# سُنَنُ النَّسَائِيّ

## بەكوردی

لِلإمَام أحْمَد بن شُعَيب أبو عَبْد الرَّحمن النَّسَائي

بەرگی دووەم

وەرگێرانی

عباس محمد أمين

حوکمی فەرموودەکان وەرگیراوە لە

الشيخ محمد صبحي بن حسن حلاق




# سُنَنُ النَّسَائِيِّ

## بەکوردی

نووسینی: **الإمام أحمد بن شعیب أبو عبد الرحمن النسائي**
وەرگێڕانـــی : **عـــباس محـــمد أمین**
دیزاینی ناوەوە : **زەردەشت کاوانی**
خـەتی بـەرگ : **نـــەوزاد کۆیـــی**
چاپــی یەکـەم : **١٤٤٢ك - ٢٠٢١ز**
٦٤٦ **لاپـــــەڕە**
١٧ * ٢٤ **ســـم**
بابـەت : **ئـاینی**

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان**
**ژمارە سپاردنی ( ٨٢٧ ) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە**











نووسینی

**الإمام أحمد بن شعيب أبو عبد الرحمن النسائي**

وەرگێڕان

**عباس محمد أمين**




## پێویست بوون یاخود واجب بوونی نوێژی هەینی

**١٣٦٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: نَحْنُ الآخِرُونَ السَّابِقُونَ، بَيْدَ أَنَّهُمْ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِنَا، وَأُوتِينَاهُ مِنْ بَعْدِهِمْ، وَهَذَا الْيَوْمُ الَّذِي كَتَبَ اللَّهُ ﷻ عَلَيْهِمْ فَاخْتَلَفُوا فِيهِ، فَهَدَانَا اللَّهُ ﷻ لَهُ «يَعْنِي يَوْمَ الْجُمُعَةِ» فَالنَّاسُ لَنَا فِيهِ تَبَعٌ الْيَهُودُ غَداً وَالنَّصَارَى بَعْدَ غَدٍ»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئێمە كۆتایەمین ئوممەتین (لە ڕووی زەمانەوە لە دنیادا) یەكەمین ئوممەتیشین (لە ڕووی پلەو پایەو ڕێز لە ڕۆژی دواییدا)، ئەگەرچی ئەوان پێش ئێمە كتێبیان بۆ هاتووە، ئێمەش دوای ئەوان پێمان دراوە، ئەم ڕۆژەی كە خوا بۆ ئەوانی نووسی (كە بریتی بوو لە ڕۆژی هەینی) ئەوان جیاوازیان تێدا هەبوو، (بۆیە جولەكەكان ڕۆژی شەممەیان هەڵبژارد گاورەكانیش یەكشەممە) خوا هیدایەتی ئێمەی دا بۆی «واتە: ڕۆژی هەینی» خەڵكی لەمەدا شوێنی ئێمە دەكەون، سبەینێ جولەكەكان و دوو سبەی گاورەكان.**

**١٣٦٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَعَنْ حُذَيْفَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالاَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَضَلَّ اللَّهُ ﷻ عَنِ الْجُمُعَةِ مَنْ كَانَ قَبْلَنَا، فَكَانَ لِلْيَهُودِ يَوْمُ السَّبْتِ، وَكَانَ لِلنَّصَارَى يَوْمُ الأَحَدِ، فَجَاءَ اللَّهُ ﷻ بِنَا فَهَدَانَا لِيَوْمِ الْجُمُعَةِ، فَجَعَلَ الْجُمُعَةَ وَالسَّبْتَ وَالأَحَدَ، وَكَذَلِكَ هُمْ لَنَا تَبَعٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَنَحْنُ الآخِرُونَ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا، وَالأَوَّلُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الْمَقْضِيُّ لَهُمْ قَبْلَ الْخَلاَئِقِ»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرەو حوزەیفە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوای زاڵی پایەدار هەینی لە پێش چاوی خەڵكانێكی پێش ئێمە ونكرد، (واتە: خوا ﷻ ڕۆژی هەینی لەسەر خەڵكانێك فەرز كرد، بەڵام ئەوان جیاوازیان تێكەوت)، جولەكە تەنها ڕۆژی شەممەی هەڵبژارد، گاورەكانیش ڕۆژی یەك شەممە، خوای زاڵی پایەدار ئێمەی هێنا هیدایەتی داین بۆ ڕۆژی هەینی و شەممەو یەك شەممە، هەروەها ئەوان لە دوای ئێمەن لە ڕۆژی قیامەتدا، ئێمە كۆتا ئوممەتین لە دنیادا، بەڵام لە قیامەتدا یەكەمین ئوممەتین، پێش هەموو ئوممەتەكان دادوەری دەكرێین و دەخرێینە بەهەشتەوە.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٨ و ٨٧٦ و ٨٩٦ و ٩٥٦ و ٣٤٨٦ و ٦٦٢٤ و ٦٨٨٧ و ٧٠٣٦ و ٧٤٩٥، ومسلم: ١٩ و ٨٥٥/٢٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٧٦، ومسلم: ٨٥٥ و ٨٥٦.




## بابەت: هەڕەشەی توند لە نەڕۆیشتن بۆ نوێژی هەینی

**١٣٦٩-** «عَنْ أَبِي الْجَعْدِ الضَّمْرِيِّ ﷺ، وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ تَرَكَ ثَلَاثَ جُمَعٍ تَهَاوُناً بِهَا طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قَلْبِهِ»[١].

**واتە: ئەبو جەعدی ضەمری ﷺ کە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بوو، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس واز لە سێ (نوێژی) هەینی بێنێ (بێ پاساو نەچێتە مزگەوت) بە هۆی تەمەڵی و کەمتەرخەمیەوە خوا مۆر دەدات بەسەر دڵیدا.**

**١٣٧٠-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَابْنَ عُمَرَ ﷺ يُحَدِّثَانِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ وَهُوَ عَلَى أَعْوَادِ مِنْبَرِهِ: لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ وَدْعِهِمُ الْجُمُعَاتِ، أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ، وَلَيَكُونُنَّ مِنَ الْغَافِلِينَ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس و ئیبنو عومەر ﷺ باسیان دەکرد: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەرە دارەکەی بوو فەرمووی: خەڵکانێک واز لە هەینیەکانیان دێنن، نزیکە خوا مۆر بدات لەسەر دڵەکانیان و، ببن بە یەکێک لەوانەی غافڵ و بێ ئاگان.**

**١٣٧١-** «عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: رَوَاحُ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ»[٣].

**واتە: حەفصە (خوا لێی ڕازی بێ)، خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ڕۆیشتن بۆ نوێژی هەینی واجبە لەسەر هەموو ئەوانەی باڵغ بوون.**

## بابەت: کەفارەتی ئەو کەسەی نوێژی هەینی دەچوێنێ بەبێ پاساوو بیانوو

**١٣٧٢-** «عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ مِنْ غَيْرِ عُذْرٍ فَلْيَتَصَدَّقْ بِدِينَارٍ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَبِنِصْفِ دِينَارٍ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٠٥٢، والترمذي: ٥٠٠، وإبن ماجه: ١١٢٥.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٦٥، وإبن ماجه: ٧٤٩.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٤٢.

(٤) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٠٥٣،وإبن ماجه: ١١٢٨.





واتە: سەمورەی کوڕی جوندوب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس واز لە نوێژی هەینی بێنێ بەبێ بیانوو، ئەوە با دینارێک بکات بە خێر (کە دەکاتە یەک مسقاڵ زێڕ)، ئەگەر نەیتوانی با نیو دینار بێت.

## بابەت: باس کردنی فەزڵ و گەورەیی نوێژی هەینی

**١٣٧٣-** «عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ فِيهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، فِيهِ خُلِقَ آدَمُ عَلَيْهِ السَّلَامُ، وَفِيهِ أُدْخِلَ الْجَنَّةَ، وَفِيهِ أُخْرِجَ مِنْهَا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترین ڕۆژێک خۆری تێدا هەڵهاتبێ ڕۆژی هەینیە، تیایدا ئادەم دروست کراوەو تیایدا خراوەتە بەهەشتەوەو تیایدا لە بەهەشت دەرکراوە.

## زۆر صەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی هەینی

**١٣٧٤-** «عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فِيهِ خُلِقَ آدَمُ عَلَيْهِ السَّلَامُ، وَفِيهِ قُبِضَ، وَفِيهِ النَّفْخَةُ، وَفِيهِ الصَّعْقَةُ، فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلَاةِ، فَإِنَّ صَلَاتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَكَيْفَ تُعْرَضُ صَلَاتُنَا عَلَيْكَ، وَقَدْ أَرَمْتَ أَيْ يَقُولُونَ قَدْ بَلِيتَ؟ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ قَدْ حَرَّمَ عَلَى الأَرْضِ أَنْ تَأْكُلَ أَجْسَادَ الأَنْبِيَاء عَلَيْهِمُ السَّلَامُ»[٢].

واتە: ئەوسی کوڕی ئەوس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی چاکترینی ڕۆژەکانتان ڕۆژی هەینیە، تیایدا ئادەم دروست کراوەو تیایدا ڕووحی کێشراوەو تیایدا فوو دەکرێ بە صوڕداو، تیایدا ڕاچڵەکان دەبێ گشت دروست کراوەکان بە هۆیەوە دەمرن (کە دەنگێکی ناخۆشە مرۆڤ لێی دەترسێ و پێی دەمرێ، مەبەست پێی فووی یەکەمە)، زۆر صەڵاواتم لەسەر لێ بدەن، چونکە صەڵاواتی ئێوە بۆم دەخرێنە ڕوو (وەکو چۆن دیاری پێشکەش دەکرێ)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن صەڵاواتی ئێمە دەخرێتە ڕووت کە تۆ ڕزیوی؟ فەرمووی: خوا ﷻ حەرامی کردوە لەسەر زەوی جەستەی پێغەمبەران بخوات.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٧ و ٨٥٤/١٨، والترمذي: ٤٨٨.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٠٤٧ و ١٥٣١، وإبن ماجه: ١٠٨٥ و ١٦٣٦.




## بابەت: فەرمان كردن بە بەكارهێنانی سیواك لە ڕۆژی هەینی

**١٣٧٥-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْغُسْلُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ، وَالسِّوَاكُ، وَيَمَسُّ مِنَ الطِّيبِ مَا قَدَرَ عَلَيْهِ»[١].

**واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی واجبە لەسەر هەموو كەسێكی باڵغ، هەروەها بەكارهێنانی سیواك و خۆ بۆن خۆش كردنیش بەو ئەندازەی لە توانایدایە.**

## بابەت: فەرمان كردن بە خۆشۆردن لە ڕۆژی هەینی

**١٣٧٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەكێك لە ئێوە هات بۆ نوێژی هەینی با خۆی بشوات.**

## بابەت: واجب بوونی خۆشۆردن لە ڕۆژی هەینی

**١٣٧٧-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: غُسْلُ يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ»[٣].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی واجبە لەسەر هەموو كەسێكی باڵغ.**

**١٣٧٨-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: عَلَى كُلِّ رَجُلٍ مُسْلِمٍ فِي كُلِّ سَبْعَةِ أَيَّامٍ غُسْلُ يَوْمٍ وَهُوَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٨٠، ومسلم: ٨٤٦/٧، وأبو داود: ٣٤٤.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٥٨، ومسلم: ٨٤٦، وأبو داود: ٣٤١.

(٤) صحيح لغيره.




**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێویستە لەسەر هەموو مسوڵمانێک لە هەر حەوت ڕۆژ جارێک خۆی بشوات ئەویش ڕۆژی هەینیە.**

## بابەت: ڕوخسەت و ڕێگەدان لە واز هێنانی خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی

**١٣٧٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْعَلَاءِ أَنَّهُ سَمِعَ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، أَنَّهُمْ ذَكَرُوا غُسْلَ يَوْمِ الْجُمُعَةِ عِنْدَ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا فَقَالَتْ: إِنَّمَا كَانَ النَّاسُ يَسْكُنُونَ الْعَالِيَةَ، فَيَحْضُرُونَ الْجُمُعَةَ وَبِهِمْ وَسَخٌ، فَإِذَا أَصَابَهُمُ الرَّوْحُ، سَطَعَتْ أَرْوَاحُهُمْ فَيَتَأَذَّى بِهَا النَّاسُ، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: أَوَ لاَ يَغْتَسِلُونَ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەلاء دەگێڕێتەوە: ئەو گوێی لێ بوو قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکر، گێڕاویەتیەوە، ئەوان باسی غوسڵ دەرکردنی ڕۆژی هەینیان کرد لەلای عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، وتی: ئەو خەڵکانەی لە دەوروبەری شاری مەدینە نیشتەجێ بوون، ئامادەی هەینی دەبوون جەستەیان پیس و ئارەقاوی بوو، جا کاتێ سروەو کزە بایەک هەڵی بکردایە بۆنیان بڵاوەی دەکرد بە ناو (نوێژخوێنانی) مزگەوتدا بە هۆیەوە خەڵکی تووشی زیان و ناڕەحەتی دەبوو، ئەوە باس کرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئەی بۆچی خۆیان ناشۆرن.**

**١٣٨٠-** «عَنْ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ تَوَضَّأَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَبِهَا وَنِعْمَتْ، وَمَنِ اغْتَسَلَ فَالْغُسْلُ أَفْضَلُ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: الْحَسَنُ، عَنْ سَمُرَةَ كِتَاباً، وَلَمْ يَسْمَعِ الْحَسَنُ مِنْ سَمُرَةَ إِلَّا حَدِيثَ الْعَقِيقَةِ، وَاللَّهُ تَعَالَى أَعْلَمُ»[٢].

**واتە: سەمورەی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس دەستنوێژ بگرێ لە ڕۆژی هەینی ئەوە چاکەو نیعمەتە، هەر کەسیش خۆی بشوات ئەوە خۆشۆردن چاکترە. ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: حەسەن لە سەمورە بە نوسین (پێی گەیشتووە) حەسەن هیچی لە سەمورەوە نەبیستووە جگە لە فەرموودەی عەقیقە، خوای بەرز زاناترە.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٠٣ و ٢٠٧١، ومسلم: ٨٤٧، وأبو داود: ٣٢٥ و ١٠٥٥.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٤، والترمذي: ٤٩٧.



## فەزڵ و گەورەیی خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی

**١٣٨١-** «عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ غَسَّلَ وَاغْتَسَلَ، وَغَدَا وَابْتَكَرَ، وَدَنَا مِنَ الْإِمَامِ وَلَمْ يَلْغُ كَانَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ عَمَلُ سَنَةٍ صِيَامُهَا وَقِيَامُهَا»[1].

**واتە: ئەوسی كوڕی ئەوس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر كەس سەرلە بەیانی خۆی بشوات و زوو بچێت بۆ مزگەوت و لە ئیمام نزیک ببێتەوەو قسەی پڕو پووچ نەكات، ئەوە بۆ هەر هەنگاوێكی كردەوەی ساڵێكی بۆ دەنوسرێ بە تەواوی بە ڕۆژو بوون و شەونوێژەوە (واتە: پاداشتی ئەوەی بۆ دەنووسرێ یەک ساڵ نوێژی كردوەو بەڕۆژوو بووە).**

## بابەت: شێوازی خۆ ئامادەكردن بۆ نوێژی هەینی

**١٣٨٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَأَى حُلَّةً فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوِ اشْتَرَيْتَ هَذِهِ فَلَبِسْتَهَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَلِلْوَفْدِ إِذَا قَدِمُوا عَلَيْكَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّمَا يَلْبَسُ هَذِهِ مَنْ لَا خَلَاقَ لَهُ فِي الْآخِرَةِ، ثُمَّ جَاءَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مِثْلُهَا فَأَعْطَى عُمَرَ مِنْهَا حُلَّةً، فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَسَوْتَنِيهَا وَقَدْ قُلْتَ فِي حُلَّةِ عُطَارِدٍ مَا قُلْتَ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَمْ أَكْسُكَهَا لِتَلْبَسَهَا، فَكَسَاهَا عُمَرُ أَخاً لَهُ مُشْرِكاً بِمَكَّةَ»[2].

**واتە: عەبدوڵلای كوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: عومەری كوڕی خەطاب دەستە پۆشاكێكی بینی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، خۆزگە ئەمەت بكڕیایە لە ڕۆژی هەینی لەبەرت بكردایە، یان بۆ كاتێک كە نوێنەرێک دێت بۆ لات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە كەسێک لەبەری دەكات هیچ بەشێكی نەبێت لە ڕۆژی دواییدا، پاشان چەند دەستەیەک (پۆشاكی دی) وەكو ئەو هات بۆ پێغەمبەر ﷺ دانەیەكیانی دابە عومەر، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، لە بیرتە بۆ پۆشاكەكەی (عُطَارِد) چیت فەرموو، ئێستاش لەبەری منی دەكەیت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پێم نەبەخشیوی بۆ ئەوەی لەبەری بكەی. عومەریش بەخشی بە برایەكی هاوبەشدانەری خۆی كە لە مەككە بوو.**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٤٥، والترمذي: ٤٩٦، وإبن ماجه: ١٠٨٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٨٦ و ٢٦١٢ و ٥٨٤١، ومسلم: ٦ و ٢٠٦٨/٧، وأبو داود: ١٠٧٦ و ٤٠٤٠، وإبن ماجه: ٣٥٩١.



**١٣٨٣-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ الْغُسْلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ، وَالسِّوَاكَ، وَأَنْ يَمَسَّ مِنَ الطِّيبِ مَا يَقْدِرُ عَلَيْهِ»[١].

**واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خۆشۆردن لە ڕۆژی هەینیدا واجبە لەسەر هەموو کەسێکی باڵغ، هەروەها بەکارهێنانی سیواک و خۆ بۆن خۆش کردنیش بەو ئەندازەی لە توانایدایە.**

## فەزڵ و گەورەیی ڕۆیشتن بە پیادە بۆ نوێژی هەینی

**١٣٨٤-** «عَنْ أَوْسِ بْنَ أَوْسٍ ﷺ صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَغَسَلَ، وَغَدَا وَابْتَكَرَ، وَمَشَى وَلَمْ يَرْكَبْ، وَدَنَا مِنَ الْإِمَامِ، وَأَنْصَتَ وَلَمْ يَلْغُ، كَانَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ عَمَلُ سَنَةٍ»[٢].

**واتە: ئەوسی کوڕی ئەوس ﷺ هاوەڵی پێغەمبەر خوا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس سەرلە بەیانی ڕۆژی هەینی خۆی بشوات و زوو بچێت بە پیادە بۆ مزگەوت و سواری هیچ شتێک نەبێت، هەروەها نزیک ببێتەوە لە ئیمام و بێدەنگ بێت و قسەی پووچ نەکات، ئەوە بۆ هەر هەنگاوێک کردەوەی (چاکی) ساڵێکی بۆ دەنوسرێ.**

## بابەت: زوو ڕۆیشتن بۆ نوێژی هەینی

**١٣٨٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِذَا كَانَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ قَعَدَتِ الْمَلَائِكَةُ عَلَى أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ، فَكَتَبُوا مَنْ جَاءَ إِلَى الْجُمُعَةِ، فَإِذَا خَرَجَ الْإِمَامُ طَوَتِ الْمَلَائِكَةُ الصُّحُفَ، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْمُهَجِّرُ إِلَى الْجُمُعَةِ كَالْمُهْدِي بَدَنَةً، ثُمَّ كَالْمُهْدِي بَقَرَةً، ثُمَّ كَالْمُهْدِي شَاةً، ثُمَّ كَالْمُهْدِي بَطَّةً، ثُمَّ كَالْمُهْدِي دَجَاجَةً، ثُمَّ كَالْمُهْدِي بَيْضَةً»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێک ڕۆژی هەینی دێت فریشتەکان لەسەر دەرگای مزگەوتەکان دادەنیشن، ئەوەی هات بۆ**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.





**هەینی ناوی دەنوسن، کاتێ ئیمام دەرچوو بۆ سەر مینبەر پەڕاوەکان دادەخەن، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەی زوو دێت بۆ نوێژی هەینی وەکو ئەوە وایە وشترێکی کردبێ بە قوربانی، پاشان (ئەوەی دوای ئەو دێت) وەکو ئەوە وایە مانگایەکی کردبێ بە قوربانی، پاشان (ئەوەی دوای ئەو دێت) وەکو ئەوە وایە بەرانێکی کردبێ بە قوربانی، پاشان (ئەوەی دوای ئەو دێت) وەکو ئەوە وایە مراوی، یان قازێکی کردبێ بە قوربانی، پاشان (ئەوەی دوای ئەو دێت) وەکو ئەوە وایە مریشکێکی کردبێ بە قوربانی، پاشان (ئەوەی دوای ئەو دێت) وەکو ئەوە وایە هێلکەیەکی کردبێ بە خێر.**

**١٣٨٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ: إِذَا كَانَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ كَانَ عَلَى كُلِّ بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ مَلَائِكَةٌ يَكْتُبُونَ النَّاسَ عَلَى مَنَازِلِهِمْ، الْأَوَّلَ فَالْأَوَّلَ، فَإِذَا خَرَجَ الْإِمَامُ طُوِيَتِ الصُّحُفُ، وَاسْتَمَعُوا الْخُطْبَةَ، فَالْمُهَجِّرُ إِلَى الصَّلَاةِ كَالْمُهْدِي بَدَنَةً، ثُمَّ الَّذِي يَلِيهِ كَالْمُهْدِي بَقَرَةً، ثُمَّ الَّذِي يَلِيهِ كَالْمُهْدِي كَبْشاً، حَتَّى ذَكَرَ الدَّجَاجَةَ وَالْبَيْضَةَ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: لە پێغەمبەرەوە ﷺ: کاتێ ڕۆژی هەینی دێت لەسەر هەر دەرگایەک لە دەرگاکانی مزگەوت چەند فریشتەیەک هەن ناوی خەڵکەکان دەنوسن بە پێی پلەو پایەکانیان، یەکەم ئینجا ئەوە دوای ئەو، کاتێ ئیمام دەرچوو بۆ سەر مینبەر پەڕاوەکان دادەخەن و گوێبیستی وتار دەبن، ئەوەی زوو دێت بۆ نوێژی هەینی وەکو ئەوە وایە وشترێکی کردبێ بە قوربانی، پاشان ئەوەی دوای ئەو دێت وەکو ئەوە وایە مانگایەکی کردبێ بە قوربانی، پاشان ئەوەی دوای ئەو دێت وەکو ئەوە وایە بەرانێکی کردبێ بە قوربانی، تەنانەت باسی مریشک و هێلەکەشی کردوە.**

**١٣٨٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: تَقْعُدُ الْمَلَائِكَةُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ عَلَى أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ يَكْتُبُونَ النَّاسَ عَلَى مَنَازِلِهِمْ، فَالنَّاسُ فِيهِ كَرَجُلٍ قَدَّمَ بَدَنَةً، وَكَرَجُلٍ قَدَّمَ بَقَرَةً، وَكَرَجُلٍ قَدَّمَ شَاةً، وَكَرَجُلٍ قَدَّمَ دَجَاجَةً، وَكَرَجُلٍ قَدَّمَ عُصْفُوراً، وَكَرَجُلٍ قَدَّمَ بَيْضَةً»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٥٠/٢٤، وإبن ماجه: ١٠٩٢.

(٢) صحيح. لكن قوله: «عُصْفُور» منكر. والمحفوظ «دَجَاجَةٌ» كما تقدم. أخرجه البخاري: ٨٨١، ومسلم: ٨٥٠/١٠، وأبو داود: ٣٥١، والترمذي: ٤٩٩.




**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فریشتەکان لە ڕۆژی هەینی دادەنیشن ناوی خەڵکی دەنوسن بە پێی پلەو پایەکانیان، پیاوی وایان تێدایە (وەک ئەوە وایە) وشترێکی پێش خستبێت، پیاوی واش هەیە (وەک ئەوە وایە) مانگایەکی پێش خستبێت، پیاوی واش هەیە (وەک ئەوە وایە) بەرانێکی پێش خستبێت، پیاوی واش هەیە (وەک ئەوە وایە) مریشکێکی پێش خستبێت، پیاوی واش هەیە (وەک ئەوە وایە) چۆلەکەیەکی پێش خستبێت، پیاوی واش هەیە (وەک ئەوە وایە) هێلکەیەکی پێش خستبێت.**

## کاتی هەینی

**١٣٨٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ غُسْلَ الْجَنَابَةِ، ثُمَّ رَاحَ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَدَنَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّانِيَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَقَرَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّالِثَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ كَبْشاً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الرَّابِعَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ دَجَاجَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الْخَامِسَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَيْضَةً، فَإِذَا خَرَجَ الْإِمَامُ حَضَرَتِ الْمَلَائِكَةُ يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕۆژی هەینی خۆی بشوات هەروەک خۆشۆردنی لەش گرانی، پاشان زوو بچێت بۆ مزگەوت وەک ئەوە وایە وشترێکی کردبێ بە قوربانی، ئەگەر لە کاتی دووەمدا چوو، وەک ئەوەیە مانگایەکی کردبێتە قوربانی، ئەگەر لە کاتی سێیەمدا چوو، وەک ئەوەیە بەرانێکی کردبێتە قوربانی، ئەگەر لە کاتی چوارەمدا چوو، وەک ئەوەیە مریشکێکی کردبێتە قوربانی، ئەگەر لە کاتی پێنجەمدا چوو، وەک ئەوەیە هێلکەیەکی کردبێتە قوربانی، جا کاتێ کە ئیمام ئامادە بوو چووە سەر مینبەر، (فریشتەکان دەفتەری پاداشت دادەخەن)و گوێبیستی یادی خوا دەبن.**

**١٣٨٩-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: يَوْمُ الْجُمُعَةِ اثْنَتَا عَشْرَةَ سَاعَةً، لَا يُوجَدُ فِيهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ يَسْأَلُ اللَّهَ شَيْئاً إِلَّا آتَاهُ إِيَّاهُ، فَالْتَمِسُوهَا آخِرَ سَاعَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٠٤٨.

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژی هەینی دوازدە کاتژمێرە، بەندەی مسوڵمان هەر داوایەک لە خوا بکات لەو کاتانەدا بێگومان خوا پێی دەبەخشێ، لە کۆتا کاتژمێری دوای عەسر بۆی بگەڕێن.

**١٣٩٠-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْجُمُعَةَ، ثُمَّ نَرْجِعُ فَنُرِيحُ نَوَاضِحَنَا، قُلْتُ: أَيَّةَ سَاعَةٍ؟ قَالَ: زَوَالُ الشَّمْسِ»(١).

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی هەینیمان دەکرد، پاشان دەگەڕاینەوە پشومان بە وشترەکانمان دەدا لە ئیش و کارو ئاو پێدانیان، وتم چ کاتێک؟ وتی: کاتێ خۆر دەترازاو لایدەدا (لە نێوەڕاستی ئاسمان).

**١٣٩١-** «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْجُمُعَةَ ثُمَّ نَرْجِعُ وَلَيْسَ لِلْحِيطَانِ فَيْءٌ يُسْتَظَلُّ بِهِ»(٢).

واتە: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی هەینیمان دەکرد، پاشان دەگەڕاینەوە دیوارەکان سێبەرێکیان نەبوو خۆی بدرێتە پاڵ.

## بابەت: بانگدان بۆ نوێژی هەینی

**١٣٩٢-** «عَنْ السَّائِبُ بْنُ يَزِيدَ ﷺ، أَنَّ الْأَذَانَ كَانَ أَوَّلُ حِينَ يَجْلِسُ الْإِمَامُ عَلَى الْمِنْبَرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَأَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ، فَلَمَّا كَانَ فِي خِلَافَةِ عُثْمَانَ، وَكَثُرَ النَّاسُ أَمَرَ عُثْمَانُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ بِالْأَذَانِ الثَّالِثِ، فَأُذِّنَ بِهِ عَلَى الزَّوْرَاءِ، فَثَبَتَ الْأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ»(٣).

واتە: سائیبی کوڕی یەزید ﷺ دەگێڕێتەوە: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم کاتی بانگ ئەو کاتە بوو کە ئیمام دادەنیشت لەسەر مینبەر لە ڕۆژی هەینی، هەروەها سەردەمی ئەبو بەکرو عومەریش، بەڵام لە خیلافەتی عوسمان خەڵک

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٨ و ٨٥٨/٢٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤١٦٨، ومسلم: ٨٦٠، وأبو داود: ١٠٨٥، وإبن ماجه: ١١٠٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٩١٢ و ٩١٣ و ٩١٥ و ٩١٦، وأبو داود: ١٠٨٧ و ١٠٨٨ و ١٠٨٩ و ١٠٩٠، والترمذي: ٥١٦، وإبن ماجه: ٩١٢.




زۆر بوو، عوسمان فەرمانی کرد بە بانگدانی سێیەم لە ڕۆژی هەینی، لە (الزَّوْرَاء) بوو (الزَّوْرَاء:ماڵێک بوو لە بازاڕ بانگ دەدرا لە نزیک مزگەوتی مەدینە)، دواتر کارەکە لەسەر ئەوە بەردەوام بوو.

**١٣٩٣**- «عَنِ السَّائِبِ بْنَ يَزِيدَ ﷺ قَالَ: إِنَّمَا أَمَرَ بِالتَّأْذِينِ الثَّالِثِ عُثْمَانُ حِينَ كَثُرَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ وَلَمْ يَكُنْ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ غَيْرُ مُؤَذِّنٍ وَاحِدٍ، وَكَانَ التَّأْذِينُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ حِينَ يَجْلِسُ الْإِمَامُ»[١].

واتە: سائیبی کوڕی یەزید ﷺ دەڵێ: بۆیە عوسمان (لە ڕۆژی هەینیدا) فەرمانی کرد بە بانگدانی سێیەم، (واتە: جگە لە بانگی ئەصڵی و قامەت)، چونکە خەڵکی مەدینە زۆر بوو بوون، پێغەمبەری خواش ﷺ تەنها یەک بانگدەری هەبوو لە ڕۆژی هەینیدا، ئەویش کاتێک بانگی دەدا کە ئیمام بچووایەتە سەر مینبەر.

**١٣٩٤**- «عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ ﷺ قَالَ: كَانَ بِلَالٌ يُؤَذِّنُ إِذَا جَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَإِذَا نَزَلَ أَقَامَ، ثُمَّ كَانَ كَذَلِكَ فِي زَمَنِ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا»[٢].

واتە: سائیبی کوڕی یەزید ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر دادەنیشت لە ڕۆژی هەینی بیلال بانگی دەدا، کاتێ دابەزیایە قامەتی دەکرد، پاشان لە سەردەمی ئەبو بەکرو عومەریش (خوایان لێ ڕازی بێ) هەر بەو شێوە بوو.

## بابەت: دوو ڕکات نوێژی سوننەت لە ڕۆژی هەینی بۆ ئەو کەسەیە کە هاتووە ئیمام چۆتە سەر مینبەر

**١٣٩٥**- «عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ وَقَدْ خَرَجَ الْإِمَامُ، فَلْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ، قَالَ شُعْبَةُ: يَوْمَ الْجُمُعَةِ»[٣].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە هات (بۆ نوێژی هەینی) ئیمامیش دەرچوو بوو (بۆ سەر مینبەر)، با دوو ڕکات نوێژ بکات. شوعبە دەڵێ: ڕۆژی هەینی (مەبەستی ڕۆژی هەینییە).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




## شوێنی ئیمام لە کاتی وتاردا

**١٣٩٦-** «عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا خَطَبَ يَسْتَنِدُ إِلَى جِذْعِ نَخْلَةٍ مِنْ سَوَارِي الْمَسْجِدِ، فَلَمَّا صُنِعَ الْمِنْبَرُ وَاسْتَوَى عَلَيْهِ، اضْطَرَبَتْ تِلْكَ السَّارِيَةُ كَحَنِينِ النَّاقَةِ حَتَّى سَمِعَهَا أَهْلُ الْمَسْجِدِ، حَتَّى نَزَلَ إِلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَاعْتَنَقَهَا فَسَكَتَتْ»[1].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بدایە، پاڵی دەدا بە قەدە دارخورمایەک لە کۆڵەکەکانی مزگەوت، جا کاتێ مینبەر دروست کراو لەسەری وەستا، ئەو کۆڵەکەیە بێتاقەت بوو، وەکو چۆن وشتر خەمبار دەبێت دەنگێکی لێوە دەرچوو، تا خەڵکی مزگەوتەکە گوێیان لێ بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزیە خوارەوە بۆ لای و لە ئامێزی گرت، ئینجا بێدەنگ بوو.**

## هەڵسانی ئیمام لە وتاری هەینی

**١٣٩٧-** «عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﵁ قَالَ: دَخَلَ الْمَسْجِدَ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ ابْنُ أُمِّ الْحَكَمِ يَخْطُبُ قَاعِداً، فَقَالَ: انْظُرُوا إِلَى هَذَا يَخْطُبُ قَاعِداً، وَقَدْ قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا ﴿١١﴾﴾ الجمعة»[2].

**واتە: کەعبی کوڕی عوجرە ﵁ دەگێڕێتەوە: چۆتە مزگەوتەوە دەبینێ عەبدورڕەحمانی کوڕی ئوممو حەکەم وتار دەدات بە دانیشتنەوە، وتی: تەماشای ئەمە بکەن بە دانیشتنەوە وتار دەدات، بێگومان خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا ﴿١١﴾﴾، واتە: هەر کارێکی بازرگانی، یان کارێکی بێهودە ببینن بڵاوەی لێدەکەن بۆ لای ئەو بازرگانیەو تۆ بەجێ دێڵن بە ڕاوەستاوی (کەواتە: وتاردان بە ڕاوەستانەوەیە).**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩١٨ بنحوه، وإبن ماجه: ١٥١٧.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٦٤.

## بابەت: فەزڵ و گەورەیی نزیک بوونەوە لە ئیمام

**١٣٩٨-** «عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ الثَّقَفِيِّ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ غَسَّلَ وَاغْتَسَلَ، وَابْتَكَرَ وَغَدَا، وَدَنَا مِنَ الْإِمَامِ وَأَنْصَتَ، ثُمَّ لَمْ يَلْغُ، كَانَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ كَأَجْرِ سَنَةٍ صِيَامِهَا وَقِيَامِهَا»[١].

**واتە: ئەوسی کوڕی ئەوسی ئەقەفی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس سەر لە بەیانی خۆی بشوات و زوو بچێت بۆ مزگەوت و لە ئیمام نزیک ببێتەوە، پاشان قسەی پڕو پووچ نەکات، ئەوە بۆ هەر هەنگاوێک کردەوەی ساڵێکی بۆ دەنوسرێ بە تەواوی بە ڕۆژو بوون و شەونوێژەوە.**

## قەدەغەکردن لە هەنگاونان بەسەر خەڵک لە کاتێ ئیمام وتار دەدات لە ڕۆژی هەینی

**١٣٩٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ جَالِساً إِلَى جَانِبِهِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَقَالَ: جَاءَ رَجُلٌ يَتَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَيِ اجْلِسْ فَقَدْ آذَيْتَ»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بوسر ﷺ دەڵێ: من لە تەنیشتی (پێغەمبەرەوە ﷺ) دانیشتبووم لە ڕۆژی هەینی، وتی: پیاوێک هات بەسەر گەردنی خەڵکیدا هەنگاوی دەنا، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: دانیشە بەڕاستی خەڵکت ئازاردا.**

## بابەت: نوێژ کردن لە ڕۆژی هەینی بۆ کەسێک بەرەو مزگەوت دێ لەو کاتەدا ئیمام وتار دەدات

**١٤٠٠-** «عَن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: جَاءَ رَجُلٌ وَالنَّبِيُّ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَقَالَ لَهُ: أَرَكَعْتَ رَكْعَتَيْنِ؟، قَالَ: لَا، قَالَ: فَارْكَعْ»[٣].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک هاتە مزگەوتەوە لە ڕۆژی هەینی پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەر بوو پێی فەرموو: ئایا دوو ڕکات نوێژت کرد؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: دوو ڕکات بکە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١١١٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٣٠ و ٩٣١ و ١١٦٦، ومسلم: ٥٤ و ٨٧٥/٥٧، والترمذي: ٥١٠، وإبن ماجه: ١١١٢.




## بابەت: بێدەنگ بوون بۆ گوێ گرتنی وتار لە ڕۆژی هەینی

**١٤٠١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ: أَنْصِتْ، فَقَدْ لَغَا»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە ڕۆژی هەینیدا بە هاوەڵەکەی بڵێت بێدەنگ بە کاتێ ئیمام وتار دەخوێنێتەوە، ئەوە قسەی نابەجێی کردوە.**

**١٤٠٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ أَنْصِتْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ فَقَدْ لَغَوْتَ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: کاتێک کە ئیمام وتار دەخوێنێتەوە لە ڕۆژی هەینی، تۆش بە هاوڕێکەت بڵێیت: بێدەنگ بە، ئەوە قسەی نابەجێت کردوە.**

## بابەت: فەزڵ و گەورەیی بێدەنگی و نە وتنی قسەی پڕو پووچ و بێ هودە لە ڕۆژی هەینی

**١٤٠٣-** «عَنْ سَلْمَانَ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا مِنْ رَجُلٍ يَتَطَهَّرُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ كَمَا أُمِرَ، ثُمَّ يَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ حَتَّى يَأْتِيَ الْجُمُعَةَ وَيُنْصِتُ حَتَّى يَقْضِيَ صَلَاتَهُ إِلَّا كَانَ كَفَّارَةً لِمَا قَبْلَهُ مِنَ الْجُمُعَةِ»[٣].

**واتە: سەلمان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی وتم: هیچ کەسێک نیە خۆی پاک بکاتەوە لە ڕۆژی هەینی بەو شێوەی فەرمانی پێکراوە، پاشان لە ماڵەکەی دەربچێت تا دێت بۆ نوێژی هەینی و، بێدەنگ بێت تا نوێژەکەی تەواو دەکات، ئیللا دەبێتە کەفارەتی هەینیەکەی پێشووی (واتە: مایەی سڕینەوەی گوناهەکانی حەفتەی ڕابردوویەتی).**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٣٤، ومسلم: ٨٥١، وأبو داود: ١١١٢، والترمذي: ٥١٢، وإبن ماجه: ١١١٠.

(٣) صحيح.




## بابەت: چۆنیەتی وتاردان

**١٤٠٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: عَلَّمَنَا خُطْبَةَ الْحَاجَةِ: الْحَمْدُ لِلَّهِ نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَسَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، ثُمَّ يَقْرَأُ ثَلَاثَ آيَاتٍ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾آل عمران، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾﴾النساء، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾﴾الأحزاب»[1].

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فێری وتاری پێویستی کردین (واتە: ئەو وتارەی بۆ کاتی پێویستەکان دەوترێن، وەک ژن مارەکردن و، صوڵح و ئاشتەویی و، ئامۆژگاریی و .... هتد، بەکاردێ لە سەرەتاوە)، بەم شێوەیە: ستایش بۆ خوا داوای یارمەتی لێدەکەین و، داوای لێخۆشبوونی لێدەکەین، پەنا دەگرین بە خوا لە خراپی نەفس و دەروونمان و خراپی کردەوەکانمان، هەر کەس خوا هیدایەتی بدات کەس ناتوانێ گومڕا بکات، هەر کەسێکیش گومڕا بکات کەس نیە ڕێنمایی بکات، شایەدی دەدەم هیچ پەرستراوێک (بە حەق) نیە جگە لە خوا، وە شایەدی دەدەم موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خوایە، پاشان ئەم سێ ئایەتە دەخوێنێ:** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾آل عمران، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾﴾النساء، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾﴾الأحزاب.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢١١٨، والترمذي: ١١٠٥، وإبن ماجه: ١٨٩٢.




## بابەت: ئیمام لە وتارەکەیدا هانی خەڵک بدات بۆ خۆ شۆردن لە ڕۆژی هەینی

**١٤٠٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِذَا رَاحَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْجُمُعَةِ فَلْيَغْتَسِلْ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاریدا فەرمووی: کاتێ یەکێک لە ئێوە ڕۆیشت بۆ نوێژی هەینی با خۆی بشوات.**

**١٤٠٦-** «عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ نَشِيطٍ، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ، عَنِ الْغُسْلِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَقَالَ: سُنَّةٌ، وَقَدْ حَدَّثَنِي بِهِ سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَكَلَّمَ بِهَا عَلَى الْمِنْبَرِ»[٢].

**واتە: ئیبراهیمی کوڕی نەشیط پرسیاری کرد لە ئیبنو شیهاب دەربارەی خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی، وتی: سوننەتە، سالمی کوڕی عەبدوڵڵا لە باوکیەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) بۆی باس کردم، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر (بە سوننەت) باسی کرد.**

**١٤٠٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ وَهُوَ قَائِمٌ عَلَى الْمِنْبَرِ: مَنْ جَاءَ مِنْكُمُ الْجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: مَا أَعْلَمُ أَحَداً تَابَعَ اللَّيْثَ عَلَى هَذَا الْإِسْنَادِ غَيْرَ ابْنِ جُرَيْجٍ، وَأَصْحَابُ الزُّهْرِيِّ يَقُولُونَ: عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ، بَدَلَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ»[٣].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر وەستا بوو فەرمووی: هەر کەس لە ئێوە هات بۆ نوێژی هەینی با خۆی بشوات، ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: نەمبینیوە کەسێک شوێنی لەیث کەوتبێ لەسەر ئەم سەنەدە، جگە لە ئیبنو جورەیج، هاوەڵانی زوهری وتوویانە: لە سالمەوە لە عەبدوڵڵاوە لە باوکیەوە، لە جیاتی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٧٧ و ٨٩٤ و ٩١٩، ومسلم: ١ و ٨٤٤/٢، والترمذي: ٤٩٢ و ٤٩٣، وإبن ماجه: ١٠٨٨.

## بابەت: ئیمام لە وتاری ڕۆژی هەینی لە وتارەکەیدا هانی خەڵکی دەدات لەسەر بەخشین

**١٤٠٨-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ يَقُولُ: جَاءَ رَجُلٌ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالنَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ بِهَيْئَةٍ بَذَّةٍ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَصَلَّيْتَ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: صَلِّ رَكْعَتَيْنِ، وَحَثَّ النَّاسَ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَأَلْقَوْا ثِيَاباً فَأَعْطَاهُ مِنْهَا ثَوْبَيْنِ، فَلَمَّا كَانَتِ الْجُمُعَةُ الثَّانِيَةُ جَاءَ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ، فَحَثَّ النَّاسَ عَلَى الصَّدَقَةِ، قَالَ: فَأَلْقَى أَحَدَ ثَوْبَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: جَاءَ هَذَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ بِهَيْئَةٍ بَذَّةٍ، فَأَمَرْتُ النَّاسَ بِالصَّدَقَةِ، فَأَلْقَوْا ثِيَاباً، فَأَمَرْتُ لَهُ مِنْهَا بِثَوْبَيْنِ، ثُمَّ جَاءَ الْآنَ فَأَمَرْتُ النَّاسَ بِالصَّدَقَةِ، فَأَلْقَى أَحَدَهُمَا، فَانْتَهَرَهُ وَقَالَ: خُذْ ثَوْبَكَ»[١].

**واتە: ئەبو سەعید خودر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی هەینی وتاری دەدا، پیاوێک بە جلێکی هەژاریەوە هات، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: نوێژت کرد؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: دوو ڕکات نوێژ بکە، ئینجا خەڵکی هاندا لەسەر بەخشین، کۆمەڵە جلێکیان خستە پێشی، پێغەمبەریش دوو دانەی پێدا، کاتێ هەینی دووەم هاتەوە، ئەو پیاوە هات پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا، دیسان هانی خەڵکیدا لەسەر بەخشین، دەڵێ: (پیاوەکەش) یەکێک لە جلەکانی دانا (کە پێشتر پێی درابوو)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەم پیاوە لە ڕۆژی هەینی بە جلێکی هەژاریەوە هات، فەرمانم کرد بە خەڵکی ببەخشن، چەند جلێکیان دانا، منیش فەرمانم کرد دوو جلی لێ ببات، پاشان ئیستا هاتەوە، دیسانەوە فەرمانم کرد بە خەڵکی ببەخشن، دانەیەکیانی دانا، لێی تووڕە بوو فەرمووی: جلەکەت هەلبگرە.**

## قسەکردنی ئیمام لەسەر مینبەر لەگەڵ خەڵکەکەی

**١٤٠٩-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: بَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِذْ جَاءَ رَجُلٌ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: صَلَّيْتَ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: قُمْ فَارْكَعْ»[٢].

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ١٦٧٥، والترمذي: ٥١١، وإبن ماجه: ١١١٣.

(٢) صحيح.

واته: جابری كوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: لە كاتێكدا پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی هەینی وتاری دەدا، پیاوێک هات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نوێژی (سوننەتت) كرد؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: هەڵسە نوێژ بكە.

**١٤١٠-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ يَقُولُ: لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ وَالْحَسَنُ مَعَهُ وَهُوَ يُقْبِلُ عَلَى النَّاسِ مَرَّةً وَعَلَيْهِ مَرَّةً، وَيَقُولُ: إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ، وَلَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ عَظِيمَتَيْنِ»[١].

واته: ئەبو بەكرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەسەر مینبەر حەسەنیشی لەگەڵ بوو، جارێک ڕووی دەكردە خەڵكەكەو، جارێكیش ڕووی دەكردە حەسەن، دەیفەرموو: بەڕاستی ئەم كوڕەی منە سەیدو گەورەیە، بێگومان خوا نێوان دوو كۆمەڵی گەورەی مسوڵمانانی پێ چاک دەكات.

تێبینی: دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ كێشەیەک دروست بوو لە نێوان مسوڵمانان، حەسەن (خوا لێی ڕازی بێ) بووە هۆكاری كوژانەوەی ئەم فیتنەو ئاشووبە، ئەمەش هاتنەدی فەرمایشی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو.

## بابەت: قورئان خوێندن لە كاتی وتاردان

**١٤١١-** «عَنِ ابْنَةِ حَارِثَةَ بْنِ النُّعْمَانِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: حَفِظْتُ: ﴿قٓ ۚ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْمَجِيدِ ۝١﴾ق، مِنْ فِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ»[٢].

واته: كچەكەی حاریثەی كوڕی نوعمان (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: (سوورەتی) ﴿قٓ ۚ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْمَجِيدِ ۝١﴾م لەبەر كرد لە دەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی هەینیدا ئەو لەسەر مینبەر بوو.

## بابەت: ئاماژە كردن لە كاتی وتاردا

**١٤١٢-** «عَنْ حُصَيْنٍ، أَنَّ بِشْرَ بْنَ مَرْوَانَ، رَفَعَ يَدَيْهِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَسَبَّهُ عُمَارَةُ بْنُ رُوَيْبَةَ الثَّقَفِيُّ ﷺ وَقَالَ: مَا زَادَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى هَذَا، وَأَشَارَ بِإِصْبَعِهِ السَّبَّابَةِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٠٤ و ٣٦٢٩ و ٣٧٤٦ و ٧١٠٩، وأبو داود: ٤٦٦٢، والترمذي: ٣٧٧٣.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٧٤، وأبو داود: ١١٠٤، والترمذي: ٥١٥.

واتە: حوصەین دەگێڕێتەوە: بیشری کوڕی مەڕوان دەستەکانی بەرز کردەوە لە ڕۆژی هەینی لەسەر مینبەر، عومارەی کوڕی ڕوەیبەی سەقەفی ﷺ سەرزەنشتی کرد، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەمە زیاتری نەکردوە، بە پەنجەی شایەتمانی ئاماژەی کرد. (وەکو ئەوەی بڵێ: تەنها پەنجەی بەرز دەکردەوە لە کاتی شایەتماندا).

## بابەت: دابەزینی ئیمام لەسەر مینبەر پێش تەواوبوون و، بڕینی وتارەکەی و گەڕانەوەی بۆ وتارەکەی لە ڕۆژی هەینی

**١٤١٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ، فَجَاءَ الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، وَعَلَيْهِمَا قَمِيصَانِ أَحْمَرَانِ يَعْثُرَانِ فِيهِمَا، فَنَزَلَ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَطَعَ كَلَامَهُ، فَحَمَلَهُمَا ثُمَّ عَادَ إِلَى الْمِنْبَرِ، ثُمَّ قَالَ: صَدَقَ اللَّهُ: ﴿ إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ١٥ ﴾التغابن، رَأَيْتُ هَذَيْنِ يَعْثُرَانِ فِي قَمِيصَيْهِمَا، فَلَمْ أَصْبِرْ حَتَّى قَطَعْتُ كَلَامِي فَحَمَلْتُهُمَا»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، وتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا، حەسەن و حوسەین هاتن، کراسێکی سوریان لەبەر بوو، ڕێیان دەکرد ئەوەندە منداڵ بوون خەریک بوو بەملاولادا دەکەوتن، پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەرەکە دابەزیە خوارەوە وتارەکەی بڕی و هەردووکیانی هەڵگرت، پاشان گەڕایەوە بۆ سەر مینبەرەکەی، پاشان فەرمووی: خوا ﷻ ڕاستی فەرمووە: ﴿ إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ١٥ ﴾، (واتە: بەڕاستی ماڵ و سامان و منداڵەکانتان هەر هۆی تاقی کردنەوەتانن لە کاتێکدا خوا پاداشتی زۆر گەورەی لەلایە). (بۆیە) ئەم دووانەم بینی دەهاتن خەریک بوو بەملاولادا دەکەوتن بەو کراسەی لەبەریاندایە، خۆم پێ ڕانەگیرا تا وتارەکەم بڕی و هەردووکیانم هەڵگرت.

## بابەت: چاکتر وایە وتار کورت بکرێتەوە

**١٤١٤-** «عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى ﷺ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُكْثِرُ الذِّكْرَ، وَيُقِلُّ اللَّغْوَ، وَيُطِيلُ الصَّلَاةَ، وَيُقَصِّرُ الْخُطْبَةَ، وَلَا يَأْنَفُ أَنْ يَمْشِيَ مَعَ الْأَرْمَلَةِ، وَالْمِسْكِينِ فَيَقْضِيَ لَهُ الْحَاجَةَ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١١٠٩، والترمذي: ٣٧٧٤، وإبن ماجه: ٣٦٠٠.

(٢) صحيح.

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر یادی خوای دەکردو شتی بێ سوودی کەم دەکرد، نوێژی درێژ دەکردەوەو وتاری کورت دەکرد، خۆی بە گەورە نەدەزانی لە ئاستی ئەوەی لەگەڵ بێوەژنو هەژاراندا ڕێ نەکات، (بەڵکو) کەمو کوڕیی و پێویستی بۆی تەواو دەکردن.**

## بابەت: چەند جار وتار دەدا

**١٤١٥-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: جَالَسْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَمَا رَأَيْتُهُ يَخْطُبُ إِلَّا قَائِماً وَيَجْلِسُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيَخْطُبُ الْخُطْبَةَ الْآخِرَةَ»[1].

**واتە: جابری کوڕی سەموڕە ﷺ دەڵێ: دانیشتم لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، بە پێوە وتاری دەداو، ئینجا دادەنیشت، پاشان هەڵدەستاو وتاری کۆتایی دەدا.**

## بابەت: جیا کردنەوە لە نێوان دوو وتارەکە بە دانیشتن

**١٤١٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَخْطُبُ الْخُطْبَتَيْنِ وَهُوَ قَائِمٌ، وَكَانَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمَا بِجُلُوسٍ»[2].

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو وتاریدا بە پێوەو، جیای دەکردنەوە لە یەکتر بە دانیشتنێک.**

## بابەت: بێدەنگ بوون لە دانیشتن لە نێوان دوو وتارەکەدا

**١٤١٧-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمْعَةِ قَائِماً، ثُمَّ يَقْعُدُ قِعْدَةً لَا يَتَكَلَّمُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيَخْطُبُ خُطْبَةً أُخْرَى، فَمَنْ حَدَّثَكُمْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَخْطُبُ قَاعِداً فَقَدْ كَذَبَ»[3].

**واتە: جابری کوڕی سەموڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە ڕۆژی هەینی وتاری دەخوێند بە پێوە، پاشان دانیشت بە دانیشتنێک هیچ قسەی نەکرد،**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٢٠ و ٩٢٨، ومسلم: ٨٦١، والترمذي: ٥٠٦، وإبن ماجه: ١١٠٣.

(٣) حسن. أخرجه مسلم: ٣٤ و ٨٣٦/٣٥، وأبو داود: ١٠٩٣ و ١٠٩٤ و ١٠٩٥ و ١١٠١ و ١١٠٥ و ١١٠٧، وإبن ماجه: ١١٠٦.




پاشان هەڵسا وتارێکی تری خوێند، هەرکەس بۆی باس کردوون پێغەمبەر ﷺ بە دانیشتنەوە وتاری دەخوێند ئەوە درۆی کردوە.

## بابەت: قورئان خوێندن لە وتاری دووەم و یادکردنەوە تیایدا

**١٤١٨-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ قَائِماً، ثُمَّ يَجْلِسُ، ثُمَّ يَقُومُ، وَيَقْرَأُ آيَاتٍ وَيَذْكُرُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ، وَكَانَتْ خُطْبَتُهُ قَصْداً وَصَلَاتُهُ قَصْداً»[١].

**واتە: جابری کوڕی سەمورە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی هەینی وتاری دەخوێند بە پێوە، پاشان دانیشت، پاشان هەڵسا، چەندین ئایەتی دەخوێندو یادی خوای تێدا دەکردەوە، وتارەکەی مام ناوەند بوو، نوێژەکەشی مام ناوەند بوو.**

## قسەکردن و هەڵسان دوای دابەزین لە مینبەر

**١٤١٩-** «عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْزِلُ عَنِ الْمِنْبَرِ فَيَعْرِضُ لَهُ الرَّجُلُ، فَيُكَلِّمُهُ فَيَقُومُ مَعَهُ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى يَقْضِيَ حَاجَتَهُ، ثُمَّ يَتَقَدَّمُ إِلَى مُصَلَّاهُ فَيُصَلِّي»[٢].

**واتە: ئەنەس رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مینبەر دادەبەزی کەسێکی لێ ڕاست دەبوویەوە، (پێویستی بوو قسەی لەگەڵ بکات)، جا قسەی لەگەڵ دەکرد، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیدا هەڵدەستا تا پێویستیەکەی بۆی پڕ دەکردەوە، پاشان پێش دەکەوت بۆ شوێنی نوێژەکەی و نوێژی دەکرد.**

## ژمارەی ڕکاتەکانی نوێژی هەینی

**١٤٢٠-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، قَالَ: قَالَ عُمَرُ رضي الله عنه: صَلَاةُ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَانِ، وَصَلَاةُ الْفِطْرِ رَكْعَتَانِ، وَصَلَاةُ الْأَضْحَى رَكْعَتَانِ، وَصَلَاةُ السَّفَرِ رَكْعَتَانِ تَمَامٌ غَيْرُ قَصْرٍ عَلَى لِسَانِ مُحَمَّدٍ ﷺ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي لَيْلَى لَمْ يَسْمَعْ مِنْ عُمَرَ»[٣].

---

(١) حسن.

(٢) شاذ. أخرجه أبو داود: ١١٢٠، والترمذي: ٥١٧، وإبن ماجه: ١١١٧.

(٣) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٠٦٣.




واتە: عەبدورڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا دەڵێ: عومەر ﷺ وتی: نوێژی هەینی دوو ڕکاتە، نوێژی جەژنی ڕەمەزان دوو ڕکاتە، نوێژی جەژنی قوربان دوو ڕکاتە، نوێژی گەشت دوو ڕکاتی تەواوە بەبێ کورت کردنەوە لەسەر زمانی موحەممەد ﷺ (چونکە پێشتر نوێژەکان خۆیان دوو ڕکات بوون)، ئەبو عەبدورڕەحمان دەڵێ: عەبدورڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا لە عومەرەوە نەیبیستووە.

## قورئان خوێندن لە نوێژی هەینی بە خوێندنی سوورەتی (الْجُمُعَةِ وَالْمُنَافِقِينَ)

**١٤٢١-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ ﴿ الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ﴾ وَ ﴿ هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ ﴾، وَفِي صَلَاةِ الْجُمُعَةِ بِسُورَةِ الْجُمُعَةِ وَالْمُنَافِقِينَ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی هەینی لە نوێژی بەیانیدا ﴿ الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢ ﴾ و ﴿ هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ۝١ ﴾ی دەخوێند، وە لە نوێژی هەینی سوورەتی (الْجُمُعَةِ وَالْمُنَافِقِينَ)ی دەخوێند.

## خوێندنی (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى، وَهَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ) لە نوێژی هەینی

**١٤٢٢-** «عَنْ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الْجُمُعَةِ: بِـ ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١ ﴾الأعلى، وَ ﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١ ﴾الغاشية»[2].

واتە: سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی هەینیدا: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١ ﴾ و ﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١ ﴾ی دەخوێند.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١١٢٥.



## باسی جیاوازی لەسەر نوعمانی کوڕی بەشیر لە خوێندنی قورئان لە نوێژی هەینی

**١٤٢٣-** «عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ الضَّحَّاكَ بْنَ قَيْسٍ سَأَلَ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ ﵁: مَاذَا كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَقْرَأُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ عَلَى إِثْرِ سُورَةِ الْجُمُعَةِ؟ قَالَ: كَانَ يَقْرَأُ: ﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ١ ﴾»[١].

**واتە: عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە: ضەحاکی کوڕی قەیس پرسیاری کرد لە نوعمانی کوڕی بەشیر ﵁: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی هەینی دوای سوورەتی (الْجُمُعَةِ) چی دەخوێند؟ وتی: ﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ١ ﴾یەی دەخوێند.**

**١٤٢٤-** «عَنْ حَبِيبِ بن سَالِمٍ عن النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْجُمُعَةِ بِـ: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ١ ﴾، و ﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ١ ﴾، وَرُبَّمَا اجْتَمَعَ الْعِيدُ وَالْجُمُعَةُ، فَيَقْرَأُ بِهِمَا فِيهِمَا جَمِيعاً»[٢].

**واتە: حەبیبی کوڕی سالم لە نوعمانی کوڕی بەشیر ﵁ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی هەینی: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ١ ﴾، و ﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ١ ﴾ی دەخوێند، کەمجار جەژن و هەینی پێکەوە کۆدەبوونەوە، هەر ئەو دوو سوورەتەی دەخوێند.**

## هەر کەس بە ڕکاتێکی نوێژی هەینی ڕابگات

**١٤٢٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ أَدْرَكَ مِنْ صَلَاةِ الْجُمُعَةِ رَكْعَةً فَقَدْ أَدْرَكَ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بە ڕکاتێکی نوێژی هەینی ڕابگات، ئەوە گەیشتووە بە نوێژی هەینی.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٧٨/٦٣، وأبو داود: ١١٢٣، وإبن ماجه: ١١١٩.

(٢) صحيح.

(٣) شاذ بذكر الجمعة. أخرجه أبو داود: ٥٠٧ و ٦٠٨ دون لفظ الجمعه.

## ژمارەی نوێژی سوننەت لە دوای نوێژی هەینی لە مزگەوت

**١٤٢٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ، فَلْيُصَلِّ بَعْدَهَا أَرْبَعاً»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە نوێژی هەینی کرد، با دوای ئەوە چوار ڕکات بکات.**

## نوێژ کردنی ئیمام لە دوای هەینی

**١٤٢٧-** «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ لَا يُصَلِّي بَعْدَ الْجُمُعَةِ حَتَّى يَنْصَرِفَ فَيُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای هەینی نوێژی نەدەکرد، تا دەڕۆیشت ئینجا دوو ڕکاتی (لەماڵەوە) دەکرد.**

**١٤٢٨-** «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي بَعْدَ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ»[٣].

**واتە: سالم لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دوای هەینی دوو ڕکات نوێژی دەکرد لە ماڵی خۆیدا.**

## بابەت: درێژ کردنەوەی دوو ڕکاتە سوننەتەکەی دوای هەینی

**١٤٢٩-** «عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي بَعْدَ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ يُطِيلُ فِيهِمَا، وَيَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَفْعَلُهُ»[٤].

**واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دوای نوێژی هەینی دوو ڕکات نوێژی دەکرد درێژی دەکردەوەو، دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوای کردوە.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٧ و ٦٨ و ٨٨١/٦٩، وأبو داود: ١١٣١، والترمذي: ٥٢٣، وإبن ماجه: ١١٣٢.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) شاذ.





١

## باسی ئەو كاتەی نزای تێدا گیرایە لە ڕۆژی هەینی

**١٤٣٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ الطُّورَ فَوَجَدْتُ ثَمَّ كَعْباً، فَمَكَثْتُ أَنَا وَهُوَ يَوْماً أُحَدِّثُهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَيُحَدِّثُنِي عَنِ التَّوْرَاةِ، فَقُلْتُ لَهُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ فِيهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ أُهْبِطَ، وَفِيهِ تِيبَ عَلَيْهِ، وَفِيهِ قُبِضَ، وَفِيهِ تَقُومُ السَّاعَةُ، مَا عَلَى الْأَرْضِ مِنْ دَابَّةٍ إِلَّا وَهِيَ تُصْبِحُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ مُصِيخَةً، حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ شَفَقاً مِنَ السَّاعَةِ إِلَّا ابْنَ آدَمَ، وَفِيهِ سَاعَةٌ لَا يُصَادِفُهَا مُؤْمِنٌ وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ يَسْأَلُ اللَّهَ فِيهَا شَيْئاً إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ فَقَالَ كَعْبٌ: ذَلِكَ يَوْمٌ فِي كُلِّ سَنَةٍ، فَقُلْتُ: بَلْ هِيَ فِي كُلِّ جُمُعَةٍ، فَقَرَأَ كَعْبٌ التَّوْرَاةَ، ثُمَّ قَالَ: صَدَقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ هُوَ فِي كُلِّ جُمُعَةٍ. فَخَرَجْتُ فَلَقِيتُ بَصْرَةَ بْنَ أَبِي بَصْرَةَ الْغِفَارِيَّ، فَقَالَ: مِنْ أَيْنَ جِئْتَ؟ قُلْتُ: مِنَ الطُّورِ، قَالَ: لَوْ لَقِيتُكَ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَأْتِيَهُ لَمْ تَأْتِهِ، قُلْتُ لَهُ: وَلِمَ؟ قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا تُعْمَلُ الْمَطِيُّ إِلَّا إِلَى ثَلَاثَةِ مَسَاجِدَ: الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَسْجِدِي وَمَسْجِدِ بَيْتِ الْمَقْدِسِ فَلَقِيتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَلَامٍ، فَقُلْتُ: لَوْ رَأَيْتَنِي خَرَجْتُ إِلَى الطُّورِ فَلَقِيتُ كَعْباً فَمَكَثْتُ أَنَا وَهُوَ يَوْماً أُحَدِّثُهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَيُحَدِّثُنِي عَنِ التَّوْرَاةِ، فَقُلْتُ لَهُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ فِيهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ أُهْبِطَ، وَفِيهِ تِيبَ عَلَيْهِ، وَفِيهِ قُبِضَ، وَفِيهِ تَقُومُ السَّاعَةُ، مَا عَلَى الْأَرْضِ مِنْ دَابَّةٍ إِلَّا وَهِيَ تُصْبِحُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ مُصِيخَةً حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ شَفَقاً مِنَ السَّاعَةِ إِلَّا ابْنَ آدَمَ، وَفِيهِ سَاعَةٌ لَا يُصَادِفُهَا عَبْدٌ مُؤْمِنٌ وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ يَسْأَلُ اللَّهَ شَيْئاً، إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ، قَالَ كَعْبٌ: ذَلِكَ يَوْمٌ فِي كُلِّ سَنَةٍ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ: كَذَبَ كَعْبٌ، قُلْتُ: ثُمَّ قَرَأَ كَعْبٌ، فَقَالَ: صَدَقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: هُوَ فِي كُلِّ جُمُعَةٍ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: صَدَقَ كَعْبٌ إِنِّي لَأَعْلَمُ تِلْكَ السَّاعَةَ، فَقُلْتُ: يَا أَخِي، حَدِّثْنِي بِهَا، قَالَ: هِيَ آخِرُ سَاعَةٍ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ قَبْلَ أَنْ تَغِيبَ الشَّمْسُ، فَقُلْتُ: أَلَيْسَ قَدْ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا يُصَادِفُهَا مُؤْمِنٌ وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ، وَلَيْسَتْ تِلْكَ السَّاعَةَ صَلَاةٌ، قَالَ: أَلَيْسَ قَدْ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ صَلَّى، وَجَلَسَ يَنْتَظِرُ الصَّلَاةَ لَمْ يَزَلْ فِي صَلَاتِهِ حَتَّى تَأْتِيَهُ الصَّلَاةُ الَّتِي تُلَاقِيهَا، قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: فَهُوَ كَذَلِكَ»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ كێوی طور كەعبم لەوێ بینی، من و ئەو ڕۆژێک ماینەوە پێكەوە فەرموودەم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆ گێڕایەوە، ئەویش دەربارەی تەورات قسەی بۆ دەكردم، پێم وت: پێغەمبەری خوا ﷺ**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٠٤٦، والترمذي: ٤٩١.




فەرموویەتی: چاکترین ڕۆژ خۆری تێدا هەڵهاتبێ ڕۆژی هەینیە، ئادەم لەو ڕۆژەدا لە دایک بووەو لەو ڕۆژەشدا هێنراوەتە خوارەوە (بۆ سەر زەوی)و، لەو ڕۆژەشدا تەوبەی لێ وەرگیراوەو، لەو ڕۆژەشدا ڕوحی کێشراوەو، لەو ڕۆژەشدا قیامەت دا دێت، هیچ گیانلەبەرێک نیە لەسەر زەوی ئیللا ڕۆژی هەینی بەیانی دەکاتەوە دەترسێ لەوەی قیامەت بەرپا بێت تا خۆر دەردەچێت، جگە لە نەوەی ئادەم، کاتێکی تێدایە بەندەی بڕوادار لە نوێژدا بێت و داوا لە خوا بکات تیایدا ئیللا خوا پێی دەبەخشێ، کەعب وتی: ئەوە ڕۆژێکە لە هەموو ساڵێکدا، وتی: بەڵکو لە هەموو هەینیەک، کەعب تەوراتی خوێندەوە، پاشان وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستی فەرموو: ئەوە لە نوێژی هەینیدایە، دواتر دەرچووم گەیشتم بە بەصرەی کوڕی بەصرەی غیفاری، وتی: لە کوێوە هاتووی؟ وتم: لە کێوی طور، وتی: ئەگەر پێت بگەشتمایە پێش ئەوەی بچوایەی بۆ ئەوێ ئەوە نەدەچووی، پێم وت: بۆچی؟ وتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: بارگە ناپێچرێتەوە (بۆ هیچ مزگەوتێک بە نیازی خێرو پاداشت) مەگەر بۆ سێ مزگەوت، مزگەوتی حەرام، مزگەوتی خۆم، مزگەوتی بەیتولمەقدیس، دواتر گەیشتم بە عەبدوڵڵای کوڕی سەلام پێم وت: خۆزگە دەمتبینی ڕۆیشتم بۆ کێوی طور گەیشتم بە کەعب، من و ئەو ڕۆژێک ماینەوە، فەرموودەی پێغەمبەرم بۆی باس دەکرد، ئەویش دەربارەی تەورات قسەی بۆ دەکردم، پێم وت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترین ڕۆژ خۆری تێدا هەڵهاتبێت ڕۆژی هەینیە، ئادەم لەو ڕۆژەدا لە دایک بووەو، لەو ڕۆژەشدا هێنراوەتە خوارەوەو، لەو ڕۆژەشدا تەوبەی لێ وەرگیراوە، لەو ڕۆژەشدا ڕوحی کێشراوەو، لەو ڕۆژەشدا قیامەت دێت، هیچ گیانلەبەرێک نیە لەسەر زەوی ئیللا ڕۆژی هەینی بەیانی دەکاتەوە دەترسێ لەوەی قیامەت بەرپا بێت هەتا خۆر دەردەچێت، جگە لە نەوەی ئادەم، کاتێکی تێدایە بەندەی بڕوادار لە نوێژدا بێت و داوا لە خوا بکات تیایدا ئیللا خوا پێی دەبەخشێ، کەعب وتی: ئەوە ڕۆژێکە لە هەموو ساڵێکدا، عەبدوڵڵای کوڕی سەلام وتی: کەعب ڕاستی نەکردوە، وتم پاشان کەعب خوێندیەوە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستی فەرموو: ئەوە لە هەموو هەینیەک دایە، عەبدوڵڵا وتی: کەعب ڕاستی کرد، من ئەو کاتەش دەزانم، وتم: ئەی برام پێم بڵێ، وتی: کۆتا کاتی ڕۆژی هەینیە، پێش ئەوەی خۆر ئاوا ببێت،




**منیش وتم: ئایا نەتبیستووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەندەی بڕوادار ڕێک بێتەوە لەگەڵی لەو کاتەدا لە نوێژدا بێت، ئەو کاتەش کاتی نوێژ نەبێ، (ئەویش وتی) ئایا نەتبیستووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس نوێژ بکات و دابنیشێ چاوەڕوانی نوێژ بکات بەردەوام لە نوێژدایە تا کاتی ئەو نوێژە دێت کە بە دوایدا دێت، وتم: وایە، وتی: بێگومان بەو شێوەیە.**

**١٤٣١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ فِي الْجُمُعَةِ سَاعَةً لَا يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ يَسْأَلُ اللَّهَ فِيهَا شَيْئاً إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی هەینیدا کاتێک هەیە بەندەی مسوڵمان تیایدا داوای شتێک لە خوا بکات هەر پێی دەبەخشێ.**

**١٤٣٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ ﷺ: إِنَّ فِي الْجُمُعَةِ سَاعَةً لَا يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ قَائِمٌ يُصَلِّي يَسْأَلُ اللَّهَ ﷻ شَيْئاً إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: باوکی قاسم ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی هەینیدا کاتژمێرێک هەیە بەندەی مسوڵمان تیایدا نوێژ بکات و داوای شتێک لە خوا بکات هەر پێی دەبەخشێ.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٩٤ و ٦٤٠٠، ومسلم: ٨٥٢/١٤، وإبن ماجه: ١١٣٧.




**١٤٣٣-** «عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ، قَالَ: قُلْتُ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ: ﴿ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ ﴿١٠١﴾ ﴾النساء، فَقَدْ أَمِنَ النَّاسُ، فَقَالَ عُمَرُ: عَجِبْتُ مِمَّا عَجِبْتَ مِنْهُ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللَّهُ بِهَا عَلَيْكُمْ فَاقْبَلُوا صَدَقَتَهُ»[1].

**واتە: ئەبو یەعلای کوڕی ئومەیە دەڵێ: بە عومەری کوڕی خەطابم ﷺ وت: (خوا ﷻ فەرموویەتی): ﴿ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ ﴿١٠١﴾ ﴾، (واتە: هەر کاتێک سەفەرتان کرد بە زەویدا ئەوە هیچ گوناهتان لەسەر نیە کە هەندێ لە نوێژەکان کورت بکەنەوە ئەگەر ترسان ئەوانەی بێبڕوان جەنگتان لەگەڵ بکەن. بێگومان ئێستا خەڵکی لە ئاسایشدایە (ئیتر بۆ نوێژ کورت دەکەنەوە)، عومەر ﷺ وتی: منیش سەرم سوڕما لەوەی تۆ سەرت پێی سوڕما، پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەوە، فەرمووی: بەخشێکی خوایە بەخشیوەتی پێتان بەخشەکە وەربگرن.**

**١٤٣٤-** «عَنْ أُمَيَّةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ خَالِدٍ أَنَّهُ قَالَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: إِنَّا نَجِدُ صَلَاةَ الْحَضَرِ، وَصَلَاةَ الْخَوْفِ فِي الْقُرْآنِ، وَلَا نَجِدُ صَلَاةَ السَّفَرِ فِي الْقُرْآنِ، فَقَالَ لَهُ ابْنُ عُمَرَ: يَا ابْنَ أَخِي، إِنَّ اللَّهَ ﷻ بَعَثَ إِلَيْنَا مُحَمَّداً ﷺ وَلَا نَعْلَمُ شَيْئاً، وَإِنَّمَا نَفْعَلُ كَمَا رَأَيْنَا مُحَمَّداً ﷺ يَفْعَلُ»[2].

**واتە: ئومەیەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی خالید بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەری (خوا لێیان ڕازی بێ) وت: ئێمە نوێژی نیشتەجێ و نوێژی ترس بەدی دەکەین لە قورئاندا، بەڵام نوێژی گەشت (سَّفَر) بەدی ناکەین لە قورئاندا، ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) پێی وت: ئەی کوڕی برام، خوا ﷻ موحەممەدی بۆمان نارد هیچمان نەدەزانی، بێگومان ئەو کردەوەی ئەو بیکات ئێمەش دەیکەین.**

**١٤٣٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ مِنْ مَكَّةَ إِلَى الْمَدِينَةِ لَا يَخَافُ إِلَّا رَبَّ الْعَالَمِينَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ»[3].

---

**(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٨٦، وأبو داود: ١١٩٩ و ١٢٠٠، والترمذي: ٣٠٣٤، وإبن ماجه: ١٠٦٥.**

**(٢) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٠٦٦.**

**(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٥٤٧.**

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو لە مەککە بۆ مەدینە لە کەس نەدەترسا جگە لە پەروەردگاری جیهانییان نەبێت، (کەچی) دوو ڕکات نوێژی کرد، (واتە: مسوڵمانان ترسیشیان لەسەر نەبوو، کەچی لە سەفەردا هەر نوێژی کورت دەکردەوە).

**١٤٣٦-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كُنَّا نَسِيرُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةَ لَا نَخَافُ إِلَّا اللَّهَ ﷻ نُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئێمە لە نێوانی مەککەو مەدینەدا دەڕۆیشتین لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەترساین مەگەر لە خوای زاڵی پایەدار، دوو ڕکات نوێژمان دەکرد.

**١٤٣٧-** «عَنِ ابْنِ السِّمْطِ، قَالَ: رَأَيْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ يُصَلِّي بِذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: إِنَّمَا أَفْعَلُ كَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَفْعَلُ»[٢].

واتە: ئیبنو سەمط دەڵێ: عومەری کوڕی خەطابم ﷺ بینی (لە سەفەری حەج) لە (ذِي الْحُلَيْفَة) دوو ڕکات نوێژی کرد، پرسیاری ئەوەم لێکرد، وتی: بێگومان ئەوەی بینیومە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کردوویەتی، (منیش) ئەوە دەکەم.

**١٤٣٨-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ فَلَمْ يَزَلْ يَقْصُرُ حَتَّى رَجَعَ فَأَقَامَ بِهَا عَشْراً»[٣].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووم لە مەدینە بۆ مەککە بەردەوام نوێژی کورت دەکردەوە تا گەڕایەوە دە ڕۆژ لەوێ مایەوە.

**١٤٣٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ، وَمَعَ أَبِي بَكْرٍ رَكْعَتَيْنِ، وَمَعَ عُمَرَ رَكْعَتَيْنِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٢/١٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٨١ و ٤٢٩٧، ومسلم: ٦٩٣، وأبو داود: ١٢٣٣، وإبن ماجه: ١٠٧٧.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٨٤ و ١٦٥٧، ومسلم: ٦٩٥، وأبو داود: ١٩٦٠.

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتدا دوو ڕکات نوێژی (فەڕزم) کرد، لەگەڵ ئەبو بەکریش دوو ڕکات، لەگەڵ عومەریش دوو ڕکات (خوا لێیان ڕازی بێ).**

**١٤٤٠-** «عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ: صَلَاةُ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَانِ، وَالْفِطْرُ رَكْعَتَانِ، وَالنَّحْرُ رَكْعَتَانِ، وَالسَّفَرُ رَكْعَتَانِ تَمَامٌ غَيْرُ قَصْرٍ، عَلَى لِسَانِ النَّبِيِّ ﷺ»(١).

**واتە: عومەر ﷺ دەڵێ: نوێژی هەینی دوو ڕکاتەو نوێژی جەژنی (ڕەمەزان) دوو ڕکاتەو نوێژی (جەژنی) قوربان دوو ڕکاتەو نوێژی گەشتیش دوو ڕکاتە، تەواوە بەبێ کورت کردنەوە، لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ.**

**١٤٤١-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: فُرِضَتْ صَلَاةُ الْحَضَرِ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّكُمْ ﷺ أَرْبَعاً، وَصَلَاةُ السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ، وَصَلَاةُ الْخَوْفِ رَكْعَةً»(٢).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: نوێژی نیشتەجێ فەڕز کراوە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەتان ﷺ بە چوار ڕکات، هەروەها نوێژی گەشت (سەفەر) یش بە دوو ڕکات و نوێژی ترسیش بە یەک ڕکات.**

**١٤٤٢-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ فَرَضَ الصَّلَاةَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّكُمْ ﷺ، فِي الْحَضَرِ أَرْبَعاً، وَفِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ، وَفِي الْخَوْفِ رَكْعَةً»(٣).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: بێگومان خوای زاڵی پایەدار نوێژی فەڕز کردوە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەتان ﷺ لە کاتی نیشتەجێ بووندا چوار ڕکات، لە گەشتدا دوو ڕکات، لە ترسیشدا یەک ڕکات.**

## بابەت: نوێژ کردن لە مەککە

**١٤٤٣-** «عَنْ مُوسَى وَهُوَ ابْنُ سَلَمَةَ، قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: كَيْفَ أُصَلِّي بِمَكَّةَ إِذَا لَمْ أُصَلِّ فِي جَمَاعَةٍ؟ قَالَ: رَكْعَتَيْنِ سُنَّةَ أَبِي الْقَاسِمِ ﷺ»(٤).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**واتە: موسای كوڕی سەلەمە وتی: بە ئیبنو عەبباسم (خوا لێیان ڕازی بێ) وت: چۆن لە مەككە نوێژ بكەم، ئەگەر بە كۆمەڵ نوێژم نەكرد؟ وتی: دوو ڕكات بكە، سوننەتی ئەبو قاسمە ﷺ.**

**١٤٤٤-** «عَن مُوسَى بْنَ سَلَمَةَ قالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قُلْتُ: تَفُوتُنِي الصَّلَاةُ فِي جَمَاعَةٍ وَأَنَا بِالْبَطْحَاءِ، مَا تَرَى أَنْ أُصَلِّيَ؟ قَالَ: رَكْعَتَيْنِ سُنَّةَ أَبِي الْقَاسِمِ ﷺ»[1].

**واتە: موسای كوڕی سەلەمە دەڵێ: پرسیارم كرد لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) وتم: نوێژی بە كۆمەڵم لە دەست دەچێت من لە (الْبَطْحَاء)م: (جێگایەكی نەرمی فراوانە لم و زیخی تێدایە بۆ پشوودان گونجاوە كە لە نێوان مەككەو مینادایە)، پێت وایە چۆن نوێژ بكەم؟ وتی: دوو ڕكات نوێژ بكە لەسەر سوننەتی ئەبو قاسم ﷺ.**

## بابەت: نوێژ كردن لە مینا

**١٤٤٥-** «عَنْ حَارِثَةَ بْنِ وَهْبٍ الْخُزَاعِيِّ رضي الله عنه قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِمِنًى آمَنَ مَا كَانَ النَّاسُ وَأَكْثَرَهُ رَكْعَتَيْنِ»[2].

**واتە: حارسی كوڕی وەهەبی خوزاعی رضي الله عنه دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕكات نوێژم كرد لە مینا، خەڵكی لەوپەڕی ئاسایش و لەوپەڕی زۆریدا بوون.**

**١٤٤٦-** «عَنْ حَارِثَةَ بْنِ وَهْبٍ رضي الله عنه قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمِنًى أَكْثَرَ مَا كَانَ النَّاسُ وَآمَنَهُ رَكْعَتَيْنِ»[3].

**واتە: حاریثی كوڕی وەهەب رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆ كردین لە مینا، خەڵكی لەوپەڕی ئاسایشدا بوون، زۆربەی نوێژەكان دوو ڕكات بوون.**

**١٤٤٧-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه أَنَّهُ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِمِنًى، وَمَعَ أَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ رَكْعَتَيْنِ، وَمَعَ عُثْمَانَ رَكْعَتَيْنِ صَدْراً مِنْ إِمَارَتِهِ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٨٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٨٣ و ١٦٥٦، ومسلم: ٦٩٦/٢١، وأبو داود: ١٩٦٥، والترمذي: ٨٨٢.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩٦٥، وإبن ماجه: ١٠٧٦.

(٤) صحيح.





**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژم کرد لە مینا، هەروەها لەگەڵ ئەبو بەکرو عومەرو، ماوەیەکیش لە سەرەتای خیلافەتی عوسمانیشدا (هەر دوو ڕکات بوو لە سەفەردا).**

**١٤٤٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ بِمِنًى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ رَكْعَتَيْنِ»[1].

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە مینا دوو ڕکات نوێژمان کرد.**

**١٤٤٩-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، قَالَ: صَلَّى عُثْمَانُ ﷺ بِمِنًى أَرْبَعاً حَتَّى بَلَغَ ذَلِكَ عَبْدَ اللَّهِ، فَقَالَ: لَقَدْ صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ رَكْعَتَيْنِ»[2].

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی یەزید دەڵێ: عوسمان ﷺ لە مینا چوار ڕکات نوێژی کرد، ئەو هەواڵە گەیشت بە عەبدوڵڵا، (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ) وتی: بە دڵنیایی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکات نوێژم کرد.**

**١٤٥٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ، وَمَعَ أَبِي بَكْرٍ رَكْعَتَيْنِ، وَمَعَ عُمَرَ رَكْعَتَيْنِ»[3].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لە مینا نوێژم کرد بە دوو ڕکات، هەروەها لەگەڵ ئەبو بەکریش دوو ڕکات، وە لەگەڵ عومەریش دوو ڕکات.**

**١٤٥١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ، وَصَلَّاهَا أَبُو بَكْرٍ رَكْعَتَيْنِ، وَصَلَّاهَا عُمَرُ رَكْعَتَيْنِ، وَصَلَّاهَا عُثْمَانُ صَدْراً مِنْ خِلَافَتِهِ»[4].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مینا بە دوو ڕکات نوێژی کرد، ئەبو بەکریش بە دوو ڕکات و عومەریش بە دوو ڕکات، هەروەها عوسمانیش ماوەیەک لە سەرەتای خیلافەتەکەیدا بە دوو ڕکاتی کرد.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٨٤ و ١٦٥٧، ومسلم: ٦٩٥، وأبو داود: ١٩٦٠.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٨٢، ومسلم: ١ و ١٧ و ٦٩٤/١٨.

(٤) صحيح.




## بابەت: مانەوە لەو شوێنەی كە نوێژی تێدا كورت دەكرێتەوە

**١٤٥٢-** «عَنْ يحيى بن أبي إسحاق عن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَكَانَ يُصَلِّي بِنَا رَكْعَتَيْنِ حَتَّى رَجَعْنَا، قُلْتُ: هَلْ أَقَامَ بِمَكَّةَ؟ قَالَ: نَعَمْ، أَقَمْنَا بِهَا عَشْراً»(١).

**واتە: یەحیای كوڕی ئەبو ئیسحاق دەگێڕێتەوە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین لە مەدینەوە بۆ مەككە، نوێژی بۆ كردین بە دوو ڕكات تا گەڕاینەوە، وتم: ئایا لە مەككە مایەوە؟ وتی: بەڵێ، دە ڕۆژ ماینەوە.**

**١٤٥٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَقَامَ بِمَكَّةَ خَمْسَةَ عَشَرَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، رَكْعَتَيْنِ»(٢).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ پازدە ڕۆژ لە مەككە مایەوە نوێژەكانی دەكرد بە دوو ڕكات، دوو ڕكات.**

**١٤٥٤-** «عَنِ الْعَلَاءِ بْنَ الْحَضْرَمِيِّ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَمْكُثُ الْمُهَاجِرُ بَعْدَ قَضَاءِ نُسُكِهِ ثَلَاثاً»(٣).

**واتە: عەلائی كوڕی حەضرەمی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كۆچكەر (واتە: ئەوكەسەی كە خەڵكی مەككە بووە و كۆچی كردوە بۆ مەدینە لە پێناوی خوادا) لەدوای قوربانی كردنی با سێ ڕۆژ بمێنێتەوە (لەم فەرموودە ئەوەی تێدایە ئەگەر چوار ڕۆژ مایەوە دەبێتە نیشتەجێ، جا بۆی نیە بە نیشتەجێی لە مەككە بمێنێتەوە دوای ئەوەی كۆچی لێ كردوە لە پێناوی خوادا).**

**١٤٥٥-** «عَنْ الْعَلَاءِ بْنِ الْحَضْرَمِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: يَمْكُثُ الْمُهَاجِرُ بِمَكَّةَ بَعْدَ نُسُكِهِ ثَلَاثاً»(٤).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٢٣١، وإبن ماجه: ١٠٧٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩٣٣، ومسلم: ٤٤١ و ١٣٥٢/٤٤٤، وأبو داود: ٢٠٢٢، والترمذي: ٩٤٩، وإبن ماجه: ١٠٧٣.

(٤) صحيح.

**واتە: عەلائی كوڕی حەضرەمی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: كۆچكەر (واتە: ئەوكەسەی كە خەڵكی مەككە بووە و كۆچی كردوە بۆ مەدینە لە پێناوی خوادا) لەدوای قوربانی كردنی با سێ ڕۆژ لە مەككە بمێنێتەوە (لەم فەرموودە ئەوەی تێدایە ئەگەر چوار ڕۆژ مایەوە دەبێتە نیشتەجێ، جا بۆی نیە بە نیشتەجێی لە مەككە بمێنێتەوە دوای ئەوەی كۆچی لێ كردوە لە پێناوی خوادا).**

**١٤٥٦-** «عَنْ عَائِشَةَ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا،أَنَّهَا اعْتَمَرَتْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ حَتَّى إِذَا قَدِمَتْ مَكَّةَ، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي قَصَرْتَ، وَأَتْمَمْتُ، وَأَفْطَرْتَ، وَصُمْتُ، قَالَ: أَحْسَنْتِ يَا عَائِشَةُ، وَمَا عَابَ عَلَيَّ»[1].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: ئەو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ عومرەی كرد لە مەدینە بۆ مەككە تا كاتێ گەیشتە مەككە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، دایك و باوكم بە قوربانت بێ، نوێژت كورت كردەوە، من بە تەواوی كردم، ڕۆژووت نەگرت من گرتم، فەرمووی: چاكت كرد ئەی عائیشە، ڕەخنەی لێ نەگرتم.**

## وازهێنان لە نوێژی سوننەت لە گەشت (سەفەر)دا

**١٤٥٧-** «عَن وَبَرَةُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا لَا يَزِيدُ فِي السَّفَرِ عَلَى رَكْعَتَيْنِ، لَا يُصَلِّي قَبْلَهَا، وَلَا بَعْدَهَا، فَقِيلَ لَهُ: مَا هَذَا؟ قَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَصْنَعُ»[2].

**واتە: وەبەرەی كوڕی عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: ئیبنو عومەر(خوا لێیان ڕازی بێ) لە دوو ڕكات نوێژی فەڕز زیاتری نەدەكرد لە گەشتدا، نە لە پێشەوەی نوێژ نە لە دوای نوێژ، پێی وترا: ئەمە چیە بۆ سوننەتەكان ناكەی؟ وتی: بەم شێوەیە پێغەمبەرم ﷺ بینیوە كردوویەتی.**

**١٤٥٨-** «عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فِي سَفَرٍ، فَصَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى طِنْفِسَةٍ لَهُ فَرَأَى قَوْماً يُسَبِّحُونَ، قَالَ: مَا يَصْنَعُ هَؤُلَاءِ؟ قُلْتُ:

---

(١) منكر.

(٢) صحيح لغيره.




يُسَبِّحُونَ، قَالَ: لَوْ كُنْتُ مُصَلِّياً قَبْلَهَا أَوْ بَعْدَهَا لَأَتْمَمْتُهَا، صَحِبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَكَانَ لَا يَزِيدُ فِي السَّفَرِ عَلَى الرَّكْعَتَيْنِ، وَأَبَا بَكْرٍ حَتَّى قُبِضَ، وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ كَذَلِكَ»[1] .

**واتە: حەفصی کوڕی عاصم دەڵێ: من لەگەڵ ئیبنو عومەر بووم (خوا لێیان ڕازی بێ) لە گەشتێکدا، دوو ڕکات نوێژی نیوەڕۆو عەسری کرد، پاشان هەڵسا ڕۆیشت بۆ لای ڕاخەرەکەی خەڵکێکی بینی نوێژی سوننەتیان دەکرد، وتی: ئەوانە چی دەکەن؟ وتم: نوێژی سوننەت دەکەن، وتی: ئەگەر لە پێش فەڕزەکە یان لە دوای فەڕزەکە نوێژم بکردایە ئەوە فەڕزەکەم تەواو دەکرد، هاوەڵیەتی پێغەمبەری خوام ﷺ کردوە لە گەشت کردنیدا دوو ڕکات زیاتری نەدەکرد، هەروەها ئەبو بەکریش تا مرد، وە عومەرو عوسمانیش بەهەمان شێوە (خوا لێیان ڕازی بێت).**

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٠١ و ١١٠٢، ومسلم: ٨ و ٦٨٩/٩، وأبو داود: ١٢٢٣، وإبن ماجه: ١٠٧١.




## خۆر گیران و مانگ گیران

**١٤٥٩-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ تَعَالَى لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنَّ اللَّهَ ﷻ يُخَوِّفُ بِهِمَا عِبَادَهُ»[1].

**واتە: ئەبو بەكرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەكانی خوا لەبەر مردن و ژیانی هیچ كەسێک ناگیرێن، بەڵام خوا ﷻ بەندەكانی خۆی پێ دەترسێنێت.**

## (سبحان الله) كردن و (الله أكبر) كردن و پاڕانەوە لە كاتی خۆر گیران

**١٤٦٠-** «عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: بَيْنَا أَنَا أَتَرَامَى بِأَسْهُمٍ لِي بِالْمَدِينَةِ إِذْ انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَجَمَعْتُ أَسْهُمِي، وَقُلْتُ: لَأَنْظُرَنَّ مَا أَحْدَثَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ، فَأَتَيْتُهُ مِمَّا يَلِي ظَهْرَهُ، وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ فَجَعَلَ يُسَبِّحُ، وَيُكَبِّرُ، وَيَدْعُو حَتَّى حُسِرَ عَنْهَا، قَالَ: ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ»[2].

**واتە: عەبدورڕەحمانی كوڕی سەموڕە ﷺ دەڵێ: لە كاتێكدا بە تیر نیشانەم دەشكاند لە مەدینە لە ناكاو خۆر گیرا، تیرەكانم كۆكردەوەو وتم: دەچم بزانم پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەكات دەربارەی خۆر گیران، كە هاتم پشتی لە من بوو، ئەو لە مزگەوت بوو تەسبیح و تەكبیری دەكردو دەپاڕایەوە تا مانگ گیرانەكە نەما، پاشان هەڵسا دوو ڕكات نوێژی كردو چوار سوژدەی تێدا برد.**

## فەرمان كردن بە نوێژ لە كاتی خۆر گیران

**١٤٦١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ تَعَالَى، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَصَلُّوا»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٥ و ٢٦ و ٩١٣/٢٧، وأبو داود: ١١٩٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٤٢ و ٣٢٠١، ومسلم: ٩١٤.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی خۆرو مانگ، لەبەر مردن و ژیانی هیچ کەسێک ناگیرێن، بەڵکو دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا ﷻ، جا ئەگەر بینیتان ئەوە نوێژ بکەن.

## بابەت: فەرمان کردن بە نوێژ لە کاتی مانگ گیراندا

**١٤٦٢-** «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ، وَلَكِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ ﷻ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَصَلُّوا»[١].

واتە: ئەبو مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی خۆرو مانگ لەبەر مردنی هیچ کەسێک ناگیرێن، بەڵکو دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا ﷻ، ئەگەر بینیتان ئەوە نوێژ بکەن.

## بابەت: فەرمان کردن بە نوێژ لە کاتی خۆر گیران و مانگ گیران تا هەڵدێن

**١٤٦٣-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ ﷻ، وَإِنَّهُمَا لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَصَلُّوا حَتَّى تَنْجَلِيَ»[٢].

واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا ﷻ، لەبەر مردن و ژیانی هیچ کەسێک ناگیرێن، کاتێ بینیتان (گیراون) نوێژ بکەن هەتا هەڵدێن.

**١٤٦٤-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا جُلُوساً مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَكَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَوَثَبَ يَجُرُّ ثَوْبَهُ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى انْجَلَتْ»[٣].

واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین خۆر گیرا، پێغەمبەر ﷺ بە پەلە هات پۆشاکەکەی لە دوای خۆی ڕادەکێشا، دوو ڕکات نوێژی کرد تا دەرکەوت.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٤١ و ١٠٥٧ و ٣٢٠٤، ومسلم: ٢١ و ٩١١/٢٣، وابن ماجه: ١٢٦١.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




## بابەت: فەرمان کردن بە بانگدان بۆ نوێژی خۆر گیران

**١٤٦٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ مُنَادِياً يُنَادِي: أَنِ الصَّلَاةَ جَامِعَةً، فَاجْتَمَعُوا وَاصْطَفُّوا، فَصَلَّى بِهِمْ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي رَكْعَتَيْنِ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە بانگدەر بانگ بدات: (الصَّلَاةَ جَامِعَةً) واتە: بێگومان نوێژ کۆکەرەوەیە، خەڵکەکە کۆبوونەوەو ڕیزیان بەست، نوێژی بۆ کردن لە دوو ڕکاتدا چوار ڕکوعی برد لەگەڵ چوار سوژدە.**

## بابەت: ڕیزەکان لە نوێژی خۆرگیراندا

**١٤٦٦-** «عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ فِي حَيَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَقَامَ فَكَبَّرَ، وَصَفَّ النَّاسُ وَرَاءَهُ، فَاسْتَكْمَلَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ، وَانْجَلَتِ الشَّمْسُ قَبْلَ أَنْ يَنْصَرِفَ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ، دەڵێ: لە ژیانی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆر گیرا پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ مزگەوت، هەڵساو تەکبیری کردو نوێژی دابەست، خەڵکەکەش لە پشتیەوە ڕیزیان بەست، چوار ڕکوعی تەواو کرد لەگەڵ چوار سوژدەدا، ئینجا خۆر هەڵهات، پێش ئەوەی نوێژەکە تەواو بکات.**

## بابەت: چۆنیەتی نوێژی خۆر گیران و مانگ گیران

**١٤٦٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى عِنْدَ كُسُوفِ الشَّمْسِ ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ، وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) شاذ. أخرجه مسلم: ٩٠٩، وأبو داود: ١١٨٣، والترمذي: ٥٦٠.

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی خۆر گیران (دوو ڕکات) نوێژی کرد هەشت ڕکوع و چوار سوژدەی تێدا برد.

**١٤٦٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ صَلَّى فِي كُسُوفٍ فَقَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ سَجَدَ، وَالْأُخْرَى مِثْلُهَا»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ نوێژی خۆر گیرانی کرد (لە نوێژەکەیدا)، قورئانی خوێند، پاشان ڕکوعی برد، پاشان قورئانی خوێند، پاشان ڕکوعی برد، پاشان (جارێکی تر هەڵسایەوە) قورئانی خوێند، پاشان ڕکوعی برد، پاشان قورئانی خوێند، پاشان ڕکوعی برد، پاشان سوژدەی برد، ڕکاتەکەی تریش بەو شێوەیە.

## جۆرێکی تر لە نوێژی خۆر گیران و مانگ گیران لە ئیبنو عەبباس

**١٤٦٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى يَوْمَ كَسَفَتِ الشَّمْسُ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي رَكْعَتَيْنِ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خۆر گیران دوو ڕکات نوێژی کرد، تیایدا چوار ڕکوعی برد، لەگەڵ چوار سوژدە.

## جۆرێکی تر لە نوێژی خۆرگیران و مانگ گیران

**١٤٧٠-** «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ سَمِعْتُ عُبَيْد بْنَ عُمَيْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي مَنْ أُصَدِّقُ، «فَظَنَنْتُ أَنَّهُ يُرِيدُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا»، أَنَّهَا قَالَتْ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَامَ بِالنَّاسِ قِيَاماً شَدِيداً، يَقُومُ بِالنَّاسِ، ثُمَّ يَرْكَعُ، ثُمَّ يَقُومُ، ثُمَّ يَرْكَعُ، ثُمَّ يَقُومُ، ثُمَّ يَرْكَعُ، فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ ثَلَاثَ رَكَعَاتٍ، رَكَعَ الثَّالِثَةَ، ثُمَّ سَجَدَ حَتَّى إِنَّ رِجَالاً يَوْمَئِذٍ يُغْشَى عَلَيْهِمْ، حَتَّى إِنَّ

---

(١) شاذ.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: بإثر ١٠٤٦ تعليقاً، ومسلم: ٩٠٢، وأبو داود: ١١٨١.

ـجَالَ الْمَاءِ لَتُصَبُّ عَلَيْهِمْ مِمَّا قَامَ بِهِمْ، يَقُولُ إِذَا رَكَعَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَلَمْ يَنْصَرِفْ حَتَّى تَجَلَّتِ الشَّمْسُ، فَقَامَ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَقَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنْ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ يُخَوِّفُكُمْ بِهِمَا، فَإِذَا كَسَفَا فَافْزَعُوا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ ﷻ حَتَّى يَنْجَلِيَا»[١].

واته: عەطاء دەڵێ: گوێم لێ بوو، عوبەیدوڵڵای کوڕی عومەیر دەڵێ: بۆی باس کردم ئەو کەسەی بەڕاستی دەزانم، «گومانم برد مەبەستی پێی عائیشە بێت خوا لێی ڕازی بێ»، ئەو وتی: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆر گیرا، خەڵکی هەڵسان بۆ نوێژ بە شێوەیەکی تەواو، پاشان ڕکوعی برد، پاشان هەڵسا، پاشان ڕکوعی برد، پاشان هەڵسا، پاشان ڕکوعی برد، دوو ڕکاتی کرد لە هەر ڕکاتێکدا سێ ڕکوعی برد، پاشان سوژدەی برد، پاشان سوژدەی برد تا پیاوانێک لەو ڕۆژەدا بێ هۆش بوون، تەنانەت بە دۆڵکە ئاویان دەکرد بەسەریاندا بە هۆی ئەو هەموو وەستانەیان لە نوێژدا، کاتێ بچوایتە ڕکوع دەیوت: (الله أكبر)، وە کاتێ سەری بەرز بکردایەتەوە: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَه) جا نوێژەکەی تەواو نەکرد تا خۆر دەرکەوت، ئینجا هەڵسا سوپاس و ستایشی خوای کردو فەرمووی: بە دڵنیایی خۆرو مانگ لەبەر مردن و ژیانی هیچ کەسێک ناگیرێن، بەڵکو دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، (خوا) دەتان ترسێنێ پێیانەوە، ئەگەر گیران بە ترسەوە بڕۆن بۆ یادی خوا ﷻ هەتا دەردەکەون.

**١٤٧١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى سِتَّ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ، قُلْتُ لِمُعَاذٍ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ؟ قَالَ: لَا شَكَّ وَلَا مِرْيَةَ»[٢].

واته: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ (دوو ڕکات) نوێژی کرد بە شەش ڕکوع و چوار سوژدە، بە موعازم وت: لە پێغەمبەرەوە ﷺ؟ وتی: بەبێ گومان و دوو دڵی.

---

(١) شاذ والمحفوظ عنها في كل ركعة ركوعان.

(٢) شاذ. أخرجه مسلم: ٩٠١، وأبو داود: ١١٧٧.




## جۆرێكی تر لە نوێژی خۆرگیران و مانگ گیران لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ)

**١٤٧٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ فِي حَيَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَامَ فَكَبَّرَ، وَصَفَّ النَّاسُ وَرَاءَهُ، فَاقْتَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قِرَاءَةً طَوِيلَةً، ثُمَّ كَبَّرَ فَرَكَعَ رُكُوعاً طَوِيلاً، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، ثُمَّ قَامَ فَاقْتَرَأَ قِرَاءَةً طَوِيلَةً هِيَ أَدْنَى مِنَ الْقِرَاءَةِ الْأُولَى، ثُمَّ كَبَّرَ فَرَكَعَ رُكُوعاً طَوِيلاً هُوَ أَدْنَى مِنَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ فَعَلَ فِي الرَّكْعَةِ الْأُخْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، فَاسْتَكْمَلَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ، وَانْجَلَتِ الشَّمْسُ قَبْلَ أَنْ يَنْصَرِفَ، ثُمَّ قَامَ فَخَطَبَ النَّاسَ، فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ ﷻ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ تَعَالَى لَا يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَصَلُّوا حَتَّى يُفْرَجَ عَنْكُمْ، وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: رَأَيْتُ فِي مَقَامِي هَذَا كُلَّ شَيْءٍ وُعِدْتُمْ، لَقَدْ رَأَيْتُمُونِي أَرَدْتُ أَنْ آخُذَ قِطْفاً مِنَ الْجَنَّةِ حِينَ رَأَيْتُمُونِي جَعَلْتُ أَتَقَدَّمُ، وَلَقَدْ رَأَيْتُ جَهَنَّمَ يَحْطِمُ بَعْضُهَا بَعْضاً حِينَ رَأَيْتُمُونِي تَأَخَّرْتُ، وَرَأَيْتُ فِيهَا ابْنَ لُحَيٍّ وَهُوَ الَّذِي سَيَّبَ السَّوَائِبَ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: خۆر گیرا لە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ، (پێغەمبەر ﷺ) هەڵساو تەكبیری كرد، خەڵكەكەش لە پشتیەوە ڕیزیان بەست، پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانێكی درێژی خوێند، پاشان تەكبیری كردو ڕكوعێكی درێژی برد، پاشان سەری بەرز كردەوە، فەرمووی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْد)، پاشان هەڵساو قورئانێكی درێژی خوێند كورتتر لە خوێندنی یەكەم، پاشان تەكبیری كردو ڕكوعێكی درێژی برد كورتتر لە ڕكوعی یەكەم، پاشان فەرمووی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْد) پاشان سوژدەی برد، پاشان لە ڕكاتەكەی تردا بە هەمان شێوەی كرد، چوار ڕكوعی تەواو كرد لەگەڵ چوار سوژدەدا، خۆر دەركەوت پێش ئەوەی تەواوی بكات، پاشان هەڵساو وتارێكی بۆ خەڵكەكەدا، ستایشی خوا ﷻی كرد بەوەی شیاویەتی، پاشان فەرمووی: بە دڵنیایی خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەكانی خوای بەرز لەبەر مردن و ژیانی هیچ كەسێك**

---

**(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٤٤ و ١٠٤٦ و ١٠٤٧ و ١٠٥٨ و ١٠٦٥ و ١٠٦٦ و ١٢١٢ و ٣٢٠٣ و ٤٦٢٤، ومسلم: ١ و ٩٠١/٥، وأبو داود: ١١٨٠ و ١١٨٧ و ١١٨٨ و ١١٩٠ و ١١٩١، والترمذي: ٥٦١ و ٥٦٣، وإبن ماجه: ١٢٦٣.**

**ناگیرێن، ئەگەر بینیتان نوێژ بکەن تا ترستان لەسەر هەڵگیرێ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لەم شوێنەمدا هەموو شتێکم پێ نیشاندرا کە پەیمانتان پێدراوە، کاتێ کە بینیتان چوومە پێشەوە، ئەوە ویستم بۆڵێک یان هێشویەک میوە لێ بکەمەوە لە بەهەشت، بێگومان کاتێکیش بینیتان هاتمە دواوە دۆزەخم بینی هەندێکی هەندێکی تری تێک دەشکاند، تێیدا ئیبنو لوحەیم بینی ئەو پیاوە یەکەم کەس بوو پەرستشی بتەکانی داهێنا لە مەککەو کردی بە ئاین و، خەڵکی بۆ لای (بتپەرستی) بانگ دەکرد.**

تێبینی: **وشەی (سائبة): بریتیە لەو وشترەی کە بۆ سواربوون بەکاریان نەهێناوەو لە لەوەڕو ئاویش ڕێگریان نەکردوە.**

**١٤٧٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَنُودِيَ: الصَّلَاةُ جَامِعَةٌ، فَاجْتَمَعَ النَّاسُ، فَصَلَّى بِهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي رَكْعَتَيْنِ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ»[1].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: خۆر گیرا لە سەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ بانگ کرا: (الصَّلَاةُ جَامِعَةٌ) واتە: نوێژ کۆکەرەوەیە، خەڵک کۆبوونەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژ بۆ کردن لە دوو ڕکاتدا چوار ڕکوعی برد لەگەڵ چوار سوژدە.**

**١٤٧٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالنَّاسِ، فَقَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ فَسَجَدَ، ثُمَّ فَعَلَ ذَلِكَ فِي الرَّكْعَةِ الْأُخْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ انْصَرَفَ وَقَدْ تَجَلَّتِ الشَّمْسُ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَا يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَادْعُوا اللَّهَ ﷻ وَكَبِّرُوا وَتَصَدَّقُوا، ثُمَّ قَالَ: يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، مَا مِنْ أَحَدٍ أَغْيَرُ مِنَ اللَّهِ ﷻ أَنْ يَزْنِيَ عَبْدُهُ أَوْ تَزْنِيَ أَمَتُهُ، يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ وَاللَّهِ لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيراً»[2].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح.**




واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆ خەڵکی کرد، هەڵساو هەڵسانەوەکەی درێژ کردەوە، پاشان چووە ڕکوع و ڕکوعەکەی درێژ کردەوە، پاشان هەڵساو هەڵسانەوەکەی درێژ کردەوە کورتتر لە هەڵسانەوەی یەکەم، پاشان ڕکوعی بردو ڕکوعەکەی درێژ کردەوە کورتتر لە ڕکوعی یەکەم، پاشان سوژدەی برد، پاشان لە ڕکاتەکەی دیکەدا بە هەمان شێوەی کرد، پاشان تەواوی کرد، خۆر دەرکەوتبوو، ئینجا وتاری بۆ خەڵکیدا، سوپاس و ستایشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: بێگومان خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا لەبەر مردن و ژیانی هیچ کەسێک ناگیرێن، ئەگەر ئەوەتان بینی داوا لە خوا ﷻ بکەن و تەکبیر بکەن و ببەخشن، پاشان فەرمووی: ئەی ئوممەتی موحەممەد، هیچ کەس ئەوەندەی خوا ﷻ تووڕە نابێ کاتێک ببینێ بەندەکەی زینا بکات، ئەی ئوممەتی موحەممەد سوێند بە خوا ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیایە کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان.

**١٤٧٥-** «عَنْ عَمْرَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا حَدَّثَتْهَا، أَنَّ يَهُودِيَّةً أَتَتْهَا فَقَالَتْ: أَجَارَكِ اللَّهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ النَّاسَ لَيُعَذَّبُونَ فِي الْقُبُورِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: عَائِذاً بِاللَّهِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ مَخْرَجاً فَخَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَخَرَجْنَا إِلَى الْحُجْرَةِ، فَاجْتَمَعَ إِلَيْنَا نِسَاءٌ، وَأَقْبَلَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَذَلِكَ ضَحْوَةً فَقَامَ قِيَاماً طَوِيلاً، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعاً طَوِيلاً، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَامَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ دُونَ رُكُوعِهِ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ قَامَ الثَّانِيَةَ، فَصَنَعَ مِثْلَ ذَلِكَ، إِلَّا أَنَّ رُكُوعَهُ وَقِيَامَهُ دُونَ الرَّكْعَةِ الْأُولَى، ثُمَّ سَجَدَ وَتَجَلَّتِ الشَّمْسُ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَعَدَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَقَالَ فِيمَا يَقُولُ: إِنَّ النَّاسَ يُفْتَنُونَ فِي قُبُورِهِمْ كَفِتْنَةِ الدَّجَّالِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: كُنَّا نَسْمَعُهُ بَعْدَ ذَلِكَ يَتَعَوَّذُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ»[١].

واتە: عەمرە دەگێڕێتەوە، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، بۆی باس کردوە، ئافرەتێکی جولەکە هات بۆ لای وتی: خوا بتپارێزێ لە سزای گۆڕ، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خەڵکی لە ناو گۆڕ سزا دەدرێن؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پەنا بە خوا (لە سزای ناو گۆڕ)، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بەلایەکدا، ئینجا خۆر گیرا، ئێمەش

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٤٩ و ١٠٥٠ و ١٠٥٥ و ١٠٥٦، ومسلم: ٩٠٣.




ڕۆیشتین بۆ ژوورەکە، کۆمەڵە ئافرەتێکمان لێ کۆبوونەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان: لە سەرەتای ڕۆژ کاتی چێشتەنگاو، نوێژی دابەست و وەستا (قورئانی خوێند) بە وەستانێکی دوورو درێژ، پاشان ڕکوعێکی درێژی برد، پاشان سەری بەرز کردەوەو وەستا کورتتر لە وەستانی پێشوو، پاشان ڕکوعی برد کورتتر لە ڕکوعی یەکەم، پاشان سوژدەی برد، پاشان جارێکیتر هەڵسایەوە، بە هەمان شێوەی پێشووی کرد، ئەوە نەبێ ڕکوع و وەستانی کورتتر بوو لە هی یەکەم، پاشان سوژدەی برد، خۆر دەرکەوت، کاتێ لێبوویەوە لەسەر مینبەرەکە دانیشت، لە (یەکێک لە) قسەکانیدا فەرمووی: بێگومان خەڵکی تووشی فیتنە دەبن لە گۆڕەکانیاندا وەکو فیتنەی دەجال، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئێمە دوای ئەوە دەمان بیست پەنای دەگرت لە سزای گۆڕ.

## جۆرێکی تر (لە نوێژی خۆرگیران و مانگ گیران)

**١٤٧٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا تَقُولُ: جَاءَتْنِي يَهُودِيَّةٌ تَسْأَلُنِي، فَقَالَتْ: أَعَاذَكِ اللَّهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، فَلَمَّا جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُعَذَّبُ النَّاسُ فِي الْقُبُورِ؟ فَقَالَ: عَائِذاً بِاللَّهِ، فَرَكِبَ مَرْكَباً «يَعْنِي» وَانْخَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَكُنْتُ بَيْنَ الْحُجَرِ مَعَ نِسْوَةٍ، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ مَرْكَبِهِ فَأَتَى مُصَلَّاهُ، فَصَلَّى بِالنَّاسِ فَقَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ قَامَ قِيَاماً أَيْسَرَ مِنْ قِيَامِهِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ أَيْسَرَ مِنْ رُكُوعِهِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَقَامَ أَيْسَرَ مِنْ قِيَامِهِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ أَيْسَرَ مِنْ رُكُوعِهِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَقَامَ أَيْسَرَ مِنْ قِيَامِهِ الْأَوَّلِ، فَكَانَتْ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ وَانْجَلَتِ الشَّمْسُ، فَقَالَ: إِنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي الْقُبُورِ كَفِتْنَةِ الدَّجَّالِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَسَمِعْتُهُ بَعْدَ ذَلِكَ يَتَعَوَّذُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ»[1].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئافرەتێکی جولەکە هات بۆ لام پرسیاری لێکردم، وتی: خوا بتپارێزێ لە سزای گۆڕ، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، خەڵکی لە ناو گۆڕ سزا دەدرێن؟ فەرمووی:

---

(١) صحيح.




پەنا بە خوا (لە سزای ناو گۆڕ)، ئینجا سواری وڵاخێک بوو، پاشان خۆر گیرا، منیش لە نێوان ژوورەکاندا بووم لەگەڵ چەند ئافرەتێکدا، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان لە وڵاخەکەی دابەزی و چووە شوێنی نوێژەکەی، نوێژی بۆ خەڵک دابەست وەستا (قورئانی خوێند) بە وەستانێکی دوورو درێژ، پاشان ڕکوعێکی دریژی برد، پاشان سەری بەرزکردەوە زۆر وەستا، پاشان ڕکوعی برد زۆر لە ڕکوع مایەوە، پاشان سەری بەرزکردەوە زۆر بە پێوە وەستا، پاشان سوژدەی برد زۆر لە سوژدەدا مایەوە، پاشان وەستا بە وەستانێک کورتتر لە وەستانی یەکەم، پاشان ڕکوعی برد کورتتر لە ڕکوعەکەی یەکەم، پاشان سەری بەرزکردەوە کورتتر لە وەستانی یەکەم، ڕکوع و سوژدەکانی بوون بە چوار ڕکوع و چوار سوژدە، پاشان خۆر دەرکەوت، ئینجا فەرمووی: بێگومان خەڵکی تووشی فیتنە دەبن لە ناو گۆڕەکانیاندا وەکو فیتنەی دەجال، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئێمە دوای ئەوە دەمان بیست پەنای دەگرت لە سزای گۆڕ.

**١٤٧٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى فِي كُسُوفٍ فِي صُفَّةِ زَمْزَمَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ (دوو ڕکات) نوێژی خۆر گیرانی کرد لە (صُفَّةُ زَمْزَمَ) چوار ڕکوع و چوار سوژدەی تێدا برد.**

**١٤٧٨-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي يَوْمٍ شَدِيدِ الْحَرِّ، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِأَصْحَابِهِ، فَأَطَالَ الْقِيَامَ حَتَّى جَعَلُوا يَخِرُّونَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ، ثُمَّ رَفَعَ فَأَطَالَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ، ثُمَّ رَفَعَ فَأَطَالَ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ قَامَ فَصَنَعَ نَحْواً مِنْ ذَلِكَ، وَجَعَلَ يَتَقَدَّمُ، ثُمَّ جَعَلَ يَتَأَخَّرُ فَكَانَتْ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ، كَانُوا يَقُولُونَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَخْسِفَانِ إِلَّا لِمَوْتِ عَظِيمٍ مِنْ عُظَمَائِهِمْ، وَإِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ يُرِيكُمُوهُمَا، فَإِذَا انْخَسَفَتْ فَصَلُّوا حَتَّى تَنْجَلِيَ»[٢].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆر گیرا لە ڕۆژێکی گەرمای سەختدا، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆ**

---

(١) صحيح دون ذكر الصفة فإنه شاذ.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٠٤، وأبو داود: ١١٧٩.




هاوەڵەکانی کرد، وەستانی نوێژی درێژ کردەوە تا خەریک بوو بە ڕوودا بکەونە سەر زەوی، پاشان ڕکوعی بردو درێژی کردەوە، پاشان هەڵسایەوەو درێژی کردەوە، پاشان ڕکوعی بردو درێژی کردەوە، پاشان هەڵسایەوەو درێژی کردەوە، پاشان دوو سوژدەی برد، پاشان هەڵسایەوەو وەکو ڕکاتەکەی پێشووی کرد، چووە پێشەوەو پاشان هاتە دواوە، چوار ڕکوعی بردو چوار سوژدەی برد، (پاشان فەرمووی) ئەوسا (پێشتر نەزانەکان) دەیانوت: خۆرو مانگ ناگیرێن مەگەر بۆ مردنی گەورەیەک لە گەورەکانیان، بێگومان خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا نیشانتان دەدات، ئەگەر گیرا، نوێژ بکەن هەتا دەردەکەوێ.

## جۆرێکی تر (لە نوێژی خۆرگیران و مانگ گیران)

**١٤٧٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَمَرَ فَنُودِيَ: الصَّلَاةُ جَامِعَةٌ، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالنَّاسِ رَكْعَتَيْنِ وَسَجْدَةً، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَسَجْدَةً »، قَالَتْ عَائِشَةُ: مَا رَكَعْتُ رُكُوعاً قَطُّ وَلَا سَجَدْتُ سُجُوداً قَطُّ كَانَ أَطْوَلَ مِنْهُ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: خۆر گیرا لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمانی کرد بانگدرا: (الصَّلَاةُ جَامِعَةٌ)، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکاتی بۆ خەڵکەکە کرد، هەروەها سوژدەیەکیش، پاشان هەڵسایەوە دوو ڕکاتی کرد لەگەڵ سوژدەیەکدا. عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: هەرگیز ڕکوعێک و سوژدەیەکم نەبردوە درێژتر بێت لەوە.

**١٤٨٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَرَكَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَكْعَتَيْنِ وَسَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ وَسَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ جُلِّيَ عَنِ الشَّمْسِ، وَكَانَتْ عَائِشَةُ تَقُولُ: مَا سَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سُجُوداً، وَلَا رَكَعَ رُكُوعاً أَطْوَلَ مِنْهُ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکوع و دوو سوژدەی برد، پاشان هەڵسایەوە دوو ڕکوع و دوو سوژدەی

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٤٥ و ١٠٥١، ومسلم: ٩١٠.

(٢) صحيح.




برد، پاشان خۆر دەرکەوت، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سوژدەیەکی نەبردوەو ڕکوعێکی نەبردوە درێژتر بێت لەوە.

**١٤٨١-** «عَن أَبِي حَفْصَةَ، مَوْلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ عَائِشَةَ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّهُ لَمَّا كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ تَوَضَّأَ، وَأَمَرَ فَنُودِيَ: أَنَّ الصَّلَاةَ جَامِعَةٌ، فَقَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ فِي صَلَاتِهِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَحَسِبْتُ قَرَأَ سُورَةَ الْبَقَرَةِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، ثُمَّ قَامَ مِثْلَ مَا قَامَ وَلَمْ يَسْجُدْ، ثُمَّ رَكَعَ فَسَجَدَ، ثُمَّ قَامَ فَصَنَعَ مِثْلَ مَا صَنَعَ، رَكْعَتَيْنِ وَسَجْدَةً، ثُمَّ جَلَسَ وَجُلِّيَ عَنِ الشَّمْسِ»[1].

واتە: ئەبو حەفصە مەولای عائیشە دەگێڕێتەوە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) هەواڵی پێداوە کاتی خۆر گیرا لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت، فەرمانی کرد بانگدرا: (أَنَّ الصَّلَاةَ جَامِعَةٌ) واتە: بەڕاستی نوێژ کۆکەرەوەیە، هەڵساو، لە هەڵسانەوەکەیدا نوێژەکەی درێژ کردەوە، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێم وایە سوورەتی بەقەڕەی خوێند، پاشان ڕکوعی بردو ڕکوعەکەی درێژ کردەوە، پاشان فەرمووی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَه)، پاشان هەڵسایەوە وەکو هەڵسانەوەکەی پێشوو سوژدەی نەبرد (ماوەیەک مایەوە)، پاشان ڕکوعی بردو، ئینجا سوژدەشی برد، پاشان هەڵسایەوە وەکو ڕکاتەکەی پێشووی کرد، دوو ڕکوع و سوژدەیەک، پاشان دانیشت و خۆر دەرکەوت.

## جۆرێکی تر (لە نوێژی خۆرگیران و مانگ گیران)

**١٤٨٢-** «عَن عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الصَّلَاةِ وَقَامَ الَّذِينَ مَعَهُ، فَقَامَ قِيَاماً فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَسَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَجَلَسَ فَأَطَالَ الْجُلُوسَ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَقَامَ فَصَنَعَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ مَا صَنَعَ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى مِنَ الْقِيَامِ وَالرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ وَالْجُلُوسِ، فَجَعَلَ يَنْفُخُ فِي آخِرِ سُجُودِهِ مِنَ الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ، وَيَبْكِي وَيَقُولُ: لَمْ تَعِدْنِي هَذَا وَأَنَا فِيهِمْ، لَمْ تَعِدْنِي هَذَا وَنَحْنُ نَسْتَغْفِرُكَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَانْجَلَتِ الشَّمْسُ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ

---

(١) صحيح لغيره.




ـشمس آيتانِ مِنْ آيَاتِ اللهِ ﷻ فَإِذَا رَأَيْتُمْ كُسُوفَ أَحَدِهِمَا فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللهِ ﷻ، وَالَّذِي ـس مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَقَدْ أُدْنِيَتِ الْجَنَّةُ مِنِّي، حَتَّى لَوْ بَسَطْتُ يَدِي لَتَعَاطَيْتُ مِنْ قُطُوفِهَا، وَلَقَدْ ـيتِ النَّارُ مِنِّي، حَتَّى لَقَدْ جَعَلْتُ أَتَّقِيهَا خَشْيَةَ أَنْ تَغْشَاكُمْ، حَتَّى رَأَيْتُ فِيهَا امْرَأَةً مِنْ ـمير تُعذَّبُ فِي هِرَّةٍ رَبَطَتْهَا، فَلَمْ تَدَعْهَا تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الأَرْضِ، فَلَا هِيَ أَطْعَمَتْهَا وَلَا هِيَ ـقَتْهَا حتى مَاتَتْ، فَلَقَدْ رَأَيْتُهَا تَنْهَشُهَا إِذَا أَقْبَلَتْ، وَإِذَا وَلَّتْ تَنْهَشُ أَلْيَتَهَا، وَحَتَّى رَأَيْتُ فِيهَا ـحب السِّبْتِيَّتَيْنِ أَخَا بَنِي الدَّعْدَاعِ يُدْفَعُ بِعَصاً ذَاتِ شُعْبَتَيْنِ فِي النَّارِ، وَحَتَّى رَأَيْتُ فِيهَا ـحب الْمِحْجَنِ، الَّذِي كَانَ يَسْرِقُ الْحَاجَّ بِمِحْجَنِهِ مُتَّكِئاً عَلَى مِحْجَنِهِ فِي النَّارِ، يَقُولُ: أَنَا سَارِقُ ـمحجن»(١).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: لە سەردەمی ـێغەمبەری خوا ﷺ خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا بۆ نوێژ ئەوانەشی ـەگەڵی بوون هەڵسان بۆ نوێژ، هەڵساو هەڵسانەوەکەی درێژ کردەوە، پاشان ـکوعی بردو ڕکوعەکەی درێژ کردەوە، پاشان سەری بەرزکردەوەو سوژدەی بردو ـوژدەکەی درێژ کردەوە، پاشان سەری بەرزکردەوەو دانیشت و دانیشتنەکەی ـرێژ کردەوە، پاشان سوژدەی بردو سوژدەکەی درێژ کردەوە، پاشان سەری ـەرزکردەوەو هەڵسایەوەو، لە ڕکاتی دووەمدا وەکو ڕکاتی یەکەم دووبارەی ـردەوە لە هەڵسانەوەو ڕکوع و سوژدەو دانیشتن، لە کۆتا سوژدەی ڕکاتی دووەم فووی دەکردو ئاخی هەڵدەکێشاو دەگریاو دەیفەرموو: (ئەی پەروەردگار) بەڵێنت داوە هەتا من لە نێویان بم سزایان نەدەی، بەڵێنت داوە هەتا من لە نێویان بم سزایان نەدەی، ئێمەش داوای لێخۆشبونت لێ دەکەین، پاشان سەری بەرزکردەوەو خۆر دەرکەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا وتارێکیدا بۆ خەڵکی، سوپاس و ستایشی خوای کردو، پاشان فەرمووی: بێگومان خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوای زاڵی پایەدار، جا کاتێ گیرانی یەکێکیانتان بینی بچن بۆ لای یادی خوای زاڵی پایەدار، سوێند بەو خوایەی نەفسی موحەممەدی بە دەستە بەهەشتم لێ نزیک کرایەوە، تەنانەت ئەگەر دەستم درێژ بکردایە هێشوەکانم دەگرت، هەروەها ئاگریشم لێ نزیک خرایەوە، خۆم لێی دەپاراست لە مەترسی ئەوەی نەتان پۆشێ، تەنانەت ئافرەتێکم بینی لە حیمیەر بە هۆی پشیلەیەکەوە سزا دەدرا، (چونکە**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١١٩٤.




بەستبوویەوە نە ڕێگەی پێ دەدا لە زیندەوەرانی زەوی بخوات، نە خۆی خۆراک و ئاوی پێ دەدا هەتا مرد، بێگومان بینیم پشیلەکە گازی لێ دەگرت کاتێ ڕووی تێبکردایە، کاتێک پشتی تێبکردایە لە دواوە گازی لێ دەگرت، تەنانەت خاوەنی دوو وشترەکەم بینی تیایدا برای نەوەکانی دەعداع (ئەو وشترەی پێغەمبەر ﷺ پێشکەشی کردبووەماڵی حەرام پیاوێک لە هاوبەشدانەران بردی، بۆیە ئەو ناوەی لێنا، چونکە بۆ خوا دایدنابوو) لە ناو ئاگردا پاڵی پێوە دەنرا بە گۆچانێک دوو سەری هەبوو، وە هەتا خاوەن گۆچانەکەم بینی کە بە گۆچانەکەی دزی لە حاجیەکان دەکرد، لە ناو ئاگردا کەوتبوو بەسەر گۆچانەکەیدا، دەیوت: من ئەو کەسەم بە گۆچانەکەم دزیم دەکرد.

**١٤٨٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَامَ فَصَلَّى لِلنَّاسِ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ وَهُوَ دُونَ السُّجُودِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَفَعَلَ فِيهِمَا مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ يَفْعَلُ فِيهِمَا مِثْلَ ذَلِكَ حَتَّى فَرَغَ مِنْ صَلَاتِهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، وَإِنَّهُمَا لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَافْزَعُوا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ ﷻ وَإِلَى الصَّلَاةِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆر گیرا، هەڵساو نوێژی بۆ خەڵکەکە کرد هەڵسانەوەکەی درێژ کردەوە، پاشان ڕکوعی بردو ڕکوعەکەی درێژ کردەوە، پاشان هەڵساو هەڵسانەوەکەی درێژ کردەوە (بەڵام) کورتتر لە هەڵسانەوەی یەکەم، پاشان ڕکوعی بردو ڕکوعەکەی درێژ کردەوە کورتتر لە ڕکوعی یەکەم، پاشان سوژدەی برد سوژدەکەی درێژ کردەوە کورتتر لە سوژدەی یەکەم، پاشان هەڵسا دوو ڕکات نوێژی کرد هەروەکو ئەوەی پێشووی کرد، پاشان دوو سوژدەی برد وەکو سوژدەکانی پێشوو هەتا نوێژەکەی تەواو کرد، پاشان فەرمووی: بێگومان خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا لەبەر مردن و ژیانی هیچ کەسێک ناگیرێن، ئەگەر ئەوەتان بینی (واتە: خۆر گیرا، یان مانگ گیرا) پەنا ببەن بۆ لای یادی خوای زاڵی پایەدارو نوێژ بکەن.

---

(١) حسن صحيح.

## جۆرێکی تر (لە نوێژی خۆرگیران و مانگ گیران)

**١٤٨٤-** «عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ قَالَ: بَيْنَا أَنَا يَوْمَاً وَغُلَامٌ مِنَ الْأَنْصَارِ نَرْمِي غَرَضَيْنِ لَنَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، حَتَّى إِذَا كَانَتِ الشَّمْسُ قِيدَ رُمْحَيْنِ أَوْ ثَلَاثَةٍ فِي عَيْنِ النَّاظِرِ مِنَ الْأُفُقِ اسْوَدَّتْ، فَقَالَ أَحَدُنَا لِصَاحِبِهِ: انْطَلِقْ بِنَا إِلَى الْمَسْجِدِ، فَوَاللَّهِ لَيُحْدِثَنَّ شَأْنُ هَذِهِ الشَّمْسِ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي أُمَّتِهِ حَدَثاً، قَالَ: فَدَفَعْنَا إِلَى الْمَسْجِدِ، قَالَ: فَوَافَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حِينَ خَرَجَ إِلَى النَّاسِ، قَالَ: فَاسْتَقْدَمَ فَصَلَّى، فَقَامَ كَأَطْوَلِ قِيَامٍ قَامَ بِنَا فِي صَلَاةٍ قَطُّ، مَا نَسْمَعُ لَهُ صَوْتاً، ثُمَّ رَكَعَ بِنَا كَأَطْوَلِ رُكُوعٍ مَا رَكَعَ بِنَا فِي صَلَاةٍ قَطُّ، مَا نَسْمَعُ لَهُ صَوْتاً، ثُمَّ سَجَدَ بِنَا كَأَطْوَلِ سُجُودٍ مَا سَجَدَ بِنَا فِي صَلَاةٍ قَطُّ، لَا نَسْمَعُ لَهُ صَوْتاً، ثُمَّ فَعَلَ ذَلِكَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ ذَلِكَ، قَالَ: فَوَافَقَ تَجَلِّي الشَّمْسِ جُلُوسَهُ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ، فَسَلَّمَ فَحَمِدَ اللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَشَهِدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَشَهِدَ أَنَّهُ عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ»[١].

**واتە: سەمورەی کوڕی جوندوب ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا من و منداڵێکی ئەنصارەکان تیرمان دەهاوێشت بۆ ئەوەی ئامانجەکەمان بپێکین، هەتا خۆر بە ئەندازی دوو ڕم، یان سێ ڕمی مابوو لە پێش چاوی بینەر لە ئاسۆدا، لە ناکاو ڕەش داهات بە یەکترمان وت: برۆ با بچین بۆ مزگەوت، سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ئەم خۆر گیرانە بۆ ئوممەتەکەی دەکات، وتی: ڕۆیشتین بۆ مزگەوت، دەڵێ: پێغەمبەرمان ﷺ بینی کاتێ دەرچوو بۆ ناو خەڵکی، دەڵێ: چووە پێشەوەو نوێژی دابەست، وەستا بە وەستانێک هەرگیز ئەوەندە درێژی نەکردبوویەوە، هیچ دەنگمان لێی نەدەبیست، پاشان ڕکوعی بۆ بردین هەرگیز ڕکوعی وا درێژی بۆمان نەبردبوو لە نوێژدا، هیچ دەنگمان لێی نەدەبیست، پاشان سوژدەی بۆ بردین هەرگیز سوژدەی وا درێژی بۆمان نەبردبوو لە نوێژدا، هیچ دەنگمان لێی نەدەبیست، پاشان ئەوەی دووبارە کردەوە لە ڕکاتی دووەمدا، دانیشتەکەی لە ڕکاتی دووەم لەگەڵ دەرچوونی خۆردا هاوکات بوو، ئینجا سەلامی دایەوەو ستایشی خوای کرد، شایەتیدا هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خواو شایەتیدا ئەو بەندەو پێغەمبەری خوایە.**

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١١٨٤، والترمذي: ٥٦٢، وإبن ماجه: ١٢٦٤.

## جۆرێکی تر (لە نوێژی خۆرگیران و مانگ گیران)

**١٤٨٥-** «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﵁ قَالَ: انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَخَرَجَ يَجُرُّ ثَوْبَهُ فَزِعاً، حَتَّى أَتَى الْمَسْجِدَ، فَلَمْ يَزَلْ يُصَلِّي بِنَا حَتَّى انْجَلَتْ، فَلَمَّا انْجَلَتْ، قَالَ: إِنَّ نَاساً يَزْعُمُونَ أَنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْكَسِفَانِ إِلَّا لِمَوْتِ عَظِيمٍ مِنَ الْعُظَمَاءِ، وَلَيْسَ كَذَلِكَ إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ ﷻ، إِنَّ اللَّهَ ﷻ إِذَا بَدَا لِشَيْءٍ مِنْ خَلْقِهِ خَشَعَ لَهُ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَصَلُّوا كَأَحْدَثِ صَلَاةٍ صَلَّيْتُمُوهَا مِنَ الْمَكْتُوبَةِ»(١).

**واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﵁ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆر گیرا، دەرچوو پۆشاکەکەی ڕادەکێشا لە ترساندا، تا هاتە مزگەوت، بەردەوام نوێژی بۆ کردین تا خۆر دەرکەوت، کاتێ دەرکەوت، فەرمووی: خەڵکانێک وادەزانن خۆرو مانگ ناگیرێن مەگەر لەبەر مردنی گەورەیەک لە گەورەکان نەبێت، بەو شێوە نیە، بێگومان خۆرو مانگ لەبەر ژیان و مردنی هیچ کەسێک ناگیرێن، بەڵکو دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا ﷻ، بێگومان خوا کاتێ شتێک لەو جۆرە دەردەخات بۆ بەدیهێنراوەکانی لێی دەترسێ (و هۆکاری ترسان و گەڕانەوەیانە)، جا ئەگەر ئەوەتان بینی نوێژ بکەن وەکو چۆن نوێژی فەرزتان کردوە.**

**١٤٨٦-** «عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ مُخَارِقٍ الْهِلَالِيِّ ﵁ قَالَ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ وَنَحْنُ إِذْ ذَاكَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِالْمَدِينَةِ، فَخَرَجَ فَزِعاً يَجُرُّ ثَوْبَهُ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ أَطَالَهُمَا، فَوَافَقَ انْصِرَافُهُ انْجِلَاءَ الشَّمْسِ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، وَإِنَّهُمَا لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْ ذَلِكَ شَيْئاً فَصَلُّوا كَأَحْدَثِ صَلَاةٍ مَكْتُوبَةٍ صَلَّيْتُمُوهَا»(٢).

**واتە: قەبیصەی کوڕی موخاریقی هیلالی ﵁ دەڵێ: خۆر گیرا ئێمە ئەو کات لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە مەدینە، بە ترسەوە دەرچوو جلەکانی ڕادەکێشا، دوو ڕکات نوێژی کردو درێژی کردنەوە، لەگەڵ تەواو بوونی خۆر دەرکەوت، ئینجا سوپاس و ستایشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: بێگومان خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، لەبەر مردن و ژیانی هیچ کەسێک ناگیرێن، جا ئەگەر**

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١١٩٣، وإبن ماجه: ١٢٦٢.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١١٨٥ و ١١٨٦.




شتێکی لەو جۆرەتان بینی نوێژ بکەن وەک چۆنیەتی ئەنجامدانی نزیکترین نوێژی فەرز کە ئەنجامتانداوە. (واتە: ئەگەر پێش نیوەڕۆ گیرا ئەوە وەک نوێژی بەیانی دوو ڕکات نوێژی خۆرگیران دەکرێت، چونکە نزیکترین نوێژە، ... بەم شێوەیە).

**١٤٨٧-** «عَنْ قَبِيصَةَ الْهِلَالِيِّ ﷺ أَنَّ الشَّمْسَ انْخَسَفَتْ، فَصَلَّى نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ حَتَّى انْجَلَتْ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْخَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ، وَلَكِنَّهُمَا خَلْقَانِ مِنْ خَلْقِهِ، وَإِنَّ اللَّهَ ﷻ يُحْدِثُ فِي خَلْقِهِ مَا شَاءَ، وَإِنَّ اللَّهَ ﷻ إِذَا تَجَلَّى لِشَيْءٍ مِنْ خَلْقِهِ يَخْشَعُ لَهُ، فَأَيُّهُمَا حَدَثَ فَصَلُّوا حَتَّى يَنْجَلِيَ أَوْ يُحْدِثَ اللَّهُ أَمْرًا»[١].

واتە: قەبیصەی هیلالی ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژی کرد، تا (خۆر) دەرکەوتەوە، پاشان فەرمووی: بێگومان خۆرو مانگ لەبەر مردنی هیچ کەسێک ناگیرێن، بەڵکو دوو دروستکراون لە دروستکراوەکانی خوا، بێگومان وە خوا ﷻ پێشی دێنێ لە دروستکراوەکانیدا چۆنی بوێ، بەڕاستی خوا ﷻ ئەگەر شتێک خۆی نیشانی دروستکراوێکی بدات لێی دەترسێ، جا ئەگەر خۆر، یان مانگ گیرا نوێژ بکەن تا دەردەکەوێ، یان خوا شتێک دێنێتە پێش.

**١٤٨٨-** «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِذَا خَسَفَتِ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ فَصَلُّوا كَأَحْدَثِ صَلَاةٍ صَلَّيْتُمُوهَا»[٢].

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێ خۆرو مانگ گیرا نوێژ بکەن وەک چۆنیەتی ئەنجامدانی نزیکترین نوێژی فەرز کە ئەنجامتانداوە.

**١٤٨٩-** «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى حِينَ انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ مِثْلَ صَلَاتِنَا يَرْكَعُ وَيَسْجُدُ»[٣].

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کرد کاتێ خۆر گیرا، وەکو نوێژەکانمان ڕکوعی دەبردو سوژدەی دەبرد.

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف.



**١٤٩٠-** «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ خَرَجَ يَوْماً مُسْتَعْجِلاً إِلَى الْمَسْجِدِ وَقَدْ انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَصَلَّى حَتَّى انْجَلَتْ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ أَهْلَ الْجَاهِلِيَّةِ كَانُوا يَقُولُونَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْخَسِفَانِ إِلَّا لِمَوْتِ عَظِيمٍ مِنْ عُظَمَاءِ أَهْلِ الْأَرْضِ، وَإِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْخَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنَّهُمَا خَلِيقَتَانِ مِنْ خَلْقِهِ، يُحْدِثُ اللَّهُ فِي خَلْقِهِ مَا يَشَاءُ، فَأَيُّهُمَا انْخَسَفَ فَصَلُّوا حَتَّى يَنْجَلِيَ أَوْ يُحْدِثَ اللَّهُ أَمْراً»(١).

**واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێک بە پەلە دەرچوو بۆ مزگەوت، خۆر گیرا بوو، نوێژی کرد تا دەرکەوت، پاشان فەرمووی: خەڵکی سەردەمی نەفامی دەیانوت: خۆرو مانگ ناگیرێن مەگەر لەبەر گەورەیەک لە گەورەکانی سەر زەوی نەبێ، بێگومان خۆرو مانگ ناگیرێن لەبەر مردن و ژیانی کەسێک، بەڵکو دوو دروستکراون لە دروستکراوەکانی خوا، خوا پێشی دێنێ لە دروستکراوەکانیدا چۆنی بوێ، جا خۆر یان مانگ گیرا نوێژ بکەن هەتا دەردەکەوێ، یان خوا شتێک دێنێتە پێش.**

**١٤٩١-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَانْكَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَجُرُّ رِدَاءَهُ حَتَّى انْتَهَى إِلَى الْمَسْجِدِ، وَثَابَ إِلَيْهِ النَّاسُ، فَصَلَّى بِنَا رَكْعَتَيْنِ، فَلَمَّا انْكَشَفَتِ الشَّمْسُ، قَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ يُخَوِّفُ اللَّهُ ﷻ بِهِمَا عِبَادَهُ، وَإِنَّهُمَا لَا يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَصَلُّوا حَتَّى يُكْشَفَ مَا بِكُمْ، وَذَلِكَ أَنَّ ابْناً لَهُ مَاتَ يُقَالُ لَهُ: إِبْرَاهِيمُ، فَقَالَ لَهُ نَاسٌ فِي ذَلِكَ»(٢).

**واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: ئێمە لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو پۆشاکەی ڕادەکێشا تا گەیشتە مزگەوت، خەڵکی بۆ لای ڕۆیشتن، دوو ڕکات نوێژی بۆ کردین، کاتێ خۆر دەرکەوت، فەرمووی: بە دڵنیایی خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، خوا ﷻ بەندەکانی پێیان دەترسێنێ، بێگومان خۆرو مانگ لەبەر مردن و ژیانی هیچ کەسێک ناگیرێن، جا ئەگەر ئەوەتان بینی نوێژ بکەن هەتا بۆتان دەردەکەون، ئەوەش لەبەر ئەوە فەرمووی، چونکە کوڕێکی هەبوو بە ناوی ئیبراهیم مردبوو، خەڵکی دەیانوت بە هۆی ئەوەوەیە خۆر گیراوە.**

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح.

**١٤٩٢-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ مِثْلَ صَلَاتِكُمْ هَذِهِ، وَذَكَرَ كُسُوفَ الشَّمْسِ»[١].

**واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی کرد وەکو ئەم نوێژەتان، باسی مانگ گیرانی کرد.**

## ئەندازەی قورئان خوێندن لە نوێژی خۆرگیران و مانگ گیران

**١٤٩٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَالنَّاسُ مَعَهُ، فَقَامَ قِيَاماً طَوِيلاً، قَرَأَ نَحْواً مِنْ سُورَةِ الْبَقَرَةِ قَالَ: ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعاً طَوِيلاً، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَاماً طَوِيلاً وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعاً طَوِيلاً وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ قَامَ قِيَاماً طَوِيلاً وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعاً طَوِيلاً وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَاماً طَوِيلاً وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعاً طَوِيلاً وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ انْصَرَفَ، وَقَدْ تَجَلَّتِ الشَّمْسُ، فَقَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَا يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَاذْكُرُوا اللَّهَ ﷻ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، رَأَيْنَاكَ تَنَاوَلْتَ شَيْئاً فِي مَقَامِكَ هَذَا، ثُمَّ رَأَيْنَاكَ تَكَعْكَعْتَ، قَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ الْجَنَّةَ- أَوْ أُرِيتُ الْجَنَّةَ- فَتَنَاوَلْتُ مِنْهَا عُنْقُوداً، وَلَوْ أَخَذْتُهُ لَأَكَلْتُمْ مِنْهُ مَا بَقِيَتِ الدُّنْيَا، وَرَأَيْتُ النَّارَ فَلَمْ أَرَ كَالْيَوْمِ مَنْظَراً قَطُّ، وَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ قَالُوا: لِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: بِكُفْرِهِنَّ، قِيلَ: يَكْفُرْنَ بِاللَّهِ؟ قَالَ: يَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ، وَيَكْفُرْنَ الْإِحْسَانَ، لَوْ أَحْسَنْتَ إِلَى إِحْدَاهُنَّ الدَّهْرَ ثُمَّ رَأَتْ مِنْكَ شَيْئاً قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ مِنْكَ خَيْراً قَطُّ»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: خۆر گیرا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دابەست و خەڵکەکەش لەگەڵی بوون، بە پێوە وەستا (قورئانی خوێند) ماوەیەکی زۆر بەو شێوە مایەوە، بەشێکی لە سوورەتی بەقەڕە خوێند، دەڵێ: پاشان ڕکوعی برد ڕکوعێکی درێژ، پاشان هەڵسایەوە بە پێوە وەستا (قورئانی خوێند) کورتتر لە وەستانی یەکەم، پاشان ڕکوعی برد ڕکوعێکی درێژ کورتتر لە ڕکوعی یەکەم، پاشان سوژدەی برد، پاشان بە پێوە وەستا (قورئانی**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩ و ٤٣١ و ٧٤٨ و ١٠٥٢ و ٣٢٠٢ و ٥١٩٧، ومسلم: ٩٠٧، وأبو داود: ١١٨٩.




خوێند) کورت تر لە وەستانی یەکەم، پاشان ڕکوعی برد ڕکوعێکی درێژ کورتتر لە ڕکوعی یەکەم، پاشان هەڵسایەوە بە پێوە وەستا (قورئانی خوێند) کورتتر لە وەستانی یەکەم، پاشان ڕکوعی برد ڕکوعێکی درێژ، (بەڵام) کورتتر لە ڕکوعی یەکەم، پاشان سوژدەی برد، پاشان لێ بوویەوە، خۆر دەرکەوتبوو، فەرمووی: بەڕاستی خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا لەبەر مردن و ژیانی کەس ناگیرێن، جا ئەگەر ئەوەتان بینی یادی خوای گەورە بکەن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، بینیمان لە شوێنی خۆت تۆزێ پێش کەوتیت، دواتر بینیمان هاتیتە دواوە، فەرمووی: بە دڵنیایی بەهەشتم بینی«یان پێم نیشاندرا» ویستم هێشوویەکی لێ بهێنم، ئەگەر بمهێنایە لێتان دەخوارد هەتا دنیا دەما، ئاگریشم بینی، هەرگیز دیمەنی وەکو ئەمڕۆم نەبینیوە، بینیم زۆربەی خەڵکەکەی ئافرەتانن، وتیان: بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بە هۆی کوفر کردنیان، وترا: کوفر بە خوا دەکەن؟ فەرمووی: کوفر بەرانبەر مێردەکانیان دەکەن کە لەگەڵیان دەژین، (واتە: شتی نابەجێیان بەرانبەر دەکەن و سپڵەن بەرانبەریان)، وە نکوولی چاکەکانیان دەکەن، ئەگەر بە درێژایی ساڵ چاکە لەگەڵ یەکێکیان بکەیت، پاشان شتێکی لێت بینی، دەڵێ: هەرگیز خێرو چاکەم لە تۆ نەبینیوە.

### بابەت: قورئان خوێندن بە دەنگی بەرز لە نوێژی مانگ گیران

**١٤٩٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ صَلَّى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ، وَجَهَرَ فِيهَا بِالْقِرَاءَةِ كُلَّمَا رَفَعَ رَأْسَهُ قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ»[1].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ (دوو ڕکات) نوێژی کرد چوار ڕکوع و چوار سوژدەی تێدا برد، بە دەنگی بەرز قورئانی تێدا خوێند، هەرکاتێ سەری بەرز بکردایەتەوە دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْد).

---

(١) صحيح.




## واز هێنان لە خوێندنی قورئان بە دەنگی بەرز (لە نوێژی خۆر گیران)

١٤٩٥- «عَنْ سَمُرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى بِهِمْ فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ لَا نَسْمَعُ لَهُ صَوْتاً»[١].

واتە: سەمورە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ نوێژی خۆر گیرانی بۆ کردین گوێمان لە دەنگی نەبوو.

## بابەت: زیکری سوژدەی نوێژی خۆر گیران و مانگ گیران

١٤٩٦- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ فَأَطَالَ - قَالَ شُعْبَةُ: وَأَحْسَبُهُ قَالَ: فِي السُّجُودِ نَحْوَ ذَلِكَ - وَجَعَلَ يَبْكِي فِي سُجُودِهِ وَيَنْفُخُ وَيَقُولُ: رَبِّ لَمْ تَعِدْنِي هَذَا وَأَنَا أَسْتَغْفِرُكَ، لَمْ تَعِدْنِي هَذَا وَأَنَا فِيهِمْ، فَلَمَّا صَلَّى قَالَ: عُرِضَتْ عَلَيَّ الْجَنَّةُ حَتَّى لَوْ مَدَدْتُ يَدِي تَنَاوَلْتُ مِنْ قُطُوفِهَا، وَعُرِضَتْ عَلَيَّ النَّارُ فَجَعَلْتُ أَنْفُخُ خَشْيَةَ أَنْ يَغْشَاكُمْ حَرُّهَا، وَرَأَيْتُ فِيهَا سَارِقَ بَدَنَتَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَرَأَيْتُ فِيهَا أَخَا بَنِي دُعْدُعٍ سَارِقَ الْحَجِيجِ، فَإِذَا فُطِنَ لَهُ قَالَ: هَذَا عَمَلُ الْمِحْجَنِ، وَرَأَيْتُ فِيهَا امْرَأَةً طَوِيلَةً سَوْدَاءَ تُعَذَّبُ فِي هِرَّةٍ رَبَطَتْهَا، فَلَمْ تُطْعِمْهَا وَلَمْ تَسْقِهَا، وَلَمْ تَدَعْهَا تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الْأَرْضِ حَتَّى مَاتَتْ، وَإِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، فَإِذَا انْكَسَفَتْ إِحْدَاهُمَا «أَوْ قَالَ: فَعَلَ أَحَدُهُمَا شَيْئاً مِنْ ذَلِكَ»، فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ ﷻ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژ کرد هەڵسانەوەکەی درێژ کردەوە، پاشان ڕکوعی بردو ڕکوعەکەی درێژ کردەوە، پاشان سەری بەرز کردەوەو درێژی کردەوە «شوعبە دەڵێ: وادەزانم وتی: لە سوژدەش بەو شێوەیە درێژی کردەوە»، فووی دەکردو ئاخی هەڵدەکێشا دەیفەرموو: بەڵێنی ئەوەت داوە سزایان نەدەی تا من داوای لێخۆشبونیان بۆ دەکەم، بەڵێنت داوە تا من لە نێویان بم سزایان نەدەی، کاتێ نوێژی کرد فەرمووی: ئەوەندە بەهەشتم لێ نزیک خرایەوە ئەگەر دەستم

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح.





ببردایە بۆ هێشوەکانی دەمگرت، ئاگریشم بۆ خرایە ڕوو فووم دەکرد لە ترسی ئەوەی گەرماکەی نەتانسوتێنی، ئەو پیاوەشم بینی کە دوو وشترەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ دزیبوو، هەروەها براکەی نەوەکانی دوعدوعم بینی وا دزی لە حاجیەکان دەکرد، جا کاتێ بە وریا کرایەوە، وتی: ئەمە کاری گۆچانەکەیە، هەروەها ئافرەتێکی درێژی ڕەشم بینی تیایدا (واتە: لە دۆزەخ) سزا دەدرا بە هۆی پشیلەیەکەوە بەستبوویەوە نە خواردەمەنی پێ دەدا نە ئاو، نە ڕێگەشی دەدا زیندەواری سەر زەوی بخوات، هەتا مرد، وە بەڕاستی خۆرو مانگ بە مردن و ژیانی هیچ کەس ناگیرێن، بەڵکو دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، ئەگەر یەکێکیان گیرا «یان وتی: یەکێکیان شتێکی لەو جۆرەی لێهات» پەلە بکەن و بچن بۆ لای یادی خوا.

## بابەت: تەحیات و سەلام دانەوە لە نوێژی خۆر گیران و مانگ گیران

**١٤٩٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَجُلاً فَنَادَى: أَنِ الصَّلَاةَ جَامِعَةً، فَاجْتَمَعَ النَّاسُ، فَصَلَّى بِهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَكَبَّرَ، ثُمَّ قَرَأَ قِرَاءَةً طَوِيلَةً، ثُمَّ كَبَّرَ فَرَكَعَ رُكُوعاً طَوِيلاً مِثْلَ قِيَامِهِ أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، وَقَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، ثُمَّ قَرَأَ قِرَاءَةً طَوِيلَةً هِيَ أَدْنَى مِنَ الْقِرَاءَةِ الْأُولَى، ثُمَّ كَبَّرَ فَرَكَعَ رُكُوعاً طَوِيلاً هُوَ أَدْنَى مِنَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، ثُمَّ كَبَّرَ فَسَجَدَ سُجُوداً طَوِيلاً مِثْلَ رُكُوعِهِ أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ كَبَّرَ فَرَفَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ كَبَّرَ فَسَجَدَ، ثُمَّ كَبَّرَ، فَقَامَ، فَقَرَأَ قِرَاءَةً طَوِيلَةً هِيَ أَدْنَى مِنَ الْأُولَى، ثُمَّ كَبَّرَ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعاً طَوِيلاً هُوَ أَدْنَى مِنَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، ثُمَّ قَرَأَ قِرَاءَةً طَوِيلَةً وَهِيَ أَدْنَى مِنَ الْقِرَاءَةِ الْأُولَى فِي الْقِيَامِ الثَّانِي، ثُمَّ كَبَّرَ فَرَكَعَ رُكُوعاً طَوِيلاً دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ كَبَّرَ فَرَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، ثُمَّ كَبَّرَ فَسَجَدَ أَدْنَى مِنْ سُجُودِهِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ تَشَهَّدَ، ثُمَّ سَلَّمَ فَقَامَ فِيهِمْ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْخَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، فَأَيُّهُمَا خُسِفَ بِهِ أَوْ بِأَحَدِهِمَا فَافْزَعُوا إِلَى اللَّهِ ﷻ بِذِكْرِ الصَّلَاةِ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆر گیرا، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە پیاوێک بانگیدا (الصَّلَاةَ جَامِعَةً)، خەڵک کۆبوونەوەو پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دابەست و تەکبیری کرد، پاشان چووە

---

(١) صحیح.




ڕکوع و ڕکوعێکی درێژی برد وەک وەستانەکەی یان زیاتر لەوە، پاشان سەری بەرز کردەوەو فەرمووی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَه)، پاشان قورئانێکی درێژی خوێند کورتتر لە یەکەم، پاشان تەکبیری کردو ڕکوعێکی درێژی برد، ئەویش کەمتر بوو لە ڕکوعی یەکەم، پاشان سەری بەرز کردەوەو فەرمووی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَه)، پاشان تەکبیری کردو سوژدەیەکی درێژی برد وەکو ڕکوعەکەی یان درێژتر، پاشان تەکبیری کردو سەری بەرز کردبوویەوە، پاشان تەکبیری کردو سوژدەی برد، پاشان تەکبیری کرد، ئینجا هەڵسا، قورئانێکی درێژی خوێند کورتتر لە یەکەم، پاشان تەکبیری کرد، پاشان ڕکوعێکی درێژی برد کورتتر لە ڕکوعی یەکەم، پاشان سەری بەرز کردەوەو فەرمووی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَه)، پاشان قورئانێکی درێژی خوێند کورتتر لە خوێندنی یەکەم لە هەڵسانەوەی دووەم، پاشان تەکبیری کردو ڕکوعێکی درێژی برد کورتتر لە ڕکوعی یەکەم، پاشان تەکبیری کردو سەری بەرز کردەوەو فەرمووی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَه)، پاشان تەکبیری کردو سوژدەی برد کورتتر لە سوژدەی یەکەم، پاشان تەحیاتی خوێند، پاشان سەلای دایەوەو هەڵسا لە ناویاندا سوپاس و ستایشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: بەڕاستی خۆرو مانگ لەبەر مردن و ژیانی هیچ کەسێک ناگیرێن، بەڵکو دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، هەرکامەیان بگیرێت دەگەڕێنەوە بۆ لای خوای ﷻ بە ئەنجامدانی نوێژ.

**١٤٩٨-** «عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَتْ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الْكُسُوفِ، فَقَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ رَفَعَ ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ انْصَرَفَ»[1].

واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی خۆر گیرانی کرد هەڵساو هەڵسانەوەکەی درێژ کردەوە، پاشان چووە ڕکوع و ڕکوعەکەی درێژ کردەوە، پاشان هەڵسایەوە هەڵسانەوەکەی درێژ کردەوە، پاشان چووە ڕکوع و ڕکوعەکەی درێژی کردەوە، پاشان بەرزبوویەوە، پاشان سوژدەی برد سوژدەکەی درێژ کردەوە، پاشان بەرزبوویەوە، پاشان سوژدەی برد

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٤٥ و ٢٣٦٤، وإبن ماجه: ١٢٦٥.




سوژدەکەی درێژ کردەوە، پاشان هەڵسایەوە هەڵسانەوەکەی درێژ کردەوە، پاشان چووە ڕکوع و ڕکوعەکەی درێژ کردەوە، پاشان بەرزبوویەوە هەڵسانەوەکەی درێژ کردەوە، پاشان چووە ڕکوع و ڕکوعەکەی درێژ کردەوە، پاشان بەرزبوویەوە، پاشان سوژدەی برد سوژدەکەی درێژ کردەوە، پاشان بەرزبوویەوە، پاشان سوژدەی برد سوژدەکەی درێژ کردەوە، پاشان بەرزبوویەوەو پاشان تەواوی کرد.

## بابەت: دانیشتن لەسەر مینبەر لە دوای نوێژی خۆر گیران و مانگ گیران

**١٤٩٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ مَخْرَجاً فَخُسِفَ بِالشَّمْسِ، فَخَرَجْنَا إِلَى الْحُجْرَةِ فَاجْتَمَعَ إِلَيْنَا نِسَاء، وَأَقْبَلَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَذَلِكَ ضَحْوَةً، فَقَامَ قِيَاماً طَوِيلاً، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعاً طَوِيلاً، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَقَامَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ دُونَ رُكُوعِهِ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ قَامَ الثَّانِيَةَ فَصَنَعَ مِثْلَ ذَلِكَ إِلَّا أَنَّ قِيَامَهُ وَرُكُوعَهُ دُونَ الرَّكْعَةِ الْأُولَى، ثُمَّ سَجَدَ وَتَجَلَّتِ الشَّمْسُ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَعَدَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَقَالَ فِيمَا يَقُولُ: إِنَّ النَّاسَ يُفْتَنُونَ فِي قُبُورِهِمْ كَفِتْنَةِ الدَّجَّالِ»[1].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بەلایەکدا، ئینجا خۆر گیرا، ئێمەش ڕۆیشتین بۆ ژوورەکە، کۆمەڵە ئافرەتێکمان لێ کۆبوویەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان سەرەتای ڕۆژ بوو کاتی چێشتەنگاو، نوێژی دابەست و بەپێوە وەستا بە وەستانێکی دوورو درێژ، پاشان ڕکوعێکی درێژی برد، پاشان سەری بەرز کردەوەو وەستا کورتتر لە وەستانی یەکەم، پاشان ڕکوعی برد کورتتر لە ڕکوعی یەکەم، پاشان سوژدەی برد، پاشان جارێکی تر (بۆ ڕکاتی دووەم) هەڵسایەوە، بە هەمان شێوەی پێشووی کرد، ئەوە نەبێ وەستان و ڕکوعی کورتتر بوو لە هی یەکەم، پاشان سوژدەی برد، خۆر دەرکەوت، کاتێ لێبوویەوە لەسەر مینبەرەکە دانیشت، لە (هەندێک لە) قسەکانیدا وتی: بەڕاستی خەڵکی تووشی فیتنە دەبن لە ناو گۆڕەکانیان وەکو فیتنەی دەجال.

---

(١) صحيح.

## بابەت: چۆنیەتی وتاردان لە خۆر گیران و مانگ گیران

**١٥٠٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَامَ فَصَلَّى، فَأَطَالَ الْقِيَامَ جِدّاً، ثُمَّ رَكَعَ، فَأَطَالَ الرُّكُوعَ جِدّاً، ثُمَّ رَفَعَ، فَأَطَالَ الْقِيَامَ جِداً وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ، فَأَطَالَ الرُّكُوعَ وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَأَطَالَ الْقِيَامَ وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ، فَأَطَالَ الرُّكُوعَ وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ، فَأَطَالَ الْقِيَامَ وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ، فَأَطَالَ الرُّكُوعَ وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ، فَفَرَغَ مِنْ صَلَاتِهِ وَقَدْ جُلِّيَ عَنِ الشَّمْسِ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَصَلُّوا وَتَصَدَّقُوا، وَاذْكُرُوا اللَّهَ ﷻ، وَقَالَ: يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، إِنَّهُ لَيْسَ أَحَدٌ أَغْيَرَ مِنَ اللَّهِ ﷻ أَنْ يَزْنِيَ عَبْدُهُ أَوْ أَمَتُهُ، يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيراً»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆر گیرا (پێغەمبەر ﷺ) وەستاو بە پێوە نوێژی دابەست، وەستانەکەی زۆر درێژ کردەوە، پاشان ڕکوعی برد ڕکوعەکەی زۆر درێژ کردەوە پاشان وەستا، وەستانەوەکەی درێژ کردەوە کورتتر لە وەستانەوەکەی یەکەم، پاشان ڕکوعی برد ڕکوعەکەی درێژ کردەوە کورتتر لە ڕکوعی یەکەم، پاشان سوژدەی برد، پاشان سەری بەرز کردەوە، وەستانەوەکەی درێژ کردەوە کورتتر لە وەستانەوەی یەکەم، پاشان ڕکوعی برد ڕکوعەکەی درێژ کردەوە کورتتر لە ڕکوعی یەکەم، پاشان بەرزبوویەوە وەستانەوەکەی درێژ کردەوە کورتتر لە وەستانەوەی یەکەم، پاشان ڕکوعی برد ڕکوعەکەی درێژ کردەوە کورتتر لە ڕکوعی یەکەم، پاشان سوژدەی برد، لە نوێژەکەی بوویەوە خۆر دەرکەوتبوو، وتاری بۆ خەڵکیداو سوپاس و ستایشی خوای کردو فەرمووی: بەڕاستی خۆرو مانگ لەبەر مردن و ژیانی هیچ کەسێک ناگیرێن، ئەگەر ئەوەتان بینی نوێژ بکەن ببەخشن و یادی خوا ﷻ بکەن، وە فەرمووی: ئەی ئوممەتی موحەممەد، هیچ کەس ئەوەندەی خوا توڕە نابێ کاتێ ببینێ بەندەکەی زینا بکات، ئەی ئوممەتی موحەممەد سوێند بە خوا ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیایە کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان.

---

(١) صحیح.




**١٥٠١-** «عَنْ سَمُرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَطَبَ حِينَ انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ فَقَالَ: أَمَّا بَعْدُ»[١].

واتە: سەمورە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ وتاریدا کاتێ خۆر گیرا، فەرمووی: دوای ئەوە (دواتر دەستی بە وتارەکە کرد).

## فەرمان کردن بە پاڕانەوە لە خۆر گیران و مانگ گیران

**١٥٠٢-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَانْكَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَقَامَ إِلَى الْمَسْجِدِ يَجُرُّ رِدَاءَهُ مِنَ الْعَجَلَةِ، فَقَامَ إِلَيْهِ النَّاسُ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَمَا يُصَلُّونَ، فَلَمَّا انْجَلَتْ خَطَبَنَا فَقَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ يُخَوِّفُ بِهِمَا عِبَادَهُ، وَإِنَّهُمَا لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ كُسُوفَ أَحَدِهِمَا فَصَلُّوا وَادْعُوا حَتَّى يَنْكَشِفَ مَا بِكُمْ»[٢].

واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: ئێمە لە لای پێغەمبەر ﷺ بووین، خۆر گیرا، هەڵسا ڕۆیشت بۆ مزگەوت، پۆشاکەکەی ڕادەکێشا لە پەلە کردندا، خەڵکەکەش بۆ لای ڕۆیشتن، دوو ڕکات نوێژی کرد وەک چۆن نوێژ دەکەن، کاتێ خۆر دەرکەوت، فەرمووی: بەڕاستی خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، خوا بەندەکانی پێیان دەترسێنێ، بێگومان خۆرو مانگ لەبەر مردن و ژیانی هیچ کەسێک ناگیرێن، جا ئەگەر گیرانی یەکێکیانتان بینی نوێژ بکەن و بپاڕێنەوە هەتا خۆرگیران یان مانگ گیرانەکەتان لەسەر لادەچێت.

## فەرمان کردن بە داوای لێخۆش بوون لە کاتی خۆر گیران و مانگ گیران

**١٥٠٣-** «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَزِعاً يَخْشَى أَنْ تَكُونَ السَّاعَةُ، فَقَامَ حَتَّى أَتَى الْمَسْجِدَ، فَقَامَ يُصَلِّي بِأَطْوَلِ قِيَامٍ وَرُكُوعٍ وَسُجُودٍ مَا رَأَيْتُهُ يَفْعَلُهُ فِي صَلَاتِهِ قَطُّ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ هَذِهِ الْآيَاتِ الَّتِي يُرْسِلُ اللَّهُ لَا تَكُونُ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنَّ اللَّهَ يُرْسِلُهَا يُخَوِّفُ بِهَا عِبَادَهُ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْهَا شَيْئاً فَافْزَعُوا إِلَى ذِكْرِهِ وَدُعَائِهِ وَاسْتِغْفَارِهِ»[٣].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٤٠ و ١٠٤٨ و ١٠٦٢ و ١٠٦٣ و ٥٧٨٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٥٩، ومسلم: ٩١٢.




واته: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: خۆر گیرا پێغەمبەر ﷺ هەڵسا ترسا لەوەی ڕۆژی دوایی ڕوو بدات، هەڵسا هەتا هاتە مزگەوت، نوێژی دابەست بە وەستانەوە بە درێژ ترین وەستان و ڕکوع و سوژدە، هەرگیز نەمبینی بوو بەو شێوەیە نوێژ بکات، پاشان فەرمووی: بەڕاستی ئەم نیشانانەی کە خوا دەینێرێ لەبەر مردن و ژیانی هیچ کەس نیە، بەڵکو خوا بۆیە دەینێرێ بەندەکانی پێ بترسێنێ، جا ئەگەر ئێوە شتێکتان لەو جۆرە بینی، بگەڕێنەوە بۆ لای یادی خواو لێی بپاڕێنەوەو داوای لێخۆشبوونی لێ بکەن.




## ئیمام کەی داوای نوێژە بارانە دەکات؟

**١٥٠٤-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلَكَتِ الْمَوَاشِي، وَانْقَطَعَتِ السُّبُلُ، فَادْعُ اللَّهَ ﷻ، فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَمُطِرْنَا مِنَ الْجُمُعَةِ إِلَى الْجُمُعَةِ، فَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تَهَدَّمَتِ الْبُيُوتُ، وَانْقَطَعَتِ السُّبُلُ، وَهَلَكَتِ الْمَوَاشِي، فَقَالَ: اللَّهُمَّ عَلَى رُءُوسِ الْجِبَالِ، وَالْآكَامِ، وَبُطُونِ الْأَوْدِيَةِ، وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ، فَانْجَابَتْ عَنِ الْمَدِينَةِ انْجِيَابَ الثَّوْبِ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئاژەڵەکان لەناوچوون و ڕێگاکان بڕان و داخران، (واتە: ڕێگای بازرگانی و کەسابەت) داوا لە خوا ﷻ بکە، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کرد لە خوا، بارانمان بۆ باری لە هەینیەوە بۆ هەینیەکی تر، پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵەکان ڕوخان و ڕێگاوبانەکان بڕان و داخران (ئەمجارە جموجۆڵ و کاسبی ناکرێ لەبەر باران) و ئاژەڵەکان لەناوچوون، فەرمووی: خوایە بیبارێنە بەسەر کێوەکان و تەپۆلکەکان و ناو شیوەکان و شوێنی سەوزبوونی دارو گژو گیاکان، جا بارانەکە لەسەر مەدینە پچڕا وەکو پچڕانی دڕانی پۆشاک.

## دەرچوونی ئیمام بۆ نوێژگە بە مەبەستی نوێژە بارانە

**١٥٠٥-** «عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ زَيْدٍ ﷺ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ إِلَى الْمُصَلَّى يَسْتَسْقِي، فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، وَقَلَبَ رِدَاءَهُ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە دەرەوە بۆ نوێژە بارانە، ڕووی کردە قیبلەو عەباکەی هەڵگەڕاندەوەو دوو ڕکات نوێژی کرد.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠١٣ و ١٠١٤ و ١٠١٦ و ١٠١٧ و ١٠١٩، ومسلم: ٨٩٧، وأبو داود: ١١٧٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٠٥ و ١٠١١ و ١٠١٢ و ١٠٢٣ و ١٠٢٤ و ١٠٢٥ و ١٠٢٦ و ١٠٢٧ و ١٠٢٨ و ٦٣٤٣، ومسلم: ١ و ٢ و ٣ و ٨٩٤/٤، وأبو داود: ١١٦١ و ١١٦٢ و ١١٦٣ و ١١٦٤ و ١١٦٦ و ١١٦٧، والترمذي: ٥٥٦، وإبن ماجه: ١٢٦٧.




## بابەت: ئەو شێوازەی کە سوننەتە بۆ ئیمام لە کاتی دەرچوونی بۆ نوێژە بارانە

**١٥٠٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كِنَانَةَ قَالَ: أَرْسَلَنِي فُلَانٌ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَسْأَلُهُ عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الِاسْتِسْقَاءِ، فَقَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُتَضَرِّعاً مُتَوَاضِعاً مُتَبَذِّلاً، فَلَمْ يَخْطُبْ نَحْوَ خُطْبَتِكُمْ هَذِهِ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی کینانە دەڵێ: فڵانەکەس ناردمی بۆ لای ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) پرسیاری لێ بکەم دەربارەی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژە بارانە، (ئیبنو عەبباس) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بە گەردنکەچی و خۆبەکەم زانین و بەشێوەیەک خۆی نەڕازندبوویەوە، وتاری نەدابوو، وەکو ئەم وتارەی کە بۆ ئێوەیدا (بەڵکو لە وتارەکەی داوای باران بارین و لێخۆشبوونی کرد)، ئینجا دوو ڕکات نوێژی کرد.

**١٥٠٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اسْتَسْقَى وَعَلَيْهِ خَمِيصَةٌ سَوْدَاءُ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژە بارانەی کرد، پۆشاکێکی ڕەشی لەبەردا بوو.

## بابەت: دانیشتنی ئیمام لەسەر مینبەر بۆ وتاری نوێژە بارانە

**١٥٠٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كِنَانَةَ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الِاسْتِسْقَاءِ، فَقَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُتَبَذِّلاً، مُتَوَاضِعاً، مُتَضَرِّعاً، فَجَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَلَمْ يَخْطُبْ خُطْبَتَكُمْ هَذِهِ، وَلَكِنْ لَمْ يَزَلْ فِي الدُّعَاءِ وَالتَّضَرُّعِ وَالتَّكْبِيرِ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَمَا كَانَ يُصَلِّي فِي الْعِيدَيْنِ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی کینانە دەڵێ: فڵانەکەس ناردمی بۆ لای ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) (تا پرسیاری لێ بکەم) دەربارەی نوێژە بارانەی پێغەمبەری

---

(١) حسن.

(٢) صحيح.

(٣) حسن. أخرجه الترمذي: ٥٥٨ و ٥٥٩، وإبن ماجه: ١١٦٥ و ١١٦٦.

## بابەت: ئەو شێوازەی کە سوننەتە بۆ ئیمام لە کاتی دەرچوونی بۆ نوێژە بارانە

**١٥٠٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كِنَانَةَ قَالَ: أَرْسَلَنِي فُلَانٌ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَسْأَلُهُ عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الِاسْتِسْقَاءِ، فَقَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُتَضَرِّعاً مُتَوَاضِعاً مُتَبَذِّلاً، فَلَمْ يَخْطُبْ نَحْوَ خُطْبَتِكُمْ هَذِهِ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ»[١].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی کینانە دەڵێ: فڵانەکەس ناردمی بۆ لای ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) پرسیاری لێ بکەم دەربارەی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژە بارانە، (ئیبنو عەبباس) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بە گەردنکەچی و خۆبەکەم زانین و بەشێوەیەک خۆی نەڕازندبوویەوە، وتاری نەدابوو، وەکو ئەم وتارەی کە بۆ ئێوەیدا (بەڵکو لە وتارەکەی داوای باران بارین و لێخۆشبوونی کرد)، ئینجا دوو ڕکات نوێژی کرد.**

**١٥٠٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اسْتَسْقَى وَعَلَيْهِ خَمِيصَةٌ سَوْدَاءُ»[٢].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژە بارانەی کرد، پۆشاکێکی ڕەشی لەبەردا بوو.**

## بابەت: دانیشتنی ئیمام لەسەر مینبەر بۆ وتاری نوێژە بارانە

**١٥٠٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كِنَانَةَ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الِاسْتِسْقَاءِ، فَقَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُتَبَذِّلاً، مُتَوَاضِعاً، مُتَضَرِّعاً، فَجَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَلَمْ يَخْطُبْ خُطْبَتَكُمْ هَذِهِ، وَلَكِنْ لَمْ يَزَلْ فِي الدُّعَاءِ وَالتَّضَرُّعِ وَالتَّكْبِيرِ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَمَا كَانَ يُصَلِّي فِي الْعِيدَيْنِ»[٣].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی کینانە دەڵێ: فڵانەکەس ناردمی بۆ لای ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) (تا پرسیاری لێ بکەم) دەربارەی نوێژە بارانەی پێغەمبەری**

---

(١) حسن.

(٢) صحيح.

(٣) حسن. أخرجه الترمذي: ٥٥٨ و ٥٥٩، وإبن ماجه: ١١٦٥ و ١١٦٦.




خوا ﷺ، (ئیبنو عەبباس) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بە شێوەیەک خۆی نەڕازاندبوویەوە، بەخۆبەکەم زانین و گەردنکەچی، لەسەر مینبەر دانیشت وتاری نەدا وەکو ئەم وتارەی کە دەیدا، بەڵکو بەردەوام دەپاڕایەوەو ملکەچ دەنواندوو تەکبیری دەکرد، دوو ڕکاتی نوێژی کرد، وەکو چۆن لە هەردوو جەژندا نوێژی دەکرد.

## ئیمام ڕووی وەردەچەرخێنێ لە خەڵک لە کاتی پاڕانەوە لە نوێژە بارانەدا

**١٥٠٩-** «عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، أَنَّ عَمَّهُ ﷺ حَدَّثَهُ، أَنَّهُ خَرَجَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَسْتَسْقِي، فَحَوَّلَ رِدَاءَهُ، وَحَوَّلَ لِلنَّاسِ ظَهْرَهُ، وَدَعَا ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فَقَرَأَ فَجَهَرَ»[١].

واتە: عەببادی کوڕی تەمیم دەگێڕێتەوە: مامی ﷺ بۆی باس کردوە، لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ نوێژە بارانە، (پێغەمبەری خوا ﷺ) عەباکەی هەڵگەڕاندەوە، پشتی لە خەڵکی کردو پاڕایەوە، پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد، قورئانی خوێند بە دەنگی بەرز.

## هەڵگەڕاندنەوەی پۆشاک لە لایەن ئیمامەوە لە کاتی نوێژە بارانە

**١٥١٠-** «عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اسْتَسْقَى، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَقَلَبَ رِدَاءَهُ»[٢].

واتە: عەببادی کوڕی تەمیم دەگێڕێتەوە: لە مامیەوە ﷺ، وتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکات نوێژە بارانەی کردو پۆشاکەکانی هەڵگەڕاندەوە.

## ئیمام کەی عەباکەی هەڵدەگەڕێنێتەوە؟

**١٥١١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ يَقُولُ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَاسْتَسْقَى، وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ حِينَ اسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.





واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو نوێژە بارانەی کرد، کاتێ ڕووی کردە قیبلە پۆشاکەکەی هەڵگەڕاندەوە.

## دەست بەرز کردنەوەی ئیمام

**١٥١٢-** «عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي الاِسْتِسْقَاءِ اسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، وَقَلَبَ الرِّدَاءَ، وَرَفَعَ يَدَيْهِ»[1].

واتە: عەببادی کوڕی تەمیم دەگێڕێتەوە لە مامیەوە ﷺ: ئەو پێغەمبەری خوای ﷺ بینی لە نوێژە بارانە ڕووی کردە قیبلەو عەباکەی هەڵگەڕاندەوەو دەستی بەرز کردەوە.

## (ئیمام) چۆن دەستی بەرز دەکاتەوە؟

**١٥١٣-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي شَيْءٍ مِنَ الدُّعَاءِ إِلَّا فِي الاِسْتِسْقَاءِ، فَإِنَّهُ كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَتَّى يُرَى بَيَاضُ إِبْطَيْهِ»[2].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەکانی بەرز نەدەکردەوە لە هیچ یەکێک لە نزاکانی مەگەر لە نوێژە بارانە نەبێ، بێگومان دەستەکانی بەرز دەکردەوە هەتا سپیایی بنباڵی دەبینرا.

**١٥١٤-** «عَنْ أَبِي اللَّحْمِ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عِنْدَ أَحْجَارِ الزَّيْتِ يَسْتَسْقِي وَهُوَ مُقْنِعٌ بِكَفَّيْهِ يَدْعُو»[3].

واتە: ئەبو لەحم ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو پێغەمبەری خوای ﷺ بینی لەلای (أَحْجَار الزَّيْت) (شوێنێک بوو لە لای مەدینە)، نوێژە بارانەی دەکرد، دەستەکانی بەرز کردبوویەوەو دەپاڕایەوە.

**١٥١٥-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: بَيْنَا نَحْنُ فِي الْمَسْجِدِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ النَّاسَ، فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تَقَطَّعَتِ السُّبُلُ، وَهَلَكَتِ الْأَمْوَالُ، وَأَجْدَبَ الْبِلَادُ،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٣١ و ٣٥٦٥، ومسلم: ٨٩٥/٧، وأبو داود: ١١٧٠، وإبن ماجه: ١١٨٠.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٥٥٧.




فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يَسْقِيَنَا، فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَيْهِ حِذَاءَ وَجْهِهِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ اسْقِنَا، فَوَاللَّهِ مَا نَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمِنْبَرِ حَتَّى أُوسِعْنَا مَطَراً، وَأُمْطِرْنَا ذَلِكَ الْيَوْمَ إِلَى الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى، فَقَامَ رَجُلٌ لَا أَدْرِي هُوَ الَّذِي قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ اسْتَسْقِ لَنَا أَمْ لَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، انْقَطَعَتِ السُّبُلُ، وَهَلَكَتِ الْأَمْوَالُ مِنْ كَثْرَةِ الْمَاءِ، فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يُمْسِكَ عَنَّا الْمَاءَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلَا عَلَيْنَا، وَلَكِنْ عَلَى الْجِبَالِ وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ، قَالَ: وَاللَّهِ مَا هُوَ إِلَّا أَنْ تَكَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِذَلِكَ تَمَزَّقَ السَّحَابُ حَتَّى مَا نَرَى مِنْهُ شَيْئاً»[١].

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: لە كاتێكدا ئێمە لە مزگەوت بووین لە ڕۆژی هەینی، پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ خەڵكی دەدا، پیاوێک هەڵساو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ڕێگاو بانەكان پچڕان (واتە: ڕێگاكانی بازرگانی نەمان بە هۆی قات و قڕیی و وشكە ساڵی) وە ماڵ و دەغڵ و دانمان لەناوچوون و وشكە ساڵی ڕووی كردە وڵات، داوا بكە لە خوا با بارانمان بۆ ببارێنێ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بەرز كردەوە تا ئاستی ڕوخساری، فەرمووی: خوایە بارانمان بۆ ببارێنی، (ئەنەس دەڵێ:) سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەرەكەی نەهاتبوویە خوارەوە باران دایگرتین، لەو ڕۆژەوە بارانمان بۆ باری تا هەینیەكەی تر داهات، پیاوێک هەڵسا نازانم ئەو پیاوە بوو كە بە پێغەمبەری وتبوو داوای بارانمان بۆ بكە، یان ئەو نەبوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ڕێگاو بانەكان چۆڵ بوون و ئاژەڵ و مەڕو ماڵاتەكان لەناوچوون بەهۆی زۆری باران بارینەوە، داوا بكە لە خوا بارانەكەمان بۆ بگرێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی خوایە بە دەوروبەرماندا نەک بەسەرماندا، بەڵكو بەسەر شاخ و شوێنی سەوزبوونی دارو كژو گیاكان، (ئەنەس) دەڵێ: سوێند بە خوا هەر ئەوەندە پێغەمبەری خوا ﷺ قسەكەی كرد، هەورەكە لەت لەت بوو هیچی نەما (واتە: بارانەكە لەو ناوچەیە ڕاوەستا).

## باسی پاڕانەوە (لە نوێژە بارانە)

**١٥١٦-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: اللَّهُمَّ اسْقِنَا»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوایە بارانمان بۆ ببارێنی.

**١٥١٧-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَقَامَ إِلَيْهِ النَّاسُ فَصَاحُوا، فَقَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، قَحَطَتِ الْمَطَرُ، وَهَلَكَتِ الْبَهَائِمُ، فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يَسْقِيَنَا، قَالَ: اللَّهُمَّ اسْقِنَا، اللَّهُمَّ اسْقِنَا قَالَ: وَايْمُ اللَّهِ، مَا نَرَى فِي السَّمَاءِ قَزَعَةً مِنْ سَحَابٍ قَالَ: فَأَنْشَأَتْ سَحَابَةٌ فَانْتَشَرَتْ، ثُمَّ إِنَّهَا أُمْطِرَتْ، وَنَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَلَّى، وَانْصَرَفَ النَّاسُ فَلَمْ تَزَلْ تَمْطُرُ إِلَى يَوْمِ الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى، فَلَمَّا قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ صَاحُوا إِلَيْهِ، فَقَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، تَهَدَّمَتِ الْبُيُوتُ، وَتَقَطَّعَتِ السُّبُلُ، فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يَحْبِسَهَا عَنَّا، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ: اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلَا عَلَيْنَا فَتَقَشَّعَتْ عَنِ الْمَدِينَةِ، فَجَعَلَتْ تَمْطُرُ حَوْلَهَا وَمَا تَمْطُرُ بِالْمَدِينَةِ قَطْرَةً، فَنَظَرْتُ إِلَى الْمَدِينَةِ وَإِنَّهَا لَفِي مِثْلِ الْإِكْلِيلِ»[1].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی هەینی وتاری دەخوێند، خەڵکەکە هەڵسان و هاواریان کرد وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، باران گیراوەو نەما، ئاژەڵ و مەڕو ماڵات لەناوچوون، داوا بکە لە خوا بارانمان بۆ ببارێنێ، فەرمووی: خوایە بارانمان بۆ ببارێنە، خوایە بارانمان بۆ ببارێنە، دەڵێ: سوێند بە خوا لە ئاسمان پارچە هەورێکمان نەدەبینی، ئیدی هەورێک هات و بڵاوەی کرد، پاشان باران باری، پێغەمبەریش لەسەر مینبەرەکە هاتە خوارەوەو نوێژی کرد، خەڵکەکەش بڵاوەیان لێکرد بەردەوام باران باری هەتا هەینیەکەی داهاتوو، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەر مینبەر بۆ وتار دان هاواریان بۆ هێنا، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ماڵەکان ڕوخان و ڕێگاوبانەکان پچڕان، داوا بکە لە خوا بارانمان لێ بگرێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بزەیەک پێکەنینی کردو فەرمووی: ئەی خوایە بە دەوروبەرماندا نەک بەسەرماندا، بارانەکەی لەسەر مەدینە نەما، بەڵکو بە دەوروبەریدا دەباری، لە مەدینە تکێکیش نەباری، تەماشای مەدینەم کرد، هەر وەکو بازنەیەک هەور دەوری دابوو.

**١٥١٨-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا دَخَلَ الْمَسْجِدَ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَائِمٌ يَخْطُبُ، فَاسْتَقْبَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَائِماً وَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلَكَتِ الْأَمْوَالُ، وَانْقَطَعَتِ السُّبُلُ، فَادْعُ

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٣٢ و ١٠٢١ و ٣٥٨٢، ومسلم: ١٠ و ٨٩٧/١١، وأبو داود: ١١٧٤.




اللَّهَ أَنْ يُغِيثَنَا، فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَيْهِ ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ أَغِثْنَا، اللَّهُمَّ أَغِثْنَا، قَالَ أَنَسٌ: وَلَا وَاللَّهِ مَا نَرَى فِي السَّمَاءِ مِنْ سَحَابَةٍ وَلَا قَزَعَةٍ وَمَا بَيْنَنَا وَبَيْنَ سَلْعٍ مِنْ بَيْتٍ وَلَا دَارٍ، فَطَلَعَتْ سَحَابَةٌ مِثْلُ التُّرْسِ، فَلَمَّا تَوَسَّطَتِ السَّمَاءَ انْتَشَرَتْ وَأَمْطَرَتْ، قَالَ أَنَسٌ: وَلَا وَاللَّهِ مَا رَأَيْنَا الشَّمْسَ سَبْتاً، قَالَ: ثُمَّ دَخَلَ رَجُلٌ مِنْ ذَلِكَ الْبَابِ فِي الْجُمُعَةِ الْمُقْبِلَةِ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَائِمٌ يَخْطُبُ، فَاسْتَقْبَلَهُ قَائِماً فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ وَسَلَّمَ عَلَيْكَ، هَلَكَتِ الْأَمْوَالُ، وَانْقَطَعَتِ السُّبُلُ، فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يُمْسِكَهَا عَنَّا، فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَيْهِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلَا عَلَيْنَا، اللَّهُمَّ عَلَى الْآكَامِ وَالظِّرَابِ، وَبُطُونِ الْأَوْدِيَةِ، وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ، قَالَ: فَأَقْلَعَتْ، وَخَرَجْنَا نَمْشِي فِي الشَّمْسِ قَالَ شَرِيكٌ: سَأَلْتُ أَنَساً: أَهُوَ الرَّجُلُ الْأَوَّلُ؟ قَالَ: لَا»[1].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێک هاتە ناو مزگەوتەوەو پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێوە وتاری دەخوێند، ڕووی کردە پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ماڵ و دەغڵ و دانمان تیاچوو، وە ڕێگاکان پچڕان (واتە: ڕێگاکانی بازرگانی نەمان بە هۆی قات و قڕیی) بپاڕێرەوە لە خوا بارانمان بۆ ببارێنێ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستی بەرز کردەوە، پاشان فەرمووی: خوایە بارانمان بۆ ببارێنە، خوایە بارانمان بۆ ببارێنە، ئەنەس دەڵێ: سوێند بە خوا نە هەورمان دی لە ئاسمان و نە پەڵەیەکیش، وە لە نێوان ئێمەو کێوی سەلعدا کە دەکەوێتە خۆرئاوای مەدینەوە، هیچ ماڵ و خانوویەک نەبوو (واتە: ئاسمان جوان دیار بوو) لە پشتی ئەو کێوەوە هەورێک هات بە وێنەی قەڵغان، کاتێک گەیشتە نێوەڕاستی ئاسمان بڵاوبوویەوەو بارانی باراند، ئەنەس دەڵێ: سوێند بە خوا بۆ ماوەی یەک هەفتە خۆرمان نەدی، پاشان پیاوێک هەفتەی داهاتوو هاتە ژوورەوە هەر لە هەمان دەرگاوە، پێغەمبەر بە پێوە وتاری دەخوێندەوە، ڕووی کردە پێغەمبەری خوا ﷺ ئینجا بە پێوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ماڵ و دەغڵ و دانمان تیاچوو، وە ڕێگاکان پچڕان، (واتە: ڕێگاکانی بازرگانی نەمان بە هۆی قات و قڕیی) لە خوا بپاڕێرەوە بیگرێتەوە لێمان، پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستی بەرزکردەوە فەرمووی: ئەی خوایە ببارێنە بە دەوروبەرمان نەک بە سەرماندا، خوایە ببارێنە بەسەر تەپۆڵکەکان و نیمچە شاخەکان و دۆڵ و شیوەکان و شوێنی سەوزبوونی دارو گژو گیاکان، وتی: هەور بە ئاسمانەوە نەما، ئینجا ئێمە دەرچووین لەبەر خۆر دەڕۆیشتین. شەریک**

---

(١) صحیح.




(یەکێکە لە گێڕەرەوانی فەرموودە) دەڵێ: پرسیم لە ئەنەسی کوڕی مالیک: ئایا ئەوە هەمان پیاوی یەکەم جار بوو (کاتێ وتی: داوا بکە با باران بوەستێ)؟ وتی: نەخێر.

## بابەت: نوێژ کردن لە دوای پاڕانەوە

**١٥١٩-** «عَنْ عَبَّادُ بْنُ تَمِيمٍ، أَنَّهُ سَمِعَ عَمَّهُ ﷺ، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْماً يَسْتَسْقِي، فَحَوَّلَ إِلَى النَّاسِ ظَهْرَهُ، يَدْعُو اللَّهَ وَيَسْتَقْبِلُ الْقِبْلَةَ، وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ»[1].

واتە: عەببادی کوڕی تەمیم دەگێڕێتەوە: مامی ﷺ بۆی باس کرد، کە یەکێک بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیوت: ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بۆ نوێژە بارانە، پشتی لە خەڵکەکە کرد، لە خوا دەپاڕایەوەو ڕووی کردبووە قیبلە، عەباکەی هەڵگەڕاندەوەو، پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد.

## نوێژە بارانە چەند ڕکاتە؟

**١٥٢٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ يَسْتَسْقِي، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دەرچوو تا نوێژە بارانە بکات، دوو ڕکات نوێژی کردو ڕووی کردە قیبلە.

## چۆنیەتی نوێژە بارانە

**١٥٢١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كِنَانَةَ قَالَ: أَرْسَلَنِي أَمِيرٌ مِنَ الْأُمَرَاءِ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَسْأَلُهُ عَنِ الِاسْتِسْقَاءِ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: مَا مَنَعَهُ أَنْ يَسْأَلَنِي؟ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُتَوَاضِعاً مُتَبَذِّلاً، مُتَخَشِّعاً، مُتَضَرِّعاً، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَمَا يُصَلِّي فِي الْعِيدَيْنِ، وَلَمْ يَخْطُبْ خُطْبَتَكُمْ هَذِهِ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) حسن.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی کینانە دەڵێ: کاربەدەستێک لە کاربەدەستان ناردمی بۆ لای ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، پرسیاری لێ بکەم دەربارەی نوێژە بارانە، ئیبنو عەبباس وتی: چی ڕێگری لێکردوە خۆی پرسیارم لێ بکات؟ (دوایی وتی:) پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بە خۆبەکەم زانین و بە پۆشاکێکی کۆنەوە خۆی نەڕازاندبوویەوە بە ترس و گەردنکەچی، ئینجا دوو ڕکات نوێژی کرد وەکو چۆن نوێژی جەژنی دەکرد، وتاری نەدا وەکو ئەم وتارەی ئێستا بۆتان دەدرێ (بەڵکو وتارەکەی دوعاو ملکەچی دەربڕین بوو).

## بابەت: قورئان خوێندن بە دەنگی بەرز لە نوێژە بارانە

١٥٢٢- «عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ فَاسْتَسْقَى، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ جَهَرَ فِيهِمَا بِالْقِرَاءَةِ»[١].

واتە: عەببادی کوڕی تەمیم لە مامییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، وتوویەتی: ڕۆژێک پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە بۆ نوێژە بارانە، دوو ڕکات نوێژی کرد، بە دەنگی بەرز قورئانی تێدا خوێند.

## ئەو نزایەی لە کاتی باران بارین (مسوڵمان) پێی دەپاڕێتەوە

١٥٢٣- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا أُمْطِرَ، قَالَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ صَيِّباً نَافِعاً»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: کاتێ باران بباریایە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوایە بیکەی بە بارانێکی بە سوود.

## ناپەسەندی داوای باران بارین بە هەسارەکان

١٥٢٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ اللَّهُ ﷻ: مَا أَنْعَمْتُ عَلَى عِبَادِي مِنْ نِعْمَةٍ إِلَّا أَصْبَحَ فَرِيقٌ مِنْهُمْ بِهَا كَافِرِينَ، يَقُولُونَ الْكَوْكَبُ وَبِالْكَوْكَبِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٠٩٩، وإبن ماجه: ٨٨٩.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٢.




**واتە: ئەبو هورەیرەﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: خواﷻ فەرموویەتی: هیچ بارانێکم نەباراندوە بەسەر بەندەکانمدا ئیللا دەستەیەکیان بێبڕوابوون پێی، دەڵێن: هەسارە هیناویەتی و بە هۆی هەسارەش هاتوە.**

**١٥٢٥-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ قَالَ: مُطِرَ النَّاسُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: أَلَمْ تَسْمَعُوا مَاذَا قَالَ رَبُّكُمُ اللَّيْلَةَ؟ قَالَ: مَا أَنْعَمْتُ عَلَى عِبَادِي مِنْ نِعْمَةٍ إِلَّا أَصْبَحَ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ بِهَا كَافِرِينَ، يَقُولُونَ: مُطِرْنَا بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا، فَأَمَّا مَنْ آمَنَ بِي وَحَمِدَنِي عَلَى سُقْيَايَ فَذَاكَ الَّذِي آمَنَ بِي وَكَفَرَ بِالْكَوْكَبِ، وَمَنْ قَالَ: مُطِرْنَا بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا، فَذَاكَ الَّذِي كَفَرَ بِي وَآمَنَ بِالْكَوْكَبِ»[١].

**واتە: زەیدی کوڕی خالدی جوهەنی ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ خەڵکی بارانیان بۆ بارێنرا، فەرمووی: ئایا دەزانن پەروەردگارتان ئەم شەو چی فەرمووە؟ فەرمووی: هیچ بارانێکم نەباراندوە بەسەر بەندەکانمدا ئیللا دەستەیەکیان بێبڕوابوون پێی، دەڵێن: بارانمان بۆ باری بە هۆی هەلاتن، یان ئاوابوونی هەسارەکان، (کەسێ وا بڵێ) ئەوە بێبڕوا بووە بە من و، بڕوادارە بە هەسارەکان.**

**تێبینی: ئەمە بۆ کەسێکە بڕوای وابێت هەسارەکان کاریگەریان هەیە لەسەر باران، بەڵام ئەوەی وەک نیشانەیەک تەماشای بکات و بڕوای وابێت تەنها خوا دەسەڵاتی باران بارینی هەیە، ئەوە بێبڕوا نابێت.**

**١٥٢٦-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَوْ أَمْسَكَ اللَّهُ ﷻ الْمَطَرَ عَنْ عِبَادِهِ خَمْسَ سِنِينَ ثُمَّ أَرْسَلَهُ لَأَصْبَحَتْ طَائِفَةٌ مِنَ النَّاسِ كَافِرِينَ يَقُولُونَ: سُقِينَا بِنَوْءِ الْمِجْدَحِ»[٢].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خوا پێنج ساڵ باران بگرێتەوە لە بەندەکانی، پاشان بیبارێنێ دەستەیەک لە خەڵکی بێبڕوا دەبن و دەڵێن: بارانمان بۆ باری بە هۆی (الْمِجْدَحِ) (کە یەکێکە لەو ئەستێرانەی لە لای عەرەب بەڵگەیە لەسەر باران بارین).**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٤٦ و ١٠٣٨ و ٧١٤٧ و ٧٥٠٣، ومسلم: ٧١، وأبو داود: ٣٩٠٦.

(٢) ضعيف.




## ئیمام داوای ڕاگرتنی باران بارین دەکات کاتێ ترسا لەوەی زیانی هەبێ

١٥٢٧- «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَحَطَ الْمَطَرُ عَاماً، فَقَامَ بَعْضُ الْمُسْلِمِينَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فِي يَوْمِ جُمُعَةٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَحَطَ الْمَطَرُ، وَأَجْدَبَتِ الأَرْضُ، وَهَلَكَ الْمَالُ، قَالَ: فَرَفَعَ يَدَيْهِ وَمَا نَرَى فِي السَّمَاءِ سَحَابَةً، فَمَدَّ يَدَيْهِ حَتَّى رَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ يَسْتَسْقِي اللَّهَ ﷻ، قَالَ: فَمَا صَلَّيْنَا الْجُمُعَةَ حَتَّى أَهَمَّ الشَّابَّ الْقَرِيبَ الدَّارِ الرُّجُوعُ إِلَى أَهْلِهِ، فَدَامَتْ جُمُعَةٌ، فَلَمَّا كَانَتِ الْجُمُعَةُ الَّتِي تَلِيهَا، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تَهَدَّمَتِ الْبُيُوتُ، وَاحْتَبَسَ الرُّكْبَانُ، قَالَ: فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِسُرْعَةِ مَلاَلَةِ ابْنِ آدَمَ، وَقَالَ بِيَدَيْهِ: اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا فَتَكَشَّطَتْ عَنِ الْمَدِينَةِ»(١).

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: ساڵێک باران نەباری، هەندێ لە مسوڵمانان هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی هەینی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، باران گیرایەوەو زەوی وشک بوو مەڕو ماڵات تیاچوو، وتی: دەستەکانی بەرز کردەوە هەتا سپیایی بنباڵی دەرکەوت داوای بارانی لە خوا ﷻ کرد، پێشتر لە ئاسمان هیچ هەورێکمان بەدی نەدەکرد، کاتێ نوێژی هەینیمان کرد، گەنج هەبوو ماڵی نزیک بوو دەیویست بچێتەوە بۆ ناو خێزانەکەی بە هۆی سەختی بارانەکەوە نەیدەتوانی بگەڕێتەوە، کاتێ هەینی داهاتوو هاتەوە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ماڵەکان ڕوخان و سوارەکان گیریان خوارد، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بزەی پێکەنینی کرد بە هۆی ئەوەی نەوەکانی ئادەم چەند زوو بێزار دەبن، دەستەکانی بەرز کردەوەو فەرمووی: خوایە لە دەوروبەرمان بیبارێنە نەک بەسەرمان. دواتر بارانەکە لەسەر مەدینە نەما.

## بابەت: ئیمام دەستەکانی بەرز دەکاتەوە لە کاتی داوا کردنی گرتنەوەی باران

١٥٢٨- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: أَصَابَ النَّاسُ سَنَةٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَبَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ عَلَى الْمِنْبَرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَقَامَ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلَكَ الْمَالُ، وَجَاعَ الْعِيَالُ، فَادْعُ اللَّهَ لَنَا، فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَيْهِ، وَمَا نَرَى فِي السَّمَاءِ قَزَعَةً، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، مَا وَضَعَهَا حَتَّى ثَارَ سَحَابٌ أَمْثَالُ الْجِبَالِ، ثُمَّ لَمْ يَنْزِلْ عَنْ مِنْبَرِهِ حَتَّى رَأَيْتُ الْمَطَرَ يَتَحَادَرُ عَلَى

---

(١) صحيح الإسناد.




لِحْيَتِهِ، فَمُطِرْنَا يَوْمَنَا ذَلِكَ وَمِنَ الْغَدِ، وَالَّذِي يَلِيهِ حَتَّى الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى، فَقَامَ ذَلِكَ الْأَعْرَابِيُّ أَوْ قَالَ غَيْرُهُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تَهَدَّمَ الْبِنَاءُ، وَغَرِقَ الْمَالُ، فَادْعُ اللَّهَ لَنَا، فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَيْهِ فَقَالَ: اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلَا عَلَيْنَا، فَمَا يُشِيرُ بِيَدِهِ إِلَى نَاحِيَةٍ مِنَ السَّحَابِ إِلَّا انْفَرَجَتْ حَتَّى صَارَتِ الْمَدِينَةُ مِثْلَ الْجَوْبَةِ، وَسَالَ الْوَادِي وَلَمْ يَجِئْ أَحَدٌ مِنْ نَاحِيَةٍ إِلَّا أَخْبَرَ بِالْجَوْدِ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: خەڵکی تووشی بێبارانی بوون لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر لە ڕۆژی هەینی وتاری دەخوێند، دەشتەکیەک هەڵسا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئاژەڵ و مەڕو ماڵاتەکان تیاچوون و خیزانەکان برسی بوون، داوای بارانمان بۆ بکە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەکانی بەرز کردەوە، پارچە هەورێکمان لە ئاسمان بەدی نەدەکرد، سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بە دەستە، دەستی دانەگرتە خوارەوە هەتا هەور ئاسمانی داپۆشی وەکو کێوەکان، پاشان لەسەر مینبەرەکەی دانەبەزی هەتا بینیم باران بەسەر ڕیشیدا دەهاتە خوارەوە، ئەو ڕۆژە بارانمان بۆ باری هەتا هەینی داهاتوو بەردەوام بوو، ئەو دەشتەکیە، یان کەسێکی تر جگە لە ئەو هەڵسا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خانووەکان ڕوخان و مەڕو ماڵاتەکان خنکان، لە خوا بپاڕێرەوە بۆمان، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەکانی بەرز کردەوەو فەرمووی: خوایە بە دەوروبەرمان نەک بەسەرماندا، بە دەستەکانی ئاماژەی بۆ هەورەکە دەکرد تا هەورەکە بڵاوەی کردو مەدینەش وەکو بازنەیەکی خڕی فراوانی لێهات، باران لە دەوروبەری دەباری، ئاوی شیوەکان کەوتنە ڕێ، هەر کەس لە دەوروبەری مەدینەوە دەهات هەواڵی بەخشندەیی و فەریحی دەدا.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٣٣ و ١٠١٨ و ١٠٣٣، ومسلم: ٨٩٧/٩.




**١٥٢٩-** «عَنْ ثَعْلَبَةَ بْنِ زَهْدَمٍ، قَالَ: كُنَّا مَعَ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِي بِطَبَرِسْتَانَ، وَمَعَنَا حُذَيْفَةُ بْنُ الْيَمَانِ ﷺ فَقَالَ: أَيُّكُمْ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْخَوْفِ؟ فَقَالَ حُذَيْفَةُ ﷺ: أَنَا، فَوَصَفَ، فَقَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْخَوْفِ بِطَائِفَةٍ رَكْعَةً، صَفٌّ خَلْفَهُ، وَطَائِفَةٍ أُخْرَى بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِالطَّائِفَةِ الَّتِي تَلِيهِ رَكْعَةً، ثُمَّ نَكَصَ هَؤُلَاءِ إِلَى مَصَافِّ أُولَئِكَ، وَجَاءَ أُولَئِكَ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً»[١].

واتە: ثەعلەبەی کوڕی زەهدەم دەڵێ: ئێمە لەگەڵ سەعیدی کوڕی عاص بووین لە طەبەرستان، حوزیفەی کوڕی یەمانیشمان ﷺ لەگەڵ بوو، وتی: کامەتان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ترسی کردوە؟ حوزەیفە ﷺ وتی: من، باسی کرد، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ یەک ڕکات نوێژی ترسی بە کۆمەڵێک کرد لە پشتیەوە، کۆمەڵێکی تریش لە نێوان ئەوو دوژمندا بوون، یەک ڕکات نوێژی بۆ ئەو کۆمەڵەش کرد، پاشان ئەمان گەڕانەوە بۆ لای جێگای ئەوانی دیکە کە لە سەنگەردابوون، ئەوانیش هاتنەوە ڕکاتێکی پێ تەواو کردن.

**١٥٣٠-** «عَنْ ثَعْلَبَةَ بْنِ زَهْدَمٍ، قَالَ: كُنَّا مَعَ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِي بِطَبَرِسْتَانَ، فَقَالَ: أَيُّكُمْ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْخَوْفِ؟ فَقَالَ: حُذَيْفَةُ ﷺ: أَنَا، فَقَامَ حُذَيْفَةُ فَصَفَّ النَّاسُ خَلْفَهُ صَفَّيْنِ، صَفًّا خَلْفَهُ وَصَفًّا مُوَازِيَ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِالَّذِي خَلْفَهُ رَكْعَةً ثُمَّ انْصَرَفَ هَؤُلَاءِ إِلَى مَكَانِ هَؤُلَاءِ، وَجَاءَ أُولَئِكَ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً وَلَمْ يَقْضُوا»[٢].

واتە: ثەعلەبەی کوڕی زەهدەم دەڵێ: ئێمە لەگەڵ سەعیدی کوڕی عاص بووین لە طەبەرستان، وتی: کامەتان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ترسی کردوە؟ حوزەیفە ﷺ وتی: من، خەڵکەکەی کرد بە دوو ڕیز لە پشتیەوە، ڕیزێک لە پشتیەوە، ڕیزێکیش ڕووبەڕووی دوژمن، یەک ڕکات نوێژی کرد بۆ ئەو ڕیزەی لە پشتیەوە بوون، پاشان ئەمانەی پشتی ڕۆیشتن بۆ شوێنی ئەوانەی ڕووبەڕوی دوژمن بوون، ئەوانیش هاتن یەک ڕکات نوێژی بۆ کردن، نوێژەکەیان قەزا نەکردەوە (لە کاتی ئاسایش).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٢٤٦.

(٢) صحيح.




**١٥٣١-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَ صَلَاةِ حُذَيْفَةَ»[١].

**واته: زەیدی کوڕی ثابت ﷺ گێڕاویەتیەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەکو نوێژەکەی حوزەیفە.**

**١٥٣٢-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: فَرَضَ اللَّهُ الصَّلَاةَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّكُمْ ﷺ فِي الْحَضَرِ أَرْبَعاً، وَفِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ، وَفِي الْخَوْفِ رَكْعَةً»[٢].

**واته: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: خوا نوێژی فەڕز کردوە لەسەر زاری پێغەمبەرەکەتان ﷺ لە شوێنی نیشتەجێ بوون چوار ڕکات، لە گەشت کردن (سەفەر) دوو ڕکات، لە کاتی هەبوونی ترس یەک ڕکات.**

**١٥٣٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى بِذِي قَرَدٍ، وَصَفَّ النَّاسُ خَلْفَهُ صَفَّيْنِ، صَفّاً خَلْفَهُ وَصَفّاً مُوَازِيَ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِالَّذِينَ خَلْفَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ انْصَرَفَ هَؤُلَاءِ إِلَى مَكَانِ هَؤُلَاءِ، وَجَاءَ أُولَئِكَ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً وَلَمْ يَقْضُوا»[٣].

**واته: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە (ذِي قَرَد) نوێژی کرد، خەڵکەکەی کرد بە دوو ڕیز لە پشتیەوە، ڕیزێک لە پشتیەوە، ڕیزێکیش ڕووبەڕوی دوژمن، یەک ڕکات نوێژی کرد بۆ ئەو ڕیزەی لە پشتیەوە بوون، پاشان ئەمانەی پشتی ڕۆیشتن بۆ شوێنی ئەوانەی ڕووبەڕووی دوژمن بوون، ئەوانیش هاتن یەک ڕکات نوێژی بۆ کردن، نوێژەکەیان قەزا نەکردەوە (لە کاتی ئاسایش).**

**١٥٣٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ فَكَبَّرَ وَكَبَّرُوا، ثُمَّ رَكَعَ وَرَكَعَ أُنَاسٌ مِنْهُمْ، ثُمَّ سَجَدَ وَسَجَدُوا، ثُمَّ قَامَ إِلَى الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ، فَتَأَخَّرَ الَّذِينَ سَجَدُوا مَعَهُ وَحَرَسُوا إِخْوَانَهُمْ، وَأَتَتِ الطَّائِفَةُ الْأُخْرَى فَرَكَعُوا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، وَسَجَدُوا وَالنَّاسُ كُلُّهُمْ فِي صَلَاةٍ يُكَبِّرُونَ وَلَكِنْ يَحْرُسُ بَعْضُهُمْ بَعْضاً»[٤].

**واته: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا، خەڵکەکەش لەگەڵی هەڵسان، تەکبیری کرد ئەوانیش تەکبیریان کرد،**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٤٤.

(٤) صحيح.

پاشان ڕکوعی برد کۆمەڵێک لە خەڵکەکە لەگەڵی ڕکوعیان برد، پاشان سوژدەی بردو سوژدەیان برد، پاشان هەڵسایەوە بۆ ڕکاتی دووەم، ئەوانەی لەگەڵی سوژدەیان بردبوو دواکەوتن و پاسەوانی براکانیان دەکرد، ئینجا کۆمەڵەکەی تر هاتن لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ڕکوع و سوژدەیان برد، وە خەڵکەکە هەموویان لە ناو نوێژدا تەکبیریان دەکرد، بەڵام هەندێکیان پاسەوانی هەندێکی دیکەیان دەکرد.

**١٥٣٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: مَا كَانَتْ صَلَاةُ الْخَوْفِ إِلَّا سَجْدَتَيْنِ كَصَلَاةِ أَحْرَاسِكُمْ هَؤُلَاءِ الْيَوْمَ خَلْفَ أَئِمَّتِكُمْ هَؤُلَاءِ، إِلَّا أَنَّهَا كَانَتْ عُقَباً، قَامَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ وَهُمْ جَمِيعاً مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَسَجَدَتْ مَعَهُ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ، ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَامُوا مَعَهُ جَمِيعاً، ثُمَّ رَكَعَ وَرَكَعُوا مَعَهُ جَمِيعاً، ثُمَّ سَجَدَ فَسَجَدَ مَعَهُ الَّذِينَ كَانُوا قِيَاماً أَوَّلَ مَرَّةٍ، فَلَمَّا جَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَالَّذِينَ سَجَدُوا مَعَهُ فِي آخِرِ صَلَاتِهِمْ سَجَدَ الَّذِينَ كَانُوا قِيَاماً لِأَنْفُسِهِمْ، ثُمَّ جَلَسُوا فَجَمَعَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالتَّسْلِيمِ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: نوێژی ترس تەنها دوو سوژدە بووە وەکو نوێژی پاسەوانەکانتان ئەوانەی ئەمڕۆ لە پشتی پێشەواکانتانن، ئەوە نەبێ کۆمەڵێک لە دوای کۆمەڵێکی تر سوژدە دەبات، دەستەیەکیان هەڵسانەوە، هەموویان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بوون، دەستەکەی تر لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ سوژدەی برد، پاشان پێغەمبەر ﷺ هەڵسا هەموویان لەگەڵی هەڵسانەوە، پاشان ڕکوعی برد هەموویان لەگەڵی ڕکوعیان برد، پاشان سوژدەی برد ئەوانە لەگەڵی سوژدەیان برد کە یەک جار لەگەڵی وەستابوون، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت، وە ئەوانەش کە سوژدەیان بردبوو لەگەڵی لە کۆتا نوێژیاندا، ئەوانەش کە بە پێوە بوون سوژدەیان برد، پاشان دانیشتن پێغەمبەری خوا ﷺ کۆی کردنەوە بە سەلامدانەوە.

**١٥٣٦-** «عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى بِهِمْ صَلَاةَ الْخَوْفِ، فَصَفَّ صَفّاً خَلْفَهُ وَصَفّاً مُصَافُّو الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً، ثُمَّ ذَهَبَ هَؤُلَاءِ وَجَاءَ أُولَئِكَ، فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً، ثُمَّ قَامُوا فَقَضَوْا رَكْعَةً رَكْعَةً»[2].

---

(١) حسن صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤١٢٩ و ٤١٣١، ومسلم: ٨٤١ و ٨٤٢، وأبو داود: ١٢٣٧ و ١٢٣٨ و ١٢٣٩، والترمذي: ٥٦٥ و ٥٦٦، وإبن ماجه: ١٢٥٩.




واتە: سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ترسی بۆ کردن، ڕیزێکی لە پشتیەوە دانا ڕیزیکیش ڕووبەڕووی دوژمن، یەک ڕکات نوێژی بۆ کردن، پاشان ئەمان ڕۆیشتن، ئەوانی تر هاتن، یەک ڕکاتیشی بۆ ئەوان کرد، پاشان هەڵسانەوە یەک ڕکات، یەک ڕکاتیان تەواو کرد.

**١٥٣٧-** «عَنْ صَالِحِ بْنِ خَوَّاتٍ ﷺ، عَمَّنْ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ ذَاتِ الرِّقَاعِ صَلَاةَ الْخَوْفِ، أَنَّ طَائِفَةً صَفَّتْ مَعَهُ، وَطَائِفَةٌ وِجَاهَ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِالَّذِينَ مَعَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ ثَبَتَ قَائِماً وَأَتَمُّوا لِأَنْفُسِهِمْ ثُمَّ انْصَرَفُوا، فَصَفُّوا وِجَاهَ الْعَدُوِّ، وَجَاءَتِ الطَّائِفَةُ الْأُخْرَى فَصَلَّى بِهِمُ الرَّكْعَةَ الَّتِي بَقِيَتْ مِنْ صَلَاتِهِ، ثُمَّ ثَبَتَ جَالِساً وَأَتَمُّوا لِأَنْفُسِهِمْ، ثُمَّ سَلَّمَ بِهِمْ»[١].

واتە: صاڵحی کوڕی خەووات ﷺ دەگێڕێتەوە: لەو کەسەی کە نوێژی ترسی کردوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی (ذَاتِ الرِّقَاعِ)دا، (دەڵێ:) کۆمەڵێک ڕیزیان بەست لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، کۆمەڵێکیش ڕووبەڕووی دوژمن، یەک ڕکات نوێژی کرد بەوانەی لەگەڵیدا بوون، پاشان بە پێوە وەستاو جێگیر بوو، ئەوان نوێژەکەیان بۆ خۆیان تەواو کرد، پاشان لاچوون، ڕیزیان بەست ڕووبەڕووی دوژمن، ئینجا کۆمەڵی دووەم هاتن، ئەو ڕکاتە نوێژەی پێکردن کە مابوو، پاشان بە دانیشتنەوە مایەوە تا ئەوانیش ڕکاتەکەیان بۆ خۆیان تەواو کرد، ئینجا سەلامی پێدانەوە.

**١٥٣٨-** «عَن عَبْدِ اللَّهِ بن عُمر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى بِإِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ رَكْعَةً، وَالطَّائِفَةُ الْأُخْرَى مُوَاجِهَةُ الْعَدُوِّ، ثُمَّ انْطَلَقُوا فَقَامُوا فِي مَقَامِ أُولَئِكَ، وَجَاءَ أُولَئِكَ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً أُخْرَى، ثُمَّ سَلَّمَ عَلَيْهِمْ، فَقَامَ هَؤُلَاءِ فَقَضَوْا رَكْعَتَهُمْ، وَقَامَ هَؤُلَاءِ فَقَضَوْا رَكْعَتَهُمْ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ یەک ڕکات نوێژی بە یەکێک لە دوو کۆمەڵەکە کرد، کۆمەڵەکەی دیکەش ڕووبەڕووی دوژمن بوون، پاشان هەڵسان چوونە جێگای ئەمان، ئەمانیش هاتن یەک ڕکاتی بۆ کردن، پاشان سەلامی دایەوە، ئەمان هەڵسان یەک ڕکاتەکەی تریان تەواو کرد، ئەوانیش هەڵسان ڕکاتەکەیان تەواو کرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**١٥٣٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن عُمر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قِبَلَ نَجْدٍ، فَوَازَيْنَا الْعَدُوَّ وَصَافَفْنَاهُمْ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي بِنَا، فَقَامَتْ طَائِفَةٌ مِنَّا مَعَهُ، وَأَقْبَلَ طَائِفَةٌ عَلَى الْعَدُوِّ، فَرَكَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَمَنْ مَعَهُ رَكْعَةً، وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ انْصَرَفُوا فَكَانُوا مَكَانَ أُولَئِكَ الَّذِينَ لَمْ يُصَلُّوا، وَجَاءَتِ الطَّائِفَةُ الَّتِي لَمْ تُصَلِّ فَرَكَعَ بِهِمْ رَكْعَةً وَسَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَامَ كُلُّ رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ فَرَكَعَ لِنَفْسِهِ رَكْعَةً وَسَجْدَتَيْنِ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: غەزام کرد لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕووی نەجدەوە بە دوژمن گەیشتین و بەرانبەریان ڕیزمان بەست، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا نوێژی بۆ کردین، کۆمەڵێک نوێژیان لەگەڵیدا کرد، کۆمەڵێکیشیان ڕووبەڕووی دوژمن وەستان، پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون ڕکوعێک و دوو سوژدەی پێ بردن، پاشان چوونە جێگای ئەوانەی نوێژیان نەکردبوو، ئەو کۆمەڵەش هاتن کە نوێژیان نەکردبوو، ڕکوعێک و دوو سوژدەی پێ بردن و، پاشان سەلامی دایەوە، هەر یەکە لەوانە بۆ خۆی ڕکوعێکی برد لەگەڵ دوو سوژدەدا.

**١٥٤٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْن عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّهُ صَلَّى صَلَاةَ الْخَوْفِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَبَّرَ النَّبِيُّ ﷺ وَصَفَّ خَلْفَهُ طَائِفَةٌ مِنَّا، وَأَقْبَلَتْ طَائِفَةٌ عَلَى الْعَدُوِّ، فَرَكَعَ بِهِمُ النَّبِيُّ ﷺ رَكْعَةً وَسَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ انْصَرَفُوا وَأَقْبَلُوا عَلَى الْعَدُوِّ، وَجَاءَتِ الطَّائِفَةُ الْأُخْرَى فَصَلَّوْا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فَفَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ قَامَ كُلُّ رَجُلٍ مِنَ الطَّائِفَتَيْنِ فَصَلَّى لِنَفْسِهِ رَكْعَةً وَسَجْدَتَيْنِ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: نوێژی ترسی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کرد، وتی: پێغەمبەر ﷺ تەکبیری کرد، کۆمەڵێکمان لە پشتیەوە ڕیزمان بەست، کۆمەڵێکیشمان ڕووبەڕووی دوژمن وەستاین، پێغەمبەر ﷺ ڕکوعێک و دوو سوژدەی پێکردن، پاشان لاچوون و ڕووبەڕووی دوژمن وەستان، کۆمەڵەکەی تریش هاتن نوێژیان کرد لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ هەر وەکو ئەوە، پاشان سەلامی دایەوە، پاشان هەر پیاوێک لەو دوو دەستەیە هەڵسا ڕکوعێک و دوو سوژدەی بۆ خۆی برد.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٤٢ و ٩٤٣ و ٤١٣٢ و٤١٣٣، ومسلم: ٣٠٦ و ٨٣٩/٣٠٧، وأبو داود: ١٢٤٣، والترمذي: ٥٦٤.

(٢) صحيح لغيره.




**١٥٤١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْخَوْفِ قَامَ فَكَبَّرَ، فَصَلَّى خَلْفَهُ طَائِفَةٌ مِنَّا وَطَائِفَةٌ مُوَاجِهَةَ الْعَدُوِّ، فَرَكَعَ بِهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَكْعَةً وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ انْصَرَفُوا وَلَمْ يُسَلِّمُوا وَأَقْبَلُوا عَلَى الْعَدُوِّ، فَصَفُّوا مَكَانَهُمْ، وَجَاءَتِ الطَّائِفَةُ الْأُخْرَى فَصَفُّوا خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً وَسَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَدْ أَتَمَّ رَكْعَتَيْنِ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ، ثُمَّ قَامَتِ الطَّائِفَتَانِ فَصَلَّى كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ لِنَفْسِهِ رَكْعَةً وَسَجْدَتَيْنِ»(١).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ترسی کرد، هەڵسا تەکبیری کرد، کۆمەڵێک لە ئێمە لە پشتیەوە نوێژیان کرد، کۆمەڵێکیش ڕووبەڕووی دوژمن وەستا بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕکوعێک و دوو سوژدەی پێ بردن، پاشان لاچوون و سەلامیان نەدایەوەو ڕۆیشتنە جێگاکانی ئەوان، ڕوبەڕووی دوژمن وەستانەوە، ئینجا کۆمەڵەکەی تر هاتن لە پشتی پێغەمبەری خوا ڕیزیان بەست، نوێژی بۆ کردن بە یەک ڕکوع و دوو سوژدە، پاشان پێغەمبەر ﷺ سەلامی دایەوە دوو ڕکوع و چوار سوژدەی تەواو کرد، پاشان هەر دوو کۆمەڵەکە هەڵسان، هەر کەس بۆ خۆی ڕکوعێک و دوو سوژدەی برد.**

**١٥٤٢-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْخَوْفِ فِي بَعْضِ أَيَّامِهِ، فَقَامَتْ طَائِفَةٌ مَعَهُ وَطَائِفَةٌ بِإِزَاءِ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِالَّذِينَ مَعَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ ذَهَبُوا وَجَاءَ الْآخَرُونَ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً، ثُمَّ قَضَتِ الطَّائِفَتَانِ رَكْعَةً رَكْعَةً»(٢).

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی ترسی کرد لە هەندێ لەو ڕۆژانەی کە غەزای تێدا کرد، کۆمەڵێک لەگەڵی نوێژیان دابەست کۆمەڵێکی تریش ڕووبەڕووی دوژمن بوون، یەک ڕکات نوێژی کرد بۆ ئەوانەی لە پشتیەوە بوون، پاشان ڕۆیشتن و ئەوانی تر هاتن، یەک ڕکاتی بۆ کردن، پاشان ئەو دوو کۆمەڵە هەر یەکەو بۆ خۆی یەک ڕکاتەکەی تری تەواو کرد.**

**١٥٤٣-** «عَنْ مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ، أَنَّهُ سَأَلَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ: هَلْ صَلَّيْتَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْخَوْفِ؟ فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: نَعَمْ، قَالَ: مَتَى، قَالَ: عَامَ غَزْوَةِ نَجْدٍ، قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِصَلَاةِ الْعَصْرِ

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.




وَقَامَتْ مَعَهُ طَائِفَةٌ وَطَائِفَةٌ أُخْرَى مُقَابِلَ الْعَدُوِّ وَظُهُورُهُمْ إِلَى الْقِبْلَةِ، فَكَبَّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَكَبَّرُوا جَمِيعاً الَّذِينَ مَعَهُ وَالَّذِينَ يُقَابِلُونَ الْعَدُوَّ، ثُمَّ رَكَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَكْعَةً وَاحِدَةً وَرَكَعَتْ مَعَهُ الطَّائِفَةُ الَّتِي تَلِيهِ، ثُمَّ سَجَدَ وَسَجَدَتِ الطَّائِفَةُ الَّتِي تَلِيهِ وَالآخَرُونَ قِيَامٌ مُقَابِلَ الْعَدُوِّ، ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَامَتِ الطَّائِفَةُ الَّتِي مَعَهُ، فَذَهَبُوا إِلَى الْعَدُوِّ فَقَابَلُوهُمْ، وَأَقْبَلَتِ الطَّائِفَةُ الَّتِي كَانَتْ مُقَابِلَ الْعَدُوِّ فَرَكَعُوا وَسَجَدُوا، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَائِمٌ كَمَا هُوَ، ثُمَّ قَامُوا فَرَكَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَكْعَةً أُخْرَى وَرَكَعُوا مَعَهُ وَسَجَدَ وَسَجَدُوا مَعَهُ، ثُمَّ أَقْبَلَتِ الطَّائِفَةُ الَّتِي كَانَتْ مُقَابِلَ الْعَدُوِّ فَرَكَعُوا وَسَجَدُوا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَاعِدٌ وَمَنْ مَعَهُ، ثُمَّ كَانَ السَّلَامُ فَسَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَسَلَّمُوا جَمِيعاً، فَكَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ رَكْعَتَانِ وَلِكُلِّ رَجُلٍ مِنَ الطَّائِفَتَيْنِ رَكْعَتَانِ رَكْعَتَانِ»[1].

**واتە: مەڕوانی کوڕی حەکەم پرسیاری کرد لە ئەبو هورەیرە ﷺ، وتی: ئایا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ترست کردوە؟ ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: بەڵێ، (مەڕوان) وتی: کەی، وتی: ساڵی غەزای نەجد، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا بۆ نوێژی عەسر، کۆمەڵێکیش لەگەڵی هەڵسان، کۆمەڵەکەی تریش ڕووبەڕووی دوژمن وەستابوونەوە پشتیان لە قیبلە بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ تەکبیری کردو ئەوانیش هەموویان تەکبیریان کرد لەگەڵیدا، ئەوانەیشی ڕووبەڕووی دوژمن وەستابوون، پاشان پێغەمبەر یەک ڕکات نوێژی کرد، ئەو کۆمەڵەیشی کە لە پشتیەوە بوون ڕکاتێکیان کرد، پاشان سوژدەی برد ئەو کۆمەڵەیش کە لە پشتیەوە بوون سوژدەیان برد، ئەوانی دیکەش وەستابوون ڕووبەڕوی دوژمن، پاشان پێغەمبەر ﷺ هەڵسا ئەو کۆمەڵەیش لەگەڵیدا بوون هەڵسانەوە ڕۆیشتن ڕووبەڕووی دوژمن بوونەوە، ئەوە کۆمەڵەیش کە لەبەرانبەر دوژمن وەستابوون هاتن ڕکوع و سوژدەیان برد، پێغەمبەری خوا وەکو خۆی وەستابوو، پاشان هەڵسانەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕکوعێکی تری برد، ئەوانیش لەگەڵیدا ڕکوعیان برد، ئینجا سوژدەی بردو ئەوانیش سوژدەیان لەگەڵیدا برد، پاشان ئەو دەستەیەی ڕووبەڕووی دوژمن وەستابوون ڕویان تێکردو ڕکوع و سوژدەیان برد، پێغەمبەریش دانیشتبوو لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، پاشان پێغەمبەر سەلامی دایەوە ئەوانیش هەموویان سەلامیان دایەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکاتی کرد، هەروەها هەر پیاوێک لەو دوو کۆمەڵە دوو ڕکات دوو ڕکاتیان کرد.**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٢٤٠ و ١٢٤١.

**١٥٤٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نَازِلاً بَيْنَ ضَجْنَانَ وَعُسْفَانَ مُحَاصِرَ الْمُشْرِكِينَ، فَقَالَ الْمُشْرِكُونَ: إِنَّ لِهَؤُلَاءِ صَلَاةً هِيَ أَحَبُّ إِلَيْهِمْ مِنْ أَبْنَائِهِمْ وَأَبْكَارِهِمْ، أَجْمِعُوا أَمْرَكُمْ ثُمَّ مِيلُوا عَلَيْهِمْ مَيْلَةً وَاحِدَةً، فَجَاءَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ فَأَمَرَهُ أَنْ يَقْسِمَ أَصْحَابَهُ نِصْفَيْنِ، فَيُصَلِّيَ بِطَائِفَةٍ مِنْهُمْ، وَطَائِفَةٌ مُقْبِلُونَ عَلَى عَدُوِّهِمْ قَدْ أَخَذُوا حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ، فَيُصَلِّيَ بِهِمْ رَكْعَةً، ثُمَّ يَتَأَخَّرَ هَؤُلَاءِ وَيَتَقَدَّمَ أُولَئِكَ فَيُصَلِّيَ بِهِمْ رَكْعَةً تَكُونُ لَهُمْ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ رَكْعَةً رَكْعَةً وَلِلنَّبِيِّ ﷺ رَكْعَتَانِ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزیە نێوان (ضَجْنَانَ وَعُسْفَانَ) هاوبەشدانەرانی دەور دابوو، هاوبەشدانەران وتیان: ئەمانە نوێژێکیان هەیە لە لایان خۆشەویسترە لە کوڕو کچەکانیان، خۆتان یەکبخەن، پاشان یەکجار بدەن بەسەریانداو تەواویان بکەن، جبریل (علیه السلام) هات فەرمانی کرد بە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵەکانی بکات بە دوو بەشەوە، نوێژ بە کۆمەڵێکیان بکات، کۆمەڵێکیشیان بەرەو ڕووی دوژمن بوەستن ئاگاداری خۆیان و چەکەکانیان بن، یەک ڕکات نوێژیان پێ بکات، پاشان ئەوانە بچنە دواوە، پاشان ئەوانی تر بێنە پێشەوە یەک ڕکاتیان بۆ بکات، ئەوجا هەریەکە لەو دوو کۆمەڵە یەک ڕکاتێکیان کردوە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ دوو ڕکات.**

**تێبینی: (ضَجْنَانَ) کێوێکە بیست و پێنج میل دوورە لە مەککەوە. وە (عُسْفَانَ): دێیەکە لە نێوان مەککەو مەدینە سی و شەش میل لە مەککەوە دوورە.**

**١٥٤٥-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى بِهِمْ صَلَاةَ الْخَوْفِ، فَقَامَ صَفٌّ بَيْنَ يَدَيْهِ وَصَفٌّ خَلْفَهُ، صَلَّى بِالَّذِينَ خَلْفَهُ رَكْعَةً وَسَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ تَقَدَّمَ هَؤُلَاءِ حَتَّى قَامُوا فِي مَقَامِ أَصْحَابِهِمْ، وَجَاءَ أُولَئِكَ فَقَامُوا مَقَامَ هَؤُلَاءِ، وَصَلَّى بِهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَكْعَةً وَسَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، فَكَانَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ رَكْعَتَانِ وَلَهُمْ رَكْعَةٌ»[٢].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ترسی بۆ کردن، ڕیزێک لە پێشیەوە، ڕیزێکی تریش لە دوایەوە، نوێژی بۆ ئەمانە کرد کە لەپشتیەوە بوون ڕکوعێک و دوو سوژدە، پاشان ئەمان چوونە پێشەوە**

---

**(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٠٣٥.**

**(٢) صحيح.**




**بۆ جێگای ئەوانی تر، ئەوانیش هاتنە شوێنەکەی ئەمان، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆ کردن ڕکوعێک و دوو سوژدە، پاشان سەلامی دایەوە، ئەو کات پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکاتی کردو ئەوانیش یەک ڕکات.**

**١٥٤٦-** «عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَامَتْ خَلْفَهُ طَائِفَةٌ وَطَائِفَةٌ مُوَاجِهَةَ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِالَّذِينَ خَلْفَهُ رَكْعَةً وَسَجَدَ بِهِمْ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ إِنَّهُمُ انْطَلَقُوا فَقَامُوا مَقَامَ أُولَئِكَ الَّذِينَ كَانُوا فِي وَجْهِ الْعَدُوِّ، وَجَاءَتْ تِلْكَ الطَّائِفَةُ فَصَلَّى بِهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَكْعَةً وَسَجَدَ بِهِمْ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَلَّمَ فَسَلَّمَ الَّذِينَ خَلْفَهُ وَسَلَّمَ أُولَئِكَ»[1].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین قامەت کرا بۆ نوێژ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵساو کۆمەڵێک لە پشتیەوە نوێژیان دابەست، کۆمەڵێکیش ڕووبەڕووی دوژمن بوون لە سەنگەردا، نوێژی بۆ ئەوانەی پشتەوەی کرد، ڕکوعێک و دوو سوژدەی پێ بردن، پاشان ئەوان هەڵسان چوونە شوێنی ئەوانەی ڕووبەڕووی دوژمن بوون، ئینجا ئەو کۆمەڵەی دیکە هات پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆ کردن ڕکوعێک و دوو سوژدەی پێ بردن، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی دایەوە، ئەوانەی پشتەوەی سەلامیان دایەوەو ئەوانەی تریش کە لە سەنگەردا بوون سەلامیان دایەوە.**

**١٥٤٧-** «عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: شَهِدْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْخَوْفِ، فَقُمْنَا خَلْفَهُ صَفَّيْنِ وَالْعَدُوُّ بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ، فَكَبَّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَكَبَّرْنَا، وَرَكَعَ وَرَكَعْنَا، وَرَفَعَ وَرَفَعْنَا، فَلَمَّا انْحَدَرَ لِلسُّجُودِ سَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَالَّذِينَ يَلُونَهُ، وَقَامَ الصَّفُّ الثَّانِي حِينَ رَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَالصَّفُّ الَّذِينَ يَلُونَهُ، ثُمَّ سَجَدَ الصَّفُّ الثَّانِي حِينَ رَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي أَمْكِنَتِهِمْ، ثُمَّ تَأَخَّرَ الصَّفُّ الَّذِينَ كَانُوا يَلُونَ النَّبِيَّ ﷺ وَتَقَدَّمَ الصَّفُّ الْآخَرُ فَقَامُوا فِي مَقَامِهِمْ وَقَامَ هَؤُلَاءِ فِي مَقَامِ الْآخَرِينَ قِيَاماً، وَرَكَعَ النَّبِيُّ ﷺ وَرَكَعْنَا، ثُمَّ رَفَعَ وَرَفَعْنَا، فَلَمَّا انْحَدَرَ لِلسُّجُودِ سَجَدَ الَّذِينَ يَلُونَهُ وَالْآخَرُونَ قِيَامٌ، فَلَمَّا رَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَالَّذِينَ يَلُونَهُ سَجَدَ الْآخَرُونَ، ثُمَّ سَلَّمَ»[2].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤١٣٠ تعليقاً، ومسلم: ٣٠٧ و ٨٤٠/٣٠٨، وابن ماجه: ١٢٦٠.**




واتە: جابر ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادەی نوێژی ترس بووین، لە پشتیەوە وەستاین بە دوو ڕیز، دوژمنیش لە نێوان ئێمەو قیبلە بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ تەکبیری کرد ئێمەش تەکبیرمان کرد، ڕکوعی بردو ڕکوعمان برد، بەرزبوویەوەو بەرزبووینەوە، کاتێ چەمیەوە بۆ سوژدە، پێغەمبەرو ئەوانەی ڕاستەوخۆ لە دوایەوە بوون سوژدەیان برد، ڕیزەی دووەم بە پێوە وەستان، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺو ئەو ڕیزەی ڕاستەوخۆ لە دوایەوە بوون هەڵسانەوە، پاشان ڕیزی دووەم سوژدەی برد، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بەرزبوویەوە، پاشان ڕیزی یەکەم هاتنە دواوە کە ڕاستەوخۆ لە دوای پێغەمبەر بوون، ڕیزی دووەم پێشکەوتن و چوونە جێگایان بە پێوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕکوعی بردو ئێمەش ڕکوعمان برد، پاشان بەرزبوویەوەو ئێمەش بەرزبووینەوە، کاتێ چەمیەوە بۆ سوژدە ئەوانەی ڕاستەوخۆ لە پشتیەوە بوون سوژدەیان برد، ئەوانی تریش بە پێوە وەستان، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بەرزبوویەوە لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵی بوون، ئەوانی تر سوژدەیان برد، پاشان سەلامی دایەوە.

**١٥٤٨-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِنَخْلٍ وَالْعَدُوُّ بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ فَكَبَّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَكَبَّرُوا جَمِيعاً، ثُمَّ رَكَعَ فَرَكَعُوا جَمِيعاً، ثُمَّ سَجَدَ النَّبِيُّ ﷺ وَالصَّفُّ الَّذِي يَلِيهِ وَالآخَرُونَ قِيَامٌ يَحْرُسُونَهُمْ، فَلَمَّا قَامُوا سَجَدَ الآخَرُونَ مَكَانَهُمُ الَّذِي كَانُوا فِيهِ، ثُمَّ تَقَدَّمَ هَؤُلَاءِ إِلَى مَصَافِّ هَؤُلَاءِ، فَرَكَعَ فَرَكَعُوا جَمِيعاً، ثُمَّ رَفَعَ فَرَفَعُوا جَمِيعاً، ثُمَّ سَجَدَ النَّبِيُّ ﷺ وَالصَّفُّ الَّذِينَ يَلُونَهُ وَالآخَرُونَ قِيَامٌ يَحْرُسُونَهُمْ، فَلَمَا سَجَدُوا وَجَلَسُوا سَجَدَ الآخَرُونَ مَكَانَهُمْ، ثُمَّ سَلَّمَ، قَالَ جَابِرٌ: كَمَا يَفْعَلُ أُمَرَاؤُكُمْ»[1].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین (لە شوێنێک) بە ناو نەخل، دوژمن لە نێوان ئێمەو نێوان قیبلە بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ تەکبیری کرد، هەموویان بە گشتی تەکبیریان کرد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سوژدەی برد، هەروەها ئەو ڕیزەی ڕاستەوخۆ لە پشتیەوە بوون، ئەوانی تر بە پێوە وەستابوون پاسەوانیان دەکردن، کاتێ هەڵسانەوە ڕیزەکەی تر سوژدەیان برد لەو جێگایەی خۆیان کە تێدا بوون، پاشان ئەو ڕیزەی لە پشتی پێغەمبەرەوە بوو هاتن بۆ لای ڕیزەکەی دواوە، ئینجا ڕکوعی برد هەموویان بە گشتی ڕکوعیان برد، پاشان بەرزبوویەوەو هەموویان

---

(١) صحيح.




**بە گشتی بەرزبوونەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ سوژدەی برد، هەروەها ڕیزی دوای خۆی و ئەو ڕیزەش کە وەستابوون پاسەوانیان دەکرد، کاتێ سوژدەیان بردو دانیشتن ئەوانی تر لە جێگایان سوژدەیان برد، پاشان سەلامی دایەوە، جابر دەڵێ: وەکو چۆن کاربەدەستەکانتان دەیکەن.**

**١٥٤٩-** «عَنْ أَبِي عَيَّاشٍ الزُّرَقِيِّ رضي الله عنه، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ مُصَافَّ الْعَدُوِّ بِعُسْفَانَ، وَعَلَى الْمُشْرِكِينَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ، فَصَلَّى بِهِمُ النَّبِيُّ ﷺ الظُّهْرَ، قَالَ الْمُشْرِكُونَ: إِنَّ لَهُمْ صَلاَةً بَعْدَ هَذِهِ هِيَ أَحَبُّ إِلَيْهِمْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ وَأَبْنَائِهِمْ، فَصَلَّى بِهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْعَصْرَ، فَصَفَّهُمْ صَفَّيْنِ خَلْفَهُ، فَرَكَعَ بِهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَمِيعاً، فَلَمَّا رَفَعُوا رُءُوسَهُمْ سَجَدَ بِالصَّفِّ الَّذِي يَلِيهِ وَقَامَ الآخَرُونَ، فَلَمَّا رَفَعُوا رُءُوسَهُمْ مِنَ السُّجُودِ سَجَدَ الصَّفُّ الْمُؤَخَّرُ بِرُكُوعِهِمْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ تَأَخَّرَ الصَّفُّ الْمُقَدَّمُ، وَتَقَدَّمَ الصَّفُّ الْمُؤَخَّرُ، فَقَامَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ فِي مَقَامِ صَاحِبِهِ، ثُمَّ رَكَعَ بِهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَمِيعاً، فَلَمَّا رَفَعُوا رُءُوسَهُمْ مِنَ الرُّكُوعِ سَجَدَ الصَّفُّ الَّذِي يَلِيهِ وَقَامَ الآخَرُونَ، فَلَمَّا فَرَغُوا مِنْ سُجُودِهِمْ سَجَدَ الآخَرُونَ، ثُمَّ سَلَّمَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَيْهِمْ»(١).

**واتە: ئەبو عەییاشی زورەقی رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ ڕووبەڕووی دوژمن بوو لە عوسفان (کە شوێنێکە دەکەوێتە نێوان مەککەو مەدینە) خالیدی کوڕی وەلید گەورەی هاوبەشدانەران بوو، پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردن، هاوبەشدانەران وتیان: نوێژێکیان هەیە لە دوای ئەم نوێژە خۆشەویستترە لە لایان لە ماڵ و منداڵیان، پێغەمبەر ﷺ نوێژی عەسری بۆ کردن، کردنی بە دوو ڕیز لە پشتیەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕکوعی بە هەموویان برد بە گشتی، کاتێ سەریان بەرز کردەوە سوژدەی برد بەو ڕیزەی ڕاستەوخۆ لە دوایەوە بوون، ڕیزەکەی تر بە پێوە بوون، کاتێ سەریان لە سوژدە بەرز کردەوە، ڕیزەکەی دواوە بە ڕکوعەکەیان سوژدەیان برد، پاشان ڕیزی دوای پێغەمبەر هاتنە دوای دواوە، ڕیزی دواش هاتنە پێشەوە، هەر یەکەیان چوونە شوێنی ئەوی تر، پاشان ڕکوعی بە هەموویان برد بە گشتی، کاتێ سەریان بەرزکردەوە لە ڕکوع، ئەو ڕیزەی ڕاستەوخۆ لە دوایەوەن سوژدەیان برد، کاتێ لە سوژدەکەیان بوونەوە، ئەوانی تر لە دواوە سوژدەیان برد، پاشان پێغەمبەر ﷺ سەلامی دایەوە.**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٢٣٦.





**١٥٥٠-** «عَنْ أَبِي عَيَّاشٍ الزُّرَقِيِّ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِعُسْفَانَ، فَصَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الظُّهْرِ، وَعَلَى الْمُشْرِكِينَ يَوْمَئِذٍ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ فَقَالَ الْمُشْرِكُونَ: لَقَدْ أَصَبْنَا مِنْهُمْ غِرَّةً، وَلَقَدْ أَصَبْنَا مِنْهُمْ غَفْلَةً، فَنَزَلَتْ ـ يَعْنِي ـ صَلَاةَ الْخَوْفِ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، فَصَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْعَصْرِ، فَفَرَّقَنَا فِرْقَتَيْنِ، فِرْقَةً تُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، وَفِرْقَةً يَحْرُسُونَهُ، فَكَبَّرَ بِالَّذِينَ يَلُونَهُ وَالَّذِينَ يَحْرُسُونَهُمْ، ثُمَّ رَكَعَ فَرَكَعَ هَؤُلَاءِ وَأُولَئِكَ جَمِيعاً، ثُمَّ سَجَدَ الَّذِينَ يَلُونَهُ وَتَأَخَّرَ هَؤُلَاءِ وَالَّذِينَ يَلُونَهُ وَتَقَدَّمَ الْآخَرُونَ فَسَجَدُوا، ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ بِهِمْ جَمِيعاً الثَّانِيَةَ بِالَّذِينَ يَلُونَهُ وَبِالَّذِينَ يَحْرُسُونَهُ، ثُمَّ سَجَدَ بِالَّذِينَ يَلُونَهُ، ثُمَّ تَأَخَّرُوا فَقَامُوا فِي مَصَافِّ أَصْحَابِهِمْ وَتَقَدَّمَ الْآخَرُونَ فَسَجَدُوا، ثُمَّ سَلَّمَ عَلَيْهِمْ، فَكَانَتْ لِكُلِّهِمْ رَكْعَتَانِ رَكْعَتَانِ مَعَ إِمَامِهِمْ وَصَلَّى مَرَّةً بِأَرْضِ بَنِي سُلَيْمٍ»[١].

**واتە: ئەبو عیاشی زورەقی ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە عوسفان (کە شوێنێکە دەکەوێتە نێوان مەککەو مەدینە) پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین، خالیدی کوڕی وەلید گەورەی هاوبەشدانەران بوو ئەو ڕۆژە، هاوبەشدانەران وتیان: کە بینیمانن بێئاگا بوون لە نوێژی نیوەڕۆدا، لە کاتی بێئاگاییاندا هێرشیان دەکەینە سەر، ئینجا نوێژی ترس دابەزیە خوارەوە لە نێوان نیوەڕۆو عەسردا، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عەسری بۆ کردن، کردنی بە دوو دەستەوە، دەستەیەک لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد، دەستەیەکیش پاسەوانیان دەکرد، تەکبیری کرد بۆ ئەوانەی ڕاستەوخۆ لە دوایەوەن و ئەوانەش پاسەوانیان دەکرد، پاشان ڕکوعی برد هەموویان پێکەوە ڕکوعیان برد، پاشان ئەوانەی لە دوایەوە بوون ڕاستەوخۆ سوژدەیان برد، هاتنە دواوە، ئەوانی دیکەش پێش کەوتن، ئینجا سوژدەیان برد، پاشان هەڵسا ڕکوعی دووەمی بە هەموویان برد بەوانەی ڕاستەوخۆ لە پشتی پێغەمبەر بوون و ئەوانەش پاسەوانیان دەکرد، دواتر سوژدەی برد بەوانەی ڕاستەخۆ لە دوایەوە بوون، پاشان سەلامی دایەوە، بۆ هەر یەکێکیان دوو ڕکات لەگەڵ ئیمامەکەیان نوێژیان کرد، جارێکیش لە زەوی نەوەکانی سولەیم نوێژی کرد.**

**١٥٥١-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى بِالْقَوْمِ فِي الْخَوْفِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ صَلَّى بِالْقَوْمِ الْآخَرِينَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، فَصَلَّى النَّبِيُّ ﷺ أَرْبَعاً»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٢٤٨.




**واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی ترسدا دوو ڕکات نوێژی بۆ کۆمەڵێک لە هاوەڵانی کرد، پاشان سەلامی دایەوە، پاشان دوو ڕکات نوێژی بۆ کۆمەڵێکی تر کرد لە هاوەڵەکانی، دواتر سەلامی دایەوە، پێغەمبەر ﷺ چوار ڕکات نوێژی کرد.**

**١٥٥٢-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى بِطَائِفَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ صَلَّى بِآخَرِينَ أَيْضاً رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ»[١].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکات نوێژی بۆ کۆمەڵێک لە هاوەڵانی کرد، پاشان سەلامی دایەوە، دواتر نوێژی بۆ کۆمەڵێکی تر کرد، پاشان سەلامی دایەوە.**

**١٥٥٣-** «عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ فِي صَلَاةِ الْخَوْفِ، قَالَ: يَقُومُ الْإِمَامُ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ وَتَقُومُ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ مَعَهُ وَطَائِفَةٌ قِبَلَ الْعَدُوِّ وَوُجُوهُهُمْ إِلَى الْعَدُوِّ، فَيَرْكَعُ بِهِمْ رَكْعَةً وَيَرْكَعُونَ لِأَنْفُسِهِمْ وَيَسْجُدُونَ سَجْدَتَيْنِ فِي مَكَانِهِمْ، وَيَذْهَبُونَ إِلَى مَقَامِ أُولَئِكَ وَيَجِيءُ أُولَئِكَ فَيَرْكَعُ بِهِمْ وَيَسْجُدُ بِهِمْ سَجْدَتَيْنِ، فَهِيَ لَهُ ثِنْتَانِ وَلَهُمْ وَاحِدَةٌ، ثُمَّ يَرْكَعُونَ رَكْعَةً رَكْعَةً، وَيَسْجُدُونَ سَجْدَتَيْنِ»[٢].

**واتە: سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە ﷺ، لەبارەی نوێژی ترسەوە دەڵێ: ئیمام هەڵدەستێ و ڕوو دەکاتە قیبلە، کۆمەڵێکیش لەوان لەگەڵی دەبێ، کۆمەڵەکەی تریش ڕووبەڕووی دوژمن دەوەستنەوە، ڕکاتێکیان پێ دەکات، ئەوانیش لە جێگای خۆیاندا ڕکوعێک (کە دەکاتە ڕکاتێک)و دوو سوژدەش بۆ خۆیان دەبەن، ئینجا دەڕۆن بۆ جێگای ئەوانی تر، ئەوانیش دێن بۆ جێگای ئەمان ڕکوعێک و دوو سوژدەیان پێدەبات، (کە دەکاتە یەک ڕکات) بۆ ئەو دەبێتە دوو ڕکات بۆ ئەوانیش دەبێتە ڕکاتێک، ئینجا ئەوان بۆ خۆیان ڕکوعێک و دوو سوژدە دەبەن.**

**١٥٥٤-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى بِأَصْحَابِهِ صَلَاةَ الْخَوْفِ، فَصَلَّتْ طَائِفَةٌ مَعَهُ وَطَائِفَةٌ وُجُوهُهُمْ قِبَلَ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قَامُوا مَقَامَ الْآخَرِينَ، وَجَاءَ الْآخَرُونَ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤١٣٦ تعليقاً، ومسلم: ٨٤٣.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ترسی بە هاوەڵەکانی کرد، کۆمەڵێکیان لەگەڵیدا نوێژیان کرد، کۆمەڵێکی تریشیان ڕووبەڕووی دوژمن وەستانەوە، دوو ڕکات نوێژی بۆ کردن، پاشان هەڵسان چوونە جێگای ئەوانی تر، ئەوانی تریش هاتن دوو ڕکات نوێژی بۆ کردن، ئینجا سەلامی دایەوە.**

**١٥٥٥-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ صَلَّى صَلَاةَ الْخَوْفِ بِالَّذِينَ خَلْفَهُ رَكْعَتَيْنِ وَالَّذِينَ جَاءُوا بَعْدُ رَكْعَتَيْنِ، فَكَانَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ أَرْبَعُ رَكَعَاتٍ، وَلِهَؤُلَاءِ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ»[١].

**واتە: ئەبو بەکرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکات نوێژی ترسی کرد بەوانەی لە پشتیەوە بوون، ئەوانەشی دوای ئەوە هاتن دوو ڕکاتی بۆ کردن، ئەو کات بۆ پێغەمبەر ﷺ بووە چوار ڕکات، بۆ ئەوانیش دوو ڕکات، دوو ڕکات.**

---

(١) صحيح.




**١٥٥٦-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ لِأَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ يَوْمَانِ فِي كُلِّ سَنَةٍ يَلْعَبُونَ فِيهِمَا، فَلَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ، قَالَ: كَانَ لَكُمْ يَوْمَانِ تَلْعَبُونَ فِيهِمَا وَقَدْ أَبْدَلَكُمُ اللَّهُ بِهِمَا خَيْراً مِنْهُمَا: يَوْمَ الْفِطْرِ، وَيَوْمَ الْأَضْحَى»[١].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: خەڵکی سەردەمی نەفامی لە هەموو ساڵێکدا دوو ڕۆژیان هەبوو خۆشیان تێدا دەردەبڕی، کاتێ پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینە، فەرمووی: ئێوە دوو ڕۆژتان هەبوو خۆشیتان تێدا دەردەبڕی، خوا بۆتانی گۆڕی بە چاکتر لەو دووانە، ئەوانیش: جەژنی ڕەمەزان و، جەژنی قوربانن.**

## بابەت: دەرچوون بۆ هەردوو جەژن لە ڕۆژی دواتردا

**١٥٥٧-** «عَنْ أَبِي عُمَيْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ عُمُومَةٍ لَهُ ﷺ، أَنَّ قَوْماً رَأَوْا الْهِلَالَ، فَأَتَوْا النَّبِيَّ ﷺ فَأَمَرَهُمْ أَنْ يُفْطِرُوا بَعْدَ مَا ارْتَفَعَ النَّهَارُ، وَأَنْ يَخْرُجُوا إِلَى الْعِيدِ مِنَ الْغَدِ»[٢].

**واتە: ئەبو عومەیری کوڕی ئەنەس، لە مامیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، خەڵکێک مانگی یەک شەوەیان بینی، هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمانی پێکردن ڕۆژوو بشکێنن دوای ئەوەی خۆر بەرز بووبوویەوە، وە فەرمانی پێ کردن لە بەیانیدا دەرچن بۆ جەژن.**

## دەرچوونی کچانی تازە پێگەیشتوو، ئەوانەیش کە خۆیان داپۆشیوە لە هەردوو جەژن

**١٥٥٨-** «عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَتْ أُمُّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، لَا تَذْكُرُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ إِلَّا قَالَتْ: بَأَبا، فَقُلْتُ: أَسَمِعْتِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَذْكُرُ كَذَا وَكَذَا؟ فَقَالَتْ: نَعَمْ، بَابا، قَالَ: لِيَخْرُجِ الْعَوَاتِقُ، وَذَوَاتُ الْخُدُورِ، وَالْحُيَّضُ وَيَشْهَدْنَ الْعِيدَ، وَدَعْوَةَ الْمُسْلِمِينَ، وَلْيَعْتَزِلِ الْحُيَّضُ الْمُصَلَّى»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١١٣٤.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١١٥٧، وإبن ماجه: ١٦٥٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٤ و ٣٥١ و ٩٧١ و ٩٧٤ و ٩٨٠ و ٩٨١ و ١٦٥٢، ومسلم: ١٠ و ٨٩٠/١٢، وأبو داود: ١١٣٦ و ١١٣٧ و ١١٣٨، والترمذي: ٥٣٩ و ٥٤٠، وإبن ماجه: ١٣٠٧ و ١٣٠٨.

واتە: حەفصە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئوممو عەطیە (خوا لێی ڕازی بێ) هەر کاتێ باسی پێغەمبەری خوا ﷺ بکردایە ئیللا دەیوت: باوکم بە قوربانی بێت. وتم: ئایا بیستوتە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ئەوەو ئەوەی کردبێت؟ وتی: بەڵێ. باوکم بەقوربانی بێت، فەرمووی: با ئەو کچانە دەربچن کە تازە پێگەیشتوون، ئەوانەش کە خۆیان داپۆشیوەو ئەوانەش لە حەیزدان ئامادەی جەژن و پاڕانەوەی مسوڵمانان (وەکو نوێژە بارانە) بین، با ئەوانەی لە حەیزدان دوور بکەونەوە لە شوێنی نوێژ کردن.

## دوورکەوتنەوەی ئەوانەی لە سوڕی مانگانەدان لە نوێژگەی خەڵک

**١٥٥٩-** «عَنْ مُحَمَّدٍ، قَالَ: لَقِيتُ أُمَّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا فَقُلْتُ لَهَا: هَلْ سَمِعْتِ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ، وَكَانَتْ إِذَا ذَكَرَتْهُ قَالَتْ: بَابا، قَالَ: أَخْرِجُوا الْعَوَاتِقَ، وَذَوَاتِ الْخُدُورِ فَيَشْهَدْنَ الْعِيدَ، وَدَعْوَةَ الْمُسْلِمِينَ، وَلْيَعْتَزِلِ الْحُيَّضُ مُصَلَّى النَّاسِ»[١].

واتە: موحەممەد دەڵێ: گەیشتم بە ئوممو عەطیە (خوا لێی ڕازی بێ) پێم وت: ئایا گوێت لە فەرموودەیەک بووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ، جا ئەو هەر کاتێ باسی پێغەمبەری خوا ﷺ بکردایە دەیوت: باوکم بە قوربانی بێت، فەرمووی: کچانی تازە پێگەیشتوو ئەوانەش کە خۆیان داپۆشیوە دەربچن بۆ جەژن و پاڕانەوەی مسوڵمانان (وەکو نوێژە بارانە)، با ئەوانەی لە حەیزدان (بچن بەڵام) دووربکەونەوە لە نوێژگە.

## بابەت: خۆ ڕازاندنەوە بۆ هەردوو جەژن

**١٥٦٠-** «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: وَجَدَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ حُلَّةً مِنْ إِسْتَبْرَقٍ بِالسُّوقِ، فَأَخَذَهَا فَأَتَى بِهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ابْتَعْ هَذِهِ، فَتَجَمَّلْ بِهَا لِلْعِيدِ وَالْوَفْدِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّمَا هَذِهِ لِبَاسُ مَنْ لَا خَلَاقَ لَهُ «أَوْ إِنَّمَا يَلْبَسُ هَذِهِ مَنْ لَا خَلَاقَ لَهُ» فَلَبِثَ عُمَرُ مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِجُبَّةِ دِيبَاجٍ، فَأَقْبَلَ بِهَا حَتَّى جَاءَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قُلْتَ: إِنَّمَا هَذِهِ لِبَاسُ مَنْ لَا خَلَاقَ لَهُ، ثُمَّ أَرْسَلْتَ إِلَيَّ بِهَذِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: بِعْهَا، وَتُصِبْ بِهَا حَاجَتَكَ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٨٦، ومسلم: ٢٠٦٨.




واتە: سالم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: عومەری کوڕی خەطاب پۆشاکێکی لە بازاڕ بینی لە ئاوریشمی ئەستور، هێنای بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمە بکڕە، خۆتی پێ بڕازێنەوە بۆ جەژن و کاتێ نوێنەرێک دێت بۆ لات بیپۆشە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی ئەم پۆشاکانە کەسێک لەبەری دەکات هیچ بەشێکی نەبێت (لە ڕۆژی دوایی) «یان کەسێک ئەمە دەپۆشێ هیچ بەشێکی نەبێت»، عومەر مایەوە تا خوا ویستی لەسەر بوو، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشاکێکی لە ئاوریشمی بۆ نارد، ئەویش بردیەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووت: ئەم پۆشاکانە کەسێک لەبەری دەکات هیچ بەشێکی نەبێت (لە ڕۆژی دوایی)، پاشان ئەمەت بۆ ناردووم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیفرۆشەو ناتەواویەکانتی پێ پڕ بکەرەوە.

## نوێژ کردن پێش ئیمام لە ڕۆژی جەژن

**١٥٦١-** «عَنْ ثَعْلَبَةَ بْنِ زَهْدَمٍ، أَنَّ عَلِيّاً اسْتَخْلَفَ أَبَا مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَلَى النَّاسِ فَخَرَجَ يَوْمَ عِيدٍ، فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّهُ لَيْسَ مِنَ السُّنَّةِ أَنْ يُصَلَّى قَبْلَ الْإِمَامِ»[١].

واتە: ثەعلەبەی کوڕی زەهدەم دەگێڕێتەوە: پێشەوا عەلی ئەبو مەسعوودی (خوا لێیان ڕازی بێ) لە جێگای خۆی دانا وەکو کاربەدەست، لە ڕۆژی جەژن هاتە دەرەوە وتی: ئەی خەڵکینە، سوننەت نیە پێش ئیمام نوێژ بکرێ.

## وازهێنان لە بانگدان لە هەردوو جەژن

**١٥٦٢-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي عِيدٍ قَبْلَ الْخُطْبَةِ بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلَا إِقَامَةٍ»[٢].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەژندا نوێژی بۆ کردین پێش وتاردان، بەبێ بانگ و بەبێ قامەت.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٥٨ و ٩٦١ و ٩٧٨، ومسلم: ٣ و ٨٨٥/٤، وأبو داود: ١١٤١.




## وتاردان لە ڕۆژی جەژن

**١٥٦٣-** «عَنِ الشَّعْبِيِّ، يَقُولُ: حَدَّثَنَا الْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ ﷺ، عِنْدَ سَارِيَةٍ مِنْ سَوَارِي الْمَسْجِدِ، قَالَ: خَطَبَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ النَّحْرِ، فَقَالَ: إِنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ بِهِ فِي يَوْمِنَا هَذَا أَنْ نُصَلِّيَ، ثُمَّ نَذْبَحَ، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا، وَمَنْ ذَبَحَ قَبْلَ ذَلِكَ فَإِنَّمَا هُوَ لَحْمٌ يُقَدِّمُهُ لِأَهْلِهِ، فَذَبَحَ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ دِينَارٍ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عِنْدِي جَذَعَةٌ خَيْرٌ مِنْ مُسِنَّةٍ قَالَ: اذْبَحْهَا وَلَنْ تُوفِيَ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ»[١].

**واتە:** شەعبی دەڵێ: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ بۆی باس کردین، لەلای کۆڵەکەیەک لە کۆڵەکەکانی مزگەوت، وتی: پێغەمبەر ﷺ لە جەژنی قوربان وتاریدا، فەرمووی: یەکەم شتێک ئەمڕۆ دەستی پێ دەکەین نوێژ کردنە، پاشان قوربانی دەکەین، هەر کەس ئەمە بکات، ئەوە ڕێبازی ئێمەی پێکاوە، هەر کەسیش پێش ئەوە قوربانی بکات، ئەوە تەنها گۆشتێکە پێشکەشی ماڵ و منداڵی خۆی دەکات، ئەبو بوردەی کوڕی دینار حەیوانی سەربڕی بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، گیسکێکم هەیە چاکترە لە بەرانێک فەرمووی: سەری ببڕە لە دوای تۆ بۆ هیچ کەسێکی تر دروست نیە.

## بابەت: نوێژی هەردوو جەژن پێش وتاردان

**١٥٦٤-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا كَانُوا يُصَلُّونَ الْعِيدَيْنِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ»[٢].

**واتە:** ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو بەکرو عومەر (خوا لێیان رازی بێ)، نوێژی هەردوو جەژنیان دەکرد پێش وتاردان.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٥١ و ٩٥٥ و ٩٦٥ و ٩٦٨ و ٩٧٦ و ٩٨٣ و ٥٥٤٥ و ٥٥٥٦ و ٥٥٥٧ و ٥٥٦٠ و ٥٥٦٣ و ٦٦٧٣، ومسلم: ٤ و ١٩٦١/٩، وأبو داود: ٢٨٠٠ و ٢٨٠١، والترمذي: ١٥٠٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٦٣، ومسلم: ٨٨٨، والترمذي: ٥٣١، وإبن ماجه: ١٢٧٦.




## بابەت: نوێژی هەردوو جەژن ڕووەو خەنجەرێک (وەکو سوترە)

**١٥٦٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُخْرِجُ الْعَنَزَةَ يَوْمَ الْفِطْرِ، وَيَوْمَ الأَضْحَى يُرْكِزُهَا فَيُصَلِّي إِلَيْهَا»[(١)].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ خەنجەری دەردەهێناو دەیچەقاند بە زەویدا (وەکو سوترە) نوێژی لە بەرانبەر دەکرد لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان.**

**تێبینی: (الْعَنَزَة): گۆچانێکە بچوکتر لە ڕم، وە وتراوە: خەنجەرە، پێم وایە لێرەدا مەبەستی پێی خەنجەرە، خوا زاناترە.**

## ژمارەی نوێژی هەردوو جەژن

**١٥٦٦-** «عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: صَلَاةُ الْأَضْحَى رَكْعَتَانِ، وَصَلَاةُ الْفِطْرِ رَكْعَتَانِ، وَصَلَاةُ الْمُسَافِرِ رَكْعَتَانِ، وَصَلَاةُ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَانِ تَمَامٌ لَيْسَ بِقَصْرٍ عَلَى لِسَانِ النَّبِيِّ ﷺ»[(٢)].

**واتە: عومەری کوڕی خەطاب ﷺ دەڵێ: نوێژی جەژنی قوربان و جەژنی ڕەمەزان دوو ڕکاتە، نوێژی گەشتیاریش دوو ڕکاتە، نوێژی هەینیش دوو ڕکاتە، تەواوە بەبێ کورت کردنەوە، لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ.**

## بابەت: خوێندنی سووڕەتی (قٓاف) و (اقْتَرَبَتْ) لە نوێژی هەردوو جەژندا

**١٥٦٧-** «عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: خَرَجَ عُمَرُ يَوْمَ عِيدٍ، فَسَأَلَ أَبَا وَاقِدٍ اللَّيْثِيَّ: بِأَيِّ شَيْءٍ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ فِي هَذَا الْيَوْمِ؟ فَقَالَ: بِقَافْ وَاقْتَرَبَتْ»[(٣)].

**واتە: عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: عومەر ﷺ هاتە دەرەوە لە ڕۆژی جەژن، پرسیاری لە ئەبو واقیدی لەیثی کرد: پێغەمبەر ﷺ لەم ڕۆژەدا چ سووڕەتێکی دەخوێند؟ وتی: سووڕەتی (قَافْ) و (اقْتَرَبَتْ)ی دەخوێند.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٠٦٣ و ١٠٦٤.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤ و ٨٩١/١٥، وأبو داود: ١١٥٤، والترمذي: ٥٣٤ و ٥٣٥، وإبن ماجه: ١٢٨٢.




## بابەت: خوێندنی سوورەتی (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ) و (هَلْ أتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ) لە نوێژی هەردوو جەژندا.

**١٥٦٨-** «عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الْعِيدَيْنِ، وَيَوْمِ الْجُمُعَةِ بِـ: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١ ﴾ الأعلى، وَ ﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١ ﴾ الغاشية، وَرُبَّمَا اجْتَمَعَا فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ فَيَقْرَأُ بِهِمَا»[1].

**واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر  دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی هەردوو جەژن و لە ڕۆژی هەینی: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١ ﴾ و ﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١ ﴾ ی دەخوێند، هەندێ جار جەژن و هەینی لە ڕۆژێکدا کۆدەبوونەوە هەردووکیانی دەخوێند.**

## بابەت: وتاردان لە دوای نوێژی هەردوو جەژن

**١٥٦٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: أَشْهَدُ أَنِّي شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَبَدَأَ بِالصَّلَاةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ، ثُمَّ خَطَبَ»[2].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: شایەتی دەدەم من ئامادەی جەژن بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتا بە نوێژ دەستی پێکرد پێش وتاردان، پاشان وتاریدا.**

**١٥٧٠-** «عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ  قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ النَّحْرِ بَعْدَ الصَّلَاةِ»[3].

**واتە: بەڕائی کوڕی عازیب  دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی قوربان وتاری بۆ داین لە دوای نوێژ.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٧٨، وأبو داود: ١١٢٢، والترمذي: ٥٣٣، وإبن ماجه: ١٢٨١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٨ و ١٤٤٩، ومسلم: ٢ و ٨٨٤/٤، وأبو داود: ١١٤٢ و ١١٤٣ و ١١٤٤، وإبن ماجه: ١٢٧٣.

(٣) صحيح.




## سەرپشک بوون لە نێوان دانیشتن بۆ گوێ گرتن لە وتاری هەردوو جەژن

**١٥٧١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ رضي الله عنه أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى الْعِيدَ، قَالَ: مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَنْصَرِفَ فَلْيَنْصَرِفْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُقِيمَ لِلْخُطْبَةِ فَلْيُقِمْ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سائیب رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ نوێژی جەژنی کرد، فەرمووی: هەر کەس پێی خۆشە بڕوات با بڕوات، هەر کەسیش پێی خۆشە دابنیشێ و گوێبیستی وتار بێت با گوێبیستی بێت.**

## خۆڕازاندنەوە بۆ وتاری هەردوو جەژن

**١٥٧٢-** «عَنْ أَبِي رِمْثَةَ رضي الله عنه قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَخْطُبُ، وَعَلَيْهِ بُرْدَانِ أَخْضَرَانِ»[٢].

**واتە: ئەبو ڕیـمثە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی وتاری دەدا، دوو کراسی خەتداری سەوزی لەبەردا بوو.**

## وتاردان لەسەر وشتر

**١٥٧٣-** «عَنْ أَبِي كَاهِلٍ الْأَحْمَسِيِّ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَخْطُبُ عَلَى نَاقَةٍ، وَحَبَشِيٌّ آخِذٌ بِخِطَامِ النَّاقَةِ»[٣].

**واتە: ئەبو کاهیلی ئەحمەسی رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی وتاری دەدا لەسەر وشتر، بیلالیش ڕەشمەی وشترەکەی گرتبوو.**

## وەستانی ئیمام لە وتاردا

**١٥٧٤-** «عَنْ سِمَاكٍ، قَالَ: سَأَلْتُ جَابِراً رضي الله عنه: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ قَائِماً؟ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ قَائِماً، ثُمَّ يَقْعُدُ قَعْدَةً، ثُمَّ يَقُومُ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١١٥٥، وإبن ماجه: ١٢٩٠.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٠٦٥ و ٤٢٠٦ و ٤٢٠٧ و ٤٢٠٨ و ٤٤٩٥، والترمذي: ٢٨١٢.

(٣) حسن. أخرجه إبن ماجه: ١٢٨٤.

(٤) صحيح.




واتە: سیماک دەڵێ: پرسیارم کرد لە جابر ﷺ: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێوە وتاری دەدا؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێوە وتاری دەدا، پاشان دادەنیشت، پاشان هەڵدەستا.

## وەستانی ئیمام بە پێوەو پاڵ بدات بە کەسێکی ترەوە

**١٥٧٥-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: شَهِدْتُ الصَّلَاةَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي يَوْمِ عِيدٍ، فَبَدَأَ بِالصَّلَاةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلَا إِقَامَةٍ، فَلَمَّا قَضَى الصَّلَاةَ قَامَ مُتَوَكِّئاً عَلَى بِلَالٍ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَوَعَظَ النَّاسَ وَذَكَّرَهُمْ وَحَثَّهُمْ عَلَى طَاعَتِهِ، ثُمَّ مَالَ وَمَضَى إِلَى النِّسَاءِ وَمَعَهُ بِلَالٌ، فَأَمَرَهُنَّ بِتَقْوَى اللَّهِ وَوَعَظَهُنَّ وَذَكَّرَهُنَّ وَحَمِدَ اللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ حَثَّهُنَّ عَلَى طَاعَتِهِ، ثُمَّ قَالَ: تَصَدَّقْنَ فَإِنَّ أَكْثَرَكُنَّ حَطَبُ جَهَنَّمَ، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنْ سَفِلَةِ النِّسَاءِ سَفْعَاءُ الْخَدَّيْنِ: بِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: تُكْثِرْنَ الشَّكَاةَ، وَتَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ، فَجَعَلْنَ يَنْزِعْنَ قَلَائِدَهُنَّ، وَأَقْرُطَهُنَّ، وَخَوَاتِيمَهُنَّ يَقْذِفْنَهُ فِي ثَوْبِ بِلَالٍ يَتَصَدَّقْنَ بِهِ»[1].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: ئامادەی نوێژ بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژن، سەرەتا دەستی کرد بە نوێژ پێش وتاردان بەبێ بانگ و بەبێ قامەت، کاتێ نوێژی تەواو کرد پاڵیدا بە بیلالەوە سوپاس و ستایشی خوای کرد، ئامۆژگاری خەڵکی کردو یادی دەخستنەوەو هانی دەدان لەسەر گوێڕایەڵی کردنی، پاشان لایداو ڕۆیشت بۆ لای ئافرەتەکان و بیلالیشی لەگەڵ بوو، فەرمانی پێکردن بە خۆپارێزی و لە خوا ترسان و ئامۆژگاری کردن و یادی خستنەوەو سوپاس و ستایشی خوای کرد، پاشان هانیدان لەسەر گوێڕایەڵی کردنی، دواتر فەرمووی: چاکە زۆر بکەن، چونکە بەڕاستی زۆربەتان سوتەمەنی دۆزەخن، ئافرەتێکی ڕوومەت ڕەش هەڵگەڕاو کە لە ئافرەتە ناودارەکان نەبوو، وتی: بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: سکاڵا زۆر دەکەن و سپڵەیی بەرانبەر مێردەکانیان دەکەن کە لەگەڵیان دەژین، (واتە: چاکەی مێردەکانیان لەبەرچاو نیە)، ئەوانیش ملوانکەو گوارەو موستیلەکانیان داکەندو دەیانخستە ناو پۆشاکەکەی بیلال و دەیانبەخشی.

---

(١) صحيح.




## ئیمام لە وتاردان بە ڕوخساری ڕوو دەکاتە خەڵکی

**١٥٧٦-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَخْرُجُ يَوْمَ الْفِطْرِ، وَيَوْمَ الْأَضْحَى إِلَى الْمُصَلَّى فَيُصَلِّي بِالنَّاسِ، فَإِذَا جَلَسَ فِي الثَّانِيَةِ وَسَلَّمَ قَامَ فَاسْتَقْبَلَ النَّاسَ بِوَجْهِهِ وَالنَّاسُ جُلُوسٌ، فَإِنْ كَانَتْ لَهُ حَاجَةٌ يُرِيدُ أَنْ يَبْعَثَ بَعْثاً ذَكَرَهُ لِلنَّاسِ، وَإِلَّا أَمَرَ النَّاسَ بِالصَّدَقَةِ، قَالَ: تَصَدَّقُوا ـ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ـ فَكَانَ مِنْ أَكْثَرِ مَنْ يَتَصَدَّقُ النِّسَاءُ»(١).

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان دەهاتە دەرەوە بۆ شوێنی نوێژەکەی، نوێژی بۆ خەڵکەکە دەکرد، کاتێ دابنیشتایە لە ڕکاتی دووەم و سەلامی بدایەتەوە، هەڵدەستا ڕووی دەکردە خەڵکەکە بە ڕوخساری، خەڵکەکەش دانیشتبوون، ئەگەر ئیشێکی هەبووایە بیویستایە نێردراوێک بنێرێ بۆ خەڵکەکەی باس دەکرد، ئەگەرنا فەرمانی دەکرد بە خەڵکەکە ببەخشن، دەیفەرموو: ببەخشن «سێ جار» زۆربەی ئەوانەی دەیانبەخشی ئافرەتان بوون.**

## بێدەنگ بوون لە کاتی وتاردان

**١٥٧٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ أَنْصِتْ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ فَقَدْ لَغَوْتَ»(٢).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک بە هاوەڵەکەت وت: بێدەنگ بە، ئیمامیش وتاری دەدا ئەوە غەڵبە غەڵبت کردوە (یان قسەی ناڕەواو نابەجێت کردوە).**

## چۆنیەتی وتاردان

**١٥٧٨-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ فِي خُطْبَتِهِ: يَحْمَدُ اللَّهَ وَيُثْنِي عَلَيْهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ يَقُولُ: مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْهُ فَلَا هَادِيَ لَهُ،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٣٤، ومسلم: ٨٥١، وأبو داود: ١١١٢، والترمذي: ٥١٢، وإبن ماجه: ١١١٠.

إِنَّ أَصْدَقَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ، وَأَحْسَنَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ، وَشَرُّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلُّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ، وَكُلُّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ، ثُمَّ يَقُولُ: بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةُ كَهَاتَيْنِ، وَكَانَ إِذَا ذَكَرَ السَّاعَةَ احْمَرَّتْ وَجْنَتَاهُ، وَعَلَا صَوْتُهُ، وَاشْتَدَّ غَضَبُهُ كَأَنَّهُ نَذِيرُ جَيْشٍ يَقُولُ: صَبَّحَكُمْ مَسَّاكُمْ، ثُمَّ قَالَ: مَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِأَهْلِهِ، وَمَنْ تَرَكَ دَيْناً أَوْ ضَيَاعاً فَإِلَيَّ أَوْ عَلَيَّ، وَأَنَا أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ»[١].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە وتارەکەیدا دەیفەرموو: سوپاس و ستایشی خوای دەکرد بەوەی شیاویەتی، پاشان دەیفەرموو: هەر کەس خوا هیدایەتی بدات کەس ناتوانێت گومڕای بکات، هەر کەسیش گومڕا بکات کەس نیە هیدایەتی بدات، بێگومان ڕاسترین باس کتێبی خوایە، وە چاکترین ڕێنمایی ڕێنمایی موحەممەدە، خراپترین کارەکان ئەو شتانەیە کە لە شەریعەتدا نیە، هەر شتێکیش لە شەریعەتدا نەبێت داهێنراوە، هەموو داهێنراوێکیش گومڕاییە، هەموو گومڕاییەکیش لە ئاگردایە، پاشان فەرمووی: من نێردراوم لەگەڵ هاتنی ڕۆژی دواییدا وەکو ئەم دووانە (ئاماژەی بە پەنجەی شەیەتمان و پەنجەکەی تەنیشتی کرد) جا کاتێ باسی ڕۆژی دوایی بکردایە کوڵمەکانی سوور دەبوونەوە، دەنگیشی بەرز دەکردەوەو توڕە دەبوو، وەکو ئەوەیە ترسێنەری هێزێک بڵێت: دوژمن هاتە سەرتان سەر لە بەیانی، دوژمن هاتە سەرتان سەر لە ئێوارە، هەر کەس ماڵێکی بەجێهێشتووە ئەوە بۆ خانەوادەکەیەتی، هەر کەس قەرزار بووە لە ژیانیدا نەیداوەتەوە یان خێزان و منداڵی بەجێهێشتووە، ئەوە بەڕێوەبردنی خێزان و منداڵی لەسەر منەو بژاردنی قەرزەکانیشی لە ئەستۆمە، بەڕاستی پشتیوانی بڕوادارانم و لە خۆیان نزیکترم.**

## هاندانی ئیمام لەسەر بەخشین لە وتاری جەژندا

**١٥٧٩-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَخْرُجُ يَوْمَ الْعِيدِ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَخْطُبُ فَيَأْمُرُ بِالصَّدَقَةِ، فَيَكُونُ أَكْثَرَ مَنْ يَتَصَدَّقُ النِّسَاءُ، فَإِنْ كَانَتْ لَهُ حَاجَةٌ أَوْ أَرَادَ أَنْ يَبْعَثَ بَعْثاً تَكَلَّمَ وَإِلَّا رَجَعَ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٦٧، وأبو داود: ٢٩٥٤، وإبن ماجه: ٤٥ و ٢٤١٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠٤ و ٩٥٦ و ١٤٦٢، ومسلم: ٨٨٩، وإبن ماجه: ١٢٨٨.




**واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژن هاتە دەرەوە دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان وتاریدا فەرمانی کرد بە بەخشین، زۆرترین کەس لەوانەی دەیانبەخشی ئافرەتان بوون، جا ئەگەر کارێکی هەبووایە، یان بیویستایە نێردراوێک بنێرێ قسەی دەکرد، ئەگەرنا دەگەڕایەوە.**

**١٥٨٠-** «عَنِ الْحَسَنِ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا خَطَبَ بِالْبَصْرَةِ فَقَالَ: أَدُّوا زَكَاةَ صَوْمِكُمْ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، فَقَالَ: مَنْ هَاهُنَا مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ، قُومُوا إِلَى إِخْوَانِكُمْ فَعَلِّمُوهُمْ فَإِنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَرَضَ صَدَقَةَ الْفِطْرِ عَلَى الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ، وَالْحُرِّ وَالْعَبْدِ، وَالذَّكَرِ وَالْأُنْثَى، نِصْفَ صَاعٍ مِنْ بُرٍّ أَوْ صَاعاً مِنْ تَمْرٍ أَوْ شَعِيرٍ»[١].

**واتە: حەسەن دەگێڕێتەوە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) وتاریدا لە بەصرە، وتی: زەکاتی ڕۆژوەکانتان بدەن، جا خەڵکی هەندێکیان تەماشای هەندێکی دیکەیان دەکرد، فەرمووی: کێ لێرەیە لە خەڵکی مەدینە، هەڵسن بۆ لای براکانتان فێریان بکەن، چونکە ئەوان نازانن، پێغەمبەر ﷺ زەکاتی سەرفترەی فەڕز کرد لەسەر بچووک و گەورەو ئازاد و بەندەو نێرو مێ، نیو صاع لە گەنم، یان صاعێک لە خورما، یان جۆ.**

**١٥٨١-** «عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ النَّحْرِ بَعْدَ الصَّلَاةِ، ثُمَّ قَالَ: مَنْ صَلَّى صَلَاتَنَا وَنَسَكَ نُسُكَنَا، فَقَدْ أَصَابَ النُّسُكَ، وَمَنْ نَسَكَ قَبْلَ الصَّلَاةِ فَتِلْكَ شَاةُ لَحْمٍ، فَقَالَ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ نِيَارٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ لَقَدْ نَسَكْتُ قَبْلَ أَنْ أَخْرُجَ إِلَى الصَّلَاةِ، عَرَفْتُ أَنَّ الْيَوْمَ يَوْمُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ فَتَعَجَّلْتُ فَأَكَلْتُ وَأَطْعَمْتُ أَهْلِي وَجِيرَانِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تِلْكَ شَاةُ لَحْمٍ، قَالَ: فَإِنَّ عِنْدِي جَذَعَةً خَيْرٌ مِنْ شَاتَيْ لَحْمٍ، فَهَلْ تُجْزِي عَنِّي؟ قَالَ: نَعَمْ، وَلَنْ تُجْزِيَ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ»[٢].

**واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە دوای نوێژی جەژنی قوربان وتاری بۆ داین، پاشان فەرمووی: هەر کەس نوێژ بکات وەک نوێژی ئێمەو قوربانی بکات وەک قوربانی ئێمە، ئەوە قوربانی دروستە، هەر کەسیش پێش نوێژ قوربانی بکات، ئەوە مەڕەکەی مەڕی گۆشتەو هی قوربانی نیە. ئەبو بوردەی کوڕی نیار وتی: ئەی**

---

(١) صحيح المرفوع منه. أخرجه أبو داود: ١٦٢٢.

(٢) صحيح.




پێغەمبەری خوا، بەڕاستی من پێش نوێژ قوربانیم کردوە، زانیم ئەمڕۆ ڕۆژی خواردن و خواردنەوەیە، پەلەم کرد خۆم و ماڵ و منداڵم لێیان خواردو بەشی دراوسێکانیشمدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مەڕەکەت مەڕی گۆشتە، وتی: گیسکە مێینەیەکمان هەیە لە دوو مەڕ لام چاکترە، ئایا دەبێت بیکەم بە قوربانی، فەرمووی: بەڵێ، بەڵام لە دوای تۆ بۆ کەسی تر دروست نیە.

## مام ناوەندی لە وتاردان

**١٥٨٢-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَكَانَتْ صَلَاتُهُ قَصْداً، وَخُطْبَتُهُ قَصْداً»[١].

**واتە:** جابری کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: من لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژم دەکرد، نوێژەکەی مام ناوەند بوو، هەروەها وتارەکەشی مام ناوەند بوو.

## دانیشتنی نێوان دوو وتارو بێدەنگ بوون تیایدا

**١٥٨٣-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ قَائِماً، ثُمَّ يَقْعُدُ قَعْدَةً لَا يَتَكَلَّمُ فِيهَا، ثُمَّ قَامَ فَخَطَبَ خُطْبَةً أُخْرَى، فَمَنْ خَبَّرَكَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَطَبَ قَاعِداً فَلَا تُصَدِّقْهُ»[٢].

**واتە:** جابری کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بە پێوە وتاری دەخوێند، پاشان دانیشت بە دانیشتنێک هیچ قسەی نەکرد، پاشان هەڵسا وتارێکی تری خوێند، هەر کەس بۆی باس کردووی پێغەمبەر ﷺ بە دانیشتنەوە وتاری داوە ئەوە بڕوای پێ مەکە.

## قورئان خوێندن لە وتاری دووەم و یادی خوا کردن تیایدا

**١٥٨٤-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ قَائِماً ثُمَّ يَجْلِسُ، ثُمَّ يَقُومُ وَيَقْرَأُ آيَاتٍ وَيَذْكُرُ اللَّهَ، وَكَانَتْ خُطْبَتُهُ قَصْداً وَصَلَاتُهُ قَصْداً»[٣].

---

(١) حسن.

(٢) حسن.

(٣) حسن.

واتە: جابری کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی هەینی وتاری دەخوێند بە پێوە، پاشان دادەنیشت، پاشان هەڵدەستا، چەندین ئایەتی دەخوێندو یادی خوای تێدا دەکردەوە، وتارەکەی مام ناوەند بوو نوێژەکەشی مام ناوەند بووە.

## دابەزینی ئیمام لەسەر مینبەر پێش تەواو کردنی وتار

**١٥٨٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: بَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ يَخْطُبُ إِذْ أَقْبَلَ الْحَسَنُ، وَالْحُسَيْنُ عَلَيْهِمَا قَمِيصَانِ أَحْمَرَانِ يَمْشِيَانِ وَيَعْثُرَانِ، فَنَزَلَ وَحَمَلَهُمَا، فَقَالَ: صَدَقَ اللَّهُ: ﴿ إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ ۝١٥ ﴾التغابن، رَأَيْتُ هَذَيْنِ يَمْشِيَانِ وَيَعْثُرَانِ فِي قَمِيصَيْهِمَا فَلَمْ أَصْبِرْ حَتَّى نَزَلْتُ فَحَمَلْتُهُمَا»(١).

واتە: عەبدوڵلای کوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا لەسەر مینبەر حەسەن و حوسەین هاتن، کراسێکی سوریان لەبەر بوو، ڕێیان دەکرد ئەوەندە منداڵ بوون خەریک بوو بەملاولادا دەکەوتن، پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەرەکە دابەزیە خوارەوە وتارەکەی بڕی و هەردووکیانی هەڵگرت، پاشان گەڕایەوە بۆ سەر مینبەرەکەی پاشان فەرمووی: خوا ﷻ ڕاستی فەرموو: ﴿ إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ ۝١٥ ﴾ واتە: بەڕاستی ماڵ و سامان و منداڵەکانتان هەر هۆی تاقی کردنەوەتانن، ئەم دووانەم بینی دەهاتن خەریک بوو بەملاولادا دەکەوتن بەو کراسەی لەبەریاندا بوو، خۆم پێ ڕانەگیرا تا وتارەکەم بڕی و هەردووکیانم هەڵگرت.

## ئامۆژگاری ئیمام بۆ ئافرەتان دوای تەواوبوونی لە وتاری جەژن و هاندانیان لەسەر بەخشین

**١٥٨٦-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَابِسٍ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ لَهُ رَجُلٌ: شَهِدْتَ الْخُرُوجَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَلَوْلَا مَكَانِي مِنْهُ مَا شَهِدْتُهُ «يَعْنِي مِنْ صِغَرِهِ» أَتَى الْعَلَمَ الَّذِي عِنْدَ دَارِ كَثِيرِ بْنِ الصَّلْتِ فَصَلَّى، ثُمَّ خَطَبَ، ثُمَّ أَتَى النِّسَاءَ فَوَعَظَهُنَّ وَذَكَّرَهُنَّ وَأَمَرَهُنَّ أَنْ يَتَصَدَّقْنَ، فَجَعَلَتِ الْمَرْأَةُ تُهْوِي بِيَدِهَا إِلَى حَلَقِهَا تُلْقِي فِي ثَوْبِ بِلَالٍ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٦٣ و ٩٧٥ و ٩٧٧ و ٥٢٤٩، وأبو داود: ١١٤٦.




واتە: عەبدورڕەحمانی کوڕی عابیس دەڵێ: گوێم لێ بوو پیاوێک پرسیاری لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، کرد: ئایا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووی؟ وتی: بەڵێ، ئەگەر لەبەر پلەو پایەکەم نەبووایە نەمدەتوانی لەگەڵی دەربچم، «واتە: لەبەر ئەوەی منداڵ بووە» هات بۆ لای ئەو شوێنەی کە نوێژی جەژنی تێدا دەکرا لە لای ماڵی ئیبنو کەثیری کوڕی صەڵت و نوێژی کرد، پاشان وتاریداو ئامۆژگاری کردن و یادی خستنەوەو فەرمانی پێکردن ببەخشن، هەر ئافرەتێک دەستی دەبرد بۆ گوارەکەی و دەیخستە ناو پۆشاکەکەی بیلالەوە.

## نوێژ لە پێش هەردوو جەژن و لە دوایەوە

**١٥٨٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ يَوْمَ الْعِيدِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلَا بَعْدَهَا»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژن دەرچوو، دوو ڕکات نوێژی کرد، نە لە پێشیەوەو، نە لە دوایەوە نوێژی نەکرد.

## قوربانی کردنی ئیمام لە ڕۆژی جەژن و ژمارەی ئەو ئاژەڵانەی سەریان دەبڕێ

**١٥٨٨-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ أَضْحَى، وَانْكَفَأَ إِلَى كَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ فَذَبَحَهُمَا»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆماندا لە ڕۆژی جەژنی قوربان، ڕۆیشت دوو بەرانی هێنا سپی و ڕەش تێکەڵ بوون، جا سەری بڕین.

**١٥٨٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَذْبَحُ أَوْ يَنْحَرُ بِالْمُصَلَّى»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٦٤ و ٩٨٩ و ١٤٣١ و ٥٨٨١ و ٥٨٨٣، ومسلم: ٨٨٤/١٣، وأبو داود: ١١٥٩، والترمذي: ٥٣٧، وإبن ماجه: ١٢٩١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٥٤، ومسلم: ٩٦٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٨٢، وأبو داود: ٢٨١١، وإبن ماجه: ٣١٦١.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شوێنی نوێژەکەی قوربانیەکەی سەردەبڕی.

## کۆبوونەوەی جەژن و هەینی لە یەک ڕۆژداو ئامادە بوون تیایاندا

**١٥٩٠-** «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْجُمُعَةِ وَالْعِيدِ بِـ: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾الأعلى، وَ ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١﴾الغاشية، وَإِذَا اجْتَمَعَ الْجُمُعَةُ وَالْعِيدُ فِي يَوْمٍ قَرَأَ بِهِمَا»[١].

**واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەینی و لە ڕۆژی جەژن: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ و ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١﴾ی دەخوێند، وە کاتێک کە جەژن و هەینی لە ڕۆژێکدا کۆدەبوونەوە هەردوو سوورەتەکەی دەخوێند.**

## مۆڵەتدان بە ئامادە نەبوون لە نوێژی هەینی بۆ کەسێک ئامادەی نوێژی جەژن بووبێ

**١٥٩١-** «عَنْ إِيَاسِ بْنِ أَبِي رَمْلَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ، سَأَلَ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَشَهِدْتَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عِيدَيْنِ؟ قَالَ: نَعَمْ، صَلَّى الْعِيدَ مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ، ثُمَّ رَخَّصَ فِي الْجُمُعَةِ»[٢].

**واتە: ئیاسی کوڕی ئەبو ڕەمله دەڵێ: گوێم لێ بوو موعاویە، پرسیاری لە زەیدی کوڕی ئەرقەم (خوا لێیان ڕازی بێ) کرد، ئایا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادەی هەردوو جەژنەکە بووی؟ وتی: بەڵێ، نوێژی جەژنی کرد لە سەرەتای ڕۆژ، پاشان مۆڵەتیدا لە نەکردنی هەینی.**

**١٥٩٢-** «عَنْ وَهْبُ بْنُ كَيْسَانَ، قَالَ: اجْتَمَعَ عِيدَانِ عَلَى عَهْدِ ابْنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فَأَخَّرَ الْخُرُوجَ حَتَّى تَعَالَى النَّهَارُ، ثُمَّ خَرَجَ فَخَطَبَ فَأَطَالَ الْخُطْبَةَ، ثُمَّ نَزَلَ فَصَلَّى وَلَمْ يُصَلِّ لِلنَّاسِ يَوْمَئِذٍ الْجُمُعَةَ، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِابْنِ عَبَّاسٍ فَقَالَ: أَصَابَ السُّنَّةَ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٠٧٠، وإبن ماجه: ١٣١٠.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٠٧١.




واتە: وەهەبی کوڕی کەیسان دەڵێ: دوو جەژن کۆبوونەوە، (جەژن و هەینی کەوتنە یەک ڕۆژ) لە سەردەمی ئیبنو زوبەیر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەرچوونی بۆ نوێژ دواخست تا خۆر بەرزبوویەوە (بوو بە نزیک نیوەڕۆ)، پاشان دەرچوو وتاریدا وتارەکەی درێژ کردەوەو، پاشان دابەزی و نوێژی کرد، ئەو ڕۆژە هەینی بۆ خەڵک نەکرد، ئەمە باسکرا بۆ ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) وتی: سوننەتی پێکاوە.

## لێدانی دەف لە ڕۆژی جەژن

**١٥٩٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا جَارِيَتَانِ تَضْرِبَانِ بِدُفَّيْنِ، فَانْتَهَرَهُمَا أَبُو بَكْرٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: دَعْهُنَّ فَإِنَّ لِكُلِّ قَوْمٍ عِيداً»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لای دوو جاریەی لەلا بوو هەریەکەو دەفێکی بە دەستەوە بوو لێیدەدا، ئەبو بەکر لێیان تووڕە بوو سەرزەنشتی کردن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وازیان لێ بێنە، هەموو گەلێک جەژنێکی هەیە.

## یاری کردن لە پێش چاوی ئیمام لە ڕۆژی جەژن

**١٥٩٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: جَاءَ السُّودَانُ يَلْعَبُونَ بَيْنَ يَدَيِ النَّبِيِّ ﷺ فِي يَوْمِ عِيدٍ، فَدَعَانِي، فَكُنْتُ أَطَّلِعُ إِلَيْهِمْ مِنْ فَوْقِ عَاتِقِهِ، فَمَا زِلْتُ أَنْظُرُ إِلَيْهِمْ حَتَّى كُنْتُ أَنَا الَّتِي انْصَرَفْتُ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: دوو ڕەش پێست هاتن یاریان دەکرد لە پێش چاوی پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژن، بانگی کردم، منیش لەسەر شانی پێغەمبەر ﷺ تەماشام دەکردن، بەردەوام تەماشام دەکردن تا خۆم ڕۆیشتم.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٥٢ و ٩٨٧ و ٢٩٠٦ و ٣٥٢٩، ومسلم: ٨٩٣، وإبن ماجه: ١٨٩٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٤ و ٤٥٥ و ٩٥٠ و ٩٨٨ و ٢٩٠٧ و ٣٥٣٠، ومسلم: ١٨ و ٨٩٢/٢٠.

## یاریکردن لە مزگەوت لە ڕۆژی جەژنداو
## تەماشاکردنی ئافرەتانیش بۆ ئەو یاریە

**١٥٩٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَسْتُرُنِي بِرِدَائِهِ، وَأَنَا أَنْظُرُ إِلَى الْحَبَشَةِ يَلْعَبُونَ فِي الْمَسْجِدِ حَتَّى أَكُونَ أَنَا أَسْأَمُ، فَاقْدُرُوا قَدْرَ الْجَارِيَةِ الْحَدِيثَةِ السِّنِّ الْحَرِيصَةِ عَلَى اللَّهْوِ»[1].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ دایدەپۆشیم بە عەباکەی، منیش تەماشای ڕەش پێستەکانم دەکرد لە مزگەوت یاریان دەکرد تا خۆم بێزار بووم، وەستام بە ئەندازەی وەستانی کچێکی تازە پێگەیشتوو کە حەزی لە یاری کردن هەبوو.**

**١٥٩٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: دَخَلَ عُمَرُ وَالْحَبَشَةُ يَلْعَبُونَ فِي الْمَسْجِدِ، فَزَجَرَهُمْ عُمَرُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: دَعْهُمْ يَا عُمَرُ، فَإِنَّمَا هُمْ بَنُو أَرْفِدَةَ»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: عومەر ﷺ هاتە ژوورەوە ڕەش پێستەکان لە مزگەوت یاریان دەکرد، عومەر ﷺ سەرزەنشتی کردن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وازیان لێ بێنە ئەی عومەر، ئەوانە نەوەی ئەرفیدەن.**

**تێبینی: دەربارەی وشەی: (بَنُو أَرْفِدَةَ) چەند بۆچوونێک هەیە، یەکێکیان دەڵێ: ناوی باپیرە گەورەیانە، خوا زاناترە.**

## مۆڵەتدان بە گوێ گرتن لە گۆرانی و دەف لێدان لە ڕۆژی جەژندا

**١٥٩٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ دَخَلَ عَلَيْهَا، وَعِنْدَهَا جَارِيَتَانِ تَضْرِبَانِ بِالدُّفِّ وَتُغَنِّيَانِ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُسَجًّى بِثَوْبِهِ - وَقَالَ مَرَّةً أُخْرَى: مُتَسَجٍّ ثَوْبَهُ - فَكَشَفَ عَنْ وَجْهِهِ، فَقَالَ: دَعْهُمَا يَا أَبَا بَكْرٍ إِنَّهَا أَيَّامُ عِيدٍ، وَهُنَّ أَيَّامُ مِنًى وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَئِذٍ بِالْمَدِينَةِ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٠١، ومسلم: ٨٩٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٤٩، ومسلم: ٨٩٢/١٧.




واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: ئەبو بەکری ڕاستگۆ هاتە ژوورەوە بۆ لای، دوو جاریەی لە لا بوو دەفیان لێدەداو گۆرانیان دەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی داپۆشی بوو بە پۆشاکەکەی، (ئەبو بەکر لێیان تووڕە بوو، وەک لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە، پێغەمبەریش ﷺ) بان چاوی لادا فەرمووی: وازیان لێ بێنە ئەی ئەبو بەکر ئەمڕۆ ڕۆژی جەژنە، وە ڕۆژەکانی مینایە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کات لە مەدینە بوو.

## بابەت: هاندان لەسەر نوێژ کردن لە ماڵان و گەورەیی و فەزڵی ئەو کارە

**١٥٩٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: صَلُّوا فِي بُيُوتِكُمْ وَلَا تَتَّخِذُوهَا قُبُوراً»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژ لە ماڵەکانتان بکەن و مەیکەن بە گۆڕستان.**

**١٥٩٩-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اتَّخَذَ حُجْرَةً فِي الْمَسْجِدِ مِنْ حَصِيرٍ، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِيهَا لَيَالِيَ حَتَّى اجْتَمَعَ إِلَيْهِ النَّاسُ، ثُمَّ فَقَدُوا صَوْتَهُ لَيْلَةً، فَظَنُّوا أَنَّهُ نَائِمٌ، فَجَعَلَ بَعْضُهُمْ يَتَنَحْنَحُ لِيَخْرُجَ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ: مَا زَالَ بِكُمُ الَّذِي رَأَيْتُ مِنْ صُنْعِكُمْ حَتَّى خَشِيتُ أَنْ يُكْتَبَ عَلَيْكُمْ، وَلَوْ كُتِبَ عَلَيْكُمْ مَا قُمْتُمْ بِهِ، فَصَلُّوا أَيُّهَا النَّاسُ فِي بُيُوتِكُمْ، فَإِنَّ أَفْضَلَ صَلَاةِ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلَّا الصَّلَاةَ الْمَكْتُوبَةَ»[٢].

**واتە: زەیدی کوڕی ثابت ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ ژوورێکی دروست کرد لە مزگەتدا لە حەسیر، شەوانێک نوێژی تێدا دەکرد تا خەڵکی لێی کۆبوونەوە، پاشان شەوێک دەنگیان نەبیست، گومانیان برد خەوتبێت، هەندێکیان ئحم ئحمیان دەکرد بۆ ئەوەی بچێتە دەرەوە بۆ لایان، فەرمووی: (نەخەوتووم) بەڵکو بەردەوام ئەوەم بینی لێتان (واتە: بەردەوام دەهاتن بۆ شەونوێژ) تا ترسام لەوەی لەسەرتان بنوسرێ، ئەگەر لەسەرتان بنوسرایە پێشی هەڵنەدەستان و لە تواناتاندا نەبوو، ئەی خەڵکینە نوێژ لە ماڵەکانتان بکەن، چونکە بەڕاستی چاکترین نوێژی کەسێک ئەوەیە لە ماڵەوە بیکات جگە لە نوێژە فەڕزەکان.**

**١٦٠٠-** «عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْمَغْرِبِ فِي مَسْجِدِ بَنِي عَبْدِ الْأَشْهَلِ، فَلَمَّا صَلَّى قَامَ نَاسٌ يَتَنَفَّلُونَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: عَلَيْكُمْ بِهَذِهِ الصَّلَاةِ فِي الْبُيُوتِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٣٢ و ١١٨٧، ومسلم: ٢٠٨ و ٧٧٧/٢٠٩، وأبو داود: ١٠٤٣ و ١٤٤٨، والترمذي: ٤٥١، وإبن ماجه: ١٣٧٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٣١ و ٦١١٣ و ٧٢٩٠، ومسلم: ٢١٣ و ٧٨١/٢١٤، وأبو داود: ١٠٤٤ و ١٤٤٧، والترمذي: ٤٥٠.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٦٠٤.




**واتە: کەعبی کوڕی عوجرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ئێوارەی کرد لە مزگەوتی نەوەکانی عەبدولئەشهەل، کاتێ نوێژی تەواو کرد خەڵکێک هەڵسان نوێژی سوننەتیان دەکرد، فەرمووی: پێویستە ئەم نوێژە لەماڵەوە بکەن.**

## بابەت: شەونوێژ

**١٦٠١-** «عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ، أَنَّهُ لَقِيَ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فَسَأَلَهُ عَنِ الْوَتْرِ، فَقَالَ: أَلَا أُنَبِّئُكَ بِأَعْلَمِ أَهْلِ الْأَرْضِ بِوَتْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: عَائِشَةُ، ائْتِهَا فَسَلْهَا، ثُمَّ ارْجِعْ إِلَيَّ فَأَخْبِرْنِي بِرَدِّهَا عَلَيْكَ، فَأَتَيْتُ عَلَى حَكِيمِ بْنِ أَفْلَحَ، فَاسْتَلْحَقْتُهُ إِلَيْهَا، فَقَالَ: مَا أَنَا بِقَارِبِهَا إِنِّي نَهَيْتُهَا أَنْ تَقُولَ فِي هَاتَيْنِ الشِّيعَتَيْنِ شَيْئاً، فَأَبَتْ فِيهَا إِلَّا مُضِيّاً، فَأَقْسَمْتُ عَلَيْهِ فَجَاءَ مَعِي فَدَخَلَ عَلَيْهَا، فَقَالَتْ لِحَكِيمٍ: مَنْ هَذَا مَعَكَ؟ قُلْتُ: سَعْدُ بْنُ هِشَامٍ، قَالَتْ: مَنْ هِشَامٌ؟ قُلْتُ: ابْنُ عَامِرٍ، فَتَرَحَّمَتْ عَلَيْهِ، وَقَالَتْ: نِعْمَ الْمَرْءُ كَانَ عَامِراً، قَالَ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، أَنْبِئِينِي عَنْ خُلُقِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَتْ: أَلَيْسَ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ؟ قَالَ: قُلْتُ: بَلَى، قَالَتْ: فَإِنَّ خُلُقَ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ الْقُرْآنُ فَهَمَمْتُ أَنْ أَقُومَ فَبَدَا لِي قِيَامُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، أَنْبِئِينِي عَنْ قِيَامِ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ قَالَتْ: أَلَيْسَ تَقْرَأُ هَذِهِ السُّورَةَ؟ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ۝١﴾ المزمل، قُلْتُ: بَلَى، قَالَتْ: فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّوَجَلَّ افْتَرَضَ قِيَامَ اللَّيْلِ فِي أَوَّلِ هَذِهِ السُّورَةِ، فَقَامَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ وَأَصْحَابُهُ حَوْلاً حَتَّى انْتَفَخَتْ أَقْدَامُهُمْ، وَأَمْسَكَ اللَّهُ عَزَّوَجَلَّ خَاتِمَتَهَا اثْنَيْ عَشَرَ شَهْراً، ثُمَّ أَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ التَّخْفِيفَ فِي آخِرِ هَذِهِ السُّورَةِ فَصَارَ قِيَامُ اللَّيْلِ تَطَوُّعاً بَعْدَ أَنْ كَانَ فَرِيضَةً فَهَمَمْتُ أَنْ أَقُومَ فَبَدَا لِي وَتْرُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، أَنْبِئِينِي عَنْ وَتْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَتْ: كُنَّا نُعِدُّ لَهُ سِوَاكَهُ، وَطَهُورَهُ، فَيَبْعَثُهُ اللَّهُ عَزَّوَجَلَّ لِمَا شَاءَ أَنْ يَبْعَثَهُ مِنَ اللَّيْلِ، فَيَتَسَوَّكُ، وَيَتَوَضَّأُ، وَيُصَلِّي ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ لَا يَجْلِسُ فِيهِنَّ إِلَّا عِنْدَ الثَّامِنَةِ، يَجْلِسُ فَيَذْكُرُ اللَّهَ عَزَّوَجَلَّ، وَيَدْعُو ثُمَّ يُسَلِّمُ تَسْلِيماً يُسْمِعُنَا، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ بَعْدَ مَا يُسَلِّمُ، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَةً فَتِلْكَ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً يَا بُنَيَّ، فَلَمَّا أَسَنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَخَذَ اللَّحْمَ أَوْتَرَ بِسَبْعٍ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ بَعْدَ مَا سَلَّمَ فَتِلْكَ تِسْعُ رَكَعَاتٍ يَا بُنَيَّ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا صَلَّى صَلَاةً أَحَبَّ أَنْ يَدُومَ عَلَيْهَا وَكَانَ إِذَا شَغَلَهُ عَنْ قِيَامِ اللَّيْلِ نَوْمٌ أَوْ مَرَضٌ أَوْ وَجَعٌ صَلَّى مِنَ النَّهَارِ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً وَلَا أَعْلَمُ أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَرَأَ الْقُرْآنَ كُلَّهُ فِي لَيْلَةٍ، وَلَا قَامَ لَيْلَةً كَامِلَةً حَتَّى الصَّبَاحِ، وَلَا صَامَ شَهْراً كَامِلاً غَيْرَ رَمَضَانَ فَأَتَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ فَحَدَّثْتُهُ بِحَدِيثِهَا، فَقَالَ: صَدَقَتْ، أَمَا إِنِّي لَوْ كُنْتُ أَدْخُلُ عَلَيْهَا لَأَتَيْتُهَا حَتَّى تُشَافِهَنِي مُشَافَهَةً»[1].

---

(١) صحيح.





واتە: سەعدی کوڕی هیشام دەگێڕێتەوە: ئەو گەیشت بە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، پرسیاری نوێژی ویتری لێکرد، ئەویش وتی: ئایا پێت ڕابگەیەنم بە شارەزاترینی سەر زەوی بە ویتری پێغەمبەری خوا ﷺ؟ وتی: بەڵێ، وتی: عائیشەیە، بڕۆ بۆ لای پرسیاری لێبکە، پاشان بگەڕێرەوە بۆ لام هەواڵم بدەرێ بە وەڵامەکەی، جا هاتم بۆ لای حەکیمی کوڕی ئەفلەح، داوام لێکرد لەگەڵم بێت بۆ لای (دایکمان) عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، وتی: من نزیکی ناکەومەوە، وە نەهیم لێکردبوو هیچ شتێک بڵێت دەربارەی ئەو دوو کۆمەڵە (واتە: کۆمەڵی عەلی و کۆمەڵی زوبەیری کوڕی عەوام و تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا، کە لە کۆتایی جەنگی جەمەل لە نێوانیاندا ڕوویدا) بەڵام ئەو (واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ)، پشتی هەڵکردو، دەربارەی ئەوەو بەردەوام بوو، جا (سەعدی کوڕی هیشام) دەڵێ: منیش سوێندم لەسەر حەکیمی کوڕی ئەفلەح خوارد: کە هەر دەبی لەگەڵم بێ، (ئنجا ڕازی بوو)، لەگەڵم هاتە ژوورەوە بۆ لای عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، (عائیشە خوا لێی ڕازی بێ) بە حەکیمی وت: ئەمە کێیە لەگەڵتدا؟ وتی: سەعدی کوڕی هیشامە، وتی: کام هیشام؟ وتم: کوڕی عامر، سۆزو خۆشەویستی بۆ دەربڕی، وتی: عامر پیاوێکی چاک بوو، وتی: ئەی دایکی بڕواداران هەواڵم بدەرێ دەربارەی ڕەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: ئایا قورئان دەخوێنی؟ دەڵێ: وتم: بەڵی دەیخوێنم، وتی: بێگومان ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ قورئان بوو، ویستم هەڵسم شەونوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ هات بە بیرمدا، جا وتم: ئەی دایکی ئیمانداران هەواڵم بدەرێ دەربارەی شەونوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش وتی: ئایا ئەم سوورەتەت نەخوێندوە؟ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ١﴾ المزمل، وتم: بەڵێ خوێندوومە، وتی: بێگومان خوا (عَزَّوَجَلَّ) شەونوێژی فەرز کرد لە سەرەتای ئەم سوورەتە، پێغەمبەرو هاوەڵەکانی یەک ساڵ هەڵسان شەونوێژیان کرد تا پێیەکانیان ئاوسا، خوا (عَزَّوَجَلَّ) لە کۆتایی دوازدە مانگەکەدا شەونوێژی لەسەریان لابرد، پاشان ئاسانکاری بۆ کردن لە کۆتایی ئەم سوورەتەدا، ئینجا شەونوێژ بوو بە سوننەت دوای ئەوەی فەرز بوو، ویستم هەڵسم، ئینجا ویتری پێغەمبەری خوا ﷺ هات بە خەیاڵمدا، وتم: ئەی دایکی ئیمانداران هەواڵم بدەرێ دەربارەی ویتری پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: ئێمە سیواک و ئاوی دەستنوێژمان بۆی ئامادە دەکرد، ئەوەندەی خوا (عَزَّوَجَلَّ) ویستی لەسەری بووایە بە خەبەری بکاتەوە

بە خەبەر دەبوویەوە، سیواکی دەکردو دەستنوێژی دەگرت و هەشت ڕکات نوێژی دەکرد دانەدەنیشت لەکاتی هەشتەمین ڕکاتدا نەبێت، ئینجا دادەنیشت یادی خوای (عَزَّوَجَلَّ) دەکردو دەپاڕایەوەو پاشان سەلامی دەدایەوە سەلامدانەوەیەک دەمان بیست، پاشان دوو ڕکات نوێژی دەکردو دادەنیشت دوای سەلامدانەوە، پاشان یەک ڕکاتی دەکرد، هەمووی بوو بە یازدە ڕکات ئەی کوڕە بچکۆلەکەم، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بە ساڵاچوو گۆشتی گرت لە حەوتەمین ڕکات ویتری دەکرد، وە دوو ڕکاتی دەکرد بە دانیشتنەوە دوای سەلامدانەوە، جا هەمووی بوو بە نۆ ڕکات ئەی کوڕە بچکۆلەکەم، وە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ نوێژێکی بکردایە حەزی دەکرد بەردەوام بێت لەسەری، بەڵام ئەگەر خەو یان نەخۆشی یان ئازارێک سەرقاڵی بکردایە لە شەونوێژ، ئەوە بە ڕۆژ دوازدە ڕکاتی دەکرد، نەمزانیوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوێکدا هەموو قورئانی خوێندبێت، وە نەمزانیوە شەوێک بە تەواوی هەڵسابێت هەتا بەیانی، وە نەمزانیوە مانگێک ڕۆژووی گرتبێ بە تەواوی جگە لە ڕەمەزان، دواتر هاتم بۆ لای ئیبنو عەبباس باسەکەم بۆی کرد، وتی: ڕاستی کرد، ئەگەر من بچوایەم بۆ لای دەچووم هەتا دەماو دەم لێم دەبیست.

## بابەت: پاداشتی ئەو کەسەی ڕەمەزان شەونوێژ بکات و بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بکات

**١٦٠٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕەمەزان شەونوێژ بکات، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ.

**١٦٠٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧ و ٣٨ و ٢٠٠٨ و ٢٠٠٩، ومسلم: ١٧٣ و ٧٥٩/١٧٤، وأبو داود: ١٣٧١ و ١٣٧٢، والترمذي: ٦٨٣ و ٨٠٨، وإبن ماجه: ١٣٢٦ و ١٦٤١.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕەمەزان شەونوێژ بکات، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ.

## بابەت: شەونوێژ لە مانگی ڕەمەزان

**١٦٠٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى فِي الْمَسْجِدِ ذَاتَ لَيْلَةٍ، وَصَلَّى بِصَلَاتِهِ نَاسٌ، ثُمَّ صَلَّى مِنَ الْقَابِلَةِ، وَكَثُرَ النَّاسُ ثُمَّ اجْتَمَعُوا مِنَ اللَّيْلَةِ الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا أَصْبَحَ قَالَ: قَدْ رَأَيْتُ الَّذِي صَنَعْتُمْ فَلَمْ يَمْنَعْنِي مِنَ الْخُرُوجِ إِلَيْكُمْ إِلَّا أَنِّي خَشِيتُ أَنْ يُفْرَضَ عَلَيْكُمْ وَذَلِكَ فِي رَمَضَانَ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێک لە مزگەوت نوێژی کرد، خەڵکیش وەک نوێژەکەی ئەو نوێژیان کرد، پاشان شەوەکەی تریش نوێژی کرد، خەڵکەکە زۆر بوون، پاشان کۆبوونەوە لە شەوی سێیەم یان چوارەم، پێغەمبەری خوا ﷺ نەهاتەدەر بۆ لایان، کاتێ ڕۆژ بوویەوە فەرمووی: ئەوەی کردتان بینیم هیچ شتێک ڕێگر نەبوو لەبەردەم هاتنم بۆ نێوتان ئەوە نەبێ ترسام لە ڕەمەزاندا شەونوێژ فەرز بکرێت لەسەرتان.**

**١٦٠٥-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: صُمْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي رَمَضَانَ، فَلَمْ يَقُمْ بِنَا حَتَّى بَقِيَ سَبْعٌ مِنَ الشَّهْرِ، فَقَامَ بِنَا حَتَّى ذَهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ، ثُمَّ لَمْ يَقُمْ بِنَا فِي السَّادِسَةِ، فَقَامَ بِنَا فِي الْخَامِسَةِ حَتَّى ذَهَبَ شَطْرُ اللَّيْلِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوْ نَفَّلْتَنَا بَقِيَّةَ لَيْلَتِنَا هَذِهِ، قَالَ: إِنَّهُ مَنْ قَامَ مَعَ الْإِمَامِ حَتَّى يَنْصَرِفَ، كَتَبَ اللَّهُ لَهُ قِيَامَ لَيْلَةٍ، ثُمَّ لَمْ يُصَلِّ بِنَا وَلَمْ يَقُمْ حَتَّى بَقِيَ ثَلَاثٌ مِنَ الشَّهْرِ، فَقَامَ بِنَا فِي الثَّالِثَةِ، وَجَمَعَ أَهْلَهُ وَنِسَاءَهُ حَتَّى تَخَوَّفْنَا أَنْ يَفُوتَنَا الْفَلَاحُ، قُلْتُ: وَمَا الْفَلَاحُ؟ قَالَ: السُّحُورُ»[٢].

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژوومان گرت لە ڕەمەزان، شەونوێژی پێ نەکردین تا حەوت شەوی مابوو لە مانگەکە، ئینجا (لە شەوی بیست و سێ) نوێژی پێکردین تا سێیەکی شەو ڕۆیشت، پاشان لە شەشەمین (واتە: شەوی بیست**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٢٤ و ١١٢٩ و ٢٠١٢، ومسلم: ١٧٧ و ٧٦١/١٧٨، وأبو داود: ١٣٧٣.

(٢) صحيح.





**و چوار) شەونوێژی پێ نەکردین، بەڵام لە شەوی بیست و پێنج نوێژی پێ کردین تا نیوەی شەو ڕۆیشت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، خۆزگە شەونوێژی ئەم شەومان بۆ زیاد بکەی، فەرمووی: کەسێک لەگەڵ ئیمامدا نوێژ بکات تا نوێژ تەواو دەکات، ئەوە خوا شەونوێژی ئەو شەوەی بۆ دەنوسێ، پاشان نە نوێژی بۆ کردین و نە شەونوێژ، تا سێ شەوی مانگەکە مابوو، ئینجا شەونوێژی بۆ کردین، کچەکانی و خێزانەکانی کۆکردەوە، تا ترساین لەوەی فەلاحمان لە دەست بچێت، وتم: فەلاح چیە؟ وتی: پارشێوە.**

**١٦٠٦-** «عَن نُعَيْمِ بْنِ زِيَادٍ أَبُو طَلْحَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ ﷺ عَلَى مِنْبَرِ حِمْصَ يَقُولُ: قُمْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ لَيْلَةَ ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ قُمْنَا مَعَهُ لَيْلَةَ خَمْسٍ وَعِشْرِينَ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ، ثُمَّ قُمْنَا مَعَهُ لَيْلَةَ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنْ لَا نُدْرِكَ الْفَلَاحَ، وَكَانُوا يُسَمُّونَهُ: السُّحُورَ»[1].

**واتە: نوعەیمی کوڕی زیاد ئەبو طەڵحە دەڵێ: گوێبیستی نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ بووم لەسەر مینبەری حیمص دەیوت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵساین بۆ شەونوێژ لە مانگی ڕەمەزان شەوی بیست و سێ تا سێیەکی یەکەمی شەو، پاشان لەگەڵی هەڵساین بۆ شەونوێژ شەوی بیست و پێنج تا نیوەی شەو، پاشان شەوی بیست و حەوت لەگەڵی هەڵساین بۆ شەونوێژ تا گومانمان برد نەگەین بە فەلاح، پێیان دەوت: پارشێو.**

## بابەت: هاندان بۆ شەونوێژ

**١٦٠٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا نَامَ أَحَدُكُمْ عَقَدَ الشَّيْطَانُ عَلَى رَأْسِهِ ثَلَاثَ عُقَدٍ، يَضْرِبُ عَلَى كُلِّ عُقْدَةٍ لَيْلاً طَوِيلاً أَيِ ارْقُدْ، فَإِنِ اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللَّهَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ تَوَضَّأَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ أُخْرَى، فَإِنْ صَلَّى انْحَلَّتِ الْعُقَدُ كُلُّهَا، فَيُصْبِحُ طَيِّبَ النَّفْسِ نَشِيطاً، وَإِلَّا أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ كَسْلَانَ»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکێک لە ئێوە دەخەوێت شەیتان سێ گرێ لەسەری دەدات، بۆ هەر گرێیەک دەڵێ: شەوێکی**

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٤٢ و ٣٢٦٩، ومسلم: ٧٧٦، وأبو داود: ١٣٠٦، وإبن ماجه: ١٣٢٩.**




**درێژت بەسەردا بێت بخەوە، ئەگەر خەبەری بوویەوەو یادی خوای کرد، ئەوە گرێیەکیان دەکرێتەوە، ئەگەر دەستنوێژی گرت گرێیەکی تریشیان دەکرێتەوە، ئەگەر نوێژیشی کرد هەموو گرێیەکان دەکرێنەوە، ئیتر ڕۆژ دەکاتەوە بە نەفسێکی پاک و چالاک، گەر وانەبوو بە دەروون پیسی و تەمبەڵی ڕۆژ دەکاتەوە.**

**١٦٠٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: ذُكِرَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ رَجُلٌ نَامَ لَيْلَةً حَتَّى أَصْبَحَ، قَالَ: ذَاكَ رَجُلٌ بَالَ الشَّيْطَانُ فِي أُذُنَيْهِ»[1].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: باسی پیاوێک کرا لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێک خەوت تا بەیانی بوویەوە، فەرمووی: ئەوە پیاوێکە شەیتان میزی کردوە بە هەردوو گوێیدا.**

**١٦٠٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ فُلَاناً نَامَ عَنِ الصَّلَاةِ الْبَارِحَةَ حَتَّى أَصْبَحَ، قَالَ: ذَاكَ شَيْطَانٌ بَالَ فِي أُذُنَيْهِ»[2].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، فڵانەکەس دوێنێ خەوت نوێژی بەیانی نەکرد تا ڕۆژ بوویەوە، فەرمووی: ئەوە شەیتان میزی کردوە بە هەردوو گوێیدا.**

**١٦١٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: رَحِمَ اللَّهُ رَجُلاً قَامَ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّى، ثُمَّ أَيْقَظَ امْرَأَتَهُ فَصَلَّتْ، فَإِنْ أَبَتْ نَضَحَ فِي وَجْهِهَا الْمَاءَ، وَرَحِمَ اللَّهُ امْرَأَةً قَامَتْ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّتْ، ثُمَّ أَيْقَظَتْ زَوْجَهَا فَصَلَّى، فَإِنْ أَبَى نَضَحَتْ فِي وَجْهِهِ الْمَاءَ»[3].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕەحمەتی خوا لە پیاوێک لە شەودا هەڵسا نوێژی کرد، پاشان خێزانەکەی بە خەبەر هێنایەوەو نوێژی کرد، ئەگەر هەڵنەسا، ڕووخساری ئاو پرژێن بکات، وە ڕەحمەتی خوا لە ئافرەتێک لە شەودا هەڵساو نوێژی کرد، پاشان مێردەکەی بەخەبەر هێنایەوەو نوێژی کرد، ئەگەر نکوڵی کرد ڕوخساری ئاو پرژێن بکات.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٤٤ و ٣٢٧٠، ومسلم: ٧٧٤، وإبن ماجه: ١٣٣٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٤٤، ومسلم: ٧٧٤.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٣٠٨ و ١٤٥٠، وإبن ماجه: ١٣٣٦.





**١٦١١-** «عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ طَرَقَهُ وَفَاطِمَةَ، فَقَالَ: أَلَا تُصَلُّونَ؟ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا أَنْفُسُنَا بِيَدِ اللَّهِ، فَإِذَا شَاءَ أَنْ يَبْعَثَهَا بَعَثَهَا، فَانْصَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ قُلْتُ لَهُ ذَلِكَ، ثُمَّ سَمِعْتُهُ وَهُوَ مُدْبِرٌ يَضْرِبُ فَخِذَهُ، وَيَقُولُ: ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾﴾الكهف»[1].

**واتە: عەلی کوڕی ئەبو طالیب ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دای لە دەرگای من و فاطیمە فەرمووی: ئایا نوێژ ناکەن؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، گیانی ئێمە بە دەستی خوایە، جا ئەگەر ویستی بێت خەبەرمان بکاتەوە هەڵدەستین، کاتێ ئەو قسەم کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت، گوێم لێ بوو کاتێ گەڕایەوە دەیدا بەڕانی خۆیداو دەیفەرموو: ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾﴾. (واتە: سوێند بە خوا بەڕاستی ئێمە لەگەڵ قورئاندا هێناومانەتەوە هەموو جۆرە نمونەیەک بۆ خەڵکی، بەڵام هەمیشە ئادەمی لە هەموو شتێک زیاتر موجادەلە دەکات).**

**١٦١٢-** «عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَعَلَى فَاطِمَةَ مِنَ اللَّيْلِ، فَأَيْقَظَنَا لِلصَّلَاةِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى بَيْتِهِ فَصَلَّى هَوِيّاً مِنَ اللَّيْلِ فَلَمْ يَسْمَعْ لَنَا حِسّاً، فَرَجَعَ إِلَيْنَا فَأَيْقَظَنَا، فَقَالَ: قُومَا فَصَلِّيَا، قَالَ: فَجَلَسْتُ وَأَنَا أَعْرُكُ عَيْنِي، وَأَقُولُ: إِنَّا وَاللَّهِ مَا نُصَلِّي إِلَّا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَنَا، إِنَّمَا أَنْفُسُنَا بِيَدِ اللَّهِ، فَإِنْ شَاءَ أَنْ يَبْعَثَنَا بَعَثَنَا، قَالَ: فَوَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ يَقُولُ: وَيَضْرِبُ بِيَدِهِ عَلَى فَخِذِهِ: مَا نُصَلِّي إِلَّا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَنَا: ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾﴾الكهف»[2].

**واتە: عەلی کوڕی ئەبو طالیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دای لە دەرگای من و فاطیمە لە شەودا خەبەری کردینەوە بۆ شەونوێژ، پاشان گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی، ئەندازەیەکی زۆر شەونوێژی کرد، هیچی لێیان نەبیست، گەڕایەوە بۆ لامان خەبەری کردینەوە، فەرمووی: هەڵسن نوێژ بکەن، دەڵێ: دانیشتم دەستم دەخستە چاوەکانم، وتم: سوێند بە خوا من نوێژ ناکەم تەنها ئەو نوێژە نەبێ کە خوا فەرزی کردوە، گیانی ئێمە بە دەستی خوایە، جا ئەگەر ویستی بێت خەبەرمان بکاتەوە هەڵدەستین، وتی:**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٢٧ و ٤٧٢٤ و ٧٣٤٧ و ٧٤٦٥، ومسلم: ٧٧٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٢٧، ومسلم: ٧٧٥.

پشتی تێکردن ڕۆیشت دەیدا بە ئەژنۆیداو دەیفەرموو: نوێژ ناکەین، تەنها ئەو نوێژە نەبێ کە خوا فەرزی کردوە لەسەرمان: ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾﴾.

## فەزڵ و گەورەیی شەونوێژ

**١٦١٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ شَهْرُ اللَّهِ الْمُحَرَّمُ، وَأَفْضَلُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْفَرِيضَةِ صَلَاةُ اللَّيْلِ»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترین ڕۆژووگرتن لە دوای ڕەمەزان مانگی موحەڕڕەمە، وە چاکترین نوێژ دوای فەڕزەکان شەونوێژە.**

**١٦١٤-** «عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَفْضَلُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْفَرِيضَةِ قِيَامُ اللَّيْلِ، وَأَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ رَمَضَانَ الْمُحَرَّمُ»[2].

**واتە: حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترین نوێژ دوای فەڕزەکان شەونوێژە، وە چاکترین ڕۆژوو گرتن لە دوای ڕەمەزان مانگی موحەڕڕەمە.**

## فەزڵ و چاکەی شەونوێژ لە گەشتدا

**١٦١٥-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: ثَلَاثَةٌ يُحِبُّهُمُ اللَّهُ ﷻ: رَجُلٌ أَتَى قَوْماً فَسَأَلَهُمْ بِاللَّهِ وَلَمْ يَسْأَلْهُمْ بِقَرَابَةٍ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُمْ فَمَنَعُوهُ فَتَخَلَّفَهُمْ رَجُلٌ بِأَعْقَابِهِمْ فَأَعْطَاهُ سِرّاً لَا يَعْلَمُ بِعَطِيَّتِهِ إِلَّا اللَّهُ ﷻ وَالَّذِي أَعْطَاهُ، وَقَوْمٌ سَارُوا لَيْلَتَهُمْ حَتَّى إِذَا كَانَ النَّوْمُ أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِمَّا يُعْدَلُ بِهِ نَزَلُوا فَوَضَعُوا رُءُوسَهُمْ فَقَامَ يَتَمَلَّقُنِي وَيَتْلُو آيَاتِي، وَرَجُلٌ كَانَ فِي سَرِيَّةٍ فَلَقُوا الْعَدُوَّ فَانْهَزَمُوا فَأَقْبَلَ بِصَدْرِهِ حَتَّى يُقْتَلَ أَوْ يُفْتَحَ لَهُ»[3].

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سێ کەس هەن خوا ﷻ خۆشی دەوێن: پیاوێک دەچێت بۆ لای خەڵکێک داوایان لێ دەکات لەبەر خوا**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٢ و ١١٦٣/٢٠٣، والترمذي: ٤٣٨ و ٧٤٠، وابن ماجه: ١٧٤٢.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٥٦٨.




یارمەتی بدەن، لەبەر خزمایەتی لە نێوان ئەوو ئەوان داوایان لێ ناکات، ئەوانیش یارمەتی نادەن، پیاوێک لە نێویاندا دەمێنێتەوە لە دوایانەوە، بە نهێنی یارمەتی دەدات، کەس بە هاوکاریەکەی نازانێت جگە لە خوا ﷻ، خەڵکێکیش شەوڕۆیی بکەن تا وایان لێ دێت خەو لەلایان لە هەموو شتێک خۆشەویستتر دەبێت سەریان دابنێن و بخەون، کەسێک لە نێویان هەڵسێت و بپاڕێتەوە لێم و ئایەتەکانم بخوێنێتەوە (واتە: قورئان بخوێنێ)، وە پیاوێک لە ناو دەستەیەکدا ڕووبەڕووی دوژمن بینەوەو بشکێن، ئەم ڕووبەڕوویان ببێتەوە تا دەکوژرێ، یان دەرووی بۆ دەکرێتەوە.

## بابەت: کاتی شەونوێژ

**١٦١٦-** «عَنْ مَسْرُوقٍ، قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَيُّ الْأَعْمَالِ أَحَبُّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَتْ: الدَّائِمُ، قُلْتُ: فَأَيُّ اللَّيْلِ كَانَ يَقُومُ؟ قَالَتْ: إِذَا سَمِعَ الصَّارِخَ»[١].

واتە: مەسروق دەڵێ: بە عائیشەم (خوا لێی ڕازی بێ) وت: چ کردەوەیەک لە لای پێغەمبەری خوا خۆشەویسترینە؟ وتی: بەردەوام بوون، وتم: چ کاتێک لە شەو شەونوێژی دەکرد؟ وتی: کاتێک گوێی لە کەڵەشێر بووایە دەخوێنێ.

## بابەت: باسی ئەو زیکرەی شەونوێژی پێ دادەبەسترێ

**١٦١٧-** «عَنْ عَاصِمِ بْنِ حُمَيْدٍ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: بِمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْتَفْتِحُ قِيَامَ اللَّيْلِ؟ قَالَتْ: لَقَدْ سَأَلْتَنِي عَنْ شَيْءٍ مَا سَأَلَنِي عَنْهُ أَحَدٌ قَبْلَكَ، كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُكَبِّرُ عَشْراً، وَيَحْمَدُ عَشْراً، وَيُسَبِّحُ عَشْراً، وَيُهَلِّلُ عَشْراً، وَيَسْتَغْفِرُ عَشْراً، وَيَقُولُ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَاهْدِنِي، وَارْزُقْنِي وَعَافِنِي، أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ ضِيقِ الْمَقَامِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٢].

واتە: عاصمی کوڕی حومەید دەڵێ پرسیارم کرد لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ): پێغەمبەری خوا ﷺ بە چ (زیکرێک) دەستی بە شەونوێژ دەکرد؟ وتی: دەربارەی شتێک پرسیارت لێکردم، هیچ کەس پێش تۆ پرسیاری لێ نەکردووم، پێغەمبەری خوا ﷺ دە جار تەکبیری دەکردو، دە جار ستایشی خوای دەکردو، دە جاریش

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٣٢ و ٦٤٦١، ومسلم: ٧٤١، وأبو داود: ١٣١٧.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٧٦٦، وإبن ماجه: ١٣٥٦.





**تەسبیحاتی دەکردو، دە جاریش تەهلیلی دەکردو، دە جاریش داوای لێخۆشبوونی دەکرد، وە دەیفەرموو: خوایە لێم خۆشبەو ڕێنماییم بکەو ڕزق و ڕۆزیم بدەو بمپارێزە، پەنا دەگرم بە خوا لە ناڕەحەتی وەستان لە ڕۆژی دواییدا.**

**١٦١٨-** «عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ كَعْبٍ الْأَسْلَمِيِّ ﵁ قَالَ: كُنْتُ أَبِيتُ عِنْدَ حُجْرَةِ النَّبِيِّ ﷺ فَكُنْتُ أَسْمَعُهُ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ، يَقُولُ: سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ الْهَوِيَّ، ثُمَّ يَقُولُ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ الْهَوِيَّ»[١].

**واتە: ڕەبیعەی کوڕی کەعبی ئەسلەمی ﵁ دەڵێ: من لە لای ژوورەکەی پێغەمبەر ﷺ شەو دەمامەوە کاتێ هەڵسایە بۆ شەونوێژ گوێم لێ بوو دەیفەرموو: پاک و بێگەردی بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان، ماوەیەکی زۆر (ئاوای دەفەرموو)، پاشان ماوەیەکی زۆر دەیفەرموو: پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ خوا بە هەمیشەیی.**

**١٦١٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ يَتَهَجَّدُ، قَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ قَيَّامُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ مَلِكُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ حَقٌّ، وَوَعْدُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ، وَمُحَمَّدٌ حَقٌّ، لَكَ أَسْلَمْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، «ثُمَّ ذَكَرَ قُتَيْبَةُ كَلِمَةً مَعْنَاهَا» وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە شەودا هەڵسابایە شەونوێژ بکات دەیفەرموو: خوایە سوپاس و ستایش بۆ تۆ، تۆ ڕووناکی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەیشی لە نێوانیاندایە، ستایش بۆ تۆ، تۆ ڕاگری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەیشی لە نێوانیاندایە، ستایش بۆ تۆ، تۆ پاشای ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەیشی لە نێوانیاندایە، ستایش بۆ تۆ، تۆ حەق و ڕاستیت، بەڵێن و پەیمانت ڕاستن، بەهەشت ڕاستەو ئاگریش ڕاستە، ڕۆژی دواییش ڕاستەو پێغەمبەرانیش ڕاستن،**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٨٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٢٠ و ٦٣١٧ و ٧٣٨٥ و ٧٤٤٢ و ٧٤٩٩، ومسلم: ٧٦٩، وأبو داود: ٧٧١ و ٧٧٢، وإبن ماجه: ١٣٥٥.




موحەممەدیش ڕاستە، ملکەچ و تەسلیمی تۆ بووم و تەنها پشتم بە تۆ بەست و بڕوام بە تۆ هێنا، «پاشان قوتەیبە باسی وشەیەکی کرد ماناکەی بریتی بوو لە» بە یارمەتی تۆ دژایەتی ناحەزانی ئیسلام دەکەم و، حوکم و بڕیار بۆ لای تۆ دەگێڕمەوە، تۆش لێم خۆشبە لە ڕابردوو و داهاتوو و ئەوەی بە ئاشکرا کردوومە، تۆ یەکەم کەس و کۆتا کەسیت، هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق جگە لە تۆ، هیچ لادانێک لە (خراپە) و، هێزێک (بۆ ئەنجامدانی کاری چاکە) نیە تەنها بە خوا نەبێ.

**١٦٢٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ بَاتَ عِنْدَ مَيْمُونَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ وَهِيَ خَالَتُهُ، فَاضْطَجَعَ فِي عَرْضِ الْوِسَادَةِ، وَاضْطَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَهْلُهُ فِي طُولِهَا، فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، حَتَّى إِذَا انْتَصَفَ اللَّيْلُ أَوْ قَبْلَهُ قَلِيلاً أَوْ بَعْدَهُ قَلِيلاً اسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَجَلَسَ يَمْسَحُ النَّوْمَ عَنْ وَجْهِهِ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَرَأَ الْعَشْرَ الْآيَاتِ الْخَوَاتِيمَ مِنْ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ، ثُمَّ قَامَ إِلَى شَنٍّ مُعَلَّقَةٍ، فَتَوَضَّأَ مِنْهَا فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ: فَقُمْتُ فَصَنَعْتُ مِثْلَ مَا صَنَعَ، ثُمَّ ذَهَبْتُ فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ، فَوَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى رَأْسِي، وَأَخَذَ بِأُذُنِي الْيُمْنَى يَفْتِلُهَا، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَوْتَرَ، ثُمَّ اضْطَجَعَ حَتَّى جَاءَهُ الْمُؤَذِّنُ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: شەو لەلای مەیمونە دایکی بڕواداران کە پوریەتی خەوت، ڕاکشا لە تەنیشتێکی ڕاخەرەکە، پێغەمبەری خوا ﷺ و خێزانەکەی لەسەر درێژاییەکەی ڕاکشان، پێغەمبەری خوا ﷺ خەوت تا کاتی نیوەی شەو، یان کەمێک پێشتر یان دواتر هەڵسا لە خەو، دەستی دەهێنا بە ڕوخساری تا خەوی بڕەوێتەوە، پاشان دە ئایەتی کۆتایی سووڕەتی ئالی عیمرانی خوێند، پاشان چوو بۆ لای جەوەنەیەکی ئاوی هەڵواسراو، دەستنوێژی لێگرت بە چاکترین شێوە، پاشان هەڵسا نوێژی کرد، جا عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: هەڵسام ئەو چی کرد منیش هەمان شتم کردم، پاشان ڕۆیشتم لەلای تەنیشتیەوە وەستام، (لەلای چەپی)، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی ڕاستی خستە سەر سەرم گوێی ڕاستی گرتم بایدا، (هێنامیە لای ڕاستی) دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان دوو ڕکات، پاشان دوو ڕکات، پاشان دوو ڕکات، پاشان دوو

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٨ و ١٨٣ و ٧٢٦ و ٨٥٩ و ٩٩٢ و ١١٩٨ و ٤٥٦٩ و ٤٥٧٠ و ٤٥٧١ و ٤٥٧٢ و ٦٢١٥، ومسلم: ١٨١ و ٧٦٣/١٩١، وأبو داود: ١٣٦٤ و ١٦٥٤ و ٥٠٤٣، والترمذي: ٢٣٢، وإبن ماجه: ٤٢٣ و ٥٠٨ و ١٣٦٣.



ڕكات، پاشان (يەک ڕكات) ويتری كرد، پاشان ڕاكشا هەتا بانگدەر بانگيدا، پاشان دوو ڕكات نوێژی سووكی كرد.

## بابەت: كاتێ (كەسێک) شەو هەڵسا بۆ شەونوێژ چۆن سيواک بەكار دێنێ

**١٦٢١-** «عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ يَشُوصُ فَاهُ بِالسِّوَاكِ»(١).

**واتە:** حوزەيفە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ كاتێ هەڵسابايە بۆ شەونوێژ سيواكی وەردەدا لە دەمی.

**١٦٢٢-** «عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ يَشُوصُ فَاهُ بِالسِّوَاكِ»(٢).

**واتە:** حوزەيفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ هەڵسابايە بۆ شەونوێژ سيواكی وەردەدا لە دەمی.

## باسی جياوازی لەسەر ئەبو حەصين عوسمانی كوڕی عاصم لەم فەرموودەدا

**١٦٢٣-** «عَنْ أبي سِنَان، عَنْ أَبِي حَصِينٍ عَنْ شَقِيقٍ عن حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُؤْمَرُ بِالسِّوَاكِ إِذَا قُمْنَا مِنَ اللَّيْلِ»(٣).

**واتە:** ئەبو سينان دەگێڕێتەوە: لە ئەبو حەصين، لە شەقيق لە حوزەيفەوە ﷺ دەڵێ: ئێمە فەرمانمان پێ دەكرا بە سيواک كردن كاتێ هەڵساين بۆ شەونوێژ.

**١٦٢٤-** «عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ، عَنْ شَقِيقٍ قَالَ: كُنَّا نُؤْمَرُ إِذَا قُمْنَا مِنَ اللَّيْلِ أَنْ نَشُوصَ أَفْوَاهَنَا بِالسِّوَاكِ»(٤).

**واتە:** ئيسرائيل دەگێڕێتەوە: لە ئەبو حەصين، لە شەقيقەوە دەڵێ: ئێمە فەرمانمان پێدەكرا كاتێ هەڵساين بۆ شەونوێژ سيواک لە دەمان وەربدەين.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح الإسناد.




## بابەت: بە چ شتێک شەونوێژ دەستی پێدەکرێ

**١٦٢٥-** «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: بِأَيِّ شَيْءٍ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَفْتَتِحُ صَلَاتَهُ؟ قَالَتْ: كَانَ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ افْتَتَحَ صَلَاتَهُ قَالَ: اللَّهُمَّ رَبَّ جِبْرِيلَ وَمِيكَائِيلَ وَإِسْرَافِيلَ، فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ، عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ، اللَّهُمَّ اهْدِنِي لِمَا اخْتُلِفَ فِيهِ مِنَ الْحَقِّ، إِنَّكَ تَهْدِي مَنْ تَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ»[١].

**واتە: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ): پێغەمبەر ﷺ بە چ شتێک نوێژی دەست پێدەکرد؟ وتی: کاتێ هەڵسایە بۆ شەونوێژ نوێژی دەست پێدەکردو دەیفەرموو: ئەی خوایە پەروەردگاری جبریل و میکائیل و ئیسرافیل، بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، زانای غەیب و پەنهان و ئاشکرا، تۆ حوکم و دادگەری دەکەی لە نێوان بەندەکانت لەوەی جیاوازیان هەیە تیایدا، خوایە هیدایەتم بدە لەوەی جیاوازی تێدایە بۆ لای حەق، تۆ هیدایەتی هەر کەسێک دەدەی بە ویستی خۆت بۆ ڕێگای ڕاست.**

**١٦٢٦-** «عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: قُلْتُ وَأَنَا فِي سَفَرٍ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: وَاللَّهِ لَأَرْقُبَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِصَلَاةٍ حَتَّى أَرَى فِعْلَهُ، فَلَمَّا صَلَّى صَلَاةَ الْعِشَاءِ وَهِيَ الْعَتَمَةُ، اضْطَجَعَ هَوِيّاً مِنَ اللَّيْلِ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ فَنَظَرَ فِي الْأُفُقِ، فَقَالَ: ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَاطِلًا ﴿١٩١﴾﴾آل عمران، حَتَّى بَلَغَ: ﴿إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ الْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾﴾آل عمران، ثُمَّ أَهْوَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى فِرَاشِهِ، فَاسْتَلَّ مِنْهُ سِوَاكاً، ثُمَّ أَفْرَغَ فِي قَدَحٍ مِنْ إِدَاوَةٍ عِنْدَهُ مَاءً فَاسْتَنَّ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى حَتَّى قُلْتُ: قَدْ صَلَّى قَدْرَ مَا نَامَ، ثُمَّ اضْطَجَعَ حَتَّى قُلْتُ: قَدْ نَامَ قَدْرَ مَا صَلَّى، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ فَفَعَلَ كَمَا فَعَلَ أَوَّلَ مَرَّةٍ، وَقَالَ مِثْلَ مَا قَالَ، فَفَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ قَبْلَ الْفَجْرِ»[٢].

**واتە: حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف دەگێڕێتەوە: پیاوێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وتی: لە گەشتێک دابووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ وتم:**

---

(١) حسن. أخرجه مسلم: ٧٧٠، وأبو داود: ٧٦٧، والترمذي: ٣٤٢٠، وإبن ماجه: ١٣٥٧.

(٢) صحيح الإسناد.




سوێند بە خوا دەبێت لە پێغەمبەری خوا نزیک ببمەوە چاودێری نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم تا بزانم چۆن ئەنجامی دەدا، کاتێ نوێژی عیشای کرد ئەندازەیەکی درێژ پاڵ کەوت، پاشان خەبەری بوویەوە تەماشای ئاسۆی کرد، فەرمووی: ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا ﴿١٩١﴾﴾، هەتا گەیشت بە: ﴿إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾﴾، پاشان چووە سەر جێگاکەی سیواکێکی دەرهێنا، پاشان ئاوی کردە قاپێک لەلایدا سیواکی پێکرد، پاشان هەڵسا نوێژی کرد تا وتم: بە ئەندازەی ئەوە نوێژی کرد کە خەوتبوو، پاشان پاڵ کەوت تا وتم: خەوت بە ئەندازەی ئەوەی نوێژی کرد، پاشان هەڵسا لە خەو، یەکەم جار چی کرد بەو شێوەیە دووبارەی کردەوە، ئەوەیشی فەرموو کە پێشتر فەرموو بووی، پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار پێش بەرەبەیان ئەوەی دووبارە کردەوە.

## بابەت: باسی شەونوێژی پێغەمبەر ﷺ

**١٦٢٧-** «عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: مَا كُنَّا نَشَاءُ أَنْ نَرَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي اللَّيْلِ مُصَلِّياً إِلَّا رَأَيْنَاهُ، وَلَا نَشَاءُ أَنْ نَرَاهُ نَائِماً إِلَّا رَأَيْنَاهُ»[١].

واتە: ئەنەس رضي الله عنه دەڵێ: ئێمە هەر کاتێک بمانویستایە پێغەمبەری خوا ﷺ ببینین شەونوێژ بکات دەمانبینی، هەرکاتێکیش بمانویستایە ببینین خەوتووە دەمانبینی. (واتە: نوێژو خەوی پێغەمبەر ﷺ کاتێکی دیاری کراوی نەبوو، بەڵکو لە هەموو کاتەکان بە جیاوازی دەیکرد، ئەگەر هەندێ جار لە کاتێکدا نوێژی کردبێ، ئەوە جارەکەی تر تیایدا خەوتووە) .

**١٦٢٨-** «عَنْ يَعْلَى بْنَ مَمْلَكٍ، أَنَّهُ سَأَلَ أُمَّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّي الْعَتَمَةَ، ثُمَّ يُسَبِّحُ، ثُمَّ يُصَلِّي بَعْدَهَا مَا شَاءَ اللَّهُ مِنَ اللَّيْلِ، ثُمَّ يَنْصَرِفُ فَيَرْقُدُ مِثْلَ مَا صَلَّى، ثُمَّ يَسْتَيْقِظُ مِنْ نَوْمِهِ ذَلِكَ فَيُصَلِّي مِثْلَ مَا نَامَ، وَصَلَاتُهُ تِلْكَ الْآخِرَةُ تَكُونُ إِلَى الصُّبْحِ»[٢].

واتە: یەعلای کوڕی مەملەک هەواڵیداوە، پرسیاری لە ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) کرد: دەربارەی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ وتی: پێغەمبەر ﷺ نوێژی

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٤١ و ١٩٧٢ و ١٩٧٣، والترمذي: ٧٦٩.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٤٦٦، والترمذي: ٢٩٢٣.

عیشای دەکرد، پاشان تەسبیحاتی دەکرد، پاشان دوای ئەوە نوێژی دەکرد، ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بووایە لە شەو، پاشان لێدەبوویەوەو دەخەوت بە ئەندازەی ئەوەی نوێژی کردوە، پاشان لە خەو هەڵدەستاو شەونوێژی دەکرد بە ئەندازەی ئەوەی خەوتبوو، کۆتا نوێژیشی تا بەیانی بوو.

**١٦٢٩-** «عَنْ يَعْلَى بْنِ مَمْلَكٍ، أَنَّهُ سَأَلَ أُمَّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ عَنْ قِرَاءَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَعَنْ صَلَاتِهِ، فَقَالَتْ: مَا لَكُمْ وَصَلَاتَهُ؟ كَانَ يُصَلِّي ثُمَّ يَنَامُ قَدْرَ مَا صَلَّى، ثُمَّ يُصَلِّي قَدْرَ مَا نَامَ، ثُمَّ يَنَامُ قَدْرَ مَا صَلَّى حَتَّى يُصْبِحَ، ثُمَّ نَعَتَتْ لَهُ قِرَاءَتَهُ، فَإِذَا هِيَ تَنْعَتُ قِرَاءَةً مُفَسَّرَةً حَرْفاً حَرْفاً»[1].

واتە: یەعلای کوڕی مەملەک دەگێڕێتەوە: ئەو پرسیاری کرد لە ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی قورئان خوێندنی پێغەمبەری خوا ﷺو نوێژ کردنی؟ وتی: ئێوە لە کوێ و نوێژی پێغەمبەر ﷺ لە کوێ؟ ئەو شەونوێژی دەکردو، پاشان دەخەوت بە ئەندازەی ئەوەی نوێژی کردبوو، پاشان شەونوێژی دەکرد بە ئەندازەی ئەوەی خەوتبوو، پاشان دەخەوت بە ئەندازەی شەونوێژەکەی تا بەیانی، پاشان وەسفی قورئان خوێندنەکەی کرد خوێندیەوە بە شێوەیەکی تەفسیر کراو پیت بە پیت.

## باسی شەونوێژی پێغەمبەر داوود (علیه السلام)

**١٦٣٠-** «عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللَّهِ ﷻ صِيَامُ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ، كَانَ يَصُومُ يَوْماً وَيُفْطِرُ يَوْماً، وَأَحَبُّ الصَّلَاةِ إِلَى اللَّهِ صَلَاةُ دَاوُدَ كَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ، وَيَقُومُ ثُلُثَهُ، وَيَنَامُ سُدُسَهُ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: خۆشەویسترین ڕۆژوو لە لای خوا ﷻ ڕۆژووی داوود بوو (علیه السلام)، ڕۆژێک ڕۆژووی دەگرت و ڕۆژێک نەیدەگرت، خۆشەویسترین نوێژیش لە لای خوا نوێژی داوودە دەخەوت تا نیوەی شەو (کە دەکاتە سێ بەش لە شەش بەش)، پاشان

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٣١ و ٣٤٢٠، ومسلم: ١٨٩ و ١١٥٩/١٩٠، وأبو داود: ٢٤٤٨، وإبن ماجه: ١٧١٢.

**سێیەکی شەوی زیندوو دەکردەوە بە شەونوێژ کە دەکاتە (دوو بەش لە شەش بەش)، شەش یەکیشی دەخەوت (دووبارە).**

## باسی شەونوێژی پێغەمبەر موسا (علیه السلام)

**١٦٣١-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي عَلَى مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ عِنْدَ الْكَثِيبِ الْأَحْمَرِ، وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي قَبْرِهِ»[١].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو شەوەی شەوڕۆییم پێکرا، هاتم بۆ لای موسا لەلای تەپۆلکە سورەکە، ئەو وەستابوو لە ناو گۆڕەکەی شەونوێژی دەکرد.**

**١٦٣٢-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ عَلَى مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ عِنْدَ الْكَثِيبِ الْأَحْمَرِ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هاتم بۆ لای موسا (علیه السلام) لە لای تەپۆڵکە سورەکە، بە پێوە شەونوێژی دەکرد.**

**١٦٣٣-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَرَرْتُ عَلَى قَبْرِ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ وَهُوَ يُصَلِّي فِي قَبْرِهِ»[٣].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تێپەڕیم بەلای گۆڕی موسا (علیه السلام) لە ناو گۆڕەکەیدا نوێژی دەکرد.**

**١٦٣٤-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَرَرْتُ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي عَلَى مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ وَهُوَ يُصَلِّي فِي قَبْرِهِ»[٤].

**واتە: : ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو شەوەی شەوڕۆییم پێکرا، تێپەڕیم بە لای موسادا لە ناو گۆڕەکەی شەونوێژی دەکرد.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٤ و ١٦٥ و ٢٣٧٥.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٣٧٥.




**١٦٣٥-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ مَرَّ عَلَى مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ وَهُوَ يُصَلِّي فِي قَبْرِهِ»[1].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ ئەو شەوەی شەوڕۆیی پێکرا، تێپەڕی بە لای موسادا لە ناو گۆڕەکەی شەونوێژی دەکرد.**

**١٦٣٦-** «عَن أَنَسٍ ﷺ يَقُولُ: أَخْبَرَنِي بَعْضُ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ مَرَّ عَلَى مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ وَهُوَ يُصَلِّي فِي قَبْرِهِ»[2].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێیان ڕاگەیاندم، پێغەمبەر ﷺ ئەو شەوەی شەوڕۆیی پێکرا، تێپەڕ بوو بەلای موسادا لە ناو گۆڕەکەی شەونوێژی دەکرد.**

**١٦٣٧-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي مَرَرْتُ عَلَى مُوسَى وَهُوَ يُصَلِّي فِي قَبْرِهِ»[3].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: لە هەندێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو شەوەی شەوڕۆییم پێکرا، تێپەڕیم بە لای موسادا لە ناو گۆڕەکەی نوێژی دەکرد.**

## بابەت: زیندوو کردنەوەی شەو بە پەرستش

**١٦٣٨-** «عَنْ خَبَّابِ بْنِ الْأَرَتِّ ﷺ، وَكَانَ قَدْ شَهِدَ بَدْراً مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ رَاقَبَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اللَّيْلَةَ كُلَّهَا حَتَّى كَانَ مَعَ الْفَجْرِ، فَلَمَّا سَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ صَلَاتِهِ جَاءَهُ خَبَّابٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، لَقَدْ صَلَّيْتَ اللَّيْلَةَ صَلَاةً مَا رَأَيْتُكَ صَلَّيْتَ نَحْوَهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَجَلْ، إِنَّهَا صَلَاةُ رَغَبٍ وَرَهَبٍ سَأَلْتُ رَبِّي ﷻ فِيهَا ثَلَاثَ خِصَالٍ، فَأَعْطَانِي اثْنَتَيْنِ وَمَنَعَنِي وَاحِدَةً، سَأَلْتُ رَبِّي ﷻ أَنْ لَا يُهْلِكَنَا بِمَا أَهْلَكَ بِهِ الْأُمَمَ قَبْلَنَا، فَأَعْطَانِيهَا، وَسَأَلْتُ رَبِّي ﷻ أَنْ لَا يُظْهِرَ عَلَيْنَا عَدُوّاً مِنْ غَيْرِنَا، فَأَعْطَانِيهَا، وَسَأَلْتُ رَبِّي أَنْ لَا يَلْبِسَنَا شِيَعاً، فَمَنَعَنِيهَا»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٣٧٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢١٧٥.

واتە: خەبابی کوڕی ئەرەت ﷺ دەگێڕێتەوە: کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداری بەدری کردبوو، بە درێژایی ئەو شەوە چاودێری پێغەمبەری خوای کرد تا نوێژ بەیانی تەواو بوو، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی دایەوە لە نوێژەکەی خەباب هات بۆ لای، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، دایک و باوکم بە قوربانت بن، ئەم شەو نوێژێکت کرد نەمبینیوە نوێژی لەو جۆرەت کردبێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئەوە نوێژی ئومێد بوو بە وەرگرتنی نزاکەم و ترسانیش بوو لەوەی ڕەت بکرێتەوە، تیایدا داوای سێ شتم کرد لە پەروەردگارم ﷻ، دوو دانەی پێبەخشیم و ڕێگری لێکردم لە یەکێکیان، داوام کرد لە پەروەردگارم ﷻ لە ناومان نەبات وەکو چۆن ئوممەتەکانی پێشووی لە ناوبرد، ئەوەی پێبەخشیم، داوام کرد لە پەروەردگارم ﷻ لە غەیری خۆمان دوژمن زاڵ نەکات بەسەرماندا، ئەویشی پێبەخشیم، داوام کرد لە پەروەردگارم ﷻ بەش بەشمان نەکات، ئەوەی پێی نەبەخشیم.

## جیاوازی لەسەر عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)
## دەربارەی زیندووکردنەوەی شەو بە پەرستش

**١٦٣٩-** «عَنْ مَسْرُوقٍ، قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: كَانَ إِذَا دَخَلَتِ الْعَشْرُ أَحْيَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ اللَّيْلَ، وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ، وَشَدَّ الْمِئْزَرَ»(١).

واتە: مەسروق دەڵێ: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بچوایەتە ناو دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان، شەوەکەی زیندوو دەکردەوەو خانەوادەکەی هەڵدەستاندو دوور دەکەوتەوە لە خێزانەکانی.

**١٦٤٠-** «عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: أَتَيْتُ الْأَسْوَدَ بْنَ يَزِيدَ، وَكَانَ لِي أَخاً صَدِيقاً، فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَمْرٍو حَدِّثْنِي مَا حَدَّثَتْكَ بِهِ أُمُّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَتْ: كَانَ يَنَامُ أَوَّلَ اللَّيْلِ وَيُحْيِي آخِرَهُ»(٢).

واتە: ئەبو ئیسحاق دەڵێ: هاتم بۆ لای ئەسوەدی کوڕی یەزید، برایەکی ڕاستگۆو چاک بوو بۆم، وتم ئەی باوکی عەمر بۆم باس بکە دایکی ئیمانداران (خوا لێی ڕازی

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٢٤، ومسلم: ١١٧٤، وأبو داود: ١٣٧٦، وإبن ماجه: ١٧٦٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٤٦، ومسلم: ٧٣٩، وإبن ماجه: ١٣٦٥.




بێ) چی بۆت باس کرد دەربارەی شەونوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) وتی: پێغەمبەر ﷺ سەرەتای شەو دەخەوت و کۆتاییەکەشی زیندوو دەکردەوە بە پەرستش.

**١٦٤١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: لَا أَعْلَمُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَرَأَ الْقُرْآنَ كُلَّهُ فِي لَيْلَةٍ، وَلَا قَامَ لَيْلَةً حَتَّى الصَّبَاحَ، وَلَا صَامَ شَهْراً كَامِلاً قَطُّ غَيْرَ رَمَضَانَ»[1].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: نەمزانیوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوێکدا هەموو قورئانی خوێندبێت، وە نەمزانیوە شەوێک بە تەواوی هەڵسابێت تا بەیانی، وە نەمزانیوە مانگێک ڕۆژووی گرتبێ بە تەواوی جگە لە ڕەمەزان.**

**١٦٤٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا امْرَأَةٌ، فَقَالَ: مَنْ هَذِهِ؟ قَالَتْ: فُلَانَةُ، لَا تَنَامُ، فَذَكَرَتْ مِنْ صَلَاتِهَا، فَقَالَ: مَهْ عَلَيْكُمْ بِمَا تُطِيقُونَ، فَوَاللَّهِ لَا يَمَلُّ اللَّهُ ﷻ حَتَّى تَمَلُّوا، وَلَكِنَّ أَحَبَّ الدِّينِ إِلَيْهِ مَا دَاوَمَ عَلَيْهِ صَاحِبُهُ»[2].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لای، (لەو کاتەدا) ئافرەتێکی لەلا بوو، فەرمووی: ئەمە کێ یە؟ وتی: فڵانەکەسە، ناخەوێت، باسی نوێژەکەی بۆی کرد، فەرمووی: دەست هەڵگرە لە وەسف کردنی سەرقاڵ بن بەوەی لە تواناتان دایە، سوێند بە خوا، خوا ماندوو نابێت تا ئێوە ماندوو دەبن، بەڵام خۆشەویسترین پەرستش لەلای ئەوەیە: خاوەنەکەی لەسەری بەردەوام بێت.**

**١٦٤٣-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَرَأَى حَبْلاً مَمْدُوداً بَيْنَ سَارِيَتَيْنِ، فَقَالَ: مَا هَذَا الْحَبْلُ؟ فَقَالُوا: لِزَيْنَبَ تُصَلِّي، فَإِذَا فَتَرَتْ تَعَلَّقَتْ بِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: حُلُّوهُ، لِيُصَلِّ أَحَدُكُمْ نَشَاطَهُ فَإِذَا فَتَرَ فَلْيَقْعُدْ»[3].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە مزگەوتەوە حەبلێکی بینی درێژ کرا بوو لە نێوان دوو کۆڵەکەدا، فەرمووی: ئەم حەبلە چیە؟**

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٤٦، وأبو داود: ١٣٤٢، وإبن ماجه: ١٣٤٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٣ و ١١٥١ تعليقاً، ومسلم: ٧٨٥، وإبن ماجه: ٤٢٣٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٥٠، ومسلم: ٧٨٤، وأبو داود: ١٣١٢، وإبن ماجه: ١٣٧١.

وتیان: ئەوە هی زەینەبە نوێژ دەكات، كاتێ ماندوو دەبێ دەستی پێوە دەگرێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بیكەنەوە، با یەكێك لە ئێوە بە ئەندازەی چالاكبوون و توانای خۆی نوێژ بكات، كاتێ ماندوو بوو با دابنیشێ.

**١٦٤٤-** «عَنِ الْمُغِيرَةَ بْنَ شُعْبَةَ ﷺ يَقُولُ: قَامَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى تَوَرَّمَتْ قَدَمَاهُ، فَقِيلَ لَهُ: قَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ قَالَ: أَفَلَا أَكُونُ عَبْداً شَكُوراً»(١).

**واتە:** موغیرەی كوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەڵسا بۆ شەونوێژ تا پێیەكانی ئاوسان، پێی وترا: خوا لە گوناهەكانی ڕابردوو و داهاتووت خۆش بووە (بۆ ئاوا خۆت ئەزیەت دەدەی) ئەویش فەرمووی: ئایا نابێ بەندەیەكی سوپاسگوزار بم.

**١٦٤٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي حَتَّى تَزْلَعَ «يَعْنِي تَشَقَّقُ» قَدَمَاهُ»(٢).

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەكرد تا قاچەكانی قڵیش دەبوو.

## كاتێ (نوێژخوێن) دەستی كرد بە نوێژ كردن بە پێوە چی دەكات و، باسی جیاوازی گێڕەرەوەكان لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ)

**١٦٤٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي لَيْلاً طَوِيلاً، فَإِذَا صَلَّى قَائِماً رَكَعَ قَائِماً، وَإِذَا صَلَّى قَاعِداً رَكَعَ قَاعِداً»(٣).

**واتە:** عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە درێژایی شەو نوێژی دەكرد، كاتێ بە پێوە نوێژی بكردایە بە پێوە ڕكوعی دەبرد، وە كاتێكیش بە دانیشتنەوە نوێژی بكردایە هەر بە دانیشتنەوە ڕكوعی دەبرد.

**١٦٤٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي قَائِماً وَقَاعِداً، فَإِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ قَائِماً رَكَعَ قَائِماً، وَإِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ قَاعِداً رَكَعَ قَاعِداً»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٣٠ و ٤٨٣٦ و ٦٤٧١، ومسلم: ٧٩ و ٢٨١٩/٨٠، والترمذي: ٤١٢، وإبن ماجه: ١٤١٩.

(٢) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٤٢٠.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٥ و ٧٣٠/١١٠، وأبو داود: ٩٥٥ و ١٢٥١، والترمذي: ٣٧٥ و ٤٣٦، وإبن ماجه: ١١٦٤ و ١٢٢٨.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٣٠.




**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێوە نوێژی دەکردو بە دانیشتنیشەوە، کاتێ بە پێوە نوێژی دەست پێ بکردایە ڕکوعی دەبرد، کاتێکیش بە دانیشتنەوە نوێژی دەست پێ بکردایە هەر بە دانیشتنەوە ڕکوعی دەبرد.**

**١٦٤٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي وَهُوَ جَالِسٌ فَيَقْرَأُ وَهُوَ جَالِسٌ، فَإِذَا بَقِيَ مِنْ قِرَاءَتِهِ قَدْرَ مَا يَكُونُ ثَلَاثِينَ أَوْ أَرْبَعِينَ آيَةً قَامَ فَقَرَأَ وَهُوَ قَائِمٌ، ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ يَفْعَلُ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ ذَلِكَ»(١).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ بە دانیشتنەوە نوێژی دەکرد، بە دانیشتنەوەش قورئانی دەخوێند، جا ئەگەر ئەندازەی سی، یان چل ئایەتی بمایە هەڵدەستا بە پێوە دەیخوێند، پاشان ڕکوعی دەبرد، پاشان سوژدەی دەبرد، پاشان لە ڕکاتی دووەمدا بەو شێوەیەی دەکرد.**

**١٦٤٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى جَالِسًا حَتَّى دَخَلَ فِي السِّنِّ، فَكَانَ يُصَلِّي وَهُوَ جَالِسٌ يَقْرَأُ، فَإِذَا غَبَرَ مِنَ السُّورَةِ ثَلَاثُونَ أَوْ أَرْبَعُونَ آيَةً، قَامَ فَقَرَأَ بِهَا ثُمَّ رَكَعَ»(٢).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: نەمبینیوە پێغەمبەری خوا ﷺ بە دانیشتنەوە نوێژ بکات تا کەوتە تەمەنەوە، ئەو کات بە دانیشتنەوە نوێژی دەکردو قورئانی دەخوێند، جا ئەگەر ئەندازەی سی، یان چل ئایەتی بمایە هەڵدەستا بە پێوە دەیخوێند، پاشان ڕکوعی دەبرد.**

**١٦٥٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ وَهُوَ قَاعِدٌ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ قَامَ قَدْرَ مَا يَقْرَأُ إِنْسَانٌ أَرْبَعِينَ آيَةً»(٣).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ (نوێژی دەکرد) بە دانیشتنەوە قورئانی دەخوێند، کاتێ بیویستایە ڕکوع بیات هەڵدەستا بە ئەندازەی ئەوەی پیاوێک چل ئایەت بخوێنێ.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١١٨ و ١١١٩، ومسلم: ٧٣١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١١٨ و ١١١٩ و ١١٤٨ و ٤٨٣٧، ومسلم: ١١١ و ٧٣١/١١٢، وأبو داود: ٩٥٣ و ٩٥٤، والترمذي: ٣٧٤، وإبن ماجه: ١٢٧.

(٣) صحيح.




**١٦٥١-** «عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ، قَالَ: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فَدَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَنْ أَنْتَ؟ قُلْتُ: أَنَا سَعْدُ بْنُ هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ، قَالَتْ: رَحِمَ اللَّهُ أَبَاكَ، قُلْتُ: أَخْبِرِينِي عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ وَكَانَ، قُلْتُ: أَجَلْ، قَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي بِاللَّيْلِ صَلَاةَ الْعِشَاءِ، ثُمَّ يَأْوِي إِلَى فِرَاشِهِ فَيَنَامُ، فَإِذَا كَانَ جَوْفُ اللَّيْلِ قَامَ إِلَى حَاجَتِهِ وَإِلَى طَهُورِهِ، فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَيُصَلِّي ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ يُخَيَّلُ إِلَيَّ أَنَّهُ يُسَوِّي بَيْنَهُنَّ فِي الْقِرَاءَةِ وَالرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ وَيُوتِرُ بِرَكْعَةٍ، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، ثُمَّ يَضَعُ جَنْبَهُ فَرُبَّمَا جَاءَ بِلَالٌ فَآذَنَهُ بِالصَّلَاةِ قَبْلَ أَنْ يُغْفِيَ، وَرُبَّمَا يُغْفِي، وَرُبَّمَا شَكَكْتُ أَغْفَى أَوْ لَمْ يُغْفِ حَتَّى يُؤْذِنَهُ بِالصَّلَاةِ، فَكَانَتْ تِلْكَ صَلَاةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَتَّى أَسَنَّ وَلُحِمَ، فَذَكَرَتْ مِنْ لَحْمِهِ مَا شَاءَ اللَّهُ، قَالَتْ: وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي بِالنَّاسِ الْعِشَاءَ، ثُمَّ يَأْوِي إِلَى فِرَاشِهِ، فَإِذَا كَانَ جَوْفُ اللَّيْلِ قَامَ إِلَى طَهُورِهِ وَإِلَى حَاجَتِهِ، فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ يَدْخُلُ الْمَسْجِدَ فَيُصَلِّي سِتَّ رَكَعَاتٍ يُخَيَّلُ إِلَيَّ أَنَّهُ يُسَوِّي بَيْنَهُنَّ فِي الْقِرَاءَةِ وَالرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ، ثُمَّ يُوتِرُ بِرَكْعَةٍ، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، ثُمَّ يَضَعُ جَنْبَهُ وَرُبَّمَا جَاءَ بِلَالٌ فَآذَنَهُ بِالصَّلَاةِ قَبْلَ أَنْ يُغْفِيَ، وَرُبَّمَا أَغْفَى، وَرُبَّمَا شَكَكْتُ أَغْفَى أَمْ لَا؟ حَتَّى يُؤْذِنَهُ بِالصَّلَاةِ، قَالَتْ: فَمَا زَالَتْ تِلْكَ صَلَاةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[(١)].

**واته: سەعدی كوڕی هیشامی كوڕی عامر، دەڵێ: هاتم بۆ مەدینە، پاشان ڕۆیشتم بۆ لای عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، وتی: تۆ كێی؟ وتم: من سەعدی كوڕی هیشامی كوڕی عامرم، وتی: ڕەحمەتی خوا لە باوكت، وتم: هەواڵم بدەرێ دەربارەی نوێژی پێغەمبەری خوا، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاواو ئاوا نوێژی دەكرد، وتم: بەڵێ، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەودا نوێژی عیشای دەكرد، پاشان دەچوو بۆ سەر جێگاكەی دەخەوت، كاتێ نیوەی شەو بهاتایە هەڵدەستاو دەچوو بۆ سەرئاو كردن، پاشان دەستنوێژی دەگرت، پاشان دەچووە مزگەوتەوە هەشت ڕكات نوێژی دەكرد، پێم وابوو یەكسانی دەكرد لە نێوان خوێندن و ڕكوع و سوژدەكانیدا، هەروەها یەك ڕكات نوێژی وتریشی دەكرد، پاشان بە دانیشتنەوە دوو ڕكاتی دەكرد، پاشان بە لا تەنیشتیدا پاڵ دەكەوت، ئینجا بیلال دەهات ئاگاداری دەكردەوە بۆ نوێژی بەیانی پێش ئەوەی خەوی لێ بكەتایەو بێ ئاگا بووایە، كەم جارێكیش بێ ئاگا دەبوو، گومانم هەیە منیش ئایا بێ ئاگا بووە یان نا، تا ئاگاداری دەكردەوە بۆ نوێژ كردن، نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیە بوو، تا كەوتە تەمەنەوەو گۆشتی گرت، جا**

---

(١) صحيح.

دەربارەی گۆشت گرتنی تا خوا ویستی لەسەر بێ باسی کرد، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عیشای بۆ خەڵکی دەکرد، پاشان دەچوو بۆ سەر جێگاکەی دەخەوت، کاتێ نیوەی شەو بهاتایە هەڵدەستاو دەچوو بۆ سەرئاو کردن، پاشان دەستنوێژی دەگرت، پاشان دەچووە مزگەوتەوە شەش ڕکات نوێژی دەکرد، پێم وابوو یەکسانی دەکرد لە نێوان خوێندن و ڕکوع و سوژدەکانیدا، هەروەها یەک ڕکات نوێژی وتریشی دەکرد، پاشان بە دانیشتنەوە دوو ڕکاتی دەکرد، پاشان بە لا تەنیشتیدا پاڵ دەکەوت، ئینجا بیلال دەهات ئاگاداری دەکردەوە بۆ نوێژی بەیانی پێش ئەوەی خەوی لێ بکەوێ و بێ ئاگا ببێ، کەم جارێکیش بێ ئاگا دەبوو، گومانم هەیە منیش ئایا بێ ئاگا بووە، یان نا؟ هەتا ئاگاداری دەکردەوە بە نوێژ کردن، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەو شێوەیە بوو.

## بابەت: نوێژی سوننەت بە دانیشتنەوە

**١٦٥٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَمْتَنِعُ مِنْ وَجْهِي وَهُوَ صَائِمٌ، وَمَا مَاتَ حَتَّى كَانَ أَكْثَرُ صَلَاتِهِ قَاعِداً، «ثُمَّ ذَكَرَتْ كَلِمَةً مَعْنَاهَا» إِلَّا الْمَكْتُوبَةَ، وَكَانَ أَحَبُّ الْعَمَلِ إِلَيْهِ مَا دَامَ عَلَيْهِ الْإِنْسَانُ وَإِنْ كَانَ يَسِيراً»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ڕۆژوو ڕێگری لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەکرد لە ماچکردنم، وە نەمرد تا زۆربەی نوێژەکانی بە دانیشتنەوە بوو،«پاشان باسی وشەیەکی کرد مانای ئەوە بوو» جگە لە نوێژی فەرز نەبێت، وە خۆشەویستترین کردەوە لەلای ئەوە بوو مرۆڤ لەسەری بەردەوام بێت ئەگەرچی کەمیش بێت.

**١٦٥٣-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَا قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى كَانَ أَكْثَرُ صَلَاتِهِ جَالِساً إِلَّا الْمَكْتُوبَةَ»[٢].

واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی نەکرد تا زۆربەی نوێژەکانی بە دانیشتنەوە بوو جگە لە نوێژە فەرزەکان.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح لغيره.

**١٦٥٤-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَا مَاتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى كَانَ أَكْثَرُ صَلَاتِهِ قَاعِداً إِلَّا الْفَرِيضَةَ، وَكَانَ أَحَبُّ الْعَمَلِ إِلَيْهِ أَدْوَمَهُ وَإِنْ قَلَّ»(١).

**واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەمرد تا زۆربەی نوێژەکانی بە دانیشتنەوە بوو جگە لە نوێژە فەڕزەکان، وە خۆشەویستترین کردەوە بەلایەوە بەردەوام بوونی بوو لەسەری ئەگەرچی کەمیش بووایە.**

**١٦٥٥-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، مَا مَاتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى كَانَ أَكْثَرُ صَلَاتِهِ قَاعِداً إِلَّا الْمَكْتُوبَةَ، وَكَانَ أَحَبُّ الْعَمَلِ إِلَيْهِ مَا دَاوَمَ عَلَيْهِ وَإِنْ قَلَّ»(٢).

**واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بە دەستە، پێغەمبەری خوا ﷺ نەمرد تا زۆربەی نوێژەکانی بە دانیشتنەوە بوو، جگە لە نوێژە فەڕزەکان، وە خۆشەویستترین کردەوە بەلایەوە بەردەوام بوونی بوو لەسەری ئەگەرچی کەمیش بووایە.**

**١٦٥٦-** «عَن عَائِشَة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قالَت: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَمُتْ حَتَّى كَانَ يُصَلِّي كَثِيراً مِنْ صَلَاتِهِ وَهُوَ جَالِسٌ»(٣).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەمرد تا زۆربەی نوێژەکانی بە دانیشتنەوە دەکردن.**

**١٦٥٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ، قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: هَلْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي وَهُوَ قَاعِدٌ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، بَعْدَ مَا حَطَمَهُ النَّاسُ»(٤).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق دەڵێ: بە عائیشەم (خوا لێی ڕازی بێ) وت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد بە دانیشتنەوە؟ وتی: بەڵێ، دواى ئەوەی خەڵک پیریان کرد.**

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٢٢٥ و ٤٢٣٧.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٣٢/١١٦.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٣٢/١١٥، وأبو داود: ٩٥٦.

**١٦٥٨-** «عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى فِي سُبْحَتِهِ قَاعِداً قَطُّ حَتَّى كَانَ قَبْلَ وَفَاتِهِ بِعَامٍ، فَكَانَ يُصَلِّي قَاعِداً يَقْرَأُ بِالسُّورَةِ فَيُرَتِّلُهَا حَتَّى تَكُونَ أَطْوَلَ مِنْ أَطْوَلَ مِنْهَا»[1].

**واتە: حەفصە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: هەرگیز پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیبوو لە چێشتەنگاودا بە دانیشتنەوە نوێژ بکات، تا یەک ساڵ پێش مردنی، بە دانیشتنەوە نوێژی دەکرد، درێژترین سوورەتی دەخوێند بە لەسەرخۆیی.**

## بابەت: گەورەیی (پاداشتی) ئەو کەسە نوێژ بە پێوە دەکات لەسەر ئەو کەسەی بە دانیشتن دەیکات

**١٦٥٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي جَالِساً، فَقُلْتُ: حُدِّثْتُ أَنَّكَ قُلْتَ: إِنَّ صَلَاةَ الْقَاعِدِ عَلَى النِّصْفِ مِنْ صَلَاةِ الْقَائِمِ، وَأَنْتَ تُصَلِّي قَاعِداً، قَالَ: أَجَلْ، وَلَكِنِّي لَسْتُ كَأَحَدٍ مِنْكُمْ»[2].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی بە دانیشتنەوە نوێژی کرد، وتم: بۆم باس کرا تۆ فەرمووتە: نوێژ بە دانیشتنەوە (پاداشتەکەی) بە ئەندازەی نیوەی نوێژێکە بە پێوە ئەنجام بدرێ، تۆش بە دانیشتنەوە نوێژ دەکەی، فەرمووی: بەڵێ، بەڵام من وەکو هیچ یەکێک لە ئێوە نیم.**

## فەزڵ و گەورەیی نوێژ کردن بە دانیشتنەوە لەسەر نوێژ کردن بە پاڵکەوتنەوە

**١٦٦٠-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ رضي الله عنه قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الَّذِي يُصَلِّي قَاعِداً، قَالَ: مَنْ صَلَّى قَائِماً فَهُوَ أَفْضَلُ، وَمَنْ صَلَّى قَاعِداً فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَائِمِ، وَمَنْ صَلَّى نَائِماً فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَاعِدِ»[3].

**واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین رضي الله عنه دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی نوێژ بە دانیشتنەوە دەکات، فەرمووی: هەر کەس نوێژ بە پێوە بکات**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٣٣، والترمذي: ٣٧٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٣٥/١٢٠، وأبو داود: ٩٥٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١١١٥ و ١١١٦ و ١١١٧، وأبو داود: ٩٥١، والترمذي: ٣٧١، وإبن ماجه: ١٢٣١.

ئەوە چاکترە، هەر کەسیش نوێژ بە دانیشتنەوە بکات ئەوە نیوەی پاداشتی ئەو کەسەی بۆ هەیە بە پێوە نوێژ دەکات، هەرکەسیش نوێژ بە خەوتنەوە بکات ئەوە نیوەی پاداشتی ئەو کەسەی بۆ هەیە بە دانیشتنەوە نوێژ دەکات.

## بابەت: چۆنیەتی نوێژ کردن بە دانیشتنەوە

**١٦٦١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي مُتَرَبِّعاً»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی نوێژی دەکرد بە چوارمشقی دانیشتبوو، قاچەکانی دەخستە ژێر ڕانی بە پێچەوانەی یەکتر.

## بابەت: چۆنیەتی قورئان خوێندن لە شەونوێژدا

**١٦٦٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَيْسٍ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، كَيْفَ كَانَتْ قِرَاءَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِاللَّيْلِ يَجْهَرُ أَمْ يُسِرُّ؟ قَالَتْ: كُلُّ ذَلِكَ قَدْ كَانَ يَفْعَلُ رُبَّمَا جَهَرَ، وَرُبَّمَا أَسَرَّ»[٢].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی ئەبو قەیس دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەونوێژدا قورئانی چۆن دەخوێند بە دەنگی بەرز دەیخوێند، یان بە نزم؟ وتی: هەردووکی دەکرد کەم جارێک بە دەنگی بەرز دەیخوێند، کەم جارێکیش بە دەنگی نزم.

## فەزڵ و گەورەیی قورئان خوێندن بە دەنگی نزم بەسەر دەنگی بەرز

**١٦٦٣-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ الَّذِي يَجْهَرُ بِالْقُرْآنِ كَالَّذِي يَجْهَرُ بِالصَّدَقَةِ، وَالَّذِي يُسِرُّ بِالْقُرْآنِ كَالَّذِي يُسِرُّ بِالصَّدَقَةِ»[٣].

واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ئەو کەسەی بە دەنگی بەرز قورئان دەخوێنێ وەکو ئەوە وایە بە ئاشکرا

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٣٣٣، والترمذي: ٢٩١٩.





ببەخشێ و چاکە بکات، وە ئەو کەسەش کە بە دەنگی نزم قورئان دەخوێنێ وەکو ئەوە وایە بە نهێنی ببەخشێ و چاکە بکات.

## بابەت: یەکسان کردنی وەستانی و ڕکوع و دوای ڕکوع و سوژدەو دانیشتنی نێوان سوژدەکان لە شەونوێژ

**١٦٦٤-** «عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ لَيْلَةً فَافْتَتَحَ الْبَقَرَةَ، فَقُلْتُ: يَرْكَعُ عِنْدَ الْمِائَةِ، فَمَضَى، فَقُلْتُ: يَرْكَعُ عِنْدَ الْمِائَتَيْنِ، فَمَضَى، فَقُلْتُ: يُصَلِّي بِهَا فِي رَكْعَةٍ، فَمَضَى، فَافْتَتَحَ النِّسَاءَ، فَقَرَأَهَا، ثُمَّ افْتَتَحَ آلَ عِمْرَانَ فَقَرَأَهَا، يَقْرَأُ مُتَرَسِّلاً إِذَا مَرَّ بِآيَةٍ فِيهَا تَسْبِيحٌ سَبَّحَ، وَإِذَا مَرَّ بِسُؤَالٍ سَأَلَ، وَإِذَا مَرَّ بِتَعَوُّذٍ تَعَوَّذَ، ثُمَّ رَكَعَ، فَقَالَ: سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ، فَكَانَ رُكُوعُهُ نَحْواً مِنْ قِيَامِهِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ» فَكَانَ قِيَامُهُ قَرِيباً مِنْ رُكُوعِهِ، ثُمَّ سَجَدَ فَجَعَلَ يَقُولُ: سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى، فَكَانَ سُجُودُهُ قَرِيباً مِنْ رُكُوعِهِ»[1].

**واتە:** حوزەیفە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژم کرد بە سوورەتی بەقەرە دەستی پێکرد، وتم: لە سەد ئایەت ڕکوع دەبات، ڕکوعی نەبرد هەر بەردەوام بوو، وتم: لە دوو سەد ئایەت ڕکوع دەبات، هەر بەردەوام بوو، وتم: تەواوی دەکات لە یەک ڕکاتدا، هەر بەردەوام بوو، ئینجا سوورەتی نیسائیشی خوێند، پاشان ئالی عیمرانی خوێند، لەسەرخۆ دەیخوێند، کاتێ بەسەر ئایەتێکدا تێپەڕ ببووایە تەسبیحی تێدا بووایە (سبحان الله)ی دەکرد، کاتێکیش تێپەڕببووایە بەسەر ئایەتێک پاڕانەوە بووایە داوای دەکرد، وە کاتێک تێپەڕ ببووایە بەسەر ئایەتی پەنا گرتن پەنای دەگرت، پاشان ڕکوعی برد، فەرمووی: پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگاری مەزن، جا ڕکوعەکەی بە ئەندازەی وەستانەکەی بوو، پاشان سەری بەرز کردەوە، فەرمووی: خوا ستایشی ئەو کەسە دەبیستێ و وەردەگرێت، کە ستایشی کردوە، جا وەستانی نزیک بوو لە ڕکوعەکەی، پاشان سوژدەی بردو دەیفەرموو: پاک و بێگەردی بۆ پەروەردگاری بەرز، جا سوژدەکەی نزیک بوو لە ڕکوعەکەی.

**١٦٦٥-** «عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ أَنَّهُ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي رَمَضَانَ فَرَكَعَ فَقَالَ فِي رُكُوعِهِ: سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ مِثْلَ مَا كَانَ قَائِماً، ثُمَّ جَلَسَ يَقُولُ: رَبِّ اغْفِرْ لِي، رَبِّ اغْفِرْ لِي مِثْلَ مَا كَانَ

---

(١) صحيح.




قَائِماً، ثُمَّ سَجَدَ فَقَالَ: سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى مِثْلَ مَا كَانَ قَائِماً، فَمَا صَلَّى إِلَّا أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، حَتَّى جَاءَ بِلَالٌ إِلَى الْغَدَاةِ»[١].

**واتە: حوزەیفە ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو نوێژی كرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕەمەزاندا، ڕكوعی بردو لە ڕكوعەكەیدا فەرمووی: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ) واتە: پاكی و بێگەردی بۆ پەروەردگاری مەزنم، بە ئەندازەی وەستانەكەی مایەوە، پاشان دانیشت و دەیفەرموو: خوایە لێم خۆشبە خوایە لێم خۆشبە، بە ئەندازەی وەستانەكەی مایەوە، پاشان سوژدەی برد، فەرمووی: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ) پاكی و بێگەردی بۆ پەروەردگاری بەرزم، بە ئەندازەی وەستانەكەی مایەوە، ئیتر نوێژی نەكرد ئەو چوار ڕكاتە نەبێت، تا بیلال هات ئاگاداری كردەوە بۆ نوێژی بەیانی.**

## بابەت: شەونوێژ چۆنە؟

**١٦٦٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: صَلَاةُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مَثْنَى مَثْنَى»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژی (سوننەت) لە شەوو لە ڕۆژ دوو ڕكات دوو ڕكاتە.**

**١٦٦٧-** «عَنْ طَاوُسٍ، قَالَ: قَالَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: سَأَلَ رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَلَاةِ اللَّيْلِ، فَقَالَ: مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خَشِيتَ الصُّبْحَ فَوَاحِدَةٌ»[٣].

**واتە: طاوس دەڵێ: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد دەربارەی شەونوێژ، فەرمووی: دوو ڕكات دوو ڕكاتە، ئەگەر ترسای لە دەرچوونی بەرە بەیان ئەوە یەك ڕكاتی ویتر بكە.**

**١٦٦٨-** «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خِفْتَ الصُّبْحَ فَأَوْتِرْ بِوَاحِدَةٍ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه وأبو داود: ١٢٩٥، والترمذي: ٥٩٧، وإبن ماجه: ١٣٢٢.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٤٩/١٤٦، وإبن ماجه: ١٣٢٠.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٣٧، ومسلم: ٧٤٩/١٤٤، وإبن ماجه: ١٣٢٠.





**واتە: سالم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، ئەگەر ترسای لەوەی نوێژی بەیانیت بەسەردا بێت ئەوە یەک ڕکاتی ویتر بکە.**

**١٦٦٩-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ يُسْأَلُ عَنْ صَلَاةِ اللَّيْلِ؟ فَقَالَ: مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خِفْتَ الصُّبْحَ فَأَوْتِرْ بِرَكْعَةٍ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لێ بوو پرسیار دەکرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەر مینبەر دەربارەی شەونوێژ؟ فەرمووی: شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، ئەگەر ترسای لەوەی نوێژی بەیانیت بە سەردا بێت ئەوە یەک ڕکاتی ویتر بکە.**

**١٦٧٠-** «عَن نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَخْبَرَهُمْ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَلَاةِ اللَّيْلِ، قَالَ: مَثْنَى مَثْنَى، فَإِنْ خَشِيَ أَحَدُكُمُ الصُّبْحَ فَلْيُوتِرْ بِوَاحِدَةٍ»[٢].

**واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) هەواڵی پێداون: پیاوێک پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی شەونوێژ، فەرمووی: شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، ئەگەر کەسێک لە ئێوە ترسا لەوەی نوێژی بەیانی بەسەردا بێت با یەک ڕکاتی ویتر بکات.**

**١٦٧١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خِفْتَ الصُّبْحَ فَأَوْتِرْ بِوَاحِدَةٍ»[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، ئەگەر ترسای لەوەی نوێژی بەیانیت بەسەردا بێت ئەوە یەک ڕکاتی ویتر بکە.**

**١٦٧٢-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَيْفَ صَلَاةُ اللَّيْلِ؟ فَقَالَ: صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خِفْتَ الصُّبْحَ فَأَوْتِرْ بِوَاحِدَةٍ»[٤].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح.**

**(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧٢ و ٤٧٣، ومسلم: ٧٤٩، وأبو داود: ١٣٢٦، والترمذي: ٤٣٧، وإبن ماجه: ١٣١٩.**

**(٤) صحيح.**

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک لە مسوڵمانان پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ شەونوێژ چۆنە؟ فەرمووی: شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، ئەگەر ترسای لەوەی نوێژی بەیانیت بەسەردا بێت ئەوە یەک ڕکاتی ویتر بکە.

**١٦٧٣-** «عنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَلَاةِ اللَّيْلِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خَشِيتَ الصُّبْحَ فَأَوْتِرْ بِوَاحِدَةٍ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی شەونوێژ، فەرمووی: شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، ئەگەر ترسای لەوەی نوێژی بەیانیت بەسەردا بێت ئەوە یەک ڕکاتی ویتر بکە.

**١٦٧٤-** «عَنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ صَلَاةُ اللَّيْلِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خِفْتَ الصُّبْحَ فَأَوْتِرْ بِوَاحِدَةٍ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک هەڵسا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا شەونوێژ چۆن دەکرێت؟ فەرمووی: شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، ئەگەر ترسای لەوەی نوێژی بەیانیت بەسەردا بێت ئەوە یەک ڕکاتی ویتر بکە.

## بابەت: فەرمان کردن بە نوێژی ویتر

**١٦٧٥-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: أَوْتَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ قَالَ: يَا أَهْلَ الْقُرْآنِ، أَوْتِرُوا، فَإِنَّ اللَّهَ ﷻ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ»[٣].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ویتری کرد، پاشان فەرمووی: ئەی ئەهلی قورئان نوێژی ویتر بکەن، چونکە خوا تاکەو تاکی خۆش دەوێت. (واتە: نوێژی ویتری خۆش دەوێ).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٤٩/١٤٧.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ١٤١٦، والترمذي: ٤٥٣ و ٤٥٤، وإبن ماجه: ١١٦٩.




**١٦٧٦-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: الْوِتْرُ لَيْسَ بِحَتْمٍ كَهَيْئَةِ الْمَكْتُوبَةِ، وَلَكِنَّهُ سُنَّةٌ سَنَّهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[١].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: نوێژی ویتر وەکو نوێژی فەرز، واجب نیە، بەڵکو سوننەتێکە پێغەمبەری خوا ﷺ کردوویەتی.**

## بابەت: هاندان و جەخت کردنەوە لەسەر نوێژی ویتر پێش خەوتن

**١٦٧٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي ﷺ بِثَلَاثٍ: النَّوْمِ عَلَى وِتْرٍ، وَصِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَرَكْعَتَيِ الضُّحَى»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: خۆشەویستم ﷺ وەسیەتی بۆ کردم بە سێ شت: خەوتن لە دوای ویتر، ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێک، وە دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاو.**

**١٦٧٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي ﷺ بِثَلَاثٍ: الْوِتْرِ أَوَّلَ اللَّيْلِ، وَرَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، وَصَوْمِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: خۆشەویستم ﷺ وەسیەتی بۆ کردم بە سێ شت: ویتر لە سەرەتای شەودا، وە دوو ڕکاتی نوێژی (سوننەتی) بەیانی، وە ڕۆژو گرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێک.**

## بابەت: نەهی کردنی پێغەمبەر ﷺ لە ئەنجامدانی دوو ویتر لە شەوێکدا

**١٦٧٩-** «عَنْ قَيْسِ بْنِ طَلْقٍ، قَالَ: زَارَنَا أَبِي طَلْقُ بْنُ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فِي يَوْمٍ مِنْ رَمَضَانَ، فَأَمْسَى بِنَا وَقَامَ بِنَا تِلْكَ اللَّيْلَةَ، وَأَوْتَرَ بِنَا، ثُمَّ انْحَدَرَ إِلَى مَسْجِدٍ فَصَلَّى بِأَصْحَابِهِ حَتَّى بَقِيَ الْوِتْرُ، ثُمَّ قَدَّمَ رَجُلاً فَقَالَ لَهُ: أَوْتِرْ بِهِمْ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا وِتْرَانِ فِي لَيْلَةٍ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٧٨ و ١٩٨١، ومسلم: ٧٢١، وأبو داود: ١٤٣٢، والترمذي: ٧٦٠.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤٣٩، والترمذي: ٤٧٠.




واتە: قەیسی کوڕی طەڵق دەڵێ: باوکم طەڵقی کوڕی عەلی (خوا لێیان ڕازی بێ) سەردانی کردین لە ڕۆژێک لە ناو مانگی ڕەمەزان، شەو لە لامان مایەوەو نوێژی بۆ کردین، هەروەها ویتریشی بۆ کردین، پاشان ڕۆیشت بۆ مزگەوت نوێژی بە هاوەڵەکانی کرد تا تەنها ویتر مابوویەوە، پاشان کەسێکی پێشخست پێی وت: ویتریان بۆ بکە، چونکە من بیستوومە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: دوو ویتر لە شەوێکدا ناکرێت.

## بابەت: کاتی ویتر کردن

**١٦٨٠-** «عَنْ الْأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: كَانَ يَنَامُ أَوَّلَ اللَّيْلِ ثُمَّ يَقُومُ، فَإِذَا كَانَ مِنَ السَّحَرِ أَوْتَرَ، ثُمَّ أَتَى فِرَاشَهُ، فَإِذَا كَانَ لَهُ حَاجَةٌ أَلَمَّ بِأَهْلِهِ، فَإِذَا سَمِعَ الْأَذَانَ وَثَبَ، فَإِنْ كَانَ جُنُباً أَفَاضَ عَلَيْهِ مِنَ الْمَاءِ، وَإِلَّا تَوَضَّأَ ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ»[١].

واتە: ئەسوەدی کوڕی یەزید ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەربارەی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: سەرەتای شەو دەخەوت و، پاشان هەڵدەسا، کاتێ کاتی پارشێو دەهات ویتری دەکرد، دواتر دەهاتە سەر جێگاکەی، ئەگەر پێویستیەکی هەبووایە دەچووە لای خێزانەکانی (بۆ جیماع) کاتێ گوێ لە بانگ بووایە پەلەی دەکرد، ئەگەر لەشگران بووایە ئاوی دەکرد بە خۆیدا، ئەگەرنا دەستنوێژی دەگرت و، پاشان دەچوو بۆ نوێژ.

**١٦٨١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أَوْتَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ أَوَّلِهِ وَآخِرِهِ وَأَوْسَطِهِ وَانْتَهَى وِتْرُهُ إِلَى السَّحَرِ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ویتری کردوە لە سەرەتای شەوو لە کۆتایی و لە نێوەڕاستی، ویترەکەی کۆتایی پێهێنا لە پارشێو.

**١٦٨٢-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: مَنْ صَلَّى مِنَ اللَّيْلِ فَلْيَجْعَلْ آخِرَ صَلَاتِهِ وِتْراً، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَأْمُرُ بِذَلِكَ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٦ و ٧٤٥/١٣٨، وأبو داود: ١٤٣٥، والترمذي: ٤٥٦، وإبن ماجه: ١١٨٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧٢ و ٩٩٨، ومسلم: ٧٥١/١٥١، وأبو داود: ١٤٣٨، والترمذي: ٤٦٩.

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: هەر كەس لە شەودا نوێژی كرد با كۆتا نوێژی ویتر بێت، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەوە دەكرد.

## بابەت: فەرمان كردن بە ویتر پێش نوێژی بەیانی

**١٦٨٣-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ يَقُولُ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْوِتْرِ، فَقَالَ: أَوْتِرُوا قَبْلَ الصُّبْحِ»[١].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پرسیار كرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ویتر، فەرمووی: ویتر بكەن پێش نوێژی بەیانی.**

**١٦٨٤-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أَوْتِرُوا قَبْلَ الْفَجْرِ»[٢].

**واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ویتر بكەن پێش نوێژی بەیانی.**

## ویتر لە دوای بانگی بەیانی

**١٦٨٥-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْتَشِرِ، أَنَّهُ كَانَ فِي مَسْجِدِ عَمْرِو بْنِ شُرَحْبِيلَ، فَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَجَعَلُوا يَنْتَظِرُونَهُ فَجَاءَ، فَقَالَ: إِنِّي كُنْتُ أُوتِرُ، قَالَ: وَسُئِلَ عَبْدُ اللَّهِ ﷺ، هَلْ بَعْدَ الْأَذَانِ وِتْرٌ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَبَعْدَ الْإِقَامَةِ، وَحَدَّثَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ نَامَ عَنِ الصَّلَاةِ حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ صَلَّى»[٣].

**واتە: موحەممەدی كوڕی مونتەشیر دەگێڕێتەوە: ئەو لە مزگەوتی عەمڕی كوڕی شورەحبیل بوو، قامەت بۆ نوێژ كرا، خەڵكەكە چاوەڕوانی ئەویان دەكرد، دواتر هات، وتی: ویترم دەكرد، وتی: پرسیار كرا لە عەبدوڵلا ﷺ، ئایا لە دوای بانگ (واتە: بانگی بەیانی) ویتر هەیە؟ وتی: بەڵێ، دوای قامەتیش، گێڕایەوە لە پێغەمبەر ﷺ كە ئەو خەوی لێكەوت لە نوێژی بەیانی تا خۆر هەڵهات، پاشان نوێژی كرد.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٤٥، والترمذي: ٤٦٨.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٠ و ٧٥٤/١٦١، والترمذي: ٤٦٨، وإبن ماجه: ١١٨٩.

(٣) صحيح الإسناد.





## بابەت: ویتر كردن لەسەر پشتی وڵاخ

**١٦٨٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُوتِرُ عَلَى الرَّاحِلَةِ»(١).

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ویتری كردوە لەسەر پشتی وڵاخ.**

**١٦٨٧-** «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، كَانَ يُوتِرُ عَلَى بَعِيرِهِ، وَيَذْكُرُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ»(٢).

**واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) ویتری لەسەر وشترەكەی دەكرد، وە باسی دەكرد پێغەمبەر ﷺ ئەوەی دەكرد.**

**١٦٨٨-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ يَسَارٍ، قَالَ: قَالَ لِي ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُوتِرُ عَلَى الْبَعِيرِ»(٣).

**واتە: سەعیدی كوڕی یەسار، دەڵێ: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) پێی وتم: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ ویتری دەكرد لەسەر وشتر.**

## بابەت: وتر چەند ڕكاتە؟

**١٦٨٩-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: الْوِتْرُ رَكْعَةٌ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ»(٤).

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ویتر ڕكاتێكە لە كۆتایی شەو.**

**١٦٩٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْوِتْرُ رَكْعَةٌ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ»(٥).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٨٨، ومسلم: ٧٤٩، والترمذي: ٤٣٧.

(٥) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٣ و ٧٥٢/١٥٤ و ٧٥٣، وإبن ماجه: ١١٧٥.

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ویتر ڕکاتێکە لە کۆتایی شەو.

**١٦٩١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَلَاةِ اللَّيْلِ، قَالَ: مَثْنَى مَثْنَى، وَالْوِتْرُ رَكْعَةٌ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێکی دەشتەکی پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی شەونوێژ، فەرمووی: دوو ڕکات دوو ڕکاتە، ویتریش ڕکاتێکە لە کۆتایی شەو.

## بابەت: چۆنیەتی ئەنجامدانی یەک ڕکاتی ویتر

**١٦٩٢-** «عَنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا أَرَدْتَ أَنْ تَنْصَرِفَ فَارْكَعْ بِوَاحِدَةٍ تُوتِرُ لَكَ مَا قَدْ صَلَّيْتَ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، کاتێ ویستت لێ ببیتەوەو تەواوی بکەی یەک ڕکات ویتر بکە دەبێتە تاکی ئەو نوێژەی کردووتە.

**١٦٩٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، وَالْوِتْرُ رَكْعَةٌ وَاحِدَةٌ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، ویتریش یەک ڕکاتە.

**١٦٩٤-** «عَنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَلَاةِ اللَّيْلِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خَشِيَ أَحَدُكُمُ الصُّبْحَ صَلَّى رَكْعَةً وَاحِدَةً تُوتِرُ لَهُ مَا قَدْ صَلَّى»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٤٩/١٤٨، وأبو داود: ١٤٢١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٩٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٩٠، ومسلم: ٧٤٩، وأبو داود: ١٣٢٦ و ١٤٢١، والترمذي: ٤٣٧.

(٤) صحيح.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پیاوێک پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی شەونوێژ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، ئەگەر یەکێک لە ئێوە ترسا لەوەی نوێژی بەیانی دابێت یەک ڕکات دەکات، دەبێتە تاکی ئەو نوێژەی کردوویەتی.

**١٦٩٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: صَلَاةُ اللَّيْلِ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، فَإِذَا خِفْتُمُ الصُّبْحَ فَأَوْتِرُوا بِوَاحِدَةٍ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەو گوێی لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، ئەگەر ترسان لەوەی نوێژی بەیانی دابێت یەک ڕکات نوێژی ویتر بکەن.

**١٦٩٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً يُوتِرُ مِنْهَا بِوَاحِدَةٍ، ثُمَّ يَضْطَجِعُ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ یازدە ڕکات شەونوێژی دەکرد، یەک ڕکاتی دەکردە تاکی ئەو نوێژانەی کردویەتی، پاشان پاڵ دەکەوت بەلای ڕاستیدا.

## بابەت: چۆنیەتی سێ ڕکاتی ویتر

**١٦٩٧-** «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: كَيْفَ كَانَتْ صَلَاةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي رَمَضَانَ؟ قَالَتْ: مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَزِيدُ فِي رَمَضَانَ وَلَا غَيْرِهِ عَلَى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُصَلِّي أَرْبَعاً فَلَا تَسْأَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي أَرْبَعاً فَلَا تَسْأَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي ثَلَاثاً، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتَنَامُ قَبْلَ أَنْ تُوتِرَ؟ قَالَ: يَا عَائِشَةُ، إِنَّ عَيْنِي تَنَامُ وَلَا يَنَامُ قَلْبِي»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح دون الاضطجاع بعد الوتر فإنه شاذ. أخرجه البخاري: ٩٩٤ و ١١٢٣، ومسلم: ٧٣٦، وأبو داود: ١٣٣٥ و ١٣٣٦ و ١٣٣٧، والترمذي: ٤٤٠ و ٤٤١، وإبن ماجه: ١١٧٧ و ١٣٥٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٤٧ و ٢٠١٣ و ٣٥٦٩، ومسلم: ٧٣٨/١٢٥، وأبو داود: ١٣٤١، والترمذي: ٤٣٩.




واتە: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان پرسیاری کرد لە عائیشە دایکی ئیمانداران (خوا لێی ڕازی بێ): نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بووە لە ڕەمەزاندا؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نە لە ڕەمەزان و غەیری ڕەمەزان یازدە ڕکات زیاتری نەدەکرد، چوار ڕکات نوێژی دەکرد، پرسیار مەکە لە جوانی و درێژکردنەوەیان، پاشان چوار ڕکات نوێژی تری دەکرد، پرسیار مەکە لە جوانی و درێژ کردنەوەیان، پاشان سێ ڕکات نوێژی دەکرد، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا تۆ دەخەوی پێش ئەوەی ویتر بکەی؟ فەرمووی: بێگومان من چاوەکانم دەخەون، بەڵام دڵم ناخەوێ.

**١٦٩٨-** «عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ، أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا حَدَّثَتْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ لَا يُسَلِّمُ فِي رَكْعَتَيِ الْوِتْرِ»[1].

واتە: سەعدی کوڕی هیشام دەگێڕێتەوە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، بۆی باس کردوە، پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی نەدەدایەوە لە دوو ڕکاتی ویتر. (تا ئەو کاتەی کۆتاییشی دەکرد، ئینجا لە ڕکاتی سێیەم و کۆتایی سەلامی دەدایەوە).

## باسی جیاوازی دەستەواژەی ئەوانەی فەرموودەکەیان لە ئوبەی کوڕی کەعب گێڕاوەتەوە لە نوێژی ویتر

**١٦٩٩-** «عَنْ زُبَيْدٍ عَنْ سَعِيدِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُوتِرُ بِثَلَاثِ رَكَعَاتٍ، كَانَ يَقْرَأُ فِي الْأُولَى بِـ: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ الأعلى، وَفِي الثَّانِيَةِ بِـ: ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝١﴾ الكافرون، وَفِي الثَّالِثَةِ بِـ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ الإخلاص، وَيَقْنُتُ قَبْلَ الرُّكُوعِ، فَإِذَا فَرَغَ، قَالَ عِنْدَ فَرَاغِهِ: سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ يُطِيلُ فِي آخِرِهِنَّ»[2].

واتە: زوبەید دەگێڕێتەوە: لە سەعیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزا لە باوکیەوە، لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە ﷺ کە وتوویەتی: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ سێ ڕکات ویتری دەکرد، لە ڕکاتی یەکەم: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ ی دەخوێند، لە ڕکاتی

(١) شاذ.

(٢) صحيح.




**دووەمیشدا: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ ﴾ی دەخوێند، لە ڕکاتی سێیەمیشدا: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾ی دەخوێند، پێش ڕکوع قنوتی دەخوێند، کاتێ تەواو دەبوو، لەو ڕکاتەی تەواوی کردبوو لە دوای سەلام دانەوە دەیفەرموو: (سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ) سێ جار، لە کۆتا جاردا درێژی دەکردەوەو بە دەنگی بەرز دەیفەرموو.**

**١٧٠٠-** «عَنْ قَتَادَةَ عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى مِنَ الْوِتْرِ بِـ ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١ ﴾الأعلى، وَفِي الثَّانِيَةِ بِـ ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ ﴾الكافرون، وَفِي الثَّالِثَةِ بِـ ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾الإخلاص»[1].

**واتە: قەتادە دەگێڕێتەوە: لە سەعیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزە لە باوکیەوە، لە ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ کە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕکاتی یەکەمی نوێژی ویتر: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١ ﴾ی دەخوێند، لە ڕکاتی دووەمیشدا: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ ﴾ی دەخوێند، لە ڕکاتی سێیەمیشدا: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾ی دەخوێند.**

**١٧٠١-** «عَنْ قَتَادَةَ عَنْ عَزْرَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى عَنْ أَبِيهِ عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْوِتْرِ بِـ ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١ ﴾الأعلى، وَفِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ بِـ ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ ﴾الكافرون، وَفِي الثَّالِثَةِ بِـ ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾الإخلاص، وَلَا يُسَلِّمُ إِلَّا فِي آخِرِهِنَّ، وَيَقُولُ «يَعْنِي بَعْدَ التَّسْلِيمِ»: سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ، ثَلَاثاً»[2].

**واتە: قەتادە دەگێڕێتەو: لە عەرزە، لە سەعیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزە لە باوکیەوە، لە ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ کە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕکاتی یەکەمدا لە نوێژی ویتر: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١ ﴾ ی دەخوێند، لە ڕکاتی دووەمیشدا: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ ﴾ی دەخوێند، لە ڕکاتی سێیەمیشدا: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾ ی دەخوێند، سەلامی نەدەدایەوە لە کۆتاییدا نەبێت، وە دەیفەرموو «واتە: لە دوای سەلامدانەوە»: (سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ) سێ جار.**

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١١٧١.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤٢٣ و ١٤٣٠، وإبن ماجه: ١١٧١ و ١١٨٢.



## باسی جیاوازی لەسەر ئەبو ئیسحاق لە فەرموودەی سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئیبنو عەبباس لە نوێژی ویتر

**١٧٠٢-** «عَنْ زَكَرِيَّا بْن أَبِي زَائِدَةَ عَنْ أَبِي إِسْحَاقٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُوتِرُ بِثَلَاثٍ، يَقْرَأُ فِي الْأُولَى بِـ ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ الأعلى، وَفِي الثَّانِيَةِ بِـ ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝١﴾ الكافرون، وَفِي الثَّالِثَةِ بِـ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ الإخلاص»[1].

**واتە:** زەکریای کوڕی ئەبو زائیدە دەگێڕێتەوە: لە ئەبو ئیسحاق لە سەعیدی کوڕی جوبەیر، لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ ڕکات ویتری دەکرد، لە ڕکاتی یەکەمدا: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ی دەخوێند، لە ڕکاتی دووەمیشدا: ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝١﴾ی دەخوێند، لە ڕکاتی سێیەمیشدا: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ی دەخوێند.

**١٧٠٣-** «عَنْ زُهَيْرٌ عَنْ أَبِي إِسْحَاقٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ كَانَ يُوتِرُ بِثَلَاثٍ: بِـ ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾، وَ ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝١﴾، وَ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ الإخلاص»[2].

**واتە:** زوهەیر دەگێڕێتەوە: لە ئەبو ئیسحاق، لە سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێغەمبەر ﷺ سێ ڕکات ویتری دەکرد بە: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾، وە ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝١﴾، وە ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾

## باسی جیاوازی لەسەر حەبیبی کوڕی ثابت لە فەرموودەی ئیبنو عەبباس لە نوێژی ویتر

**١٧٠٤-** «عَنِ سُفْيَانُ عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ» رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَامَ مِنَ اللَّيْلِ فَاسْتَنَّ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ نَامَ، ثُمَّ قَامَ فَاسْتَنَّ، ثُمَّ تَوَضَّأَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى صَلَّى سِتّاً، ثُمَّ أَوْتَرَ بِثَلَاثٍ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٤٦٢، وإبن ماجه: ١١٧٢.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٦٣/١٩١، وأبو داود: ٥٨ و ١٣٥٣ و ١٣٥٤.




**واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە: لە حەبیبی کوڕی ئەبو ثابت، لە موحەممەدی کوڕی عەلی، لە باوکی لە باپیرەی «ئیبنو عەبباس» دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ شەو هەڵسا سیواکی کرد، پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان خەوت، پاشان هەڵسا سیواکی کرد، پاشان دەستنوێژی گرت و دوو ڕکات تا شەش ڕکات نوێژی کرد، پاشان سێ ڕکات ویتری کرد، وە دوو ڕکاتی تریشی کرد.**

**١٧٠٥-** «عَنْ حُصَيْنٍ عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بن عَلِيِّ بَن عَبْدِ اللَّهِ بن عَبَّاسٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَامَ فَتَوَضَّأَ وَاسْتَاكَ وَهُوَ يَقْرَأُ هَذِهِ الْآيَةَ حَتَّى فَرَغَ مِنْهَا: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ١٩٠ ﴾آل عمران، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ عَادَ فَنَامَ حَتَّى سَمِعْتُ نَفْخَهُ، ثُمَّ قَامَ فَتَوَضَّأَ وَاسْتَاكَ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ نَامَ ثُمَّ قَامَ فَتَوَضَّأَ وَاسْتَاكَ وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَأَوْتَرَ بِثَلَاثٍ»[1].

**واتە: حوصەین دەگێڕێتەوە، لە حەبیبی کوڕی ئەبو ثابت، لە موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبباس لە باوکی لە باپیرەیەوە (ئیبنو عەبباس) دەڵێ: من لە لای پێغەمبەر ﷺ بووم هەڵساو دەستنوێژی گرت و سیواکی کردو ئەم ئایەتەی دەخوێند: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ١٩٠ ﴾، تا تەواو بوو، پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان گەڕایەوە خەوت تا گوێم لە پرخەی بوو، پاشان هەڵسا دەستنوێژی گرت و سیواکیشی کرد، پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان خەوت، پاشان هەڵسا دەستنوێژی گرت و سیواکی کرد، پاشان دوو ڕکات نوێژی کردو سێ ڕکات ویتریشی کرد.**

**١٧٠٦-** «عَنْ زَيْدٍ عَنْ حَبِيبِ بَنْ أَبِي ثَابِتٍ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ عَنِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: اسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَاسْتَنَّ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ»[2].

**واتە: زەید دەگێڕێتەوە: لە حەبیبی کوڕی ئەبو ثابت، لە موحەممەدی کوڕی عەلی لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا لە خەو سیواکی کرد، ئینجا هەمان فەرموودەکەی پێشووی باس کرد.**

---

**(١)** صحيح.

**(٢)** سكت عنه الشيخ.




**١٧٠٧-** «عَنْ أَبي بَكْرٍ النَّهْشَلِيُّ، عَنْ حَبِيبِ بَنِ أَبي ثَابِتٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ الْجَزَّارِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ثَمَانَ رَكَعَاتٍ، وَيُوتِرُ بِثَلَاثٍ، وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الْفَجْرِ»(١).

**واتە: ئەبو بەکری نەهشەلی دەگێڕێتەوە: لە حەبیبی کوڕی ئەبو ثابت، لە یەحیای کوڕی جەززار لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەودا هەشت ڕکات نوێژی دەکرد، هەروەها سێ ڕکات ویتریشی دەکرد، دوو ڕکاتیشی دەکرد پێش نوێژی بەیانی.**

**١٧٠٨-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُوتِرُ بِثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، فَلَمَّا كَبِرَ وَضَعُفَ أَوْتَرَ بِتِسْعٍ»(٢).

**واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سێزدە ڕکات ویتری دەکرد، کاتێ کەوتە تەمەنەوەو لاواز بوو حەوت ڕکات ویتری کرد.**

**١٧٠٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ تِسْعاً، فَلَمَّا أَسَنَّ وَثَقُلَ صَلَّى سَبْعاً»(٣).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەودا نۆ ڕکاتی دەکرد، کاتێ کەوتە تەمەنەوەو قورس بوو حەوت ڕکاتی دەکرد.**

## بابەت: جیاوازی لەسەر زوهری لە فەرموودەی ئەبو ئەیوب لە ویتردا

**١٧١٠-** «عَنْ دُوَيْدِ بْنِ نَافِعٍ، قَالَ أَخْبَرَنِي ابْنُ شِهَابٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَطَاءُ بْنُ يَزِيدَ عَنْ أَبِي أَيُّوبَ رضي الله عنه، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: الْوِتْرُ حَقٌّ، فَمَنْ شَاءَ أَوْتَرَ بِسَبْعٍ، وَمَنْ شَاءَ أَوْتَرَ بِخَمْسٍ، وَمَنْ شَاءَ أَوْتَرَ بِثَلَاثٍ، وَمَنْ شَاءَ أَوْتَرَ بِوَاحِدَةٍ»(٤).

**واتە: دوەیدی کوڕی نافیع، دەڵێ: ئیبنو شیهاب هەواڵی پێدام وتی: عەطائی کوڕی یەزید بۆی باس کردم لە ئەبو ئەیوبەوە رضي الله عنه، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ویتر حەقە، هەر**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح الإسناد. أخرجه الترمذي: ٤٥٧.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤٢٢، وإبن ماجه: ١١٩٠.




**کەس ویستی با حەوت ڕکات ویتر بکات، هەر کەسیش ویستی با پێنج ڕکات بکات، هەر کەسیش ویستی با سێ ڕکات بکات، هەر کەسیش ویستی با یەک ڕکات بکات.**

**١٧١١-** «عَنِ الْأَوْزَاعِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنِي الزُّهْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَطَاءُ بن يَزِيد عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْوِتْرُ حَقٌّ، فَمَنْ شَاءَ أَوْتَرَ بِخَمْسٍ، وَمَنْ شَاءَ أَوْتَرَ بِثَلَاثٍ، وَمَنْ شَاءَ أَوْتَرَ بِوَاحِدَةٍ»[١].

**واتە: ئەوزاعی دەڵێ: زوهری بۆی باس کردم وتی: عەطائی کوڕی یەزید بۆی باس کردین لە ئەبو ئەیوبەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ویتر حەقە، هەر کەس ویستی با پێنج ڕکات ویتر بکات، هەر کەسیش ویستی با سێ ڕکات بکات، هەر کەسیش ویستی با یەک ڕکات بکات.**

**١٧١٢-** «عَنْ أَبِي مُعَيْدٍ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي عَطَاءُ بن يَزِيدَ أَنَّهُ سمع أَبَا أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيَّ ﷺ يَقُولُ: الْوِتْرُ حَقٌّ، فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِخَمْسِ رَكَعَاتٍ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِثَلَاثٍ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِوَاحِدَةٍ فَلْيَفْعَلْ»[٢].

**واتە: ئەبو موعید دەگێڕێتەوە: لە زوهریەوە وتوویەتی: عەطائی کوڕی یەزید بۆی باس کردم ئەو گوێی لێ بوو ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ دەیوت: ویتر حەقە، هەر کەس پێی خۆش بوو ویتر بکات با پێنج ڕکات ویتر بکات، هەر کەسیش پێی خۆش بوو با سێ ڕکات بکات، هەر کەسیش پێی خۆش بوو با یەک ڕکات بکات.**

**١٧١٣-** «عَنْ سُفْيَانَ عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ عَطَاءِ بْن يَزِيد عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ قَالَ: مَنْ شَاءَ أَوْتَرَ بِسَبْعٍ، وَمَنْ شَاءَ أَوْتَرَ بِخَمْسٍ، وَمَنْ شَاءَ أَوْتَرَ بِثَلَاثٍ، وَمَنْ شَاءَ أَوْتَرَ بِوَاحِدَةٍ، وَمَنْ شَاءَ أَوْمَأَ إِيمَاءً»[٣].

**واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە لە زوهری لە عەطائی کوڕی یەزید ئەبو ئەیوب ﷺ دەڵێ: هەرکەس ویستی با حەوت ڕکات ویتر بکات، هەر کەسیش ویستی با پێنج ڕکات ویتر بکات، هەر کەسیش ویستی با سێ ڕکات ویتر بکات، هەر کەسیش ویستی با یەک ڕکات ویتر بکات، هەر کەسیش ویستی بە (دانیشتن و) ئاماژە بیکات، با بیکات.**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤٢٢، وإبن ماجه: ١١٩٠.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح الإسناد موقوف. وانظر أبو داود: ١٤٢٢، وإبن ماجه: ١١٩٠. فهو صحيح مرفوعاً.




## بابەت: چۆنیەتی پێنج ڕکات ویترو باسکردنی جیاوازی لەسەر حەکەم لە فەرموودەی ویتر

**١٧١٤-** «عَنِ الْحَكَمِ عَنْ مِقْسَمٍ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُوتِرُ بِخَمْسٍ وَبِسَبْعٍ لَا يَفْصِلُ بَيْنَهَا بِسَلَامٍ وَلَا بِكَلَامٍ»(١).

**واتە: حەکەم دەگێڕێتەوە: لە میقسەم لە ئوممو سەلەمەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێنج یان حەوت ڕکات ویتری دەکرد، لە نێوانیاندا نەیدەبڕی نە بە سەلام دانەوە، نە بە قسە کردن. (سێ ڕکاتی کۆتایی بەیەکەوە دەکرد).**

**١٧١٥-** «عَنِ الْحَكَمِ عَنْ مِقْسَمٍ عَنِ بْنِ عَبَّاسٍ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُوتِرُ بِسَبْعٍ أَوْ بِخَمْسٍ لَا يَفْصِلُ بَيْنَهُنَّ بِتَسْلِيمٍ»(٢).

**واتە: حەکەم دەگێڕێتەوە، لە میقسەم لە ئیبنو عەبباس لە ئوممو سەلەمەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێنج، یان حەوت ڕکات ویتری دەکرد، لە نێوانیاندا نەیدەبڕی بە سەلام دانەوە.**

**١٧١٦-** «عَنِ الحَكَمِ عَنِ مِقْسَمٍ، قَالَ: الْوِتْرُ سَبْعٌ فَلَا أَقَلَّ مِنْ خَمْسٍ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِإِبْرَاهِيمَ، فَقَالَ: عَمَّنْ ذَكَرَهُ؟ قُلْتُ: لَا أَدْرِي، قَالَ الْحَكَمُ: فَحَجَجْتُ، فَلَقِيتُ مِقْسَماً، فَقُلْتُ لَهُ: عَمَّنْ قَالَ؟ عَنِ الثِّقَةِ، عَنْ عَائِشَةَ، وَعَنْ مَيْمُونَةَ»(٣).

**واتە: حەکەم دەگێڕێتەوە: میقسەم دەڵێ: ویتر خۆی حەوت ڕکاتەو کەمتر نیە لە پێنج ڕکات، ئەمەم باسکرد بۆ ئیبراهیم، وتی: میقسەم لە چ کەسێک باسیکردوە؟ وتم: نازانم، حەکەم دەڵێ: حەجم کرد، گەیشتم بە میقسەم، پێم وت: کێ ئەمەی وتووە؟ وتی: لە کەسێکی متمانە پێکراوەوە لە عائیشەو لە مەیمونەشەوە (خوا لێیان ڕازی بێ).**

**١٧١٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُوتِرُ بِخَمْسٍ وَلَا يَجْلِسُ إِلَّا فِي آخِرِهِنَّ»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١١٩٢.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٣٧/١٢٣، وأبو داود: ١٣٣٨، والترمذي: ٤٥٩، وإبن ماجه: ١٣٥٩.




واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پێنج ڕکات ویتری کرد دانەدەنیشت لە کۆتاییەکەیدا نەبێت.

## بابەت: چۆنیەتی ئەنجامدانی حەوت ڕکاتی ویتر

**١٧١٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: لَمَّا أَسَنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَخَذَ اللَّحْمَ صَلَّى سَبْعَ رَكَعَاتٍ لَا يَقْعُدُ إِلَّا فِي آخِرِهِنَّ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ قَاعِدٌ بَعْدَ مَا يُسَلِّمُ، فَتِلْكَ تِسْعٌ يَا بُنَيَّ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا صَلَّى صَلَاةً أَحَبَّ أَنْ يُدَاوِمَ عَلَيْهَا»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە تەمەنەوەو گۆشتی گرت حەوت ڕکاتی دەکرد دانەدەنیشت مەگەر لە کۆتاییدا نەبێت، وە بە دانیشتنەوە دوو ڕکاتی دەکرد دوای ئەوەی سەلامی دەدایەوە، ئەوە نۆ ڕکات ئەی کوڕە بچکۆلەکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر نوێژێکی بکردایە پێی خۆش بوو بەردەوام بێت لە سەری.

**١٧١٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَوْتَرَ بِتِسْعِ رَكَعَاتٍ لَمْ يَقْعُدْ إِلَّا فِي الثَّامِنَةِ، فَيَحْمَدُ اللَّهَ وَيَذْكُرُهُ وَيَدْعُو، ثُمَّ يَنْهَضُ وَلَا يُسَلِّمُ، ثُمَّ يُصَلِّي التَّاسِعَةَ، فَيَجْلِسُ فَيَذْكُرُ اللَّهَ ﷻ وَيَدْعُو، ثُمَّ يُسَلِّمُ تَسْلِيمَةً يُسْمِعُنَا، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، فَلَمَّا كَبِرَ وَضَعُفَ أَوْتَرَ بِسَبْعِ رَكَعَاتٍ لَا يَقْعُدُ إِلَّا فِي السَّادِسَةِ، ثُمَّ يَنْهَضُ وَلَا يُسَلِّمُ، فَيُصَلِّي السَّابِعَةَ ثُمَّ يُسَلِّمُ تَسْلِيمَةً، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ نۆ ڕکات ویتری بکردایە دانەدەنیشت مەگەر لە هەشتەمین ڕکاتدا نەبێ، پاشان ستایشی خوای دەکردو یادی دەکردو لێی دەپاڕایەوە (لە دانیشتنەکەدا)، پاشان هەڵدەستاو سەلامی نەدەدایەوە، پاشان ڕکاتی نۆیەمی دەکرد، دادەنیشت یادی خوای دەکردو دەپاڕایەوە، پاشان بە جۆرێک سەلامی دەدایەوە دەمانبیست، دواتر دوو ڕکاتی دەکرد بە دانیشتنەوە، کاتێ کەوتە تەمەنەوەو لاواز بوو، حەوت ڕکاتی کرد دانەدەنیشت مەگەر لە شەشەمین ڕکاتدا نەبێ، پاشان هەڵدەستایەوەو سەلامی نەدەدایەوە، ئینجا

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ڕکاتی حەوتەمی دەکرد، پاشان سەلامی دەدایەوە، دواتر بە دانیشتنەوە دوو ڕکات نوێژی دەکرد.

## چۆنیەتی ئەنجامدانی نۆ ڕکاتی ویتر

**١٧٢٠-** «عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ، أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُنَّا نُعِدُّ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ سِوَاكَهُ وَطَهُورَهُ فَيَبْعَثُهُ اللَّهُ ﷻ لِمَا شَاءَ أَنْ يَبْعَثَهُ مِنَ اللَّيْلِ، فَيَسْتَاكُ وَيَتَوَضَّأُ وَيُصَلِّي تِسْعَ رَكَعَاتٍ لَا يَجْلِسُ فِيهِنَّ إِلَّا عِنْدَ الثَّامِنَةِ، وَيَحْمَدُ اللَّهَ، وَيُصَلِّي عَلَى نَبِيِّهِ ﷺ وَيَدْعُو بَيْنَهُنَّ، وَلَا يُسَلِّمُ تَسْلِيماً، ثُمَّ يُصَلِّي التَّاسِعَةَ وَيَقْعُدُ «وَذَكَرَ كَلِمَةً نَحْوَهَا»، وَيَحْمَدُ اللَّهَ وَيُصَلِّي عَلَى نَبِيِّهِ ﷺ، وَيَدْعُو ثُمَّ يُسَلِّمُ تَسْلِيماً يُسْمِعُنَا، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ قَاعِدٌ»[١].

**واتە: سەعدی کوڕی هیشام دەگێڕێتەوە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئێمە سیواک و ئاوی دەستنوێژمان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادە دەکرد، هەر کاتێک خوا ویستی لەسەری بووایە بەخەبەری بکاتەوە بەخەبەر دەبوویەوە، جا سیواکی دەکردو دەستنوێژی دەگرت، هەشت ڕکات نوێژی دەکرد دانەدەنیشت تیایاندا تەنها لە هەشتەمین ڕکاتدا نەبێ، هەروەها ستایشی خوای دەکردو صەڵاواتی دەدا لە سەر پێغەمبەرەکەی و لە نێوانیاندا دەپاڕایەوە، سەلامی نەدەدایەوە، پاشان نۆیەم ڕکاتی دەکردو دادەنیشت «وە باسی وشەیەکی کرد وەکو ئەمە»، وە ستایشی خوای دەکردو صەڵاواتی دەدا لە سەر پێغەمبەرەکەی و دەپاڕایەوە، پاشان بە جۆرێ سەلامی دەدایەوە دەمانبیست، دواتر بە دانیشتنەوە دوو ڕکات نوێژی دەکرد.**

**١٧٢١-** «عَنْ زُرَارَةَ بْنِ أَوْفَى، أَنَّ سَعْدَ بْنَ هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ لَمَّا أَنْ قَدِمَ عَلَيْنَا أَخْبَرَنَا، أَنَّهُ أَتَى ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فَسَأَلَهُ عَنْ وِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَلَا أَدُلُّكَ أَوْ أَلَا أُنَبِّئُكَ بِأَعْلَمِ أَهْلِ الْأَرْضِ بِوِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قُلْتُ: مَنْ، قَالَ: عَائِشَةُ، فَأَتَيْنَاهَا فَسَلَّمْنَا عَلَيْهَا، وَدَخَلْنَا فَسَأَلْنَاهَا، فَقُلْتُ: أَنْبِئِينِي عَنْ وِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَتْ: كُنَّا نُعِدُّ لَهُ سِوَاكَهُ وَطَهُورَهُ فَيَبْعَثُهُ اللَّهُ ﷻ مَا شَاءَ أَنْ يَبْعَثَهُ مِنَ اللَّيْلِ، فَيَتَسَوَّكُ وَيَتَوَضَّأُ، ثُمَّ يُصَلِّي تِسْعَ رَكَعَاتٍ لَا يَقْعُدُ فِيهِنَّ إِلَّا فِي الثَّامِنَةِ، فَيَحْمَدُ اللَّهَ وَيَذْكُرُهُ وَيَدْعُو، ثُمَّ يَنْهَضُ وَلَا يُسَلِّمُ، ثُمَّ يُصَلِّي التَّاسِعَةَ فَيَجْلِسُ، فَيَحْمَدُ اللَّهَ وَيَذْكُرُهُ وَيَدْعُو، ثُمَّ يُسَلِّمُ تَسْلِيماً يُسْمِعُنَا، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ فَتِلْكَ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً يَا

---

(١) صحيح.

بُنَيَّ، فَلَمَّا أَسَنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَخَذَ اللَّحْمَ أَوْتَرَ بِسَبْعٍ، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ بَعْدَ مَا يُسَلِّمُ فَتِلْكَ تِسْعاً أَيْ بُنَيَّ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا صَلَّى صَلَاةً أَحَبَّ أَنْ يُدَاوِمَ عَلَيْهَا»[١].

**واتە: زورارەی کوڕی ئەوفی دەگێڕێتەوە: کاتێ سەعدی کوڕی هیشام هات بۆ لامان هەواڵی پێداین کە ئەو ڕۆیشتووە بۆ لای ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، پرسیاری لێکرد دەربارەی ویتری پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: ئایا شارەزاترین کەسی سەر زەویت پێ نیشان بدەم بە ویتری پێغەمبەری خوا ﷺ؟ وتم: کێیە؟ وتی: عائیشەیە (خوا لێی ڕازی بێ)، جا ڕۆیشتین بۆ لای و سڵاومان لێکردو چووینە ژوورەوە پرسیارمان لێکرد، وتم: هەواڵم بدەرێ دەربارەی ویتری پێغەمبەری خوا، وتی: ئێمە سیواک و ئاوی دەستنوێژمان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادە دەکرد، هەر کاتێک خوا ویستی لەسەری بووایە بە خەبەری بکاتەوە بە خەبەر دەبوویەوە، جا سیواکی دەکردو دەستنوێژی دەگرت، پاشان نۆ ڕکات نوێژی دەکرد دانەدەنیشت تیایاندا تەنها لە هەشتەمین ڕکاتدا نەبێ، هەروەها ستایش و یادی خوای دەکردو دەپاڕایەوە، پاشان هەڵدەستایەوەو سەلامی نەدەدایەوە، دواتر نۆیەم ڕکاتی دەکردو دادەنیشت، ستایش و یادی خوای دەکردو دەپاڕایەوە، پاشان سەلامی دەدایەوە بە جۆرێک دەمانبیست، بە دانیشتنەوە دوو ڕکاتی دەکرد، ئەوە بوو بە یازدە ڕکات ئەی کوڕە بچکۆلەکەم، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە تەمەنەوەو گۆشتی گرت حەوت ڕکات ویتری دەکرد، پاشان بە دانیشتنەوە دوو ڕکاتی دەکرد دوای ئەوەی سەلامی دەدایەوە، ئەوەش بوو بە نۆ ڕکات ئەی کوڕە بچکۆلەکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر نوێژێکی بکردایە پێی خۆش بوو بەردەوام بێ لە سەری.**

**١٧٢٢-** «عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهُ سَمِعَهَا تَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُوتِرُ بِتِسْعِ رَكَعَاتٍ، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، فَلَمَّا ضَعُفَ أَوْتَرَ بِسَبْعِ رَكَعَاتٍ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ»[٢].

**واتە: سەعدی کوڕی هیشام دەگێڕێتەوە: ئەو گوێی لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ نۆ ڕکات نوێژی ویتری دەکرد، پاشان بە دانیشتنەوە**

---

**(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٤٦، وأبو داود: ١٣٤٢ و ١٣٤٣ و ١٣٤٤ و ١٣٤٥، والترمذي: ٤٤٥ و ١٣٥٢، وإبن ماجه: ١١٩١ و ١٣٤٨.**

**(٢) صحيح.**

دوو ڕکاتی دەکرد، کاتێ لاواز بوو حەوت ڕکات نوێژی کرد، پاشان بە دانیشتنەوە دوو ڕکات نوێژی کرد.

**١٧٢٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُوتِرُ بِتِسْعٍ، وَيَرْكَعُ رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ»(١).

**واتە: عائیشە دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نۆ ڕکات ویتری دەکرد، پاشان بە دانیشتنەوە دوو ڕکاتی دەکرد.**

**١٧٢٤-** «عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ، أَنَّهُ وَفَدَ عَلَى أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، فَسَأَلَهَا عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ثَمَانَ رَكَعَاتٍ وَيُوتِرُ بِالتَّاسِعَةِ، وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ»(٢).

**واتە: سەعدی کوڕی هیشام دەگێڕێتەوە: ئەو سەردانی دایکی ئیمانداران عائیشەی کرد (خوا لێی ڕازی بێ)، پرسیاری لێکرد دەربارەی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، (عائیشە خوا لێی ڕازی بێ) وتی: لە شەودا هەشت ڕکات نوێژی دەکردو، نۆیەم ڕکاتی دەکرد بە ویتر، پاشان دوو ڕکاتی دەکرد بە دانیشتنەوە.**

**١٧٢٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ تِسْعَ رَكَعَاتٍ»(٣).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەودا نۆ ڕکات نوێژی دەکرد.**

## بابەت: چۆنیەتی ئەنجامدانی یازدە ڕکات ویتر

**١٧٢٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً وَيُوتِرُ مِنْهَا بِوَاحِدَةٍ، ثُمَّ يَضْطَجِعُ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ»(٤).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە شەودا یازدە ڕکات نوێژی دەکرد، یەکێکیانی دەکرد بە ویتر، پاشان بەلای ڕاستیدا پاڵ دەکەوت.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٣٨.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٤٤٣ و ٤٤٤، وإبن ماجه: ١٣٦٠.

(٤) صحيح. لكن ذكر الاضطجاع بعد الوتر شاذ. أخرجه البخاري: ٦٣١٠، ومسلم: ٧٣٦، وأبو داود: ١٣٣٥، والترمذي: ٤٤٠.

## بابەت: ویتر بە سێزدە ڕکات

**١٧٢٧-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُوتِرُ بِثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، فَلَمَّا كَبِرَ وَضَعُفَ أَوْتَرَ بِتِسْعٍ»(١).

**واتە:** ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سێزدە ڕکات ویتری دەکرد، کاتێ کەوتە تەمەنەوەو لاواز بوو حەوت ڕکاتی دەکرد.

## بابەت: قورئان خوێندن لە ویتردا

**١٧٢٨-** «عَنْ أَبِي مِجْلَزٍ، أَنَّ أَبَا مُوسَى ﷺ كَانَ بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ، فَصَلَّى الْعِشَاءَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى رَكْعَةً أَوْتَرَ بِهَا، فَقَرَأَ فِيهَا بِمِائَةِ آيَةٍ مِنَ النِّسَاءِ، ثُمَّ قَالَ: مَا أَلَوْتُ أَنْ أَضَعَ قَدَمَيَّ حَيْثُ وَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَدَمَيْهِ، وَأَنَا أَقْرَأُ بِمَا قَرَأَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»(٢).

**واتە:** ئەبو میجلەز دەگێڕێتەوە: ئەبو موسا ﷺ لە نێوان مەککەو مەدینە (لە گەشتدا) بوو، دوو ڕکات نوێژی عیشای کرد، پاشان هەڵسا یەک ڕکات نوێژی کردو کردی بە تاک، سەد ئایەتی تێدا خوێند لە سوورەتی نیساء، پاشان وتی: کەمتەرخەمیم نەکرد لەوەی قاچم لە شوێن قاچی پێغەمبەری خوا ﷺ دانا، منیش ئەوە دەخوێنم کە پێغەمبەری خوا ﷺ خوێندوویەتی.

## جۆرێکی تر لە قورئان خوێندن لە ویتردا

**١٧٢٩-** «عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْوِتْرِ بِـ ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾الأعلى، وَ ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾الكافرون، وَ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾الإخلاص، فَإِذَا سَلَّمَ قَالَ: سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ»(٣).

**واتە:** ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی ویتردا سوورەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ و ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾ و ﴿قُلْ هُوَ

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

﴿ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ی دەخوێند، کاتێ سەلامی بدایەتەوە دەیفەرموو: (سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوس) سێ جار.

**١٧٣٠-** «عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُوتِرُ بـ: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾الأعلى، وَ ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾الكافرون، وَ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾الإخلاص»[1].

**واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ویتری دەکرد سوورەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ و ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾ و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ی تێدا دەخوێند.**

**١٧٣١-** «عَنِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الْوِتْرِ بـ: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾الأعلى، وَ ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾الكافرون، وَ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾الإخلاص»[2].

**واتە: ئیبنو عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ویتردا سوورەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ و ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾، و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ی دەخوێند.**

## باسی جیاوازی لەسەر شوعبە لە فەرموودەکە

**١٧٣٢-** «عَنْ شُعْبَةُ عن سَلَمَةَ وَزُبَيْدٍ عَنْ ذَرٍّ عَنِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُوتِرُ بـ: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾الأعلى، وَ ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾الكافرون، وَ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾الإخلاص، وَكَانَ يَقُولُ إِذَا سَلَّمَ: سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ ثَلَاثاً، وَيَرْفَعُ صَوْتَهُ بِالثَّالِثَةِ»[3].

**واتە: شوعبە دەگێڕێتەوە: لە سەلەمەو زوبەید لە زەڕ لە ئیبنو عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ویتری دەکرد سوورەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ و ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾ و ﴿قُلْ**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾ی دەخوێند، وە کاتێ سەلامی بدایەتەوە دەیفەرموو: (سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوس) سێ جار، لە سێیەمین جاردا دەنگی بەرز دەکردەوە.

**١٧٣٣-** «عَنْ شُعْبَةُ قَالَ أَخْبَرَنِي سَلَمَةُ وَزُبَيْدٌ عَنْ ذَرٍّ عَنِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الْوِتْرِ بـ: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١ ﴾الأعلى، وَ ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ ﴾الكافرون، و ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾الإخلاص، ثُمَّ يَقُولُ إِذَا سَلَّمَ: سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ، وَيَرْفَعُ بِسُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ صَوْتَهُ بِالثَّالِثَةِ»[1].

**واتە: شوعبە دەڵێ: سەلەمەو زوبەید هەواڵیان پێدام لە زەڕ لە ئیبنو عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی ویتردا سووڕەتی: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١ ﴾ و ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ ﴾ و ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾ی دەخوێند، پاشان کاتێ سەلامی بدایەتەوە دەیفەرموو: (سُبْحَانَ الْمَلِك الْقُدُّوس) سێ جار، لە سێیەم جاردا دەنگی بەرز دەکردەوەو دەیفەرموو: (سُبْحَانَ الْمَلِكَ الْقُدُّوس).**

**١٧٣٤-** «عن مَنْصُورٍ عن سَلَمَةَ بن كُهَيْلٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُوتِرُ بـ: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١ ﴾الأعلى، وَ ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ ﴾الكافرون، وَ ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾الإخلاص، وَكَانَ إِذَا سَلَّمَ وَفَرَغَ قَالَ: سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ» ثَلَاثاً طَوَّلَ فِي الثَّالِثَةِ»[2].

**واتە: مەنصور دەگێڕێتەوە: لە سەلەمەی کوڕی کوهەیل، لە سەعیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ویتری دەکرد سووڕەتی: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١ ﴾ و ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ ﴾ و ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾ی تێدا دەخوێند، کاتێ سەلامی بدایەتەوەو تەواو بووایە دەیفەرموو: (سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ) سێ جار، لە سێیەم جاردا دەنگی درێژ دەکردەوە.**

**١٧٣٥-** «عَنْ عَبْدُ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي سُلَيْمَانَ عَنْ زُبَيْدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُوتِرُ بـ: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١ ﴾الأعلى، وَ ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ ﴾الكافرون، وَ ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾الإخلاص»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: عەبدولمەلیکی کوڕی سولەیمان دەگێڕێتەوە: لە زوبەید، لە سەعیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ویتری دەکرد سووڕەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ۝١﴾ و ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ۝١﴾ و ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ی تێدا دەخوێند.

**١٧٣٦-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُحَادَةَ، عَنْ زُبَيْدٍ، عَنِ بْنِ أَبْزَى عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُوتِرُ بـ: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ۝١﴾الأعلى، وَ ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ۝١﴾الكافرون، وَ ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾الإخلاص، فَإِذَا فَرَغَ مِنَ الصَّلَاةِ قَالَ: سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ»[1].

واتە: موحەممەدی کوڕی جوحادە دەگێڕێتەوە: لە زوبەید، لە ئیبنو ئەبزە لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ویتری دەکرد سووڕەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ۝١﴾ و ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ۝١﴾ و ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ی تێدا دەخوێند، کاتێ نوێژی تەواو بکردایە دەیفەرموو: (سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ) سێ جار.

## باسی جیاوازی لەسەر مالیکی کوڕی میغوەل لە فەرموودەکە

**١٧٣٧-** «عَنْ مَالِكٍ، عَنْ زُبَيْدٍ، عَنِ ابْنِ أَبْزَى، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْوِتْرِ بـ: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ۝١﴾الأعلى، وَ ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ۝١﴾الكافرون، وَ ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾الإخلاص»[2].

واتە: مالیک دەگێڕێتەوە، لە زوبەید، لە ئیبنو ئەبی ئەبزە، ئەویش لە باوکیەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی ویتردا سووڕەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ۝١﴾ و ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ۝١﴾ و ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ی دەخوێند.

**١٧٣٨-** «عَنْ مَالِكٍ، عَنْ زُبَيْدٍ، عَنْ ذَرٍّ، عَنِ ابْنِ أَبْزَى، مُرْسَلٌ، وَقَدْ رَوَاهُ عَطَاءُ بْنُ السَّائِبِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى، عَنْ أَبِيهِ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: مالیک دەگێڕێتەوە، لە زوبەید، لە زەڕ، لە ئیبنو ئەبزە، بە (مرسل) هێناویەتی. وە عەطائی کوڕی سائیب گێڕاویەتیەوە لە سەعیدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبزەی لە باوکیەوە.

تێبینی: (مُرْسَل): ئەم فەرموودەیە کە یەکێک، چەند کەسێک لە تابیعین فەرموودەیەک بگێڕنەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بێ ئەوەی ئاماژە بەوە بکەن لە هاوەڵانیان بیستوە.

**١٧٣٩-** «عَنْ رَوْحِ بْنِ الْقَاسِمِ عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الْوِتْرِ بـ: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾الأعلى، وَ ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾الكافرون، وَ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾الإخلاص»[1].

واتە: ڕەوحی کوڕی ئەبو قاسم دەگێڕێتەوە: لە عەطائی کوڕی ئەبو سائیب، لە سەعیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزەی لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی ویتردا سووڕەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ و ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾ و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ی دەخوێند.

## باسی جیاوازی لەسەر شوعبە لە قەتادە لەم فەرموودەدا

**١٧٤٠-** «عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ سَمِعْتُ عَزْرَةَ يحَدِّثُ عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُوتِرُ بـ: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾الأعلى، وَ ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾الكافرون، وَ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾الإخلاص، فَإِذَا فَرَغَ قَالَ: سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ، ثَلَاثاً»[2].

واتە: شوعبە دەگێڕێتەوە: لە قەتادەوە دەڵێ: گوێم لێ بوو عەزرە باسی دەکرد لە سەعیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزەی لە باوکیەوە، وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ویتری کرد سووڕەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ و ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾ و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ی تێدا خوێند، کاتێ نوێژی تەواو کرد فەرمووی: (سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوس) سێ جار.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.





**١٧٤١-** «عَنْ شُعْبَة، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ زُرَارَةَ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، كَانَ يُوتِرُ بـ ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ۝١﴾ الأعلى، وَ ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ۝١﴾ الكافرون، وَ ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ الإخلاص، فَإِذَا فَرَغَ قَالَ: سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ، ثَلَاثاً وَيَمُدُّ فِي الثَّالِثَةِ»[١].

**واتە: شوعبە دەگێڕێتەوە: لە قەتادەوە لە زورارەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزە ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ویتری کرد، سووڕەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ۝١﴾ وَ ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ۝١﴾ و ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ ی تێدا خوێند، کاتێ نوێژی تەواو کرد فەرمووی: (سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوس) سێ جار، لە سێیەمین جاردا درێژی دەکردەوە.**

**١٧٤٢-** «عَنْ شُعْبَة، قَالَ: سَمِعْتُ قَتَادَةَ يحَدّث عَنْ زُرَارَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُوتِرُ بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى»[٢].

**واتە: شوعبە دەڵێ: گوێم لە قەتادە بوو باسی دەکرد لە زورارە، ئەویش لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزە ﷺ وتوویەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ویتری کرد، سووڕەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ۝١﴾ ی تێدا خوێند.**

**١٧٤٣-** «عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ زُرَارَةَ بْنِ أبي أَوْفَى عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَوْتَرَ بـ ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ۝١﴾ الأعلى»[٣].

**واتە: شوعبە دەگێڕێتەوە: لە قەتادە، لە زورارەی کوڕی ئەبو ئەوفا لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ﷺ، کە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ویتری کرد، سووڕەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ۝١﴾ ی تێدا خوێند.**

**١٧٤٤-** «عَنْ يَحْيَى بْن سَعِيدٍ عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ زُرَارَةَ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الظُّهْرَ، فَقَرَأَ رَجُلٌ بـ ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ۝١﴾ الأعلى، فَلَمَّا صَلَّى قَالَ: مَنْ قَرَأَ بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى؟ قَالَ رَجُلٌ: أَنَا، قَالَ: قَدْ عَلِمْتُ أَنَّ بَعْضَهُمْ خَالَجَنِيهَا»[٤].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح لغيره.**

**(٣) صحيح.**

**(٤) صحيح.**




واتە: یەحیای کوڕی سەعید دەگێڕێتەوە: لە قەتادە، لە زورارە، لە عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی کرد، پیاوێک (سوورەتی) ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾ی خوێند، کاتێ نوێژی کرد فەرمووی: ئەمە کێ بوو ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾ی خوێند؟ پیاوێک وتی: من، فەرمووی: زانیم هەندێکتان بەربەرەکانێم دەکەن.

تێبینی: ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئینکاری و نکووڵی کردنە لەوەی بە دەنگی بەرز سوورەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾ی خوێند، چونکە نوێژەکە بە نهێنی قورئانی تێدا دەخوێنرێ، ئەو پیاوەش بە دەنگی بەرز قورئانی تێدا خوێند.

## بابەت: نزاو پاڕانەوە لە نوێژی ویتر

**١٧٤٥-** «عَنْ أَبِي الْحَوْرَاءِ، قَالَ: قَالَ الْحَسَنُ ﷺ: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ فِي الْوِتْرِ فِي الْقُنُوتِ: اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، إِنَّكَ تَقْضِي وَلَا يُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لَا يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ، تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ»[1].

**واتە: ئەبو حوراء دەڵێ: حەسەن ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵە وشەیەکی فێر کردم لە ناو قونوتی نوێژی ویتر بیڵێم: خوایە ڕێنمایێم بکەیت لەگەڵ ئەوانەی ڕێنماییت کردوون، وە پارێزراوو لەش ساغم بکەیت لەگەڵ پارێزراواندا، وە پشتیوانیم بکە لەگەڵ پشتیوانی لێکراواندا، وە لەوەی پێت بەخشیوم بەرەکەت و خێری زۆری تێ بکەو لە خراپەی ئەوەی تەقدیرت کردوە بۆم بمپارێزە، بەڕاستی تۆ بڕیار دەدەیت و کەسی تر بڕیار نادات بەسەر بڕیاری تۆدا، ئەوەی تۆ پشتیوانی بکەیت و زەلیل و زەبوون نابێ، خێری تۆ زۆرە لە هەردوو دنیادا، گەورەیت و دەسەڵاتت دیارە پەروەردگارمان.**

**١٧٤٦-** «عَنْ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ هَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ فِي الْوِتْرِ قَالَ: قُلْ: اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، فَإِنَّكَ تَقْضِي وَلَا يُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لَا يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ، تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ، وَصَلَّى اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ مُحَمَّدٍ»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤٢٥ و ١٤٢٦، والترمذي: ٤٦٤، وإبن ماجه: ١١٧٨.

(٢) ضعيف.




واتە: حەسەنی کوڕی عەلی (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو وشانەی فێر کردم لە ویتردا، فەرمووی: بڵێ: خوایە ڕێنماییم بکەیت لەگەڵ ئەوانەی ڕێنماییت کردوون، وە لەوەی پێت بەخشیوم بەرەکەت و خێری زۆری تێ بکەو لە خراپەی ئەوەی تەقدیرت کردوە بۆم بمپارێزە، بەڕاستی تۆ بڕیار دەدەیت و کەسی تر بڕیار نادات بەسەر بڕیاری تۆدا، ئەوەی تۆ پشتیوانی بکەیت و زەلیل و زەبوون نابێ، خێری تۆ زۆرە لە هەردوو دنیاداو گەورەیت و دەسەڵاتت دیارە پەروەردگارمان، وە صەڵاواتی خوا بۆ سەر پێغەمبەرمان موحەممەد.

**١٧٤٧-** «عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي آخِرِ وِتْرِهِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ، لَا أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ، أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ»[1].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو طالیب ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە کۆتا ڕکاتی نوێژی ویتر دەیفەرموو: خوایە من پەنا دەگرم بە ڕەزامەندیت لەوەی لێم توڕە بیت، وە بە سەلامەتیت لەوەی سزام بدەیت، پەنا دەگرم بە زاتی تۆ لە (شوێنەواری سیفەتەکانی) تۆ، ناتوانم ستایش کردنت بژمێرم وەکو ئەوەی تەنها تۆ دەتوانیت ستایشی خۆت بکەیت بەوەی شیاوە بە مەزنیت.

## وازهێنان لە دەست بەرز کردنەوە لە پاڕانەوەی نوێژی ویتر

**١٧٤٨-** «عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لَا يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي شَيْءٍ مِنْ دُعَائِهِ إِلَّا فِي الِاسْتِسْقَاءِ، قَالَ شُعْبَةُ: فَقُلْتُ لِثَابِتٍ: أَنْتَ سَمِعْتَهُ مِنْ أَنَسٍ؟ قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ، قُلْتُ: سَمِعْتَهُ، قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ»[2].

واتە: ثابتی بونانی دەگێڕێتەوە، ئەنەس ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستەکانی زۆر بەرز نەدەکردەوە لە هیچ شتێک لە پاڕانەوەکانیدا جگە لە نوێژە بارانە، شوعبە دەڵێ: بە ثابتم وت: تۆ لە ئەنەسەوە بیستووتە؟ وتی: (سُبْحَانَ اللَّهِ) وتم: بیستووتە، وتی: (سُبْحَانَ اللَّهِ). (واتە: بەڵێ لەوم بیستووە خۆ لە خۆمەوە قسە ناکەم).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤٢٧، والترمذي: ٣٥٦٦، وإبن ماجه: ١١٧٩.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٩٥.




## بابەت: ئەندازەی سوژدەی دوای ویتر

**١٧٤٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً فِيمَا بَيْنَ أَنْ يَفْرُغَ مِنْ صَلَاةِ الْعِشَاءِ إِلَى الْفَجْرِ بِاللَّيْلِ سِوَى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، وَيَسْجُدُ قَدْرَ مَا يَقْرَأُ أَحَدُكُمْ خَمْسِينَ آيَةً»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان لێبوونەوەی لە نوێژی عیشا بۆ بەیانی یازدە ڕکاتی دەکرد، جگە لە دوو ڕکاتەکەی بەیانی، وە سوژدەی دەبرد بە ئەندازەی ئەوەی یەکێکتان پەنجا ئایەت بخوێنێت.**

## تەسبیح کردن دوای تەواوبوونی نوێژی ویترو، باسی جیاوازی لەسەر سوفیان لە فەرموودەکە

**١٧٥٠-** «عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ زُبَيْدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يُوتِرُ بِـ: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ الأعلى، وَ ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾ الكافرون، و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ الإخلاص، وَيَقُولُ بَعْدَ مَا يُسَلِّمُ: سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ يَرْفَعُ بِهَا صَوْتَهُ»[٢].

**واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە: لە زوبەید، لە سەعیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ، وتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ نوێژی ویتری دەکرد، سوورەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾، و ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾ و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ی تێدا دەخوێند، کاتێ سەلامی دەدایەوە دەیفەرموو: (سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوس) سێ جار، دەنگی بەرز دەکردەوە.**

**١٧٥١-** «عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَعَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي سُلَيْمَانَ، عَنْ زُبَيْدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُوتِرُ بِـ: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ الأعلى، وَ ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾ الكافرون، وَ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ الإخلاص، وَيَقُولُ بَعْدَ مَا يُسَلِّمُ: سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ يَرْفَعُ بِهَا صَوْتَهُ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**واتە: سوفیانی ثەوری و عەبدولمەلیکی کوڕی سولەیمان دەگێڕنەوە: لە زوبەید، لە سەعیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزە لە باوکیەوە ﷺ، وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ویتری دەکرد، سوورەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ١﴾، و ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ١﴾ و ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١﴾ی تێدا دەخوێند، دوای ئەوەی سەلامی دەدایەوە دەیفەرموو: (سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوس) سێ جار، دەنگی بەرز دەکردەوە.**

**١٧٥٢-** «عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ زُبَيْدٍ، عَنْ ذَرٍّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُوتِرُ بِـ ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ١﴾الأعلى، وَ ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ١﴾الكافرون، وَ ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١﴾الإخلاص، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَنْصَرِفَ قَالَ: سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ ثَلَاثاً يَرْفَعُ بِهَا صَوْتَهُ»[1].

**واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە: لە زوبەید، لە سەعیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزە لە باوکیەوە ﷺ، وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ویتری دەکرد، سوورەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ١﴾، و ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ١﴾ و ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١﴾ی تێدا دەخوێند، جا ئەگەر بیویستایە بڕوات دەیفەرموو: (سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوس) سێ جار، دەنگی بەرز دەکردەوە.**

**١٧٥٣-** «عَنْ جَرِيرٍ قَالَ: سَمِعْتُ زُبَيْداً يحدث عَنْ ذَرٍّ عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُوتِرُ بِـ ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ١﴾الأعلى، وَ ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ١﴾الكافرون، وَ ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١﴾الإخلاص، وَإِذَا سَلَّمَ قَالَ: سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ» ثَلَاثَ مَرَّاتٍ يَمُدُّ صَوْتَهُ فِي الثَّالِثَةِ ثُمَّ يَرْفَعُ»[2].

**واتە: جەریر دەڵێ: گوێم لێ بوو زوبەید باسی دەکرد لە زەڕەوە، لە سەعیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ کە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ویتری دەکرد، سوورەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ١﴾، و ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ١﴾ و ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١﴾ی تێدا خوێند، کاتێ سەلامی دەدایەوە دەیفەرموو: (سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوس) سێ جار، دەنگی درێژ دەکردەوە لە سێیەمین جاردا، وە دەنگیشی بەرز دەکردەوە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**١٧٥٤-** «عَنْ عَبْدُ الْعَزِيزِ بَن عَبْدُ الصَّمَدِ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ عَزْرَةَ عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُوتِرُ بـ: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ﴿١﴾﴾الأعلى، وَ ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿١﴾﴾الكافرون، وَ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾﴾الإخلاص، فَإِذَا فَرَغَ قَالَ: سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ»[١].

**واتە: عەبدولعەزیزی کوڕی عەبدولصەمەد دەڵێ: سەعید بۆی باس کردین لە قەتادە، لە عەزرە، لە سەعیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزە ﷺ وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ویتری دەکرد سوورەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ﴿١﴾﴾، و ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿١﴾﴾ و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾﴾ی دەخوێند تیایدا، جا کاتێ سەلامی دەدایەوە دەیفەرموو: (سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوس).**

**١٧٥٥-** «عَنْ هِشَامٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ عَزْرَةَ عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْد الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُوتِرُ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ»[٢].

**واتە: هیشام دەگێڕێتەوە: لە قەتادە لە عەزرە لە سەعیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزە ﷺ، وتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ نوێژی ویتری دەکرد، جا فەرموودەکەی باس کرد.**

## بابەت: نوێژ کردن دروستە لە نێوان ویترو دوو ڕکات سوننەتەکەی بەیانی

**١٧٥٦-** «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ اللَّيْلِ، فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّي ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، تِسْعَ رَكَعَاتٍ قَائِماً يُوتِرُ فِيهَا، وَرَكْعَتَيْنِ جَالِساً، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ قَامَ فَرَكَعَ وَسَجَدَ، وَيَفْعَلُ ذَلِكَ بَعْدَ الْوِتْرِ، فَإِذَا سَمِعَ نِدَاءَ الصُّبْحِ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ»[٣].

**واتە: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان پرسیاری کرد لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەربارەی شەونوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: سێزدە ڕکاتی دەکرد، نۆ ڕکات بە پێوە، ویتریشی تێدا دەخوێند، دوو ڕکاتیش بە دانیشتنەوە، کاتێ بیویستایە**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

ڕکوع ببات هەڵدەستا (بە هەڵسانەوە) ڕکوعی دەبرد، پاشان سوژدەی دەبرد، ئەو دوو ڕکاتەی لە دوای ویتر دەکرد، ئەگەر بانگی بەیانی ببیستایە هەڵدەستا دوو ڕکاتی کورتی دەکرد.

## پارێزگاری لە دوو ڕکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی

**١٧٥٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ لَا يَدَعُ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ»(١).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دەستبەرداری چوار ڕکاتی پێش نوێژی نیوەڕۆ و دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی نەدەبوو.

**١٧٥٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يَدَعُ أَرْبَعاً قَبْلَ الظُّهْرِ وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الصُّبْحِ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: هَذَا الصَّوَابُ عِنْدَنَا، وَحَدِيثُ عُثْمَانَ بْنِ عُمَرَ خَطَأٌ وَاللَّهُ تَعَالَى أَعْلَمُ»(٢).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستبەرداری چوار ڕکاتی پێش نوێژی نیوەڕۆ نەدەبوو، وە دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانیش.

**١٧٥٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: رَكْعَتَا الْفَجْرِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا»(٣).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دوو ڕکات (سوننەتی پێش نوێژی) بەیانی چاکترە لە دنیاو ئەوەی تێیدایە.

## بابەت: کاتی دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی

**١٧٦٠-** «عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ إِذَا نُودِيَ لِصَلَاةِ الصُّبْحِ رَكَعَ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَقُومَ إِلَى الصَّلَاةِ»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٨٢، وأبو داود: ١٢٣٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٦ و ٧٢٥/٩٧، والترمذي: ٤١٦.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٨، ومسلم: ٧٢٣.

واتە: حەفصە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، کاتێ بانگی بەیانی بدرایە پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکاتی کورتی دەکرد پێش ئەوەی هەڵسێت بۆ نوێژ.

**١٧٦١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: أَخْبَرَتْنِي حَفْصَةُ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا أَضَاءَ لَهُ الْفَجْرُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر دەڵێ: حەفصە ﵂ هەواڵی پێدام، پێغەمبەر ﷺ کاتێ بەرەبەیان ڕۆشن ببوایەتەوە دوو ڕکات نوێژی سوننەتی پێش بەیانی دەکرد.

## ڕاکشان بەلای ڕاستدا لە دوای دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی

**١٧٦٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا سَكَتَ الْمُؤَذِّنُ بِالْأُولَى مِنْ صَلَاةِ الْفَجْرِ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الْفَجْرِ بَعْدَ أَنْ يَتَبَيَّنَ الْفَجْرُ، ثُمَّ يَضْطَجِعُ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: کاتێ بانگدەر بانگی بەیانی تەواو بکردایەو بێدەنگ ببووایە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵدەستا دوو ڕکات نوێژی کورتی دەکرد پێش نوێژی بەیانی دوای ئەوەی بەرەبەیان دەردەکەوت، پاشان ڕادەکشا بەلای ڕاستیدا.

## بابەت: سەرزەنشت کردنی ئەو کەسەی واز لە شەونوێژ دەهێنێ

**١٧٦٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَكُنْ مِثْلَ فُلَانٍ كَانَ يَقُومُ اللَّيْلَ فَتَرَكَ قِيَامَ اللَّيْلِ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: وەکو فڵان کەس مەبە هەڵدەستا بۆ شەونوێژ دواتر وازی لە شەونوێژ هێنا.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٢٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٢٦ و ٩٩٤ و ١١٢٣ و ١١٦٠ و ٦٣١٠، ومسلم: ٧٣٦، وإبن ماجه: ١١٩٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٥٢، ومسلم: ١١٥٩/١٨٥، وإبن ماجه: ١٣٣١.




**١٧٦٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَكُنْ يَا عَبْدَ اللَّهِ مِثْلَ فُلَانٍ، كَانَ يَقُومُ اللَّيْلَ فَتَرَكَ قِيَامَ اللَّيْلِ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: وەکو فڵان کەس مەبە ئەی عەبدوڵڵا، هەڵدەستا بۆ شەونوێژ دواتر وازی لە شەونوێژ هێنا.**

## بابەت: کاتی دوو ڕکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی و، باسی جیاوازی لەسەر نافیع

**١٧٦٥-** «عَنْ نَافِعٍ عَنْ صَفِيَّةَ عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ»[٢].

**واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: لە صەفیە، لە حەفصەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) وتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکاتی سوننەتی بەیانی دەکرد بە سووکی.**

**١٧٦٦-** «عَنْ نَافِعٍ، قَالَ حَدَّثَنِي بْن عُمَرَ، قَالَ حَدَّثَتْنِي حَفْصَةُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَرْكَعُ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ بَيْنَ النِّدَاءِ وَالْإِقَامَةِ مِنْ صَلَاةِ الْفَجْرِ»[٣].

**واتە: نافیع دەڵێ: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) بۆی باس کردم وتی: حەفصە (خوا لێی ڕازی بێ) بۆی باس کردم: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی سووکی دەکرد لە نێوان بانگ و قامەتی نوێژی بەیانیدا.**

**١٧٦٧-** «عَنْ نَافِعٍ عَنِ بْنِ عُمَرَ عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَرْكَعُ بَيْنَ النِّدَاءِ وَالصَّلَاةِ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ»[٤].

**واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: لە ئیبنو عومەر لە حەفصەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی سووکی دەکرد لە نێوان بانگ و نوێژی بەیانیدا.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٨، ومسلم: ٧٢٣.

(٤) صحيح.





**١٧٦٨-** «عَنْ نَافِعٍ عَنِ بْنِ عُمَرَ عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي بَيْنَ النِّدَاءِ وَالْإِقَامَةِ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ رَكْعَتَي الْفَجْرِ»(١).

**واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: لە ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە حەفصەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکاتی سووکی دەکرد لە نێوان بانگ و قامەتدا.**

**١٧٦٩-** «عَن نَافِعٍ أَنَّ بْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُ أَنَّ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم حَدَّثَتْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ بَيْنَ النِّدَاءِ وَالْإِقَامَةِ مِنْ صَلَاةِ الصُّبْحِ»(٢).

**واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: ئیبنو عومەر بۆی باس کرد، حەفصە (خوا لێیان ڕازی بێ)، بۆی باس کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکاتی سووکی دەکرد لە نێوان بانگ و قامەتدا لە نوێژی بەیانی.**

**١٧٧٠-** «عَنْ نَافِعٍ عَنِ بْنِ عُمَرَ، قَالَ أَخْبَرَتْنِي حَفْصَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي قَبْلَ الصُّبْحِ رَكْعَتَيْنِ»(٣).

**واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: لە ئیبنو عومەرەوە دەڵێ: حەفصە (خوا لێیان ڕازی بێ) هەواڵی پێدام، پێغەمبەری خوا ﷺ پێش نوێژی بەیانی دوو ڕکاتی دەکرد.**

**١٧٧١-** «عَنْ نَافِعٍ عَنِ بْنِ عُمَرَ عَنْ حَفْصَةَ أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمْ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا نُودِيَ لِصَلَاةِ الصُّبْحِ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الصُّبْحِ»(٤).

**واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: لە ئیبنو عومەر لە حەفصە (خوا لێیان ڕازی بێ)، ئەو هەواڵی پێدا، کاتێ بانگ بدرایە بۆ نوێژی بەیانی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات سوننەتی دەکرد پێش نوێژی بەیانی.**

**١٧٧٢-** «عَنْ نَافِعٍ عَنِ بْنِ عُمَرَ عَنْ حَفْصَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا سَكَتَ الْمُؤَذِّنُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ»(٥).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح.




واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: لە ئیبنو عومەر لە دایکی ئیماندااران حەفصە (خوا لێی ڕازی بێ)، کاتێ بانگدەر بێدەنگ ببووایە پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی سووکی دەکرد.

**١٧٧٣-** «عَنْ نَافِعٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّ حَفْصَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا سَكَتَ الْمُؤَذِّنُ مِنَ الْأَذَانِ لِصَلَاةِ الصُّبْحِ وَبَدَا الصُّبْحُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ تُقَامَ الصَّلَاةُ»(١).

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، دایکی ئیماندااران حەفصە (خوا لێی ڕازی بێ) وتوویەتی: کاتێ بانگدەر بێدەنگ ببووایە لە بانگدانی نوێژی بەیانی، وە بەرەبەیان دەربکەوتایە پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی سووکی دەکرد پێش ئەوەی قامەت بکرێ بۆ نوێژ.

**١٧٧٤-** «عَنْ نَافِعٍ عَنْ عَبْد اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَتْنِي أُخْتِي حَفْصَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي قَبْلَ الْفَجْرِ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ»(٢).

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: لە عەبدوڵڵاوە ﷺ دەڵێ: حەفصەی خوشکم (خوا لێی ڕازی بێ)، بۆی باس کردم کە ئەو پێش نوێژی بەیانی دوو ڕکات نوێژی سووکی دەکرد.

**١٧٧٥-** «عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ»(٣).

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، لە حەفصەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، وتوویەتی: کاتێ بەرەبەیان دەربکەوتایە، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی سوننەتی دەکرد.

**١٧٧٦-** «عَنْ نَافِعٍ عَنِ بْنِ عُمَرَ عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ لَا يُصَلِّي إِلَّا رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٨ و ١١٧٣ و ١١٨١، ومسلم: ٨٧ و ٧٢٣/٨٩، والترمذي: ٤٣٣ و ٤٣٤، وإبن ماجه: ١١٤٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: لە ئیبنو عومەر لە حەفصەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، وتوویەتی: کاتێ بەربەیان دەربکەوتایە، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نەدەکرد دوو ڕکاتی سووک نەبێ.

**١٧٧٧-** «عَنْ نَافِعٍ عَنِ بْنِ عُمَرَ عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ إِذَا نُودِيَ لِصَلَاةِ الصُّبْحِ رَكَعَ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَقُومَ إِلَى الصَّلَاةِ» (١).

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو عومەر لە حەفصەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، وتوویەتی: کاتێ بانگ بدرایە بۆ نوێژی بەیانی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات سووکی دەکرد، پێش ئەوەی هەڵسێت بۆ نوێژی بەیانی.

**١٧٧٨-** «عَنْ سَالِمٍ، قَالَ: ابْنُ عُمَرَ أَخْبَرَتْنِي حَفْصَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَرْكَعُ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ وَذَلِكَ بَعْدَ مَا يَطْلُعُ الْفَجْرُ»(٢).

واتە: سالم دەگێڕێتەوە: ئیبنو عومەر وتی: حەفصە (خوا لێیان ڕازی بێ) هەواڵی پێدام، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکاتی سووکی دەکرد پێش نوێژی بەیانی، ئەویش دوای ئەوەی بەرەبەیان دەردەکەوت.

**١٧٧٩-** «عَنْ سَالِمٍ عَنْ أَبِيهِ، قَالَ أَخْبَرَتْنِي حَفْصَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا أَضَاءَ لَهُ الْفَجْرُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ»(٣).

واتە: سالم دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە دەڵێ: حەفصە (خوا لێیان ڕازی بێ) هەواڵی پێدام، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بەرەبەیانی بۆ دەردەکەوت دوو ڕکاتی دەکرد.

**١٧٨٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ بَيْنَ النِّدَاءِ وَالْإِقَامَةِ مِنْ صَلَاةِ الْفَجْرِ»(٤).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکاتی سووکی دەکرد لە نێوان بانگ و قامەتی نوێژی بەیانی.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٩، ومسلم: ٧٢٤، وأبو داود: ١٢٥٥.




**١٧٨١-** «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِاللَّيْلِ، قَالَتْ: كَانَ يُصَلِّي ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُصَلِّي ثَمَانَ رَكَعَاتٍ، ثُمَّ يُوتِرُ، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ قَامَ فَرَكَعَ، وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ بَيْنَ الْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ»(١).

**واتە: ئەبو سەلەمە دەگێڕێتەوە: پرسیاری کرد لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەربارەی شەونوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: پێغەمبەر ﷺ سێزدە ڕکاتی دەکرد، هەشت ڕکاتی دەکرد، پاشان ویتری دەکرد، پاشان بە دانیشتنەوە دوو ڕکاتی دەکرد، (جا لە دووەم ڕکاتەکەی دانیشتندا) کاتێ بیویستایە ڕکوع ببات هەڵدەستا ڕکوعی دەبرد، وە دوو ڕکاتی دەکرد لە نێوان بانگ و قامەتی نوێژی بەیانی.**

**١٧٨٢-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ إِذَا سَمِعَ الْأَذَانَ وَيُخَفِّفُهُمَا»(٢).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ گوێی لە بانگ بووایە دوو ڕکات سوننەتی بەیانی دەکردو سووکی دەکردنەوە.**

**١٧٨٣-** «عَنِ السَّائِبِ بْن يَزِيد ﷺ أَنَّ شُرَيْحاً الْحَضْرَمِيَّ ﷺ ذُكِرَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يَتَوَسَّدُ الْقُرْآنَ»(٣).

**واتە: سائیبی کوڕی یەزید ﷺ دەگێڕێتەوە: باسی شورەیحی حەضرەمی ﷺ کرا لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: قورئان ناخاتە ژێر سەری.**

**تێبینی: پێدەچێ وەسف و پیاهەڵدان بێت، واتە: نە پشت گوێی دەخات و نە فڕێی دەدا، بەڵکو بە گەورەو مەزنی دەزانێ، وە پێدەچێ سەرزەنشت کردنی بێت، واتە: ناکەوێت بەسەر خوێندنەوەی قورئان وەکو چۆن کەسی خەوتوو دەکەوێت بەسەر سەریندا، قسەی کۆتایی و کۆکەرەوە ئەوەیە، مەبەست لە (التوسد) کردن بە سەرین، خەوە، قسەکەش دەگونجێ بۆ وەسف و پیاهەڵدان بێت، واتە: شەو بەبێ قورئان ناخەوێ، ئەو کات لەگەڵ قورئان دەخەوێ، بەڵکو بەردەوامە لەسەر خوێندنەوەو**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٩ و ١١٥٩، ومسلم: ٧٣٨، وأبو داود: ١٢٤٠ و ١٣٥٠ و ١٣٦١، وإبن ماجه: ١١٩٦.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح الإسناد.




پارێزگاری کردنی، وە دەگونجێ بۆ سەرزەنشتیش بێت، بە مانای ئەوەی هیچی لەبەر نەکردوە لە قورئان یان بەردەوام نیە لەسەر قورئان و لەبەر کردنی، کاتێ خەوت لەگەڵ قورئاندا ناخەوێ، لێکدانەوەی یەکەم تەواوە خوا زاناترە.

## بابەت: هەر کەس لە شەودا شەونوێژ بکات و، خەو زۆری بۆ بهێنێ

**١٧٨٤**- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَا مِنَ امْرِئٍ تَكُونُ لَهُ صَلَاةٌ بِلَيْلٍ فَغَلَبَهُ عَلَيْهَا نَوْمٌ إِلَّا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ أَجْرَ صَلَاتِهِ، وَكَانَ نَوْمُهُ صَدَقَةً عَلَيْهِ»(١).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ کەسێک نیە لە شەودا شەونوێژ بکات خەو زاڵ بێت بەسەریداو زۆری بۆ بێنێ ئیللا خوا پاداشتی نوێژەکەی بۆ دەنوسێ، خەوەکەشی دەبێتە بەخشش بۆی.

## ناوی ئەو پیاوەی کە بە الرِّضَى هاتووە (ئەویش ئەسوەدی کوڕی یەزیدە)

**١٧٨٥**- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ كَانَتْ لَهُ صَلَاةٌ صَلَّاهَا مِنَ اللَّيْلِ فَنَامَ عَنْهَا كَانَ ذَلِكَ صَدَقَةً تَصَدَّقَ اللَّهُ ﷻ عَلَيْهِ، وَكَتَبَ لَهُ أَجْرَ صَلَاتِهِ»(٢).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە شەودا شەونوێژ بکات و بەسەریەوە خەوی لێ بکەوێت، ئەوە دەبێتە بەخششێک بۆی، خوای زاڵی پایەدار پێی دەبەخشێ، هەروەها پاداشتی نوێژەکەشی بۆ دەنووسێ.

**١٧٨٦**- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فَذَكَرَ نَحْوَهُ»(٣).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەروەکو فەرموودەکەی پێشوو.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٣١٤.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




## بابەت: هەرکەس بچێتە سەر جێگاکەی نیەتی شەونوێژی هەبێ و خەوی لێ بکەوێ

**١٧٨٧-** «عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ أَتَى فِرَاشَهُ وَهُوَ يَنْوِي أَنْ يَقُومَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ فَغَلَبَتْهُ عَيْنَاهُ حَتَّى أَصْبَحَ كُتِبَ لَهُ مَا نَوَى وَكَانَ نَوْمُهُ صَدَقَةً عَلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ ﷻ»[١].

**واتە: ئەبو دەرداء ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بچێتە سەر جێگاکەی نیەتی ئەوەی هەبێت هەڵبسێ بۆ شەونوێژ خەو زۆری بۆ هێناو بە خەبەر نەهات تا ڕۆژ بوویەوە، پاداشتی نیەتەکەی بۆ دەنوسرێ، خەوەکەشی لە لایەن خواوە دەبێتە بەخششێک بۆی.**

**١٧٨٨-** «عَنْ عَبْدَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ سُوَيْدَ بْنَ غَفَلَةَ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ، وَأَبِي الدَّرْدَاءِ مَوْقُوفاً»[٢].

**واتە: عەبدە دەڵێ: گوێم لێ بوو سوەیدی کوڕی غەفلە لە ئەبو زەڕو ئەبو دەڕدائەوە (هەمان فەرموودەی پێشووی) گێڕاوەتەوە بە (مَوْقُوف)ی.**

## بابەت: ئەو کەسەی لە شەودا خەوی لێکەوت و بە خەبەر نەهاتەوە بۆ شەونوێژ، یان بە هۆی ئازارێک نەیتوانی شەونوێژ بکات، ئایا چەند ڕکات نوێژ دەکات؟

**١٧٨٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا لَمْ يُصَلِّ مِنَ اللَّيْلِ مَنَعَهُ مِنْ ذَلِكَ نَوْمٌ أَوْ وَجَعٌ صَلَّى مِنَ النَّهَارِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر شەونوێژی نەکردایە، خەو یان ئازار ڕێگری لێ بکردایە بە ڕۆژ دوازدە ڕکاتی دەکرد.**

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٣٤٤.

(٢) صحيح موقوف.

(٣) صحيح.

## بابەت: هەر کەس بخەوێ بەسەر حیزبێکی قورئان و لە دەستی بچێت لە شەودا کەی بیخوێنێتەوە؟

**١٧٩٠-** «عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ نَامَ عَنْ حِزْبِهِ أَوْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ فَقَرَأَهُ فِيمَا بَيْنَ صَلَاةِ الْفَجْرِ وَصَلَاةِ الظُّهْرِ كُتِبَ لَهُ كَأَنَّمَا قَرَأَهُ مِنَ اللَّيْلِ»[١].

**واتە: عومەری کوڕی خەطاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە شەودا بخەوێت لەکاتی خوێندنی حیزبێکی قورئان یان بەشێکی لە شەودا، ئینجا خوێندیەوە لە نێوان نوێژی بەیانی و نوێژی نیوەڕۆدا بۆی دەنوسرێ هەروەکو ئەوەی لە شەودا خوێندبێتی.**

**١٧٩١-** «عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَنْ نَامَ عَنْ حِزْبِهِ ـ أَوْ قَالَ: جُزْئِهِ مِنَ اللَّيْلِ ـ فَقَرَأَهُ فِيمَا بَيْنَ صَلَاةِ الصُّبْحِ إِلَى صَلَاةِ الظُّهْرِ فَكَأَنَّمَا قَرَأَهُ مِنَ اللَّيْلِ»[٢].

**واتە: عومەری کوڕی خەطاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە شەودا بخەوێت لەکاتی خوێندنی حیزبێکی قورئان یان بەشێکی لەشەودا، ئینجا خوێندیەوە لە نێوان نوێژی بەیانی و نوێژی نیوەڕۆدا هەروەکو ئەوە وایە لە شەودا خوێندبێتی.**

**١٧٩٢-** «عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: مَنْ فَاتَهُ حِزْبُهُ مِنَ اللَّيْلِ فَقَرَأَهُ حِينَ تَزُولُ الشَّمْسُ إِلَى صَلَاةِ الظُّهْرِ فَإِنَّهُ لَمْ يَفُتْهُ أَوْ كَأَنَّهُ أَدْرَكَهُ»[٣].

**واتە: عومەری کوڕی خەطاب ﷺ دەڵێ: هەر کەس لە شەودا بخەوێت و حیزبەکەی لە قورئان لە دەست دابێ، کاتێ خۆر دەترازێ بۆ لای نێوەڕۆ بیخوێنێت، ئەوە بێگومان لە دەستی نەداوە یان وەکو ئەوە وایە بەدەستی هێنا بێت.**

**١٧٩٣-** «عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: مَنْ فَاتَهُ وِرْدُهُ مِنَ اللَّيْلِ فَلْيَقْرَأْهُ فِي صَلَاةٍ قَبْلَ الظُّهْرِ فَإِنَّهَا تَعْدِلُ صَلَاةَ اللَّيْلِ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٤٧، وأبو داود: ١٣١٣، والترمذي: ٥٨١، وإبن ماجه: ١٣٤٣.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح موقوف.

(٤) صحيح مقطوع.

واتە: حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: هەر کەس لە شەودا ویردو عیبادەتەکەی لە دەست چوو، ئەوە با لە نوێژێکدا بیخوێنێت پێش نیوەڕۆ، بێگومان ئەوە بەرانبەرە بە شەونوێژ.

## بابەت: پاداشتی ئەو کەسەی لە شەوو ڕۆژێکدا دوازدە ڕکات نوێژ بکات جگە لە نوێژی فەرز، وە باسی ڕاجیایی گێڕەروانی تێیدا بۆ فەرموودەی ئوممو حەبیبە لەسەر فەرموودەکەو ڕا جیایی لەسەر عەتاء

**١٧٩٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ ثَابَرَ عَلَى اثْنَتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ دَخَلَ الْجَنَّةَ، أَرْبَعاً قَبْلَ الظُّهْرِ وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بەردەوام بێت لەسەر دوازدە ڕکاتی (سوننەت) لە شەوو ڕۆژێکدا دەچێتە بەهەشتەوە، چوار ڕکات پێش نیوەڕۆو دوو ڕکات لە دوای، دوو ڕکات دوای ئێوارە، دوو ڕکات دوای عیشا، دوو ڕکاتیش پێش نوێژی بەیانی.

**١٧٩٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ ثَابَرَ عَلَى اثْنَتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً بَنَى اللَّهُ ﷻ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ، أَرْبَعاً قَبْلَ الظُّهْرِ وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بەردەوام بێت لەسەر دوازدە ڕکاتی (سوننەت) خواماڵێکی بۆ دروست دەکات لەناو بەهەشت، چوار ڕکات پێش نیوەڕۆو دوو ڕکاتیش لە دوایەوە، دوو ڕکات دوای ئێوارە، دوو ڕکات دوای عیشا، دوو ڕکاتیش پێش نوێژی بەیانی.

**١٧٩٦-** «عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ بِنْتَ أَبِي سُفْيَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ رَكَعَ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً فِي يَوْمِهِ وَلَيْلَتِهِ سِوَى الْمَكْتُوبَةِ بَنَى اللَّهُ لَهُ بِهَا بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٤١٤، وإبن ماجه: ١١٤٠.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠١ و ١٠٢ و ٧٢٨/١٠٣، وأبو داود: ١٢٥٠، والترمذي: ٤١٥، وإبن ماجه: ١١٤١.




**واتە: ئوممو حەبیبەی کچی ئەبو سوفیان (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر کەس دوازدە ڕکات نوێژی (سوننەت) بکات لە شەوو ڕۆژێکدا جگە لە نوێژی فەرز خوا ماڵێکی بۆ دروست دەکات لە بەهەشت.**

**١٧٩٧-** «عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، قُلْتُ لِعَطَاءٍ: بَلَغَنِي أَنَّكَ تَرْكَعُ قَبْلَ الْجُمُعَةِ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً، مَا بَلَغَكَ فِي ذَلِكَ؟ قَالَ: أُخْبِرْتُ أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ، حَدَّثَتْ عَنْبَسَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنْ رَكَعَ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ سِوَى الْمَكْتُوبَةِ بَنَى اللَّهُ ﷻ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ»(١).

**واتە: ئیبنو جورەیج بە عەطائی وت: هەواڵم پێ گەیشتووە تۆ پێش نوێژی هەینی دوازدە ڕکات دەکەیت، چیت پێگەیشتوە لەو بارەوە؟ (ئەویش) وتی: هەواڵم پێگەیشت ئوممو حەبیبە باسی کرد بۆ عەنبەسەی کوڕی ئەبو سوفیان ﵁، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس دوازدە ڕکات بکات، لە شەوو ڕۆژێکدا جگە لە نوێژی فەرز، خوا ماڵێکی بۆ دروست دەکات لە بەهەشتدا.**

**١٧٩٨-** «عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ صَلَّى فِي يَوْمٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً بَنَى اللَّهُ ﷻ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ» (٢).

**واتە: ئوممو حەبیبە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر کەس لە ڕۆژێکدا دوازدە ڕکات نوێژ بکات، خوا ماڵێکی بۆ دروست دەکات لە بەهەشتدا.**

**١٧٩٩-** «عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ، قَالَ: قَدِمْتُ الطَّائِفَ فَدَخَلْتُ عَلَى عَنْبَسَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا وَهُوَ بِالْمَوْتِ فَرَأَيْتُ مِنْهُ جَزَعاً، فَقُلْتُ: إِنَّكَ عَلَى خَيْرٍ، فَقَالَ: أَخْبَرَتْنِي أُخْتِي أُمُّ حَبِيبَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ صَلَّى ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً بِالنَّهَارِ أَوْ بِاللَّيْلِ بَنَى اللَّهُ ﷻ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ»(٣).

**واتە: یەعلای کوڕی ئومەییە دەڵێ: هاتمە طائیف سەردانی عەنبەسەی کوڕی ئەبو سوفیانم (خوا لێیان ڕازی بێ) کرد لە کاتی سەرەمەرگدا بوو، بینیم زۆر شپرزەو حاڵ**

---

**(١) صحيح لغيره.**

**(٢) صحيح.**

**(٣) صحيح الإسناد.**

خراپ بوو، وتم: تۆ لەسەر خێریت، جا وتی: خوشکەکەم ئوممو حەبیبە (کە خێزانی پێغەمبەری خوایە) هەواڵی پێ داوم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس دوازدە ڕکات بکات بە ڕۆژ یان بە شەو، خوا ماڵێکی بۆ دروست دەکات لە بەهەشت.

**١٨٠٠-** «عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ بِنْتِ أَبِي سُفْيَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَتْ: مَنْ صَلَّى ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً فِي يَوْمٍ فَصَلَّى قَبْلَ الظُّهْرِ بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ»[١].

واتە: ئوممو حەبیبەی کچی ئەبو سوفیان (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: هەر کەس دوازدە ڕکات نوێژ بکات لە ڕۆژێکدا پێش نیوەڕۆ، خوا ماڵێکی بۆ دروست دەکات لە بەهەشت.

**١٨٠١-** «عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: اثْنَتَا عَشْرَةَ رَكْعَةً مَنْ صَلَّاهُنَّ بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ، أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْعَصْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الصُّبْحِ»[٢].

واتە: ئوممو حەبیبە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوازدە ڕکات هەیە هەر کەس ئەنجامیان بدات خوا ماڵێکی بۆ دروست دەکات لە بەهەشتدا، چوار ڕکات پێش نیوەڕۆو دوو ڕکات لە دوای نوێژی نیوەڕۆ، دوو ڕکات پێش عەسر، دوو ڕکات دوای نوێژی ئێوارە، دوو ڕکاتیش پێش نوێژی بەیانی.

**١٨٠٢-** «عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ صَلَّى اثْنَتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ، أَرْبَعاً قَبْلَ الظُّهْرِ وَاثْنَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَاثْنَتَيْنِ قَبْلَ الْعَصْرِ، وَاثْنَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ، وَاثْنَتَيْنِ قَبْلَ الصُّبْحِ»[٣].

واتە: ئوممو حەبیبە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس دوازدە ڕکات بکات خوا ماڵێکی بۆ دروست دەکات لە ناو بەهەشتدا، چوار ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆو، دوو ڕکات لە دوای نوێژی نیوەڕۆو، دوو ڕکات پێش عەسرو، دوو ڕکات دوای نوێژی ئێوارەو، دوو ڕکاتیش پێش نوێژی بەیانی.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) ضعيف الإسناد.

(٣) ضعيف الإسناد.




**١٨٠٣-** «عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَنْ صَلَّى فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً سِوَى الْمَكْتُوبَةِ بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ، أَرْبَعاً قَبْلَ الظُّهْرِ وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَثِنْتَيْنِ قَبْلَ الْعَصْرِ، وَثِنْتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ، وَثِنْتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ»[١].

**واتە: ئوممو حەبیبە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هەر کەس لە شەوو ڕۆژێکدا دوازدە ڕکات نوێژ بکات جگە لە نوێژە فەڕزەکان، ماڵێکی بۆ دروست دەکرێ لە ناو بەهەشتدا، چوار ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆو، دوو ڕکات لە دوای نوێژی نیوەڕۆو، دوو ڕکات پێش عەسرو، دوو ڕکات دوای نوێژی ئێوارەو، دوو ڕکاتیش پێش نوێژی بەیانی.**

## جیاوازی لە سەر ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالد (لە بارەی ئەم فەرموودەوە)

**١٨٠٤-** «عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنِ الْمُسَيَّبِ بْنِ رَافِعٍ، عَنْ عَنْبَسَةَ بْن أَبي سُفْيَانَ، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ صَلَّى فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ»[٢].

**واتە: ئیسماعیل دەگێڕێتەوە: لە موسەییبی کوڕی ڕافیع، لە عەنبەسەی کوڕی ئەبو سوفیان، لە ئوممو حەبیبەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە شەوو ڕۆژێکدا دوازدە ڕکات نوێژ بکات، ماڵێکی بۆ دروست دەکرێ لە ناو بەهەشتدا.**

**١٨٠٥-** «عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنِ الْمُسَيَّبِ بْنِ رَافِعٍ، عَنْ عَنْبَسَةَ بْن أَبي سُفْيَانَ، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَتْ: مَنْ صَلَّى فِي اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً سِوَى الْمَكْتُوبَةِ بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ»[٣].

**واتە: ئیسماعیل دەگێڕێتەوە: لە موسەییبی کوڕی ڕافیع، لە عەنبەسەی کوڕی ئەبو سوفیان لە ئوممو حەبیبەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: هەرکەس لە شەوو ڕۆژێکدا دوازدە ڕکات نوێژ بکات جگە لە نوێژە فەرزەکان، ماڵێکی بۆ دروست دەکرێ لەناو بەهەشتدا.**

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**١٨٠٦-** «عَنْ إِسْمَاعِيلِ، عَنِ الْمُسَيَّبِ بْنِ رَافِعٍ، عَنْ عَنْبَسَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَتْ: مَنْ صَلَّى فِي يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً سِوَى الْمَكْتُوبَةِ بَنَى اللَّهُ ﷻ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ»[١].

**واتە: ئیسماعیل دەگێڕێتەوە: لە موسەییبی کوڕی ڕافیع، لە عەنبەسەی کوڕی ئەبو سوفیان لە ئوممو حەبیبەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: هەر کەسێ لە شەوو ڕۆژێکدا دوازدە ڕکات نوێژ بکات جگە لە نوێژە فەڕزەکان، خوای زاڵی پایەدار ماڵێکی بۆ دروست دەکات لەناو بەهەشتدا.**

**١٨٠٧-** «عَنْ حُصَيْنٍ، عَنِ الْمُسَيَّبِ بْنِ رَافِعٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ ذَكْوَانَ، قَالَ: حَدَّثَنِي عَنْبَسَةُ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا حَدَّثَتْهُ أَنَّهُ: مَنْ صَلَّى فِي يَوْمٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ»[٢].

**واتە: حوصەین دەگێڕێتەوە لە موسەییبی کوڕی ڕافع لە ئەبو صالەح زەکوان دەڵێ: عەنبەسەی کوڕی ئەبو سوفیان بۆی باس کردم ئوممو حەبیبە (خوا لێیان ڕازی بێ)، بۆی باس کرد: هەر کەس لە شەوو ڕۆژێکدا دوازدە ڕکات نوێژ بکات، ماڵێکی بۆ دروست دەکرێت لە ناو بەهەشتدا.**

**١٨٠٨-** «عَنْ حَمَّادٍ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ صَلَّى فِي يَوْمٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً سِوَى الْفَرِيضَةِ بَنَى اللَّهُ لَهُ، أَوْ بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ»[٣].

**واتە: حەماد دەگێڕێتەوە: لە عاصم، لە ئەبو صاڵح لە ئوممو حەبیبە (خوا لێی ڕازی بێ) وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە شەوو ڕۆژێکدا دوازدە ڕکات نوێژ بکات، جگە لە نوێژە فەڕزەکان، خوا ﷻ ماڵێکی بۆ دروست دەکات، یان ماڵێکی بۆ دروست دەکرێت لە ناو بەهەشتدا.**

**١٨٠٩-** «عَنْ حَمَّادٍ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ صَلَّى ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً فِي يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

**واتە: حەماد دەگێڕێتەوە: لە عاصم، لە ئەبو صاڵح لە ئوممو حەبیبەوە (خوا لێی ڕازی بێ) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە شەوو ڕۆژێکدا دوازدە ڕکات نوێژ بکات، خوا ماڵێکی بۆ دروست دەکات لە بەهەشتدا.**

**١٨١٠-** «عَنْ حَمَّادِ بن سَلَمَةَ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَنْ صَلَّى فِي يَوْمٍ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ»[١].

**واتە: حەمادی کوڕی سەلەمە دەگێڕێتەوە، لە عاصم، لە ئەبو صاڵح، لە ئوممو حەبیبەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هەر کەس لە شەوو ڕۆژێکدا دوازدە ڕکات نوێژ بکات، ماڵێکی بۆ دروست دەکرێت لە بەهەشتدا.**

**١٨١١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ صَلَّى فِي يَوْمٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً سِوَى الْفَرِيضَةِ بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە شەوو ڕۆژێکدا دوازدە ڕکات نوێژ بکات، جگە لە نوێژە فەڕزەکان، خوا ﷻ ماڵێکی بۆ دروست دەکات لە بەهەشتدا.**

**١٨١٢-** «عَنْ حَسَّانَ بْنِ عَطِيَّةَ، قَالَ: لَمَّا نُزِلَ بِعَنْبَسَةَ جَعَلَ يَتَضَوَّرُ، فَقِيلَ لَهُ، فَقَالَ: أَمَا إِنِّي سَمِعْتُ أُمَّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ تُحَدِّثُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: مَنْ رَكَعَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ وَأَرْبَعاً بَعْدَهَا حَرَّمَ اللَّهُ ﷻ لَحْمَهُ عَلَى النَّارِ، فَمَا تَرَكْتُهُنَّ مُنْذُ سَمِعْتُهُنَّ»[٣].

**واتە: حەسانی کوڕی عەطیە دەڵێ: کاتێ عەنبەسە لە سەرەمەرگدا بوو (لە دڵخۆشبوونی بە بەڵێنی پەروەردگاری) پلی دەخوارد، پێی وترا (بۆ ئەوەندە دڵخۆشیت)، (ئەویش) وتی: بەڵام من گوێم لە ئوممو حەبیبە (خوا لێی ڕازی بێ) بوو لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕایەوە، ئەو فەرموویەتی: هەر کەس چوار ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆ بکات، چوار ڕکاتیش لە دوایەوە، خوا ﷻ گۆشتی حەڕام دەکات لەسەر ئاگر (کە بیسووتێنێ)، لەو کاتەی بیستوومە هەرگیز وازم لێ نەهێناوە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه إبن ماجه: ١١٤٢.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٢٦٩، والترمذي: ٤٢٧ و ٤٢٨، وإبن ماجه: ١١٦٠.




١٨١٣- «عَنْ عَنْبَسَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَخْبَرَتْنِي أُخْتِي أُمُّ حَبِيبَةَ زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ حَبِيبَهَا أَبَا الْقَاسِمِ ﷺ أَخْبَرَهَا، قَالَ: مَا مِنْ عَبْدٍ مُؤْمِنٍ يُصَلِّي أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ بَعْدَ الظُّهْرِ فَتَمَسُّ وَجْهَهُ النَّارُ أَبَداً إِنْ شَاءَ اللَّهُ ﷻ»[١].

**واتە: عەنبەسەی کوڕی ئەبو سوفیان (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: خوشکەکەم ئوممو حەبیبە خێزانی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدام، کە خۆشەویستەکەی باوکی قاسم ﷺ هەواڵی پێداوەو فەرموویەتی: هیچ بەندەیەکی بڕوادار نیە چوار ڕکات نوێژ بکات دوای نیوەڕۆ، ئاگر ڕووخساری بسوتێنێ، ئەگەر خوا ویستی لە سەر بێت.**

١٨١٤- «عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: مَنْ صَلَّى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ وَأَرْبَعاً بَعْدَهَا حَرَّمَهُ اللَّهُ ﷻ عَلَى النَّارِ»[٢].

**واتە: ئوممو حەبیبە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر کەس چوار ڕکات بکات پێش نیوەڕۆو، چوار ڕکات لە دوایەوە خوا ﷻ ڕووخساری لە ئاگر حەڕام دەکات.**

١٨١٥- «عَن عَنْبَسَةَ بن أبي سُفْيَانَ عَن أُمِّ حَبِيبَةَ ﵂ ـ قَال مَرْوَانُ: وَكَانَ سَعِيدٌ إِذَا قُرِئَ عَلَيْهِ، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَقَرَّ بِذَلِكَ وَلَمْ يُنْكِرْهُ، وَإِذَا حَدَّثَنَا بِهِ هُوَ لَمْ يَرْفَعْهُ، قَالَتْ: مَنْ رَكَعَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ وَأَرْبَعاً بَعْدَهَا حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ» [٣].

**واتە: عەنبەسەی کوڕی ئەبو سوفیان دەگێڕێتەوە: لە ئوممو حەبیبە ﵂، مەڕوان دەڵێ: سەعید کاتێ فەرمودەدە بخوێنرایەتەوە بە سەریدا، لە ئوممو حەبیبەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ، دانی پێدادەناو ئینکاری نەدەکرد، وە ئەگەر خۆی بۆی باس بکردینایە نەیدەوت پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی، دەڵێ: هەر کەس چوار ڕکات بکات پێش نیوەڕۆو، چوار ڕکات لە دوایەوە خوا ئاگری لە سەر حەڕام دەکات.**

١٨١٦- «عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ مُوسَى يحدث عَنْ مُحَمَّدِ بن أَبِي سُفْيَانَ قَالَ: لَمَّا نَزَلَ بِهِ الْمَوْتُ أَخَذَهُ أَمْرٌ شَدِيدٌ، فَقَالَ: حَدَّثَتْنِي أُخْتِي أُمُّ حَبِيبَةَ بِنْتُ أَبِي سُفْيَانَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ حَافَظَ عَلَى أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ وَأَرْبَعٍ بَعْدَهَا حَرَّمَهُ اللَّهُ تَعَالَى عَلَى النَّارِ»[٤].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




واتە: سولەیمانی کوڕی موسا قسەی دەکرد دەربارەی موحەممەدی کوڕی ئەبو سوفیان، وتی: کاتێ کەوتە سەرەمەرگ تووشی سەختی و ناخۆشیەکی توند بوو، وتی: خوشکەکەم ئوممو حەبیبەی کچی ئەبو سوفیان ﵂ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس پارێزگاری بکات لە چوار ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆو، چوار ڕکات دوای نیوەڕۆ خوا ئاگری لە سەر حەرام دەکات.

**١٨١٧-** «عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ صَلَّى أَرْبَعاً قَبْلَ الظُّهْرِ وَأَرْبَعاً بَعْدَهَا لَمْ تَمَسَّهُ النَّارُ»[١].

واتە: ئوممو حەبیبە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس چوار ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆو، چوار ڕکات دوای نیوەڕۆ بکات، ئاگر بەری ناکەوێت.




## بابەت: ئاوات خواستنی مردن

**١٨١٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمُ الْمَوْتَ، إِمَّا مُحْسِناً فَلَعَلَّهُ أَنْ يَزْدَادَ خَيْراً، وَإِمَّا مُسِيئاً فَلَعَلَّهُ أَنْ يَسْتَعْتِبَ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با یەکێک لە ئێوە ئاواتی مردن نەخوازێت، (چونکە) یان چاکەخوازە بەڵکو لە ژیاندا خێرو چاکەی زیاتر بکات، یان گوناهبارە بەڵکو لە ژیاندا داوای لێخۆشبوون بکات و بگەڕێتەوە لە گوناح.**

**١٨١٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ، إِمَّا مُحْسِناً فَلَعَلَّهُ أَنْ يَعِيشَ يَزْدَادُ خَيْراً وَهُوَ خَيْرٌ لَهُ، وَإِمَّا مُسِيئاً فَلَعَلَّهُ أَنْ يَسْتَعْتِبَ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با یەکێک لە ئێوە ئاواتی مردن نەخوازێت، (چونکە) یان چاکەخوازە بەڵکو بژیێ و لە ژیانیدا خێرو چاکەی زیاتر بکات ئەوە بۆی چاکترە، یان گوناهبارە بەڵکو لە ژیانیدا داوای لێخۆشبوون بکات و بگەڕێتەوە لە گوناح.**

**١٨٢٠-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ فِي الدُّنْيَا، وَلَكِنْ لِيَقُلْ: اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْراً لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْراً لِي»[٣].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با یەکێک لە ئێوە ئاواتی مردن نەخوازێت، لەبەر زیانێک تووشی بووە لە دنیادا، بەڵکو بڵێت: خوایە بمژیێنە مادام ژیان خێری تێدایە بۆم، وە بممرێنە ئەگەر مردن خێری تێدایە بۆم.**

**١٨٢١-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَلَا لَا يَتَمَنَّى أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ، فَإِنْ كَانَ لَا بُدَّ مُتَمَنِّياً الْمَوْتَ فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْراً لِي، وَتَوَفَّنِي مَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْراً لِي»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٧٣ و ٧٢٣٥.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٧١ و ٦٣٥١ و ٧٢٣٣، ومسلم: ١٠ و ٢٦٨٠/١١، وأبو داود: ٣١٠٨ و ٣١٠٩، والترمذي: ٩٧١، وإبن ماجه: ٤٢٦٥.




**واتە: ئەنەس ﷛ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاگادار بن با یەکێک لە ئێوە ئاواتی مردن نەخوازێت، لەبەر زیانێک تووشی بووە، ئەگەر هەر ئاوات دەخوازێت با بڵێت: خوایە بمژێنە ئەوەندەی ژیان خێری تێدایە بۆم، وە بممرێنە ئەوکاتەی مردن خێری تێدایە بۆم.**

## نزاکردنی مردن

**١٨٢٢-** «عَنْ أَنَسٍ ﷛ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَدْعُوا بِالْمَوْتِ وَلَا تَتَمَنَّوْهُ، فَمَنْ كَانَ دَاعِياً لَا بُدَّ فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْراً لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْراً لِي»(١).

**واتە: ئەنەس ﷛ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: داوای مردن مەکەن و ئاواتی بۆ مەخوازن، ئەگەر کەسێک هەر داوا دەکات با بڵێ: خوایە بمژێنە ئەوەندەی ژیان خێری تێدایە بۆم، وە بممرێنە ئەو کاتەی مردن خێری تێدایە بۆم.**

**١٨٢٣-** «عَنْ قَيْسٍ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى خَبَّابٍ ﷛ وَقَدْ اكْتَوَى فِي بَطْنِهِ سَبْعاً وَقَالَ: لَوْلَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَانَا أَنْ نَدْعُوَ بِالْمَوْتِ دَعَوْتُ بِهِ»(٢).

**واتە: قەیس، دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای خەباب ﷛ لە حەوت شوێنەوە سکی داخ کردبوو (بۆ چارەسەر) وتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری داوا کردنی مردنی لێ نەکردینایە، ئەوە داوام دەکرد (خوا گیانم بکێشێ).**

## زۆر یادکردنەوەی مردن

**١٨٢٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷛ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَكْثِرُوا ذِكْرَ هَادِمِ اللَّذَّاتِ»(٣).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷛ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زۆر یادی ڕوخێنەرو (پچڕێنەری) چێژو لەزەتەکان بکەنەوە. (کە مردنە).**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٧٢ و ٦٣٤٩ و ٦٣٥٠، ومسلم: ٢٦٨١.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٣٠٧، وإبن ماجه: ٤٢٥٨.




**١٨٢٥-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِذَا حَضَرْتُمُ الْمَرِيضَ فَقُولُوا خَيْراً، فَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ يُؤَمِّنُونَ عَلَى مَا تَقُولُونَ، فَلَمَّا مَاتَ أَبُو سَلَمَةَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ أَقُولُ؟ قَالَ: قُولِي اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَنَا وَلَهُ، وَأَعْقِبْنِي مِنْهُ عُقْبَى حَسَنَةً، فَأَعْقَبَنِي اللَّهُ ﷻ مِنْهُ مُحَمَّداً ﷺ»[١].

**واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: کاتێ سەردانی نەخۆشتان کرد وتەی چاک بڵێن، چونکە فریشتەکان ئامین دەکەن بۆ ئەو وتانەی دەیڵێن، کاتێ ئەبو سەلەمە مرد، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، چێ بڵێم؟ فەرمووی: بڵێ: خوایە لە ئێمەو ئەویش خۆشبە، وە لە جیاتی ئەو چاکترم پێ ببەخشە، خوا ﷻ لە دوای ئەو موحەممەدی (پێغەمبەری خوا) پێ بەخشیم.**

## بابەت: تەلقین کردنی ئەو کەسەی لە سەرەمەرگە

**١٨٢٦-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ؓ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ»[٢].

**واتە: ئەبو سەعید ؓ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مردووەکانتان (واتە: ئەوانەی لە سەرەمەرگن) تەلقین بکەن بە (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) واتە: هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا.**

**١٨٢٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَقِّنُوا هَلْكَاكُمْ قَوْلَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مردووەکانتان تەلقین بکەن بە (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) واتە: هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا.**

## بابەت: نیشانەی مردنی بڕوادار

**١٨٢٨-** «عَنْ بُرَيْدَةَ ؓ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَوْتُ الْمُؤْمِنِ بِعَرَقِ الْجَبِينِ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٩١٩، وأبو داود: ٣١١٥، والترمذي: ٩٧٧، وإبن ماجه: ١٤٤٧.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩١٦، وأبو داود: ٣١١٧، والترمذي: ٩٧٦، وإبن ماجه: ١٤٤٥.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه الترمذي: ٩٨٢، وإبن ماجه: ١٤٥٢.




واتە: بورەیدە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (نیشانەی) مردنی بڕوادار بە ئارەقی ناوچاوانە.

**١٨٢٩-** «عَنْ بُرَيْدَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: الْمُؤْمِنُ يَمُوتُ بِعَرَقِ الْجَبِينِ»[١].

واتە: بورەیدە ﷺ دەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بڕوادار (یەک لە نیشانەکانی ئەوەیە) بە ئارەقی ناوچاوانەوە دەمرێت.

## سەختی و ناڕەحەتی مردن

**١٨٣٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَاتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَإِنَّهُ لَبَيْنَ حَاقِنَتِي وَذَاقِنَتِي، فَلَا أَكْرَهُ شِدَّةَ الْمَوْتِ لِأَحَدٍ أَبَداً بَعْدَ مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مرد لە کاتێکدا لە نێوان سنگ و چەناکەمدا بوو، (واتە: سەری لەسەر سنگی بوو) سەختی و ناڕەحەتی مردنی هیچ کەسێکم پێناخۆش و قورس نیە، دوای ئەوەی پێغەمبەری خوام بینی ﷺ (کە بەو ناڕەحەتیە وەفاتی فەرموو).

## مردن لە ڕۆژی دووشەممەدا

**١٨٣١-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: آخِرُ نَظْرَةٍ نَظَرْتُهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَشْفُ السِّتَارَةِ وَالنَّاسُ صُفُوفٌ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ، فَأَرَادَ أَبُو بَكْرٍ أَنْ يَرْتَدَّ، فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ أَنِ امْكُثُوا وَأَلْقَى السِّجْفَ، وَتُوُفِّيَ مِنْ آخِرِ ذَلِكَ الْيَوْمِ، وَذَلِكَ يَوْمُ الاثْنَيْنِ»[٣].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: دوایین تەماشاکردن کە تەماشای پێغەمبەری خوام ﷺ کرد ئەو کاتە بوو کە پەردەی ژوورەکەی لادا، کاتێ کە خەڵکی بە ڕیز وەستا بوو لە پشتی ئەبو بەکرەوە، ئەبو بەکر ویستی بێتە دواوە، ئاماژەی بۆ کردن لە شوێنی خۆتان بمێننەوە، پاشان پەردەکەی داخست، لە کۆتایی ئەو ڕۆژەدا کە ڕۆژی دووشەممە بوو کۆچی دوایی کرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٤٣٨ و ٤٤٤٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٨٠ و ٦٨١ و ٧٥٤ و ١٢٠٥ و ٤٤٤٨، ومسلم: ٩٨ و ٤١٩/١٠٠، وإبن ماجه: ١٦٢٤.




## مردن لە غەیری ئەو شوێنەی تێیدا لە دایک بووە

**١٨٣٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: مَاتَ رَجُلٌ بِالْمَدِينَةِ مِمَّنْ وُلِدَ بِهَا، فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ قَالَ: يَا لَيْتَهُ مَاتَ بِغَيْرِ مَوْلِدِهِ، قَالُوا: وَلِمَ ذَاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا مَاتَ بِغَيْرِ مَوْلِدِهِ قِيسَ لَهُ مِنْ مَوْلِدِهِ إِلَى مُنْقَطَعِ أَثَرِهِ فِي الْجَنَّةِ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک لە مەدینە مرد، کە لەوێ لە دایک بوو بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لە سەر کرد، پاشان فەرمووی: خۆزگە لە غەیری شوێنەکەی خۆی دەمرد. وتیان: بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بەڕاستی مرۆڤ ئەگەر لە غەیری شوێنی خۆی بمرێت، بۆی ئەندازە دەکرێ لەو شوێنەی تێیدا لە دایک بووە تا ئەو شوێنەی کۆچی دوایی تێدا کردوە لە بەهەشت.**

## بابەت: ئەو ڕێزەی لە بڕوادار دەگیرێ لە کاتی گیان دەرچوونی

**١٨٣٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِذَا حُضِرَ الْمُؤْمِنُ أَتَتْهُ مَلَائِكَةُ الرَّحْمَةِ بِحَرِيرَةٍ بَيْضَاءَ فَيَقُولُونَ: اخْرُجِي رَاضِيَةً مَرْضِيّاً عَنْكِ إِلَى رَوْحِ اللَّهِ، وَرَيْحَانٍ، وَرَبٍّ غَيْرِ غَضْبَانَ، فَتَخْرُجُ كَأَطْيَبِ رِيحِ الْمِسْكِ، حَتَّى أَنَّهُ لَيُنَاوِلُهُ بَعْضُهُمْ بَعْضاً، حَتَّى يَأْتُونَ بِهِ بَابَ السَّمَاءِ فَيَقُولُونَ: مَا أَطْيَبَ هَذِهِ الرِّيحَ الَّتِي جَاءَتْكُمْ مِنَ الْأَرْضِ، فَيَأْتُونَ بِهِ أَرْوَاحَ الْمُؤْمِنِينَ فَلَهُمْ أَشَدُّ فَرَحاً بِهِ مِنْ أَحَدِكُمْ بِغَائِبِهِ يَقْدَمُ عَلَيْهِ، فَيَسْأَلُونَهُ: مَاذَا فَعَلَ فُلَانٌ؟ مَاذَا فَعَلَ فُلَانٌ؟ فَيَقُولُونَ: دَعُوهُ فَإِنَّهُ كَانَ فِي غَمِّ الدُّنْيَا، فَإِذَا قَالَ: أَمَا أَتَاكُمْ؟ قَالُوا: ذُهِبَ بِهِ إِلَى أُمِّهِ الْهَاوِيَةِ، وَإِنَّ الْكَافِرَ إِذَا احْتُضِرَ أَتَتْهُ مَلَائِكَةُ الْعَذَابِ بِمِسْحٍ فَيَقُولُونَ: اخْرُجِي سَاخِطَةً مَسْخُوطاً عَلَيْكِ إِلَى عَذَابِ اللَّهِ ﷻ، فَتَخْرُجُ كَأَنْتَنِ رِيحِ جِيفَةٍ، حَتَّى يَأْتُونَ بِهِ بَابَ الْأَرْضِ، فَيَقُولُونَ: مَا أَنْتَنَ هَذِهِ الرِّيحَ حَتَّى يَأْتُونَ بِهِ أَرْوَاحَ الْكُفَّارِ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێ بڕوادار ئامادەی سەرە مەرگ دەبێ فریشتەی ڕەحمەت بە ئاوریشمی سپیەوە دێن بۆ لای پێی دەڵێن: دەربچۆ بە خۆشی و ڕازی بوون لێت بۆ لای ڕەحمەتی خوا، وە دەربچۆ**

---

(١) حسن.

(٢) صحيح.

وەک خۆشترین بۆن، بۆ لای پەروەردگارێک کە تووڕە نیە لێت، ئەویش دەردەچێ وەک خۆشترین بۆنی میسک، تا (فریشتەکان) هەندێکیان لە هەندێکی دیکەیان وەریدەگرن، ئینجا دەیبەن بۆ دەرگای ئاسمان دەڵێن: ئەم بۆنە خۆشە چیە لە زەویەوە بەرزبۆتەوە بۆ لاتان، ئینجا دەیبەن بۆ لای ڕووحی بڕواداران، ئەوان ئەوەندەیان پێ خۆشە زیاتر لەوەی کەسێک لە ئێوە خۆشەویستێکی نادیاری دەبینێتەوە، (پاش ماوەیەکی زۆر لە دابڕان)، ئینجا پرسیاری لێ دەکەن: فڵانە کەس چی کرد؟ ئەی فڵانە کەس چی کرد؟ ئینجا دەڵێن: وازی لێ بێنن بەڕاستی ئەو لە خەم و پەژارەی دونیادایە، دەڵێ: ئایا نەهاتەوە بۆ لاتان؟ ئەوانیش دەڵێن: بردرا بۆ لای دایکی کە هاویەیە (واتە: دۆزەخ)، وە بێگومان بێبڕوا ئەگەر لە سەرە مەرگدا بوو فریشتەی سزا دێن بۆ لای بە پۆشاکی ناسراو پێی دەڵێن: دەربچۆ بە تووڕەیی و تووڕە بوون لێت بۆ لای سزای خوا، هەروەکو بۆنێکی زۆر پیس و بۆگەن دەردەچێت، تا دەیبەن بۆ دەرگای سەر زەوی، دەڵێن، ئەم بۆنە ناخۆشە چیە تا دەیبەن بۆ لای ڕووحی بێبڕوایان.

## دەربارەی ئەو کەسەی حەز دەکات (بمرێ و) بە خوا بگات

**١٨٣٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ، قَالَ شُرَيْحٌ: فَأَتَيْتُ عَائِشَةَ، فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَذْكُرُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَدِيثاً إِنْ كَانَ كَذَلِكَ فَقَدْ هَلَكْنَا، قَالَتْ: وَمَا ذَاكَ؟ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَلَكِنْ لَيْسَ مِنَّا أَحَدٌ إِلَّا وَهُوَ يَكْرَهُ الْمَوْتَ، قَالَتْ: قَدْ قَالَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَلَيْسَ بِالَّذِي تَذْهَبُ إِلَيْهِ، وَلَكِنْ إِذَا طَمَحَ الْبَصَرُ، وَحَشْرَجَ الصَّدْرُ، وَاقْشَعَرَّ الْجِلْدُ فَعِنْدَ ذَلِكَ مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس حەز بکات بگات بە خوا، خواش حەز دەکات بە گەیشتنی، وە هەر کەس پێی ناخۆش بێ بگات بە خوا، خواش گەیشتنی ئەوی پێ ناخۆشە. شورەیح دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای عائیشە، وتم: ئەی دایکی بڕواداران، گوێم لێ بوو ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ باسی فەرموودەیەکی دەکرد، ئەگەر بەو شێوەیە بێ تیاچووین، وتی: ئەو

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٨٥.




فەرمووده چیه؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس حەز بکات بگات بە خوا، خواش حەز دەکات بە گەیشتنی، وە هەر کەس پێی ناخۆش بێ بگات بە خوا، خواش گەیشتنی ئەوی پێ ناخۆشە. بەڵام هیچ یەکێک لە ئێمە نیە ئیللا ڕقی لە مردنە، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) وتی: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی فەرمووە، بەڵام نەک بەو شێوەیەی تۆ بۆ تێگەیشتووی، بەڵکو ئەگەر چاو ئەبڵەق بوو، ڕووح گەیشتە غەرغەرەو سنگ توونـد بوو، پێستیشی تەزووی پێدا هات، ئەو کاتە هەر کەس حەز بکات بگات بە خوا، خواش حەز دەکات بە گەیشتنی، وە هەر کەس پێی ناخۆش بێ بگات بە خوا، خواش گەیشتنی ئەوی پێ ناخۆشە.

**١٨٣٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قَالَ اللَّهُ تَعالى: إِذَا أَحبَّ عَبْدِي لِقائي أَحْبَبْتُ لِقاءَهُ، وَإِذَا كَرِهَ لِقَائِي كَرِهْتُ لِقاءَهُ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا ﷻ فەرموویەتی: ئەگەر بەندەکەم حەز بکات بگاتە لام، منیش حەزم بە گەیشتنێتی، وە ئەگەر حەز نەکات بگاتە لام، منیش حەز بە گەیشتنی ئەو ناکەم.**

**١٨٣٦-** «عَنْ عُبَادَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللهِ أَحَبَّ اللهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللهِ كَرِهَ اللهُ لِقَاءَهُ»[٢].

**واتە: عوبادە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس حەز بکات بگات بە خوا، خواش حەز دەکات بە گەیشتنی، وە هەر کەس پێی ناخۆش بێ بگات بە خوا، خواش گەیشتنی ئەوی پێ ناخۆشە.**

**١٨٣٧-** «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ»[٣].

**واتە: عوبادەی کوڕی صامیت رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس حەز بکات بگات بە خوا، خواش حەز دەکات بە گەیشتنی، وە هەر کەس پێی ناخۆش بێ بگات بە خوا، خواش گەیشتنی ئەوی پێ ناخۆشە.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٥٠٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥٠٧، ومسلم: ٢٦٨٣، والترمذي: ١٠٦٦ و ٢٣٠٩.

(٣) صحيح.




**١٨٣٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ» زَادَ عَمْرٌو فِي حَدِيثِهِ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَرَاهِيَةُ لِقَاءِ اللَّهِ كَرَاهِيَةُ الْمَوْتِ، كُلُّنَا نَكْرَهُ الْمَوْتَ، قَالَ: ذَاكَ عِنْدَ مَوْتِهِ، إِذَا بُشِّرَ بِرَحْمَةِ اللَّهِ وَمَغْفِرَتِهِ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ وَأَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَإِذَا بُشِّرَ بِعَذَابِ اللَّهِ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ وَكَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس حەز بکات بگات بە خوا، خواش حەز دەکات بە گەیشتنی، وە هەر کەس پێی ناخۆش بێ بگات بە خوا، خواش گەیشتنی ئەوی پێ ناخۆشە. عەمر ئەوەشی زیاد کردوە، وترا ئەی پێغەمبەری خوا، حەز نەکردن بە گەیشتن بە خوا حەز نەکردنە لە مردن، هەموومان ڕقمان لە مردنە؟! (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەوە لە کاتی سەرەمەرگ دایە، کاتێ مژدەی پێدرا بە ڕەحمەت و لێخۆشبوونی خوا حەز دەکات بگات بە خوا، خواش حەزی بە گەیشتنێتی، کاتێ هەواڵی سزای خوای پێدەدرێ حەز ناکات لە گەیشتن بە خوا، خواش حەزی لە گەیشتنی ئەو نابێت.**

## ماچ کردنی مردوو

**١٨٣٩-** «عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَبَّلَ بَيْنَ عَيْنَيِ النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ مَيِّتٌ»[٢].

**واتە: عائیشە دەگێڕێتەوە: ئەبو بەکر (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێ) ماچی ناوچاوانی پێغەمبەری کرد ﷺ، کاتێ کە وەفاتی کردبوو.**

**١٨٤٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ قَبَّلَ النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ مَيِّتٌ»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: ئەبو بەکر ماچی ناوچاوانی پێغەمبەری کرد ﷺ، کاتێ کە مردبوو.**

**١٨٤١-** «عَنْ أَبُو سَلَمَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَقْبَلَ عَلَى فَرَسٍ مِنْ مَسْكَنِهِ بِالسُّنُحِ حَتَّى نَزَلَ، فَدَخَلَ الْمَسْجِدَ فَلَمْ يُكَلِّمِ النَّاسَ حَتَّى دَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ وَرَسُولُ اللَّهِ

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: تعليقاً بإثر ٦٥٠٧، ومسلم: ٢٦٨٤، والترمذي: ١٠٦٧، وإبن ماجه: ٤٢٦٤.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٤٥٥ و ٥٧٠٩، وإبن ماجه: ١٤٥٧.

ﷺ مُسَجًّى بِبُرْدٍ حِبَرَةٍ فَكَشَفَ عَنْ وَجْهِهِ، ثُمَّ أَكَبَّ عَلَيْهِ فَقَبَّلَهُ، فَبَكَى، ثُمَّ قَالَ: بَأَبِي أَنْتَ، وَاللَّهِ لَا يَجْمَعُ اللَّهُ عَلَيْكَ مَوْتَتَيْنِ أَبَداً أَمَّا الْمَوْتَةُ الَّتِي كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْكَ فَقَدْ مِتَّهَا»[١].

**واتە: ئەبو سەلەمە دەگێڕێتەوە: عائیشە هەواڵی پێدا (لە ڕۆژی مردنی پێغەمبەری خوا ﷺ) ئەبو بەکر (خوا لێیان ڕازی بێ) سواری ئەسپەکەی بوو لە شوێنی نیشتەجێ بوونی لە سونوح تا گەیشت لایان، ئینجا چووە ناو مزگەت قسەی لەگەڵ کەس نەکرد، چووە ژوورەوە بۆ لای عائیشە پێغەمبەری خوا ﷺ داپۆشرابوو بە کراسێکی خەتدار بان چاوی لادا (کراسەکەی لەسەر ڕووخساری موبارەک و نوورانی لادا)، پاشان باوەشی پێدا کردو ماچی کرد، دەستی کرد بە گریان، پاشان فەرمووی: باوکم بە قوربانت بێت، سوێند بە خوا، هەرگیز خوا دوو مردنت پێکەوە بۆ کۆ ناکاتەوە، ئەو مردنەی خوا لەسەرتی نووسیبوو چەشتت.**

## داپۆشینی مردوو

**١٨٤٢-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: جِيءَ بَأَبِي يَوْمَ أُحُدٍ وَقَدْ مُثِّلَ بِهِ، فَوُضِعَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَقَدْ سُجِّيَ بِثَوْبٍ، فَجَعَلْتُ أُرِيدُ أَنْ أَكْشِفَ عَنْهُ، فَنَهَانِي قَوْمِي، فَأَمَرَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ فَرُفِعَ، فَلَمَّا رُفِعَ سَمِعَ صَوْتَ بَاكِيَةٍ، فَقَالَ: مَنْ هَذِهِ؟ فَقَالُوا: هَذِهِ بِنْتُ عَمْرٍو أَوْ أُخْتُ عَمْرٍو، قَالَ: فَلَا تَبْكِي أَوْ فَلِمَ تَبْكِي مَا زَالَتِ الْمَلَائِكَةُ تُظِلُّهُ بِأَجْنِحَتِهَا حَتَّى رُفِعَ»[٢].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی ئوحود باوکمیان هێنابوو شێواندبوویان (واتە: دەستکاری لاشەیان کردبوو)، خرایە بەردەست پێغەمبەری خوا ﷺ بە پۆشاکێک داپۆشرابوو، ویستم پۆشاکەکە لەسەری لابەم، بەڵام کەسوکارەکەم ڕێگریان لێ کردم، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد پۆشاکەکەیان بەرز کردەوە، کاتێ بەرز کرایەوە گوێی لە دەنگی گریانێک بوو، فەرمووی: ئەوە کێیە؟ وتیان: ئەوە کچی عەمرە، یان خوشکی عەمرە، فەرمووی: مەگری بەردەوام فریشتەکان بە باڵەکانیان دەوریان دابوو تا بەرز کرایەوە (بۆ ئاسمان).**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٤١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٤٤ و ١٣٩٣ و ٢٨١٦، ومسلم: ١٢٩ و ٢٣٧١/١٣٠.

## دەربارەی گریان لەسەر مردوو

**١٨٤٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَمَّا حُضِرَتْ بِنْتٌ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ صَغِيرَةٌ فَأَخَذَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَضَمَّهَا إِلَى صَدْرِهِ، ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ عَلَيْهَا فَقَضَتْ وَهِيَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَبَكَتْ أُمُّ أَيْمَنَ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَا أُمَّ أَيْمَنَ، أَتَبْكِينَ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ عِنْدَكِ، فَقَالَتْ: مَا لِي لَا أَبْكِي وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَبْكِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنِّي لَسْتُ أَبْكِي، وَلَكِنَّهَا رَحْمَةٌ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْمُؤْمِنُ بِخَيْرٍ عَلَى كُلِّ حَالٍ تُنْزَعُ نَفْسُهُ مِنْ بَيْنِ جَنْبَيْهِ وَهُوَ يَحْمَدُ اللَّهَ ﷻ»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێ کچە بچکۆلەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەمەرگدا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ گرتی و نوساندنی بە سنگیەوە، پاشان دەستی لەسەری داناو ڕووحی سپارد لەبەر دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئوممو ئەیمەن دەستی کرد بە گریان، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەی ئوممو ئەیمەن، ئەوە چیە دەگریت لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە لاتە، وتی: ئەی چۆن نەگریم لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا دەگری، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی من ناگریم، بەڵکو ئەوە ڕەحمەتێکە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بڕوادار لە هەموو دۆخێکدا لە خێردایە، ڕووح لە پێش چاوی دەکێشرێ، ئەو هەر ستایشی خوای زاڵی پایەدار دەکات.**

**١٨٤٤-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ فَاطِمَةَ بَكَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حِينَ مَاتَ فَقَالَتْ: يَا أَبَتَاهُ مِنْ رَبِّهِ مَا أَدْنَاهُ؟ يَا أَبَتَاهُ إِلَى جِبْرِيلَ نَنْعَاهْ، يَا أَبَتَاهُ جَنَّةُ الْفِرْدَوْسِ مَأْوَاهُ»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد فاطیمە گریا، وتی: ئای باوکی من چەندە لە پەروەردگارت نزیکی، ئای باوکی من هەواڵی مردنت دەدەین بە جبریل، ئای باوکی من بەهەشتی فیردەوس جێگاتە.**

**١٨٤٥-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ أَبَاهُ قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ قَالَ: فَجَعَلْتُ أَكْشِفُ عَنْ وَجْهِهِ وَأَبْكِي، وَالنَّاسُ يَنْهَوْنِي، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يَنْهَانِي، وَجَعَلَتْ عَمَّتِي تَبْكِيهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَبْكِيهِ مَا زَالَتِ الْمَلَائِكَةُ تُظِلُّهُ بِأَجْنِحَتِهَا حَتَّى رَفَعْتُمُوهُ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٤٦٢، وإبن ماجه: ١٦٣٠.

(٣) صحيح.




واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: باوکی لە ڕۆژی ئوحود کوژرا، دەڵێ: منیش ڕوخساریم دەرخستبوو و دەگریام، خەڵکەکەش ڕێگریان لێ دەکردم، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێ نەدەکردم، پووریشم هەر بۆی دەگریا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بۆی مەگری بەردەوام فریشتەکان دایانپۆشیوە بە باڵەکانیان تا بەرزتان کردەوە.

## قەدەغەکردن لە گریان لەسەر مردوو

**١٨٤٦-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَتِيكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ جَاءَ يَعُودُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ ثَابِتٍ فَوَجَدَهُ قَدْ غُلِبَ عَلَيْهِ، فَصَاحَ بِهِ، فَلَمْ يُجِبْهُ فَاسْتَرْجَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ: قَدْ غُلِبْنَا عَلَيْكَ أَبَا الرَّبِيعِ، فَصِحْنَ النِّسَاءُ وَبَكَيْنَ، فَجَعَلَ ابْنُ عَتِيكٍ يُسَكِّتُهُنَّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: دَعْهُنَّ فَإِذَا وَجَبَ فَلَا تَبْكِيَنَّ بَاكِيَةٌ، قَالُوا: وَمَا الْوُجُوبُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: الْمَوْتُ، قَالَتِ ابْنَتُهُ: إِنْ كُنْتُ لَأَرْجُو أَنْ تَكُونَ شَهِيداً قَدْ كُنْتَ قَضَيْتَ جِهَازَكَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَإِنَّ اللَّهَ ﷻ قَدْ أَوْقَعَ أَجْرَهُ عَلَيْهِ عَلَى قَدْرِ نِيَّتِهِ، وَمَا تَعُدُّونَ الشَّهَادَةَ؟ قَالُوا: الْقَتْلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الشَّهَادَةُ سَبْعٌ سِوَى الْقَتْلِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ: الْمَطْعُونُ شَهِيدٌ، وَالْمَبْطُونُ شَهِيدٌ، وَالْغَرِيقُ شَهِيدٌ، وَصَاحِبُ الْهَدَمِ شَهِيدٌ، وَصَاحِبُ ذَاتِ الْجَنْبِ شَهِيدٌ، وَصَاحِبُ الْحَرَقِ شَهِيدٌ، وَالْمَرْأَةُ تَمُوتُ بِجُمْعٍ شَهِيدَةٌ»[(١)].

واتە: جابری کوڕی عەتیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ هات سەردانی عەبدوڵڵای کوڕی ثابتی کرد تەماشای کرد مردن زۆری بۆ هێناوە، بە دەنگی بەرزەوە بانگی کرد، هیچ وەڵامی نەدایەوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُون)ی کردو فەرمووی: بەڕاستی خوا زاڵە بەسەرماندا لەسەر مردنت ئەی باوکی ڕەبیع. (ئەگەرنا ژیانی تۆ لە لای ئێمە خۆشەویستە) ئافرەتەکان دەستیان کرد بە هاوار و گریان، ئیبنو عەتیکیش بێدەنگی دەکردن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وازیان لێ بێنە ئەگەر (وجوب) ڕویدا با ئیتر نەگرین. وتیان: (الوجوب) چیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: مردنە، کچەکەی وتی: من ئومێدم هەیە تۆ شەهید بێت، چونکە لە سەر کردەوەی چاک مردویت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان خوای زاڵی پایەدار پاداشتی باوکتی نوسیوە لە سەر خۆی بە ئەندازەی نیەتەکەی، ئێوە شەهیدی بە چی دەزانن؟ وتیان: کوژران لە پێناوی خوای زاڵی پایەدار، پێغەمبەری

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣١١١.




خوا ﷺ فەرمووی: شەهیدی حەوت دانەیە جگە لە کوژران لە پێناوی خوادا: ئەو کەسەی بە تاعون دەمرێ شەهیدە، (کەسی مردوو بە) سک ئێشە شەهیدە، خنکاو شەهیدە، ئەو کەسەی دیواری بەسەردار دەڕوخێ شەهیدە، دوومەڵی گەورە کە لە لاتەنیشتەوە دەردەچێ و دەبێتە مایەی کوشتنی خاوەنەکەی شەهیدە، (واتە: هەو کردنی تەنیشتەکان کە بریتیە لە هەوکردنی کلییەکان و قەفەسی سنگ)، ئەوەیشی دەسوتێنرێت شەهیدە، ئەو ئافرەتەی بە هۆی دانانی منداڵبوونەوە دەمرێت شەهیدە.

**١٨٤٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: لَمَّا أَتَى نَعْيُ زَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ، وَجَعْفَرِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ رَوَاحَةَ جَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعْرَفُ فِيهِ الْحُزْنُ وَأَنَا أَنْظُرُ مِنْ صِئْرِ الْبَابِ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّ نِسَاءَ جَعْفَرٍ يَبْكِينَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: انْطَلِقْ فَانْهَهُنَّ، فَانْطَلَقَ ثُمَّ جَاءَ فَقَالَ: قَدْ نَهَيْتُهُنَّ فَأَبَيْنَ أَنْ يَنْتَهِينَ، فَقَالَ: انْطَلِقْ فَانْهَهُنَّ، فَانْطَلَقَ ثُمَّ جَاءَ، فَقَالَ: قَدْ نَهَيْتُهُنَّ فَأَبَيْنَ أَنْ يَنْتَهِينَ، قَالَ: فَانْطَلِقْ فَاحْثُ فِي أَفْوَاهِهِنَّ التُّرَابَ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ: أَرْغَمَ اللَّهُ أَنْفَ الْأَبْعَدِ، إِنَّكَ وَاللَّهِ مَا تَرَكْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَمَا أَنْتَ بِفَاعِلٍ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: کاتێ هەواڵی کوشتنی زەیدی کوڕی حاریسەو جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب و عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە هات، پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت خەمباری پێوە دیار بوو، من لە درزی دەرگاکەوە تەماشام دەکرد، پیاوێک هات بۆ لای، وتی: ژنەکانی جەعفەر دەگرین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بڕۆ ڕێگریان لێ بکە، کابرا چوو پاشان گەڕایەوە وتی: ڕێگریم لێکردن بە قسەیان نەکردم، ئینجا فەرمووی: بڕۆ ڕێگریان لێ بکە. دیسانەوە کابرا ڕۆیی و پاشان گەڕایەوە، وتی: ڕێگریم لێکردن بە قسەیان نەکردم، وتی: بڕۆ خۆڵ لە دەمیان بکە، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: خوا لووتی ئەوە بکات بە خۆڵدا کە دوورە (لە تورەییدا ئاوای وت) سوێند بە خوا ئازاری پێغەمبەری خواتدا ﷺ لەوەی نەتتوانی بێدەنگیان بکەیت.

**١٨٤٨-** «عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْمَيِّتُ يُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٩٩ و ١٣٠٥ و ٤٢٦٣، ومسلم: ٩٣٥، وأبو داود: ٣١٢٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٩٢، ومسلم: ١٦ و ٩٢٧/١٨، والترمذي: ١٠٠٢، وإبن ماجه: ١٥٩٣.




**واتە: عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: مردوو سزا دەدرێ بە گریانی کەسوکارەکەی لەسەری. (ئەگەر خۆی هۆکار بێت و لە ژیانیدا پێی ڕازی بوو بێت، یان وەصیەتی کردبێ وای بۆ بکرێ).**

**١٨٤٩-** «عَنْ مُحَمَّد بْن سِيرِين، يَقُولُ: ذُكِرَ عِنْدَ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ الْمَيِّتُ يُعَذَّبُ بِبُكَاءِ الْحَيِّ، فَقَالَ عِمْرَانُ: قَالَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[١].

**واتە: موحەممەدی کوڕی سیرین دەڵێ: باس کرا لە لای عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ: مردوو سزا دەدرێت بە گریانی دەورو بەرەکەی، عیمران وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی فەرمووە.**

**١٨٥٠-** «عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يُعَذَّبُ الْمَيِّتُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ»[٢].

**واتە: عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مردوو سزا دەدرێت بە گریانی کەسوکارەکەی لەسەری.**

## شیوەن و هات و هاوارو گریان لەسەر مردوو

**١٨٥١-** «عَنْ قَيْس بْن عَاصِمٍ ﷺ قَالَ: لَا تَنُوحُوا عَلَيَّ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يُنَحْ عَلَيْهِ»[٣].

**واتە: قەیسی کوڕی عاصم ﷺ دەڵێ: شیوەن مەکەن بەسەرمدا، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ شیوەن نەکرا بەسەریدا.**

**١٨٥٢-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَخَذَ عَلَى النِّسَاءِ حِينَ بَايَعَهُنَّ أَنْ لَا يَنُحْنَ، فَقُلْنَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ نِسَاءً أَسْعَدْنَنَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ أَفَنُسْعِدُهُنَّ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا إِسْعَادَ فِي الْإِسْلَامِ»[٤].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵێنی لە ئافرەتان وەرگرت کاتێ بەیعەتی لێیان وەرگرت بە هیچ شێوەیەک شیوەن نەکەن، وتیان: ئەی پێغەمبەری**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢٢٢، والترمذي: ١٦٠١، وإبن ماجه: ١٨٨٥.




**خوا، ئافرەتانێک لە سەردەمی نەفامیدا شیوەنیان کردوە بۆمان و هۆنراوەیان وتووە ئایا ئێمە شیوەنیان بۆ بکەین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: شیوەن و هۆنراوە هۆنینەوە نیە لە ئیسلامدا.**

**١٨٥٣-** «عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: الْمَيِّتُ يُعَذَّبُ فِي قَبْرِهِ بِالنِّيَاحَةِ عَلَيْهِ»[1].

**واتە: عومەر ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: مردوو لە ناو گۆڕەکەیدا سزا دەدرێ بە هۆی شیوەن کردن بە سەریدا.**

**١٨٥٤-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: الْمَيِّتُ يُعَذَّبُ بِنِيَاحَةِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: أَرَأَيْتَ رَجُلاً مَاتَ بِخُرَاسَانَ وَنَاحَ أَهْلُهُ عَلَيْهِ هَاهُنَا، أَكَانَ يُعَذَّبُ بِنِيَاحَةِ أَهْلِهِ؟ قَالَ: صَدَقَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَكَذَبْتَ أَنْتَ»[2].

**واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: مردوو سزا دەدرێت بە شیوەن کردنی کەس و کارەکەی لە سەری، پیاوێک پێی وت: ئەی ئەگەر کەسێک لە خوراسان مردبێت و خانەوادەکەی لێرە شیوەن بکەن بە سەریدا، ئایا سزا دەدرێت بە شیوەنی کەس و کارەکەی؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستی کردو تۆ درۆت کرد، (واتە: ئەگەر گومان ببەی لە سزادانی ئەوە گومانەکەت درۆیە و ڕاستیەکە قسەی پێغەمبەرە ﷺ).**

**١٨٥٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِعَائِشَةَ فَقَالَتْ: وَهِلَ، إِنَّمَا مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى قَبْرٍ، فَقَالَ: إِنَّ صَاحِبَ الْقَبْرِ لَيُعَذَّبُ، وَإِنَّ أَهْلَهُ يَبْكُونَ عَلَيْهِ، ثُمَّ قَرَأَتْ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ١٦٤﴾ الأنعام»[3].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە ڕاستی مردوو سزا دەدرێت بە گریانی کەس و کاری لە سەری، ئەوە بۆ عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) باسکرا وتی: هەڵەی کرد، بەڵکو (بابەتەکە بەو شێوەیەیە) پێغەمبەر ﷺ بە لای گۆڕێکدا تێپەڕ بوو، فەرمووی: بەڕاستی خاوەن ئەم گۆڕە سزا**

---

**(١) صحيح.**

**(٢) ضعيف الإسناد.**

**(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩٧٨، ومسلم: ٩٣١ و ٩٣٢، وأبو داود: ٣١٢٩.**




دەدرێت، وە بەڕاستی کەس و کارەکەی لە سەری دەگرین، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۝١٦٤﴾.

**١٨٥٦-** «عَنْ عَمْرَةَ، أَنَّهَا سَمِعَتْ عَائِشَةَ وَذُكِرَ لَهَا أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبُكَاءِ الْحَيِّ عَلَيْهِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: يَغْفِرُ اللَّهُ لِأَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَمَا إِنَّهُ لَمْ يَكْذِبْ وَلَكِنْ نَسِيَ أَوْ أَخْطَأَ، إِنَّمَا مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى يَهُودِيَّةٍ يُبْكَى عَلَيْهَا، فَقَالَ: إِنَّهُمْ لَيَبْكُونَ عَلَيْهَا وَإِنَّهَا لَتُعَذَّبُ»[١].

**واتە: عەمرە دەگێڕێتەوە: گوێی لە عائیشە بوو، بۆی باسکرا کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: مردوو سزا دەدرێت بە گریانی زیندووەکان (واتە: خزم و کەسی) لە سەری، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) وتی: خوا لە ئەبو عەبدووڕەحمان (واتە: ئیبنو عومەر) خۆش بێت، بێگومان ئەو درۆی نەکردوە، بەڵکو یان بیری چووە، یان هەڵەی کردوە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بەلای گۆڕی ئافرەتێکی جوولەکەدا (خزم و کەسەکەی) بەسەریدا دەگریان، فەرمووی: ئەوان بەسەریدا دەگرین و ئەویش سزا دەدرێت.**

**١٨٥٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: إِنَّمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ يَزِيدُ الْكَافِرَ عَذَاباً بِبَعْضِ بُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس دەگێڕێتەوە عائیشە ﷺ دەڵێ: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا ﷻ سزای بێبڕوا زیاد دەکات بە هەندێک لە گریانی خزم وکەسەکانی لەسەری.**

**١٨٥٨-** «عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، يَقُولُ: لَمَّا هَلَكَتْ أُمُّ أَبَانَ حَضَرْتُ مَعَ النَّاسِ، فَجَلَسْتُ بَيْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ وَابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ فَبَكَيْنَ النِّسَاءُ، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: أَلَا تَنْهَى هَؤُلَاءِ عَنِ الْبُكَاءِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبَعْضِ بُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ، قَدْ كَانَ عُمَرُ، يَقُولُ بَعْضَ ذَلِكَ: خَرَجْتُ مَعَ عُمَرَ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْبَيْدَاءِ رَأَى رَكْباً تَحْتَ شَجَرَةٍ، فَقَالَ: انْظُرْ مَنِ الرَّكْبُ، فَذَهَبْتُ فَإِذَا صُهَيْبٌ وَأَهْلُهُ، فَرَجَعْتُ إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، هَذَا

---

**(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٨٩، ومسلم: ٩٣٢/٢٧، والترمذي: ١٠٠٦.**

**(٢) صحيح.**

صُهَيْبٌ وَأَهْلُهُ، فَقَالَ: عَلَيَّ بِصُهَيْبٍ، فَلَمَّا دَخَلْنَا الْمَدِينَةَ أُصِيبَ عُمَرُ، فَجَلَسَ صُهَيْبٌ يَبْكِي عِنْدَهُ يَقُولُ: وَا أُخَيَّاهُ وَا أُخَيَّاهُ، فَقَالَ عُمَرُ: يَا صُهَيْبُ لَا تَبْكِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبَعْضِ بُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ قَالَ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَائِشَةَ، فَقَالَتْ أَمَا وَاللَّهِ مَا تُحَدِّثُونَ هَذَا الْحَدِيثَ عَنْ كَاذِبَيْنِ مُكَذَّبَيْنِ، وَلَكِنَّ السَّمْعَ يُخْطِئُ، وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْقُرْآنِ لَمَا يَشْفِيكُمْ: ﴿ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿٣٨﴾ ﴾النجم، وَلَكِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ لَيَزِيدُ الْكَافِرَ عَذَاباً بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ»[١].

واتە: ئیبنو ئەبو مولەیکە دەڵێ: کاتێ دایکی ئەبان کۆچی دوایی کرد لەگەڵ خەڵکی ئامادە بووم، دانیشتم لە نێوان عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو ئیبنو عەبباس ، ئافرەتان دەگریان، ئیبنو عومەر وتی: ئایا ڕێگری لەوانە ناکەی لە گریان، چونکە گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: بەڕاستی مردوو سزا دەدرێت بە هەندێ گریانی کەسوکاری لە سەری، ئیبنو عەبباس وتی: بێگومان ئیبنو عومەریش ئەوە دەڵێ، لەگەڵ عومەر دەرچووم تا گەیشتین بە چۆڵەوانیەک، کاروانیەکی بینی لە ژێر دارێکدا، وتی: تەماشا بکە بزانە ئەو کاروانیە کێن؟ ڕۆیشتم تەماشام کرد صوهەیب و خانەوادەکەی بوو، منیش گەڕامەوە بۆ لای وتم: ئەی گەورەی بڕواداران ئەوە صوهەیب و خانەوادەکەیەتی، ئەویش وتی: صوهەیبم بۆ بێنە، کاتێ گەڕاینەوە بۆ مەدینە درا لە عومەرو (بە خەنجەر پێکرا لە کاتی نوێژ کردندا) صوهەیب دانیشتبوو لەلای دەگریا و دەیوت: ئەی هاوار بۆ براکەم، ئەی هاوار بۆ براکەم، عومەر وتی: ئەی صوهەیب مەگری، چونکە من گویم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: بەڕاستی مردوو سزا دەدرێت بە هەندێ گریانی کەسوکاری لەسەری، دەڵێ: ئەوەم بۆ عائیشە باس کرد، وتی: سوێند بە خوا ئەم فەرموودەیە لە دوو کەسی درۆزنەوە ناگێڕدرێنەوە، بەڵام بیستن (واتە: گوێیە) هەڵە دەکات، بێگومان لە قورئان شتانێک هەیە بۆ ئێوە چارەسەری (ئەوە)تان بۆ دەکات، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خوا سزای بێبڕوا زیاد دەکات بە گریانی کەسوکاری لەسەری.

تێبینی: مەبەستی دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿٣٨﴾ ﴾النجم، واتە: کەس گوناهی کەسی دیکە هەڵناگرێ، هەر کەس خاوەنی گوناهی خۆیتی لە دواڕۆژ، ئەوان بە هەڵە ئەم فەرموودەیان بیستوە.

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٨٦ و ١٢٨٧، ومسلم: ٢٢ و ٩٢٨/٢٣.

هەندێک لە زانایان وا تەفسیری ئەم فەرموودەیان کردوەو دەڵێن: ئەگەر کەسێک پێش ئەوەی بمرێ، وەسیەت بکات دوای مردنی شیوەن و ڕۆ ڕۆی بۆ بکرێ و کاری ناشەری لەسەر ئەنجام بدرێ، ئەوە بێگومان بەشدارە لە گوناهەکەو ئەم ئایەتە لەو کاتەدا ناگیرێتەوە، بۆیە بە ئەندازەی گریان و شیوەنی خزم و کەسەکەی سزا دەدرێت، (والله أعلم).

## بابەت: ڕێگەدانی گریان لەسەر مردوو

**١٨٥٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: مَاتَ مَيِّتٌ مِنْ آلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَاجْتَمَعَ النِّسَاءُ يَبْكِينَ عَلَيْهِ، فَقَامَ عُمَرُ يَنْهَاهُنَّ وَيَطْرُدُهُنَّ، فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: دَعْهُنَّ يَا عُمَرُ فَإِنَّ الْعَيْنَ دَامِعَةٌ، وَالْقَلْبَ مُصَابٌ، وَالْعَهْدَ قَرِيبٌ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کەسێک لە خانەوادەی پێغەمبەری خوا ﷺ مرد، ئافرەتان کۆبوونەوە لەسەری دەگریان، عومەر هەڵسا ڕێگری کردن و دەریکردن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وازیان لێ بێنە ئەی عومەر، بێگومان چاو فرمێسک دەڕێژێ و دڵ خەمبارەو تووشی موصیبەت بووەو، ڕووداوەکەش تازە ڕوویداوە.

## هات و هاوار کردنی سەردەمی نەفامی لەسەر مردوودا

**١٨٦٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ، وَشَقَّ الْجُيُوبَ، وَدَعَا بِدُعَاءِ الْجَاهِلِيَّةِ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ئێمە نیە ئەو کەسەی لە ڕوومەتی خۆی دەداو یەخەی خۆی دادەدڕێ و هاوارو واوەیلێ دەکات وەک سەردەمی نەفامی.

---

(١) ضعيف. أخرجه إبن ماجه: ١٥٨٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٩٤ و ١٢٩٧ و ١٢٩٨ و ٣٥١٩، ومسلم: ١٦٥ و ١٠٣/١٦٦، والترمذي: ٩٩٩، وإبن ماجه: ١٥٨٤.




## گریان بە دەنگی بەرز لەسەر مردوودا

**١٨٦١-** «عَنْ صَفْوَانَ بْنِ مُحْرِزٍ ﷺ قَالَ: أُغْمِيَ عَلَى أَبِي مُوسَى فَبَكَوْا عَلَيْهِ، فَقَالَ: أَبْرَأُ إِلَيْكُمْ كَمَا بَرِئَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيْسَ مِنَّا مَنْ حَلَقَ، وَلَا خَرَقَ، وَلَا سَلَقَ»[١].

**واتە: صەفوانی کوڕی موحریز ﷺ دەڵێ: ئەبو موسا بێهۆش کەوت کەسوکارەکەی بەسەریدا گریان، وتی: من بەریم لێتان چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی بەری کرد لێیان، فەرمووی: لە ئێمە نیە ئەو کەسەی لە کاتی بەڵاو موصیبەت سەری، یان ڕیشی بتاشێ و سنگی دادەڕێ و دەنگی بەرز بکاتەوە بە گریان.**

## لێدانی ڕوخسار لە کاتی مردن یان نەخۆش کەوتنی کەسێکی نزیک

**١٨٦٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ، وَشَقَّ الْجُيُوبَ، وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ»[٢].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە ئێمە نیە ئەو کەسەی لە ڕوومەتی خۆی دەداو یەخەی خۆی دادەدڕێ و هاوارو واوەیلێ دەکات وەک سەردەمی نەفامی (بە هۆی مردن، یان نەخۆش کەوتنی کەسێکی).**

## سەر تاشین یان ڕیش تاشین لە کاتی مردن
## یان نەخۆش کەوتنی کەسێکی نزیک

**١٨٦٣-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، وَأَبِي بُرْدَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَا: لَمَّا ثَقُلَ أَبُو مُوسَى أَقْبَلَتِ امْرَأَتُهُ تَصِيحُ، قَالَا: فَأَفَاقَ، فَقَالَ: أَلَمْ أُخْبِرْكِ أَنِّي بَرِيءٌ مِمَّنْ بَرِئَ مِنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَا: وَكَانَ يُحَدِّثُهَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَنَا بَرِيءٌ مِمَّنْ حَلَقَ، وَخَرَقَ، وَسَلَقَ»[٣].

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی یەزید و ئەبو بوردە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێن: کاتێ ئەبو موسا بێهۆش کەوت ئافرەتێک هات و هاواری کردو قیژاندی، وتیان:**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٤.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٩٦ تعليقاً، ومسلم: ١٠٤، وإبن ماجه: ١٥٨٦.




هات بە هۆشدا، وتی: ئایا پێم نەوتی من بەریم لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێی بەریە، (عەبدوڕڕەحمانی کوڕی یەزید و ئەبو بوردە) دەڵێن: بۆی باس کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من بەریم لەو کەسەی سەری، یان ڕیشی دەتاشێ و، سنگی دادەدڕێ و هات و هاوار دەکات.

## سنگ دادڕین بەسەر مردوو یان نەخۆش

**١٨٦٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ، وَشَقَّ الْجُيُوبَ، وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ»(١).

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە ئێمە نیە ئەو کەسەی لە ڕوومەتی خۆی دەداو یەخەی خۆی دادەدڕێ و هاوارو واوەیلێ دەکات وەک سەردەمی نەفامی.

**١٨٦٥-** «عَنْ يَزِيد بن أَوْسٍ، عَن أَبِي مُوسَى ﷺ، أَنَّهُ أُغْمِيَ عَلَيْهِ فَبَكَتْ أُمُّ وَلَدٍ لَهُ، فَلَمَّا أَفَاقَ، قَالَ لَهَا: أَمَا بَلَغَكِ مَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ؟ فَسَأَلْنَاهَا: فَقَالَتْ: قَالَ: لَيْسَ مِنَّا مَنْ سَلَقَ، وَحَلَقَ، وَخَرَقَ»(٢).

واتە: یەزیدی کوڕی ئەوس دەگێڕێتەوە: ئەبو موسا ﷺ، بێهۆش کەوت دایکی یەکێک لە منداڵەکانی گریا، کاتێ بە هۆش هاتەوە، پێی وت: ئایا پێتنەگەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ چی فەمووە؟ پرسیارمان لێی کرد، وتی: فەرموویەتی: لە ئێمە نیە ئەوکەسەی هات و هاوار دەکات و، سەری یان ڕیشی دەتاشێ و یان جل لەبەر خۆی دەدڕێ (کاتێک کەسێکی دەمرێ، یان نەخۆش دەکەوێ).

**١٨٦٦-** «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَيْسَ مِنَّا مَنْ حَلَقَ، وَسَلَقَ، وَخَرَقَ»(٣).

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ئێمە نیە ئەو کەسەی سەری، یان ڕیشی دەتاشێ و هات و هاوار دەکات و یان جل لەبەر خۆی دەدڕێ. (بە هۆی مردن، یان بێهۆش کەوتنی کەسێکی نزیکی).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣١٣٠.

(٣) صحيح.

کراوی هەیە، با ئارام بگرێت و بە تەمای پاداشتی خوا بێت. بەڵام کچەکەی ناردیەوە بە دوایداو، سوێندی خوارد هەر ئەبی بچێت بۆ لای، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵساو سەعدی کوڕی عوبادەو موعازی کوڕی جەبەل و ئوبەی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی ثابت و چەند پیاوێکی تریش لەگەڵیدا هەڵسان، دواتر منداڵەکەیان بەرز کردەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێدا هەناسەی سوار (تەنگ) بوو، خڕەی سنگی دەهات، (پێغەمبەریش ﷺ) فرمێسک لە چاوی دەهاتنە خوارەوە، سەعد (خوا لێی ڕازی بێ) وتی: ئەمە چیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی: ئەمە ڕەحم و بەزەییەکە خوا خستویەتیە ناو دڵی بەندەکانیەوە، خوا لە ناو بەندەکانیدا تەنها بەزەیی بەوانەیاندا دێتەوە کە بە ڕەحم و میهرەبانن.

**١٨٦٩-** «عَنْ أَنَسٍ ﵁ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الْأُولَى»[١].

واتە: ئەنەس ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئارامگرتن لە کاتی کۆستی یەکەم دایە (واتە: لە یەکەم ساتی کارەساتەکەدا پێویستە مرۆڤ ئارامگر بێت).

**١٨٧٠-** «عَنْ مُعَاوِيَةُ بْنُ قُرَّةَ ﵁، أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ وَمَعَهُ ابْنٌ لَهُ فَقَالَ لَهُ: أَتُحِبُّهُ؟ فَقَالَ: أَحَبَّكَ اللَّهُ كَمَا أُحِبُّهُ، فَمَاتَ، فَفَقَدَهُ، فَسَأَلَ عَنْهُ، فَقَالَ: مَا يَسُرُّكَ أَنْ لَا تَأْتِيَ بَاباً مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ؟ إِلَّا وَجَدْتَهُ عِنْدَهُ يَسْعَى يَفْتَحُ لَكَ»[٢].

واتە: موعاویەی کوڕی قورە ﵁ دەگێڕێتەوە: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ منداڵێکی لەگەڵدا بوو، پێی فەرموو: ئەم منداڵەت خۆش دەوێ؟ ئەویش وتی: خوا خۆشی بوێی بە ئەندازەی ئەوەی ئەم منداڵەم خۆش ئەوێ، دواتر منداڵەکەی مرد، بۆ ماوەیەک پێغەمبەر ﷺ نەیبینیەوە، پرسیاری (لە هاوەڵان) کرد ئەو پیاوە چی بەسەر هات، (دواتر کە هاتە خزمەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا پێت خۆش نیە کە بچیتە لای هەر دەرگایەک لە دەرگاکانی بەهەشت و ببینی (ئەگەر بچیت) بە خێرایی دەرگاکەت بۆ دەکاتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٥٢ و ١٢٨٣ و ١٣٠٢ و ٧١٥٤، ومسلم: ٩٢٦، وأبو داود: ٣١٢٤، والترمذي: ٩٨٨.

(٢) صحيح.




## پاداشتی ئەو کەسەی ئارام دەگرێ و بە تەمای پاداشتە

**١٨٧١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ اللَّهَ لَا يَرْضَى لِعَبْدِهِ الْمُؤْمِنِ إِذَا ذَهَبَ بِصَفِيِّهِ مِنْ أَهْلِ الْأَرْضِ فَصَبَرَ وَاحْتَسَبَ، وَقَالَ: مَا أُمِرَ بِهِ بِثَوَابٍ دُونَ الْجَنَّةِ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا ڕازی نابێ بۆ بەندە بڕوادارەکەی کاتێ منداڵەکەی لە دەست بدات لە دنیاداو، ئارام بگرێ و بە تەمای پاداشت بێت، وە فەرمووی: فەرمان نەکراوە بە هیچ پاداشتێک جگە لە بەهەشت.**

## بابەت: پاداشتی ئەو کەسەی سێ لە منداڵەکانی لە دەست دەدات

**١٨٧٢-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنِ احْتَسَبَ ثَلَاثَةً مِنْ صُلْبِهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ، فَقَامَتِ امْرَأَةٌ، فَقَالَتْ: أَوِ اثْنَانِ؟ قَالَ: أَوِ اثْنَانِ، قَالَتِ الْمَرْأَةُ: يَا لَيْتَنِي قُلْتُ وَاحِداً»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکەس ئارام بگرێ و چاوەڕوانی پاداشتی موسیبەتی مردنی سیان لە منداڵەکانی بکات دەچێتە بەهەشتەوە، ئافرەتێک وتی: دوانیش؟ فەرمووی بەڵێ، دوانیش، ئافرەتەکە وتی: خۆزگا بموتایە یەک دانە.**

## هەر کەسێک سێ منداڵی بمرێ

**١٨٧٣-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُتَوَفَّى لَهُ ثَلَاثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ إِلَّا أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمْ»[٣].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ مسوڵمانێک نیە سێ منداڵی نەگەیشتبێتە قۆناغی پێگەیشتن و باڵغ بوون و بمرن، ئیللا خودا دەیخاتە بەهەشتەوە، ئەویش بە هۆی ڕەحم و بەزەیی بۆیان.**

---

(١) حسن.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٤٨ و ١٣٨١، إبن ماجه: ١٦٠٥.

**١٨٧٤-** «عَنْ صَعْصَعَةَ بْنِ مُعَاوِيَةَ، قَالَ: لَقِيتُ أَبَا ذَرٍّ ﵁، قُلْتُ: حَدِّثْنِي، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَمُوتُ بَيْنَهُمَا ثَلَاثَةُ أَوْلَادٍ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ إِلَّا غَفَرَ اللَّهُ لَهُمَا بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمْ»[١].

**واتە: صەعصەعەی کوڕی مەعاویە دەڵێ: گەیشتم بە ئەبو زەڕ ﵁، وتم: فەرموودەیەکم بۆ باس بکە، وتی: باشە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ دوو بڕوادارێک (واتە: ژن و مێردێک) نیە سێ منداڵ لە نێوانیاندا بمرێ و باڵغ نەبووبێتن، ئیللا خودا لێیان خۆش دەبێت بە هۆی ڕەحم و بە زەیی بەو منداڵانە.**

**١٨٧٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَمُوتُ لِأَحَدٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ثَلَاثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ فَتَمَسَّهُ النَّارُ إِلَّا تَحِلَّةَ الْقَسَمِ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر مسوڵمانێک سێ منداڵی بمرێ ئاگر بەری ناکەوێ، تەنها بۆ جێبەجێ بوونی سوێندەکەی نەبێت (کە فەرموویەتی دەبێ هەمووتان بچنە ناو ئاگرەوەو پێیدا تێپەڕ بین).**

**١٨٧٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَمُوتُ بَيْنَهُمَا ثَلَاثَةُ أَوْلَادٍ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ إِلَّا أَدْخَلَهُمَا اللَّهُ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمُ الْجَنَّةَ، قَالَ: يُقَالُ لَهُمْ: ادْخُلُوا الْجَنَّةَ، فَيَقُولُونَ: حَتَّى يَدْخُلَ آبَاؤُنَا، فَيُقَالُ: ادْخُلُوا الْجَنَّةَ أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمْ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ دوو ژن و مێردێک نیە سێ منداڵ لە نێوانیاندا بمرێ و باڵغ نەبووبێتن، ئیللا خوا بە هۆی ڕەحم و بەزەیی بەو منداڵانە دەیانخاتە بەهەشتەوە، فەرمووی: پێیان دەوترێ: بچنە بەهەشتەوە، ئەوانیش دەڵێن: تا دایک و باوکمان دەچێتە بەهەشتەوە، دەوترێ: بچنە بەهەشتەوە ئێوەو دایک و باوکتان.**

**١٨٧٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِابْنٍ لَهَا يَشْتَكِي، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَخَافُ عَلَيْهِ وَقَدْ قَدَّمْتُ ثَلَاثَةً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَقَدْ احْتَظَرْتِ بِحِظَارٍ شَدِيدٍ مِنَ النَّارِ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٥١ و ٦٦٥٦، ومسلم: ٢٦٣٢/١٥٠، والترمذي: ١٠٦٠، وإبن ماجه: ١٦٠٣.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٣٦.



## ئەو کەسەی سێ منداڵ پێش بخات

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بە منداڵێکەوە سکاڵای دەکردو دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا دەترسم بمرێ، چونکە بە ڕاستی سێ منداڵم لە پێشتر مردوون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی پەرژین کراوی بە پەرژینێکی بەهێز لە ئاگر.

**١٨٧٨-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَعَى زَيْداً وَجَعْفَراً قَبْلَ أَنْ يَجِيءَ خَبَرُهُمْ، فَنَعَاهُمْ وَعَيْنَاهُ تَذْرِفَانِ»[١].

## بابەت: هەواڵدان بە مردنی کەسێک

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی کوشتنی زەیدو جەعفەریدا پێش ئەوەی هەواڵیان بێت، کاتێ هەواڵیدا چاوەکانی فرمێسکی لێ دەهاتنە خوار.

**١٨٧٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَعَى لَهُمَا النَّجَاشِيَّ صَاحِبَ الْحَبَشَةِ الْيَوْمَ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، وَقَالَ: اسْتَغْفِرُوا لِأَخِيكُمْ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی مردنی زەیدو جەعفەری ڕاگەیاند لەو ڕۆژەی نەجاشی دەسەڵاتداری حەبەشە تیایدا مرد، وە فەرمووی: داوای لێخۆشبوون بۆ براکەتان بکەن.

**١٨٨٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ نَسِيرُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذْ بَصُرَ بِامْرَأَةٍ لَا تَظُنُّ أَنَّهُ عَرَفَهَا، فَلَمَّا تَوَسَّطَ الطَّرِيقَ وَقَفَ حَتَّى انْتَهَتْ إِلَيْهِ، فَإِذَا فَاطِمَةُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ لَهَا: مَا أَخْرَجَكِ مِنْ بَيْتِكِ يَا فَاطِمَةُ؟ قَالَتْ: أَتَيْتُ أَهْلَ هَذَا الْمَيِّتِ، فَتَرَحَّمْتُ إِلَيْهِمْ، وَعَزَّيْتُهُمْ بِمَيِّتِهِمْ، قَالَ: لَعَلَّكِ بَلَغْتِ مَعَهُمُ الْكُدَى؟ قَالَتْ: مَعَاذَ اللَّهِ، أَنْ أَكُونَ بَلَغْتُهَا وَقَدْ

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٤٦ و ٢٧٩٨ و ٣٠٦٣ و ٣٦٣٠ و ٣٧٥٧ و ٦٢٤٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٤٥ و ١٣١٨ و ١٣٢٧ و ١٣٣٣ و ٣٨٨٠، ومسلم: ٦٢ و ٩٥١/٦٣، وأبو داود: ٣٢٠٤، والترمذي: ١٠٢٢، وإبن ماجه: ١٥٣٤.





سَمِعْتُكَ تَذْكُرُ فِي ذَلِكَ مَا تَذْكُرُ، فَقَالَ لَهَا: لَوْ بَلَغْتِهَا مَعَهُمْ مَا رَأَيْتِ الْجَنَّةَ حَتَّى يَرَاهَا جَدُّ أَبِيكِ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: رَبِيعَةُ ضَعِيفٌ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەڕۆیشتین لە ناکاو چاوی بە ئافرەتێک کەوت گومانت نەدەبرد بیناسێتەوە، کاتێ گەیشتە نێوەڕاستی ڕێگا وەستا، هەتا گەیشتە لای، دەرچوو فاطیمەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، پێی فەرموو: چی تۆی لە ماڵ دەرهێناوە ئەی فاطیمە؟ وتی: هاتم بۆ لای کەس و کاری ئەم مردووە، بەزەییم پێدا هاتەوەو سەرەخۆشیم لێیان کرد، فەرمووی: خۆ لەگەڵیاندا نەڕۆشتی بۆ گۆڕستان؟ وتی: پەنا بە خوا ڕۆشتبم لە کاتێکدا گوێم لێ بوو لەوبارەوە فەرمایشتت فەرمووە، پێی فەرموو: ئەگەر لەگەڵیان بچوایەی ئەوە هەرگیز بەهەشتت نەدەبینی تا باپیرەی باوکت بەهەشتی دەیبینی.

ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: ڕەبیعە (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەکانی ئەم فەرموودەیە) کەسێکی فەرموودە لاوازە.

## شۆردنی مردوو بە ئاو و سیدر

**١٨٨١-** «عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ الْأَنْصَارِيَّةِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ تُوُفِّيَتِ ابْنَتُهُ، فَقَالَ: اغْسِلْنَهَا ثَلَاثاً أَوْ خَمْساً، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكِ إِنْ رَأَيْتُنَّ ذَلِكِ، بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَاجْعَلْنَ فِي الْآخِرَةِ كَافُوراً أَوْ شَيْئاً مِنْ كَافُورٍ، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي، فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ، فَأَعْطَانَا حَقْوَهُ وَقَالَ: أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ»[٢].

واتە: ئوممو عەطیەی ئەنصاری (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان کاتێ کچەکەی وەفاتی کرد، فەرمووی: سێ جار سێ جار، یان پێنج جار پێنج جار، یان زیاتر لەوە ئەگەر پێتان باش بوو بیشۆرن، بە ئاوو سیدر، دواهەمین جاری با بە کافور بێت، یان کەمێک لە کافور، کاتێک لێ بوونەوە ئاگادارم بکەنەوە،

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣١٢٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٥٣ و ١٢٥٤ و ١٢٥٧ و ١٢٥٨ و ١٢٥٩ و ١٢٦١، ومسلم: ٣٦ و ٩٣٩/٣٨، وأبو داود: ٣١٤٢ و ٣١٤٦ و ٣١٤٧، والترمذي: ٩٩٠، وإبن ماجه: ١٤٥٨.




کاتێک لێ بووینەوە ئاگادارمان کردەوە، پشتەماڵەکەی خۆی پێهانداو فەرمووی: لەشی پێ دابپۆشن.

## شۆردنی مردوو بە ئاوی گەرم

**١٨٨٢-** «عَنْ أُمِّ قَيْسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: تُوُفِّيَ ابْنِي فَجَزِعْتُ عَلَيْهِ، فَقُلْتُ لِلَّذِي يَغْسِلُهُ: لَا تَغْسِلِ ابْنِي بِالْمَاءِ الْبَارِدِ فَتَقْتُلَهُ، فَانْطَلَقَ عُكَّاشَةُ بْنُ مِحْصَنٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرَهُ بِقَوْلِهَا، فَتَبَسَّمَ، ثُمَّ قَالَ: مَا قَالَتْ طَالَ عُمْرُهَا، فَلَا نَعْلَمُ امْرَأَةً عَمِرَتْ مَا عَمِرَتْ»[١].

واتە: دایکی قەیس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: کوڕەکەم کۆچی دوایی کرد زۆر خەمبار بووم پێی، بەو کەسەم وت کە دەیشۆرد: کوڕەکەم بە ئاوی سارد مەشۆرە دەیکوژی، عوکاشەی کوڕی میحصەن ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێدا بەو قسەی دایکی قەیس وتی، بزەیەکی پێکەنینی کرد، پاشان فەرمووی: ئەوەی ئەو قسەی کرد تەمەنی درێژ بێت. جا ئافرەتێکمان نەبینی ئەوەندەی ئەو تەمەن بکات.

## هەڵوەشاندنەوەی پەلکەی قژی مردوو

**١٨٨٣-** «عَنْ حَفْصَةَ تَقُولُ حَدَّثَتْنَا أُمُّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُنَّ جَعَلْنَ رَأْسَ ابْنَةَ النَّبِيِّ ﷺ ثَلَاثَةَ قُرُونٍ، قُلْتُ: نَقَضْنَهُ وَجَعَلْنَهُ ثَلَاثَةَ قُرُونٍ؟ قَالَتْ: نَعَمْ»[٢].

واتە: حەفصە دەڵێ: ئوممو عەطیە (خوا لێیان ڕازی بێ) بۆی باس کردین: ئەوان قژی سەری کچەکەی پێغەمبەریان ﷺ کرد بە سێ بە شەوە، وتم: پەلکەکەیان هەڵوەشاندەوەو کردیان بە سێ بەشەوە؟ وتی: بەڵێ.

## دەست پێکردنی بە شۆردنی لای ڕاستی مردوو، وە شوێنی ئەندامەکانی دەستنوێژ.

**١٨٨٤-** «عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ فِي غَسْلِ ابْنَتِهِ: ابْدَأْنَ بِمَيَامِنِهَا وَمَوَاضِعِ الْوُضُوءِ مِنْهَا»[٣].

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: ئوممو عەطیە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی شۆردنی کچەکەی فەرمووی: لە لای ڕاستیەوە دەستی پێ بکەن، وە شوێنی ئەندامەکانی دەستنوێژیش.

## شۆردنی مردوو بە تاک

**١٨٨٥-** «عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَاتَتْ إِحْدَى بَنَاتِ النَّبِيِّ ﷺ فَأَرْسَلَ إِلَيْنَا فَقَالَ: اغْسِلْنَهَا بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَاغْسِلْنَهَا وِتْراً ثَلَاثاً أَوْ خَمْساً، أَوْ سَبْعاً إِنْ رَأَيْتُنَّ ذَلِكِ، وَاجْعَلْنَ فِي الْآخِرَةِ شَيْئاً مِنْ كَافُورٍ، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي، فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ، فَأَلْقَى إِلَيْنَا حَقْوَهُ وَقَالَ: أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ، وَمَشَطْنَاهَا ثَلَاثَةَ قُرُونٍ، وَأَلْقَيْنَاهَا مِنْ خَلْفِهَا»(١).

**واتە: ئوممو عەطیە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: یەکێک لە کچەکانی پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بە شوێنماندا و فەرمووی: سێ جار، یان پێنج جار، یان حەوت جار، ئەگەر پێتان باش بوو بە ئاوو سیدر بیشۆرن، دواهەمین جاری با بە کافور بێت، کاتێک لێ بوونەوە ئاگادارم بکەنەوە. کاتێک لێ بووینەوە ئاگادارمان کردەوە، پشتەماڵەکەی خۆی پێماندا و فەرمووی: لەشی پێ داپۆشن. وە سێ جار شانەمان کردو کردمانە سێ بەشەوە، پاشان خستمانە پشتیەوە.**

## شۆردنی مردوو زیاتر لە پێنج جار

**١٨٨٦-** «عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ نَغْسِلُ ابْنَتَهُ، فَقَالَ: اغْسِلْنَهَا ثَلَاثاً أَوْ خَمْساً، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكِ إِنْ رَأَيْتُنَّ ذَلِكِ، بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَاجْعَلْنَ فِي الْآخِرَةِ كَافُوراً أَوْ شَيْئاً مِنْ كَافُورٍ، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي، فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ، فَأَلْقَى إِلَيْنَا حِقْوَهُ وَقَالَ: أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ»(٢).

**واتە: ئوممو عەطیە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان کاتێ کچەکەیان دەشۆرد، فەرمووی: سێ جار، یان پێنج جار، یان زیاتر لەوە**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٥٥ و ١٢٥٦ و ١٢٦٠ و ١٢٦٢ و ١٢٦٣، ومسلم: ٣٩ و ٩٣٩/٤٣، وأبو داود: ٣١٤٣ و ٣١٤٤ و ٣١٤٥، والترمذي: ٩٩٠، وإبن ماجه: ١٤٥٩.

(٢) صحيح.




ئەگەر پێتان باش بوو بیشۆرن، بە ئاوو سیدر، دواهەمین جاری با بە کافور بێت، یان کەمێک لە کافور، کاتێک لێ بوونەوە ئاگادارم بکەنەوە، کاتێک لێ بووینەوە ئاگادارمان کردەوە، پشتەماڵەکەی خۆی پێداو فەرمووی: لەشی پێ بپێچن.

## شۆردنی مردوو زیاتر لە حەوت جار

١٨٨٧- «عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: تُوُفِّيَتْ إِحْدَى بَنَاتِ النَّبِيِّ ﷺ فَأَرْسَلَ إِلَيْنَا، فَقَالَ: اغْسِلْنَهَا ثَلَاثاً أَوْ خَمْساً، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكِ إِنْ رَأَيْتُنَّ، بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَاجْعَلْنَ فِي الْآخِرَةِ كَافُوراً أَوْ شَيْئاً مِنْ كَافُورٍ، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي، فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ، فَأَلْقَى إِلَيْنَا حِقْوَهُ وَقَالَ: أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ»[1].

واتە: ئوممو عەطیە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: یەکێک لە کچەکانی پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد، ناردی بە شوێنماندا، فەرمووی: سێ جار، یان پێنج جار، یان زیاتر لەوە ئەگەر پێتان باش بوو بیشۆرن، بە ئاوو سیدر، دواهەمین جاری با بە کافور بێت، یان کەمێک لە کافور، کاتێک لێ بوونەوە ئاگادارم بکەنەوە. کاتێک لێ بووینەوە ئاگادارمان کردەوە، پشتەماڵەکەی خۆی پێداو فەرمووی: لەشی پێ بپێچن.

١٨٨٨- «عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، نَحْوَهُ غَيْرَ أَنَّهُ قَالَ: ثَلَاثاً أَوْ خَمْساً، أَوْ سَبْعاً أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكِ إِنْ رَأَيْتُنَّ ذَلِكِ»[2].

واتە: ئوممو عەطیە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: هەروەکو فەرموودەکەی پێشوو جگە لەوە نەبێ، فەرموویەتی: سێ جار، یان پێنج جار، یان حەوت جار، یان زیاتر لەوە ئەگەر پێتان باش بوو.

١٨٨٩- «عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: تُوُفِّيَتِ ابْنَةٌ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَمَرَنَا بِغَسْلِهَا، فَقَالَ: اغْسِلْنَهَا ثَلَاثاً أَوْ خَمْساً، أَوْ سَبْعاً أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكِ إِنْ رَأَيْتُنَّ، قَالَتْ: قُلْتُ: وِتْراً؟ قَالَ: نَعَمْ، وَاجْعَلْنَ فِي الْآخِرَةِ كَافُوراً، أَوْ شَيْئاً مِنْ كَافُورٍ، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي، فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ، فَأَعْطَانَا حِقْوَهُ وَقَالَ: أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: ئوممو عەطیە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: یەکێک لە کچەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد، فەرمانی پێ کردین بیشۆرین، فەرمووی: سێ جار، یان پێنج جار، یان حەوت جار، یان زیاتر لەوە ئەگەر پێتان باش بوو بیشۆرن، دەڵێ: وتم: بە تاک؟ فەرمووی: بەڵێ، دواهەمین جاری با بە کافور بێت، یان کەمێک لە کافور، کاتێک لێ بوونەوە ئاگادارم بکەنەوە. کاتێک لێ بووینەوە ئاگادارمان کردەوە، پشتەماڵەکەی خۆی پێداو فەرمووی: لەشی پێ بپێچن.

## بەکارهێنانی کافوور بۆ شۆردنی مردوودا

**١٨٩٠-** «عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ نَغْسِلُ ابْنَتَهُ فَقَالَ: اغْسِلْنَهَا ثَلَاثاً أَوْ خَمْساً، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكِ إِنْ رَأَيْتُنَّ ذَلِكِ، بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَاجْعَلْنَ فِي الْآخِرَةِ كَافُوراً، أَوْ شَيْئاً مِنْ كَافُورٍ، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي، فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ، فَأَلْقَى إِلَيْنَا حِقْوَهُ وَقَالَ: أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ، قَالَ: أَوْ قَالَتْ حَفْصَةُ: اغْسِلْنَهَا ثَلَاثاً أَوْ خَمْساً أَوْ سَبْعاً، قَالَ: وَقَالَتْ أُمُّ عَطِيَّةَ: مَشَطْنَاهَا ثَلَاثَةَ قُرُونٍ»[١].

واتە: ئوممو عەطیە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان ئێمە کچەکەیان دەشۆرد، فەرمووی: سێ جار، یان پێنج جار، یان زیاتر لەوە ئەگەر پێتان باش بوو بە ئاوو سیدر بیشۆرن، دواهەمین جاری با بە کافور بێت، یان کەمێک لە کافور، کاتێک لێ بوونەوە ئاگادارم بکەنەوە. کاتێک لێ بووینەوە ئاگادارمان کردەوە، پشتەماڵەکەی خۆی پێداو فەرمووی: لەشی پێ بپێچن. دەڵێ: یان حەفصە بوو وتی: سێ جار، یان پێنج جار یان حەوت جار بیشۆرن، (ڕاوی) دەڵێ: ئوممو عەطیە (خوا لێی ڕازی بێ) وتوویەتی: قژیان شانە کردو کردمان بە سێ بەشەوە.

**١٨٩١-** «عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: وَجَعَلْنَا رَأْسَهَا ثَلَاثَةَ قُرُونٍ»[٢].

واتە: ئوممو عەطیە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: قژیان کرد بە سێ بەشەوە.

---

(١) صحیح.

(٢) صحیح.




**١٨٩٢-** «عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، وَجَعَلْنَا رَأْسَهَا ثَلَاثَةَ قُرُونٍ»(١).

**واتە: ئوممو عەطیە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: قژیان کرد بە سێ بەشەوە.**

## پێچانەوەو داپۆشینی مردوو

**١٨٩٣-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، يَقُولُ: كَانَتْ أُمُّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا امْرَأَةٌ مِنَ الْأَنْصَارِ قَدِمَتْ تُبَادِرُ ابْناً لَهَا، فَلَمْ تُدْرِكْهُ، حَدَّثَتْنَا قَالَتْ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَيْنَا وَنَحْنُ نَغْسِلُ ابْنَتَهُ فَقَالَ: اغْسِلْنَهَا ثَلَاثاً أَوْ خَمْسَاً، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكِ إِنْ رَأَيْتُنَّ، بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَاجْعَلْنَ فِي الْآخِرَةِ كَافُوراً أَوْ شَيْئاً مِنْ كَافُورٍ، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي، فَلَمَّا فَرَغْنَا أَلْقَى إِلَيْنَا حِقْوَهُ وَقَالَ: أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ، وَلَمْ يَزِدْ عَلَى ذَلِكَ، قَالَ: لَا أَدْرِي أَيُّ بَنَاتِهِ قَالَ: قُلْتُ: مَا قَوْلُهُ أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ؟ أَتُؤَزَّرُ بِهِ؟ قَالَ: لَا أُرَاهُ إِلَّا أَنْ يَقُولَ الْفُفْنَهَا فِيهِ»(٢).

**واتە: موحەممەدی کوڕی سیرین دەڵێ: ئوممو عەطیە (خوا لێی ڕازی بێ) ئافرەتێکی ئەنصاری بوو، هات (بۆ بەصرە) بۆ بینینی کوڕەکەی، بەڵام پێی نەگەیشت (یان لەبەر ئەوەی مردبوو، یان لەبەر ئەوەی لە بەصرە نەمابوو)، جا بۆمانی باسکردو وتی: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لامان ئێمە کچەکەیان دەشۆرد (بە مردوویی)، فەرمووی: سێ جار، یان پێنج جار، یان زیاتر لەوە ئەگەر پێتان باش بوو بە ئاوو سیدر بیشۆرن، دواهەمین جاری با بە کافور بێت، یان کەمێک لە کافور، کاتێک لێ بوونەوە ئاگادارم بکەنەوە. کاتێک لێ بووینەوە ئاگادارمان کردەوە، پشتەماڵەکەی خۆی پێیانداو فەرمووی: لەشی پێ داپۆشن. هیچ شتێکی لە سەر ئەوە زیاد نەکرد، وتی: نازانم کام لە کچەکانی بوو، وتم: مانای (أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ) چیە؟ ئایا پێی دادەپۆشی؟ وتی: پێم وایە فەرموویەتی: پێوەی بیپێچنەوە.**

**١٨٩٤-** «عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: تُوُفِّيَ إِحْدَى بَنَاتِ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: اغْسِلْنَهَا ثَلَاثاً أَوْ خَمْساً، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكِ إِنْ رَأَيْتُنَّ ذَلِكِ، وَاغْسِلْنَهَا بِالسِّدْرِ وَالْمَاءِ، وَاجْعَلْنَ فِي آخِرِ ذَلِكِ كَافُوراً أَوْ شَيْئاً مِنْ كَافُورٍ، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي، قَالَتْ: فَآذَنَّاهُ، فَأَلْقَى إِلَيْنَا حِقْوَهُ فَقَالَ: أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: ئوممو عەطیە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: یەکێک لە کچەکانی پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد فەرمووی: سێ جار، یان پێنج جار، یان زیاتر لەوە ئەگەر پێتان باش بوو بە ئاوو سیدر بیشۆرن، دواهەمین جاری با بە کافور بێت، یان کەمێک لە کافور، کاتێک لێ بوونەوە ئاگادارم بکەنەوە. کاتێک لێ بووینەوە ئاگادارمان کردەوە، پشتەماڵەکەی خۆی پێیانداو فەرمووی: لەشی پێ دابپۆشن.

## فەرمان کردن بە باش کفن کردن

**١٨٩٥-** «عَن جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرَ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِهِ مَاتَ فَقُبِرَ لَيْلاً، وَكُفِّنَ فِي كَفَنٍ غَيْرِ طَائِلٍ، فَزَجَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُقْبَرَ إِنْسَانٌ لَيْلاً إِلَّا أَنْ يُضْطَرَّ إِلَى ذَلِكَ، وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا وَلِيَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيُحَسِّنْ كَفَنَهُ»[١].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاریدا، باسی یەکێک لە هاوەڵانی کرد کە مردبوو، بە شەو گۆڕیان بۆ هەڵکەند بوو، بەبێ ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە کفنیان بۆی کرد کفنەکەی باش نەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ سەرزەنشتی ئەوەی کرد کەسێک لە گۆڕ بنرێت لە شەودا مەگەر زۆر ناچاربن، وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر کەسێک لە ئێوە کرا بە وەکیلی براکەی، با بە چاکترین شێوە کفنی بۆ بکات.

## چ کفنێک چاکە؟

**١٨٩٦-** «عَنْ سَمُرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْبَسُوا مِنْ ثِيَابِكُمُ الْبَيَاضَ، فَإِنَّهَا أَطْهَرُ وَأَطْيَبُ، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ»[٢].

واتە: سەمورە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: جلی سپی لەبەر بکەن، چونکە پاکترین و جوانترینە، وە مردووەکانتانیشی پێ کفن بکەن.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٤٣، وأبو داود: ٣١٤٨، وإبن ماجه: ١٥٢١.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٨١٠، وإبن ماجه: ٣٥٦٧.




## كفنى پێغەمبەر ﷺ

**١٨٩٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُفِّنَ النَّبِيُّ ﷺ فِي ثَلَاثَةِ أَثْوَابٍ سُحُولِيَّةٍ بِيضٍ»[١].

**واتە:** عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کفن کرا لە سێ پارچە قوماشی یەمەنی سپیدا.

**تێبینی:** وشەی: (سُحْولة) گوندێکە لە وڵاتی یەمەن، کۆی وشەی (سُحْولة)یە، واتە: پۆشاکی سپی.

**١٨٩٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كُفِّنَ فِي ثَلَاثَةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ سُحُولِيَّةٍ لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ وَلَا عِمَامَةٌ»[٢].

**واتە:** عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کفن کرا لە سێ پارچە قوماشی یەمەنی سپیدا، نە کراس و، نە مێزەریان تێدا نەبوو.

**١٨٩٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُفِّنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي ثَلَاثَةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ يَمَانِيَةٍ كُرْسُفٍ لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ، وَلَا عِمَامَةٌ، فَذُكِرَ لِعَائِشَةَ قَوْلُهُمْ فِي ثَوْبَيْنِ وَبُرْدٍ مِنْ حِبَرَةٍ، فَقَالَتْ: قَدْ أُتِيَ بِالْبُرْدِ وَلَكِنَّهُمْ رَدُّوهُ وَلَمْ يُكَفِّنُوهُ فِيهِ»[٣].

**واتە:** عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کفن کرا لە سێ پارچە قوماشی یەمەنی سپیدا لە لۆکە، نە کراس و، نە مێزەریان تێدا نەبوو، قسەی ئەوانە باس کرا بۆ عائیشە کە وتبوویان: لە دوو پۆشاک و کراسێکی خەتدار کفن کرا، وتی: کراسە خەتدارەکە هێنرا، بەڵام ڕەتیان کردەوەو کفنیان نەکرد پێی.

## کراس لە کفن دا

**١٩٠٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَمَّا مَاتَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ جَاءَ ابْنُهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: اعْطِنِي قَمِيصَكَ حَتَّى أُكَفِّنَهُ فِيهِ، وَصَلِّ عَلَيْهِ، وَاسْتَغْفِرْ لَهُ، فَأَعْطَاهُ قَمِيصَهُ ثُمَّ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٦٤ و ١٢٧١ و ١٢٧٢ و ١٢٧٣ و ١٢٨٧، ومسلم: ٤٥ و ٩٤١/٤٧، وأبو داود: ٣١٥١ و ٣١٥٢، والترمذي: ٩٩٦، وإبن ماجه: ١٤٦٩.

(٣) صحيح.

قَالَ: إِذَا فَرَغْتُمْ فَآذِنُونِي أُصَلِّي عَلَيْهِ، فَجَذَبَهُ عُمَرُ وَقَالَ: قَدْ نَهَاكَ اللَّهُ أَنْ تُصَلِّيَ عَلَى الْمُنَافِقِينَ، فَقَالَ: أَنَا بَيْنَ خِيرَتَيْنِ، قَالَ: اسْتَغْفِرْ لَهُمْ، أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ، فَصَلَّى عَلَيْهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ﴿٨٤﴾ ﴾التوبة، فَتَرَكَ الصَّلَاةَ عَلَيْهِمْ»[1].

واته: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێک عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی (سەرۆکی دووڕووەکان) مرد کوڕەکەی هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و پێی وت: کراسەکەتم پێ بدە تا بیکەم بە کفنی و نوێژی لەسەر بکەو داوای لێ خۆشبوونیشی بۆ بکە، پێغەمبەر ﷺ کراسەکەی پێداو پاشان فەرمووی: کاتێک لێ بوونەوە ئاگادارم بکەنەوە نوێژی لەسەر دەکەم. عومەر ڕایکێشاو وتی: خوا ڕێگری لێکردووی نوێژ لەسەر دووڕووەکان بکەیت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من لە نێوانی دوو شتدا سەرپشک کراوم، فەرمووی: داوای لێ خۆشبوونیان بۆ بکەی، یان داوای لێ خۆشبوونیان بۆ نەکەی. ئیدی نوێژی لەسەر کرد، خوای بەرز ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ﴿٨٤﴾ ﴾، ئینجا وازی لە نوێژ کردن هێنا لە سەریان.

**١٩٠١-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: أَتَى النَّبِيُّ ﷺ قَبْرَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ وَقَدْ وُضِعَ فِي حُفْرَتِهِ، فَوَقَفَ عَلَيْهِ، فَأَمَرَ بِهِ فَأُخْرِجَ لَهُ، فَوَضَعَهُ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَأَلْبَسَهُ قَمِيصَهُ، وَنَفَثَ عَلَيْهِ مِنْ رِيقِهِ، وَاللَّهُ تَعَالَى أَعْلَمُ»[2].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای گۆڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی خرابوویە ناو چاڵی گۆڕەکەوە، لەسەری وەستا، فەرمانی کرد بۆیان دەرهێنا، خستیە سەر هەردوو ئەژنۆی، کراسەکەی لەبەری کرد و فووی کرد بەسەریدا لە لیکی، خوا زاناترە.

**١٩٠٢-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: وَكَانَ الْعَبَّاسُ بِالْمَدِينَةِ، فَطَلَبَتِ الْأَنْصَارُ ثَوْباً يَكْسُونَهُ، فَلَمْ يَجِدُوا قَمِيصاً يَصْلُحُ عَلَيْهِ إِلَّا قَمِيصَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ فَكَسَوْهُ إِيَّاهُ»[3].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: عەبباس لە مەدینە بوو (کاتێ لە جەنگی بەدر دەستگیر کراو کراسی لەبەردا نەبوو) ئەنصارەکان بە دوای کراسێکدا دەگەڕان بیکەنە بەری،

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٦٩ و ٤٦٧٠ و ٤٦٧٢ و ٥٧٩٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٧٠ و ١٣٥٠ و ٣٠٠٨ و ٥٧٩٥، ومسلم: ٢٧٧٣.

(٣) صحيح.

کراسێکیان نەدۆزیەوە بۆی بشێت جگە لە کراسی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی نەبێ، لەبەریان کرد.

**١٩٠٣-** «عَن خَبَّابٍ ﷺ قَالَ: هَاجَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نَبْتَغِي وَجْهَ اللَّهِ تَعَالَى، فَوَجَبَ أَجْرُنَا عَلَى اللَّهِ، فَمِنَّا مَنْ مَاتَ لَمْ يَأْكُلْ مِنْ أَجْرِهِ شَيْئاً، مِنْهُمْ مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ فَلَمْ نَجِدْ شَيْئاً نُكَفِّنُهُ فِيهِ إِلَّا نَمِرَةً، كُنَّا إِذَا غَطَّيْنَا رَأْسَهُ خَرَجَتْ رِجْلَاهُ، وَإِذَا غَطَّيْنَا بِهَا رِجْلَيْهِ خَرَجَتْ رَأْسُهُ، فَأَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نُغَطِّيَ بِهَا رَأْسَهُ، وَنَجْعَلَ عَلَى رِجْلَيْهِ إِذْخِراً، وَمِنَّا مَنْ أَيْنَعَتْ لَهُ ثَمَرَتُهُ فَهُوَ يَهْدِبُهَا»[١].

**واتە: خەباب ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچمان کرد بە مەبەستی پاداشت لەلای خوا، پاداشتمان بۆ واجب بوو لەلای خوا، تیاماندا بوو مرد هیچی لە بەرهەم و غەنیمەت نەخوارد، لەوانە موصعەبی کوڕی عومەیر لە ڕۆژی ئوحود کوژرا شتێکمان نەبینیەوە پێی کفن بکەین، جگە لە پارچە قوماشێک نەبێت کاتێ دەماندا بەسەریدا قاچەکانی دەردەکەوت، کاتێکیش دەماندا بەسەر قاچەکانیدا سەری دەردەکەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین سەری پێدا بپۆشین و گیایەکی بۆنخۆشیش بە ناوی (إِذْخِر) بدەین بەسەر قاچیدا، وە هەشمان بوو بەرهەمەکەی پێگەیی و چنیەوە.**

## ئەو کەسەی ئیحرامی بەستووە کاتێ مرد چۆن کفن دەکرێ؟

**١٩٠٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اغْسِلُوا الْمُحْرِمَ فِي ثَوْبَيْهِ اللَّذَيْنِ أَحْرَمَ فِيهِمَا، وَاغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْهِ، وَلَا تُمِسُّوهُ بِطِيبٍ، وَلَا تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ، فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُحْرِماً»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو کەسەی ئیحرامی بەستووەو مردووە بیشۆرن بەو دوو پارچە قوماشەی کە**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٧٦ و ٣٨٩٧ و ٣٩١٣ و ٣٩١٤ و ٤٠٤٧ و ٤٠٨٢ و ٦٤٣٢ و ٦٤٤٨، ومسلم: ٩٤٠، وأبو داود: ٢٨٧٦ و ٣١٥٥، والترمذي: ٣٨٥٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٦٥ و ١٢٦٦ و ١٢٦٧ و ١٢٦٨ و ١٨٣٩ و ١٨٤٩ و ١٨٥٠ و ١٨٥١، ومسلم: ٩٣ و ١٢٠٦/١٠٣، وأبو داود: ٣٢٣٨ و ٣٢٣٩ و ٣٢٤٠ و ٣٢٤١، والترمذي: ٩٥١، وإبن ماجه: ٣٠٨٤.




ئیحرامی پێبەستووە، وە بیشۆرن بە ئاوو بە سیدر، بە هەردوو پارچە قوماشەکەی کفنی بکەن، بۆنی خۆشی لێ مەدەن، سەری دامەپۆشن، چونکە لە ڕۆژی دواییدا بە ئیحرامەوە زیندوو دەبێتەوە.

## بەکارهێنانی میسک

**١٩٠٥-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَطْيَبُ الطِّيبِ الْمِسْكُ»[١].

**واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆشترینی بۆنەکان بۆنی میسکە.**

**١٩٠٦-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مِنْ خَيْرِ طِيبِكُمُ الْمِسْكُ»[٢].

**واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە چاکترینی بۆنە خۆشەکانتان بۆنی میسکە.**

## ئاگادارکردنەوەی خەڵک بە مردنی کەسێک

**١٩٠٧-** «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﷺ قال: أَنَّ مِسْكِينَةً مَرِضَتْ، فَأُخْبِرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمَرَضِهَا، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُودُ الْمَسَاكِينَ، وَيَسْأَلُ عَنْهُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا مَاتَتْ فَآذِنُونِي، فَأُخْرِجَ بِجَنَازَتِهَا لَيْلاً، وَكَرِهُوا أَنْ يُوقِظُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا أَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أُخْبِرَ بِالَّذِي كَانَ مِنْهَا، فَقَالَ: أَلَمْ آمُرْكُمْ أَنْ تُؤْذِنُونِي بِهَا، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَرِهْنَا أَنْ نُوقِظَكَ لَيْلاً، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى صَفَّ بِالنَّاسِ عَلَى قَبْرِهَا، وَكَبَّرَ أَرْبَعَ تَكْبِيرَاتٍ»[٣].

**واتە: ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیف ﷺ دەڵێ: ئافرەتێکی هەژار نەخۆش کەوت، هەواڵی نەخۆشبوونی درا بە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی هەژارەکانی دەکردو لە حاڵی دەپرسین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر مرد ئاگادارم بکەنەوە. (کاتێ کە مرد) بە شەو تەرمەکەی دەرهێناو، پێیان**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٥٢، وأبو داود: ٣١٥٨، والترمذي: ٩٩١ و ٩٢٢.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح.




ناخۆش بوو پێغەمبەر لە خەو هەڵسێنن، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی کردەوە هەواڵی ئەوەی پێدرا، فەرمووی: ئایا فەرمانم پێ نەکردن ئاگادارم بکەنەوە لە مردنی ئەو ئافرەتە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، پێمان ناخۆش بوو شەو بە خەبەرت بێنینەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو تا لە تەنیشت گۆڕەکەی خەڵکەکەی ڕیز کردو، چوار جار تەکبیری کردو (نوێژی مردووی لەسەر کرد).

## پەلە کردن لە بردنی جەنازە بۆ گۆڕستان

**١٩٠٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِذَا وُضِعَ الرَّجُلُ الصَّالِحُ عَلَى سَرِيرِهِ، قَالَ: قَدِّمُونِي قَدِّمُونِي، وَإِذَا وُضِعَ الرَّجُلُ «يَعنِي السُّوءَ» عَلَى سَرِيرِهِ، قَالَ: يَا وَيْلِي أَيْنَ تَذْهَبُونَ بِي»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: کاتێ (تەرمی) پیاو چاک دانرا لەسەر شان دەڵێ: پێشم بخەن پێشم بخەن، وە کاتێ (تەرمی) پیاو خراپ دانرا لەسەر شان (بۆ بەڕێکردنی بۆ گۆڕستان)، دەڵێ: ئەی هاوار بۆ کوێ دەمبەن.

**١٩٠٩-** «عَن أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا وُضِعَتِ الْجَنَازَةُ فَاحْتَمَلَهَا الرِّجَالُ عَلَى أَعْنَاقِهِمْ، فَإِنْ كَانَتْ صَالِحَةً قَالَتْ: قَدِّمُونِي قَدِّمُونِي، وَإِنْ كَانَتْ غَيْرَ صَالِحَةٍ، قَالَتْ: يَا وَيْلَهَا إِلَى أَيْنَ تَذْهَبُونَ بِهَا، يَسْمَعُ صَوْتَهَا كُلُّ شَيْءٍ إِلَّا الْإِنْسَانَ، وَلَوْ سَمِعَهَا الْإِنْسَانُ لَصَعِقَ»[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ جەنازە دانراو پیاوان خستیانە سەر شانیان، ئەگەر پیاو چاک بێت، دەڵێ: پێشم بخەن پێشم بخەن، وە ئەگەر پیاو چاک نەبێت، دەڵێ: ئەی هاوار بۆ کوێ دەمبەن، هەموو شتێک گوێی لە دەنگیەتی جگە لە مرۆڤ، ئەگەر مرۆڤ گوێی لێ بێت بیهۆش دەبێت.

**١٩١٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: أَسْرِعُوا بِالْجَنَازَةِ، فَإِنْ تَكُ صَالِحَةً فَخَيْرٌ تُقَدِّمُونَهَا إِلَيْهِ، وَإِنْ تَكُ غَيْرَ ذَلِكَ فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣١٤ و ١٣١٦ و ١٣٨٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣١٥، ومسلم: ٥٠ و ٩٤٤/٥١، وأبو داود: ٣١٨١، والترمذي: ١٠١٥، وإبن ماجه: ١٤٧٧.




**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پەلە بکەن لە بەڕێ کردنی جەنازەدا، چونکە ئەگەر باش و خواناس بێت، ئەوە بەرەو خۆشی و شادی دەیبەن، خۆ ئەگەر وانەبوو ئەوە شەڕو بەڵایەکە لە کۆڵ خۆتانی دەکەنەوە.**

**١٩١١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: أَسْرِعُوا بِالْجَنَازَةِ فَإِنْ كَانَتْ صَالِحَةً قَدَّمْتُمُوهَا إِلَى الْخَيْرِ، وَإِنْ كَانَتْ غَيْرَ ذَلِكَ كَانَتْ شَرّاً تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: پەلە بکەن لە بەڕێ کردنی جەنازەدا، چونکە ئەگەر باش و خواناس بێت، ئەوە بەرەو خۆشی و شادی بردووتانە، خۆ ئەگەر وا نەبوو ئەوە شەڕو بەڵایەکە لە کۆڵ خۆتانی دەکەنەوە.**

**١٩١٢-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يُونُسَ قَالَ: شَهِدْتُ جَنَازَةَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ وَخَرَجَ زِيَادٌ يَمْشِي بَيْنَ يَدَيِ السَّرِيرِ، فَجَعَلَ رِجَالٌ مِنْ أَهْلِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَمَوَالِيهِمْ يَسْتَقْبِلُونَ السَّرِيرَ وَيَمْشُونَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ، وَيَقُولُونَ: رُوَيْداً رُوَيْداً بَارَكَ اللَّهُ فِيكُمْ، فَكَانُوا يَدِبُّونَ دَبِيباً حَتَّى إِذَا كُنَّا بِبَعْضِ طَرِيقِ الْمِرْبَدِ لَحِقَنَا أَبُو بَكْرَةَ ﷺ عَلَى بَغْلَةٍ، فَلَمَّا رَأَى الَّذِي يَصْنَعُونَ حَمَلَ عَلَيْهِمْ بِبَغْلَتِهِ، وَأَهْوَى إِلَيْهِمْ بِالسَّوْطِ، وَقَالَ: خَلُّوا، فَوَالَّذِي أَكْرَمَ وَجْهَ أَبِي الْقَاسِمِ ﷺ لَقَدْ، رَأَيْتُنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَإِنَّا لَنَكَادُ نَرْمُلُ بِهَا رَمَلاً، فَانْبَسَطَ الْقَوْمُ»[٢].

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی یونوس دەڵێ: ئامادەی جەنازەی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەمورە بووم، زیاد هاتە دەرەوە لە پێش جەنازەکەدا ڕێی دەکرد، کۆمەڵێکیش لە کەسوکارەکەی عەبدوڕڕەحمان و خزمەتکارەکانیان پێشوازی جەنازەکەیان دەکرد، مردووەکەیان لەسەر شانیان دانابوو دەڕۆیشتن و دەیانوت: پەلە مەکەن پەلە مەکەن، بەرەکەتی خوا لە سەرتان، ئەوانیش زۆر لەسەر خۆیان ڕێیان دەکرد، هەتا گەیشتینە ڕێگای (الْمِرْبَدِ) (شوێنێکە لە بەصرە)، ئەبو بەکرە ﷺ بەسەر ئێسترێکەوە بوو پێمان گەیشت، کاتێ بینی ئەو کارە دەکەن هەڵی کوتایە سەریان بە ئێسترەکەی و بە قامچی لێی دەدان و دەیوت: دوور بکەونەوە، سوێند بەو خوایەی ڕووی باوکی قاسمی ﷺ پیرۆز کردوە، ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین بە پەلەکردنێکی مامناوەندی جەنازەمان ڕەوانە دەکرد، ئینجا خەڵکەکە لە ڕۆیشتن پەلەیان کرد.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣١٨٢ و ٣١٨٣.





**١٩١٣-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَإِنَّا لَنَكَادُ نَرْمُلُ بِهَا رَمَلاً»[١].

**واتە: ئەبو بەكرە ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین بە پەلەكردنێكی مامناوەندی جەنازەمان ڕەوانەی گۆڕستان دەكرد.**

**١٩١٤-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا مَرَّتْ بِكُمْ جَنَازَةٌ فَقُومُوا، فَمَنْ تَبِعَهَا فَلَا يَقْعُدْ حَتَّى تُوضَعَ»[٢].

**واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كاتێك جەنازەیەك تێپەڕی بەلاتاندا هەڵسن، هەر كەسێك شوێنی كەوت با دانەنیشێ تا دادەنرێ.**

**تێبینی: زانایان ڕای جیاوازیان هەیە دەربارەی (حَتَّى تُوضَعَ) هەندێكیان ڕایان وایە، واتە: تا لەسەر زەوی دادەنرێ، هەندێكیشیان ڕایان وایە، واتە: تا دەخرێتە ناو گۆڕ.**

## بابەت: فەرمان كردن بە هەڵسان لە بەردەم جەنازە

**١٩١٥-** «عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا رَأَى أَحَدُكُمُ الْجَنَازَةَ فَلَمْ يَكُنْ مَاشِياً مَعَهَا، فَلْيَقُمْ حَتَّى تُخَلِّفَهُ أَوْ تُوضَعَ مِنْ قَبْلِ أَنْ تُخَلِّفَهُ»[٣].

**واتە: عامری كوڕی ڕەبیعە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەكێك لە ئێوە جەنازەیەكی بینی لەگەڵیدا ڕێی نەدەكرد، با هەڵسێت تا پشتی تێدەكات، یان دادەنرێت پێش ئەوەی پشتی تێ بكات.**

**١٩١٦-** «عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ الْعَدَوِيِّ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: إِذَا رَأَيْتُمُ الْجَنَازَةَ فَقُومُوا حَتَّى تُخَلِّفَكُمْ أَوْ تُوضَعَ»[٤].

**واتە: عامری كوڕی ڕەبیعەی عەدەوی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كاتێ جەنازەیەكتان بینی هەڵسن تا پشتان تێ دەكات، یاخود دادەنرێت.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٠٧ و ١٣٠٨، ومسلم: ٧٣ و ٩٥٨/٧٥، وأبو داود: ٣١٧٢، والترمذي: ١٠٤٢، وإبن ماجه: ١٥٤٢.

(٤) صحيح.

**١٩١٧-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا رَأَيْتُمُ الْجَنَازَةَ فَقُومُوا، فَمَنْ تَبِعَهَا فَلَا يَقْعُدْ حَتَّى تُوضَعَ»[١].

**واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ جەنازەیەکتان بینی هەڵسن، هەر کەسێک شوێنی کەوت با دانەنیشێ تا دادەنرێ.**

**١٩١٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَا: مَا رَأَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ شَهِدَ جَنَازَةً قَطُّ فَجَلَسَ حَتَّى تُوضَعَ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرەو ئەبو سەعید (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێن: هەرگیز پێغەمبەری خوامان ﷺ نەبینیوە ئامادەی جەنازەیەک بێت، دواتر دابنیشتایە تا دادەنرا.**

**١٩١٩-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرُّوا عَلَيْهِ بِجَنَازَةٍ فَقَامَ، وَقَالَ عَمْرٌو: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّتْ بِهِ جَنَازَةٌ فَقَامَ»[٣].

**واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە: جەنازەیەک تێپەڕێنرا بە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش هەڵسا، عەمر وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ جەنازەیەک بەلایدا تێپەڕی هەڵسا.**

**١٩٢٠-** «عَنْ يَزِيدِ ابْنِ ثَابِتٍ ﷺ، أَنَّهُمْ كَانُوا جُلُوساً مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَطَلَعَتْ جَنَازَةٌ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَامَ مَنْ مَعَهُ فَلَمْ يَزَالُوا قِيَاماً حَتَّى نَفَذَتْ»[٤].

**واتە: یەزیدی کوڕی ثابت ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەوان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوون جەنازەیەک دەرکەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا ئەوانیش لەگەڵی هەڵسان، ئەوان بەردەوام بە پێوە بوون تا تێپەڕی.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣١٠، ومسلم: ٧٦ و ٩٥٩/٧٧، والترمذي: ١٠٤٣.

(٢) حسن الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح الإسناد.




## هەڵسانەوەو وەستان لەبەر جەنازەی هاوبەشدانەران

**١٩٢١-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، قَالَ: كَانَ سَهْلُ ابْنُ حُنَيْفٍ، وَقَيْسُ بْنُ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا بِالْقَادِسِيَّةِ، فَمُرَّ عَلَيْهِمَا بِجَنَازَةٍ، فَقَامَا، فَقِيلَ لَهُمَا: إِنَّهَا مِنْ أَهْلِ الْأَرْضِ، فَقَالَا: مُرَّ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِجَنَازَةٍ فَقَامَ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّهُ يَهُودِيٌّ، فَقَالَ: أَلَيْسَتْ نَفْساً؟»[١].

**واتە:** عەبدورڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا دەڵێ: لە قادسیە جەنازەیەک بەلای سەهلی کوڕی حونەیف و قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە (خوا لێیان ڕازی بێ) تێپەڕی هەڵسان، پێیان وترا: ئەمانە خاوەن زەویەکانن (واتە: خاوەن کتێبەکان، ئەوانەی لە دوای ڕزگارکردنی شوێنەکانیان لەلایەن سوپای مسوڵمانانەوە لەسەر زەوی خۆیان مابوونەوە) وتیان: جەنازەیەک تێپەڕی بەلای پێغەمبەری خوادا ﷺ هەڵسا، پێی وترا: ئەوە جولەکەیە، فەرمووی: ئایا نەفسێک نیە (واتە: ئایا نەوەی ئادەم نیە.).

**١٩٢٢-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: مَرَّتْ بِنَا جَنَازَةٌ فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقُمْنَا مَعَهُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا هِيَ جَنَازَةُ يَهُودِيَّةٍ، فَقَالَ: إِنَّ لِلْمَوْتِ فَزَعاً، فَإِذَا رَأَيْتُمُ الْجَنَازَةَ، فَقُومُوا»[٢].

**واتە:** جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: جەنازەیەک بەلاماندا تێپەڕی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵساو ئێمەش لەگەڵی هەڵساین، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، بێگومان ئەمە جەنازەیەکی جولەکەیە، فەرمووی: بەڕاستی مردن جۆرێک لە ترس و ڕاچەڵەکینی تێدایە، (نابێ بە بینینی مردوو هەر بەردەوام بن لەسەر بێئاگایی) ئەگەر جەنازەیەکتان بینی هەڵسنەوە لەبەری، (لەبەر گەورەیی مردن هەڵسن، نەک لەبەر بە گەورە دانانی مردووەکە).

## ڕێگەدان بە هەڵنەستان لەبەر مردوو

**١٩٢٣-** «عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فَمَرَّتْ بِهِ جَنَازَةٌ فَقَامُوا لَهَا، فَقَالَ عَلِيٌّ: مَا هَذَا؟ قَالُوا: أَمْرُ أَبِي مُوسَى، فَقَالَ: إِنَّمَا قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِجَنَازَةِ يَهُودِيَّةٍ وَلَمْ يَعُدْ بَعْدَ ذَلِكَ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣١٢، ومسلم: ٩٦١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣١١، ومسلم: ٩٦٠، وأبو داود: ٣١٧٤.

(٣) صحيح.




واتە: ئەبو مەعمەر دەڵێ: ئێمە لەلای عەلی (خوا لێیان ڕازی بێ) بووین جەنازەیەک تێپەڕی بەلایدا لەبەری هەڵسان، عەلی وتی: ئەمە چیە؟ وتیان: فەرمانی ئەبو مووسایە، عەلی وتی: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر جەنازەیەکی جولەکە هەڵسا دوای ئەوە دووبارەی نەکردەوە.

**١٩٢٤-** «عَنْ مُحَمَّدٍ، أَنَّ جَنَازَةً مَرَّتْ بِالْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ وَابْنِ عَبَّاسٍ ، فَقَامَ الْحَسَنُ وَلَمْ يَقُمْ ابْنُ عَبَّاسٍ، فَقَالَ الْحَسَنُ: أَلَيْسَ قَدْ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِجَنَازَةِ يَهُودِيٍّ؟ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: نَعَمْ، ثُمَّ جَلَسَ»[١].

واتە: موحەممەد دەڵێ: جەنازەیەک تێپەڕی بەلای حەسەنی کوڕی عەلی و ئیبنو عەبباس ، حەسەن هەڵساو ئیبنو عەبباس هەڵنەستا، حەسەن وتی: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵنەستا لەبەر جەنازەیەکی جولەکە؟ ئیبنو عەبباس وتی: با، (بەڵام) دواتر دانیشت.

**١٩٢٥-** «عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، قَالَ: مُرَّ بِجَنَازَةٍ عَلَى الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ، وَابْنِ عَبَّاسٍ ، فَقَامَ الْحَسَنُ، وَلَمْ يَقُمِ ابْنُ عَبَّاسٍ، فَقَالَ الْحَسَنُ لِابْنِ عَبَّاسٍ: أَمَا قَامَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: قَامَ لَهَا ثُمَّ قَعَدَ»[٢].

واتە: ئیبنو سیرین دەڵێ: جەنازەیەک تێپەڕی بەلای حەسەنی کوڕی عەلی و ئیبنو عەبباس ، حەسەن هەڵساو ئیبنو عەبباس هەڵنەستا، حەسەن بە ئیبنو عەبباسی وت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەری هەڵنەستا؟ ئیبنو عەبباس وتی: با، لە بەری هەڵسا، (بەڵام) دواتر دانیشت.

**١٩٢٦-** «عَنْ أبي مِجْلَزٍ عَن ابْنِ عَبَّاسٍ، وَالْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ ، مَرَّتْ بِهِمَا جَنَازَةٌ فَقَامَ أَحَدُهُمَا، وَقَعَدَ الْآخَرُ، فَقَالَ الَّذِي قَامَ: أَمَا وَاللَّهِ، لَقَدْ عَلِمْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ قَامَ، قَالَ لَهُ الَّذِي جَلَسَ: لَقَدْ عَلِمْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ جَلَسَ»[٣].

واتە: ئەبو میجلەز دەگێڕێتەوە: لە ئیبنو عەبباس و حەسەنی کوڕی عەلی ، جەنازەیەک تێپەڕی بەلایاندا یەکێکیان هەڵساو ئەویتر دانیشت، ئەوەی هەڵسا

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد.




**بوو وتی: سوێند بە خوا، چاک زانیوومە پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا، ئەوەی کە دانیشتبوو وتی: بەڕاستی منیش زانیم پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت.**

**١٩٢٧-** «عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ الْحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا كَانَ جَالِساً فَمُرَّ عَلَيْهِ بِجَنَازَةٍ، فَقَامَ النَّاسُ حَتَّى جَاوَزَتِ الْجَنَازَةُ، فَقَالَ الْحَسَنُ: إِنَّمَا مُرَّ بِجَنَازَةِ يَهُودِيٍّ وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى طَرِيقِهَا جَالِساً، فَكَرِهَ أَنْ تَعْلُوَ رَأْسَهُ جَنَازَةُ يَهُودِيٍّ، فَقَامَ»[١].

**واتە: جەعفەری کوڕی موحەممەد دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە، حەسەنی کوڕی عەلی (خوا لێیان ڕازی بێ) دانیشتبوو، جەنازەیەک تێپەڕێنرا بەلایدا، خەڵکەکە هەڵسان تا جەنازەکە تێپەڕی، حەسەن وتی: جەنازەیەکی جولەکە تێپەڕی، پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو لە سەر ڕێگاکەی، پێی ناخۆش بوو جەنازەیەکی جولەکە بەرزتر بێ لەسەر سەری، بۆیە هەڵسا.**

**١٩٢٨-** «عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو الزُّبَيْرِ أَنَّهُ سَمِعَ جَابِراً ﷺ يَقُولُ: قَامَ النَّبِيُّ ﷺ لِجَنَازَةِ يَهُودِيٍّ مَرَّتْ بِهِ حَتَّى تَوَارَتْ» وأَخْبَرَنِي أَبُو الزُّبَيْرِ أَيْضاً، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِراً رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَقُولُ: قَامَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَصْحَابُهُ لِجَنَازَةِ يَهُودِيٍّ حَتَّى تَوَارَتْ»[٢].

**واتە: ئیبنو جورەیج دەڵێ: ئەبو زوبەیر هەواڵی پێدام، ئەو گوێی لە جابر ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەر ﷺ هەڵسا لەبەر جەنازەیەکی جولەکە تا ون بوو (لەبەر چاو). هەروەها ئەبو زوبەیر هەواڵی پێدام، ئەو گوێی لە جابر ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی لە بەر جەنازەیەکی جولەکە هەڵسان تا ون بوو.**

**١٩٢٩-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ جَنَازَةً مَرَّتْ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَامَ، فَقِيلَ: إِنَّهَا جَنَازَةُ يَهُودِيٍّ، فَقَالَ: إِنَّمَا قُمْنَا لِلْمَلَائِكَةِ»[٣].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: جەنازەیەک تێپەڕی بەلای پێغەمبەری خوادا ﷺ لەبەری هەڵسا، وترا: ئەوە جەنازەی جولەکەیە، فەرمووی: ئێمە لەبەر فریشتەکان هەڵساین.**

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٩ و ٩٦٠/٨٠.

(٣) صحيح.

## حەسانەوەی بڕوادار بە مردن

**١٩٣٠-** «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ بْنِ رِبْعِيٍّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يُحَدِّثُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مُرَّ عَلَيْهِ بِجَنَازَةٍ فَقَالَ: مُسْتَرِيحٌ وَمُسْتَرَاحٌ مِنْهُ، فَقَالُوا: مَا الْمُسْتَرِيحُ وَمَا الْمُسْتَرَاحُ مِنْهُ؟ قَالَ: الْعَبْدُ الْمُؤْمِنُ يَسْتَرِيحُ مِنْ نَصَبِ الدُّنْيَا وَأَذَاهَا، وَالْعَبْدُ الْفَاجِرُ يَسْتَرِيحُ مِنْهُ الْعِبَادُ وَالْبِلَادُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ»[١].

**واتە:** ئەبو قەتادەی کوڕی ڕەبعی ﷺ دەگێڕێتەوە: جەنازەیەک تێپەڕێنرا بە لای پێغەمبەری خوادا ﷺ، فەرمووی: حەسایەوە یان دەحەسێنەوە لێی، وتیان: حەسایەوە یان دەحەسێنەوە لێی چیە؟ فەرمووی: بەندەی بڕوادار دەحەسێتەوە لە بەڵاو ناخۆشی و دنیاو نارەحەتیەکانی، بەندەی تاوانباریش خەڵکی و وڵات و داروو بەردو گیاندارەکان لێی دەحەسێنەوە.

## حەسانەوەی خەڵک بە مردنی بێبڕوایان

**١٩٣١-** «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا جُلُوساً عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذْ طَلَعَتْ جَنَازَةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مُسْتَرِيحٌ وَمُسْتَرَاحٌ مِنْهُ، الْمُؤْمِنُ يَمُوتُ فَيَسْتَرِيحُ مِنْ أَوْصَابِ الدُّنْيَا وَنَصَبِهَا وَأَذَاهَا، وَالْفَاجِرُ يَمُوتُ فَيَسْتَرِيحُ مِنْهُ الْعِبَادُ وَالْبِلَادُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ»[٢].

**واتە:** ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: ئێمە لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین لە ناکاو جەنازەیەک دەرکەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: حەسایەوەو دەحەسێنەوە لێی، بەندەی بڕوادار دەحەسێتەوە لە بەڵاو ناخۆشی دنیاو نارەحەتیەکانی، بەندەی تاوانباریش خەڵک و وڵات و داروو بەردو گیاندارەکان لێی دەحەسێنەوە.

## بابەت: ستایش و پیاهەڵدانی جەنازە

**١٩٣٢-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: مُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا خَيْراً، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: وَجَبَتْ، وَمُرَّ بِجَنَازَةٍ أُخْرَى فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا شَرّاً، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: وَجَبَتْ، فَقَالَ عُمَرُ: فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي، مُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِيَ

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥١٢ و ٦٥١٣، ومسلم: ٩٥٠.

(٢) صحيح.





عَلَيْهَا خَيْراً، فَقُلْتَ: وَجَبَتْ، وَمُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا شَرّاً، فَقُلْتَ: وَجَبَتْ، فَقَالَ: مَنْ أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ خَيْراً وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، وَمَنْ أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ شَرّاً وَجَبَتْ لَهُ النَّارُ، أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِي الْأَرْضِ»[١].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: جەنازەیەک تێپەڕێنرا ستایش و پیاهەڵدانی چاکەی کرا (خەڵک مەدحی کرد)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پێویست بوو، (دوای ماوەیەک) جەنازەیەکی تر بە لایدا تێپەڕێنرا بە خراپە باسیکرا (خەڵک زەمیان کرد)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پێویست بوو، عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) وتی: دایک و باوکم بە قوربانت بن، جەنازەیەک تێپەڕێنرا ستایش و پیاهەڵدانی چاکەی کرا، فەرمووت: پێویست بوو، پاشان جەنازەیەکی تر بە لاتدا تێپەڕێنرا باسی خراپەی کرا، فەرمووت: پێویست بوو، (مەبەستت چی بوو؟) (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: هەر کەس ئێوە ستایشی چاکەی بکەن ئەوە بەهەشتی بۆ پێویست دەبێ، وە هەر کەس لە ئێوە باسی خراپەی بکەن ئاگری بۆ پێویست دەبێت، ئێوە شایەتیدەری خوان لەسەر زەویدا.

**١٩٣٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: مَرُّوا بِجَنَازَةٍ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا خَيْراً، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: وَجَبَتْ، ثُمَّ مَرُّوا بِجَنَازَةٍ أُخْرَى فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا شَرّاً، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: وَجَبَتْ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَوْلُكَ الْأُولَى وَالْأُخْرَى وَجَبَتْ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: الْمَلَائِكَةُ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِي السَّمَاءِ، وَأَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِي الْأَرْضِ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: جەنازەیەکیان تێپەڕاند بەلای پێغەمبەردا ﷺ بە چاکە باسیان کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پێویست بوو، پاشان جەنازەیەکی تریان تێپەڕاند بەلایدا بە خراپە باسیان کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پێویست بوو، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، سەرەتاو کۆتاییت هەر فەرمووت: پێویست بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: فریشتەکان شایەتی خوان لە ئاسمانەکان و ئێوەش شایەتی خوان لەسەر زەوی.

**١٩٣٤-** «عَنْ أَبِي الْأَسْوَدِ الدِّيْلِيِّ قَالَ: أَتَيْتُ الْمَدِينَةَ فَجَلَسْتُ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فَمُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَى صَاحِبِهَا خَيْراً، فَقَالَ عُمَرُ: وَجَبَتْ، ثُمَّ مُرَّ بِأُخْرَى فَأُثْنِيَ عَلَى صَاحِبِهَا خَيْراً، فَقَالَ عُمَرُ: وَجَبَتْ، ثُمَّ مُرَّ بِالثَّالِثِ فَأُثْنِيَ عَلَى صَاحِبِهَا شَرّاً فَقَالَ عُمَرُ: وَجَبَتْ،

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٦٧ و ٢٦٤٢، ومسلم: ٩٤٩، والترمذي: ١٠٥٨، وإبن ماجه: ١٤٩١.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢٣٣، وإبن ماجه: ١٤٩٢.

فَقُلْتُ وَمَا وَجَبَتْ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ؟ قَالَ: قُلْتُ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَيُّمَا مُسْلِمٍ شَهِدَ لَهُ أَرْبَعَةٌ قَالُوا خَيْراً أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ، قُلْنَا: أَوْ ثَلَاثَةٌ؟ قَالَ: أَوْ ثَلَاثَةٌ، قُلْنَا: أَوِ اثْنَانِ، قَالَ: أَوِ اثْنَانِ»[١].

واتە: ئەبو ئەسوەدی دەیلی دەڵێ: هاتم بۆ مەدینە لەلای عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دانیشتم، جەنازەیەک تێپەڕێنرا ستایش و پیاهەڵدانی چاکەی خاوەنەکەی کرا، عومەر ﷺ وتی: پێویست بوو، پاشان جەنازەیەکی تر تێپەڕێنرا ستایش و پیاهەڵدانی چاکەی خاوەنەکەی کرا، عومەر ﷺ وتی: پێویست بوو، پاشان سێیەم جەنازە تێپەڕێنرا باسی خراپەی خاوەنەکەی کرا، عومەر ﷺ وتی: پێویست بوو، وتم: ئەی پێشەوای بڕواداران چی پێویست بوو؟ وتی: ئەوەم وت کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر مسوڵمانێک چوار کەس شایەتی چاکەی بۆ بدەن خوا دەیخاتە بەهەشتەوە، وتمان: ئەی سێ کەس؟ وتی: سێ کەسیش، وتمان: ئەی دووان؟ وتی: دووانیش.

## ڕێگە نەدان بە باسکردنی مردوو مەگەر بە چاکە بێت

**١٩٣٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: ذُكِرَ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ هَالِكٌ بِسُوءٍ فَقَالَ: لَا تَذْكُرُوا هَلْكَاكُمْ إِلَّا بِخَيْرٍ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ باسی مردوویەک کرا بە خراپە، فەرمووی: باسی مردووەکانتان مەکەن تەنها بە باشە نەبێت.

## قەدەغە کردن لە جنێو و توانج تانەدان لە مردووەکان

**١٩٣٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَسُبُّوا الْأَمْوَاتَ فَإِنَّهُمْ قَدْ أَفْضَوْا إِلَى مَا قَدَّمُوا»[٣].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جنێوو تانەو توانج لە مردووەکان مەدەن، چونکە ئەوان تازە گەیشتن بەوەی پێشیان خستبوو.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٦٨ و ٢٦٤٣، والترمذي: ١٠٥٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٩٣ و ٦٥١٦.




**١٩٣٧-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَتْبَعُ الْمَيِّتَ ثَلَاثَةٌ: أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَعَمَلُهُ، فَيَرْجِعُ اثْنَانِ أَهْلُهُ وَمَالُهُ، وَيَبْقَى وَاحِدٌ عَمَلُهُ»[١].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سێ شت شوێنی مردوو دەکەوێت: کەسوکاری و سامانەکەی و کردەوەکانی، دووانیان دەگەڕێنەوە، کەس و کارو ماڵ و سامانەکەی، یەک دانەیشیان دەمێنێتەوە ئەویش کردەوەکانیەتی.**

**١٩٣٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لِلْمُؤْمِنِ عَلَى الْمُؤْمِنِ سِتُّ خِصَالٍ: يَعُودُهُ إِذَا مَرِضَ، وَيَشْهَدُهُ إِذَا مَاتَ، وَيُجِيبُهُ إِذَا دَعَاهُ، وَيُسَلِّمُ عَلَيْهِ إِذَا لَقِيَهُ، وَيُشَمِّتُهُ إِذَا عَطَسَ، وَيَنْصَحُ لَهُ إِذَا غَابَ أَوْ شَهِدَ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بڕوادار شەش مافی هەیە بەسەر بڕوادارەوە: کاتێ نەخۆش کەوت سەردانی بکات، کاتێکیش کە مرد ئامادەی تەرمەکەی ببێت (تا دەنێژرێ)، کاتێکیش دەعوەتی کرد بە دەمیەوە بچێت، کاتێکیش پێی گەیشت سڵاوی لێ بکات، کاتێکیش دەپژمێت دوعاو نزای بۆ بکات (پێی بڵێ: یرحمک الله)، بۆی دڵسۆز بێت لە کاتێکدا نادیار بێت، یان ئامادە بێت.**

## فەرمان کردن بە شوێنکەوتنی جەنازە

**١٩٣٩-** «عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِسَبْعٍ، وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ: أَمَرَنَا بِعِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَتَشْمِيتِ الْعَاطِسِ، وَإِبْرَارِ الْقَسَمِ، وَنُصْرَةِ الْمَظْلُومِ، وَإِفْشَاءِ السَّلَامِ، وَإِجَابَةِ الدَّاعِي، وَاتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ، وَنَهَانَا عَنْ خَوَاتِيمِ الذَّهَبِ، وَعَنْ آنِيَةِ الْفِضَّةِ، وَعَنِ الْمَيَاثِرِ، وَالْقَسِّيَّةِ، وَالْإِسْتَبْرَقِ، وَالْحَرِيرِ، وَالدِّيبَاجِ»[٣].

**واتە: بەڕائی کوڕی عازب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین بە حەوت شت و ڕێگریشی لێ کردین لە حەوت شت: فەرمانی پێکردین بە سەردانی**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥١٤، ومسلم: ٢٩٦٠، والترمذي: ٢٣٧٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٤٠، ومسلم: ٢١٦٢، وأبو داود: ٥٠٣٠، والترمذي: ٢٧٣٧، وإبن ماجه: ١٤٣٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٣٩ و ٢٤٤٥ و ٥١٧٥ و ٥٦٣٥ و ٥٦٥٠ و ٥٨٣٨ و ٥٨٤٩ و ٥٨٦٣ و ٦٢٢٢ و ٦٦٥٤، ومسلم: ٢٠٦٩/٣٠، والترمذي: ١٧٦٠ و ٢٨٠٩، وإبن ماجه: ٢١١٥ و ٣٥٨٩.





نەخۆش و نزا کردن بۆ ئەو کەسەی دەپژمێت، سوێند بردنە سەرو سەرخستنی ستەم لێکراوو بڵاوکردنەوەی سەلام کردن، وە چوون بۆ سەر دەعوەتی و شوێنکەوتنی جەنازە، وە ڕێگری لێکردین لە: بەکارهێنانی موستیلەی ئاڵتوون و بەکارهێنانی قاپ و قاچاخی زیو، وە جلی وشتر کە لە ئاوریشم بێت، وە لە بەکارهێنانی ئاوریشم و دیباج و جل و بەرگ بە ئاوریشم تێکەڵ کراو.

## فەزڵ و گەورەیی ئەو کەسەی شوێنی جەنازە دەکەوێ

**١٩٤٠-** «عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ تَبِعَ جَنَازَةً حَتَّى يُصَلَّى عَلَيْهَا كَانَ لَهُ مِنَ الْأَجْرِ قِيرَاطٌ، وَمَنْ مَشَى مَعَ الْجَنَازَةِ حَتَّى تُدْفَنَ كَانَ لَهُ مِنَ الْأَجْرِ قِيرَاطَانِ، وَالْقِيرَاطُ مِثْلُ أُحُدٍ»(١).

**واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک شوێنی جەنازەیەک بکەوێت تا نوێژی لەسەر دەکرێت ئەوە پاداشتی قیراتێکی بۆ هەیە، وە هەر کەسێک لەگەڵ جەنازەیەکدا ڕێ بکات تا دەنێژرێت ئەوە پاداشتی دوو قیراتی بۆ هەیە، قیراتیش بە ئەندازەی کێوی ئوحودە.**

**١٩٤١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْمُغَفَّلِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ تَبِعَ جِنَازَةً حَتَّى يُفْرَغَ مِنْهَا فَلَهُ قِيرَاطَانِ، فَإِنْ رَجَعَ قَبْلَ أَنْ يُفْرَغَ مِنْهَا فَلَهُ قِيرَاطٌ»(٢).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موغەفەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک شوێنی جەنازەیەک بکەوێت تا دەنێژرێت، ئەوە دوو قیراتی بۆ هەیە، وە ئەگەر گەڕایەوە پێش ئەوەی بنێژرێ ئەوە یەک قیراتی بۆ هەیە.**

## شوێنی سوار لە کاتی بە ڕێ کردنی جەنازەدا

**١٩٤٢-** «عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، الرَّاكِبُ خَلْفَ الْجَنَازَةِ، وَالْمَاشِي حَيْثُ شَاءَ مِنْهَا، وَالطِّفْلُ يُصَلَّى عَلَيْهِ»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣١٨٠، والترمذي: ١٠٣١، وإبن ماجه: ١٥٠٧.




واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوار لە پشتی جەنازەوە دەبێت، پیادەش لە هەر شوێنێک دەبێت کە بیەوێ، منداڵیش نوێژی لەسەر دەکرێت.

## شوێنی پیادە لە بە ڕێ کردنی جەنازەدا

**١٩٤٣-** «عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الرَّاكِبُ خَلْفَ الْجَنَازَةِ، وَالْمَاشِي حَيْثُ شَاءَ مِنْهَا، وَالطِّفْلُ يُصَلَّى عَلَيْهِ»[١].

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوار لە پشتی جەنازەوە دەبێت، پیادەش لە هەر شوێنێک دەبێت کە بیەوێت، منداڵیش نوێژی لەسەر دەکرێت.

**١٩٤٤-** «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَأَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَمْشُونَ أَمَامَ الْجَنَازَةِ»[٢].

واتە: سالم دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە ﷺ، ئەو پێغەمبەری خوا ﷺو ئەبو بەکرو عومەری بینی لە پێشی جەنازەوە ڕێیان دەکرد (خوا لێیان ڕازی بێ).

**١٩٤٥-** «عَنْ سُفْيَانُ، وَمَنْصُورٌ، وَزِيَادٌ، وَبَكْرٌ هُوَ ابْنُ وَائِلٍ كُلُّهُمْ ذَكَرُوا، أَنَّهُمْ سَمِعُوا مِنَ الزُّهْرِيِّ يُحَدِّثُ، أَنَّ سَالِماً أَخْبَرَهُ، أَنَّ أَبَاهُ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ وَأَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ يَمْشُونَ بَيْنَ يَدَيِ الْجَنَازَةِ، بَكْرٌ وَحْدَهُ لَمْ يَذْكُرْ عُثْمَانَ»[٣].

واتە: سوفیان و مەنصورو زیادو بەکری کوڕی وائیل هەموویان باسیان کردوە، لە زوهریەوە بیستوویانە دەیگێڕایەوە، سالم هەواڵی پێداوە، (ئەویش) باوکی ﷺ هەواڵی پێداوە، ئەو پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان بینی لە پێشی جەنازەوە ڕێیان دەکرد (واتە: دەڕۆیشتن)، تەنها بەکر باسی عوسمانی نەکردوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣١٧٩، والترمذي: ١٠٠٧ و ١٠٠٨، وإبن ماجه: ١٤٨٢.

(٣) صحيح.




## فەرمان بە نوێژ كردن لە سەر مردوو

١٩٤٦- «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ أَخَاكُمْ قَدْ مَاتَ فَقُومُوا فَصَلُّوا عَلَيْهِ»[١].

واتە: عیمرانی كوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان براكەتان مرد هەستن نوێژی لەسەر بكەن.

## نوێژ كردنی جەنازە لەسەر منداڵان

١٩٤٧- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِصَبِيٍّ مِنْ صِبْيَانِ الْأَنْصَارِ، فَصَلَّى عَلَيْهِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ: طُوبَى لِهَذَا عُصْفُورٌ مِنْ عَصَافِيرِ الْجَنَّةِ، لَمْ يَعْمَلْ سُوءاً وَلَمْ يُدْرِكْهُ، قَالَ: أَوَ غَيْرُ ذَلِكَ يَا عَائِشَةُ، خَلَقَ اللَّهُ ﷻ الْجَنَّةَ وَخَلَقَ لَهَا أَهْلاً، وَخَلَقَهُمْ فِي أَصْلَابِ آبَائِهِمْ، وَخَلَقَ النَّارَ وَخَلَقَ لَهَا أَهْلاً، وَخَلَقَهُمْ فِي أَصْلَابِ آبَائِهِمْ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: منداڵێكیان هێنا (كە مردبوو) بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە منداڵانی ئەنصار، نوێژی لەسەر كرد، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: وتم: خۆشبەختی بۆی چۆلەكەیەكە لە چۆلەكەكانی بەهەشت، نە خراپەی كردوەو نە پێی گەیشتووە، فەرمووی: لە غەیری ئەوە شتێكی تر هەیە ئەی عائیشە، خوا ﷻ بەهەشتی دروست كردوەو خەڵكانێكی بۆ دروست كردوە، دروستی كردوون ئەوان لە پشتی باب و باپیرانیاندا بوون، وە ئاگری دروست كردوەو خەڵكانێكی بۆ دروست كردوە، دروستی كردوون لە پشتی باب و باپیرانیاندا بوون.

## نوێژ كردنی جەنازە لەسەر منداڵان

١٩٤٨- «عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ أَنَّهُ ذَكَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الرَّاكِبُ خَلْفَ الْجَنَازَةِ، وَالْمَاشِي حَيْثُ شَاءَ مِنْهَا، وَالطِّفْلُ يُصَلَّى عَلَيْهِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٥٣، والترمذي: ١٠٣٩، وإبن ماجه: ١٥٣٥.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٠ و ٢٦٦٢/٣١، وأبو داود: ٤٧١٣، وإبن ماجه: ٨٢.

(٣) صحيح.





واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوار لە پشتی جەنازەوە دەبێت، پیادەش لە هەر شوێنێک دەبێت کە بیەوێت، منداڵیش نوێژی لەسەر دەکرێت.

## منداڵی هاوبەشدانەران

**١٩٤٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ أَوْلَادِ الْمُشْرِكِينَ، فَقَالَ: اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی منداڵی هاوبەشدانەران؟ فەرمووی: خوا خۆی زاناترە بەوەی ئەگەر لە ژیاندا بوونایە چیان دەکرد. (واتە: چارەنووسیان تەنها خوا خۆی دەیزانێ).

**١٩٥٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ عَنْ أَوْلَادِ الْمُشْرِكِينَ، فَقَالَ: اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی منداڵی هاوبەشدانەران، فەرمووی: خوا خۆی زاناترە بەوەی ئەگەر لە ژیاندا بوونایە چیان دەکرد.

**١٩٥١-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ أَوْلَادِ الْمُشْرِكِينَ، فَقَالَ: خَلَقَهُمُ اللَّهُ حِينَ خَلَقَهُمْ وَهُوَ يَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی منداڵی هاوبەشدانەران، فەرمووی: کاتێ خوا دروستی کردوون دەیزانی بەوەی لە ژیاندا بوونایە چیان دەکرد.

**١٩٥٢-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ ذَرَارِيِّ الْمُشْرِكِينَ، فَقَالَ: اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٨٤ و ٦٦٠٠، ومسلم: ٢٦ و ٢٦٥٩/٢٧، وأبو داود: ٤٧١٤، والترمذي: ٢١٣٨.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٨٣ و ٦٥٩٧، ومسلم: ٢٦٦٠، وأبو داود: ٤٧١١.

(٤) صحيح.




**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی وەچەی هاوبەشدانەران، فەرمووی: خوا زانایە بەوەی ئەوان ئەگەر لە ژیاندا بوونایە چیان دەکرد.**

## نوێژ کردن لەسەر شەهیدەکان

**١٩٥٣-** «عَنْ شَدَّادِ بْنِ الْهَادِ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً مِنَ الْأَعْرَابِ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَآمَنَ بِهِ وَاتَّبَعَهُ، ثُمَّ قَالَ: أُهَاجِرُ مَعَكَ، فَأَوْصَى بِهِ النَّبِيُّ ﷺ بَعْضَ أَصْحَابِهِ، فَلَمَّا كَانَتْ غَزْوَةٌ غَنِمَ النَّبِيُّ ﷺ سَبْياً، فَقَسَمَ وَقَسَمَ لَهُ، فَأَعْطَى أَصْحَابَهُ مَا قَسَمَ لَهُ، وَكَانَ يَرْعَى ظَهْرَهُمْ، فَلَمَّا جَاءَ دَفَعُوهُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: مَا هَذَا؟، قَالُوا: قِسْمٌ قَسَمَهُ لَكَ النَّبِيُّ ﷺ، فَأَخَذَهُ فَجَاءَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: مَا هَذَا؟ قَالَ: قَسَمْتُهُ لَكَ، قَالَ: مَا عَلَى هَذَا اتَّبَعْتُكَ، وَلَكِنِّي اتَّبَعْتُكَ عَلَى أَنْ أُرْمَى إِلَى هَاهُنَا، وَأَشَارَ إِلَى حَلْقِهِ بِسَهْمٍ، فَأَمُوتَ فَأَدْخُلَ الْجَنَّةَ فَقَالَ: إِنْ تَصْدُقِ اللَّهَ يَصْدُقْكَ، فَلَبِثُوا قَلِيلاً ثُمَّ نَهَضُوا فِي قِتَالِ الْعَدُوِّ، فَأُتِيَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ يُحْمَلُ قَدْ أَصَابَهُ سَهْمٌ حَيْثُ أَشَارَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَهُوَ هُوَ؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: صَدَقَ اللَّهَ فَصَدَقَهُ، ثُمَّ كَفَّنَهُ النَّبِيُّ ﷺ فِي جُبَّةِ النَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ قَدَّمَهُ فَصَلَّى عَلَيْهِ، فَكَانَ فِيمَا ظَهَرَ مِنْ صَلَاتِهِ: اللَّهُمَّ هَذَا عَبْدُكَ خَرَجَ مُهَاجِراً فِي سَبِيلِكَ فَقُتِلَ شَهِيداً أَنَا شَهِيدٌ عَلَى ذَلِكَ»[١].

**واتە: شەدادی کوڕی هاد ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێکی دەشتەکی هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بڕوای پێ هێناو شوێنی کەوت، پاشان وتی، لەگەڵتدا کۆچ دەکەم، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەو پیاوە وەسیەتی کرد بە هەندێ لە هاوەڵانی، کاتێ کەوتنە غەزا کردن پێغەمبەر ﷺ کۆیلەیەکی زۆری بە دەستکەوت گرتنی، (دوایی) دابەشی کردن و بەشی ئەویشی دابە هاوەڵەکانی پێی بدەن، چاودێری پشتەوەیانی دەکرد، کاتێ هات پێیاندا، وتی: ئەمە چیە؟ وتیان: بەشی تۆیە پێغەمبەر ﷺ دابەشی کردوە، لەگەڵ خۆی هێنای بۆ لای پێغەمبەر، وتی: ئەمە چیە؟ فەرمووی: بەشی تۆیە، وتی: من لەسەر ئەمە بەیعەتم پێت نەداوە، بەڵکو لەسەر ئەوە بەیعەتم پێداوی تیرێک بدرێ لە ئێرەم، ئاماژەی بۆ گەردنی کرد، بمرم و بچمە بەهەشتەوە، فەرمووی: ئەگەر لەگەڵ خوا ڕاست بکەی دێتەجێ، ماوەیەکی کەم مانەوە، پاشان هەڵسان بۆ جەنگی دوژمن، دواترا هێنرا بۆ**

---

(١) صحيح.




لای پێغەمبەر ﷺ تیرێک بەر ئەو شوێنەی کەوتبوو کە ئاماژەی بۆ کردبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە ئەو پیاوە بوو؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: لەگەڵ خوا ڕاستی گوت، خواش ڕاستی لەگەڵ کرد، پاشان پێغەمبەر ﷺ بە عەباکەی خۆی کفنی کرد، ئنجا پێشی خست و نوێژی لەسەری کرد، ئەوەی لە نوێژەکەیدا دەرکەوت (لە دوعاکانی کە بۆی دەکرد دەیفەرموو): خوایە ئەمە بەندەی تۆیە هیجرەتی کردوە لە پێناوی تۆداو بە شەهیدی کوژراوەو، منیش شایەتم لەسەر ئەوە.

**١٩٥٤-** «عَنْ عُقْبَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ يَوْماً فَصَلَّى عَلَى أَهْلِ أُحُدٍ صَلَاتَهُ عَلَى الْمَيِّتِ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: إِنِّي فَرَطٌ لَكُمْ وَأَنَا شَهِيدٌ عَلَيْكُمْ»[١].

واتە: عوقبە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێک دەرچوو نوێژی لەسەر شەهیدەکانی ئوحود کرد وەکو چۆن نوێژی لەسەر هەر مردوویەک دەکرد، پاشان هاتەوەو چووە سەر مینبەرو فەرمووی: من پێشتان دەکەوم (بۆ سەر حەوزەکەم) من شایەتم لەسەرتان.

## نەکردنی نوێژی جەنازە لەسەر شەهیدان

**١٩٥٥-** «عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَجْمَعُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ مِنْ قَتْلَى أُحُدٍ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ يَقُولُ: أَيُّهُمَا أَكْثَرُ أَخْذاً لِلْقُرْآنِ؟ فَإِذَا أُشِيرَ إِلَى أَحَدِهِمَا قَدَّمَهُ فِي اللَّحْدِ، قَالَ: أَنَا شَهِيدٌ عَلَى هَؤُلَاءِ، وَأَمَرَ بِدَفْنِهِمْ فِي دِمَائِهِمْ، وَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِمْ، وَلَمْ يُغَسَّلُوا»[٢].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) هەواڵی داوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو کەسی پێکەوە کۆدەکردەوە لە کوژراوەکانی ئوحود لە یەک پۆشاکدا، پاشان دەیفەرموو: کامەیان قورئانی زیاتر لەبەرە؟ ئەگەر ئاماژەیان بکردایە بۆ یەکێکیان ئەوەی بۆ ناو گۆڕەکە پێش دەخست، فەرمووی: من شایەتم لەسەر ئەمانە، وە فەرمانی کرد بە خوێنەکانیانەوە بنێژرێن، نوێژی لەسەریان نەکردو نەشۆردران.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٤٤ و ٣٥٩٦ و ٤٠٤٢ و ٤٠٨٥ و ٦٤٢٦ و ٦٥٩٠، ومسلم: ٣٠ و ٢٢٩٦/٣١، وأبو داود: ٣٢٢٣ و ٣٢٢٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٤٣ و ١٣٤٦ و ١٣٤٧ و ١٣٤٨ و ١٣٥٣ و ٤٠٧٩، وأبو داود: ٣١٣٨ و ٣١٣٩، والترمذي: ١٠٣٦، وإبن ماجه: ١٥١٤.




## بابەت: نوێژ نەكردن لەسەر ڕەجم كراو

**١٩٥٦-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَسْلَمَ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَاعْتَرَفَ بِالزِّنَا، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ اعْتَرَفَ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ اعْتَرَفَ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ حَتَّى شَهِدَ عَلَى نَفْسِهِ أَرْبَعَ مَرَّاتٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَبِكَ جُنُونٌ؟، قَالَ: لَا، قَالَ: أَحْصَنْتَ؟ قَالَ: نَعَمْ فَأَمَرَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ، فَرُجِمَ، فَلَمَّا أَذْلَقَتْهُ الْحِجَارَةُ، فَرَّ فَأُدْرِكَ فَرُجِمَ فَمَاتَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: خَيْراً، وَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِ»[١].

واتە: جابری كوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک لە ئەسلەم هات بۆ لای پێغەمبەر دانی نا بەوەی زینای كردوە، ڕووی لێ وەرگێڕا، پاشان (پیاوەكە بۆ جاری دووەم) دانی پێدانا، پاشان (بۆ جاری سێیەم) دانی پێدانا، پاشان پێغەمبەری خواش ڕووی لێ وەرگێڕا، تا چوار جار شایەتی لەسەر خۆیدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا تۆ شێتی و ناتەواویت تێدایە؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ژنت هێناوە؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كرد بە ڕەجم كردنی و ڕەجم كرا، كاتێ بەردەكان ئازاریان پێگەیاند ڕای كرد، بەڵام پێی گەیشتن و هەر بەردبارانیان كرد تا وەفاتی كرد، پێغەمبەر ﷺ قسەی باشی دەربارەی كرد، بەڵام نوێژی لەسەر نەكرد.

## نوێژكردن لە سەر ڕەجم كراو

**١٩٥٧-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، أَنَّ امْرَأَةً مِنْ جُهَيْنَةَ أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: إِنِّي زَنَيْتُ، وَهِيَ حُبْلَى، فَدَفَعَهَا إِلَى وَلِيِّهَا فَقَالَ: أَحْسِنْ إِلَيْهَا، فَإِذَا وَضَعَتْ فَأْتِنِي بِهَا، فَلَمَّا وَضَعَتْ جَاءَ بِهَا، فَأَمَرَ بِهَا فَشُكَّتْ عَلَيْهَا ثِيَابُهَا، ثُمَّ رَجَمَهَا، ثُمَّ صَلَّى عَلَيْهَا، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: أَتُصَلِّي عَلَيْهَا وَقَدْ زَنَتْ، فَقَالَ: لَقَدْ تَابَتْ تَوْبَةً لَوْ قُسِمَتْ بَيْنَ سَبْعِينَ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ لَوَسِعَتْهُمْ، وَهَلْ وَجَدْتَ تَوْبَةً أَفْضَلَ مِنْ أَنْ جَادَتْ بِنَفْسِهَا لِلَّهِ ﷻ»[٢].

واتە: عیمرانی كوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک لە جوهەینە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: من زینام كردوە، ئەو ئافرەتە دوو گیان بوو، پێغەمبەر ﷺ دای بە دەستی خاوەنەكەی و فەرمووی: چاک بە لەگەڵیدا، ئەگەر منداڵەكەی بوو

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٨٢٠، ومسلم: ١٦٩١/١٦، وأبو داود: ٤٤٣٠، والترمذي: ١٤٢٩.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٩٦، وأبو داود: ٤٤٤٠، والترمذي: ١٤٣٥، وإبن ماجه: ٢٥٥٥.

بۆم بهێنەوە، کاتێک منداڵەکەی بوو بۆی هێنا، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد جلەکانی پێچرا بە دەوریدا، پاشان ڕەجم کرا، پاشان نوێژی لەسەر کرد، عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) پێی وت: ئایا نوێژی لەسەر دەکەی کە ئەو زینای کردوە، فەرمووی: بەڕاستی ئەم ئافرەتە تەوبەیەکی کردوە، ئەگەر دابەش بکرایە لە نێوان حەفتا کەسی مەدینەدا بەشی دەکردن، ئایا تەوبەیەکت بینیوە لەوە چاکتر کە نەفسی خۆی پێشکەشی خوا بکات.

## نوێژ کردن لەسەر کەسێک ستەم لە وەسیەتەکەیدا دەکات

**١٩٥٨-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً أَعْتَقَ سِتَّةً مَمْلُوكِينَ لَهُ عِنْدَ مَوْتِهِ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرَهُمْ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ، فَغَضِبَ مِنْ ذَلِكَ وَقَالَ: لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ لَا أُصَلِّيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ دَعَا مَمْلُوكِيهِ فَجَزَّأَهُمْ ثَلَاثَةَ أَجْزَاءٍ، ثُمَّ أَقْرَعَ بَيْنَهُمْ، فَأَعْتَقَ اثْنَيْنِ وَأَرَقَّ أَرْبَعَةً»[١].

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێک لە سەرەمەرگیدا شەش کۆیلەی هەبوو هەموویانی ئازاد کرد، جگە لەوانە هیچ ماڵ و سامانێکی نەبوو، ئەو (هەواڵ)ـە گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ بەو هۆیەوە توڕە بوو، فەرمووی: هات بە خەیاڵمدا نوێژی لەسەر نەکەم، پاشان بانگی کۆیلەکانی کردو کردنی بە سێ بەشەوە، دواتر قورعەی لە نێوانیاندا کرد، دووانی لێ ئازاد کردن و چواری هێشتنەوە.

## نوێژ کردن لەسەر ئەو کەسەی کە دزی و ناپاکی دەکات لە دەستکەوتی جەنگ

**١٩٥٩-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ ﷺ قَالَ: مَاتَ رَجُلٌ بِخَيْبَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ إِنَّهُ غَلَّ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَفَتَّشْنَا مَتَاعَهُ فَوَجَدْنَا فِيهِ خَرَزاً مِنْ خَرَزِ يَهُودَ مَا يُسَاوِي دِرْهَمَيْنِ»[٢].

واتە: زەیدی کوڕی خالد ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە خەیبەر مرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن بە دڵنیایی ئەو دزی و ناپاکی کردوە لە (دەستکەوتی جەنگ) لە ڕێگای خوادا، ئێمەیش پشکنینی کەل و پەلەکەیان کرد بینیمان موورویەکی تێدایە لە موورووەکانی جولەکە بە ئەندازەی دوو درهەم.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٦٨/٥٧، وأبو داود: ٣٩٥٨ و ٣٩٥٩ و ٣٩٦١، والترمذي: ١٣٦٤، وإبن ماجه: ٢٣٤٥.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٧١٠، وإبن ماجه: ٢٨٤٨.

## نوێژ کردن لەسەر ئەو کەسەی قەرزی لەسەرە

**١٩٦٠-** «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ قال: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُتِيَ بِرَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ لِيُصَلِّيَ عَلَيْهِ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ فَإِنَّ عَلَيْهِ دَيْناً، قَالَ: أَبُو قَتَادَةَ هُوَ عَلَيَّ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: بِالْوَفَاءِ قَالَ: بِالْوَفَاءِ، فَصَلَّى عَلَيْهِ»[١].

**واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: پیاوێکیان لە ئەنصار هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر بکات، فەرمووی: نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن، چونکە بەڕاستی ئەو قەرزی لەسەرە، ئەبو قەتادە (دەڵێ ئەو) وتوویەتی: من قەرزەکەی بۆ دەبژێرم (لە جیاتی ئەو دەیدەمەوە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێن بێت. وتی: بەڵێن بێت: ئینجا نوێژی لەسەر کرد.**

**١٩٦١-** «عَنْ سَلَمَةَ ابْنِ الْأَكْوَعِ ﷺ قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِجَنَازَةٍ، فَقَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، صَلِّ عَلَيْهَا، قَالَ: هَلْ تَرَكَ عَلَيْهِ دَيْناً؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: هَلْ تَرَكَ مِنْ شَيْءٍ؟ قَالُوا: لَا، قَالَ: صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ» قَالَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ: أَبُو قَتَادَةَ: صَلِّ عَلَيْهِ وَعَلَيَّ دَيْنُهُ، فَصَلَّى عَلَيْهِ»[٢].

**واتە: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەڵێ: جەنازەیەکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا نوێژی لەسەر بکە، فەرمووی: ئایا قەرزی لەسەرە؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ئایا شتێکی بەجێهێشتووە؟ وتیان: نەخێر، فەرمووی: نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن، پیاوێک لە ئەنصارەکان پێی دەوترا: ئەبو قەتادە، وتی: نوێژی لەسەر بکە قەرزەکەیشی لەسەر من، ئینجا (پێغەمبەر ﷺ) نوێژی لەسەر کرد.**

**١٩٦٢-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لَا يُصَلِّي عَلَى رَجُلٍ عَلَيْهِ دَيْنٌ، فَأُتِيَ بِمَيِّتٍ، فَسَأَلَ: أَعَلَيْهِ دَيْنٌ؟ قَالُوا: نَعَمْ، عَلَيْهِ دِينَارَانِ، قَالَ: صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ، قَالَ أَبُو قَتَادَةَ: هُمَا عَلَيَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَصَلَّى عَلَيْهِ، فَلَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ ﷺ قَالَ: أَنَا أَوْلَى بِكُلِّ مُؤْمِنٍ مِنْ نَفْسِهِ، مَنْ تَرَكَ دَيْناً فَعَلَيَّ، وَمَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِهِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٠٦٩، وإبن ماجه: ٢٤٠٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٨٩ و ٢٢٩٥.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٩٥٦ و ٣٣٤٣.




واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر کەسێک نەدەکرد قەرزی لەسەر بووایە، مردوویەکیان هێنا، پرسیاری کرد: ئایا قەرزی لە سەرە؟ وتیان: بەڵێ، دوو دینار قەرزارە، فەرمووی: نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن. ئەبو قەتادە وتی: هەردوو دینارەکە لەسەر من، بۆی دەبژێرم ئەی پێغەمبەری خوا، پاشان نوێژی لەسەر کرد، کاتێ خوا دەرووی لە پێغەمبەرەکەی کردەوەو (باری ئابوری باش بوو)، فەرمووی: من لە پێشترم بۆ هەموو بڕوادارێک لە نەفسی خۆی، هەر کەس قەرزی بەجێهێشتووە من دەیبژێرم، هەر کەسیش ماڵ و سامانی بەجێهێشتووە بۆ میراتگرەکانیەتی.

**١٩٦٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا تُوُفِّيَ الْمُؤْمِنُ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ سَأَلَ: هَلْ تَرَكَ لِدَيْنِهِ مِنْ قَضَاءٍ؟ فَإِنْ قَالُوا: نَعَمْ صَلَّى عَلَيْهِ، وَإِنْ قَالُوا: لَا، قَالَ: صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ، فَلَمَّا فَتَحَ اللَّهُ ﷻ عَلَى رَسُولِهِ ﷺ قَالَ: أَنَا أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، فَمَنْ تُوُفِّيَ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ فَعَلَيَّ قَضَاؤُهُ، وَمَنْ تَرَكَ مَالاً فَهُوَ لِوَرَثَتِهِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بڕوادارێک بمردایەو قەرزی لەسەر بووایە دەیپرسی: ئایا شتێکی بەجێهێشتووە قەرزەکەی پێ بداتەوە؟ ئەگەر بیانوتایە: بەڵێ، نوێژی لەسەر دەکرد، وە ئەگەر بیانوتایە: نەخێر، دەیفەرموو: نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن. کاتێ خوا دەرووی لە پێغەمبەرەکەی کردەوەو (باری ئابوری باش بوو)، فەرمووی: من لە پێشترم بۆ هەموو بڕواداران لە نەفسی خۆیان، هەر کەس قەرزی بەجێهێشتووە من دەیبژێرم، هەرکەسیش ماڵ و سامانی بەجێهێشتووە بۆ میراتگرەکانیەتی.

## نوێژ نەکردن لەسەر ئەو کەسەی خۆی دەکوژێت

**١٩٦٤-** «عَنِ ابْنِ سَمُرَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً قَتَلَ نَفْسَهُ بِمَشَاقِصَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَمَّا أَنَا فَلَا أُصَلِّي عَلَيْهِ»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٩٨ و ٢٣٩٨ و ٢٣٩٩ و ٤٧٨٩ و ٥٣٧١ و ٦٧٣١ و ٦٧٤٥ و ٦٧٦٣، ومسلم: ١٤ و ١٦١٩/١٧، والترمذي: ١٠٧٠ و ٢٠٩٠، وإبن ماجه: ٢٤١٥.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٧٨، وأبو داود: ٣١٨٥، والترمذي: ١٠٦٨، وإبن ماجه: ١٥٢٦.




واتە: ئیبنو سەمورە ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێک بە سەرە ڕمێک خۆی کوشت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (لەبەر ئەوەی خۆی کوشتوە بۆیە) من نوێژی لەسەر ناکەم.

**١٩٦٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ تَرَدَّى مِنْ جَبَلٍ، فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَهُوَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ يَتَرَدَّى خَالِداً مُخَلَّداً فِيهَا أَبَداً، وَمَنْ تَحَسَّى سُمّاً فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَسُمُّهُ فِي يَدِهِ يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِداً مُخَلَّداً فِيهَا أَبَداً، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ، «ثُمَّ انْقَطَعَ عَلَيَّ شَيْءٌ خَالِدٌ يَقُولُ» كَانَتْ حَدِيدَتُهُ فِي يَدِهِ يَجَأُ بِهَا فِي بَطْنِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِداً مُخَلَّداً فِيهَا أَبَداً»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە شاخێک خۆی بخاتە خوارەوەو خۆی بکوژێت، ئەوە لە شاخەکانی دۆزەخەوە دەکەوێتە خوارەوە بۆ ناو شیوەکانی، بە هەمیشەیی تیایدا دەمێنێتەوە، هەر کەس خۆی ژەهر خوارد بکات و خۆی بکوژێت، ئەوە لە دۆزەخدا ژەهرەکە بەدەستیەوەیە بە هەمیشەیی دەیخوات و تیایدا دەمێنێتەوە، وە هەرکەس بە ئاسنێ خۆی بکوژێت، «پاشان شتێکم لە فەرموودەکە لێ پچڕا، خالد وتی»: ئاسنەکە بەدەستیەوەیە دەیکاتە ورگی خۆیدا لە ناو ئاگری دۆزەخ بە هەمیشەیی تیایدا دەمێنێتەوە.

## نوێژ کردن لەسەر دووڕووەکان

**١٩٦٦-** «عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: لَمَّا مَاتَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ دُعِيَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِيُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَلَمَّا قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَثَبْتُ إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تُصَلِّي عَلَى ابْنِ أُبَيٍّ وَقَدْ قَالَ: يَوْمَ كَذَا وَكَذَا كَذَا وَكَذَا أُعَدِّدُ عَلَيْهِ، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ: أَخِّرْ عَنِّي يَا عُمَرُ، فَلَمَّا أَكْثَرْتُ عَلَيْهِ، قَالَ: إِنِّي قَدْ خُيِّرْتُ فَاخْتَرْتُ، فَلَوْ عَلِمْتُ أَنِّي لَوْ زِدْتُ عَلَى السَّبْعِينَ غُفِرَ لَهُ لَزِدْتُ عَلَيْهَا، فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَلَمْ يَمْكُثْ إِلَّا يَسِيراً حَتَّى نَزَلَتِ الْآيَتَانِ مِنْ بَرَاءَةَ: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾التوبة، فَعَجِبْتُ بَعْدُ مِنْ جُرْأَتِي عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَئِذٍ وَاللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٧٧٨، ومسلم: ١٠٩، وأبو داود: ٣٨٧٢، والترمذي: ٢٠٤٣ و ٢٠٤٤، وإبن ماجه: ٣٤٦٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٦٦ و ٤٦٧١، والترمذي: ٣٠٩٧.

واتە: عومەری کوڕی خەطاب ﷺ دەڵێ: کاتێ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول (سەرۆکی دووڕووەکان) مرد، بانگی پێغەمبەری خوا ﷺ کرا نوێژی لەسەر بکات، کاتێ پێغەمبەر هەڵسا، منیش ڕۆیشتم بۆ لای وتم: ئەی پێغەمبەری خوا لە سەر ئیبنو ئوبەی نوێژ دەکەی لە فڵان ڕۆژدا فڵانە شت و فڵانە شتی دەوت، بۆم دەژمارد، پێغەمبەری خوا ﷺ بزەیەکی پێکەنینی بۆی کردو فەرمووی: ئەی عومەر لێم دوور بکەوەرەوە. کاتێ زۆر ئەوەم دووبارە کردەوە فەرمووی: من سەرپشک کراوم جا ئەوەم هەڵبژاردوە، ئەگەر بزانم حەفتا جار زیاتر ئەوە ئەنجام بدەم خوا لێی خۆش دەبێ، لەوە زیاترم دەکرد. ئینجا نوێژی لەسەر کردو ڕۆیشت، نەمایەوە ماوەیەکی کەم نەبێت تا ئەم دوو ئایەتەی سوورەتی بەرائە دابەزیە خوارەوە: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾، جا سەرم سووڕما لە جورئەت و بوێریم لەو ڕۆژەدا بەرانبەر خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، لە کاتێکدا خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن.

## نوێژ کردن لەسەر جەنازە لە ناو مزگەوتدا

**١٩٦٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى سُهَيْلِ ابْنِ بَيْضَاءَ إِلَّا فِي الْمَسْجِدِ»(١).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نەکرد لە سەر سوهەیلی کوڕی بەیضاء لە ناو مزگەوتدا نەبێت.

**١٩٦٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى سُهَيْلِ ابْنِ بَيْضَاءَ إِلَّا فِي جَوْفِ الْمَسْجِدِ»(٢).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نەکرد لەسەر سوهەیلی کوڕی بەیضاء لە ناو مزگەوتدا نەبێت.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٩ و ٩٧٣/١٠٠، وأبو داود: ٣١٨٩ و ٣١٩٠، والترمذي: ١٠٣٣، وإبن ماجه: ١٥١٨.

(٢) صحيح.

## نوێژ کردن لەسەر جەنازە بە شەو

**١٩٦٩-** «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنُ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: اشْتَكَتِ امْرَأَةٌ بِالْعَوالِي مِسْكِينَةٌ، فَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَسْأَلُهُمْ عَنْهَا، وَقَالَ: إِنْ مَاتَتْ فَلَا تَدْفِنُوهَا حَتَّى أُصَلِّيَ عَلَيْهَا، فَتُوُفِّيَتْ، فَجَاءُوا بِهَا إِلَى الْمَدِينَةِ بَعْدَ الْعَتَمَةِ، فَوَجَدُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ نَامَ، فَكَرِهُوا أَنْ يُوقِظُوهُ، فَصَلَّوْا عَلَيْهَا وَدَفَنُوهَا بِبَقِيعِ الْغَرْقَدِ، فَلَمَّا أَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَاءُوا فَسَأَلَهُمْ عَنْهَا، فَقَالُوا: قَدْ دُفِنَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَقَدْ جِئْنَاكَ فَوَجَدْنَاكَ نَائِماً فَكَرِهْنَا أَنْ نُوقِظَكَ، قَالَ: فَانْطَلِقُوا، فَانْطَلَقَ يَمْشِي وَمَشَوْا مَعَهُ حَتَّى أَرَوْهُ قَبْرَهَا، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَصَفُّوا وَرَاءَهُ، فَصَلَّى عَلَيْهَا وَكَبَّرَ أَرْبَعاً»[١].

**واتە: ئەبو ئومامەی کوڕی سەهل و کوڕی حونەیف ﷺ دەڵێ: ئافرەتێکی هەژار لە گوندو ئاواییەکانی دەوروبەری مەدینە نەخۆش کەوتبوو، پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لە هاوەڵانی دەکرد دەربارەی حاڵی، وە فەرمووی: ئەگەر مرد مەینێژن تا نوێژی لەسەر دەکەم، ئافرەتەکە مرد، دواتر هێنایان بۆ مەدینە لە دوای نوێژی عیشا، تەماشایان کرد پێغەمبەر خەوتبوو، پێیان باش نەبوو پێغەمبەر لە خەو هەڵبستێنن، خۆیان نوێژیان لەسەر کردو لە گۆڕستانی بەقیعی غەرقەد ناشتیان، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی کردەوە هاتن پرسیاری لێکردن دەربارەی حاڵی ئافرەتەکە، وتیان: نێژراوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە هاتین بۆ لات بینیمان خەوت لێ کەوتبوو، حەزمان نەکرد لە خەو هەڵتبسێنین، وتی: ڕۆیشتن، پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو ئەوانیش لەگەڵی دەرچوون، تا گۆڕەکەیان پێی نیشاندا، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵساو (خەڵکەکە) لە پشتیەوە ڕیزیان بەست، نوێژی لەسەر کردو چوار جار تەکبیری کرد.**

## ڕیز بەستن لەسەر جەنازە

**١٩٧٠-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ أَخَاكُمُ النَّجَاشِيَّ قَدْ مَاتَ، فَقُومُوا فَصَلُّوا عَلَيْهِ، فَقَامَ فَصَفَّ بِنَا كَمَا يُصَفُّ عَلَى الْجَنَازَةِ وَصَلَّى عَلَيْهِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣١٧ و ١٣٢٠ و ١٣٣٤ و ٣٨٧٧ و ٣٨٧٨ و ٣٨٧٩، ومسلم: ٦٤ و ٩٥٢/٦٦.




واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی نەجاشی براتان مرد، هەڵسن نوێژی لەسەر بکەن، هەڵسا ڕیزی کردین، هەر وەک چۆن ڕیز دەبەسترێ بۆ نوێژی جەنازەو، نوێژی لەسەر کرد.

**١٩٧١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَعَى لِلنَّاسِ النَّجَاشِيَّ الْيَوْمَ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، ثُمَّ خَرَجَ بِهِمْ إِلَى الْمُصَلَّى، فَصَفَّ بِهِمْ فَصَلَّى عَلَيْهِ وَكَبَّرَ أَرْبَعَ تَكْبِيرَاتٍ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ هەواڵی مردنی نەجاشی بە خەڵکی ڕاگەیاند لەو ڕۆژەی کە تیایدا مرد، پاشان لەگەڵیان دەرچوو بۆ نوێژگە، ڕیزی کردن و نوێژی لەسەر کردو چوار جار تەکبیری کرد.

**١٩٧٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَعَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّجَاشِيَّ لِأَصْحَابِهِ بِالْمَدِينَةِ، فَصَفُّوا خَلْفَهُ، فَصَلَّى عَلَيْهِ، وَكَبَّرَ أَرْبَعاً، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: ابْنُ الْمُسَيَّبِ إِنِّي لَمْ أَفْهَمْهُ كَمَا أَرَدْتَ»[2]

واتە: : ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی مردنی نەجاشی بە هاوەڵانی ڕاگەیاند لە مەدینە، ئەوانیش ڕیزیان بەست لە پشتیەوە، نوێژی لەسەر کردو چوار تەکبیری کرد.

**١٩٧٣-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ أَخَاكُمْ قَدْ مَاتَ، فَقُومُوا فَصَلُّوا عَلَيْهِ، فَصَفَفْنَا عَلَيْهِ صَفَّيْنِ»[3].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی براکەتان نەجاشی مرد، هەڵسن نوێژی لەسەر بکەن، ئێمەیش بە دوو ڕیز ڕیزمان بەست لە سەری.

**١٩٧٤-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ فِي الصَّفِّ الثَّانِي يَوْمَ صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى النَّجَاشِيِّ»[4]

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: من لە ڕیزی دووەمدا بووم لەو ڕۆژەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر نەجاشی کرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**١٩٧٥-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ أَخَاكُمُ النَّجَاشِيَّ قَدْ مَاتَ، فَقُومُوا فَصَلُّوا عَلَيْهِ، قَالَ: فَقُمْنَا فَصَفَفْنَا عَلَيْهِ كَمَا يُصَفُّ عَلَى الْمَيِّتِ، وَصَلَّيْنَا عَلَيْهِ كَمَا يُصَلَّى عَلَى الْمَيِّتِ»(١).

**واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووین: بەڕاستی براکەتان نەجاشی مرد، هەستن نوێژی لەسەر بکەن. دەڵێ: ئێمەیش هەڵساین ڕیزمان بەست وەک چۆن ڕیز بۆ مردوو دەبەسترێ، وە نوێژمان لەسەر کرد، وەک چۆن نوێژ لەسەر مردوو دەکرێ.**

## نوێژ کردن لەسەر جەنازە بە پێوە

**١٩٧٦-** «عَنْ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَى أُمِّ كَعْبٍ مَاتَتْ فِي نِفَاسِهَا، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الصَّلَاةِ فِي وَسَطِهَا»(٢).

**واتە: سەمورە ﷺ دەڵێ: نوێژم کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر دایکی کەعب کە بە هۆی منداڵبوونەوە مردبوو، پێغەمبەر ﷺ لە نێوەڕاستی جەنازەکەیەوە وەستابوو بۆ نوێژ کردنەکە.**

## کۆبوونەوەی جەنازەی منداڵ و ئافرەت پێکەوە

**١٩٧٧-** «عَنْ عَمَّارٍ قَالَ: حَضَرَتْ جَنَازَةُ صَبِيٍّ وَامْرَأَةٍ، فَقُدِّمَ الصَّبِيُّ مِمَّا يَلِي الْقَوْمَ، وَوُضِعَتِ الْمَرْأَةُ وَرَاءَهُ، فَصَلَّى عَلَيْهِمَا، وَفِي الْقَوْمِ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ، وَابْنُ عَبَّاسٍ، وَأَبُو قَتَادَةَ، وَأَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ فَسَأَلْتُهُمْ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالُوا: السُّنَّةُ»(٣).

**واتە: عەمار دەڵێ: ئامادەی جەنازەی منداڵێک و ئافرەتێک بووم، منداڵەکە پێشخرا لە نزیکی خەڵکەکە دانرا، ئافرەتەکەیش لە پشتیەوە دانرا، ئینجا نوێژیان لەسەر کرا، وە لە ناو خەڵکەکەیشدا ئەبو سەعیدی خودری و ئیبنو عەبباس و ئەبو**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٢ و ١٣٣١ و ١٣٣٢، ومسلم: ٨٧ و ٩٦٤/٧٨، وأبو داود: ٣١٩٥، والترمذي: ١٠٣٥، وإبن ماجه: ١٤٩٣.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣١٩٣.

قەتادەو ئەبو هورەیرەیان ﭫ تیدا بوو، پرسیارم كرد دەربارەی ئەوە، وتیان: ئەوە سوننەتە.

## كۆبوونەوەی جەنازەی پیاوان و ئافرەتان

**١٩٧٨-** «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا صَلَّى عَلَى تِسْعِ جَنَائِزَ جَمِيعاً فَجَعَلَ الرِّجَالَ يَلُونَ الْإِمَامَ، وَالنِّسَاءَ يَلِينَ الْقِبْلَةَ، فَصَفَّهُنَّ صَفّاً وَاحِداً، وَوُضِعَتْ جَنَازَةُ أُمِّ كُلْثُومِ بِنْتِ عَلِيٍّ امْرَأَةِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، وَابْنٍ لَهَا يُقَالُ لَهُ زَيْدٌ وُضِعَا جَمِيعاً وَالْإِمَامُ يَوْمَئِذٍ سَعِيدُ بْنُ الْعَاصِ، وَفِي النَّاسِ ابْنُ عُمَرَ، وَأَبُو هُرَيْرَةَ، وَأَبُو سَعِيدٍ، وَأَبُو قَتَادَةَ، فَوُضِعَ الْغُلَامُ مِمَّا يَلِي الْإِمَامَ، فَقَالَ رَجُلٌ: فَأَنْكَرْتُ ذَلِكَ، فَنَظَرْتُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَأَبِي قَتَادَةَ، فَقُلْتُ: مَا هَذَا؟ قَالُوا: هِيَ السُّنَّةُ»[١].

**واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) نوێژی لەسەر نۆ جەنازە كرد پێكەوە، پیاوانی لە نزیک ئیمام دانا، ئافرەتانیش لە لای قیبلە، هەموویانی ڕیز كرد بە یەک ڕیز، جەنازەی ئوم كەلثومی كچی عەلی خێزانی عومەری كوڕی خەطاب، وە منداڵێكیشی پێی دەوترا زەید هەموویان پێكەوە دانرابوون، ئیمامیش لەو ڕۆژەدا سەعیدی كوڕی عاص بوو، وە ئیبنو عومەرو ئەبو هورەیرەو ئەبو سەعیدو ئەبو قەتادە لە ناو خەڵكەكەدا بوون، منداڵەكە لە نزیكی ئیمام دانرا، پیاوێک وتی: ئینكاری ئەوەم كرد (واتە: پێم هەڵە بوو)، كە تەماشای ئیبنو عەبباس و ئەبو هورەیرەو ئەبو سەعیدو ئەبو قەتادەم كرد وتم: ئەمە چیە؟ وتیان: ئەوە سوننەتە.**

**١٩٧٩-** «عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﭬ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى عَلَى أُمِّ فُلَانٍ مَاتَتْ فِي نِفَاسِهَا، فَقَامَ فِي وَسَطِهَا»[٢].

**واتە: سەمورەی كوڕی جوندوب ﭬ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر دایكی فڵانە كەس كرد كە بە هۆی زەیستانی (منالبوونەوە) مردبوو، لە نێوەڕاستی جەنازەكەیەوە وەستابوو.**

---

(١) صحیح.

(٢) صحیح.




## ژمارەی تەکبیر (اللهُ أکبر) کردن لەسەر جەنازە

**١٩٨٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَعَى لِلنَّاسِ النَّجَاشِيَّ، وَخَرَجَ بِهِمْ فَصَفَّ بِهِمْ، وَكَبَّرَ أَرْبَعَ تَكْبِيرَاتٍ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی مردنی نەجاشی بە خەڵکی ڕاگەیاند، بردنیە دەرەوەو ڕیزی کردن و چوار جار تەکبیری کرد.**

**١٩٨١-** «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلٍ ﵁ قَالَ: مَرِضَتِ امْرَأَةٌ مِنْ أَهْلِ الْعَوَالِي، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَحْسَنَ شَيْءٍ عِيَادَةً لِلْمَرِيضِ، فَقَالَ: إِذَا مَاتَتْ فَآذِنُونِي، فَمَاتَتْ لَيْلاً، فَدَفَنُوهَا وَلَمْ يُعْلِمُوا النَّبِيَّ ﷺ، فَلَمَّا أَصْبَحَ سَأَلَ عَنْهَا، فَقَالُوا: كَرِهْنَا أَنْ نُوقِظَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَأَتَى قَبْرَهَا، فَصَلَّى عَلَيْهَا وَكَبَّرَ أَرْبَعاً»[٢].

**واتە: ئەبو ئومامەی کوڕی سەهل ﵁ دەڵێ: ئافرەتێک لە خەڵکی گوندو ئاوایيەکانی دەورو بەری مەدینە نەخۆش کەوت، پێغەمبەریش ﷺ بە چاکترین شێوە سەردانی نەخۆشی دەکرد، فەرمووی: ئەگەر مرد ئاگادارم بکەنەوە. ئافرەتەکە لە شەودا مردو ناشتیان، پێغەمبەریان ﷺ لێ ئاگادار نەکردەوە، کاتێ ڕۆژ بوویەوە پرسیاری ئافرەتەکەی کرد، وتیان: حەزمان نەکرد بە خەبەرت بهێنینەوە ئەی پێغەمبەری خوا، ئینجا ڕۆیشت بۆ لای گۆڕەکەی، نوێژی لەسەر کردو چوار جار تەکبیری کرد (لە نوێژەکەیدا).**

**١٩٨٢-** «عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، أَنَّ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ ﵁ صَلَّى عَلَى جَنَازَةٍ فَكَبَّرَ عَلَيْهَا خَمْساً، وَقَالَ: كَبَّرَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[٣].

**واتە: ئیبنو ئەبی لەیلا دەگێڕێتەوە: زەیدی کوڕی ئەرقەم ﵁ نوێژی لەسەر جەنازەیەک کرد پێنج جار تەکبیری لەسەر کردو، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو پێنج تەکبیرەی لەسەر (جەنازە) کردوە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٥٧، وأبو داود: ٣١٩٧، والترمذي: ١٠٢٣، وإبن ماجه: ١٥٠٥.




## پاڕانەوە (بۆ مردوو لە نوێژی جەنازە)

**١٩٨٣-** «عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى عَلَى جَنَازَةٍ يَقُولُ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ، وَاعْفُ عَنْهُ وَعَافِهِ، وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ، وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ، وَاغْسِلْهُ بِمَاءٍ وَثَلْجٍ وَبَرَدٍ، وَنَقِّهِ مِنَ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، وَأَبْدِلْهُ دَاراً خَيْراً مِنْ دَارِهِ، وَأَهْلاً خَيْراً مِنْ أَهْلِهِ، وَزَوْجاً خَيْراً مِنْ زَوْجِهِ، وَقِهِ عَذَابَ الْقَبْرِ، وَعَذَابَ النَّارِ، قَالَ عَوْفٌ: فَتَمَنَّيْتُ أَنْ لَوْ كُنْتُ الْمَيِّتَ لِدُعَاءِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لِذَلِكَ الْمَيِّتِ»[١].

**واتە: عەوفی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر مردوویەک کردو دەیفەرموو: خوایە لێی خۆش ببە و ڕەحمی پێ بکە و بیپارێزەو لێی ببورەو لە شوێنگەو میوانداریەکی ڕێز لێگیراو دایبنێ، وە شوێنی بۆ فراوان بکە، وە بە ئاوی باران و بەفرو تەرزە بیشۆرە، پاکی بکەرەوە لە گوناه هەروەک چۆن پۆشاکی سپی پاک دەبێتەوە لە چڵک، وە ماڵەکەی بۆ بگۆڕە بە خانەیەکی خۆشتر لەوەی دنیایی و کەسوکارێکی بدەرێ لە کەسوکارەکەی چاکترو هاوسەرو خێزانێکی بدەرێ لە هاوسەرەکەی باشتر بێت، بیپارێزە لە سزای گۆر و سزای ئاگر. عەوف دەڵێ: ئاواتی ئەوەم دەخواست من مردووەکە بووایەم، لەبەر نزای پیغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەو مردووە.**

**١٩٨٤-** «عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي عَلَى مَيِّتٍ فَسَمِعْتُ فِي دُعَائِهِ وَهُوَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ، وَعَافِهِ وَاعْفُ عَنْهُ، وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ، وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ، وَاغْسِلْهُ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَنَقِّهِ مِنَ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الْأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وَأَبْدِلْهُ دَاراً خَيْراً مِنْ دَارِهِ، وَأَهْلاً خَيْراً مِنْ أَهْلِهِ، وَزَوْجاً خَيْراً مِنْ زَوْجِهِ، وَأَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ وَنَجِّهِ مِنَ النَّارِ «أَوْ قَالَ»: وَأَعِذْهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ»[٢].

**واتە: عەوفی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد لەسەر مردوویەک لە نزاکەیدا دەیفەرموو: خوایە لێی خۆش ببە و ڕەحمی پێ بکەو بیپارێزەو لێی ببورەو لە شوێنگەو میوانداریەکی ڕێز لێگیراو دایبنێ، وە**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥ و ٩٦٣/٨٦، والترمذي: ١٠٢٥، وإبن ماجه: ١٥٠٠.

(٢) صحيح.

شوێنی فراوان بکە، وە بە ئاوی باران و بەفرو تەرزە بیشۆرە، پاکی بکەرەوە لە گوناه هەروەک چۆن پۆشاکی سپیت پاک کردوەتەوە، وە ماڵەکەی بۆ بگۆڕە بە خانەیەکی خۆشتر لەوەی دنیایی و کەسوکارێکی بدەرێ لە کەسوکارەکەی چاکترو هاوسەرو خێزانێکی بدەرێ لە هاوسەرەکەی باشتر بێت، بیخەرە بەهەشتەوەو بیپارێزە لە ئاگر «یان فەرمووی»: بیپارێزە لە سزای ناو گۆڕ.

**١٩٨٥-** «عَنْ عُبَيْدِ بْنِ خَالِدٍ السُّلَمِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ آخَى بَيْنَ رَجُلَيْنِ، فَقُتِلَ أَحَدُهُمَا وَمَاتَ الْآخَرُ بَعْدَهُ، فَصَلَّيْنَا عَلَيْهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَا قُلْتُمْ؟ قَالُوا: دَعَوْنَا لَهُ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ، اللَّهُمَّ أَلْحِقْهُ بِصَاحِبِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: فَأَيْنَ صَلَاتُهُ بَعْدَ صَلَاتِهِ؟ وَأَيْنَ عَمَلُهُ بَعْدَ عَمَلِهِ؟ فَلَمَا بَيْنَهُمَا كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ» [١].

واتە: عوبەیدی کوڕی خالیدی سوللەمی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ برایەتی لە نێوان دوو کەسدا کرد، یەکێکیان کوژراو ئەوی تریان دوای ئەو مرد، نوێژمان لەسەری کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چیتان وت؟ وتیان: نزامان کرد بۆی خوایە لێی خۆش ببە، خوایە ڕەحمی لێ بکە، خوایە بیگەیەنە بە هاوەڵەکەی، پێغمبەر ﷺ فەرمووی: نوێژی ئەم لە کوێ و نوێژی ئەو لە کوێ؟ کردەوەی ئەم لە کوێ و کردەوەی ئەو لە کوێ؟ نێوانی ئەو دووانە هەر وەکو نێوانی ئاسمان و زەوی وایە (چونکە ئەوەی دووەمیان تەمەنی درێژتر بووەو کردەوەی چاکی زیاتر ئەنجام داوە).

**١٩٨٦-** «عَنْ أَبِي إِبْرَاهِيمَ الْأَنْصَارِيِّ، عَنْ أَبِيه رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ فِي الصَّلَاةِ عَلَى الْمَيِّتِ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا، وَشَاهِدِنَا وَغَائِبِنَا، وَذَكَرِنَا وَأُنْثَانَا، وَصَغِيرِنَا وَكَبِيرِنَا» [٢].

واتە: ئەبو ئیبڕاهیمی ئەنصاری، لە باوکیەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەو بیستوویەتی پێغەمبەر ﷺ لە کاتی نوێژ کردنی لەسەر مردوو دەیفەرموو: خوایە خۆش ببە لە زیندوو مردوومان و لە ئامادەو نائامادەمان و لە نێرو مێ و بچووک و گەورەمان.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٥٢٤.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٠٢٤.




**١٩٨٧-** «عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَلَى جَنَازَةٍ، فَقَرَأَ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، وَسُورَةٍ وَجَهَرَ حَتَّى أَسْمَعَنَا، فَلَمَّا فَرَغَ أَخَذْتُ بِيَدِهِ، فَسَأَلْتُهُ فَقَالَ: سُنَّةٌ وَحَقٌّ»(١).

**واتە: طەڵحەی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی عەوف دەڵێ: لە پشتی ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) نوێژم كرد لەسەر جەنازەیەک، سوورەتی فاتیحەو سوورەتێكی دیكەی خوێند بە دەنگی بەرز، تا هەمووومان گوێیان لێ بوو، كاتێ لێ بوویەوە دەستیم گرت و پرسیارم لێكرد، وتی: سوننەتەو حەق و ڕاستە.**

**١٩٨٨-** «عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَلَى جَنَازَةٍ فَسَمِعْتُهُ يَقْرَأُ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَخَذْتُ بِيَدِهِ، فَسَأَلْتُهُ فَقُلْتُ: تَقْرَأُ، قَالَ: نَعَمْ، إِنَّهُ حَقٌّ وَسُنَّةٌ»(٢).

**واتە: طەڵحەی كوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: لە پشتی ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) نوێژمان كرد لەسەر جەنازەیەک، گوێم لێ بوو سوورەتی فاتیحە دەخوێند، كاتێ لێ بوویەوە دەستیم گرت و پرسیارم لێكرد، وتم: سوورەتی فاتیحە دەخوێنی؟ وتی: بەڵی، بێگومان ئەوە حەق و ڕێبازی پێغەمبەری خوایە.**

**١٩٨٩-** «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ قَالَ: السُّنَّةُ فِي الصَّلَاةِ عَلَى الْجَنَازَةِ أَنْ يَقْرَأَ فِي التَّكْبِيرَةِ الْأُولَى بِأُمِّ الْقُرْآنِ مُخَافَتَةً، ثُمَّ يُكَبِّرَ ثَلَاثاً، وَالتَّسْلِيمُ عِنْدَ الْآخِرَةِ»(٣).

**واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێ: سوننەت (واتە: ڕێبازی پێغەمبەری خواﷺ) لە نوێژی جەنازەدا ئەوەیە لە دوای تەكبیری یەكەم سوورەتی فاتیحە بە شاراوەیی بخوێنرێت، پاشان سێ جار تەكبیر بكات، لە كۆ تەكبیریشدا سەلام بداتەوە.**

**١٩٩٠-** «عَنْ قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سُوَيْدٍ الدِّمَشْقِيِّ الْفِهْرِيِّ، عَنْ الضَّحَّاكِ بْنِ قَيْسٍ الدِّمَشْقِيِّ بِنَحْوِ ذَلِكَ»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٣٥، وأبو داود: ٣١٩٨، والترمذي: ١٠٢٦ و ١٠٢٧، وإبن ماجه: ١٤٩٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

واتە: قوتەیبە دەڵێ: لەیث بۆی باس کردین، لە ئیبنو شیهاب، لە موحەممەدی کوڕی سوەیدی دیمەشقی فیهری، لە ضەحاکی کوڕی قەیسی دیمەشقی، وەکو ئەو فەرموودەیە (ی پێش خۆی).

## فەزڵ و گەورەیی ئەو کەسەی سەد کەس نوێژی لەسەر دەکەن

**١٩٩١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَا مِنْ مَيِّتٍ يُصَلِّي عَلَيْهِ أُمَّةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَبْلُغُونَ أَنْ يَكُونُوا مِائَةً يَشْفَعُونَ إِلَّا شُفِّعُوا فِيهِ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ مردوویەک نیە کۆمەڵێک لە موسڵمانان نوێژی لەسەر بکەن ڕێژەیان بگات بە سەد کەس و، تکای بۆ بکەن، ئیللا تکاکەیان وەردەگیرێ (بۆ مردووەکە).**

**١٩٩٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا يَمُوتُ أَحَدٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ فَيُصَلِّي عَلَيْهِ أُمَّةٌ مِنَ النَّاسِ فَيَبْلُغُوا أَنْ يَكُونُوا مِائَةً، فَيَشْفَعُوا إِلَّا شُفِّعُوا فِيهِ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێک لە موسڵمانان نامرێ کۆمەڵێک لە خەڵکی نوێژی لەسەر بکەن ڕێژەیان بگاتە سەد کەس و، تکای بۆ بکەن، ئیللا تکاکەیان وەردەگیرێ (بۆی).**

**١٩٩٣-** «عَنْ أَبِي بَكَّارٍ الْحَكَمُ بْنُ فَرُّوخَ، قَالَ: صَلَّى بِنَا أَبُو الْمَلِيحِ عَلَى جَنَازَةٍ فَظَنَنَّا أَنَّهُ قَدْ كَبَّرَ، فَأَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ، فَقَالَ: أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ وَلْتَحْسُنْ شَفَاعَتُكُمْ، قَالَ أَبُو الْمَلِيحِ، حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ وَهُوَ ابْنُ سَلِيطٍ، عَنْ إِحْدَى أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ وَهِيَ مَيْمُونَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: أَخْبَرَنِي النَّبِيُّ ﷺ قَالَ: مَا مِنْ مَيِّتٍ يُصَلِّي عَلَيْهِ أُمَّةٌ مِنَ النَّاسِ إِلَّا شُفِّعُوا فِيهِ، فَسَأَلْتُ أَبَا الْمَلِيحِ عَنِ الْأُمَّةِ: فَقَالَ: أَرْبَعُونَ»[٣].

**واتە: ئەبو بەکار حەکەمی کوڕی فەڕڕوخ دەڵێ: ئەبو مەلیح نوێژی بۆ کردین لەسەر جەنازەیەک، گومانمان برد تەکبیری کردبێت (بەڵام دەستی پێ نەکردبوو)**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٤٧، والترمذي: ١٠٢٩.

(٢) صحيح.

(٣) حسن صحيح.





ڕووی تێکردین بە ڕوخساری، وتی: ڕیزەکانتان ڕێک بخەن و تکاکردنتان با چاک بێت، ئەبو مەلیح دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی سەلیط بۆی باس کردم لە یەکێک لە دایکانی ئیمانداران، ئەویش مەیمونەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ بوو، وتی: پێغەمبەر هەواڵی پێم داوەو فەرموویەتی: هیچ کەسێک نیە بمرێ و کۆمەڵێک لە خەڵکی نوێژی لەسەر بکەن (و تکای بۆ بکەن)، ئیللا تکاکەیان لێ وەردەگیرێ. پرسیارم کرد لە ئەبو مەلیح دەربارەی ئەو کۆمەڵە: وتی: (ژمارەی گەیشتبێتە) چل کەس.

## بابەت: پاداشتی ئەو کەسەی نوێژ لەسەر جەنازە دەکات

**١٩٩٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ صَلَّى عَلَى جَنَازَةٍ فَلَهُ قِيرَاطٌ، وَمَنِ انْتَظَرَهَا حَتَّى تُوضَعَ فِي اللَّحْدِ فَلَهُ قِيرَاطَانِ، وَالْقِيرَاطَانِ مِثْلُ الْجَبَلَيْنِ الْعَظِيمَيْنِ»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک نوێژ لەسەر جەنازەیەک بکات قیراتێکی بۆ هەیە (لە پاداشت) هەرکەسیش چاوەڕوانی بکات تا (مردووەکە) دەخرێتە ناو گۆڕ ئەوە دوو قیراتی بۆ هەیە، دوو قیراتیش بە ئەندازەی دوو کێوی مەزنن (لە پاداشت).

**١٩٩٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ شَهِدَ جَنَازَةً حَتَّى يُصَلَّى عَلَيْهَا فَلَهُ قِيرَاطٌ، وَمَنْ شَهِدَ حَتَّى تُدْفَنَ فَلَهُ قِيرَاطَانِ، قِيلَ: وَمَا الْقِيرَاطَانِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: مِثْلُ الْجَبَلَيْنِ الْعَظِيمَيْنِ»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ئامادەی جەنازەیەک بێت تا نوێژی لەسەر دەکرێ، ئەوە یەک قیراتی بۆ هەیە (لە پاداشت) هەرکەسیش ئامادەی بێ تا دەنێژرێت ئەوە دوو قیراتی بۆ هەیە. وترا: ئەو دوو قیراتە چین ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: وەکو دوو کێوی مەزنن.

**١٩٩٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ تَبِعَ جَنَازَةَ رَجُلٍ مُسْلِمٍ احْتِسَاباً فَصَلَّى عَلَيْهَا وَدَفَنَهَا فَلَهُ قِيرَاطَانِ، وَمَنْ صَلَّى عَلَيْهَا ثُمَّ رَجَعَ قَبْلَ أَنْ تُدْفَنَ فَإِنَّهُ يَرْجِعُ بِقِيرَاطٍ مِنَ الأَجْرِ»(٣).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٢٣ و ١٣٢٤ و ١٣٢٥، ومسلم: ٥٢ و ٩٤٥/٥٦، وأبو داود: ٣١٦٨ و ٣١٦٩، والترمذي: ١٠٤٠، وإبن ماجه: ١٥٣٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: هەر کەس شوێنی جەنازەی پیاوێکی مسوڵمان بکەوێت بە ئومێدی پاداشت، ئینجا نوێژی لەسەر کردو ناشتی ئەوە دوو قیراتی بۆ هەیە هەرکەسیش نوێژی لەسەر بکات پاشان بگەڕێتەوە پێش ئەوەی بنێژرێت، ئەوە بە یەک قیرات پاداشت دەگەڕێتەوە.

**١٩٩٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ تَبِعَ جَنَازَةً فَصَلَّى عَلَيْهَا ثُمَّ انْصَرَفَ فَلَهُ قِيرَاطٌ مِنَ الْأَجْرِ، وَمَنْ تَبِعَهَا فَصَلَّى عَلَيْهَا ثُمَّ قَعَدَ حَتَّى يُفْرَغَ مِنْ دَفْنِهَا فَلَهُ قِيرَاطَانِ مِنَ الْأَجْرِ، كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا أَعْظَمُ مِنْ أُحُدٍ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس شوێنی جەنازەیەک کەوت و نوێژی لەسەر کرد، پاشان گەڕایەوە ئەوە یەک قیرات پاداشتی بۆ هەیە، هەر کەسیش شوێنی کەوت و نوێژی لەسەر کرد، پاشان دانیشت تا لێ بوونەوە لە ناشتنی ئەوە دوو قیرات پاداشتی بۆ هەیە، هەر یەکێک لەو دووانە مەزنترە لە کێوی ئوحود.

## دانیشتن پێش ئەوەی جەنازە دابنرێت

**١٩٩٨-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا رَأَيْتُمُ الْجَنَازَةَ، فَقُومُوا وَمَنْ تَبِعَهَا فَلَا يَقْعُدَنَّ حَتَّى تُوضَعَ»[٢].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر جەنازەتان بینی، هەڵسن هەرکەسیش شوێنی کەوت با دانەنیشێ تا دادەنرێت.

## وەستان بۆ جەنازە

**١٩٩٩-** «عَنْ مَسْعُودِ بن الْحَكَمِ عَن عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّهُ ذُكِرَ الْقِيَامُ عَلَى الْجَنَازَةِ حَتَّى تُوضَعَ، فَقَالَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ قَعَدَ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٢ و ٩٦٢/٨٤، وأبو داود: ٣١٧٥، والترمذي: ١٠٤٤، وإبن ماجه: ١٥٤٤.

واتە: مەسعوودی کوڕی حەکەم دەگێڕێتەوە: باسی وەستان لەسەر جەنازە کرا لە لای عەلی کوڕی ئەبو طالیب ﷺ تا دادەنرێ، عەلی کوڕی ئەبو طالیب وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا پاشان دانیشت.

٢٠٠٠- «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَامَ فَقُمْنَا وَرَأَيْنَاهُ قَعَدَ فَقَعَدْنَا»(١).

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی هەڵسا ئێمەش هەڵساین، وە بینیمان دانیشت ئێمەش دانیشتین.

٢٠٠١- «عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي جَنَازَةٍ، فَلَمَّا انْتَهَيْنَا إِلَى الْقَبْرِ وَلَمْ يُلْحَدْ، فَجَلَسَ وَجَلَسْنَا حَوْلَهُ كَأَنَّ عَلَى رُءُوسِنَا الطَّيْرَ»(٢).

واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین بە جەنازەیەکەوە کاتێ گەیشتینە لای گۆڕەکە هێشتا تەواو نەبوو بوو، ئەو دانیشت و ئێمەش دانیشتین هەر وەکو ئەوەی باڵندە لەسەر سەرمان هەڵنیشتبێ (جوڵەو قسەمان نەدەکرد).

## ناشتنی شەهید بە خوێنەکەیەوە

٢٠٠٢- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ ثَعْلَبَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِقَتْلَى أُحُدٍ: زَمِّلُوهُمْ بِدِمَائِهِمْ، فَإِنَّهُ لَيْسَ كَلْمٌ يُكْلَمُ فِي اللَّهِ إِلَّا يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَدْمَى، لَوْنُهُ لَوْنُ الدَّمِ، وَرِيحُهُ رِيحُ الْمِسْكِ»(٣).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ثەعلەبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە کوژراوەکانی ئوحودی فەرموو: بیانپێچنەوە بە جلە خوێناویەکانیان، چونکە لە ڕۆژی دواییدا هەر برینێک کە بووبێتە برین لە ئەندامەکانی جەستە خوێنی لی بچۆڕی کاتێ خاوەنەکەی دێت ڕەنگەکەی ڕەنگی خوێنەو بۆنەکەی بۆنی میسکە.

## شەهید لە کوێ دەنێژرێ؟

٢٠٠٣- «عَنْ عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُعَيَّةَ ﷺ قَالَ: أُصِيبَ رَجُلَانِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَوْمَ الطَّائِفِ فَحُمِلَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَمَرَ أَنْ يُدْفَنَا حَيْثُ أُصِيبَا، وَكَانَ ابْنُ مُعَيَّةَ وُلِدَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»(٤).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢١٢ و ٤٧٥٣ و ٤٧٥٤، وإبن ماجه: ١٥٤٨ و ١٥٤٩.

(٣) صحيح.

(٤) ضعيف الإسناد.




**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موعەیە ﷺ دەڵێ: دوو پیاو لە مسوڵمانان شەهید کران لە جەنگی طائیف هێنران بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، فەرمانی کرد لەو شوێنە بنێژێن کە شەهید کراون، ئیبنو موعەییە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لە دایک بوو.**

**٢٠٠٤-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ بِقَتْلَى أُحُدٍ أَنْ يُرَدُّوا إِلَى مَصَارِعِهِمْ، وَكَانُوا قَدْ نُقِلُوا إِلَى الْمَدِينَةِ»[١].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بەوانەی لە جەنگی ئوحود کوژران بگەڕێنرێنەوە بۆ ئەو شوێنەی لێی کوژراون، لە کاتێدا گواسترابوونەوە بۆ مەدینە.**

**٢٠٠٥-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: ادْفِنُوا الْقَتْلَى فِي مَصَارِعِهِمْ»[٢].

**واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کوژراوەکان بنێژن لەو شوێنەی تیایدا کوژراون.**

## بابەت: ناشتنی هاوبەشدانەران

**٢٠٠٦-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قُلْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ عَمَّكَ الشَّيْخَ الضَّالَّ مَاتَ فَمَنْ يُوَارِيهِ؟ قَالَ: اذْهَبْ فَوَارِ أَبَاكَ، وَلَا تُحْدِثَنَّ حَدَثاً حَتَّى تَأْتِيَنِي، فَوَارَيْتُهُ ثُمَّ جِئْتُ، فَأَمَرَنِي فَاغْتَسَلْتُ، وَدَعَا لِي، وَذَكَرَ دُعَاءً لَمْ أَحْفَظْهُ»[٣].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: بە پێغەمبەرم ﷺ وت: مامە بە تەمەنە گومڕاکەت مرد کێ دەینێژێ؟ فەرمووی: بڕۆ باوکت بنێژە، هیچ مەڵێ تا دێیتەوە بۆ لام، منیش دامپۆشی پاشان گەڕامەوە بۆ لای، فەرمانی پێکردم منیش خۆم شۆرد، وە نزای بۆ کردم، نزایەکی کرد لەبەرم نەماوە.**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥٣٣ و ٣١٦٥، والترمذي: ١٧١٧، وإبن ماجه: ١٥١٦.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




## گۆڕی لادرو ناودر

وشەی (اللَّحْدُ): بریتیە لە بڕینی زەوی لە کەنارەوە لە لای قیبلە. (الشَّقُّ) بریتیە لە بڕینی زەوی لە نێوەڕاستەوە.

**٢٠٠٧-** «عَنْ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: أَلْحِدُوا لِي لَحْدَاً، وَانْصِبُوا عَلَيَّ نَصْباً كَمَا فُعِلَ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[١].

واتە: سەعد ﷺ دەڵێ: گوڕێکی لادرم بۆ لێ بدەن و شتێکم لە بان سەر (گۆڕەکەم) بۆ بچەقێنن، وەکو چۆن بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کرا.

**٢٠٠٨-** «عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، أَنَّ سَعْداً لَمَّا حَضَرَتْهُ الْوَفَاةُ قَالَ: أَلْحِدُوا لِي لَحْدَاً، وَانْصِبُوا عَلَيَّ نَصْبَاً، كَمَا فُعِلَ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[٢].

واتە: عامری کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە: کاتێ سەعد ئامادەی سەرمەرگ بوو وتی: گوڕێکی لادرم بۆ لێ بدەن و شتێکم لە بان سەر (گۆڕەکەم) بۆ بچەقێنن، وەکو چۆن بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کرا.

**٢٠٠٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اللَّحْدُ لَنَا، وَالشَّقُّ لِغَيْرِنَا»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: گۆڕی لادر (شێوازی) ئێمەیەو گۆڕی ناودڕیش شێوازی غەیری ئێمەیە.

## بابەت: چاكتر وایە گۆڕ قووڵ بكرێت

**٢٠١٠-** «عَنْ هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: شَكَوْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ أُحُدٍ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، الْحَفْرُ عَلَيْنَا لِكُلِّ إِنْسَانٍ شَدِيدٌ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: احْفِرُوا وَأَعْمِقُوا وَأَحْسِنُوا، وَادْفِنُوا الِاثْنَيْنِ وَالثَّلَاثَةَ فِي قَبْرٍ وَاحِدٍ، قَالُوا: فَمَنْ نُقَدِّمُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: قَدِّمُوا أَكْثَرَهُمْ قُرْآنَاً، قَالَ: فَكَانَ أَبِي ثَالِثَ ثَلَاثَةٍ فِي قَبْرٍ وَاحِدٍ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٦٦، وإبن ماجه: ١٥٥٦.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢٠٨، والترمذي: ١٠٤٥، وإبن ماجه: ١٥٥٤.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢١٥ و ٣٢١٦ و ٣٢١٧، والترمذي: ١٧١٣، وإبن ماجه: ١٥٦٠.




واتە: هیشامی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: سکاڵامان برد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئوحود، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا، چاڵ کردن بۆ هەموو کەسێک زۆر گران و سەختە لەسەرمان (چونکە مردووەکان زۆرن)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چاڵ بکەن و قوڵی بکەن و چاکی بکەن، دوو کەس و سێ کەس پێکەوە بخەنە ناو یەک گۆڕێکەوە، وتیان: کامەیان پێش بخەین ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەوەیان پێشبخەن قورئانی زۆرتر لەبەرە، وتی: جا باوکم سێیەمینی سێ کەس بوو لە ناو یەک گۆڕەکەدا.

## بابەت: ئەوەندەی سوننەتە گۆڕ فراوان بکرێت

**٢٠١١-** «عَنْ هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ أُصِيبَ مَنْ أُصِيبَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَأَصَابَ النَّاسَ جِرَاحَاتٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: احْفِرُوا وَأَوْسِعُوا، وَادْفِنُوا الِاثْنَيْنِ وَالثَّلَاثَةَ فِي الْقَبْرِ، وَقَدِّمُوا أَكْثَرَهُمْ قُرْآناً»[١].

واتە: هیشامی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی ئوحودا ئەوەی کوژرا لە مسوڵمانان کوژرا، خەڵکێکی تریش بریندار بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چاڵ بکەن و فراوانی بکەن دوو کەس و، سێ کەس پێکەوە بخەنە ناو یەک گۆڕەوەو ئەوەی قورئانی زۆرتر لەبەر بوو پێشی بخەن.

## دانانی پارچە قوماش لە ناو گۆڕیچکە، یان گۆڕی لادڕ

**٢٠١٢-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: جُعِلَ تَحْتَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حِينَ دُفِنَ قَطِيفَةٌ حَمْرَاءُ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ نێژرا پارچە قوماشێکی سوریان لە ژێری ڕاخست.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٦٧، والترمذي: ١٠٤٨.

## ئەو کاتانەی قەدەغەکراوە مردووی تێدا بنێژرێ

**٢٠١٣-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ الْجُهَنِيَّ ﷺ قَالَ: ثَلَاثُ سَاعَاتٍ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْهَانَا أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ أَوْ نَقْبُرَ فِيهِنَّ مَوْتَانَا: حِينَ تَطْلُعُ الشَّمْسُ بَازِغَةً حَتَّى تَرْتَفِعَ، وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ حَتَّى تَزُولَ الشَّمْسُ، وَحِينَ تَضَيَّفُ الشَّمْسُ لِلْغُرُوبِ»[١].

**واتە: عوقبەی کوڕی عامری جوهەنی ﷺ دەڵێ: سێ کات هەیە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی لێ کردووین نوێژی تێدا بکەین، یان مردووەکانی تێدا بنێژین: کاتێ خۆر هەڵدێت تا بەرز دەبێتەوە، کاتێ خۆری نیوەڕۆ دەوەستێ و جێگیر دەبێ تا خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان دەترازێ و لادەدات، کاتێکیش خۆر خەریکە ئاوا دەبێت.**

**٢٠١٤-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرَ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِهِ مَاتَ فَقُبِرَ لَيْلاً، وَكُفِّنَ فِي كَفَنٍ غَيْرِ طَائِلٍ، فَزَجَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُقْبَرَ إِنْسَانٌ لَيْلاً، إِلَّا أَنْ يُضْطَرَّ إِلَى ذَلِكَ»[٢].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاریدا باسی یەکێک لە هاوەڵانی کرد مردبوو بە شەو گۆڕیان بۆ هەڵکەند، وە کفنیان بۆی کرد کفنێکی باش نەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ سەرزەنشتی کرد کەسێک لە گۆڕ بنرێت لە شەودا، مەگەر ناچاری بێت.**

## ناشتنی کۆمەڵە کەسێک لە یەک گۆڕدا

**٢٠١٥-** «عَنْ هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ أَصَابَ النَّاسَ جَهْدٌ شَدِيدٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: احْفِرُوا وَأَوْسِعُوا، وَادْفِنُوا الِاثْنَيْنِ وَالثَّلَاثَةَ فِي قَبْرٍ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَمَنْ نُقَدِّمُ؟ قَالَ: قَدِّمُوا أَكْثَرَهُمْ قُرْآناً»[٣].

**واتە: هیشامی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: کاتێ لە ڕۆژی ئوحودا خەڵکی تووشی سەختی و نارەحەتیەکی زۆر بوون بە بۆنەی گۆڕ هەڵکەندنەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




چاڵ بکەن و فراوان و چاکی بکەن، دوو کەس و، سێ کەس پێکەوە بخەنە ناو یەک گۆڕەوە، وتیان: کامەیان پێش بخەین ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەوەیان پێشبخەن قورئانی زۆرتر لەبەرە.

**٢٠١٦-** «عَنْ هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: اشْتَدَّ الْجِرَاحُ يَوْمَ أُحُدٍ فَشُكِيَ ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: احْفِرُوا وَأَوْسِعُوا وَأَحْسِنُوا، وَادْفِنُوا فِي الْقَبْرِ الاِثْنَيْنِ وَالثَّلاَثَةَ، وَقَدِّمُوا أَكْثَرَهُمْ قُرْآناً»[١].

واتە: هیشامی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی ئوحود سکاڵای برینداریی و ماندوو بوون کرا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بە هۆی گۆڕ هەڵکەندن، ئەویش فەرمووی: چاڵ بکەن و فراوان و چاکی بکەن، دوو کەس و، سێ کەس پێکەوە بخەنە ناو یەک گۆڕەوە، وە ئەوەیان پێشبخەن قورئانی زۆرتر لەبەرە.

**٢٠١٧-** «عَنْ هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: احْفِرُوا وَأَحْسِنُوا، وَادْفِنُوا الاِثْنَيْنِ وَالثَّلاَثَةَ، وَقَدِّمُوا أَكْثَرَهُمْ قُرْآناً»[٢].

واتە: هیشامی کوڕی عامر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چاڵ بکەن و فراوان و چاکی بکەن، دوو کەس و سێ کەس پێکەوە بخەنە ناو یەک گۆڕەوە، وە ئەوەیان پێشبخەن قورئانی زۆرتر لەبەرە.

## کێ پێش دەخرێت لە ناو گۆڕدا کاتێ کۆمەڵێک پێکەوە دەنێژرێن؟

**٢٠١٨-** «عَنْ هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: قُتِلَ أَبِي يَوْمَ أُحُدٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: احْفِرُوا وَأَوْسِعُوا وَأَحْسِنُوا، وَادْفِنُوا الاِثْنَيْنِ وَالثَّلاَثَةَ فِي الْقَبْرِ، وَقَدِّمُوا أَكْثَرَهُمْ قُرْآناً، فَكَانَ أَبِي ثَالِثَ ثَلاَثَةٍ، وَكَانَ أَكْثَرَهُمْ قُرْآناً فَقُدِّمَ»[٣].

واتە: هیشامی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: باوکم لە ڕۆژی ئوحود کوژرا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چاڵ بکەن و فراوان و چاکی بکەن، دوو کەس و سێ کەس پێکەوە بخەنە ناو یەک گۆڕەوە، وە ئەوەیان پێشبخەن قورئانی زۆرتر لەبەرە، جا باوکی من سێیەمینی سێ کەسەکە بوو، جا ئەوان قورئانی زیاتریان لەبەر بوو پێش خران.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




## دەرهێنانی مردوو لە ناو گۆڕی لادرِ دوای ئەوەی دەخرێتە ناوی

**٢٠١٩-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: أَتَى النَّبِيُّ ﷺ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيٍّ بَعْدَ مَا أُدْخِلَ فِي قَبْرِهِ فَأَمَرَ بِهِ فَأُخْرِجَ، فَوَضَعَهُ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَنَفَثَ عَلَيْهِ مِنْ رِيقِهِ، وَأَلْبَسَهُ قَمِيصَهُ، وَاللَّهُ أَعْلَمُ»(١).

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای گۆڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی دوای ئەوەی خرابوویە ناو گۆڕەکەیەوە، فەرمانی کرد بۆیان دەرهێنا، ئینجا خستیە سەر هەردوو ئەژنۆی، فووی کرد بەسەریدا لە لیکی، کراسەکەی لەبەری کرد، خوا زاناترە.**

**٢٠٢٠-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ بِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ فَأَخْرَجَهُ مِنْ قَبْرِهِ، فَوَضَعَ رَأْسَهُ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، فَتَفَلَ فِيهِ مِنْ رِيقِهِ، وَأَلْبَسَهُ قَمِيصَهُ، قَالَ جَابِرٌ: وَصَلَّى عَلَيْهِ، وَاللَّهُ أَعْلَمُ»(٢).

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی دەرهێنرا لە گۆڕەکەی، ئینجا خستیە سەر هەردوو ئەژنۆی، فووی کرد بەسەریدا لە لیکی، کراسەکەی لەبەری کرد، جابر دەڵێ: نوێژیشی لەسەر کرد، خوا زاناترە.**

## بابەت: دەرهێنانی مردوو لە ناو گۆڕ دوای ئەوەی دەشاردرێتەوە

**٢٠٢١-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: دُفِنَ مَعَ أَبِي رَجُلٌ فِي الْقَبْرِ فَلَمْ يَطِبْ قَلْبِي حَتَّى أَخْرَجْتُهُ وَدَفَنْتُهُ عَلَى حِدَةٍ»(٣).

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: باوکم لەگەڵ پیاوێکدا لە ناو یەک گۆڕدا نێژرا دڵم ئاسودە نەبوو تا دەرم هێناو بە تەنها ناشتم.**

## نوێژ کردن لەسەر گۆڕی مردوو (پاش ناشتنی)

**٢٠٢٢-** «عَنْ يَزِيدَ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ أَنَّهُمْ خَرَجُوا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ فَرَأَى قَبْراً جَدِيداً، فَقَالَ: مَا هَذَا؟ قَالُوا: هَذِهِ فُلَانَةُ مَوْلَاةُ بَنِي فُلَانٍ، فَعَرَفَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، مَاتَتْ ظُهْراً وَأَنْتَ نَائِمٌ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٥٢.




قَائِلٌ فَلَمْ نُحِبَّ أَنْ نُوقِظَكَ بِهَا، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَصَفَّ النَّاسَ خَلْفَهُ، وَكَبَّرَ عَلَيْهَا أَرْبَعاً، ثُمَّ قَالَ: لَا يَمُوتُ فِيكُمْ مَيِّتٌ مَا دُمْتُ بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ إِلَّا آذَنْتُمُونِي بِهِ، فَإِنَّ صَلَاتِي لَهُ رَحْمَةٌ»[١].

**واتە: یەزیدی کوڕی ثابت ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەوان ڕۆژێک لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوون، گۆڕێکی تازەی بینی، فەرمووی: ئەمە چیە؟ وتیان: ئەمە گۆڕی فلانە ئافرەتە مەولای نەوەکانی فلان، پێغەمبەری خوا ﷺ ناسیەوە، وتیان: نیوەڕۆ مردبوو تۆش خەوتبووی قەیلولەت دەکرد حەزمان نەکرد بە خەبەرت بێنینەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا خەڵکەکەش لە پشتیەوە ڕیزیان بەست، چوار جار تەکبیری کرد بەسەریدا (لە نوێژەکەدا) پاشان فەرمووی: هەر کەس لە ئێوە مرد ئاگادارم بکەنەوە مادام لە ناوتاندام، چونکە نوێژی من بۆی ڕەحمەتە.**

**٢٠٢٣-** «عَنْ سُلَيْمَان الشَّيْبَانِيِّ، عَن الشَّعْبِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَنْ مَرَّ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَى قَبْرٍ مُنْتَبِذٍ، فَأَمَّهُمْ، وَصَفَّ خَلْفَهُ، قُلْتُ: مَنْ هُوَ يَا أَبَا عَمْرٍو؟ قَالَ: ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا»[٢].

**واتە: سولەیمانی شەیبانی دەگێڕێتەوە: شەعبی وتوویەتی: هەواڵی پێدام ئەو کەسەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بەلای تەنها گۆڕێکدا دوور لە گۆڕەکانی تر، پێشنوێژی بۆ کردن، ئەویش لە پشتیەوە لە ڕیزەکەدا بوو، وتم: ئەو کەسە کێ بوو ئەی باوکی عەمر؟ وتی: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ).**

**٢٠٢٤-** «عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: أَخْبَرَنِي مَنْ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ بِقَبْرٍ مُنْتَبِذٍ فَصَلَّى عَلَيْهِ، وَصَفَّ أَصْحَابَهُ خَلْفَهُ، قِيلَ مَنْ حَدَّثَكَ؟ قَالَ: ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا»[٣].

**واتە: شەعبی دەڵێ: هەواڵی پێدام ئەو کەسەی پێغەمبەری ﷺ بینی تێپەڕی بە لای تەنها گۆڕێکدا دوور لە گۆڕەکانی تر، نوێژی لەسەری کرد، هاوەڵەکانیشی لە پشتی خۆیەوە ڕیز کرد، وترا کێ بۆی باس کردی؟ وتی: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ).**

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٥٢٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٥٧ و ١٢٤٧ و ١٣١٩ و ١٣٢١ و ١٣٢٢ و ١٣٢٦ و ١٣٣٦ و ١٣٤٠، ومسلم: ٦٨ و ٩٥٤/٦٩، وأبو داود: ٣١٩٦، والترمذي: ١٠٣٧، وإبن ماجه: ١٥٣٠.

(٣) صحيح.




**٢٠٢٥-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى عَلَى قَبْرِ امْرَأَةٍ بَعْدَ مَا دُفِنَتْ»[١].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر گۆڕی ئافرەتێک کرد دوای ئەوەی نێژرا.**

## سوار بوون دوای ناشتنی جەنازە

**٢٠٢٦-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى جَنَازَةِ أَبِي الدَّحْدَاحِ، فَلَمَّا رَجَعَ أُتِيَ بِفَرَسٍ مُعْرَوْرًى، فَرَكِبَ وَمَشَيْنَا مَعَهُ»[٢].

**واتە: جابری کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ جەنازەی ئەبو دەحداح، کاتێ گەڕایەوە ئەسپێکیان بۆی هێنا زین نەکرابوو، سواری بوو ئێمەش لەگەڵیدا ڕێمان دەکرد.**

## دانانی شتی زیادە لەسەر گۆڕ

**٢٠٢٧-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُبْنَى عَلَى الْقَبْرِ، أَوْ يُزَادَ عَلَيْهِ، أَوْ يُجَصَّصَ. زَادَ سُلَيْمَانُ بْنُ مُوسَى: أَوْ يُكْتَبَ عَلَيْهِ»[٣].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردوە خانوو لەسەر گۆر دروست بکرێ، یان خۆڵی زیاتر بکرێت بەسەریدا، یان گەچکاری بکرێت. سولەیمانی کوڕی مووسا (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودە) ئەوەشی زیاد کردوە: یان لەسەری بنوسرێ.**

## دروست کردنی دیوارو خانوو لەسەر گۆڕ

**٢٠٢٨-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ تَقْصِيصِ الْقُبُورِ، أَوْ يُبْنَى عَلَيْهَا، أَوْ يَجْلِسَ عَلَيْهَا أَحَدٌ»[٤].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٦٥، وأبو داود: ٣١٧٨، والترمذي: ١٠١٣ و ١٠١٤.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٤ و ٩٧٠/٩٥ و ٣٢٢٥ و ٣٢٢٦، والترمذي: ١٠٥٢، وإبن ماجه: ١٥٦٢ و ١٥٦٣.

(٤) صحيح.




**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە گەچکاری کردنی گۆڕەکان، یان خانووی لەسەر دروست بکرێ، یان کەسێک لەسەری دابنیشێ.**

## گەچکاری کردنی گۆڕەکان

**٢٠٢٩-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ تَجْصِيصِ الْقُبُورِ»[١].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە گەچکاری کردنی گۆڕەکان.**

## تەخت کردنی زەوی ئەگەر بەرز کرایەوە

**٢٠٣٠-** «عَنْ ثُمَامَةَ بْنَ شُفَيٍّ قَالَ: كُنَّا مَعَ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ ﷺ بِأَرْضِ الرُّومِ، فَتُوُفِّيَ صَاحِبٌ لَنَا فَأَمَرَ فَضَالَةُ بِقَبْرِهِ فَسُوِّيَ ثُمَّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُ بِتَسْوِيَتِهَا»[٢].

**واتە: ثومامەی کوڕی شوفەی دەڵێ: ئێمە لەگەڵ فەضالەی کوڕی عوبەید ﷺ بووین لە خاکی ڕۆمەکان، هاوەڵێکمان مرد، فەضالە فەرمانی کرد گۆڕەکەی تەخت کرا، پاشان وتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە تەخت کردنی (گۆڕ).**

**٢٠٣١-** «عَنْ أَبِي الْهَيَّاجِ، قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ ﷺ: أَلَا أَبْعَثُكَ عَلَى مَا بَعَثَنِي عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، لَا تَدَعَنَّ قَبْراً مُشْرِفاً إِلَّا سَوَّيْتَهُ، وَلَا صُورَةً فِي بَيْتٍ إِلَّا طَمَسْتَهَا»[٣].

**واتە: ئەبو هەییاج دەڵێ: عەلی ﷺ وتی: ئایا ڕەوانەت بکەم بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەوانەی کردووم، هەر گۆڕێکی بەرزت بینی حەتمەن تەختی بکە، هەر وێنەیەکیشت بینی لە ماڵدا لایبەرە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٦٨، وأبو داود: ٣٢١٩.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٦٩، وأبو داود: ٣٢١٨، والترمذي: ١٠٤٩.





## سەردانی کردنی گۆڕستان

**٢٠٣٢-** «عَنْ بُرَيْدَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ فَزُورُوهَا، وَنَهَيْتُكُمْ عَنْ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ فَوْقَ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ، فَامْسِكُوا مَا بَدَا لَكُمْ، وَنَهَيْتُكُمْ عَنِ النَّبِيذِ إِلَّا فِي سِقَاءٍ، فَاشْرَبُوا فِي الْأَسْقِيَةِ كُلِّهَا وَلَا تَشْرَبُوا مُسْكِراً»(١).

**واتە: بوڕەیدە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕێگریم لێکردن لە سەردانی گۆڕستان، بەڵام (لەمەودوا) سەردانی بکەن، وە ڕێگریم لێکردن لە هەڵگرتنی گۆشتی قوربانی لە سەرووی سێ ڕۆژەوە، (بەڵام لەمەودوا) ئەوەی بۆتان دەکرێ لێی هەڵبگرن، ڕیگریم لێکردن لە دروست کردنی گیراوە مەگەر لە جەوەنەدا نەبێت، (بەڵام لەمەودوا) لە هەموو قاپ و قاچاخەکان بخۆنەوە، بەڵام شتی سەرخۆشکەر مەخۆنەوە.**

**٢٠٣٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ فِي مَجْلِسٍ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ أَنْ تَأْكُلُوا لُحُومَ الْأَضَاحِيِّ إِلَّا ثَلَاثاً، فَكُلُوا وَأَطْعِمُوا وَادَّخِرُوا مَا بَدَا لَكُمْ، وَذَكَرْتُ لَكُمْ أَنْ لَا تَنْتَبِذُوا فِي الظُّرُوفِ الدُّبَّاءِ وَالْمُزَفَّتِ وَالنَّقِيرِ وَالْحَنْتَمِ انْتَبِذُوا فِيمَا رَأَيْتُمْ وَاجْتَنِبُوا كُلَّ مُسْكِرٍ، وَنَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ، فَمَنْ أَرَادَ أَنْ يَزُورَ فَلْيَزُرْ، وَلَا تَقُولُوا هُجْراً»(٢).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بوڕەیدە دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە ﷺ، ئەو لە کۆڕێکدا بوو پێغەمبەری خوای ﷺ تێدا بوو، فەرمووی: بەڕاستی من ڕێگریم لێ کردن گۆشتی قوربانی لە سەرووی سێ ڕۆژ زیاترەوە بخۆن، جا (لەمەودوا) بخۆن و لێی هەڵبگرن ئەوەندەی لە تواناتانە، وە باسی ئەوەم بۆ کردن کە گیراوە نەگرنەوە لە ناو (الدُّبَّاء) کولەکە و (الْمُزَفَّتُ) قاپی بۆیە کراو بە زفت و (النَّقير) لقی دارخورماو (الْحَنْتَمْ) گۆزە، (چونکە ئەوانە زوو گیراوەکە دەکەن بە مادەی سەرخۆشکەر) ئیتر گیراوەیان تێدا بگرنەوەو خۆتان بە دوور بگرن لە هەموو سەرخۆشکەرێک، وە ڕێگریم لێ کردن لەسەردانی گۆڕستان، هەر کەس دەیەوێت سەردانی گۆڕستان بکات با سەردانی بکات، قسەی خراپیش مەکەن.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٧٧ و ١٩٧٧/٣٧، وأبو داود: ٣٢٣٥ و ٣٤٠٥ و ٣٦٩٨، والترمذي: ١٠٥٤ و ١٥١٠ و ١٨٦٩.

(٢) صحيح.

## سەردانی گۆڕی هاوبەشدانەر ان

**٢٠٣٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: زَارَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَبْرَ أُمِّهِ، فَبَكَى وَأَبْكَى مَنْ حَوْلَهُ، وَقَالَ: اسْتَأْذَنْتُ رَبِّي ﷻ فِي أَنْ أَسْتَغْفِرَ لَهَا فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي، وَاسْتَأْذَنْتُ فِي أَنْ أَزُورَ قَبْرَهَا فَأَذِنَ لِي، فَزُورُوا الْقُبُورَ فَإِنَّهَا تُذَكِّرُكُمُ الْمَوْتَ»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی گۆڕی دایكی كرد، گریاو دەورو بەری گریاند، فەرمووی: داوام لە پەروەردگارم كردوە داوای لێخۆشبوون بكەم بۆ دایكم مۆڵەتی نەدام، داوام لێكرد سەردانی گۆڕەكەی بكەم مۆڵەتی دام، سەردانی گۆڕستان بكەن، چونكە مردنتان بیر دەخاتەوە.**

## نەهی كردن لە داوای لێخۆش بوون بۆ هاوبەشدانەران

**٢٠٣٥-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: لَمَّا حَضَرَتْ أَبَا طَالِبٍ الْوَفَاةُ دَخَلَ عَلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ، وَعِنْدَهُ أَبُو جَهْلٍ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أُمَيَّةَ، فَقَالَ: أَيْ عَمِّ قُلْ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، كَلِمَةً أُحَاجُّ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللَّهِ ﷻ، فَقَالَ لَهُ أَبُو جَهْلٍ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أُمَيَّةَ: يَا أَبَا طَالِبٍ، أَتَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ؟ فَلَمْ يَزَالَا يُكَلِّمَانِهِ حَتَّى كَانَ آخِرُ شَيْءٍ كَلَّمَهُمْ بِهِ عَلَى مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ مَا لَمْ أُنْهَ عَنْكَ، فَنَزَلَتْ: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ ﴿١١٣﴾ ﴾التوبة، وَنَزَلَتْ: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ ﴿٥٦﴾ ﴾القصص»[2].

**واتە: سەعیدی كوڕی موسەییب دەگێڕێتەوە: لە باوكیەوە ﷺ، كاتێ ئەبو طالیب لە سەرەمەرگدا بوو پێغەمبەر ﷺ چووە ژوورەوە بۆ لای لە كاتێكدا ئەبو جەهل و عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو ئومەیەی لەلا بوو، فەرمووی: ئەی مامم بڵێ: هیچ پەرستراوێك بە حەق نیە جگە لە اللَّه، وشەیەكە دەیكەمە بەڵگە بۆت لە لای خوا ﷻ، ئەبو جەهل و عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو ئومەیە وتیان: ئەی ئەبو طالیب، ئایا پشت دەكەی لە میللەتی عەبدولموطلیب؟ بەردەوام قسەیان بۆ دەكرد تا كۆتا وشەی ئەوە بوو لەسەر میللەتی عەبدولموطلیبە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: داوای لێخۆشبونت بۆ**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٧٦، وأبو داود: ٣٢٣٤، وإبن ماجه: ١٥٦٩ و ١٥٧٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٦٠ و ٣٨٨٤ و ٤٦٧٥ و ٤٧٧٢ و ٦٦٨١، ومسلم: ٣٩ و ٢٤/٤٠.

دەکەم تا قەدەغەم لێنەکرێ، ئینجا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١١٣﴾ ﴾، (واتە: واتە: ڕەواو شایستە نیە بۆ پێغەمبەرو بڕواداران کە داوای لێبوردن بکەن بۆ هاوبەشدانەران). هەروەها ئەمەش دابەزی: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ ﴿٥٦﴾ ﴾، (واتە: بەڕاستی تۆ هیدایەتی ئەو کەسە نادەیت کە خۆشت بوێ).

**٢٠٣٦-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَجُلاً يَسْتَغْفِرُ لِأَبَوَيْهِ وَهُمَا مُشْرِكَانِ، فَقُلْتُ: أَتَسْتَغْفِرُ لَهُمَا وَهُمَا مُشْرِكَانِ؟ فَقَالَ: أَوَ لَمْ يَسْتَغْفِرْ إِبْرَاهِيمُ لِأَبِيهِ؟ فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَنَزَلَتْ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱسۡتِغۡفَارُ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ ﴿١١٤﴾ ﴾التوبة»[1].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پیاوێک داوای لێخۆشبوونی بۆ باوک و دایکی دەکرد، ئەوانیش هاوبەشدانەر بوون، وتم: ئایا داوای لێخۆشبوونیان بۆ دەکەی لە کاتێکدا ئەوان هاوبەشیان داناوە؟ وتی: ئەی ئیبراهیم داوای لێخۆشبوونی بۆ باوکی نەکرد؟ هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەوەم بۆی باس کرد، ئینجا ئەم ئایەتە دابەزیە خوارەوە: ﴿ وَمَا كَانَ ٱسۡتِغۡفَارُ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ ﴿١١٤﴾ ﴾، (واتە: وە داوای لێخۆشبوونی ئیبراهیم بۆ باوکی تەنها لەبەر وادەو بەڵێنێک بوو کە بە باوکی دابوو).

## فەرمان کردن بە داوای لێخۆشبوون بۆ بڕواداران

**٢٠٣٧-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ قَيْسِ بْنِ مَخْرَمَةَ يَقُولُ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا تُحَدِّثُ، قَالَتْ: أَلَا أُحَدِّثُكُمْ عَنِّي، وَعَنِ النَّبِيِّ ﷺ؟ قُلْنَا: بَلَى، قَالَتْ: لَمَّا كَانَتْ لَيْلَتِي الَّتِي هُوَ عِنْدِي «تَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ» انْقَلَبَ فَوَضَعَ نَعْلَيْهِ عِنْدَ رِجْلَيْهِ، وَبَسَطَ طَرَفَ إِزَارِهِ عَلَى فِرَاشِهِ، فَلَمْ يَلْبَثْ إِلَّا رَيْثَمَا ظَنَّ أَنِّي قَدْ رَقَدْتُ، ثُمَّ انْتَعَلَ رُوَيْداً، وَأَخَذَ رِدَاءَهُ رُوَيْداً، ثُمَّ فَتَحَ الْبَابَ رُوَيْداً، وَخَرَجَ رُوَيْداً. وَجَعَلْتُ دِرْعِي فِي رَأْسِي، وَاخْتَمَرْتُ، وَتَقَنَّعْتُ إِزَارِي، وَانْطَلَقْتُ فِي إِثْرِهِ حَتَّى جَاءَ الْبَقِيعَ، فَرَفَعَ يَدَيْهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَأَطَالَ ثُمَّ انْحَرَفَ، فَانْحَرَفْتُ، فَأَسْرَعَ، فَأَسْرَعْتُ، فَهَرْوَلَ فَهَرْوَلْتُ، فَأَحْضَرَ فَأَحْضَرْتُ، وَسَبَقْتُهُ فَدَخَلْتُ فَلَيْسَ إِلَّا أَنْ اضْطَجَعْتُ، فَدَخَلَ فَقَالَ: مَا لَكِ يَا عَائِشَةُ حَشْيَا رَابِيَةً؟، قَالَتْ: لَا، قَالَ: لَتُخْبِرِنِّي أَوْ لَيُخْبِرَنِّي اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بِأَبِي أَنْتَ

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ٣١٠١.

وَأُمِّي، فَأَخْبَرْتُهُ الْخَبَرَ، قَالَ: فَأَنْتِ السَّوَادُ الَّذِي رَأَيْتُ أَمَامِي؟ قَالَتْ: نَعَمْ، فَلَهَزَنِي فِي صَدْرِي لَهْزَةً أَوْجَعَتْنِي، ثُمَّ قَالَ: أَظَنَنْتِ أَنْ يَحِيفَ اللَّهُ عَلَيْكِ وَرَسُولُهُ؟، قُلْتُ: مَهْمَا يَكْتُمِ النَّاسُ فَقَدْ عَلِمَهُ اللَّهُ، قَالَ: فَإِنَّ جِبْرِيلَ أَتَانِي حِينَ رَأَيْتِ، وَلَمْ يَدْخُلْ عَلَيَّ، وَقَدْ وَضَعْتِ ثِيَابَكِ، فَنَادَانِي فَأَخْفَى مِنْكِ، فَأَجَبْتُهُ فَأَخْفَيْتُهُ مِنْكِ، فَظَنَنْتُ أَنْ قَدْ رَقَدْتِ، وَكَرِهْتُ أَنْ أُوقِظَكِ، وَخَشِيتُ أَنْ تَسْتَوْحِشِي، فَأَمَرَنِي أَنْ آتِيَ الْبَقِيعَ، فَأَسْتَغْفِرَ لَهُمْ، قُلْتُ: كَيْفَ أَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: قُولِي السَّلَامُ عَلَى أَهْلِ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ، يَرْحَمُ اللَّهُ الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنَّا وَالْمُسْتَأْخِرِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لَاحِقُونَ»[١].

**واتە: موحەممەدی کوڕی قەیسی کوڕی مەخرەمە دەڵێ: گوێم لە عائیشە بوو (حوا لێی ڕازی بێ) دەیوت: ئایا دەربارەی خۆم و پێغەمبەر ﷺ شتێکتان بۆ بگێڕمەوە؟ وتمان: بەڵێ، وتی: کاتێ ئەو شەوەی نۆرەی من بوو لە لام بێت «مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بوو» گەڕایەوە لە نوێژی عیشا نەعلەکانی لە لای پێی دانا، هەروەها بەشێک لە عەباکەی لەسەر شوێنی خەوەکەی ڕاخست، نەمایەوە بە ئەندازەی ئەوە نەبێت گومانی برد من خەوم لێکەوتووە، پاشان بە ئەسپایی نەعلەکانی لە پێ کردو بە ئەسپایی عەباکەی هەڵگرت، پاشان بە ئەسپایی دەرگاکەی کردەوەو بە ئەسپایی دەرچووە دەرەوە، منیش سەرپۆشەکەم لەسەر کردبوو پشتەماڵەکەشم بە خۆمداداو خۆم پێچایەوە، بە شوێنیدا ڕۆیشتم تا هاتە بەقیع، سێ جار دەستی بەرز کردەوەو پاڕایەوە، درێژەی خایاند، پاشان گەڕایەوە منیش گەڕامەوە، پەلەی کردو منیش پەلەم کرد، لەسەر خۆی ڕای کرد، منیش ڕامکرد، ئەو گەیشت و منیش گەیشتم پێشی کەوتم چوومە ژوورەوە ڕاستەوخۆ پاڵکەوتم، ئەویش هاتە ژوورەوە فەرمووی: ئەوە چیە هەناسەت سوار بووە؟ (عائیشە) وتی: نا، فەرمووی: خوای بەبەزەیی و شارەزا هەواڵی پێدام، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا دایک و باوکم بە قوربانت بن، باسم کرد بۆی، فەرمووی: ئەو ڕەشاییەی لە پێش خۆم بینیم تۆ بووی؟ وتم: بەڵێ، دای بەسەر سنگمدا بە لێدانێک ئازاری پێگەیاندم، پاشان فەرمووی: ئایا گومانت برد خواو پێغەمبەرەکەی ستەمیان لێکردووی؟ وتم: خەڵکی هەرچۆنێک بیشارنەوە خوا دەیزانێ، فەرمووی: جبریل هات بۆ لام کاتێ تۆ بینیت، بەڵام کە تۆ جلەکانت دانا نەهاتە ژوورەوە، بانگی کردم زۆر بە ئەسپایی لە تۆی شاردەوە، منیش وەڵامم**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٧٤/١٠٣.




دایەوەو لە تۆم شاردەوە، گومانم برد خەوتبی، حەزم نەکرد بە خەبەرت بهێنمەوە، لەوەش ترسام بترسی، فەرمانی پێکردم بچم بۆ بەقیع و داوای لێخۆشبونیان بۆ بکەم، وتم: چی بڵێم ئەی نێردراوی خوا (لە کاتی سەردانی گۆڕستان)؟ وتی: بڵێ: سەلامی خواتان لێ بێت خاوەنی خانەکان لە بڕواداران مسوڵمانان خوا بەزەیی بێتەوە بەوانەی پێشمان کەوتوون و ئەوانەش دوامان دەکەون، بێگومان ئێمەش بە ویستی خوا پێتان دەگەین.

**٢٠٣٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا تَقُولُ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَلَبِسَ ثِيَابَهُ، ثُمَّ خَرَجَ. قَالَتْ: فَأَمَرْتُ جَارِيَتِي بَرِيرَةَ تَتْبَعُهُ، فَتَبِعَتْهُ حَتَّى جَاءَ الْبَقِيعَ، فَوَقَفَ فِي أَدْنَاهُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقِفَ، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَسَبَقَتْهُ بَرِيرَةُ، فَأَخْبَرَتْنِي، فَلَمْ أَذْكُرْ لَهُ شَيْئاً حَتَّى أَصْبَحْتُ، ثُمَّ ذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: إِنِّي بُعِثْتُ إِلَى أَهْلِ الْبَقِيعِ لِأُصَلِّيَ عَلَيْهِمْ»(١).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێک هەڵسا جلەکانی لەبەر کرد، پاشان دەرچوو، (عائیشە) دەڵێ: فەرمانم کرد بە کەنیزەکەکەم بەریرە شوێنی بکەوێت، ئەویش شوێنی کەوت تا هات بۆ بەقیع، لە خواریەوە وەستا ئەوەندی خوا ویستی لەسەر بوو بوەستێ، پاشان ڕۆیشت، بەریرە پێشی کەوت، هەواڵی پێدام هیچم بۆی باس نەکرد تا ڕۆژ بوویەوە، پاشان بۆم باس کرد، فەرمووی: من نێردرام بۆ لای ئەهلی بەقیع بۆ ئەوەی داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەم.

**٢٠٣٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كُلَّمَا كَانَتْ لَيْلَتُهَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَخْرُجُ فِي آخِرِ اللَّيْلِ إِلَى الْبَقِيعِ فَيَقُولُ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ، وَإِنَّا وَإِيَّاكُمْ مُتَوَاعِدُونَ غَداً أَوْ مُوَاكِلُونَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لَاحِقُونَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِأَهْلِ بَقِيعِ الْغَرْقَدِ»(٢).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: هەر کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ شەوەکەی لەلای من بووایە لە کۆتایی شەودا دەردەچوو بۆ بەقیع، دەیفەرموو: سەلامی خواتان لێ بێت خاوەن ماڵی بڕواداران، ئێمەو ئێوەش پەیمانمان بە یەکتری داوە بە ئامادەبوون لە ڕۆژی دوایی، یان پشتمان بە یەکتری بەستووە بۆ شەفاعەت، ئێمەش بە ویستی خوا پێتان دەگەین، خوایە لە ئەهلی بەقیعی غەرقەد خۆشبە.

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٧٤.

**٢٠٤٠-** «عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا أَتَى عَلَى الْمَقَابِرِ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لَاحِقُونَ، أَنْتُمْ لَنَا فَرَطٌ وَنَحْنُ لَكُمْ تَبَعٌ، أَسْأَلُ اللَّهَ الْعَافِيَةَ لَنَا وَلَكُمْ»[١].

**واتە: سولەیمانی کوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بچوایەتە گۆڕستان دەیفەرموو: سەلامی خواتان لێ بێت خاوەن خانەکان لە بڕواداران و مسولمانان، بە ویستی خوا دەگەین دەگەین، ئێوە پێشینەی ئێمەن پێشمان کەوتوون و ئێمەش بە دواتاندا دێین، لە خوا دەپاڕێمەوە ئێمەو ئێوەش بپارێزێ.**

**٢٠٤١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: لَمَّا مَاتَ النَّجَاشِيُّ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: اسْتَغْفِرُوا لَهُ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتێ نەجاشی مرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەن.**

**٢٠٤٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَعَى لَهُمُ النَّجَاشِيَّ صَاحِبَ الْحَبَشَةِ فِي الْيَوْمِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، فَقَالَ: اسْتَغْفِرُوا لِأَخِيكُمْ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی مردنی نەجاشی خاوەنی حەبەشەی پێ ڕاگەیاندن لەو ڕۆژەی کە تیایدا مرد، وە فەرمووی: داوای لێخۆشبوون بۆ براکەتان بکەن.**

## هەڕەشەی توند بۆ داگیرساندنی چرا لەسەر گۆڕەکان

**٢٠٤٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زَائِرَاتِ الْقُبُورِ، وَالْمُتَّخِذِينَ عَلَيْهَا الْمَسَاجِدَ وَالسُّرُجَ»[٤].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لەو ئافرەتانەی سەردانی گۆڕەکان دەکەن، لەوانەش مزگەوتیان لەسەر دروست دەکەن و چرایان لەسەر دادەگیرسێنن.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٧٥، وإبن ماجه: ١٥٤٧.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) ضعيف بذكر «السُّرُجَ». أخرجه أبو داود: ٣٢٣٦، والترمذي: ٣٢٠، وإبن ماجه: ١٥٧٥.

## هەڕەشە کردن دەربارەی دانەنیشتن لەسەر گۆڕەکان

**٢٠٤٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَأَنْ يَجْلِسَ أَحَدُكُمْ عَلَى جَمْرَةٍ حَتَّى تَحْرُقَ ثِيَابَهُ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَجْلِسَ عَلَى قَبْرٍ»[(١)].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە لەسەر پشکۆیەک (ئاگر) دابنیشێت تا جلەکانی دەسوتێن، چاکترە بۆی لەوەی لەسەر گۆڕێک دابنیشێ.**

**٢٠٤٥-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا تَقْعُدُوا عَلَى الْقُبُورِ»[(٢)].

**واتە: عەمری کوڕی حەزم ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لەسەر گۆڕەکان دامەنیشن.**

## (حوکمی) ئەوەی گۆڕستان بکرێت بە مزگەوت

**٢٠٤٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَعَنَ اللَّهُ قَوْمَاً اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ»[(٣)].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نەفرینی خوا لە خەڵکانێک گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کرد بە مزگەوت.**

**٢٠٤٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَعَنَ اللَّهُ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ»[(٤)].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەفرینی خوا لە جولەکەو گاورەکان گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کرد بە مزگەوت.**

---

**(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٧١، وأبو داود: ٣٢٢٨، وإبن ماجه: ١٥٦٦.**

**(٢) صحيح لغيره.**

**(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٣٠ و ١٣٩٠ و ٤٤٤١، ومسلم: ٥٢٩ بلفظ أتم.**

**(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٣٧، ومسلم: ٥٣٠، وأبو داود: ٣٢٢٧.**




## ڕێکردن لە نێوان گۆڕەکان بە نەعلی سیبتیەوە کەراهەتی هەیە

**٢٠٤٨-** «عَنْ بَشِيرَ ابْنَ الْخَصَاصِيَةِ ﷺ قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَمَرَّ عَلَى قُبُورِ الْمُسْلِمِينَ، فَقَالَ: لَقَدْ سَبَقَ هَؤُلَاءِ شَرّاً كَثِيراً، ثُمَّ مَرَّ عَلَى قُبُورِ الْمُشْرِكِينَ، فَقَالَ: لَقَدْ سَبَقَ هَؤُلَاءِ خَيْراً كَثِيراً، فَحَانَتْ مِنْهُ الْتِفَاتَةٌ، فَرَأَى رَجُلاً يَمْشِي بَيْنَ الْقُبُورِ فِي نَعْلَيْهِ، فَقَالَ: يَا صَاحِبَ السِّبْتِيَّتَيْنِ أَلْقِهِمَا»[١].

**واتە: بەشیری کوڕی خەصاصیە ﷺ دەڵێ: من لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێم دەکرد، تێپەڕی بە لای گۆڕستانی مسوڵمانان فەرمووی: بەڕاستی ئەوانە پێشی شەڕێکی زۆر کەوتن. (واتە: نەگەیشتن بە شەڕو خراپەو گەیشتن بە خێر)، پاشان تێپەڕی بەلای گۆڕستانی هاوبەشدانەران، فەرمووی: بەڕاستی ئەوانە پێشی خێرێکی زۆر کەوتن. (واتە: نەگەیشتن بە خێرو چاکەو گەیشتن بە شەڕ)، ئینجا ئاوڕی دایەوە پیاوێکی بینی لە نێوان گۆڕەکاندا ڕێ دەکرد بە نەعلەکانیەوە، فەرمووی: ئەی خاوەن نەعلە سیبتیەکە لە پێتی داکەنە.**

**تێبینی: (السِّبْتِيَّة) دراوەتە پاڵ (السبت) ئەویش بریتیە لە پێستی مانگای خۆشەکراو نەعلی پێ دروست دەکەن.**

## ئاسانکاری لە بەکارهێنانی ئەو نەعلەی سیبتی نیە

**٢٠٤٩-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ وَتَوَلَّى عَنْهُ أَصْحَابُهُ إِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی بەندە کاتێ دەخرێتە ناو گۆڕەکەیەوەو هاوەڵەکانی دەگەڕێنەوەو پشتی تێدەکەن، شەقەی نەعلەکانیان دەبیستێ.**

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٢٣٠، وابن ماجه: ١٥٦٨.

(٢) صحيح.




## پرسیار کردنی ناو گۆڕ

**٢٠٥٠-** «عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ وَتَوَلَّى عَنْهُ أَصْحَابُهُ إِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ، قَالَ: فَيَأْتِيهِ مَلَكَانِ، فَيُقْعِدَانِهِ فَيَقُولَانِ لَهُ: مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ؟ فَأَمَّا الْمُؤْمِنُ، فَيَقُولُ: أَشْهَدُ أَنَّهُ عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ، فَيُقَالُ لَهُ: انْظُرْ إِلَى مَقْعَدِكَ مِنَ النَّارِ قَدْ أَبْدَلَكَ اللَّهُ بِهِ مَقْعَداً مِنَ الْجَنَّةِ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: فَيَرَاهُمَا جَمِيعاً»[1].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی بەندە کاتێ خرایە ناو گۆڕەکەی و هاوەڵەکانی پشتیان تێکرد، شەقەی نەعلەکانیان دەبیستێ، فەرمووی: دوو فریشتە دێن بۆ لای، دای دەنیشێنن و پێی دەڵێن: تۆ چی دەڵێی دەربارەی ئەو پیاوە (واتە: پێغەمبەری خوا)؟ بڕوادار دەڵێ: شایەتی دەدەم ئەو بەندەو پێغەمبەری خوا بووە، پێی دەوترێ: تەماشای شوێنەکەی خۆت بکە لە ئاگردا کە چۆن خوا بۆی گۆڕیویت بە شوێنێک لە بەهەشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەردووکیان پێکەوە دەبینێت.**

## پرسیار کردن لە بێبڕوا

**٢٠٥١-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ وَتَوَلَّى عَنْهُ أَصْحَابُهُ إِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ، أَتَاهُ مَلَكَانِ فَيُقْعِدَانِهِ فَيَقُولَانِ لَهُ: مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ مُحَمَّدٍ ﷺ؟ فَأَمَّا الْمُؤْمِنُ فَيَقُولُ: أَشْهَدُ أَنَّهُ عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ، فَيُقَالُ لَهُ: انْظُرْ إِلَى مَقْعَدِكَ مِنَ النَّارِ قَدْ أَبْدَلَكَ اللَّهُ بِهِ مَقْعَداً خَيْراً مِنْهُ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَيَرَاهُمَا جَمِيعاً، وَأَمَّا الْكَافِرُ أَوِ الْمُنَافِقُ فَيُقَالُ لَهُ: مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ؟ فَيَقُولُ: لَا أَدْرِي، كُنْتُ أَقُولُ كَمَا يَقُولُ النَّاسُ، فَيُقَالُ لَهُ: لَا دَرَيْتَ وَلَا تَلَيْتَ، ثُمَّ يُضْرَبُ ضَرْبَةً بَيْنَ أُذُنَيْهِ فَيَصِيحُ صَيْحَةً يَسْمَعُهَا مَنْ يَلِيهِ غَيْرُ الثَّقَلَيْنِ»[2].

**واتە: ئەنەسی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی بەندە کاتێ خرایە ناو گۆڕەکەی و هاوەڵەکانی پشتیان تێکرد، شەقەی نەعلەکانیان دەبیستێ، فەرمووی: دوو فریشتە دێن بۆ لای، دای دەنیشێنن و پێی دەڵێن: تۆ چی دەڵێی دەربارەی**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٣٨ و ١٣٧٤، ومسلم: ٧٠ و ٢٨٧٠/٧١، وأبو داود: ٣٢٣١ و ٤٧٥٢.

ئەو پیاوە موحەممەد ﷺ؟ بڕوادار دەڵێ: شایەتی دەدەم ئەو بەندەو پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، پێی دەوترێ: تەماشای شوێنەکەی خۆت بکە لە ئاگردا کە چۆن خوا بۆی گۆڕیویت بە شوێنێکی چاکتر لەو شوێنە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەردووکیان پێکەوە دەبینێت، بەڵام (کەسی) بێبڕوا یان دووڕوو، پێی دەوترێ: تۆ چی دەڵێی دەربارەی ئەو پیاوە؟ دەڵێ: نازانم، خەڵکی چیان دەوت منیش هەر ئەوەم دەوت، پێی دەوترێ: دەی هەر نەزانیت و زمانت گۆ نەکات، پاشان بە لێدانێک لە نێوانی هەردوو گوێچکەی دەدەن ئیتر هات و هاوارێکی وا دەکات هەموو ئەوانەی لە دەوروبەرین دەیبیستن جگە لە مرۆڤ و جنۆکە.

## ئەو کەسەی بە هۆی سک ئێشەوە دەمرێ

**٢٠٥٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ يَسَارٍ، قَالَ: كُنْتُ جَالِساً وَسُلَيْمَانُ بْنُ صُرَدٍ وخَالِدُ بْنُ عُرْفُطَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فَذَكَرُوا أَنَّ رَجُلاً تُوُفِّيَ مَاتَ بِبَطْنِهِ، فَإِذَا هُمَا يَشْتَهِيَانِ أَنْ يَكُونَا شُهَدَاءَ جَنَازَتِهِ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِلْآخَرِ: أَلَمْ يَقُلْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ يَقْتُلْهُ بَطْنُهُ، فَلَنْ يُعَذَّبَ فِي قَبْرِهِ فَقَالَ الْآخَرُ: بَلَى»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی یەسار دەڵێ: من دانیشتبووم لەگەڵ سولەیمانی کوڕی صورەدو خالیدی کوڕی عورطوفە، باسی پیاوێکیان کرد بە هۆی سک ئێشەوە مرد، حەزیان دەکرد ئامادەی جەنازەکەی بین، یەکێکیان بەوی تری وت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفەرموو: هەر کەس بە هۆی سک ئێشەوە بمرێ هەرگیز لە گۆڕەکەیدا سزا نادرێ؟ ئەوی تریان وتی: بەڵێ وایە.

## شەهید (لە ناو گۆڕەکەی)

**٢٠٥٣-** «عَنْ رَاشِدِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا بَالُ الْمُؤْمِنِينَ يُفْتَنُونَ فِي قُبُورِهِمْ إِلَّا الشَّهِيدَ؟ قَالَ: كَفَى بِبَارِقَةِ السُّيُوفِ عَلَى رَأْسِهِ فِتْنَةً»[٢].

واتە: ڕاشیدی کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە: لە پیاوێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بۆچی بڕواداران تاقی دەکرێنەوە لە گۆڕەکانیان

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٠٦٤.

(٢) صحيح.

جگە لە شەهید نەبێت؟ فەرمووی: تیشکی شمشێرەکان لەسەر سەریان بەسە بۆ تاقیکردنەوە. (واتە: ئەوە بەسە لە کاتی جەنگ جیهاد خۆڕاگربن و بەرگەی شەهید بوون و کوژران بگرن).

**٢٠٥٤-** «عَنْ صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ ﷺ قَالَ: الطَّاعُونُ، وَالْمَبْطُونُ، وَالْغَرِيقُ، وَالنُّفَسَاءُ شَهَادَةٌ»[١].

واتە: صەفوانی کوڕی ئومەیە ﷺ دەڵێ: تاعون و سک ئێشە و خنکان و مردن بە هۆی منداڵبوونەوە (خاوەنەکانیان) شەهیدن (واتە: هەر کەسێک بەو حاڵەتانە بمرێ شەهیدە).

## پاڵەپەستۆو سەغڵەتی ناو گۆڕ

**٢٠٥٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: هَذَا الَّذِي تَحَرَّكَ لَهُ الْعَرْشُ، وَفُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ السَّمَاءِ، وَشَهِدَهُ سَبْعُونَ أَلْفاً مِنَ الْمَلَائِكَةِ، لَقَدْ ضُمَّ ضَمَّةً، ثُمَّ فُرِّجَ عَنْهُ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی (واتە: سەعدی کوڕی موعاز) کە عەرش لەبەر مردنی جوڵاو دەرگای ئاسمانەکانی بۆ کرایەوە، حەفتا هەزار لە فریشتەکانیش ئامادەی بوون، لە گۆڕەکەیدا جارێک گوشرا، پاشان دەرووی لێ کرایەوە.

## سزای ناو گۆڕ

**٢٠٥٦-** «عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأٓخِرَةِ ﴿٢٧﴾﴾ إبراهيم، قَالَ: نَزَلَتْ فِي عَذَابِ الْقَبْرِ»[٣].

واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأٓخِرَةِ ﴿٢٧﴾﴾، (واتە: ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە خوا دامەزراویان دەکات بە وتەی جێگیر کە شایەتمانە لە ژیانی دنیاو لە ڕۆژی دوایشدا)، دەڵێ: دەربارەی سزای ناو گۆڕ دابەزی.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**٢٠٥٧-** «عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأَخِرَةِ ﴿٢٧﴾ ﴾إبراهيم، قَالَ: نَزَلَتْ فِي عَذَابِ الْقَبْرِ، يُقَالُ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: رَبِّيَ اللَّهُ، وَدِينِي دِينُ مُحَمَّدٍ ﷺ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأَخِرَةِ ﴿٢٧﴾ ﴾إبراهيم»[١].

**واتە: بەڕائی كوڕی عازیب ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأَخِرَةِ ﴿٢٧﴾ ﴾، فەرمووی: دەربارەی سزای ناو گۆڕ دابەزی، پێی دەوترێ: كێ پەروەردگارتە؟ دەڵێ: پەروەردگارم خودایە، ئاینیشم ئاینی موحەممەدە ﷺ، ئەوەش فەرماشتی خوایە: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأَخِرَةِ ﴿٢٧﴾ ﴾.**

**٢٠٥٨-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَمِعَ صَوْتاً مِنْ قَبْرٍ فَقَالَ: مَتَى مَاتَ هَذَا؟ قَالُوا: مَاتَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَسُرَّ بِذَلِكَ، وَقَالَ: لَوْلَا أَنْ لَا تَدَافَنُوا لَدَعَوْتُ اللَّهَ أَنْ يُسْمِعَكُمْ عَذَابَ الْقَبْرِ»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ گوێی لە دەنگێک بوو لە ناو گۆڕێکدا فەرمووی: ئەمە كەی مردوە؟ وتیان لە سەردەمی نەفامیدا مردوە، دڵخۆش بوو بەوە (یان لەبەر ئەوەی كابرا بڕوادار بووە بەمەش هەتا هەتایی ناچێتە دۆزەخ، یان لەبەر ئەوە دڵخۆش بووە، چونكە كابرا دوژمنی خوا بووە و سزادراوە، فەرمووی: ئەگەر لەبەر مەترسی ئەوە نەبووایە مردووەكانتان نەشارنەوە داوام دەكرد لە خوا سزای ناو گۆڕ ببیستن.**

**٢٠٥٩-** «عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَعْدَ مَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ فَسَمِعَ صَوْتاً فَقَالَ: يَهُودُ تُعَذَّبُ فِي قُبُورِهَا»[٣].

**واتە: ئەیوب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای خۆر ئاوا بوون هاتە دەرەوە گوێی لە دەنگێک بوو فەرمووی: جولەكەكان سزا دەدرێن لە ناو گۆڕەكانیان.**

---

**(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٦٩ و ٤٦٩٩، ومسلم: ٧٣ و ٢٨٧١/٧٤، وأبو داود: ٤٧٥٠، والترمذي: ٣١٢٠، وإبن ماجه: ٤٢٦٩.**

**(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٨٦٨.**

**(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٧٥، ومسلم: ٣١٢٤.**




## پەنا گرتن لە سزای ناو گۆڕ

**٢٠٦٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ النَّارِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ»(١).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێدەگرم لە سزای ناو گۆڕ، وە پەنات پێدەگرم لە سزای ئاگر، وە پەنات پێدەگرم لە بەڵا و فیتنەی ژیان و مردن، وە پەنات پێدەگرم لە فیتنەی مەسیحی دەجال.**

**تێبینی: وشەی (دەجال): واتە: فێڵبازو ساختەچی.**

**٢٠٦١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعْدَ ذَلِكَ يَسْتَعِيذُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ»(٢).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوەی (ئافرەتە جولەکەکە باسی سزای ناو گۆڕی کرد) پەنای دەگرت لە سزای ناو گۆڕ.**

**٢٠٦٢-** «عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا تَقُولُ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرَ الْفِتْنَةَ الَّتِي يُفْتَنُ بِهَا الْمَرْءُ فِي قَبْرِهِ، فَلَمَّا ذَكَرَ ذَلِكَ ضَجَّ الْمُسْلِمُونَ ضَجَّةً حَالَتْ بَيْنِي وَبَيْنَ أَنْ أَفْهَمَ كَلَامَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا سَكَنَتْ ضَجَّتُهُمْ قُلْتُ لِرَجُلٍ قَرِيبٍ مِنِّي: أَيْ بَارَكَ اللَّهُ لَكَ، مَاذَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي آخِرِ قَوْلِهِ؟ قَالَ: قَدْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي الْقُبُورِ قَرِيباً مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ»(٣).

**واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ئەو بەڵاو تاقیکردنەوەی کرد کە مرۆڤ لە ناو گۆڕەکەی تووشی دەبێت، کاتێ ئەو باسەی کرد مسوڵمانان دەنگ و هاواریان لێ بەرز بوویەوە بە جۆرێک بوو بە بەربەست لە نێوان من و نێوان ئەوەی تێبگەم لە وتەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کاتێ هات و هاواریان نەما بە پیاوێک لە نزیک لە خۆمم وت: خوا بەرەکەت بڕێژێ بەسەرتدا،**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٧٧، ومسلم: ١٣٠ و ٥٨٨/١٣١.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٨٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٧٣.

**پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆتا وتەکەیدا چی فەرمووی؟ وتی: فەرمووی: بێگومان وەحیم بۆ هاتووە ئێوە تووشی فیتنە دەبن لە ناو گۆڕەکانتان نزیکە لە فیتنەی دەجال.**

**٢٠٦٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُعَلِّمُهُمْ هَذَا الدُّعَاءَ، كَمَا يُعَلِّمُهُمُ السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ قُولُوا: اللَّهُمَّ إِنَّا نَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ»(١).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری ئەم نزایەی دەکردن وەکو چۆن فێری سوورەتێکی قورئانی دەکردن بڵێن: خوایە ئێمە پەنات پێدەگرین لە سزای دۆزەخ ، وە پەنات پێدەگرم لە سزای ناو گۆڕ، وە پەنات پێدەگرم لە فیتنەی مەسیحی دەجال، وە پەنات پێدەگرم لە بەڵا و فیتنەی ژیان و مردن.**

**٢٠٦٤-** «عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَعِنْدِي امْرَأَةٌ مِنَ الْيَهُودِ وَهِيَ تَقُولُ: إِنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي الْقُبُورِ، فَارْتَاعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ: إِنَّمَا تُفْتَنُ يَهُودُ، وَقَالَتْ عَائِشَةُ: فَلَبِثْنَا لَيَالِيَ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّهُ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي الْقُبُورِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعْدُ يَسْتَعِيذُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ»(٢).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لام ئافرەتێکی جولەکەم لەلا بوو دەیوت: ئێوە لە ناو گۆڕدا تووشی بەڵاو تاقیکردنەوە دەبن، پێغەمبەر ڕاچەڵەکی و فەرمووی: بەڵکو جولەکە تووشی بەڵاو فیتنە دەبێت، (ڕاوی دەڵێ) عائیشە وتی: چەند شەوێک ماینەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وەحیم بۆ هات ئێوە تووشی بەڵاو تاقیکردنەوە دەبن لە ناو گۆڕەکانتان، عائیشە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو لە دوای ئەوە پەنای دەگرت لە سزای ناو گۆڕ.**

**٢٠٦٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَسْتَعِيذُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ، وَقَالَ: إِنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي قُبُورِكُمْ»(٣).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٩٠، وأبو داود: ٩٨٤ و ١٥٤٢، والترمذي: ٣٤٩٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٤٩ بنحوه، ومسلم: ٥٨٤.

(٣) صحيح.




**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پەنای دەگرت لە سزای ناو گۆڕ، وە لە فیتنەی دەجال، وە فەرمووی: بەڕاستی ئێوە تووشی بەڵاو تاقیکردنەوە دەبن لە ناو گۆڕەکانتان.**

**٢٠٦٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، دَخَلَتْ يَهُودِيَّةٌ عَلَيْهَا فَاسْتَوْهَبَتْهَا شَيْئاً، فَوَهَبَتْ لَهَا عَائِشَةُ، فَقَالَتْ: أَجَارَكِ اللَّهُ مِنْ عذَابِ الْقَبْرِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَوَقَعَ فِي نَفْسِي مِنْ ذَلِكَ، حَتَّى جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: إِنَّهُمْ لَيُعَذَّبُونَ فِي قُبُورِهِمْ عَذَاباً تَسْمَعُهُ الْبَهَائِمُ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئافرەتێکی جولەکە هاتە ژوورەوە بۆ لای، شتێکی بە دیاری پێیدا، عائیشەش دیاریەکی پێیدا، ئافرەتەکە وتی: خوا بتپارێزێ لە سزای ناو گۆڕ، عائیشە وتی: شتێک لە دەروونمدا لەوبارەوە دروست بوو، تا پێغەمبەری خوا ﷺ هات، ئینجا ئەوەم بۆی باس کرد فەرمووی: بەڕاستی ئەوانە سزا دەدرێن لە گۆڕەکانیان سزایەک ئاژەڵەکان دەیبیستن.**

**٢٠٦٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: دَخَلَتْ عَلَيَّ عَجُوزَتَانِ مِنْ عُجُزِ يَهُودِ الْمَدِينَةِ، فَقَالَتَا: إِنَّ أَهْلَ الْقُبُورِ يُعَذَّبُونَ فِي قُبُورِهِمْ، فَكَذَّبْتُهُمَا وَلَمْ أُنْعِمْ أَنْ أُصَدِّقَهُمَا، فَخَرَجَتَا وَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ عَجُوزَتَيْنِ مِنْ عُجُزِ يَهُودِ الْمَدِينَةِ قَالَتَا: إِنَّ أَهْلَ الْقُبُورِ يُعَذَّبُونَ فِي قُبُورِهِمْ، قَالَ: صَدَقَتَا إِنَّهُمْ يُعَذَّبُونَ عَذَاباً تَسْمَعُهُ الْبَهَائِمُ كُلُّهَا، فَمَا رَأَيْتُهُ صَلَّى صَلَاةً إِلَّا تَعَوَّذَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: دوو پیرەژن لە پیرەژنەکانی جولەکەی مەدینە هاتن بۆ لام، وتیان: بەڕاستی ئەوانەی لە گۆڕستانن سزا دەدرێن لە ناو گۆڕەکانیان، بە درۆیانم داناو نەمتوانی بڕوایان پێبکەم، ئەوان ڕۆیشتن پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لام، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، دوو پیرەژن لە پیرەژنەکانی مەدینە وتیان: ئەوانەی لە گۆڕستانن سزا دەدرێن لە ناو گۆڕەکانیان، فەرمووی: ڕاستیان کرد ئەوانە بە جۆرێک سزا دەدرێن تەنانەت هەموو ئاژەڵەکانیش دەیبیستن، عائیشە دەڵێ: پاشان نەمبینی نوێژێک بکات ئیللا پەنای دەگرت بە سزای ناو گۆڕ.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٧٢ و ٦٣٦٦، ومسلم: ٥٨٦.




## دانانی لقی دارخورما لەسەر گۆڕ

**٢٠٦٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِحَائِطٍ مِنْ حِيطَانِ مَكَّةَ أَوِ الْمَدِينَةِ سَمِعَ صَوْتَ إِنْسَانَيْنِ يُعَذَّبَانِ فِي قُبُورِهِمَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يُعَذَّبَانِ وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، ثُمَّ قَالَ: بَلَى، كَانَ أَحَدُهُمَا لَا يَسْتَبْرِئُ مِنْ بَوْلِهِ، وَكَانَ الْآخَرُ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ، ثُمَّ دَعَا بِجَرِيدَةٍ فَكَسَرَهَا كِسْرَتَيْنِ، فَوَضَعَ عَلَى كُلِّ قَبْرٍ مِنْهُمَا كِسْرَةً، فَقِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لِمَ فَعَلْتَ هَذَا؟ قَالَ: لَعَلَّهُ أَنْ يُخَفَّفَ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا أَوْ إِلَى أَنْ يَيْبَسَا»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بە لای باخێک لە باخەکانی مەککە یان مەدینە، گوێی لە دەنگی دوو کەس بوو سزا دەدران لە گۆڕەکەیان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو دووانە سزا دەدرێن لەبەر گوناهی گەورە سزا نادرێن (واتە: گوناهەکان لای ئێوە گەورە نین)، پاشان فەرمووی: با، (واتە: بەڵام لە حەقیقەتدا گوناهەکان گەورەن)، چونکە یەکەمیان خۆی پاک نەکردەوە لە میزەکەی، وە دووەمیشیان لە ناو خەڵکیدا قسەی دەهێناو قسەی دەبرد، پاشان لقێکی تەڕی دارخورمای هەڵگرت و کردی بە دوو لەتەوە لەسەر هەر قەبرێکیان دانەیەکی چەقاند، پێی وترا: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی ئەمەت کرد؟ فەرمووی: بەڵکو سزایان لەسەر سووک ببێت تا ئەو کاتەی وشک نەبوونەتەوە.**

**٢٠٦٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِقَبْرَيْنِ فَقَالَ: إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لَا يَسْتَبْرِئُ مِنْ بَوْلِهِ، وَأَمَّا الْآخَرُ فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ، ثُمَّ أَخَذَ جَرِيدَةً رَطْبَةً فَشَقَّهَا نِصْفَيْنِ، ثُمَّ غَرَزَ فِي كُلِّ قَبْرٍ وَاحِدَةً، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لِمَ صَنَعْتَ هَذَا؟ فَقَالَ: لَعَلَّهُمَا أَنْ يُخَفَّفَ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بەلای دوو گۆڕدا فەرمووی: ئەو دووانە سزا دەدرێن لەبەر گوناهی گەورە سزا نادرێن (واتە: خەڵک پێیان وایە گوناهەکان گەورە نین) یەکەمیان خۆی پاک نەدەکردەوە**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**لە میزەکەی، وە دووەمیشیان لە ناو خەڵکیدا قسەی دەهێناو قسەی دەبرد، پاشان لقێکی تەڕی دارخورمای هەڵگرت و کردی بە دوو لەتەوە لەسەر هەر قەبرێکیان دانەیەکی چەقاند، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی ئەمەت کرد؟ فەرمووی: بەڵکو سزایان لەسەر سووک ببێت تا ئەوکاتەی وشک نەبوونەتەوە.**

**٢٠٧٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: أَلَا إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا مَاتَ عُرِضَ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ، إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَمِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ، حَتَّى يَبْعَثَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئەگەر یەکێک لە ئێوە مرد بەیانیان و ئێواران جێگاکەی پێ نیشان دەدرێ، ئەگەر لە ئەهلی بەهەشت بێت ئەوە شوێنەکەی لە بەهەشت نیشان دەدرێت، وە ئەگەر لە ئەهلی دۆزەخ بێت ئەوە شوێنەکەی نیشان دەدرێت لە دۆزەخ، تا خوا ﷻ لە ڕۆژی قیامەتدا زیندووی دەکاتەوە.**

**٢٠٧١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: يُعْرَضُ عَلَى أَحَدِكُمْ إِذَا مَاتَ مَقْعَدُهُ مِنَ الْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ، فَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ، قِيلَ: هَذَا مَقْعَدُكَ حَتَّى يَبْعَثَكَ اللَّهُ ﷻ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئەگەر یەکێک لە ئێوە مرد بەیانیان و ئێواران جێگاکەی پێ نیشان دەدرێ، ئەگەر لە ئەهلی بەهەشت بێت ئەوە شوێنەکەی لە بەهەشت نیشان دەدرێت، وە ئەگەر لە ئەهلی دۆزەخ بێت ئەوە شوێنەکەی لە دۆزەخ نیشان دەدرێت، تا خوا ﷻ لە ڕۆژی قیامەتدا زیندووی دەکاتەوە.**

**٢٠٧٢-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا مَاتَ أَحَدُكُمْ عُرِضَ عَلَى مَقْعَدِهِ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ، إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَمِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَيُقَالُ: هَذَا مَقْعَدُكَ حَتَّى يَبْعَثَكَ اللَّهُ ﷻ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٧٩ و ٣٢٤٠ و ٦٥١٥، ومسلم: ٢٨٦٦/٦٥، والترمذي: ١٠٧٢، وإبن ماجه: ٤٢٧٠.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە مرد جێگاکەی نیشان دەدرێ بە بەیانیان و ئێواران، ئەگەر لە ئەهلی بەهەشت بێت ئەوە شوێنەکەی لە بەهەشت نیشان دەدرێت، وە ئەگەر لە ئەهلی دۆزەخ بێت ئەوە شوێنەکەی لە دۆزەخ نیشان دەدرێت. پێی دەوترێ: ئەمە جێگاکەتە تا خوا ﷻ لە ڕۆژی قیامەتدا زیندووی دەکاتەوە.

## ڕووحی بڕواداران

**٢٠٧٣-** «عَنْ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّمَا نَسَمَةُ الْمُؤْمِنِ طَائِرٌ فِي شَجَرِ الْجَنَّةِ حَتَّى يَبْعَثَهُ اللَّهُ ﷻ إِلَى جَسَدِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[١].

واتە: کەعبی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ڕووحی بڕوادار باڵندەیەکە لە ناو باخەکانی بەهەشت تا خوا لە ڕۆژی قیامەتدا دەینێرێتەوە بۆ ناو جەستەکەی.

**٢٠٧٤-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ عُمَرَ بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ أَخَذَ يُحَدِّثُنَا عَنْ أَهْلِ بَدْرٍ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَيُرِينَا مَصَارِعَهُمْ بِالْأَمْسِ، قَالَ: هَذَا مَصْرَعُ فُلَانٍ إِنْ شَاءَ اللَّهُ غَداً، قَالَ عُمَرُ: وَالَّذِي بَعَثَهُ بِالْحَقِّ مَا أَخْطَئُوا تِيكَ، فَجُعِلُوا فِي بِئْرٍ، فَأَتَاهُمُ النَّبِيُّ ﷺ فَنَادَى: يَا فُلَانُ بْنَ فُلَانٍ، يَا فُلَانُ بْنَ فُلَانٍ، هَلْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقّاً؟ فَإِنِّي وَجَدْتُ مَا وَعَدَنِي اللَّهُ حَقّاً، فَقَالَ: عُمَرُ: تُكَلِّمُ أَجْسَاداً لَا أَرْوَاحَ فِيهَا، فَقَالَ: مَا أَنْتُمْ بِأَسْمَعَ لِمَا أَقُولُ مِنْهُمْ»[٢].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ عومەر بووین لە نێوان مەککەو مەدینە باسی ئەهلی بەدری دەکرد، دەیوت: بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێک پێش ئەوە شوێنی کوشتنیانی پێ نیشان دەداین، فەرمووی: بە ویستی خوا بەیانی ئێرە شوێنی کوشتنی فڵانەکەس دەبێت، عومەر وتی: سوێند بەو خوایەی بە حەق ناردوویەتی هەڵەی تێدا نەبوو، هەموویان خرانە ناو بیرێکەوە، پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لایان، بانگی کرد: ئەی فڵانی کوڕی فڵان، ئەی فڵانی کوڕی فڵان، ئایا بینیتان ئەو بەڵێنە ڕاستەی خوا پێتانی دابوو؟ بەڕاستی من بەڵێنی ڕاستەقینەی خوام بینی کە پێیدابووم، عومەر:

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٦٤١، وإبن ماجه: ٤٢٧١.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٨٧٣.





**وتی: ئەمانە کۆمەڵە جەستەیەکن گیانیان تێدا نیە (چۆن دەبیستن)، فەرمووی: ئێوە لە ئەوان چاکتر نابیستن.**

**٢٠٧٥-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: سَمِعَ الْمُسْلِمُونَ مِنَ اللَّيْلِ بِبِئْرِ بَدْرٍ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَائِمٌ يُنَادِي: يَا أَبَا جَهْلِ بْنَ هِشَامٍ، وَيَا شَيْبَةُ بْنَ رَبِيعَةَ، وَيَا عُتْبَةُ بْنَ رَبِيعَةَ، وَيَا أُمَيَّةَ بْنَ خَلَفٍ، هَلْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقّاً؟ فَإِنِّي وَجَدْتُ مَا وَعَدَنِي رَبِّي حَقّاً، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَوَ تُنَادِي قَوْماً قَدْ جَيَّفُوا؟ فَقَالَ: مَا أَنْتُمْ بِأَسْمَعَ لِمَا أَقُولُ مِنْهُمْ، وَلَكِنَّهُمْ لَا يَسْتَطِيعُونَ أَنْ يُجِيبُوا»[١].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: مسوڵمانان لە شەودا گوێیان لە پێغەمبەر ﷺ بوو لەسەر بیری بەدر وەستابوو بانگی دەکرد: ئەی ئەبو جەهلی کوڕی هیشام، ئەی شەیبەی کوڕی ڕەبیعە، ئەی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە، ئەی ئومەیەی کوڕی خەڵەف، ئایا بینیتان ئەو بەڵێنە ڕاستەی خوا پێتانی دابوو؟ بەڕاستی من بەڵێنی ڕاستەقینەی خوام بینی کە پێیدابووم، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، قسە لەگەڵ خەڵکێکدا دەکەیت بۆگەن بوون؟ فەرمووی: ئێوە لە ئەوان چاکتر نابیستن، بەڵام ئەوان توانای وەڵامدانەوەیان نیە.**

**٢٠٧٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَقَفَ عَلَى قَلِيبِ بَدْرٍ، فَقَالَ: هَلْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقّاً؟، قَالَ: إِنَّهُمْ لَيَسْمَعُونَ الْآنَ مَا أَقُولُ لَهُمْ، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِعَائِشَةَ، فَقَالَتْ: وَهِلَ ابْنُ عُمَرَ، إِنَّمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّهُمُ الْآنَ يَعْلَمُونَ أَنَّ الَّذِي كُنْتُ أَقُولُ لَهُمْ هُوَ الْحَقُّ، ثُمَّ قَرَأَتْ قَوْلَهُ: ﴿إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ ۝٨٠﴾ النمل، حَتَّى قَرَأَتِ الْآيَةَ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لەسەر بیرە کۆنەکەی بەدر وەستا، فەرمووی: ئایا بینیتان ئەو بەڵێنە ڕاستەی خوا پێتانی دابوو؟ فەرمووی: ئەوان ئێستا وتەکانی من دەبیستن کە قسەیان بۆ دەکەم. ئەوە باس کرا بۆ عائیشە، وتی: ئیبنو عومەر هەڵەی کرد، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئەوان ئێستا دەزانن ئەوەی من پێیان دەڵێم تەنها ئەوە حەق و ڕاستە، پاشان ئەمەی خوێندەوە: ﴿إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ ۝٨٠﴾ واتە: بەڕاستی تۆ ناتوانی مردووەکان بیبیستێنی هەتا ئایەتەکەی تەواو کرد.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٧٧٩ و ٢٨٧٤، وأبو داود: ٢٦٨١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩٧٨ و ٣٩٨٠ و ٣٩٨١، ومسلم: ٩٣٢.

**٢٠٧٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كُلُّ بَنِي آدَمَ «وَفِي حَدِيثِ مُغِيرَةَ»: كُلُّ ابْنِ آدَمَ يَأْكُلُهُ التُّرَابُ إِلَّا عَجْبَ الذَّنَبِ مِنْهُ خُلِقَ، وَفِيهِ يُرَكَّبُ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو نەوەکانی ئادەم خۆڵ دەیخوات (دەرزێ و دەبێتە خۆڵ) جگە لە (عَجْبَ الذَّنَب) کلێنجە نەبێت لەو دروست کراوە، لەوەش دروست دەکرێتەوە جارێکی دیکە.**

**تێبینی: (عَجْبَ الذَّنَب): ئێسکێکە لە خوارەوەی پشتە بنچینەو بناغەی مرۆڤە، کۆتا ئێسکە لەوە دروست کراوەو دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی جارێکی تر ئادەمی لەسەر دروست بکرێتەوە.**

**٢٠٧٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ اللَّهُ ﷿: كَذَّبَنِي ابْنُ آدَمَ، وَلَمْ يَكُنْ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يُكَذِّبَنِي، وَشَتَمَنِي ابْنُ آدَمَ، وَلَمْ يَكُنْ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَشْتُمَنِي، أَمَّا تَكْذِيبُهُ إِيَّايَ، فَقَوْلُهُ: إِنِّي لَا أُعِيدُهُ كَمَا بَدَأْتُهُ، وَلَيْسَ آخِرُ الْخَلْقِ بِأَعَزَّ عَلَيَّ مِنْ أَوَّلِهِ، وَأَمَّا شَتْمُهُ إِيَّايَ، فَقَوْلُهُ: اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَداً وَأَنَا اللَّهُ الْأَحَدُ الصَّمَدُ، لَمْ أَلِدْ وَلَمْ أُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لِي كُفُواً أَحَدٌ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا ﷻ دەفەرموێ: نەوەی ئادەم بڕوای پێنەکردم بۆ ئەو نیە بڕوام پێنەکات، وە نەوەی ئادەم جنێوی پێدام، بۆ ئەو نیە جنێو بە من بدات، جا بڕوانەبوونی بە من لە لایەن ئەوەوە ئەوەیە کە وتوویەتی: گوایە من جارێکی تر زیندووی ناکەمەوە وەکو چۆن هێنامە بوون، بێگومان کۆتای دروستکراوەکان گران تر نیە لەلام لە یەکەمینیان، بەڵام جنێودانی پێم ئەوەیە کە وتوویەتی: خوا منداڵی بۆ خۆی داناوە، بێگومان من خوای تاک و تەنهای بێنیازم، کەسم لێ نەبووە لە کەسیش نەبووم، هەرگیز هیچ کەس هاوشێوەو هاوتام نیە.**

**٢٠٧٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: أَسْرَفَ عَبْدٌ عَلَى نَفْسِهِ حَتَّى حَضَرَتْهُ الْوَفَاةُ، قَالَ لِأَهْلِهِ: إِذَا أَنَا مُتُّ فَأَحْرِقُونِي، ثُمَّ اسْحَقُونِي، ثُمَّ اذْرُونِي فِي الرِّيحِ فِي الْبَحْرِ، فَوَاللَّهِ لَئِنْ قَدَرَ اللَّهُ عَلَيَّ لَيُعَذِّبَنِّي عَذَاباً لَا يُعَذِّبُهُ أَحَداً مِنْ خَلْقِهِ، قَالَ: فَفَعَلَ أَهْلُهُ ذَلِكَ، قَالَ اللَّهُ ﷿ لِكُلِّ شَيْءٍ أَخَذَ مِنْهُ شَيْئاً: أَدِّ مَا أَخَذْتَ، فَإِذَا هُوَ قَائِمٌ، قَالَ اللَّهُ ﷿: مَا حَمَلَكَ عَلَى مَا صَنَعْتَ؟ قَالَ: خَشْيَتُكَ، فَغَفَرَ اللَّهُ لَهُ»[٣].

---

**(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٨١٤ و ٤٩٣٥، ومسلم: ٤١ و ٢٩٥٥/١٤٣، وأبو داود: ٤٧٤٣، وابن ماجه: ٤٢٦٦.**

**(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٩٣ و ٤٩٧٤ و ٤٩٧٥.**

**(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤٨١ و ٧٥٠٦، ومسلم: ٢٧٥٦، وأبو داود: ٤٢٥٥.**





واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەندەیەک زیادەڕەوی لە نەفسی خۆی کرد تا کاتی مردنی هات، بە خانەوادەکەی وت: ئەگەر مردم بمسوتێنن، پاشان ورد وردم بکەن، پاشان لەسەر دەریایەک بمدەن بە دەم باوە، سوێند بە خوا ئەگەر خوا دەسەڵاتی هەبێت بەسەرمدا سزام دەدات بە سزادانێک پێشتر هیچ کەسی لە دروستکراوەکانی سزا نەدابێت (دیارە گوناهی زۆر ئەنجام داوە)، دەڵێ: خانەوانەکەی وسیەتەکەیان بەجێهێنا، خوا ﷻ فەرمووی: لە هەر شتێک شتێکی لێوەردەگیرێ: ئەوەی وەرت گرتووە بیدەرەوە، خوا ﷻ فەرمووی: چی وای لێکردی لەسەر ئەوەی کردت؟ وتی: ترسام لێت، خوا لێی خۆش بوو.

**٢٠٨٠-** «عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِمَّنْ كان قَبْلَكُمْ يُسِيءُ الظَّنَ بِعَمَلِهِ فَلَمَّا حَضَرَتْهُ الْوَفَاةُ قال لِأَهْلِهِ إِذَا أَنَا مُتُّ فَأَحْرِقُونِي، ثُمَّ اطْحَنُونِي، ثُمَّ اذْرُونِي في الْبَحْرِ فَإِنَّ اللَّهَ إن يَقْدِرْ على لم يَغْفِرْ لي قَالَ: فَأَمَرَ الله ﷻ الْمَلَائِكَةَ فَتَلَقَّتْ رُوحَهُ قَالَ لَهُ مَا حَمَلَكَ عَلَى مَا فَعَلْتَ قَالَ: يَا رَبِّ ما فَعَلْتُ إلاَّ مَنْ مَخَافَتِكَ فَغَفَرَ الله له»[١].

واتە: حوزەیفە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پیاوێک لە پێش ئێوە گومانی خراپی بە کردەوەکانی دەبرد کاتێ سەرەمەرگی هات بە خانەوادەکەی وت: ئەگەر مردم بمسوتێنن، پاشان ورد وردم بکەن، پاشان فرێم بدەنە نێو دەریاوە، چونکە خوا ئەگەر دەسەڵاتی هەبێت بەسەرمدا هەرگیز لێم خۆش نابێت، دەڵێ: خوا ﷻ فەرمانی کرد بە فریشتەکان ڕووح کرا بە بەریدا، پێی فەرموو: چ شتێک وای لێ کردی لەسەر ئەو کارەی کردت؟ (پیاوەکە) وتی: ئەی پەروەردگارم من تەنها ئەوەم لە ترسی تۆ کردوە، ئینجا خوا لێی خۆش بوو.

## زیندوو کردنەوە

**٢٠٨١-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: إِنَّكُمْ مُلَاقُو اللَّهَ ﷻ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤٥٢ و ٣٤٧٩ و ٦٤٨٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٤٩ و ٣٤٤٧ و ٤٦٢٦ و ٦٥٢٤ و ٦٥٢٥ و ٦٥٢٦، ومسلم: ٥٧ و ٥٨/٢٨٦٠، والترمذي: ٢٤٢٣ و ٣١٦٧.

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو وتاری دەدا لەسەر مینبەرو دەیفەرموو: ئێوە دەگەن بە خوا ﷻ بۆ لێپرسینەوەو پاداشتدانەوە بە پێ پەتی و ڕووت و قووتی و خەتەنە نەکراوی.**

**٢٠٨٢-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عُرَاةً غُرْلاً، وَأَوَّلُ الْخَلاَئِقِ يُكْسَى إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ﴿١٠٤﴾ ﴾الأنبياء»[1].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خەڵکی کۆدەکرێتەوە لە ڕۆژی دواییدا بە ڕووت و قووتی و خەتەنە نەکراوی، یەکەمین کەس لە نێو دروستکراوەکان پۆشاکی لەبەر دەکرێ ئیبراهیمە سەلامی خوای لەسەر بێت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ﴿١٠٤﴾ ﴾، (واتە: وەکو چۆن یەکەم جار دروستمان کرد بە ڕووت و قووتی).**

**٢٠٨٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: يُبْعَثُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: فَكَيْفَ بِالْعَوْرَاتِ؟ قَالَ: ﴿لِكُلِّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ﴿٣٧﴾ ﴾عبس»[2].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵکی زیندوو دەکرێنەوە لە ڕۆژی دواییدا بە پێ پەتی و ڕووت و قووتی و خەتەنە نەکراوی. عائیشە وتی: ئەی عەورەتەکان چی؟ فەرمووی: ﴿لِكُلِّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ﴿٣٧﴾ ﴾، (واتە: هەر یەکێک لە ئەوان لەو ڕۆژەدا کارێکی وای هەیە کە نایپرژێتە سەر کەسی دیکە).**

**٢٠٨٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّكُمْ تُحْشَرُونَ حُفَاةً عُرَاةً، قُلْتُ: الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ؟ قَالَ: إِنَّ الأَمْرَ أَشَدُّ مِنْ أَنْ يُهِمَّهُمْ ذَلِكَ»[3].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئێوە کۆدەکرێنەوە لە ڕۆژی دواییدا بە پێ پەتی و ڕووت و قوتی، وتم:**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥٢٧، ومسلم: ٢٨٥٩، وإبن ماجه: ٤٢٧٦.

پیاوو ژن هەندێکیان تەماشای هەندێکی دیکە دەکات؟ فەرمووی: کارەکە لەوە سەختترە بیانپرژێتە سەر ئەوە.

**٢٠٨٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى ثَلَاثِ طَرَائِقَ: رَاغِبِينَ رَاهِبِينَ، اثْنَانِ عَلَى بَعِيرٍ، وَثَلَاثَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَأَرْبَعَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَعَشَرَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَتَحْشُرُ بَقِيَّتَهُمُ النَّارُ تَقِيلُ مَعَهُمْ حَيْثُ قَالُوا، وَتَبِيتُ مَعَهُمْ حَيْثُ بَاتُوا، وَتُصْبِحُ مَعَهُمْ حَيْثُ أَصْبَحُوا، وَتُمْسِي مَعَهُمْ حَيْثُ أَمْسَوْا»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵکی کۆدەکرێتەوە لە ڕۆژی دواییدا (زۆربەی زانایان پێیان وایە ئەم کۆکردنەوەیە لە دنیادایە لە کۆتایی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەمەش گونجاوترە) لەسەر سێ شێوازو کۆمەڵە، هەم تەماحیان هەیەو هەم دەترسن، دوو کەس لەسەر وشترێکن، سیان لەسەر وشترێکن، چوار لەسەر وشترێکن، دە کەس لەسەر وشترێکن، ئاگر کۆیان دەکاتەوە، لە کوێ سەرخەو بشکێنن لەگەڵیانە، لەگەڵیان شەو دەکاتەوە لە هەرکوێ شەو بکەنەوە، وە بەیانی دەکاتەوە لە هەر کوێ بەیانی بکەنەوە، وە ئێوارە دەکاتەوە لەگەڵیان لە هەر کوێ ئێوارە بکەنەوە.**

**٢٠٨٦-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: إِنَّ الصَّادِقَ الْمَصْدُوقَ ﷺ حَدَّثَنِي: أَنَّ النَّاسَ يُحْشَرُونَ ثَلَاثَةَ أَفْوَاجٍ: فَوْجٌ رَاكِبِينَ طَاعِمِينَ كَاسِينَ، وَفَوْجٌ تَسْحَبُهُمُ الْمَلَائِكَةُ عَلَى وُجُوهِهِمْ وَتَحْشُرُهُمُ النَّارُ، وَفَوْجٌ يَمْشُونَ وَيَسْعَوْنَ يُلْقِي اللَّهُ الْآفَةَ عَلَى الظَّهْرِ فَلَا يَبْقَى، حَتَّى إِنَّ الرَّجُلَ لَتَكُونُ لَهُ الْحَدِيقَةُ يُعْطِيهَا بِذَاتِ الْقَتَبِ لَا يَقْدِرُ عَلَيْهَا»[2].

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: بەڕاستی ڕاستگۆو بەڕاست دانراو ﷺ بۆی باس کردم: خەڵکی کۆدەکرێنەوە بە سێ پێڕ: پێڕێکیان کۆدەکرێنەوە ئەوانیش (بڕوادارە پێشینەکانن کە بڕوایان دەمەزراوە) سەرجەم پێویستیەکانی گەشتیان پێیەو دڵخۆش و پۆشتەن، پێڕێکی تریان (بێبڕواکانن) فریشتە لەسەر ڕووخساریان ڕایاندەکێشێ و کۆیان دەکاتەوە بۆ نێو ئاگر، کۆمەڵ و پێڕێکی تریان (بڕوادارە تاوانبارەکانن هەر لە دنیا) ڕێدەکەن و تێدەکۆشن، خوا دەردو بەڵایەک تووشی ئاژەڵەکانیان دەکات**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥٢٢، ومسلم: ٢٨٦١، والترمذي: ٣١٤٢.

(٢) ضعيف.

پیاوو ژن هەندێکیان تەماشای هەندێکی دیکە دەکات؟ فەرمووی: کارەکە لەوە سەختترە بیانپرژێتە سەر ئەوە.

**٢٠٨٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى ثَلَاثِ طَرَائِقَ: رَاغِبِينَ رَاهِبِينَ، اثْنَانِ عَلَى بَعِيرٍ، وَثَلَاثَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَأَرْبَعَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَعَشَرَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَتَحْشُرُ بَقِيَّتَهُمُ النَّارُ تَقِيلُ مَعَهُمْ حَيْثُ قَالُوا، وَتَبِيتُ مَعَهُمْ حَيْثُ بَاتُوا، وَتُصْبِحُ مَعَهُمْ حَيْثُ أَصْبَحُوا، وَتُمْسِي مَعَهُمْ حَيْثُ أَمْسَوْا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵکی کۆدەکرێتەوە لە ڕۆژی دواییدا (زۆربەی زانایان پێیان وایە ئەم کۆکردنەوەیە لە دنیادایە لە کۆتایی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەمەش گونجاوترە) لەسەر سێ شێوە کۆمەڵە، هەم تەماحیان هەیەو هەم دەترسن، دوو کەس لەسەر وشترێکن، سێ لەسەر وشترێکن، چوار لەسەر وشترێکن، دە کەس لەسەر وشترێکن، ئاگر کۆیان دەکاتەوە، لە کوێ سەرخەو بشکێنن لەگەڵیانە، لەگەڵیان شەو دەکاتەوە لە هەرکوێ شەو بکەنەوە، وە بەیانی دەکاتەوە لە هەر کوێ بەیانی بکەنەوە، وە ئێوارە دەکاتەوە لەگەڵیان لە هەر کوێ ئێوارە بکەنەوە.

**٢٠٨٦-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: إِنَّ الصَّادِقَ الْمَصْدُوقَ ﷺ حَدَّثَنِي: أَنَّ النَّاسَ يُحْشَرُونَ ثَلَاثَةَ أَفْوَاجٍ: فَوْجٌ رَاكِبِينَ طَاعِمِينَ كَاسِينَ، وَفَوْجٌ تَسْحَبُهُمُ الْمَلَائِكَةُ عَلَى وُجُوهِهِمْ وَتَحْشُرُهُمُ النَّارُ، وَفَوْجٌ يَمْشُونَ وَيَسْعَوْنَ يُلْقِي اللَّهُ الْآفَةَ عَلَى الظَّهْرِ فَلَا يَبْقَى، حَتَّى إِنَّ الرَّجُلَ لَتَكُونُ لَهُ الْحَدِيقَةُ يُعْطِيهَا بِذَاتِ الْقَتَبِ لَا يَقْدِرُ عَلَيْهَا»[٢].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: بەڕاستی ڕاستگۆو بەڕاست دانراو ﷺ بۆی باسی کردم: خەڵکی کۆدەکرێنەوە بە سێ پێڕ: پێڕێکیان کۆدەکرێنەوە ئەوانیش (بڕوادارە پێشینەکانن کە بڕوایان دەمەزراوە) سەرجەم پێویستیەکانی گەشتیان پێیەو دڵخۆشن و پۆشتەن، پێڕێکی تریان (بێبڕواکانن) فریشتە لەسەر ڕووخساریان ڕایاندەکێشن و کۆیان دەکاتەوە بۆ نێو ئاگر، کۆمەڵ و پێڕێکی تریان (بڕوادارە تاوانبارەکانن هەر لە دنیا) ڕێدەکەن و تێدەکۆشن، خوا دەردو بەڵایەک تووشی ئاژەڵەکانیان دەکات

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥٢٢، ومسلم: ٢٨٦١، والترمذي: ٣١٤٢.

(٢) ضعيف.

هیچیان نامێنن، تەنانەت کەسێک باخێکی هەیە دەیدات لە بری وشترێک هیچ کەسێک لەگەڵی نایگۆڕێتەوە.

## باسی یەکەمین کەس کە پۆشاکی لەبەر دەکرێ لە ڕۆژی دوایی دا

**٢٠٨٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْمَوْعِظَةِ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّكُمْ مَحْشُورُونَ إِلَى اللَّهِ ﷻ عُرَاةً، قَالَ أَبُو دَاوُدَ: حُفَاةً غُرْلاً، وَقَالَ وَكِيعٌ وَوَهْبٌ: عُرَاةً غُرْلاً: ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ﴿١٠٤﴾﴾الأنبياء، قَالَ: أَوَّلُ مَنْ يُكْسَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلَامُ، وَإِنَّهُ سَيُؤْتَى، «قَالَ أَبُو دَاوُدَ: يُجَاءُ، وَقَالَ وَهْبٌ وَوَكِيعٌ» سَيُؤْتَى بِرِجَالٍ مِنْ أُمَّتِي فَيُؤْخَذُ بِهِمْ ذَاتَ الشِّمَالِ، فَأَقُولُ: رَبِّ أَصْحَابِي، فَيُقَالُ: إِنَّكَ لَا تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ، فَأَقُولُ كَمَا قَالَ الْعَبْدُ الصَّالِحُ: ﴿وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي ﴿١١٧﴾﴾المائدة، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ ﴿١١٨﴾﴾المائدة، فَيُقَالُ: إِنَّ هَؤُلَاءِ لَمْ يَزَالُوا مُدْبِرِينَ «قَالَ أَبُو دَاوُدَ: مُرْتَدِّينَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ مُنْذُ فَارَقْتَهُمْ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵساو دەستی بە ئامۆژگاری کردن کرد، فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئێوە کۆدەکرێنەوە بۆ لای خوا ﷻ بە ڕووتی، ئەبو داوود (کە یەکێکە لە گێڕەرەوانی ئەم فەرموودە) وتی: بە پێ پەتی و خەتەنە نەکراوی. وەکیع و وەهب (کە یەکێکن لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودە)، وتیان: بە ڕووتی و خەتەنە نەکراوی: ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ﴿١٠٤﴾﴾، (واتە: وەکو چۆن یەکەم جار دروستمان کرد دووبارە دروستی دەکەینەوە)، فەرمووی: یەکەم کەس پۆشاکی لەبەر دەکرێ لە ڕۆژی دوایی ئیبراهیمە، وە بێگومان دەهێنرێ، «ئەبو داود (بە وشەیەکی تر) دەڵێ: (دەهێنرێ)، وەهەب و وەکیع وتیان»: (فەرموویەتی): کۆمەڵە پیاوێک لە ئوممەتەکەم دەهێنرێن بەرەو ئاگر دەبرێن، دەڵێم: پەروەردگارم ئەوانە هاوەڵی من بوون، دەوترێ: تۆ نازانی دوای تۆ چیان کرد، منیش دەڵێم هەروەکو چۆن بەندەی چاک وتی: ﴿وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي ﴿١١٧﴾﴾، (واتە: من شایەتم لەسەریان ئەو ماوەی لەگەڵیان ژیام کاتی منت مراند. تا فەرمایشتی: ﴿وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ ﴿١١٨﴾﴾، ئینجا دەوترێ: بە ڕاستی ئەمانە بەردەوام

(١) صحيح.




پشتیان کردبوو لە ئاین، ئەبو داود وتوویەتی: (ئەوانە کەسانێکن) هەڵگەڕاونەتەوە لە ئاینەکەیان لەوکاتەی بەجێت هێشتن.

## دەربارەی پرسە و تەعزێ

**٢٠٨٨-** «عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنَ قُرَّةَ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ إِذَا جَلَسَ يَجْلِسُ إِلَيْهِ نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِهِ، وَفِيهِمْ رَجُلٌ لَهُ ابْنٌ صَغِيرٌ يَأْتِيهِ مِنْ خَلْفِ ظَهْرِهِ، فَيُقْعِدُهُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَهَلَكَ فَامْتَنَعَ الرَّجُلُ أَنْ يَحْضُرَ الْحَلْقَةَ لِذِكْرِ ابْنِهِ، فَحَزِنَ عَلَيْهِ، فَفَقَدَهُ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: مَالِي لَا أَرَى فُلَاناً؟ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بُنَيُّهُ الَّذِي رَأَيْتَهُ هَلَكَ، فَلَقِيَهُ النَّبِيُّ ﷺ فَسَأَلَهُ عَنْ بُنَيِّهِ، فَأَخْبَرَهُ أَنَّهُ هَلَكَ، فَعَزَّاهُ عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: يَا فُلَانُ، أَيُّمَا كَانَ أَحَبُّ إِلَيْكَ أَنْ تَمَتَّعَ بِهِ عُمُرَكَ، أَوْ لَا تَأْتِي غَداً إِلَى بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ إِلَّا وَجَدْتَهُ قَدْ سَبَقَكَ إِلَيْهِ يَفْتَحُهُ لَكَ، قَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، بَلْ يَسْبِقُنِي إِلَى بَابِ الْجَنَّةِ فَيَفْتَحُهَا لِي لَهُوَ أَحَبُّ إِلَيَّ، قَالَ: فَذَاكَ لَكَ»[١].

واتە: موعاویەی کوڕی قوڕڕە، لە باوکیەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دابنیشتایە کۆمەڵێک لە هاوەڵەکانی دادەنیشتن لەلای، پیاوێکیان تێدا بوو منداڵێکی بچووکی لەگەڵدا بوو دەچووە پێشەوەو لە بەردەمی خۆی دایدەنیشاند، منداڵەکە مرد پیاوەکەش ئەو ئەڵقەیەی چۆڵ کرد لەبەر ئەوەی کوڕەکەی نەکەوێتەوە یاد، زۆر بێتاقەت بوو بۆی، پێغەمبەر ﷺ ئیتر نەیبینیەوە فەرمووی: ئەوە چیە فڵانەکەس نابینم؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو منداڵەی کە تۆ بینیت مرد، پێغەمبەر ﷺ دواتر گەیشت بەو پیاوە پرسیاری منداڵەکەی لێکرد، ئەویش هەواڵی مردنی پێدا، پێغەمبەر سەرەخۆشی لێکردو پاشان فەرمووی: ئەی فڵانە کەس، کامەیان لە لات خۆشەویسترە لە تەمەنتدا چێژی لێ وەربگری، ئایا ناتەوێ سبەینێ بچی بۆ لای دەرگایەک لە دەرگاکانی بەهەشت ببینی پێشت کەوتووە دەرگاکەت بۆ دەکاتەوە. وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بێگومان حەز دەکەم پێشم بکەوێت لە بەهەشتدا دەرگاکەم بۆ بکاتەوە، ئەوە لە لام خۆشەویسترە، فەرمووی: ئەوە بۆ تۆیە.

---

(١) صحيح.




## جۆرێکی تر (لە پرسە و تەعزیە)

**٢٠٨٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أُرْسِلَ مَلَكُ الْمَوْتِ إِلَى مُوسَى ؑ، فَلَمَّا جَاءَهُ صَكَّهُ، فَفَقَأَ عَيْنَهُ، فَرَجَعَ إِلَى رَبِّهِ، فَقَالَ: أَرْسَلْتَنِي إِلَى عَبْدٍ لَا يُرِيدُ الْمَوْتَ، فَرَدَّ اللَّهُ ﷻ إِلَيْهِ عَيْنَهُ، وَقَالَ: ارْجِعْ إِلَيْهِ، فَقُلْ لَهُ يَضَعُ يَدَهُ عَلَى مَتْنِ ثَوْرٍ، فَلَهُ بِكُلِّ مَا غَطَّتْ يَدُهُ بِكُلِّ شَعْرَةٍ سَنَةٌ، قَالَ: أَيْ رَبِّ، ثُمَّ مَهْ؟ قَالَ: الْمَوْتُ، قَالَ: فَالْآنَ، فَسَأَلَ اللَّهَ ﷻ أَنْ يُدْنِيَهُ مِنَ الْأَرْضِ الْمُقَدَّسَةِ رَمْيَةً بِحَجَرٍ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَلَوْ كُنْتُ ثَمَّ، لَأَرَيْتُكُمْ قَبْرَهُ إِلَى جَانِبِ الطَّرِيقِ تَحْتَ الْكَثِيبِ الْأَحْمَرِ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: فریشتەی گیان کێشان نێردرا بۆ لای مووسا ؑ، کاتێ هات بۆ لای زللەیەکی لێدا، چاوی کوێر کرد، ئەویش گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری، وتی: منت ناردوە بۆ لای بەندەیەک مردنی ناوێت، خوا ﷻ چاوی بۆ گەڕاندەوە، پێی فەرموو: بگەڕێرەوە بۆ لای، پێی بڵێ: با دەستی لە سەر پشتی گایەک دابنێت، چەندە تاڵە موو لە ژێر دەستیدا بوو بەگوێرەی هەر تاڵە موویەک ساڵێک بژی، وتی: ئەی پەروەردگارم، پاشان چی دەبێ؟ فەرمووی: مردن، وتی: دەی ئێستاکە با بمرم، داوای لە خوا کرد نزیکی بکاتەوە لە زەوی پیرۆز (بيت المقدس) بە ئەندازەی نزیکی هاوێشتنی بەردێک، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر لەوێ بومایە، گۆڕەکەیم نیشان دەدان کە لە تەنیشتی ڕێگاکەیە لە ژێر تەپۆڵکەی لە سورەکە.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٣٩، ومسلم: ٢٣٧٢.

## بابەت: پێویست بوون (یان واجب) بوونی ڕۆژوو

**٢٠٩٠-** «عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ أَعْرَابِيًّا جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثَائِرَ الرَّأْسِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَخْبِرْنِي مَاذَا فَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنَ الصَّلَاةِ؟ قَالَ: الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ شَيْئًا، قَالَ: أَخْبِرْنِي بِمَا افْتَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنَ الصِّيَامِ؟ قَالَ: صِيَامُ شَهْرِ رَمَضَانَ إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ شَيْئًا، قَالَ: أَخْبِرْنِي بِمَا افْتَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنَ الزَّكَاةِ؟ فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِشَرَائِعِ الْإِسْلَامِ، فَقَالَ: وَالَّذِي أَكْرَمَكَ، لَا أَتَطَوَّعُ شَيْئًا لَا أَنْقُصُ مِمَّا فَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ شَيْئًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ أَوْ دَخَلَ الْجَنَّةَ إِنْ صَدَقَ»[1].

**واتە: طەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا ﷺ دەڵێ: پیاوێکی دەشتەکی هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ قژی برژو ئاڵۆز بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، خوا چی فەڕز کردوە لە سەرم لە نوێژ؟ فەرمووی: پێنج نوێژی فەرز کردوە مەگەر نوێژی زیادە بکەی، وتی: هەواڵم بدەرێ خوا چی لە ڕۆژوو فەرز کردوە لە سەرم؟ فەرمووی: ڕۆژوو گرتنی مانگی ڕەمەزان مەگەر ڕۆژووی زیادە بگریت، وتی: هەواڵم بدەرێ خوا چی لە زەکات فەرز کردوە لە سەرم؟ هەواڵی پێدا بەوەی شەریعەتی ئیسلام فەرزی کردوە، وتی: سوێند بەو خوایەی بەڕێزی کردووی لەوە زیاتر دەکەم و نە لەوە کەمتر دەکەم کە خوا فەرزی کردوە لە سەرم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سەرفراز بوو ئەگەر ڕاست بکات، یان چووە بەهەشتەوە ئەگەر ڕاست بکات.**

**٢٠٩١-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: نُهِينَا فِي الْقُرْآنِ أَنْ نَسْأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ شَيْءٍ، فَكَانَ يُعْجِبُنَا أَنْ يَجِيءَ الرَّجُلُ الْعَاقِلُ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ فَيَسْأَلَهُ، فَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، أَتَانَا رَسُولُكَ فَأَخْبَرَنَا أَنَّكَ تَزْعُمُ أَنَّ اللَّهَ ﷻ أَرْسَلَكَ، قَالَ: صَدَقَ، قَالَ: فَمَنْ خَلَقَ السَّمَاءَ؟ قَالَ: اللَّهُ، قَالَ: فَمَنْ خَلَقَ الْأَرْضَ؟ قَالَ: اللَّهُ، قَالَ: فَمَنْ نَصَبَ فِيهَا الْجِبَالَ؟ قَالَ: اللَّهُ، قَالَ: فَمَنْ جَعَلَ فِيهَا الْمَنَافِعَ؟ قَالَ: اللَّهُ، قَالَ: فَبِالَّذِي خَلَقَ السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ، وَنَصَبَ فِيهَا الْجِبَالَ، وَجَعَلَ فِيهَا الْمَنَافِعَ آللَّهُ أَرْسَلَكَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: وَزَعَمَ رَسُولُكَ أَنَّ عَلَيْنَا خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، قَالَ: صَدَقَ، قَالَ: فَبِالَّذِي أَرْسَلَكَ آللَّهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: وَزَعَمَ رَسُولُكَ أَنَّ عَلَيْنَا زَكَاةَ أَمْوَالِنَا، قَالَ: صَدَقَ، قَالَ: فَبِالَّذِي أَرْسَلَكَ آللَّهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: وَزَعَمَ رَسُولُكَ أَنَّ عَلَيْنَا

---

(١) صحيح.




صَوْمَ شَهْرِ رَمَضَانَ فِي كُلِّ سَنَةٍ، قَالَ: صَدَقَ، قَالَ: فَبِالَّذِي أَرْسَلَكَ آللَّهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: وَزَعَمَ رَسُولُكَ أَنَّ عَلَيْنَا الْحَجَّ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً؟ قَالَ: صَدَقَ، قَالَ: فَبِالَّذِي أَرْسَلَكَ آللَّهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَوَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لَا أَزِيدَنَّ عَلَيْهِنَّ شَيْئاً وَلَا أَنْقُصُ، فَلَمَّا وَلَّى قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَئِنْ صَدَقَ لَيَدْخُلَنَّ الْجَنَّةَ»[1].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: لە قورئاندا ڕێگریمان لێکرا پرسیار دەربارەی شتێک بکەین لە پێغەمبەر ﷺ، زۆرمان پێ خۆش بوو پیاوێکی عاقڵ لە دەشت نشینەوە بهاتایەو پرسیاری لێ بکردایە، پیاوێکی دەشت نشین هات، وتی: ئەی موحەممەد ﷺ نێردراوەکەت هاتووە بۆ لامان هەواڵی پێ داوین، تۆ وتوتە: خوا ﷻ تۆی ناردوە، فەرمووی: ڕاستی کرد، وتی: دەی کێ ئاسمانی دروست کردوە؟ فەرمووی: خوا، وتی: دەی کێ چیاکانی تیادا داکوتاوە؟ فەرمووی: خوا، وتی: دەی کێ زەوی دروست کردوە؟ فەرمووی: خوا، وتی: سوێند بەو خوایەی ئاسمان و زەوی دروست کردوەو کێوەکانی داکوتاوەو سوودو قازانجی تیایاندا داناوە ئایا خوا تۆی ناردوە؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: نێردراوەکەت وتوویەتی: پێنج نوێژ لە سەرمان پێویستە لە گشت شەو و ڕۆژێکدا، فەرمووی: ڕاستی کرد، وتی: سوێند بەو خوایەی تۆی ناردوە ئایا خوا فەرمانی پێ کردووی بەمە؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: نێردراوەکەت وتوویەتی: لە هەموو ساڵێکدا پێویستە لە سەرمان مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو بین، فەرمووی: ڕاستی کرد، وتی: نێردراوەکە وتوویەتی: زەکاتی ماڵ و سامانەکانتان لەسەر واجبە، فەرمووی: ڕاست دەکات، وتی: سوێند بەو خوایەی تۆی ناردوە ئایا خوا فەرمانی پێ کردووی بەمە؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: نێردراوەکەت وتوویەتی: حەج پێویستە لە سەرمان بۆ هەر کەسێ توانای هەبێ؟ فەرمووی: ڕاستی کرد، وتی: سوێند بەو خوایەی تۆی ناردوە ئایا خوا فەرمانی پێ کردووی بەمە؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: سوێند بەو خوایەی تۆی بە حەق ناردوە نە هیچی بۆ زیاد دەکەم و نە هیچی لێ کەم دەکەمەوە، کاتێ پشتی هەڵکرد پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر ڕاست بکات دەچێتە بەهەشتەوە.**

**٢٠٩٢-** «عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: بَيْنَا نَحْنُ جُلُوسٌ فِي الْمَسْجِدِ جَاءَ رَجُلٌ عَلَى جَمَلٍ فَأَنَاخَهُ فِي الْمَسْجِدِ، ثُمَّ عَقَلَهُ، فَقَالَ لَهُمْ: أَيُّكُمْ مُحَمَّدٌ؟ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُتَّكِئٌ بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ. قُلْنَا لَهُ: هَذَا الرَّجُلُ الْأَبْيَضُ الْمُتَّكِئُ، فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: يَا ابْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠ و ١٢/١١، والترمذي: ٦١٩.

ﷺ: قَدْ أَجَبْتُكَ، فَقَالَ الرَّجُلُ: إِنِّي سَائِلُكَ يَا مُحَمَّدُ، فَمُشَدِّدٌ عَلَيْكَ فِي الْمَسْأَلَةِ، فَلَا تَجِدَنَّ فِي نَفْسِكَ، قَالَ: سَلْ مَا بَدَا لَكَ، فَقَالَ الرَّجُلُ: نَشَدْتُكَ بِرَبِّكَ، وَرَبِّ مَنْ قَبْلَكَ، آللَّهُ أَرْسَلَكَ إِلَى النَّاسِ كُلِّهِمْ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْشُدُكَ اللَّهَ، آللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ تُصَلِّيَ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْشُدُكَ اللَّهَ، آللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ تَصُومَ هَذَا الشَّهْرَ مِنَ السَّنَةِ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْشُدُكَ اللَّهَ، آللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ تَأْخُذَ هَذِهِ الصَّدَقَةَ مِنْ أَغْنِيَائِنَا فَتَقْسِمَهَا عَلَى فُقَرَائِنَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اللَّهُمَّ نَعَمْ، فَقَالَ الرَّجُلُ: آمَنْتُ بِمَا جِئْتَ بِهِ، وَأَنَا رَسُولُ مَنْ وَرَائِي مِنْ قَوْمِي، وَأَنَا ضِمَامُ بْنُ ثَعْلَبَةَ، أَخُو بَنِي سَعْدِ بْنِ بَكْرٍ، خَالَفَهُ يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ»[1].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە دانیشتبووین لە مزگەوت پیاوێک هات بەسەر وشترێکەوە وشترەکەی یەخدا لە مزگەوت، پاشان بەستیەوە، پێی وتن: کامەتان موحەممەدە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ پاڵی دابوویەوە لە نێوانیاندا، پێیان وت: ئەو پیاوە سپیەیە کە پاڵی داوەتەوە، پیاوەکە پێی وت: ئەی کوڕی عەبدولموطلیب، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وەڵامم دایتەوە، پیاوەکە وتی: من پرسیارت لێ دەکەم ئەی موحەممەد، جەخت دەکەمەوەو توند دەبم لە پرسیار کردندا نەوەک شتێک لە دەروونتدا دروست بێت، فەرمووی: هەرچی دێت بە خەیاڵتدا بپرسە، پیاوەکە وتی: سوێندت دەدەم بە پەروەردگارت و پەروەردگاری کەسانی پێش خۆت، ئایا خوا تۆی ناردووە بۆ هەموو خەڵکی بە گشتی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، وتی: سوێندت دەدەم بە خوا، ئایا خوا فەرمانی پێکردووی لە شەوو ڕۆژێکدا پێنج نوێژ بکەی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، وتی: سوێندت دەدەم بە خوا، ئایا خوا فەرمانی پێکردووی لە ئەم مانگە بە ڕۆژوو بین لە هەموو ساڵێکدا؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، وتی: سوێندت دەدەم بە خوا، ئایا خوا فەرمانی پێکردووی ئەم زەکاتە وەربگری لە دەوڵەمەندەکانمان دابەشی بکەیت بەسەر هەژارەکانمان؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، پیاوەکە وتی: بڕوام هێنا بەو پەیامەی تۆ هێناوتە، من نێردراوی قەومەکەی خۆمم، من ضیمامی کوڕی ثەعلەبەم برای نەوەکانی سەعدی کوڕی بەکر.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٣، وأبو داود: ٤٨٦، وإبن ماجه: ١٤٠٢.

**٢٠٩٣-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ جُلُوسٌ فِي الْمَسْجِدِ، دَخَلَ رَجُلٌ عَلَى جَمَلٍ فَأَنَاخَهُ فِي الْمَسْجِدِ، ثُمَّ عَقَلَهُ، ثُمَّ قَالَ: أَيُّكُمْ مُحَمَّدٌ؟ وَهُوَ مُتَّكِئٌ بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ، فَقُلْنَا لَهُ: هَذَا الرَّجُلُ الأَبْيَضُ الْمُتَّكِئُ، فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: يَا ابْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قَدْ أَجَبْتُكَ، قَالَ الرَّجُلُ: يَا مُحَمَّدُ، إِنِّي سَائِلُكَ فَمُشَدِّدٌ عَلَيْكَ فِي الْمَسْأَلَةِ، قَالَ: سَلْ عَمَّا بَدَا لَكَ، قَالَ: أَنْشُدُكَ بِرَبِّكَ وَرَبِّ مَنْ قَبْلَكَ، آللَّهُ أَرْسَلَكَ إِلَى النَّاسِ كُلِّهِمْ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْشُدُكَ اللَّهَ، آللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ تَصُومَ هَذَا الشَّهْرَ مِنَ السَّنَةِ؟ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْشُدُكَ اللَّهَ، آللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ تَأْخُذَ هَذِهِ الصَّدَقَةَ مِنْ أَغْنِيَائِنَا فَتَقْسِمَهَا عَلَى فُقَرَائِنَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اللَّهُمَّ نَعَمْ، فَقَالَ الرَّجُلُ: إِنِّي آمَنْتُ بِمَا جِئْتَ بِهِ، وَأَنَا رَسُولُ مَنْ وَرَائِي مِنْ قَوْمِي، وَأَنَا ضِمَامُ بْنُ ثَعْلَبَةَ، أَخُو بَنِي سَعْدِ بْنِ بَكْرٍ، خَالَفَهُ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ»[1].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە دانیشتبووین لە مزگەوت پیاوێک هات بەسەر وشترێکەوە وشترەکەی یەخدا لە مزگەوت، پاشان بەستیەوە، پاشان وتی: کامەتان موحەممەدە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ پاڵی دابوویەوە لە نێوانیاندا، پێیان وت: ئەم پیاوە سپییە کە پاڵی داوەتەوە، پیاوەکە پێی وت: ئەی کوڕی عەبدولموطلیب، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وەڵامم دایتەوە، پیاوەکە وتی: ئەی موحەممەد، من پرسیارت لێدەکەم توند دەبم و جەخت دەکەمەوە لە پرسیارەکەمدا، فەرمووی: هەرچی دێت بە خەیاڵتدا بپرسە، پیاوەکە وتی: سوێندت دەدەم بە پەروەردگارت و پەروەردگاری پێش خۆت، ئایا خوا تۆی ناردووە بۆ هەموو خەڵکی بە گشتی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، وتی: سوێندت دەدەم بە خوا، ئایا خوا فەرمانی پێکردووی لە ئەم مانگە بە ڕۆژوو بیت لە هەموو ساڵێکدا؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، وتی: سوێندت دەدەم بە خوا، ئایا خوا فەرمانی پێکردووی ئەم زەکاتە وەربگری لە دەوڵەمەندەکانمان دابەشی بکەیت بەسەر هەژارەکانمان؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، پیاوەکە وتی: بڕوام هێنا بەوەی تۆ هێناوتە، من نێردراوی قەومەکەی خۆمم، من ضیمامی کوڕی ثەعلەبەم برای نەوەکانی سەعدی کوڕی بەکر.**

---

**(١) صحيح.**

**٢٠٩٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا النَّبِيُّ ﷺ مَعَ أَصْحَابِهِ جَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ قَالَ: أَيُّكُمُ ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ؟ قَالُوا: هَذَا الْأَمْغَرُ الْمُرْتَفِقُ، قَالَ: سَلْ عَمَّا بَدَا لَكَ، قَالَ: أَسْأَلُكَ بِرَبِّكَ، وَرَبِّ مَنْ قَبْلَكَ، وَرَبِّ مَنْ بَعْدَكَ، آللَّهُ أَرْسَلَكَ؟ قَالَ: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْشُدُكَ بِهِ آللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ تُصَلِّيَ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ؟ قَالَ: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْشُدُكَ بِهِ، آللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ تَأْخُذَ مِنْ أَمْوَالِ أَغْنِيَائِنَا فَتَرُدَّهُ عَلَى فُقَرَائِنَا؟ قَالَ: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْشُدُكَ بِهِ، آللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ تَصُومَ هَذَا الشَّهْرَ مِنَ اثْنَيْ عَشَرَ شَهْراً؟ قَالَ: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْشُدُكَ بِهِ، آللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ يَحُجَّ هَذَا الْبَيْتَ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً؟ قَالَ: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: فَإِنِّي آمَنْتُ وَصَدَّقْتُ وَأَنَا ضِمَامُ بْنُ ثَعْلَبَةَ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵەکانی بوو پیاوێکی دەشت نشین هات بۆ لای، وتی: کامەتان کوڕی عەبدولموطلیبە؟ وتیان: ئەم پیاوە سوورو سپیەیە، فەرمووی: پرسیار بکە چی بە خەیاڵتدا دێت، وتی: پرسیارت لێدەکەم بە پەروەردگارت و پەروەردگاری پێش خۆت و پەروەردگاری دوای خۆت، ئایا خوا تۆی ناردوە؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: سوێندت دەدەم بە خوا، ئایا خوا فەرمانی پێکردووی لە شەوو ڕۆژێکدا پێنج نوێژ بکەی؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، وتی: سوێندت دەدەم بە خوا، ئایا خوا فەرمانی پێکردووی لەماڵی دەوڵەمەندەکانمان وەربگری دابەشی بکەیت بەسەر هەژارەکانمان؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: سوێندت دەدەم بە خوا، ئایا خوا فەرمانی پێکردووی لە هەر دوازدە مانگدا تەنها ئەم مانگە بە ڕۆژی بیت؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: سوێندت دەدەم بە خوا، ئایا خوا فەرمانی پێکردووی حەجی ئەم ماڵە بکات هەر کەسێک توانای هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ، پیاوەکە وتی: بڕوام هێناو بەڕاستم دانا من ضیمامی کوڕی ثەعلەبەم.**

## بابەت: چاکەو بەخشندەیی لە مانگی ڕەمەزان

**٢٠٩٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا كَانَ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَجْوَدَ النَّاسِ، وَكَانَ أَجْوَدَ مَا يَكُونُ فِي رَمَضَانَ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ، وَكَانَ جِبْرِيلُ يَلْقَاهُ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ فَيُدَارِسُهُ الْقُرْآنَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ أَجْوَدَ بِالْخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ»[٢].

---

**(١) صحيح الإسناد.**

**(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦ و ١٩٠٢ و ٣٢٢٠ و ٣٥٥٤ و ٤٩٩٧، ومسلم: ٢٣٠٨.**




**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەخشندەترینی ناو خەڵکی بوو، لە ڕەمەزاندا زۆر زیاتر بەخشندەتر دەبوو کاتێ جبریل پێی دەگەیشت، جبریل لە هەموو شەوێکی مانگی ڕەمەزان پێی دەگەیشت دەوری قورئانی دەکردەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ جبریل پێی دەگەیشت لە شنەی شەماڵ بەخشندەتر بوو.**

**٢٠٩٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَا لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ لَعْنَةٍ تُذْكَرُ، كَانَ إِذَا كَانَ قَرِيبَ عَهْدٍ بِجِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلَامُ يُدَارِسُهُ، كَانَ أَجْوَدَ بِالْخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ»[1].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینێکی وای نەکردوە شایەنی باس بێت، کاتێ کاتی دیداری نزیک بووایەتەوە لەگەڵ جیبریل (عَلَيْهِ السَّلَامُ) لەگەڵی دەوری (قورئانی) دەکردەوە، لە بای خێرا بەخشندەتر بوو.**

## بابەت: فەزڵ و گەورەیی مانگی ڕەمەزان

**٢٠٩٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ؓ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا دَخَلَ شَهْرُ رَمَضَانَ فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ، وَصُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ»[2]

**واتە: ئەبو هورەیرە ؓ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر مانگی ڕەمەزان هات دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو، دەرگاکانی ئاگریش دادەخرێن و، شەیتانەکانیش دەبەسترێنەوە.**

**٢٠٩٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ؓ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا دَخَلَ رَمَضَانُ فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ، وَصُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ»[3].

**واتە: ئەبو هورەیرە ؓ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ مانگی ڕەمەزان هات دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو، دەرگاکانی ئاگریش دادەخرێن و، شەیتانەکانیش دەبەسترێنەوە.**

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٩٨ و ١٨٩٩ و ٣٢٧٧، ومسلم: ١٠٧٩.

(٣) صحيح.





## بابەت: باسی جیاوازی لەسەر زوهری (دەربارەی فەرموودەی فەزڵ و گەورەیی ڕەمەزان)

**٢٠٩٩-** «عَنْ صَالِحٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي نَافِعُ بْنُ أَبِي أَنَسٍ، أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا دَخَلَ رَمَضَانُ، فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ جَهَنَّمَ، وَسُلْسِلَتِ الشَّيَاطِينُ»[١].

**واتە: صاڵح دەگێڕێتەوە: زوهری وتوویەتی: نافیعی کوڕی ئەبو ئونەیس هەواڵی پێدام باوکی بۆی باسکردوە، ئەو گوێی لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ مانگی ڕەمەزان هات دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو، دەرگاکانی ئاگریش دادەخرێن، وە شەیتانەکانیش دەبەسترێنەوە.**

**٢١٠٠-** «عَنْ شُعَيْبٍ عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ أَبِي أَنَسٍ، مَوْلَى التَّيْمِيِّينَ، أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا جَاءَ رَمَضَانُ فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الرَّحْمَةِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ جَهَنَّمَ، وَسُلْسِلَتِ الشَّيَاطِينُ»[٢].

**واتە: شوعەیب دەگێڕێتەوە: زوهری وتوویەتی: ئیبنو ئەبی ئەنەس مەولای تەیمیەکان هەواڵی پێدام باوکی بۆی باسکردوە، ئەو گوێی لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ مانگی ڕەمەزان هات دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو، دەرگاکانی ئاگریش دادەخرێن و، شەیتانەکانیش دەبەسترێنەوە.**

**٢١٠١-** «عَنْ يُونُس عَنِ ابنِ شِهَابٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي أَنَسٍ، أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا كَانَ رَمَضَانُ فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ جَهَنَّمَ، وَسُلْسِلَتِ الشَّيَاطِينُ، رَوَاهُ ابْنُ إِسْحَقَ، عَنْ الزُّهْرِيِّ»[٣].

**واتە: یونس دەگێڕێتەوە: لە ئیبنو شیهاب، لە ئیبنو ئەبی ئەنەس، کە باوکی بۆی باسکردوە ئەو گوێی لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:**

---

(١) صحیح.

(٢) صحیح.

(٣) صحیح.




**کاتێ مانگی ڕەمەزان هات دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو، دەرگاکانی ئاگریش دادەخرێن و، شەیتانەکانیش دەبەسترێنەوە.**

**٢١٠٢-** «عَنِ ابْنِ إِسْحَاق، عَنِ الزُّهْرِي، عَنِ ابْنِ أَبِي أَنَسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا دَخَلَ شَهْرُ رَمَضَانَ، فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ، وَسُلْسِلَتِ الشَّيَاطِينُ»[١].

**واتە: ئیبنو ئیسحاق دەگێڕێتەوە: لە زوهری، لە ئیبنو ئەبی ئەنەس، ئەویش لە باوکیەوە، ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر مانگی ڕەمەزان هات دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو، دەرگاکانی ئاگریش دادەخرێن و، شەیتانەکانیش دەبەسرێنەوە.**

**٢١٠٣-** «عَنِ ابْنِ إِسْحَاقَ، قَالَ: وَذَكَرَ مُحَمَّد بْن مُسْلِمٍ، عَنْ أُوَيْسِ بْنِ أَبِي أُوَيْسٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: هَذَا رَمَضَانُ قَدْ جَاءَكُمْ تُفَتَّحُ فِيهِ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ، وَتُغَلَّقُ فِيهِ أَبْوَابُ النَّارِ، وَتُسَلْسَلُ فِيهِ الشَّيَاطِينُ» [٢].

**واتە: ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: موحەممەدی کوڕی موسلیم لە ئوەیسی کوڕی ئەبو ئوەیس لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﵁ گێڕاویەتیەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوە ڕەمەزانە هات بۆ ناوتان دەرگاکانی بەهەشت تیایدا دەکرێنەوەو، دەرگاکانی ئاگریش تیایدا دادەخرێن و، شەیتانەکانیش تیایدا دەبەسرێنەوە.**

## باسی جیاوازی لەسەر مەعمەر لە فەرموودەکەدا

**٢١٠٤-** «عَنْ عَبْدُ الْأَعْلَى، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُرَغِّبُ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ عَزِيمَةٍ، وَقَالَ: إِذَا دَخَلَ رَمَضَانُ فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ الْجَحِيمِ، وَسُلْسِلَتْ فِيهِ الشَّيَاطِينُ. أَرْسَلَهُ ابْنُ الْمُبَارَكِ» [٣].

**واتە: عەبدولئەعلا دەگێڕێتەوە: لە مەعمەر، لە زوهری، لە ئەبو سەلەمە، لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ پێغەمبەر ﷺ هانی خەڵکی دەدا لە زیندووکردنەوەی شەوەکان**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح.




**بە پەرستش لە مانگی ڕەمەزاندا بەبێ ئەوەی بیکات بە عەزیمەت، فەرمووی: ئەگەر مانگی ڕەمەزان هات دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو، دەرگاکانی ئاگریش دادەخرێن و، شەیتانەکانیش دەبەسترێنەوە. ئیبنو موبارەک بە (مرسل) هیناویەتی.**

**٢١٠٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا دَخَلَ رَمَضَانُ، فُتِحَتْ أَبْوَابُ الرَّحْمَةِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ جَهَنَّمَ، وَسُلْسِلَتِ الشَّيَاطِينُ»[١].

**واتە: عەبدوڵلا دەگێڕێتەوە لە مەعمەر لە زوهری، لە ئەبو هورەیرە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر مانگی ڕەمەزان هات دەرگاکانی ڕەحمەت و بەهەشت دەکرێنەوەو، دەرگاکانی ئاگریش دادەخرێن و شەیتانەکانیش دەبەسترێنەوە.**

**٢١٠٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَتَاكُمْ رَمَضَانُ شَهْرٌ مُبَارَكٌ فَرَضَ اللَّهُ ﷻ عَلَيْكُمْ صِيَامَهُ، تُفْتَحُ فِيهِ أَبْوَابُ السَّمَاءِ، وَتُغْلَقُ فِيهِ أَبْوَابُ الْجَحِيمِ، وَتُغَلُّ فِيهِ مَرَدَةُ الشَّيَاطِينِ، لِلَّهِ فِيهِ لَيْلَةٌ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ، مَنْ حُرِمَ خَيْرَهَا فَقَدْ حُرِمَ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مانگی ڕەمەزان هات مانگێکی پیرۆزە خوا ﷻ ڕۆژووگرتنی ئەو مانگەی لەسەرتان فەرز کردوە، دەرگاکانی ئاسمانی تێدا دەکرێتەوە، دەرگاکانی دۆزەخیشی تێدا دادەخرێت، شەیتانە یاخی بووەکان دەبەسترێنەوە، شەوێکی تێدایە لەلای خوا چاکترە لە هەزار مانگ، هەر کەس بێبەش بێت لە خێری ئەو شەوە بێبەش دەبێت (لە زۆرترین خێرو چاکە).**

**٢١٠٧-** «عَنْ عَرْفَجَةَ، قَالَ: عُدْنَا عُتْبَةَ بْنَ فَرْقَدٍ ﷺ، فَتَذَاكَرْنَا شَهْرَ رَمَضَانَ، فَقَالَ: مَا تَذْكُرُونَ؟ قُلْنَا: شَهْرَ رَمَضَانَ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: تُفْتَحُ فِيهِ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ، وَتُغْلَقُ فِيهِ أَبْوَابُ النَّارِ، وَتُغَلُّ فِيهِ الشَّيَاطِينُ، وَيُنَادِي مُنَادٍ كُلَّ لَيْلَةٍ: يَا بَاغِيَ الْخَيْرِ هَلُمَّ، وَيَا بَاغِيَ الشَّرِّ أَقْصِرْ»[٣].

**واتە: عەرفەجە دەڵێ: سەردانی عوتبەی کوڕی فەرقەدمان ﷺ کرد، باسی مانگی ڕەمەزانمان کرد، وتی: باسی چی دەکەن؟ وتمان: مانگی ڕەمەزان، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەرگاکانی بەهەشتی تێدا دەکرێتەوە، وە**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.

دەرگاکانی دۆزەخیشی تێدا دادەخرێت، شەیتانەکانیشی تێدا کۆت و بەند دەکرێ، هەموو شەوێک بانگکەرێک بانگ دەکات: ئەی ئەو کەسەی بە دوای خێردا دەگەڕێیت بەردەوام بە لەسەری، ئەی ئەو کەسەی بە دوای شەڕدا دەگەڕێی دەست هەڵگرە.

**٢١٠٨-** «عَنْ عَرْفَجَةَ، قَالَ: كُنْتُ فِي بَيْتٍ فِيهِ عُتْبَةُ بْنُ فَرْقَدٍ ﷺ، فَأَرَدْتُ أَنْ أُحَدِّثَ بِحَدِيثٍ، وَكَانَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، كَأَنَّهُ أَوْلَى بِالْحَدِيثِ مِنِّي، فَحَدَّثَ الرَّجُلُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: فِي رَمَضَانَ، تُفْتَحُ فِيهِ أَبْوَابُ السَّمَاءِ، وَتُغْلَقُ فِيهِ أَبْوَابُ النَّارِ، وَيُصَفَّدُ فِيهِ كُلُّ شَيْطَانٍ مَرِيدٍ، وَيُنَادِي مُنَادٍ كُلَّ لَيْلَةٍ: يَا طَالِبَ الْخَيْرِ هَلُمَّ، وَيَا طَالِبَ الشَّرِّ أَمْسِك»[1].

**واتە:** عەرفەجە دەڵێ: من لە ماڵی عوتبەی کوڕی فەرقەد ﷺ بووم، ویستم باسی فەرموودەیەک بکەم، ئەویش پیاوێک بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وەک بڵێیی لە من شارەزاتر بوو لە فەرموودەدا، لە پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، فەرموویەتی: لە ڕەمەزاندا، دەرگاکانی ئاسمانی تێدا دەکرێنەوەو، دەرگاکانی ئاگریشی تێدا دادەخرێن، هەموو شەیتانێکی یاخیشی تێدا دەبەسترێتەوە، بانگکەرێک لە هەموو شەوێکدا بانگ دەکات: ئەی ئەو کەسەی بە دوای خێردا دەگەڕێیت بەردەوام ببە لەسەری، ئەی ئەو کەسەی بە دوای شەڕدا دەگەڕێی دەست هەڵگرە.

## ڕێگەدان بەوەی بە مانگی ڕەمەزان بوترێ ڕەمەزان

**٢١٠٩-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ صُمْتُ رَمَضَانَ، وَلَا قُمْتُهُ كُلَّهُ، وَلَا أَدْرِي كَرِهَ التَّزْكِيَةَ، أَوْ قَالَ: لَا بُدَّ مِنْ غَفْلَةٍ وَرَقْدَةٍ»[2].

**واتە:** ئەبو بەکرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: با یەکێک لە ئێوە نەڵێت ڕەمەزان بەڕۆژوو بووم، یان هەموو ڕەمەزان شەوەکەیم زیندو کردەوە، نازانم حەزی لە تەزکیە نەکرد، یان وتی: هەر دەبێ بێئاگایی و لە خەو هەڵسانی تووش ببێت.

**٢١١٠-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِامْرَأَةٍ مِنَ الْأَنْصَارِ: إِذَا كَانَ رَمَضَانُ فَاعْتَمِرِي فِيهِ، فَإِنَّ عُمْرَةً فِيهِ تَعْدِلُ حَجَّةً»[3].

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٤١٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٨٢ و ١٨٦٣، ومسلم: ٢٢١ و ١٢٥٦/٢٢٢، وإبن ماجه: ٢٩٩٤.




واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئافرەتێکی ئەنصاری فەرموو: ئەگەر ڕەمەزان هات عومرەی تێدا بکە، چونکە عومرەیەک تێیدا بە قەدر حەجێکە.

## جیاوازی خەڵکی جێگاکان لە بینینی مانگ

**٢١١١-** «عَن كُرَيْبٍ، أَنَّ أُمَّ الْفَضْلِ بَعَثَتْهُ إِلَى مُعَاوِيَةَ رضي الله عنه بِالشَّامِ، قَالَ: فَقَدِمْتُ الشَّامَ، فَقَضَيْتُ حَاجَتَهَا وَاسْتَهَلَّ عَلَيَّ هِلَالُ رَمَضَانَ وَأَنَا بِالشَّامِ، فَرَأَيْتُ الْهِلَالَ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، ثُمَّ قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فِي آخِرِ الشَّهْرِ، فَسَأَلَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ، ثُمَّ ذَكَرَ الْهِلَالَ، فَقَالَ: مَتَى رَأَيْتُمْ؟ فَقُلْتُ: رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، قَالَ: أَنْتَ رَأَيْتَهُ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، وَرَآهُ النَّاسُ فَصَامُوا وَصَامَ مُعَاوِيَةُ، قَالَ: لَكِنْ رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَ السَّبْتِ، فَلَا نَزَالُ نَصُومُ حَتَّى نُكْمِلَ ثَلَاثِينَ يَوْماً أَوْ نَرَاهُ، فَقُلْتُ: أَوَ لَا تَكْتَفِي بِرُؤْيَةِ مُعَاوِيَةَ، وَأَصْحَابِهِ؟ قَالَ: لَا هَكَذَا أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[١].

واتە: کورەیب دەگێڕێتەوە: دایکی فەزڵ ناردی بۆ لای موعاویە رضي الله عنه لە شام، وتی: چوومە شامەوە، پێویستیەکانی ئەوم تەواو کرد، ئینجا مانگی یەک شەوەی ڕەمەزان هاتە پێشەوە من لە شام بووم، لە شەوی هەینی مانگی یەک شەوەم بینی، پاشان چوومە مەدینە لە کۆتایی مانگەکە، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس پرسیاری لێکردم، پاشان باسی مانگی یەک شەوەی ڕەمەزانی کرد، وتی: کەی بینیتان؟ وتم: لە شەوی هەینی بینیمان، وتی: تۆ لە شەوی هەینی بینیوتە؟ وتم: بەڵێ، خەڵکیش بینیان و ڕۆژویان گرت موعاویەش ڕۆژووی گرت، وتی: بەڵام ئێمە لە ڕۆژی شەممە بینیمان، بەردەوام دەبین لەسەر ڕۆژوو تا سی ڕۆژ تەواو دەکەین، یان مانگی شەوال دەبینین، وتم: بینینی موعاویەو هاوەڵانی بەس نیە؟ وتی: نا، بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردووین.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٨٧، وأبو داود: ٢٣٣٢، والترمذي: ٦٩٣.




## بابەت: وەرگرتنی شایەتی یەک پیاو لەسەر بینینی یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزان و باسی جیاوازی تیایدا لەسەر سوفیان لە فەرموودەی سیماک

**٢١١٢-** «عَنِ الْفَضْلِ بْنِ مُوسَى، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: رَأَيْتُ الْهِلاَلَ، فَقَالَ: أَتَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَنَادَى النَّبِيُّ ﷺ: أَنْ صُومُوا»[١]

**واتە:** فەزلی کوڕی مووسا دەگێڕێتەوە: لە سوفیان، لە سیماک، لە عیکریمە، لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: دەشتەکیەک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: مانگی یەکەم شەوی ڕەمەزانم بینیوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا شایەتی دەدەی کە هیچ پەرستراوێک نیە جگە لە خوا، وە موحەممەدیش بەندەو پێغەمبەری خوایە؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ بانگی کرد: ڕۆژوو بگرن.

**٢١١٣-** «عَنْ حُسَيْنٍ، عَنْ زَائِدَةَ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: أَبْصَرْتُ الْهِلاَلَ اللَّيْلَةَ، قَالَ: أَتَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: يَا بِلاَلُ، أَذِّنْ فِي النَّاسِ فَلْيَصُومُوا غَداً»[٢].

**واتە:** حوسەین دەگێڕێتەوە: لە زائیدەوە، لە سیماک، لە عیکریمە، لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: دەشتەکیەک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزانم بینیوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا شایەتی دەدەی کە هیچ پەرستراوێک نیە جگە لە خوا، وە موحەممەدیش بەندەو پێغەمبەری خوایە؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی بیلال، خەڵکی ئاگادار بکەرەوە با بەیانی بە ڕۆژوو بن.

**٢١١٤-** «عَنْ أَبِي دَاوُدَ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ مُرْسَلٌ»[٣].

**واتە:** ئەبو داود دەگێڕێتەوە: لە سوفیان، لە سیماک، لە عیکریمە بە (مُرْسَلٌ)ی هێناویەتی.

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٣٤٠ و ٢٣٤١، والترمذي: ٦٩١، وإبن ماجه: ١٦٥٢.

(٣) ضعيف.

**٢١١٥-** «عَنْ عَبْد اللَّهِ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ مُرْسَلٌ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە: لە سوفیان، لە سیماک، لە عیکریمە بە (مُرْسَل)ی هێناویەتی.**

**٢١١٦-** «عَنْ حُسَيْنِ بْنِ الْحَارِثِ الْجَدَلِيِّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زَيْدِ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، أَنَّهُ خَطَبَ النَّاسَ فِي الْيَوْمِ الَّذِي يُشَكُّ فِيهِ، فَقَالَ: أَلَا إِنِّي جَالَسْتُ أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَسَاءَلْتُهُمْ، وَإِنَّهُمْ حَدَّثُونِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ، وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ، وَانْسُكُوا لَهَا فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَأَكْمِلُوا ثَلَاثِينَ، فَإِنْ شَهِدَ شَاهِدَانِ فَصُومُوا، وَأَفْطِرُوا»[٢].

**واتە: حوسەینی کوڕی حاریسی جەدەلی دەگێڕێتەوە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی خەطاب ﷺ، ئەو وتاریدا بۆ خەڵکی لەو ڕۆژەی کە گومانی تێدایە، وتی: ئاگاداربن من لە کۆڕو مەجلیسی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتووم و پرسیارم لێکردوون، ئەوان بۆیان باسکردووم، بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژوو بگرن بە بینینی (یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزان)، ڕۆژوو بشکێنن بە بینینی (مانگی شەوال) ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن، ئەوە سی (٣٠) ڕۆژ تەواو بکەن، ئەگەر دوو کەس شایەتیاندا ئەوە ڕۆژوو بگرن، وە ڕۆژووش بشکێنن.**

## تەواوکردنی سی شەوی شەعبان ئەگەر هەور بوو، باسی جیاوازی ئەوانەی فەرموودەکەیان گواستۆتەوە لە ئەبو هورەیرە

**٢١١٧-** «عَنْ إِسْمَعِيلَ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ الشَّهْرُ فَعُدُّوا ثَلَاثِينَ»[٣].

**واتە: ئیسماعیل دەگێڕێتەوە: لە شوعبە، لە موحەممەدی کوڕی زیاد، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژوو بگرن بە بینینی (یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزان)، ڕۆژوو بشکێنن بە بینینی (یەکەم شەوی مانگی شەوال)، ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن، ئەوە سی (٣٠) شەو تەواو بکەن.**

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٠٩، ومسلم: ١٨ و ١٠٨١/١٩.




**٢١١٨-** «عَنْ وَرْقَاءَ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ، وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدِرُوا ثَلَاثِينَ»[1].

**واتە: وەرقا دەگێڕێتەوە، لە شوعبەوە، لە موحەممەدی کوڕی زیاد، لە ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژوو بگرن بە بینینی (یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزان)، ڕۆژوو بشکێنن بە بینینی (یەکەم شەوی مانگی شەوال)، ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن ئەوە سی (٣٠) ڕۆژی بۆ بژمێرن.**

## باسی جیاوازی لەسەر زوهری لەم فەرمووده‌دا

**٢١١٩-** «عَنْ إبراهيم، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا رَأَيْتُمُ الْهِلَالَ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَصُومُوا ثَلَاثِينَ يَوْماً»[2].

**واتە: ئیبراهیم دەگێڕێتەوە لە موحەممەدی کوڕی موسلیم، لە سەعیدی کوڕی موسەییب، لە ئەبو هورەیرە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکەم شەوی مانگی (ڕەمەزانتان) بینیٚ ئەوا بە ڕۆژوو بن، کاتێکیش یەکەم شەوی مانگی (شەوالتان) بینی ئەوە بیشکێنن، ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن، ئەوە سی (٣٠) ڕۆژ بە ڕۆژوو بن.**

**٢١٢٠-** «عَنْ يُونُس، عَنْ ابْنِ شِهَابٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِذَا رَأَيْتُمُ الْهِلَالَ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدِرُوا لَهُ»[3].

**واتە: یونس دەگێڕێتەوە لە ئیبنو شهاب، دەڵێ: سالمی کوڕی عەبدوڵڵا بۆی باسکردم، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: کاتێ یەکەم شەوی مانگی (ڕەمەزانتان) بینی ئەوە بە ڕۆژوو بن، کاتێکیش یەکەم شەوی مانگی (شەوالتان) بینی ئەوە بیشکێنن، ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن، ئەوە ئەندازەی بکەن (بە مانگێکی تەواو).**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٨١، وابن ماجه: ١٦٥٥.

(٣) صحيح.

**٢١٢١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَكَرَ رَمَضَانَ، فَقَالَ: لَا تَصُومُوا حَتَّى تَرَوُا الْهِلَالَ، وَلَا تُفْطِرُوا حَتَّى تَرَوْهُ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدِرُوا لَهُ»[1].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ڕەمەزانی کرد، فەرمووی: ڕۆژوو مەگرن تا (یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزان) دەبینن، وە مەیشکێنن تا (یەکەم شەوی مانگی شەوال) دەبینن، ئەگەر هەور بەرچاوی، گرتن ئەوە ئەندازەی بکەن (بە مانگێکی تەواو).**

## باسی جیاوازی لەسەر عوبەیدوڵلای کوڕی عومەر لەم فەرموودەدا

**٢١٢٢-** «عَنْ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، قَالَ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا تَصُومُوا حَتَّى تَرَوْهُ، وَلَا تُفْطِرُوا حَتَّى تَرَوْهُ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدِرُوا لَهُ»[2].

**واتە: یەحیا دەڵێ: عوبەیدوڵڵا بۆی باسکردین وتی: نافیع بۆی باسکردم، لە ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕۆژوو مەگرن تا (یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزان) دەبینن، وە مەیشیکێنن تا (یەکەم شەوی مانگی شەوال) دەبینن، ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن، ئەوە ئەندازەی بکەن (بە مانگێکی تەواو).**

**٢١٢٣-** «عَنْ مُحَمَّد بْن بِشْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ الْأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْهِلَالَ، فَقَالَ: إِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَعُدُّوا ثَلَاثِينَ»[3].

**واتە: موحەممەدی کوڕی بیشر، دەڵێ: عوبەیدوڵڵا بۆی باسکردین، لە ئەبو زیناد، لە ئەعرەج، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزانی کرد، فەرمووی: کاتێ مانگی یەک شەوەی ڕەمەزانتان بینی ئەوە بە ڕۆژووبن، کاتێکیش (یەکەم شەوی مانگی شەوالتان) بینی ئەوە بیشکێنن، ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن، ئەوە سی (٣٠) شەو بژمێرن.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٠٠ و ١٩٠٦ و ١٩٠٧، ومسلم: ٣ و ١٠٨٠/٩، وأبو داود: ٢٣٢٠، وإبن ماجه: ١٦٥٤.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٨١/٢٠.




## باسی جیاوازی لەسەر عەمڕی کوڕی دینار لە فەرموودەی ئیبنو عەبباس

**٢١٢٤-** «عَنْ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَأَكْمِلُوا الْعِدَّةَ ثَلَاثِينَ»[1].

**واتە: حەمادی کوڕی سەلەمە دەگێڕێتەوە: لە عەمڕی کوڕی دینار، لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژوو بگرن بە بینینی (یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزان)، ڕۆژوو بشکێنن بە بینینی (یەکەم شەوی مانگی شەوال)، ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن، ئەوە سی (٣٠) ڕۆژ تەواو بکەن.**

**٢١٢٥-** «عَنْ سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ حُنَيْنٍ، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: عَجِبْتُ مِمَّنْ يَتَقَدَّمُ الشَّهْرَ، وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا رَأَيْتُمُ الْهِلَالَ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَأَكْمِلُوا الْعِدَّةَ ثَلَاثِينَ»[2].

**واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە: لە عەمری کوڕی دینار، لە موحەممەدی کوڕی حونەین، لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: سەرم سووڕماوە لەو کەسەی پێش مانگ دەکەوێت لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کاتی یەکەم شەوی مانگی (ڕەمەزانتان) بینی ئەوە بە ڕۆژوو بن، کاتێکیش (یەکەم شەوی مانگی شەوالتان) بینی ئەوە بیشکێنن، ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن، ئەوە سی ڕۆژ تەواو بکەن.**

## باسی جیاوازی لەسەر مەنصور لە فەرموودەی ریبعی

**٢١٢٦-** «عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ بنِ الْيَمَانِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا تَقَدَّمُوا الشَّهْرَ حَتَّى تَرَوُا الْهِلَالَ قَبْلَهُ أَوْ تُكْمِلُوا الْعِدَّةَ، ثُمَّ صُومُوا حَتَّى تَرَوُا الْهِلَالَ، أَوْ تُكْمِلُوا الْعِدَّةَ قَبْلَهُ»[3].

**واتە: مەنصور دەگێڕێتەوە لە ریبعی کوڕی حیراش، لە حوزەیفەی کوڕی یەمانیەوە ﷺ، وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژوو گرتندا پێشی مانگ مەکەون**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٣٢٦.




**تا مانگی یەک شەوەی (ڕەمەزان) لە پێشەوە دەبینن، یان ماوەی (سی ڕۆژەکەی شەعبان) تەواو دەکەن، پاشان بەڕۆژوو بن تا مانگی (یەک شەوەی شەوال) دەبینن، یان لە پێشەوە ماوەکەی تەواو بکەن.**

**٢١٢٧-** «عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ رِبْعِيٍّ، عَنْ رِبْعِيٍّ، عَنْ بعْضِ، أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَقَدَّمُوا الشَّهْرَ حَتَّى تُكْمِلُوا الْعِدَّةَ أَوْ تَرَوْا الْهِلَالَ، ثُمَّ صُومُوا وَلَا تُفْطِرُوا حَتَّى تَرَوْا الْهِلَالَ أَوْ تُكْمِلُوا الْعِدَّةَ ثَلَاثِينَ»[١].

**واتە: مەنصور دەگێڕێتەوە لە ربیعی کوڕی حیراش، لە حوزەیفەی کوڕی یەمان ﷺ، وتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژوو گرتندا پێشی مانگ مەکەون هەتا سی ڕۆژی ماوەی مانگی شەعبان تەواو دەکەن، یان مانگی یەک شەوە دەبینن، پاشان بەڕۆژوو ببن و ڕۆژوو مەشکێنن تا مانگ دەبینن، یان سی ڕۆژ لە ڕەمەزان تەواو بکەن.**

**٢١٢٨-** «عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ رِبْعِيٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا رَأَيْتُمُ الْهِلَالَ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَأَتِمُّوا شَعْبَانَ ثَلَاثِينَ، إِلَّا أَنْ تَرَوْا الْهِلَالَ قَبْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ صُومُوا رَمَضَانَ ثَلَاثِينَ إِلَّا أَنْ تَرَوْا الْهِلَالَ قَبْلَ ذَلِكَ»[٢].

**واتە: مەنصور دەگێڕێتەوە: لە ربیعی کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێک یەکەم شەوی مانگی (ڕەمەزانتان) بینی ئەوە بە ڕۆژوو بن، کاتێکیش (یەکەم شەوی مانگی شەوالتان) بینی ئەوە بیشکێنن، ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن ئەوە سی شەوی شەعبان تەواو بکەن، مەگەر پێش ئەوە مانگ ببینن، پاشان سی ڕۆژ ڕەمەزان بەڕۆژوو بن، مەگەر پێش ئەوە مانگ ببینن.**

**٢١٢٩-** «عَنْ حَاتِمِ بْنُ أَبِي صَغِيرَةَ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ، فَإِنْ حَالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ سَحَابٌ فَأَكْمِلُوا الْعِدَّةَ، وَلَا تَسْتَقْبِلُوا الشَّهْرَ اسْتِقْبَالاً»[٣].

**واتە: حاتیمی کوڕی ئەبو صەغیرە دەگێڕێتەوە: لە سیماکی کوڕی حەرب، لە عیکریمە، دەڵێ: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره. وهو مرسل وانظر ما قبله.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٨٨/٣٠، وأبو داود: ٢٣٢٧، والترمذي: ٦٨٨.




فەرموویەتی: ڕۆژوو بگرن بە بینینی (یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزان)، ڕۆژوو بشکێنن بە بینینی (یەکەم شەوی مانگی شەوال)، ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن ئەوە ماوەکە تەواو بکەن (کە بریتیە لە سی ڕۆژ) بە هیچ شێوەیەک پێشی مانگەکە مەکەون.

**٢١٣٠-** «عَنْ أَبِي الْأَحْوَصِ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَصُومُوا قَبْلَ رَمَضَانَ، صُومُوا لِلرُّؤْيَةِ، وَأَفْطِرُوا لِلرُّؤْيَةِ، فَإِنْ حَالَتْ دُونَهُ غَيَايَةٌ فَأَكْمِلُوا ثَلَاثِينَ»[١].

**واتە: باوکی ئەحوەص دەگێڕێتەوە: لە سیماک لە عیکریمە، ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێش ڕەمەزان ڕۆژوو مەگرن، ڕۆژوو بگرن بە بینینی (یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزان)، ڕۆژوو بشکێنن بە بینینی (یەکەم شەوی مانگی شەوال)، ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن، ئەوە سی ڕۆژەکە تەواو بکەن.**

## مانگ چەندە؟ وە باسی جیاوازی لەسەر زوهری لە فەرموودەی عائیشە

**٢١٣١-** «عَنْ مَعْمَر، عَنْ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أَقْسَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ لَا يَدْخُلَ عَلَى نِسَائِهِ شَهْراً، فَلَبِثَ تِسْعاً وَعِشْرِينَ، فَقُلْتُ: أَلَيْسَ قَدْ كُنْتَ آلَيْتَ شَهْراً؟ فَعَدَدْتُ الْأَيَّامَ تِسْعاً وَعِشْرِينَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ»[٢].

**واتە: مەعمەر دەگێڕێتەوە لە زوهری لە عوروە، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی خوارد مانگێک نەچێتە لای خێزانەکانی، بیست و نۆ ڕۆژ مایەوە (نەچوو بۆ لایان) وتم: ئایا تۆ سوێندت نە خوارد لێیان دوورکەویتەوە بۆ ماوەی مانگێک؟ ڕۆژەکانم ژمارد بیست و نۆ ڕۆژ بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەم مانگە بیست و نۆ ڕۆژە.**

**٢١٣٢-** «عَنْ صَالِحٍ، عَنْ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ عُبَيْدَ اللَّهِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي ثَوْرٍ، حَدَّثَهُ ح وَعَنْ شُعَيْبٌ، عَنْ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي ثَوْرٍ، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَمْ أَزَلْ حَرِيصاً أَنْ أَسْأَلَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، عَنِ الْمَرْأَتَيْنِ مِنْ أَزْوَاجِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٨٣، والترمذي: ٣٣١٨، وإبن ماجه: ٢٠٥٣.




اللَّتَيْنِ قَالَ اللَّهُ لَهُمَا: ﴿ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا ﴿٤﴾ ﴾التحريم، وَسَاقَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ فِيهِ: فَاعْتَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نِسَاءَهُ مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ الْحَدِيثِ حِينَ أَفْشَتْهُ حَفْصَةُ إِلَى عَائِشَةَ تِسْعاً وَعِشْرِينَ لَيْلَةً، قَالَتْ عَائِشَةُ: وَكَانَ قَالَ: مَا أَنَا بِدَاخِلٍ عَلَيْهِنَّ شَهْراً مِنْ شِدَّةِ مَوْجِدَتِهِ عَلَيْهِنَّ، حِينَ حَدَّثَهُ اللَّهُ ﷻ حَدِيثَهُنَّ، فَلَمَّا مَضَتْ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ لَيْلَةً دَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ، فَبَدَأَ بِهَا، فَقَالَتْ لَهُ عَائِشَةُ: إِنَّكَ قَدْ كُنْتَ آلَيْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْ لَا تَدْخُلَ عَلَيْنَا شَهْراً، وَإِنَّا أَصْبَحْنَا مِنْ تِسْعٍ وَعِشْرِينَ لَيْلَةً نَعُدُّهَا عَدَداً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ لَيْلَةً»[1].

واتە: صاڵح دەگێڕێتەوە: لە ئیبنو شیهاب، کە عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ثەور، فەرموودەکەی بۆی باسکردوە، وە شوعەیب دەگێڕێتەوە زوهری دەڵێ: عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ثەور هەواڵی پێدام، ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: بەردەوام سوور بووم لەسەر ئەوەی پرسیار بکەم لە عومەری کوڕی خەطاب، دەربارەی ئەو دوو خێزانەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە خوا دەربارەیان فەرموو بووی: ﴿ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا ﴿٤﴾ ﴾، (واتە: ئەگەر هەردووکتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا (ئەوە جێی خۆیەتی) چونکە بەڕاستی دڵتان لایدا لە حەق و ڕاستی). ئینجا فەرموودەکەی باس کرد، وە تیایدا وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر ئەوەی حەفصە هەواڵەکەی گەیاند بە عائیشە (لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ خۆی فەرمووی بە کەس نەڵێیت) دوورکەوتەوە لە خێزانەکانی بۆ ماوەی بیست و نۆ ڕۆژ، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: فەرمووی: من مانگێک ناچمە لایان، چونکە زۆر لێیان توڕە بوو، کاتێک خوا باسەکەیانی بۆی باس کرد، کاتێ بیست و نۆ شەو تێپەڕی چوو بۆ لای عائیشە، لە عائیشەوە دەستی پێکرد، عائیشە پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ سوێندت خوارد تا مانگێک نەیەیتە لامان؟ ئێمە ڕۆژمان کردۆتەوە وا بیست و نۆ شەوە ژماردوومانە بە ژماردن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەم مانگە بیست و نۆ شەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٩، ومسلم: ١٤٧٩، وأبو داود: ٥٢٠١، والترمذي: ٢٣١٨ و ٢٤٦١ و ٢٦٩١، وإبن ماجه: ٤١٥٣.

## باسی هەواڵی ئیبنو عەبباس دەربارەی فەرموودەکە

**٢١٣٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أَتَانِي جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ، فَقَالَ: الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ يَوْماً»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: جبریل هات بۆ لام فەرمووی: ئەم مانگە بیست و نۆ ڕۆژە.**

**٢١٣٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ يَوْماً»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەم مانگە بیست و نۆ ڕۆژە.**

## باسی جیاوازی لەسەر ئیسماعیل لە فەرموودەی سەعدی کوڕی مالیک دەربارەی ژمارەی ڕۆژەکانی مانگ

**٢١٣٥-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ بِشْرٍ، عَنْ إِسْمَعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ ضَرَبَ بِيَدِهِ عَلَى الْأُخْرَى، وَقَالَ: الشَّهْرُ هَكَذَا، وَهَكَذَا، وَهَكَذَا، وَنَقَصَ فِي الثَّالِثَةِ إِصْبَعاً»[٣].

**واتە: موحەممەدی کوڕی بیشر دەگێڕێتەوە: لە ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالد، لە موحەممەدی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص لە باوکیەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بە دەستێکی دای لە دەستەکەی دیکەی و (بە هەردە پەنجەکەی ئاماژەی کرد)، وە فەرمووی: مانگ ئەوەندەو ئەوەندەو ئەوەندەیە، لە سێیەم جاردا پەنجەیەکی کەم کردەوە، (واتە: بیست و نۆ ڕۆژە).**

**٢١٣٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ إِسْمَعِيلَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، الشَّهْرُ هَكَذَا، وَهَكَذَا، وَهَكَذَا، يَعْنِي تِسْعَةً وَعِشْرِينَ»[٤].

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦ و ١٠٨٦/٢٧، وإبن ماجه: ١٦٥٧.

(٤) صحيح.




واتە: عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە: لە ئیسماعیل، لە موحەممەدی كوڕی سەعد، لە باوكیەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مانگ ئەوەندەو ئەوەندەو ئەوەندەیە (بە هەر دە پەنجەكەی ئاماژەی كرد)، واتە: بیست و نۆیە.

**٢١٣٧-** «عَنْ مُحَمَّد بْن عُبَيْدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَعِيلُ، عَنْ مُحَمَّد بْن سَعد بْن أَبِي وَقَّاصٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الشَّهْرُ هَكَذَا، وَهَكَذَا، وَهكَذَا، وَصَفَّقَ مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْد بِيَدَيْهِ يَنْعَتُهَا ثَلَاثاً، ثُمَّ قَبَضَ فِي الثَّالِثَةِ الْإِبْهَامَ فِي الْيُسْرَى»[١].

واتە: موحەممەدی كوڕی عوبەیدوڵڵا دەڵێ: ئیسماعیل بۆی باسكردین، لە موحەممەدی كوڕی سەعدی كوڕی ئەبو وەقاص (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مانگ ئەوەندەو ئەوەندەو ئەوەندەیە (بە هەر دە پەنجەكەی ئاماژەی كرد)، موحەممەدی كوڕی عوبەید بە (پەنجەكانی) هەردوو دەستی دای لە یەكتر سێ جار كردیەوە وەسفی دەكرد، پاشان لە سێیەمین جار پەنجە گەورەكەی دەستی چەپی نوقاند.

## باسی جیاوازی لەسەر یەحیای كوڕی ئەبو كەثیر
## لە فەرموودەی ئەبو سەلەمە دەربارەی ژمارەی ڕۆژەكانی مانگ

**٢١٣٨-** «عَنْ عَلِيِ ابْنِ الْمُبَارَكِ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الشَّهْرُ يَكُونُ تِسْعَةً وعِشْرِينَ وَيَكُونُ ثَلَاثِينَ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَأَكْمِلُوا الْعِدَّةَ»[٢].

واتە: عەلی كوڕی ئیبنو موبارەك دەڵێ: یەحیا بۆی باسكردین لە ئەبو سەلەمە، لە ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەندێ جار مانگ بیست و نۆ دەبێت و هەندێ جاریش سی دەبێت، كاتێ (یەكەم شەوی مانگی ڕەمەزانتان) بینی ئەوە بە ڕۆژوو بن، كاتێكیش (یەكەم شەوی مانگی شەوالتان) بینی بیشكێنن، ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن، ئەوە سی شەو تەواو بكەن.

---

(١) صحيح. وهو مرسل.

(٢) صحيح الإسناد. أخرجه الترمذي: ٦٨٤.




**٢١٣٩-** «عَن عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ فَضَالَةَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: أَنْبَأَنَا مُحَمَّدٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ، ح وَعَنْ مُعَاوِيَةَ، وَاللَّفْظُ لَهُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، أَنَّ أَبَا سَلَمَةَ، أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ وَهُوَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ»[١].

**واتە: عوبەیدوڵڵای کوڕی فەضالەی کوڕی ئیبراهیم دەڵێ: موحەممەد بۆی باسکردین وتی: موعاویە بۆی باس کردین، فەرموودەکە وە موعاویە دەگێڕێتەوە دەربڕینەکەش لەلایەن ئەوەوەیە، لە یەحیای کوڕی ئەبو کەثیر، ئەبو سەلەمە هەواڵی پێداوە، گوێی لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بوو (خوا لێیان ڕازی بێ) وتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: مانگە بیست و نۆیە.**

**٢١٤٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّا أُمَّةٌ أُمِّيَّةٌ، لَا نَكْتُبُ وَلَا نَحْسُبُ الشَّهْرُ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا، ثَلَاثاً حَتَّى ذَكَرَ تِسْعاً وَعِشْرِينَ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئێمە ئوممەتێکی نەخوێندەوارین، نەدەنوسین و نە (مانگ) دەژمێرین، ئەوەندەو ئەوەندەو ئەوەندەیە. سێ جارَ تا باسی بیست و نۆی کرد.**

**٢١٤١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّا أُمَّةٌ أُمِّيَّةٌ، لَا نَحْسُبُ وَلَا نَكْتُبُ، وَالشَّهْرُ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا «وَعَقَدَ الْإِبْهَامَ فِي الثَّالِثَةِ»، وَالشَّهْرُ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا تَمَامَ الثَّلَاثِينَ»[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئێمە ئوممەتێکی نەخوێندەوارین، نە دەنوسین و نە (مانگ) دەژمێرین و نەدەنوسین، وە مانگ (هەیە) ئەوەندەو ئەوەندەو ئەوەندەیە (لە سێیەم جاردا پەنجە گەورەکەی نوقاند) وە مانگیش (هەیە) ئەوەندەو ئەوەندەو ئەوەندەیە سی ڕۆژی تەواو.**

**٢١٤٢-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الشَّهْرُ هَكَذَا، وَوَصَفَ شُعْبَةُ، عَنْ صِفَةِ جَبَلَةَ، عَنْ صِفَةِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّهُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ، فِيمَا حَكَى مِنْ صَنِيعِهِ مَرَّتَيْنِ بِأَصَابِعِ يَدَيْهِ، وَنَقَصَ فِي الثَّالِثَةِ إِصْبَعاً مِنْ أَصَابِعِ يَدَيْهِ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٠٧ و ١٩٠٨ و ١٩١٣ و ٥٣٠٢، ومسلم: ١٠ و ١٠٨٠/١٧، وأبو داود: ٢٣١٩.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: مانگ ئەوەندەیە، شوعبە وەسفی کرد لەسەر وەسفی ئیبنو عومەر، کە مانگ بیست و نۆیە، بە پەنجەکانی دەستی وەک ئیبنو عومەر دوو جار ژماردی، لە سێیەمین جاردا پەنجەیەک لە پەنجەکانی دەستی کەم کردەوە.

**٢١٤٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مانگ بیست و نۆیە.

## هاندان لەسەر پارشێو کردن

**٢١٤٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً»[٢].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پارشێو بکەن، چونکە لە پارشێودا بەرەکەت هەیە.

**٢١٤٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: تَسَحَّرُوا» [٣].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پارشێو بکەن.

**٢١٤٦-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً»[٤].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پارشێو بکەن، چونکە لە پارشێودا بەرەکەت هەیە.

---

(١) صحيح.

(٢) حسن صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٢٣، ومسلم: ١٠٩٥، والترمذي: ٧٠٨، وإبن ماجه: ١٦٩٢.




## باسی جیاوازی لەسەر عەبدولمەلیکی کوڕی ئەبو سولەیمان لەم فەرموودەدا

**٢١٤٧-** «عَن مَنْصُورُ بْنُ أَبِي الْأَسْوَدِ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي سُلَيْمَانَ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً»(١).

**واتە: مەنصوری کوڕی ئەبولئەسوەد دەگێڕێتەوە: عەبدولمەلیکی کوڕی ئەبو سولەیمان لە عەطائەوە، کە ئەبو هورەیرە ﷺ وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پارشێو بکەن، چونکە لە پارشێودا بەرەکەت هەیە.**

**٢١٤٨-** «عَنْ يَزِيدُ، قَالَ: أَنْبَأَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ أَبِي سُلَيْمَانَ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً، رَفَعَهُ ابْنُ أَبِي لَيْلَى»(٢).

**واتە: یەزید دەڵێ: عەبدولمەلیکی کوڕی ئەبو سولەیمان بۆی باس کردین لە عەطائەوە، کە ئەبو هورەیرە ﷺ وتوویەتی: پارشێو بکەن، چونکە لە پارشێودا بەرەکەت هەیە.**

**٢١٤٩-** «عَن ابْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً»(٣).

**واتە: ئیبنو ئەبو لەیلا دەگێڕێتەوە: لە عەطائەوە، ئەبو هورەیرەوە ﷺ وتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پارشێو بکەن، چونکە لە پارشێودا بەرەکەت هەیە.**

**٢١٥٠-** «عَن ابْن أَبِي لَيْلَى، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً»(٤).

**واتە: ئیبنو ئەبو لەیلا دەگێڕێتەوە: لە عەطائەوە، ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پارشێو بکەن چونکە لە پارشێودا بەرەکەت هەیە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**٢١٥١-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ فُضَيْلٍ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً»(١).

**واتە: موحەممەدی کوڕی فوضەیل دەگێڕێتەوە: لە یەحیای کوڕی سەعید، لە ئەبو سەلەمە، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پارشێو بکەن، چونکە لە پارشێودا بەرەکەت هەیە.**

## دواخستنی پارشێوو باسی جیاوازی لەسەر زیڕ لە فەرموودەکەدا

**٢١٥٢-** «عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ زِرٍّ قَالَ: قُلْنَا لِحُذَيْفَةَ ﷺ: أَيَّ سَاعَةٍ تَسَحَّرْتَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: هُوَ النَّهَارُ إِلَّا أَنَّ الشَّمْسَ لَمْ تَطْلُعْ»(٢).

**واتە: عاصم دەگێڕێتەوە: زیڕ دەڵێ: بە حوزەیفەمان ﷺ وت: چ کاتێک پارشێوت کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ؟ وتی: ڕۆژ بوو ئەوە نەبێ خۆر دەرنەچوو بوو. (واتە: نزیک دەرچوونی بەرە بەیان بوو).**

**٢١٥٣-** «عَنْ عَدِيٍّ قَالَ: سَمِعْتُ زِرَّ بْنَ حُبَيْشٍ قَالَ: تَسَحَّرْتُ مَعَ حُذَيْفَةَ ﷺ، ثُمَّ خَرَجْنَا إِلَى الصَّلَاةِ، فَلَمَّا أَتَيْنَا الْمَسْجِدَ صَلَّيْنَا رَكْعَتَيْنِ، وَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ وَلَيْسَ بَيْنَهُمَا إِلَّا هُنَيْهَةٌ»(٣).

**واتە: عەدی دەڵێ: زیڕی کوڕی حوبەیش دەڵێ: لەگەڵ حوزەیفە ﷺ پارشێوم کرد، پاشان دەرچووین بۆ نوێژ، کاتێ هاتینە مزگەوت دوو ڕکاتمان کرد، ئینجا قامەتی نوێژ کرا، لە نێوانیاندا ماوەیەکی کەم هەبوو.**

**٢١٥٤-** «عَنْ صِلَةَ بْنِ زُفَرَ قَالَ: تَسَحَّرْتُ مَعَ حُذَيْفَةَ ﷺ، ثُمَّ خَرَجْنَا إِلَى الْمَسْجِدِ، فَصَلَّيْنَا رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، ثُمَّ أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَصَلَّيْنَا»(٤).

**واتە: صیلەی کوڕی زوفەر دەڵێ: لەگەڵ حوزەیفە ﷺ پارشێوم کرد، پاشان دەرچووین بۆ مزگەوت، ئینجا دوو ڕکات نوێژی بەرەبەیانمان کرد، پاشان قامەت کرا بۆ نوێژ و نوێژمان کرد.**

---

(١) صحيح.

(٢) حسن. أخرجه إبن ماجه: ١٦٩٥.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح الإسناد.

## ئەندازەی نێوان پارشێوو نێوان نوێژی بەیانی

**٢١٥٥-** «عَنْ قتادةَ، عَنْ أنَسِ بْنِ مَالكٍ، زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﵁ قَالَ: تَسَحَّرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قُمْنَا إِلَى الصَّلَاةِ، قُلْتُ: كَمْ كَانَ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: قَدْرُ مَا يَقْرَأُ الرَّجُلُ خَمْسِينَ آيَةً»[١].

**واتە: قەتادە دەگێڕێتەوە: لە ئەنەسی کوڕی مالیک، لە زەیدی کوڕی ثابتەوە ﵁ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ پارشێومان کرد، پاشان هەڵساین بۆ نوێژ، وتم: نێوانیان چەند بوو؟ وتی: بە ئەندازەی ئەوەی کەسێک پەنجا ئایەت بخوێنێت.**

## باسی جیاوازی هیشام و سەعید لەسەر قەتادە لە فەرموودەکەدا

**٢١٥٦-** «عَنْ خَالِدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﵁ قَالَ: تَسَحَّرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قُمْنَا إِلَى الصَّلَاةِ، قُلْتُ: «زُعِمَ أَنَّ أَنَسًا الْقَائِلُ» مَا كَانَ بَيْنَ ذَلِكَ؟ قَالَ: قَدْرُ مَا يَقْرَأُ الرَّجُلُ خَمْسِينَ آيَةً»[٢].

**واتە: خالد دەڵێ: هیشام بۆی باسکردین وتی: قەتادە بۆی باسکردین، لە ئەنەس، لە زەیدی کوڕی ثابتەوە ﵁ وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ پارشێومان کرد، پاشان هەڵساین بۆ نوێژ، وتم: «وتراوە: ئەنەس خۆی وتویەتی:» نێوان پاشێوو نوێژی بەیانی چەند بووە؟ وتی: ئەندازەی ئەوەی کەسێک پەنجا ئایەت بخوێنێ.**

**٢١٥٧-** «عَنْ خَالِدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: تَسَحَّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، ثُمَّ قَامَا فَدَخَلَا فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ، فَقُلْنَا لِأَنَسٍ: كَمْ كَانَ بَيْنَ فَرَاغِهِمَا وَدُخُولِهِمَا فِي الصَّلَاةِ؟ قَالَ: قَدْرُ مَا يَقْرَأُ الْإِنْسَانُ خَمْسِينَ آيَةً»[٣].

**واتە: خالد دەڵێ: سەعید بۆی باسکردین، لە قەتادە، لە ئەنەسەوە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پارشێوی کرد لەگەڵ زەیدی کوڕی ثابت، پاشان هەڵسان چوونە نێو نوێژی بەیانیەوە، بە ئەنەسمان وت: نێوان پارشێوو نوێژی بەیانیان چەند بوو؟ وتی: بە ئەندازەی ئەوەی کەسێک پەنجا ئایەت بخوێنێ.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٧٥ و ١٩٢١، ومسلم: ١٠٩٧، والترمذي: ٧٠٣ و ٧٠٤، وإبن ماجه: .١٦٩٤.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٧٦ و ١١٣٤.




## بەشی جیاوازی لەسەر سولەیمانی کوڕی میهران لە فەرموودەی عائیشە لە دواکەوتنی پارشێوو جیاوازی دەستەواژەیان

**٢١٥٨-** «عَنْ شُعْبَةُ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ خَيْثَمَةَ، عَنْ أَبِي عَطِيَّةَ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: فِينَا رَجُلَانِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ أَحَدُهُمَا يُعَجِّلُ الْإِفْطَارَ وَيُؤَخِّرُ السُّحُورَ، وَالْآخَرُ يُؤَخِّرُ الْإِفْطَارَ وَيُعَجِّلُ السُّحُورَ، قَالَتْ: أَيُّهُمَا الَّذِي يُعَجِّلُ الْإِفْطَارَ وَيُؤَخِّرُ السُّحُورَ؟، قُلْتُ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ، قَالَتْ: هَكَذَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصْنَعُ»[1].

**واتە: شوعبە دەگێڕێتەوە: لە سولەیان، لە خەیثەمە، لە ئەبو عەطاء دەڵێ: وتم بە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ): دوو پیاومان تێدایە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ یەکێکیان ڕۆژوو زوو دەشکێنێ و پارشێوە دوادەخات، ئەوی تریان، درەنگ ڕۆژوو دەشکێنێ و زوو پارشێو دەکات (کامەیان چاکترە)، وتی: کامەیان ڕۆژوو زوو دەشکێنێ و پارشێوە دوادەخات؟ وتم: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەی دەکرد.**

**٢١٥٩-** «عَنْ سُفْيَانُ، عَنْ الْأَعْمَشِ، عَنْ خَيْثَمَةَ، عَنْ أَبِي عَطِيَّةَ، قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: فِينَا رَجُلَانِ أَحَدُهُمَا يُعَجِّلُ الْإِفْطَارَ وَيُؤَخِّرُ السُّحُورَ، وَالْآخَرُ يُؤَخِّرُ الْفِطْرَ وَيُعَجِّلُ السُّحُورَ، قَالَتْ: أَيُّهُمَا الَّذِي يُعَجِّلُ الْإِفْطَارَ وَيُؤَخِّرُ السُّحُورَ؟ قُلْتُ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ، قَالَتْ: هَكَذَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصْنَعُ»[2].

**واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە: لە ئەعمەش، لە خەیثەمە، لە ئەبو عەطاء دەڵێ: وتم بە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دوو پیاومان تێدایە یەکێکیان ڕۆژوو زوو دەشکێنێ و پارشێوە دوادەخات، ئەوی تریان درەنگ ڕۆژوو دەشکێنێ و زوو پارشێو دەکات (کامەیان چاکترە)؟ وتی: کامەیان ڕۆژوو زوو دەشکێنێ و پارشێوە دوادەخات؟ وتم: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەی دەکرد.**

**٢١٦٠-** «عَنْ زَائِدَةَ، عَنْ الْأَعْمَشِ، عَنْ عُمَارَةَ، عَنْ أَبِي عَطِيَّةَ، قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَمَسْرُوقٌ عَلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا فَقَالَ لَهَا مَسْرُوقٌ: رَجُلَانِ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كِلَاهُمَا لَا يَأْلُو عَنِ

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٩ و ١٠٩٩/٥٠، وأبو داود: ٧٠٢ و ٢٣٥٤.

(٢) صحيح.




الْخَيْرِ، أَحَدُهُمَا يُؤَخِّرُ الصَّلَاةَ وَالْفِطْرَ، وَالْآخَرُ يُعَجِّلُ الصَّلَاةَ وَالْفِطْرَ، قَالَتْ عَائِشَةُ: أَيُّهُمَا الَّذِي يُعَجِّلُ الصَّلَاةَ وَالْفِطْرَ؟ قَالَ مَسْرُوقٌ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: هَكَذَا كَانَ يَصْنَعُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[١].

**واتە: زائیدە دەگێڕێتەوە: لە ئەعمەش، لە عومارە، لە ئەبو عەطاء دەڵێ: من و مەسروق چووین بۆ لای عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) مەسروق پێی وت: دوو پیاو لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەردووکیان کەمتەرخەمی لە خێردا ناکەن، یەکێکیان نوێژ دوادەخات و درەنگ ڕۆژوو دەشکێنێ، ئەوی تریان زوو نوێژ دەکات و زوو ڕۆژوو دەشکێنێ (کاری کامەیان چاکترە)؟ عائیشە وتی: کێ زوو نوێژ دەکات و زوو ڕۆژوو دەشکێنێ؟ مەسروق وتی: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود، عائیشە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەی دەکرد.**

**٢١٦١-** «عَنْ أَبِي مُعَاوِيَةَ، عَنْ الْأَعْمَشِ، عَنْ عُمَارَةَ، عَنْ أَبِي عَطِيَّةَ، قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَمَسْرُوقٌ عَلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا فَقُلْنَا لَهَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، رَجُلَانِ مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ ﷺ، أَحَدُهُمَا يُعَجِّلُ الْإِفْطَارَ وَيُعَجِّلُ الصَّلَاةَ، وَالْآخَرُ يُؤَخِّرُ الْإِفْطَارَ وَيُؤَخِّرُ الصَّلَاةَ، فَقَالَتْ: أَيُّهُمَا يُعَجِّلُ الْإِفْطَارَ وَيُعَجِّلُ الصَّلَاةَ؟ قُلْنَا: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ، قَالَتْ: هَكَذَا كَانَ يَصْنَعُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَالْآخَرُ أَبُو مُوسَى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا»[٢].

**واتە: ئەبو موعاویە دەگێڕێتەوە: لە ئەعمەش، لە عومارە، لە ئەبو عەطاء دەڵێ: من و مەسروق چووین بۆ لای عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) پێمان وت: ئەی دایکی ئیمانداران، دوو پیاو لە هاوەڵانی موحەممەد ﷺ یەکێکیان زوو ڕۆژوو دەشکێنێ و زوو نوێژ دەکات، ئەوی تریان درەنگ ڕۆژوو دەشکێنێ و نوێژیش درەنگ دەکات (جا کامەیان چاکترە)؟ وتی: کامەیان زوو ڕۆژوو دەشکێنێ و زوو نوێژ دەکات؟ وتمان: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەی دەکرد، ئەوی دیکەشیان ئەبو مووسا بوو.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




## فەزڵ و چاکەی پارشێو کردن

**٢١٦٢-** «عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الْحَارِثِ ﵁، يُحَدِّثُ عَنْ رَجُلٍ، مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يَتَسَحَّرُ، فَقَالَ: إِنَّهَا بَرَكَةٌ أَعْطَاكُمُ اللَّهُ إِيَّاهَا فَلَا تَدَعُوهُ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی حارث ﵁ دەگێڕێتەوە: پیاوێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وتی: ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پارشێوی دەکرد، فەرمووی: ئەمە بەرەکەتێکە خوا پێتانی بەخشیوە وازی لێ مەهێنن.**

## بانگ کردن بۆ پارشێو

**٢١٦٣-** «عَنِ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يَدْعُو إِلَى السَّحُورِ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، وَقَالَ: هَلُمُّوا إِلَى الْغَدَاءِ الْمُبَارَكِ»[٢].

**واتە: عیرباضی کوڕی ساریە ﵁ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بانگی دەکرد بۆ پارشێو کردن لە مانگی ڕەمەزان، فەرمووی: وەرن بۆ خواردنی بە بەرەکەت.**

## ناونانی پارشێو بە خواردن

**٢١٦٤-** «عَنْ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِ يكَرِبَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: عَلَيْكُمْ بِغَدَاءِ السُّحُورِ، فَإِنَّهُ هُوَ الْغَدَاءُ الْمُبَارَكُ»[٣].

**واتە: میقدامی کوڕی مەعدی یەکرب ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەست بگرن بە خواردنی پارشێو، چونکە ئەوە خواردنێکی بەرەکەتدارە.**

**٢١٦٥-** «عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِرَجُلٍ: هَلُمَّ إِلَى الْغَدَاءِ الْمُبَارَكِ، يَعْنِي السَّحُورَ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٣٤٤.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح الإسناد. وهو مرسل وانظر ما قبله.




واتە: خالدی كوڕی مەعدان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە پیاوێكی فەرموو: وەرە بۆ خواردنی بە بەرەكەت، واتە: پارشێو.

## جیاوازی لە نێوان ڕۆژووی ئێمەو ڕۆژووی خاوەن كتێبەكان

**٢١٦٦-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ فَصْلَ مَا بَيْنَ صِيَامِنَا وَصِيَامِ أَهْلِ الْكِتَابِ أَكْلَةُ السُّحُورِ»[1].

واتە: عەمری كوڕی عاص ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان جیاوازی لە نێوان ڕۆژووی ئێمەو ڕۆژووی خاوەن كتێبەكان خواردنی پارشێوە.

## پارشێو كردن بە خورماو (السويق) كە خواردنێكە لە ئاردو ڕۆن دروست دەكرێ

**٢١٦٧-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَذَلِكَ عِنْدَ السُّحُورِ: يَا أَنَسُ إِنِّي أُرِيدُ الصِّيَامَ، أَطْعِمْنِي شَيْئاً، فَأَتَيْتُهُ بِتَمْرٍ وَإِنَاءٍ فِيهِ مَاءٌ، وَذَلِكَ بَعْدَ مَا أَذَّنَ بِلَالٌ، فَقَالَ: يَا أَنَسُ، انْظُرْ رَجُلاً يَأْكُلْ مَعِي، فَدَعَوْتُ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ، فَجَاءَ، فَقَالَ: إِنِّي قَدْ شَرِبْتُ شَرْبَةَ سَوِيقٍ وَأَنَا أُرِيدُ الصِّيَامَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَأَنَا أُرِيدُ الصِّيَامَ، فَتَسَحَّرَ مَعَهُ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ»[2].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە كاتی پارشێودا فەرموویەتی: ئەی ئەنەس من دەمەوێ ڕۆژوو بگرم، شتێكم بدەرێ بیخۆم، منیش خورماو قاپێك ئاوم بۆی هێنا، ئەویش دوای ئەوەی بیلال بانگی دابوو (واتە: دوای بانگی یەكەم) فەرمووی: ئەی ئەنەس كەسێك بدۆزەرەوە با لەگەڵم بخوات، بانگی زەیدی كوڕی ثابتم كرد، ئەویش هات، وتی من شۆربای سەویقم خواردوەو دەمەوێ بە ڕۆژوو بم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: منیش دەمەوێ بەڕۆژوو بم، پارشێوی لەگەڵدا كرد، پاشان هەڵسا دوو ڕكاتی كرد، پاشان ڕۆیشت بۆ نوێژ.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٩٦، وأبو داود: ٢٣٤٣، والترمذي: ٧٠٩.

(٢) صحيح الإسناد.




## تەفسیری فەرمایشتی خوا ﷻ:

﴿ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ﴿١٨٧﴾ ﴾البقرة.

واتە: بخۆن و بخۆنەوە هەتا ڕوشتەی سپی ڕۆژ، لە ڕوشتەی ڕەشی شەوتان بۆ لێک جیا دەبێتەوە لە شەبەقدا.

**٢١٦٨-** «عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ: أَنَّ أَحَدَهُمْ كَانَ إِذَا نَامَ قَبْلَ أَنْ يَتَعَشَّى لَمْ يَحِلَّ لَهُ أَنْ يَأْكُلَ شَيْئاً وَلَا يَشْرَبَ لَيْلَتَهُ وَيَوْمَهُ، مِنَ الْغَدِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ ﴿١٨٧﴾ ﴾البقرة، إِلَى: ﴿ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ ﴿١٨٧﴾ ﴾البقرة، قَالَ: وَنَزَلَتْ فِي أَبِي قَيْسِ بْنِ عَمْرٍو، أَتَى أَهْلَهُ وَهُوَ صَائِمٌ بَعْدَ الْمَغْرِبِ، فَقَالَ: هَلْ مِنْ شَيْءٍ؟ فَقَالَتِ امْرَأَتُهُ: مَا عِنْدَنَا شَيْءٌ وَلَكِنْ أَخْرُجُ أَلْتَمِسُ لَكَ عَشَاءً، فَخَرَجَتْ وَوَضَعَ رَأْسَهُ فَنَامَ، فَرَجَعَتْ إِلَيْهِ فَوَجَدَتْهُ نَائِماً وَأَيْقَظَتْهُ، فَلَمْ يَطْعَمْ شَيْئاً وَبَاتَ وَأَصْبَحَ صَائِماً حَتَّى انْتَصَفَ النَّهَارُ فَغُشِيَ عَلَيْهِ، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ تَنْزِلَ هَذِهِ الْآيَةُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِ»[١].

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەگێڕێتەوە: یەکێکیان کاتێ بخەوتایە (دوای ڕۆژوو شکاندن) پێش ئەوەی نان بخوات حەڵاڵ نەبوو بۆی شتێک بخوات، یان بخواتەوە لەم شەوەو لە ڕۆژەکەشدا، لە بەیانیەوە تا خۆر ئاوا دەبوو (لە ڕۆژی دواتر)، تا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ ﴿١٨٧﴾ ﴾البقرة، تا: ﴿ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ ﴿١٨٧﴾ ﴾البقرة، دەڵێ: دەربارەی ئەبو قەیسی کوڕی عەمر دابەزی، لە دوای ئێوارە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە بە ڕۆژوو بوو، وتی: شتێک هەیە بیخۆین؟ هاوسەرەکەی وتی: هیچمان نیە، بەڵام دەردەچم، بەڵکو خواردنێکت بۆ پەیدا بکەم، دەرچوو ئەویش سەری نایەوەو خەوت، کاتێ ژنەکەی گەڕایەوە بۆ لای تەماشای کرد خەوتووە، ئینجا هەڵیساند لە خەو، ئەویش هیچی نەخوارد، شەوی کردەوەو دیسان بۆ بەیانیەکەی بەڕۆژوو بوو تا نیوەڕۆ، ئینجا بێهۆش کەوت، جا ئەمە پێش دابەزینی ئەم ئایەتە بوو، کە خوا دەربارەی دایبەزاند.

**٢١٦٩-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ ﴿١٨٧﴾ ﴾البقرة، قَالَ: هُوَ سَوَادُ اللَّيْلِ وَبَيَاضُ النَّهَارِ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩١٥، وأبو داود: ٢٣١٤، والترمذي: ٢٩٦٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩١٦ و ٤٥٠٩ و ٤٥١٠، ومسلم: ١٠٩٠، وأبو داود: ٢٣٤٩، والترمذي: ٢٩٧٠.




**واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی فەرمایشتی خوا: ﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ ١٨٧﴾ البقرة، فەرمووی: بریتیە لە تاریکایی شەوو سپیایی ڕۆژ.**

## چۆنیەتی بەرەبەیان

**٢١٧٠-** «عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ بِلَالاً يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ لِيُنَبِّهَ نَائِمَكُمْ وَيُرْجِعَ قَائِمَكُمْ، وَلَيْسَ الْفَجْرُ أَنْ يَقُولَ: هَكَذَا «وَأَشَارَ بِكَفِّهِ»، وَلَكِنِ الْفَجْرُ أَنْ يَقُولَ: هَكَذَا «وَأَشَارَ بِالسَّبَابَتَيْنِ»»[1].

**واتە: ئیبنو مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بیلال بە شەو بانگ دەدات بۆ ئەوەی خەوتوەکانتان بە ئاگا بێنێتەوەو، ئەوەشتان شەونوێژ دەکات بیگەڕێنێتەوە بۆ لای کارو بارەکانی، ئەوە بەرەبەیان نیە کە ئاوا بێت «ئاماژەی بۆ ناو لەپی دەستی کرد» بەڵکو بەرەبەیان بەم شێوەیەیە: «ئاماژەی بەهەردوو پەنجەی شایەتمانی کرد»، (واتە: دەبێ ڕوناکیەکە درێژ بێتەوە بۆ ئەوپەڕی ئاسمان گشتی دابگرێت).**

**٢١٧١-** «عَنْ سَمُرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يَغُرَّنَّكُمْ أَذَانُ بِلَالٍ، وَلَا هَذَا الْبَيَاضُ حَتَّى يَنْفَجِرَ الْفَجْرُ هَكَذَا وَهَكَذَا «يَعْنِي مُعْتَرِضاً» قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَبَسَطَ بِيَدَيْهِ يَمِيناً وَشِمَالاً مَادّاً يَدَيْهِ»[2].

**واتە: سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نە بانگی بیلال فریوتان بدات، وە نە ئەم سپیاییەی تا بەرەبەیان دەردەکەوێ بەم شێوەو بەم شێوەیە «واتە: بە پانایی» ئەبو داود (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی فەرموودەکە) وتوویەتی: هەردوو دەستی درێژ کرد بەلای ڕاست و چەپدا دەستەکانی دەهێناو دەبرد.**

## پێشکەوتن بەسەر مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو گرتن

**٢١٧٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا تَقَدَّمُوا قَبْلَ الشَّهْرِ بِصِيَامٍ، إِلَّا رَجُلٌ كَانَ يَصُومُ صِيَاماً أَتَى ذَلِكَ الْيَوْمُ عَلَى صِيَامِهِ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٤١ و ٤٢ و ٤٣ و ١٠٩٤/٤٤، وأبو داود: ٢٣٤٦، والترمذي: ٧٠٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩١٤، ومسلم: ١٠٨٢، وأبو داود: ٢٣٣٥، والترمذي: ٦٨٤ و ٦٨٥، وإبن ماجه: ١٦٥٠.




**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێش مانگی ڕەمەزان مەکەون بە ڕۆژوو گرتن، مەگەر کەسێک خۆی ڕۆژووگر بێت ئەو ڕۆژەش هاتبێ بەسەر ڕۆژوو گرتنەکەیدا (وەک دووشەم و پێنج شەم).**

## باسی جیاوازی لەسەر یەحیای کوڕی ئەبو کەثیرو موحەممەدی کوڕی عەمر لەسەر ئەبو سەلەمە لە فەرموودەکەدا

**٢١٧٣-** «عَنْ مُحَمَّدُ بْنُ شُعَيْبٍ، قَالَ: أَنْبَأَنَا الأَوْزَاعِيُّ، عَنْ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَتَقَدَّمَنَّ أَحَدٌ الشَّهْرَ بِيَوْمٍ وَلَا يَوْمَيْنِ، إِلَّا أَحَدٌ كَانَ يَصُومُ صِيَاماً قَبْلَهُ فَلْيَصُمْهُ»[١].

**واتە: موحەممەدی کوڕی شوعەیب دەڵێ: ئەوزاعی بۆی باس کردین یەحیا وتی: ئەبو سەلەمە بۆی باس کردین وتی: ئەبو هورەیرە ﷺ هەواڵی پێدام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با یەکێک لە ئێوە پێشی مانگی ڕەمەزان نەکەوێ بە ڕۆژووگرتنی ڕۆژێک، یان دوو ڕۆژ، مەگەر کەسێک ڕۆژووی گرتبێ لە پێشتر (واتە: ڕاهاتبێ لەگەڵ ڕۆژووی سوننەت) ئەوە با ڕۆژوو بگرێ (ئەگەر ڕۆژووەکە لەگەڵ ڕۆژووگرتنی سوننەتی ئەو تێکی کردەوە).**

**٢١٧٤-** «عَنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَتَقَدَّمُوا الشَّهْرَ بِصِيَامِ يَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ إِلَّا أَنْ يُوَافِقَ ذَلِكَ يَوْماً كَانَ يَصُومُهُ أَحَدُكُمْ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: هَذَا خَطَأٌ»[٢].

**واتە: ئەبو خالد دەگێڕێتەوە: لە موحەممەدی کوڕی عەمر لە ئەبو سەلەمەوە، ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێشی مانگی ڕەمەزان مەکەون بە ڕۆژووگرتنی ڕۆژێک، یان دوو ڕۆژ، مەگەر ئەو ڕۆژە ڕێک بێتەوە لەگەڵ ئەو ڕۆژەدا کە یەکێک لە ئێوە ڕۆژووی تێدا گرتووە (بەردەوام لە مانگەکانی تر).**

---

(١) صحيح.

(٢) حسن صحيح.

## باسی فەرموودەی ئەبو سەلەمە لەو بارەوە

**٢١٧٥-** «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ إِلَّا أَنَّهُ كَانَ يَصِلُ شَعْبَانَ بِرَمَضَانَ»[١].

**واتە:** سالم دەگێڕێتەوە: لە ئەبو سەلەمە، لە دایکی سەلەمە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: هەرگیز پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە دوو مانگ بەدوای یەکتردا بە ڕۆژوو بووبێ، مەگەر ئەوە نەبێ شەعبانی دەگەیاند بە ڕەمەزان بە ڕۆژوو گرتن.

## جیاوازی لەسەر موحەممەدی کوڕی ئیبڕاهیم لە فەرموودەکەدا

**٢١٧٦-** «عَنْ تَوْبَةَ الْعَنْبَرِيِّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصِلُ شَعْبَانَ بِرَمَضَانَ»[٢].

**واتە:** تەوبەی عەنبەری دەگێڕێتەوە: لە موحەممەدی کوڕی ئیبڕاهیم، لە ئەبو سەلەمە، لە دایکی سەلەمە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەعبانی دەگەیاند بە ڕەمەزان بە ڕۆژوو گرتن.

**٢١٧٧-** «عَن أُسَامَةَ بْنُ زَيْدٍ ، أَنَّ مُحَمَّدَ بْنَ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَهُ عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنْ صِيَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ لَا يُفْطِرُ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ لَا يَصُومُ، وَكَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ أَوْ عَامَّةَ شَعْبَانَ»[٣].

**واتە:** ئوسامەی کوڕی زەید دەگێڕێتەوە: موحەممەدی کوڕی ئیبڕاهیم بۆی باسکردوە لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان کە ئەو پرسیاری لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) کرد دەربارەی ڕۆژوو گرتنی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ (عائیشە خوا لێی ڕازی بێ) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ (مانگ هەبوو) ئەوەندە ڕۆژووی دەگرت تا

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٣٣٦، والترمذي: ٧٣٦، وإبن ماجه: ١٦٤٨.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٦٩، ومسلم: ١٧٥ و ١١٥٦/١٧٦، وأبو داود: ٢٤٣٤، والترمذي: ٧٣٧، وإبن ماجه: ١٧١٠.




**دەمانوت ڕەنگە نەیشکێنێت، مانگی دیکەش هەبوو بە ڕۆژوو نەدەبوو دەمانوت ڕەنگە ئەم مانگە بەڕۆژوو نەبێت، لە مانگی شەعبانیشدا بە ڕۆژوو دەبوو، یان شەعبان بە گشتی (بە ڕۆژوو دەبوو).**

**٢١٧٨-** «عَنِ ابْنِ الْهَادِ، أَنَّ مُحَمَّدَ بْنَ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَهُ عَنْ أَبِي سَلَمَةَ يَعْنِي ابْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: لَقَدْ كَانَتْ إِحْدَانَا تُفْطِرُ فِي رَمَضَانَ فَمَا تَقْدِرُ عَلَى أَنْ تَقْضِيَ حَتَّى يَدْخُلَ شَعْبَانُ ، وَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ فِي شَهْرٍ مَا يَصُومُ فِي شَعْبَانَ، كَانَ يَصُومُهُ كُلَّهُ إِلَّا قَلِيلاً بَلْ كَانَ يَصُومُهُ كُلَّهُ»[١].

**واتە: ئیبنو هاد دەگێڕێتەوە: موحەممەدی کوڕی ئیبراهیم بۆی باسکردوە لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بێگومان یەکێک لە ئێمەی ئافرەتان ڕۆژووی دەشکاند لە ڕەمەزاندا (بە هۆی عوزرێکی شەرعی) توانای نەبوو قەزای بکاتەوە تا دەچووە ناو مانگی شەعبان، وە پێغەمبەری خوا ﷺ لە هیچ مانگێکدا بە ڕۆژوو نەدەبوو وەکو ئەوەی لە شەعباندا بە ڕۆژوو بوو، هەموو ئەو مانگەی دەگرت تەنها کەمێکی نەبێت بەڵکو (هەندێ جار) ئەو مانگەی بە گشتی دەگرت.**

## باسی جیاوازی دەستەواژەی ئەوانەی وتەکەی عائیشەیان گواستۆتەوە لە فەرموودەکە

**٢١٧٩-** «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا فَقُلْتُ: أَخْبِرِينِي عَنْ صِيَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَتْ: كَانَ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ قَدْ صَامَ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ قَدْ أَفْطَرَ، وَلَمْ يَكُنْ يَصُومُ شَهْراً أَكْثَرَ مِنْ شَعْبَانَ كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ إِلَّا قَلِيلاً، كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ كُلَّهُ»[٢].

**واتە: ئەبو سەلەمە دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) وتم: هەواڵم بدەرێ دەربارەی ڕۆژوو گرتنی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: ڕۆژووی دەگرت تا دەمانوت هەر بەردەوام دەبێ، وە ڕۆژوویشی دەشکاند تا دەمانوت ئیتر ڕۆژوو ناگرێ، هیچ مانگێک ئەوەندەی مانگی شەعبان زۆرتر بە ڕۆژوو نەدەبوو، (هەندێ جار) مانگی شەعبان بە ڕۆژوو دەبوو کەمێکی نەبێ، بەڵکو (هەندێ جار) هەموو شەعبان بە ڕۆژوو دەبوو.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**٢١٨٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي شَهْرٍ مِنَ السَّنَةِ أَكْثَرَ صِيَاماً مِنْهُ فِي شَعْبَانَ، كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ كُلَّهُ»(١).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هیچ مانگێک لە ساڵەکەدا ئەوەندەی شەعبان بە ڕۆژوو نەدەبوو، هەموو مانگی شەعبان بە ڕۆژوو دەبوو.**

**٢١٨١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَصُومُ شَعْبَانَ»(٢).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ مانگی شەعبان بە ڕۆژوو دەبوو.**

**٢١٨٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: لَا أَعْلَمُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَرَأَ الْقُرْآنَ كُلَّهُ فِي لَيْلَةٍ، وَلَا قَامَ لَيْلَةً حَتَّى الصَّبَاحِ، وَلَا صَامَ شَهْراً كَامِلاً قَطُّ غَيْرَ رَمَضَانَ»(٣).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: وا نازانم پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو قورئانی لە شەوێکدا خوێندبێ، هەروەها شەوێک هەڵسابێ بۆ شەو نوێژ تا بەیانی، هەروەها مانگێک بە تەواوی بە ڕۆژوو بووبێ، جگە لە ڕەمەزان.**

**٢١٨٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَ: سَأَلْتُهَا عَنْ صِيَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ قَدْ صَامَ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ قَدْ أَفْطَرَ، وَلَمْ يَصُمْ شَهْراً تَامّاً مُنْذُ أَتَى الْمَدِينَةَ إِلَّا أَنْ يَكُونَ رَمَضَانُ»(٤).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەربارەی (چۆنیەتی) ڕۆژووی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژووی دەگرت تا دەمانوت هەر بەردەوام دەبێ، وە ڕۆژوویشی دەشکاند تا دەمانوت ئیتر ڕۆژوو ناگرێ، وە هیچ مانگێک بە تەواوی نەیگرتووە لەو کاتەی هاتە مەدینە، جگە لە ڕەمەزان نەبێ.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**٢١٨٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ، قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي صَلَاةَ الضُّحَى؟ قَالَتْ: لَا، إِلَّا أَنْ يَجِيءَ مِنْ مَغِيبِهِ، قُلْتُ: هَلْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ شَهْراً كُلَّهُ؟ قَالَتْ: لَا، مَا عَلِمْتُ صَامَ شَهْراً كُلَّهُ إِلَّا رَمَضَانَ، وَلَا أَفْطَرَ حَتَّى يَصُومَ مِنْهُ حَتَّى مَضَى لِسَبِيلِهِ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق دەڵێ: بە عائیشەم (خوا لێی ڕازی بێ) وت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد؟ وتی: نا، مەگەر لە گەشتێکدا بهاتایەتەوە، وتم: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ مانگێک بە تەواوی بە ڕۆژوو دەبوو؟ وتی: نا، نەمزانیوە مانگێک بە تەواوی بە ڕۆژوو بووبێ جگە لە ڕەمەزان، هەروەها مانگیش بەردەوام بێ ڕۆژوو نەبووە حەتمەن ڕۆژی تێدا گرتووە، تا کۆچی دوایی کرد.**

**٢١٨٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ، قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي صَلَاةَ الضُّحَى؟ قَالَتْ: لَا، إِلَّا أَنْ يَجِيءَ مِنْ مَغِيبِهِ، قُلْتُ: هَلْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَهُ صَوْمٌ مَعْلُومٌ سِوَى رَمَضَانَ؟ قَالَتْ: وَاللَّهِ إِنْ صَامَ شَهْراً مَعْلُوماً سِوَى رَمَضَانَ حَتَّى مَضَى لِوَجْهِهِ وَلَا أَفْطَرَ حَتَّى يَصُومَ مِنْهُ»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق دەڵێ: بە عائیشەم (خوا لێی ڕازی بێ) وت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد؟ وتی: نا، مەگەر لە سەفەرێکیدا بهاتایەتەوە، وتم: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێکی دیاریکراوی هەبوو جگە لە ڕەمەزان تێدا بەڕۆژوو بێت؟ وتی: سوێند بە خوا جگە لە ڕەمەزان هیچ مانگێک بە تەواوی بە ڕۆژوو نەبووە تا کۆچی دوایی کرد، هەروەها مانگێکیش بەردەوام بێ ڕۆژووگرتن نەبووە، هەر ڕۆژووی تێدا گرتووە.**

## باسی جیاوازی لەسەر خالدی کوڕی مەعدان لەم فەرموودەدا

**٢١٨٦-** «عَنْ بَحِيرٌ، عَنْ خَالِدٍ، عَنْ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ الصِّيَامِ، فَقَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ كُلَّهُ، وَيَتَحَرَّى صِيَامَ الاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٧٢ و ١٧٣ و ١١٥٦/١٧٤، والترمذي: ٧٦٨.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: بوحەیر دەگێڕێتەوە: لە خالد، لە جوبەیری کوڕی نوفەیر، کە پیاوێک پرسیاری کرد لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەربارەی ڕۆژووگرتن، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ شەعبانی دەگرت بە گشتی، هەروەها دووشەمەان و پێنج شەمانیش.

**٢١٨٧-** «عَنْ ثَوْرٌ، عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ، عَنْ رَبِيعَةَ الْجُرَشِيِّ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ شَعْبَانَ وَرَمَضَانَ وَيَتَحَرَّى الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسَ»[1].

واتە: ثەور دەگێڕێتەوە: خالدی کوڕی مەعدان، لە ڕەبیعەی جورەشی، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەعبان و ڕەمەزانی دەگرت، دووشەمەان و پێنج شەمانیش.

## ڕۆژوو گرتنی ئەو ڕۆژەی گومانی تێدایە کە ئاخۆ ڕەمەزانە، یان شەعبان؟

**٢١٨٨-** «عَنْ صِلَةَ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَمَّارٍ ﷺ فَأُتِيَ بِشَاةٍ مَصْلِيَّةٍ، فَقَالَ: كُلُوا، فَتَنَحَّى بَعْضُ الْقَوْمِ. قَالَ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ عَمَّارٌ: مَنْ صَامَ الْيَوْمَ الَّذِي يُشَكُّ فِيهِ فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ ﷺ»[2].

واتە: صیلە دەڵێ: ئێمە لەلای عەممار ﷺ بووین بەرخێکی برژاویان هێنا، وتی: بخۆن، یەکێک لە خەڵکەکە هاتە دواوە وتی: من بەڕۆژووم، عەممار ﷺ وتی: هەر کەس ئەم ڕۆژە بگرێ کە گومانی تێدایە ئەوە سەرپێچی باوکی قاسمی کردوە ﷺ.

**٢١٨٩-** «عَنْ سِمَاكٍ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عِكْرِمَةَ فِي يَوْمٍ قَدْ أُشْكِلَ مِنْ رَمَضَانَ هُوَ أَمْ مِنْ شَعْبَانَ. وَهُوَ يَأْكُلُ خُبْزاً وَبَقْلاً وَلَبَناً، فَقَالَ لِي: هَلُمَّ، فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ، قَالَ وَحَلَفَ بِاللَّهِ: لَتُفْطِرَنَّ. قُلْتُ: سُبْحَانَ اللَّهِ مَرَّتَيْنِ، فَلَمَّا رَأَيْتُهُ يَحْلِفُ لَا يَسْتَثْنِي تَقَدَّمْتُ قُلْتُ: هَاتِ الْآنَ مَا عِنْدَكَ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ، وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ، فَإِنْ حَالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ سَحَابَةٌ أَوْ ظُلْمَةٌ، فَأَكْمِلُوا الْعِدَّةَ عِدَّةَ شَعْبَانَ، وَلَا تَسْتَقْبِلُوا الشَّهْرَ اسْتِقْبَالاً، وَلَا تَصِلُوا رَمَضَانَ بِيَوْمٍ مِنْ شَعْبَانَ»[3].

واتە: سیماک دەڵێ: هاتمە ژوورەوە بۆ لای عیکریمە لە ڕۆژێکدا گومانی تێدا بوو نەدەزانرا ڕەمەزانە یان شەعبان، لە کاتێکدا ئەو نان و پاقلەو ماستی دەخوارد پێی وتم:

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٧٤٥، وابن ماجه: ١٦٤٩ و ١٧٣٩.

(٢) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٢٣٣٤، والترمذي: ٦٨٦، وابن ماجه: ١٦٤٥.

(٣) صحيح.





وەرە پێشەوە، وتم: من بەڕۆژووم، سوێندی خوارد بە خوا دەبێ بیشکێنیت، دوو جار، وتم: پاک و بێگەردی بۆ خوا، کاتێ بینیم سوێندی دەخواردو (إِنْ شَاءَ اللَّه)ی نەکردو وازی نەدەهێنا، چوومە پێشەوە وتم: ئەو بەڵگەی لەلاتە ئێستا بمدەرێ، وتی: گوێم لە ئیبنو عەبباس بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژوو بگرن بە بینینی (یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزان)، ڕۆژووش بشکێنن بە بینینی (یەکەم شەوی مانگی شەوال) ئەگەر هەور یان تاریکی بەرچاوی گرتن ئەوە مانگی شەعبان تەواو بکەن، بە هیچ شێوەیەک پێشی مانگەکە مەکەون، ڕەمەزان مەگەیەنن بە شەعبان بە ڕۆژێک ڕۆژوو گرتن لە شەعبان.

## ئاسانکاری لە ڕۆژوو گرتنی ئەو ڕۆژەی گومان تێدایە

٢١٩٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: أَلَا لَا تَقَدَّمُوا الشَّهْرَ بِيَوْمٍ أَوِ ثْنَيْنِ، إِلَّا رَجُلٌ كَانَ يَصُومُ صِيَاماً فَلْيَصُمْهُ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ئاگاداربن پێش مانگی ڕەمەزان مەکەون بەڕۆژوو گرتنی ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ، مەگەر کەسێک پێشتر ڕۆژووی گرتبێ، ئەوە با ڕۆژوو بگرێ.

## پاداشتی ئەو کەسەی لە ڕەمەزان شەونوێژ دەکات و ڕۆژووی تێدا دەگرێ بە بڕوا پێی بوونەوەو چاوەڕێی پاداشت دەکات، وە جیاوازیش لەسەر زوهری لەو فەرموودەدا

٢١٩١- «عَنِ ابْنِ أَبِي هِلَالٍ، عَنِ بْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[2].

واتە: ئیبنو ئەبی هیلال دەگێڕێتەوە: لە ئیبنو شهاب، لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕەمەزان (شەو) هەڵسێت شەونوێژ بکات، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، خوا لە هەموو گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبێت.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره.




**٢١٩٢-** «عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ رَاشِدٍ، عَنْ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ ﷺ، أَنَّ عَائِشَةَ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، أَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُرَغِّبُ النَّاسَ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَأْمُرَهُمْ بِعَزِيمَةِ أَمْرٍ فِيهِ، فَيَقُولُ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[١].

**واتە: ئیسحاقی كوڕی ڕاشید دەگێڕێتەوە: لە زوهریەوە، دەڵێ: عوروەی كوڕی زوبەیر ﷺ هەواڵی پێدام عائیشە خێزانی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوە پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵكی هاندەدا لەسەر هەڵسان بۆ شەونوێژ كردن لە ڕەمەزاندا، بەبێ ئەوەی فەرمانیان پێ بكات بە عەزیمەت و جەختكردنەوە، دەیفەرموو: هەر كەس ڕەمەزان هەڵسێت شەونوێژ بكات، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، خوا لە هەموو گوناهەكانی پێشووی خۆش دەبێت.**

**٢١٩٣-** «عَنْ يُونُسَ الْأَيْلِيِّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ ﷺ، أَنَّ عَائِشَةَ، أَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ يُصَلِّي فِي الْمَسْجِدِ، فَصَلَّى بِالنَّاسِ «وَسَاقَ الْحَدِيثَ، وَفِيهِ قَالَتْ» فَكَانَ يُرَغِّبُهُمْ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَأْمُرَهُمْ بِعَزِيمَةٍ، وَيَقُولُ: مَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، قَالَ: فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَالْأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ»[٢].

**واتە: یونسی ئەیلی دەگێڕێتەوە: زوهری وتوویەتی: عوروەی كوڕی زوبەیر ﷺ هەواڵی پێدام، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) هەواڵی پێداوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە نیوەی شەودا هاتەدەرەوە لە ناو مزگەوت نوێژی كرد، ئینجا بۆ خەڵكی نوێژی كرد، وە فەرموودەكەی باس كردو تیایدا عائیشە دەڵێ: هانیدەدان لە هەڵسان بۆ شەونوێژ لە ڕەمەزاندا بەبێ ئەوەی بە عەزیمەت و جەختكردنەوە فەرمانیان پێ بكات، وە دەیفەرموو: هەر كەس لە شەوی قەدردا هەڵسێت شەونوێژ بكات، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، خوا لە هەموو گوناهەكانی پێشووی خۆش دەبێت، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ كۆچی دوایی كرد كارەكە هەر بەم شێوەیە بوو.**

**٢١٩٤-** «عَن يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ فِي رَمَضَانَ: مَنْ قَامَهُ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٢٩، ومسلم: ٧٦١/١٧٨، وأبو داود: ١٣٧٣.

(٣) صحيح.




واته: یونس دەگێڕێتەوە: لە ئیبنو شیهاب دەڵێ: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان هەواڵی پێدام ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەربارەی ڕەمەزان دەیفەرموو: هەر کەس هەڵسێت شەونوێژی تێدا بکات بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ.

**٢١٩٥-** «عَن بِشْرُ بْنُ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ ﷺ، أَنَّ عَائِشَةَ، أَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ، فَصَلَّى فِي الْمَسْجِدِ «وَسَاقَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ فِيهِ» وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُرَغِّبُهُمْ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَأْمُرَهُمْ بِعَزِيمَةِ أَمْرٍ فِيهِ، فَيَقُولُ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[١].

واته: بیشری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە: زوهری وتوویەتی: عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ هەواڵی پێدام، بێگومان عائیشە هەواڵی پێداوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە نیوەی شەودا هاتە دەرەوە لە مزگەوت نوێژی کرد «وە فەرموودەکەی باس کردو تیایدا عائیشە دەڵێ:» پێغەمبەری خوا ﷺ هانیدەدان بۆ هەڵسانی شەونوێژ لە ڕەمەزاندا بەبێ ئەوەی بە عەزیمەت فەرمانیان پێ بکات، وە دەیفەرموو: هەر کەس لە ڕەمەزاندا هەڵسێت شەونوێژ بکات، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ.

**٢١٩٦-** «عَن بِشْرُ بْنُ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لِرَمَضَانَ مَنْ قَامَهُ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٢].

واته: بیشری کوڕی شوعەیب، لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە: زوهری دەڵێ: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان بۆی باس کردین ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەربارەی ڕەمەزان دەیفەرموو: هەر کەس شەونوێژی تێدا بگرێ و بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٢١٩٧-** «عَنْ صَالِحٍ، عَنْ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ أَبَا سَلَمَةَ، أَخْبَرَهُ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[١].

**واتە: صاڵح دەگێڕێتەوە: لە ئیبنو شیهاب، کە ئەبو سەلەمە هەواڵی داوە، ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕەمەزان هەستێت شەونوێژ بکات، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ.**

**٢١٩٨-** «عَن مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُرَغِّبُ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَأْمُرَهُمْ بِعَزِيمَةٍ، قَالَ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٢].

**واتە: مەعمەر دەگێڕێتەوە: لە زوهری، لە باوکی سەلەمەوە، ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هانی دەدان لە هەستان بۆ شەونوێژ کردن لە مانگی ڕەمەزاندا بەبێ ئەوەی بە عەزیمەت فەرمانیان پێ بکات، دەیفەرموو: هەرکەس ڕەمەزان هەستێت شەونوێژ بکات، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ.**

**٢١٩٩-** «عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٣].

**واتە: مالک دەگێڕێتەوە: لە ئیبنو شیهاب، لە حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان، لە ئەبو هورەیرە ﵁ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس ڕەمەزان هەڵسێت شەونوێژ بکات، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ.**

**٢٢٠٠-** «عَنْ مَالِكٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




واتە: مالک دەڵێ: ئیبنو شیهاب بۆی باس کردم لە حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان لە ئەبو هورەیرە ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕەمەزان هەڵسێت شەونوێژ بکات، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ.

**٢٢٠١-** «عَنْ مَالِكٍ، قَالَ الزُّهْرِيُّ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَحُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[١].

واتە: مالک دەگێڕێتەوە: زوهری دەڵێ: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان و حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان بۆمیان باس کرد، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس ڕەمەزان هەڵسێت شەونوێژ بکات، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ.

**٢٢٠٢-** «عَن سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ صَامَ رَمَضَانَ «وَفِي حَدِيثِ قُتَيْبَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنْ قَامَ شَهْرَ رَمَضَانَ» إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٢].

واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە: لە زوهری، لە ئەبو سەلەمە، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێ «وە لە فەرموودەی قوتەیبە هاتوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس شەوانی مانگی ڕەمەزان زیندوو بکاتەوە» بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ، وە هەر کەس هەڵسێت بۆ شەوی قەدر، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ.

**٢٢٠١-** «عَنْ مَالِكٍ، قَالَ الزُّهْرِيُّ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَحُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: مالک دەگێڕێتەوە: زوهری دەڵێ: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان و حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان بۆمیان باس کرد، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس ڕەمەزان هەڵسێت شەونوێژ بکات، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ.

**٢٢٠٢-** «عَن سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَن صَامَ رَمَضَانَ «وَفِي حَدِيثِ قُتَيْبَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنْ قَامَ شَهْرَ رَمَضَانَ» إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[١].

واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە: لە زوهری، لە ئەبو سەلەمە، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێ «وە لە فەرموودەی قوتەیبە هاتوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس شەوانی مانگی ڕەمەزان زیندوو بکاتەوە» بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ، وە هەر کەس هەڵسێت بۆ شەوی قەدر، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ.

**٢٢٠٣-** «عَن سُفْيَانَ، عَنْ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَن صَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٢].

واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە: لە زوهری، لە ئەبو سەلەمە، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێ پێ بڕوای پێی هەبێت و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ.

**٢٢٠٤-** «عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٣].

واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە: لە زوهری، لە ئەبو سەلەمە، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێ بڕوای پێی هەبێت و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٨، وإبن ماجه: ١٦٤١.

(٣) صحيح.




**٢٢٠٥-** «عَنِ ابْنِ فُضَيْلٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[١].

**واتە: ئیبنو فوضەیل دەڵێ: یەحیای کوڕی سەعید بۆی باس کردین، لە ئەبو سەلەمە، لە ئەبو هورەیرە ﵁ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێ بڕوای پێی هەبێت و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ.**

## باسی جیاوازی یەحیای کوڕی ئەبو کەثیرو نەزری کوڕی شەیبان لە فەرموودەکەدا

**٢٢٠٦-** «عَن هِشَام، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٢].

**واتە: هیشام دەگێڕێتەوە: لە یەحیای کوڕی ئەبو کەثیر، لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﵁ بۆی باس کردم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕەمەزان هەستێت بۆ شەونوێژ، بڕوای پێی هەبێت و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ، وە هەر کەس هەڵسێت بۆ شەوی قەدر، بڕوای پێی هەبێت و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ.**

**٢٢٠٧-** «عَن مُعَاوِيَةَ بْن سَلَّامٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ قَامَ شَهْرَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٣].

**واتە: موعاوەیەی کوڕی سەلام دەگێڕێتەوە: لە یەحیای کوڕی ئەبو کەثیر، لە ئەبو سەلەمە، لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.





ڕەمەزان هەڵسێت بۆ شەونوێژ، بڕوای پێی هەبێت و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ، وە هەر کەس هەڵسێت بۆ شەوی قەدر، بڕوای پێی هەبێت و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێ.

**٢٢٠٨-** «عَنْ نَصْرِ بْنِ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنِي النَّضْرُ بْنُ شَيْبَانَ، «أَنَّهُ لَقِيَ أَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، فَقَالَ لَهُ: حَدِّثْنِي بِأَفْضَلِ شَيْءٍ سَمِعْتَهُ يُذْكَرُ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ»، فَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ، حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ ذَكَرَ شَهْرَ رَمَضَانَ فَفَضَّلَهُ عَلَى الشُّهُورِ، وَقَالَ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً خَرَجَ مِنْ ذُنُوبِهِ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ»[١].

واتە: نەصری کوڕی عەلی دەڵێ: نەضری کوڕی شەیبان بۆی باسکردم، کە گەیشتووە بە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان پێی وت: چاکترین شتم بۆ باس بکە بیستبێتت لە مانگی ڕەمەزاندا باس کرابێت، ئەبو سەلەمە وتی: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ بۆی باسکردم پێغەمبەری خوا ﷺ باسی مانگی ڕەمەزانی کرد فەزڵیدا بەسەر هەموو مانگەکاندا، وە فەرمووی: هەر کەس ڕەمەزان هەڵسێت بۆ شەونوێژ، بڕوای پێی هەبێت چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی دەردەچێ وەکو ئەو ڕۆژەی لە دایک بووە.

**٢٢٠٩-** «عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ الْفَضْلِ قَالَ: حَدَّثَنَا النَّضْرُ بْنُ شَيْبَانَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ، فَذَكَرَ مِثْلَهُ، وَقَالَ: مَنْ صَامَهُ وَقَامَهُ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً»[٢].

واتە: قاسمی کوڕی فەضل دەڵێ: نەضری کوڕی شەیبان بۆی باس کردین، لە ئەبو سەلەمە ﷺ هەر وەکو ئەو فەرموودەی باس کرد، وە فەرمووی: هەرکەس ڕۆژووی تێدا بگرێ و شەونوێژی تێدا بکات، بڕوای پێی هەبێت و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا.

**٢٢١٠-** «عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ الْفَضْلِ، قَالَ: حَدَّثَنَا النَّضْرُ بْنُ شَيْبَانَ، قَالَ: «قُلْتُ لِأَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، حَدِّثْنِي بِشَيْءٍ سَمِعْتَهُ مِنْ أَبِيكَ، سَمِعَهُ أَبُوكَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، لَيْسَ بَيْنَ أَبِيكَ وَبَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَحَدٌ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ قَالَ: نَعَمْ» حَدَّثَنِي أَبِي، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

---

(١) ضعيف. أخرجه إبن ماجه: ١٣٢٨.

(٢) ضعيف.




إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فَرَضَ صِيَامَ رَمَضَانَ عَلَيْكُمْ وَسَنَنْتُ لَكُمْ قِيَامَهُ، فَمَنْ صَامَهُ وَقَامَهُ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، خَرَجَ مِنْ ذُنُوبِهِ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ»[١].

**واتە: قاسمی کوڕی فەضل دەڵێ: نەضری کوڕی شەیبان بۆی باس کردین وتی: بە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانم ﷺ وت: باسی شتێکم بۆ بکە لە باوکتەوە بیستبێتت، باوکیشت لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستبێت دەربارەی مانگی ڕەمەزان، لە نێوان باوکت و پێغەمبەردا هیچ کەس بوونی نەبێت، وتی: بەڵێ، باوکم بۆی باسکردم وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا (تَبَارَكَ وَتَعَالَى) ڕۆژووی ڕەمەزانی فەرز کردوە لەسەرتان منیش شەونوێژی ئەو مانگەم بۆ کردوون بە سوننەت، هەر کەس ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت و شەونوێژی تێدا بکات، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، لە گوناهەکانی دەردەچێ، وەکو ئەو ڕۆژەی لە دایک بووە.**

## فەزڵ و چاکەی ڕۆژوو، وە جیاوازی لەسەر ئەبو ئیسحاق لە فەرموودەی عەلی کوڕی ئەبو طالیب لەوبارەوە

**٢٢١١-** «عَنْ زَيْدٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَقَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى، يَقُولُ: الصَّوْمُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، وَلِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ حِينَ يُفْطِرُ، وَحِينَ يَلْقَى رَبَّهُ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ»[٢].

**واتە: زەید دەگێڕێتەوە: لە ئەبو ئیسحاق، لە عەبدوڵڵای کوڕی حارث، لە عەلی کوڕی ئەبو طالیبەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خوا (تَبَارَكَ وَتَعَالَى) دەفەرموێ: ڕۆژوو بۆ منەو تەنها منیش پاداشتی دەدەمەوە، بۆ ڕۆژووەوان دوو خۆشی هەیە کاتێ کە دەیشکێنێ، کاتێکیش دەگات بە پەروەردگاری، سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بە دەستە بۆنی دەمی ڕۆژووەوان خۆشترە لە لای خوا لە بۆنی میسک.**

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح لغيره.




**٢٢١٢-** «عَنْ شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَقَ، عَنْ أَبِي الْأَحْوَصِ، قَالَ: عَبْدُ اللَّهِ ﵁: قَالَ اللَّهُ ﷻ: الصَّوْمُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، وَلِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ فَرْحَةٌ حِينَ يَلْقَى رَبَّهُ، وَفَرْحَةٌ عِنْدَ إِفْطَارِهِ، وَلَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ»[١].

**واتە: شوعبە دەگێڕێتەوە: لە ئەبو ئیسحاق، لە ئەبو ئەحوەصەوە، عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێ: خوا ﷻ فەرموویەتی: ڕۆژوو بۆ منەو تەنها منیش پاداشتی دەدەمەوە، بۆ ڕۆژووەوان دوو خۆشی هەیە کاتێ کە دەیشکێنێ، کاتێکیش دەگات بە پەروەردگاری، سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بە دەستە بۆنی دەمی ڕۆژووەوان خۆشترە لە لای خوا لە بۆنی میسک.**

## باسی جیاوازی لە سەر ئەبو صاڵح لەم فەرموودەیەدا

**٢٢١٣-** «عَنْ أَبِي سِنَانٍ ضِرَارُ بْنُ مُرَّةَ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﵁ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى، يَقُولُ: الصَّوْمُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ. وَلِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ إِذَا أَفْطَرَ فَرِحَ، وَإِذَا لَقِيَ اللَّهَ فَجَزَاهُ فَرِحَ، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ»[٢].

**واتە: ئەبو سینان ضیراری کوڕی موڕڕە دەگێڕێتەوە: لە ئەبو صاڵح، لە ئەبو سەعیدەوە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا (تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ) دەفەرموێ: ڕۆژوو بۆ منەو تەنها منیش پاداشتی دەدەمەوە، بۆ ڕۆژووەوان دوو خۆشی هەیە کاتێ کە ڕۆژوو دەشکێنێ دڵخۆش دەبێ، کاتێکیش دەگات بە پەروەردگاری و پاداشتی دەداتەوە دڵخۆش دەبێ، سوێند بەو خوایەی نەفسی موحەممەدی بە دەستە بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لە لای خوا خۆشترە لە بۆنی میسک.**

**٢٢١٤-** «عَنِ الْمُنْذِرِ بْنِ عُبَيْدٍ، حَدَّثَهُ عَنْ أَبِي صَالِحٍ السَّمَّانِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الصِّيَامُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، وَالصَّائِمُ يَفْرَحُ مَرَّتَيْنِ عِنْدَ فِطْرِهِ، وَيَوْمَ يَلْقَى اللَّهَ. وَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ»[٣].

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٥/١١٥١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٠٤ و ٧٤٩٢، ومسلم: ١٦٣ و ١٦٥/١١٥١، وإبن ماجه: ١٦٣٨ و ١٦٩١ و ٣٨٢٣.

**واتە: مونزیری کوڕی عوبەید دەگێڕێتەوە: ئەبو صاڵحی کوڕی سەلمان بۆی باس کردوە لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژوو بۆ منەو تەنها منیش پاداشتی دەدەمەوە، ڕۆژووەوان دوو جار دڵخۆش دەبێ لە کاتی شکاندنی، وە لەو کاتەی دەگات بە پەروەردگاری، بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لە لای خوا خۆشترە لە بۆنی میسک.**

**٢٢١٥-** «عَنْ الْأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَا مِنْ حَسَنَةٍ عَمِلَهَا ابْنُ آدَمَ إِلَّا كُتِبَ لَهُ عَشْرُ حَسَنَاتٍ إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ، قَالَ اللَّهُ ﷻ: إِلَّا الصِّيَامَ فَإِنَّهُ لِي، وَأَنَا أَجْزِي بِهِ يَدَعُ شَهْوَتَهُ وَطَعَامَهُ مِنْ أَجْلِي، الصِّيَامُ جُنَّةٌ. لِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ: فَرْحَةٌ عِنْدَ فِطْرِهِ، وَفَرْحَةٌ عِنْدَ لِقَاءِ رَبِّهِ. وَلَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ»[1].

**واتە: ئەعمەش دەگێڕێتەوە: لە ئەبو صاڵح، لە ئەبو هورەیرە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەوەی ئادەم هەر چاکەیەک دەکات بێگومان خوا دە چاکەی بۆ دەنوسێت تا حەوت سەد ئەوەندە، خوا ﷻ فەرموویەتی: جگە لە ڕۆژوو، چونکە ڕۆژوو بۆ منەو تەنها منیش پاداشتی دەدەمەوە، ئەو کەسە واز لە حەزو ئارەزووی خواردن دەهێنێ لە پێناوی مندا، ڕۆژوو قەڵغانە، ڕۆژووەوان دوو خۆشی بۆ هەیە خۆشیەک لە کاتی شکاندنی، خۆشیەکیش لەو کاتەی دەگات بە پەروەردگاری. بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لە لای خوا خۆشترە لە بۆنی میسک.**

**٢٢١٦-** «عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ الزَّيَّاتِ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إِلَّا الصِّيَامَ هُوَ لِي، وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، وَالصِّيَامُ جُنَّةٌ، إِذَا كَانَ يَوْمُ صِيَامِ أَحَدِكُمْ فَلَا يَرْفُثْ وَلَا يَصْخَبْ، فَإِنْ شَاتَمَهُ أَحَدٌ أَوْ قَاتَلَهُ، فَلْيَقُلْ: إِنِّي صَائِمٌ. وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ. لِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ يَفْرَحُهُمَا إِذَا أَفْطَرَ فَرِحَ بِفِطْرِهِ، وَإِذَا لَقِيَ رَبَّهُ ﷻ فَرِحَ بِصَوْمِهِ»[2].

**واتە: عەطاء دەگێڕێتەوە: لە ئەبو صاڵحی زەییات، ئەو گوێی لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو کردەوەیەکی نەوەی ئادەم بۆ خۆیەتی تەنها ڕۆژوو نەبێ بۆ منەو منیش پاداشتی دەدەمەوە، ڕۆژوو قەڵغانە، کاتێ**

---

**(١) صحیح.**

**(٢) صحیح.**




یەکێک لە ئێوە لە ڕۆژێکدا بە ڕۆژو بوو با قسەی ناشرین و نەشیاو نەکات و هاوارو ژاوەژاو نەکات، جا ئەگەر کەسێ جنێوی پێدا، یان شەڕی لەگەڵ کرد با بڵێ: من بەڕۆژووم، سوێند بەو خوایەی نەفسی موحەممەدی بە دەستە بۆنی دەمی ڕۆژەوان لە لای خوا خۆشترە لە بۆنی میسک. ڕۆژووەوان دوو خۆشی بۆ هەیە دڵخۆش دەبێ پێیان: کاتێ کە ڕۆژوو دەشکێنێ، دڵخۆش دەبێ بە شکاندنی، کاتێکیش دەگات بە پەروەردگاری، دڵخۆش دەبێ بە ڕۆژووەکەی.

**٢٢١٧-** «عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ الزَّيَّاتُ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قَالَ اللَّهُ ﷻ: كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إِلَّا الصِّيَامَ هُوَ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، الصِّيَامُ جُنَّةٌ، فَإِذَا كَانَ يَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ فَلَا يَرْفُثْ، وَلَا يَصْخَبْ، فَإِنْ شَاتَمَهُ أَحَدٌ أَوْ قَاتَلَهُ، فَلْيَقُلْ: إِنِّي امْرُؤٌ صَائِمٌ. وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ، وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الْحَدِيثُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَسَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ»[1].

واتە: عەطائی کوڕی ئەبو ڕەباح دەڵێ: عەطائی زەیاد هەواڵی پێدام کە ئەو بیستوویەتی ئەبو هورەیرە ﷺ دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا ﷻ هەموو کردەوەیەکی نەوەی ئادەم بۆ خۆیەتی تەنها ڕۆژوو نەبێ بۆ منەو منیش پاداشتی دەدەمەوە، ڕۆژوو قەڵغانە، کاتێ یەکێک لە ئێوە لە ڕۆژێکدا بە ڕۆژوە با قسەی ناشرین و نەشیاو نەکات و هاوارو ژاوەژاو نەکات، جا ئەگەر کەسێ جنێوی پێدا، یان شەڕی لەگەڵ کرد، با بڵێ: من بە ڕۆژووم، سوێند بەو خوایەی نەفسی موحەممەدی بە دەستە بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لە لای خوا خۆشترە لە بۆنی میسک. ئەم فەرمودەیە ڕیوایەت کراوە لە ئەبو هورەیرەو سەعیدی کوڕی موسەییبیش.

**٢٢١٨-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ اللَّهُ ﷻ: كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إِلَّا الصِّيَامَ هُوَ لِي، وَأَنَا أَجْزِي بِهِ. وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَخُلْفَةُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ»[2].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەیب دەگێڕێتەوە: ئەبو هورەیرە ﷺ وتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوا ﷻ فەرموویەتی: هەموو کردەوەیەکی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٢٧، ومسلم: ١١٥١/١٦١، والترمذي: ٧٦٤.

نەوەی ئادەم بۆ خۆیەتی تەنها ڕۆژوو نەبێ بۆ منەو منیش پاداشتی دەدەمەوە، سوێند بەو خوایەی نەفسی موحەممەدی بە دەستە بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لە لای خوا خۆشترە لە بۆنی میسک.

**٢٢١٩-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: كُلُّ حَسَنَةٍ يَعْمَلُهَا ابْنُ آدَمَ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا، إِلَّا الصِّيَامَ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ»[١].

**واتە:** سەعیدی کوڕی موسەیب دەگێڕێتەوە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر چاکەیەک نەوەی ئادەم دەیکات دە ئەوەندە پاداشتی بۆ هەیە جگە لە ڕۆژوو بۆ منەو، منیش پاداشتی دەدەمەوە.

## باسی جیاوازی لەسەر موحەممەدی کوڕی ئەبو یەعقوب لە فەرموودەی ئەبو ئومامە دەربارەی فەزڵ و چاکەی ڕۆژووەوان

**٢٢٢٠-** «عَن مَهْدِيُّ بْنُ مَيْمُونٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي يَعْقُوبَ، قَالَ: أَخْبَرَنِي رَجَاءُ بْنُ حَيْوَةَ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: مُرْنِي بِأَمْرٍ آخُذُهُ عَنْكَ، قَالَ: عَلَيْكَ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَا مِثْلَ لَهُ»[٢].

**واتە:** مەهدی کوڕی مەیمون دەڵێ: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو یەعقوب دەڵێ: ڕەجائی کوڕی حەیوە هەواڵی پێدام لە ئەبو ئومامەوە ﷺ کە وتویەتی: چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: فەرمانم پێبکە بە کارێک لێت وەربگرم (کاری پێ بکەم) فەرمووی: دەستبگرە بە ڕۆژوو گرتنەوە چونکە هاوشێوەی نیە (لە پاداشت و گەورەیی).

**٢٢٢١-** «عَنْ جَرِيرِ بن حَازِمٍ عَن مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي يَعْقُوبَ الضَّبِّيَّ، حَدَّثَهُ عَنْ رَجَاءِ بْنِ حَيْوَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُمَامَةَ الْبَاهِلِيُّ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مُرْنِي بِأَمْرٍ يَنْفَعُنِي اللَّهُ بِهِ، قَالَ: عَلَيْكَ بِالصِّيَامِ فَإِنَّهُ لَا مِثْلَ لَهُ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.





**واته: جەریری کوڕی حازم دەگێڕێتەوە: لە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو یەعقوبی ضەببی، ڕەجائی کوڕی حەیوە دەڵێ: ئەبو ئومامەی باهیلی ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانم پێبکە بە کارێک بە هۆیە خوا سوودم پێبگەیەنێ، فەرمووی: دەستبگرە بە ڕۆژووەوە، چونکە هاوشێوەی نیە.**

**٢٢٢٢-** «عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي يَعْقُوبَ، عَنْ أَبِي نَصْرٍ، عَنْ رَجَاءِ بْنِ حَيْوَةَ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: عَلَيْكَ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَا عِدْلَ لَهُ»[1].

**واته: شوعبە دەگێڕێتەوە: لە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو یەعقوب، لە ئەبو نەصر، لە ڕەجائی کوڕی حەیوە، لە ئەبو ئومامە ﷺ، ئەو پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ چ کردەوەیەک چاکترینە؟ فەرمووی: دەستبگرە بە ڕۆژووەوە، چونکە هاوشێوەی نیە.**

**٢٢٢٣-** «عَنْ شُعْبَةُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي يَعْقُوبَ الضَّبِّيِّ، عَنْ أَبِي نَصْرٍ الْهِلَالِيِّ، عَنْ رَجَاءِ بْنِ حَيْوَةَ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مُرْنِي بِعَمَلٍ، قَالَ: عَلَيْكَ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَا عَدْلَ لَهُ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مُرْنِي بِعَمَلٍ، قَالَ: عَلَيْكَ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَا عِدْلَ لَهُ»[2].

**واته: شوعبە دەگێڕێتەوە: لە موحەممەدی کوڕی ئەبو یەعقوبی ضەببی، لە ئەبو نەصری هیلالی، لە ڕەجائی کوڕی حەیوە، لە ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانم پێبکە بە کردەوەیەک، فەرمووی: دەستبگرە بە ڕۆژووەوە، چونکە هاوشێوەی نیە، (دووبارە) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا فەرمانم پێبکە بە کردەوەیەک، فەرمووی: دەستبگرە بە ڕۆژووەوە، چونکە هاوشێوەی نیە.**

**٢٢٢٤-** «عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الصَّوْمُ جُنَّةٌ»[3].

**واته: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژوو قەڵغانە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.





**٢٢٢٥-** «عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الصَّوْمُ جُنَّةٌ»[١].

**واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژوو قەڵغانە.**

**٢٢٢٦-** «عَنْ مُعَاذٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الصَّوْمُ جُنَّةٌ»[٢].

**واتە: موعاز ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژوو قەڵغانە.**

**٢٢٢٧-** «عَنْ شُعْبَةَ، «قَالَ لِي الْحَكَمُ: سَمِعْتُهُ مِنْهُ مُنْذُ أَرْبَعِينَ سَنَةً، ثُمَّ» قَالَ الْحَكَمُ، وَحَدَّثَنِي بِهِ مَيْمُونُ بْنُ أَبِي شَبِيبٍ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ»[٣].

**واتە: شوعبە دەگێڕێتەوە: دەڵێ: حەکەم پێی وتم: ماوەی چل ساڵە ئەم فەرموودەیەم بیستووە (واتە: فەرموودەی ڕۆژوو قەڵغانە)، پاشان حەکەم (باسی سەنەدەکەی کرد)و وتی: مەیموونی کوڕی ئەبو شەبیب بۆی گێڕامەوە لە موعازی کوڕی جەبەلەوە ﷺ.**

**٢٢٢٨-** «عَنْ أَبِي صَالِحٍ الزَّيَّاتِ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الصِّيَامُ جُنَّةٌ»[٤].

**واتە: ئەبو صاڵحی زەییات دەگێڕێتەوە: ئەو گوێی لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ڕۆژوو قەڵغانە.**

**٢٢٢٩-** «عَنْ أَبِي صَالِحٍ الزَّيَّاتُ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الصِّيَامُ جُنَّةٌ»[٥].

**واتە: ئەبو صاڵحی زەییات دەگێڕێتەوە: ئەو گوێی لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژوو قەڵغانە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح.




**٢٢٣٠-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، أَنَّ مُطَرِّفًا، رَجُلاً مِنْ بَنِي عَامِرِ بْنِ صَعْصَعَةَ، حَدَّثَهُ أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ أَبِي الْعَاصِ، دَعَا لَهُ بِلَبَنٍ لِيَسْقِيَهُ، فَقَالَ مُطَرِّفٌ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ عُثْمَانُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: الصِّيَامُ جُنَّةٌ كَجُنَّةِ أَحَدِكُمْ مِنَ الْقِتَالِ»[١].

**واتە: سەعیدی کوڕی ئەبو هیند دەگێڕێتەوە: موتەڕڕیف پیاوێک بوو لە نەوەکانی عامیری کوڕی صەعصەعە، عوسمان داوای کرد شیر بۆ موتەڕڕیف بێنن بۆ ئەوەی بیخواتەوە، موتەڕڕیف وتی: من بەڕۆژووم، عوسمان وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ڕۆژوو قەڵغانە، وەکو قەڵغانی یەکێتان لە جەنگدا.**

**٢٢٣١-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، عَنْ مُطَرِّفٍ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ رضي الله عنه، فَدَعَا بِلَبَنٍ، فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: الصَّوْمُ جُنَّةٌ مِنَ النَّارِ كَجُنَّةِ أَحَدِكُمْ مِنَ الْقِتَالِ»[٢].

**واتە: سەعیدی کوڕی ئەبو هیند دەگێڕێتەوە: موتەڕڕیف دەڵێ: چوومە ژوورەوە بۆ لای عوسمانی کوڕی ئەبو لعاص رضي الله عنه، داوای کرد شیری بۆ بێنن، وتم: من بەڕۆژووم، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ڕۆژوو قەڵغانە لە ئاگر وەکو قەڵغانی یەکێتان لە جەنگدا.**

**٢٢٣٢-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِنْدٍ قَالَ: دَخَلَ مُطَرِّفٌ عَلَى عُثْمَانَ، نَحْوَهُ مُرْسَلٌ»[٣].

**واتە: سەعیدی کوڕی ئەبو هیند دەڵێ: موتەڕڕیف چووە ژوورەوە بۆ لای عوسمان، وەکو فەرموودەکەی پێشوو، بەڵام (مُرْسَل)ـە.**

**٢٢٣٣-** «عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ رضي الله عنه، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: الصَّوْمُ جُنَّةٌ مَا لَمْ يَخْرِقْهَا»[٤].

**واتە: ئەبو عوبەیدەوە رضي الله عنه، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ڕۆژوو قەڵغانە بە مەرجێک (ڕۆژووەوان) لەکەداری نەکات بە گوناهو غەیبەت کردن.**

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٦٣٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) ضعيف.




**٢٢٣٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الصِّيَامُ جُنَّةٌ مِنَ النَّارِ، فَمَنْ أَصْبَحَ صَائِماً، فَلَا يَجْهَلْ يَوْمَئِذٍ، وَإِنِ امْرُؤٌ جَهِلَ عَلَيْهِ فَلَا يَشْتُمْهُ وَلَا يَسُبَّهُ، وَلْيَقُلْ إِنِّي صَائِمٌ، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ»[١].

**واته: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژوو قەڵغانە لە ئاگر، هەر کەس بەیانی کردەوە بەڕۆژوو بوو با نەفامی نەکات ئەو ڕۆژە، ئەگەر کەسێک نەفامی بەرانبەر کرد با جنێوو قسەی نابەجێی پێنەڵێ، با بڵێ: من بەڕۆژووم، سوێند بەو خوایەی نەفسی موحەممەدی بە دەستە بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لە لای خوا خۆشترە لە بۆنی میسک.**

**٢٢٣٥-** «عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ ﷺ قَالَ: الصِّيَامُ جُنَّةٌ مَا لَمْ يَخْرِقْهَا»[٢].

**واته: ئەبو عوبەیدە ﷺ دەڵێ: ڕۆژوو قەڵغانە بە مەرجێک (ڕۆژووەوان) لەکەداری نەکات بە گوناهو غەیبەت کردن.**

**٢٢٣٦-** «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِ ﷺ قَالَ: لِلصَّائِمِينَ بَابٌ فِي الْجَنَّةِ يُقَالُ لَهُ الرَّيَّانُ، لَا يَدْخُلُ فِيهِ أَحَدٌ غَيْرُهُمْ، فَإِذَا دَخَلَ آخِرُهُمْ أُغْلِقَ، مَنْ دَخَلَ فِيهِ شَرِبَ وَمَنْ شَرِبَ لَمْ يَظْمَأْ أَبَداً»[٣].

**واته: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژووەوانەکان دەرگایەکیان بۆ هەیە لە بەهەشتدا پێی دەوترێ: ڕەییان، جگە لەوان کەس ناچێتە ناویەوە، کاتێ کۆتا کەسیان چووە نێویەوە دادەخرێ، هەر کەسیش بچێتە نێویەوە (ئاوی حەوزە کەوسەر) دەخواتەوە، هەر کەسیش (ئەم ئاوە) بخواتەوە هەرگیز تینووی نابێ.**

**٢٢٣٧-** «عَنْ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: حَدَّثَنِي سَهْلٌ: أَنَّ فِي الْجَنَّةِ بَاباً يُقَالُ لَهُ الرَّيَّانُ، يُقَالُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَيْنَ الصَّائِمُونَ؟ هَلْ لَكُمْ إِلَى الرَّيَّانِ، مَنْ دَخَلَهُ لَمْ يَظْمَأْ أَبَداً، فَإِذَا دَخَلُوا أُغْلِقَ عَلَيْهِمْ فَلَمْ يَدْخُلْ فِيهِ أَحَدٌ غَيْرُهُمْ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح الإسناد مقطوع.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٩٦ و ٣٢٥٧، ومسلم: ١١٥٢، والترمذي: ٧٦٥، وابن ماجه: ١٦٤٠.

(٤) صحيح الإسناد موقوف.




**واتە: ئەبو حازم دەڵێ: سەهل بۆی باس کردم: لە بەهەشتدا دەرگایەک هەیە پێی دەوترێ ڕەییان، لە ڕۆژی دواییدا دەوترێ کوان ڕۆژووەوانەکان؟ ئایا ناچن بۆ ڕەییان، هەر کەسێک بچێتە نێویەوە هەرگیز تینووی نابێ، کاتێ چوونە نێویەوە لێیان دادەخرێ غەیری ئەوان کەس ناچێتە نێویەوە.**

**٢٢٣٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ نُودِيَ فِي الْجَنَّةِ يَا عَبْدَ اللَّهِ هَذَا خَيْرٌ، فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّلَاةِ يُدْعَى مِنْ بَابِ الصَّلَاةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجِهَادِ يُدْعَى مِنْ بَابِ الْجِهَادِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّدَقَةِ يُدْعَى مِنْ بَابِ الصَّدَقَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصِّيَامِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الرَّيَّانِ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا عَلَى أَحَدٍ يُدْعَى مِنْ تِلْكَ الْأَبْوَابِ مِنْ ضَرُورَةٍ، فَهَلْ يُدْعَى أَحَدٌ مِنْ تِلْكَ الْأَبْوَابِ كُلِّهَا؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: نَعَمْ، وَأَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس دوو دانە لە یەک جۆر ببەخشێ لە پێناوی خوا (بۆ نموونە: دوو وشتر، یان دوو مەڕ یان ....هتد)، لە بەهەشتدا بانگ دەکرێت ئەی بەندەی خوا ئەمە خێرو پاداشتێکە خوا بۆی ئامادە کردووی، جا هەرکەس لە ئەهلی نوێژ بێت لە دەرگای نوێژەوە بانگ دەکرێ، هەرکەس لە ئەهلی جیهاد بێت لە دەرگای جیهادەوە بانگ دەکرێ، هەرکەس لە ئەهلی خێرو صەدەقە بێت لە دەرگای خێرو صەدەقە بانگ دەکرێ، هەرکەس لە ئەهلی ڕۆژوو بێت لە دەرگای ڕەییانەوە بانگ دەکرێ، ئەبو بەکری صدیق ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا پێویست دەکات کەسێک لەو هەموو دەرگایانەوە بانگ بکرێ (چونکە لە هەر دەرگایەکیانەوە چووە ژوورەوە ڕزگاری دەبێت) ئایا هیچ یەکێک هەیە لە هەموو دەگاکانەوە بانگ بکرێ؟ فەرمووی: بەڵێ، ئومێد دەکەم تۆ لەوانە بیت (لە هەموو دەرگاکان بانگ بکرێی).**

**٢٢٣٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَنَحْنُ شَبَابٌ لَا نَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ، قَالَ: يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، عَلَيْكُمْ بِالْبَاءَةِ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ»[٢].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح.**





**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین، ئێمە گەنج بووین توانای ژن هێنانمان نەبوو لەبەر هەژاری، فەرمووی: ئەی کۆمەڵی گەنج، ژن بهێنن، چونکە چاکترە بۆ پاراستنی چاوو پاراستنی داوێن، هەرکەسیش توانای نیە ئەوە با بەڕۆژوو بێت، بێگومان ئەو کات دەتوانێت جڵەوی ئارەزووی بکات.**

**٢٢٤٠-** «عَنْ عَلْقَمَةَ: أَنَّ ابْنَ مَسْعُودٍ، لَقِيَ عُثْمَانَ بِعَرَفَاتٍ، فَخَلَا بِهِ فَحَدَّثَهُ، وَأَنَّ عُثْمَانَ قَالَ لِابْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: هَلْ لَكَ فِي فَتَاةٍ أُزَوِّجُكَهَا، فَدَعَا عَبْدُ اللَّهِ عَلْقَمَةَ، فَحَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَلْيَصُمْ، فَإِنَّ الصَّوْمَ لَهُ وِجَاءٌ»[١].

**واتە: عەلقەمە دەڵێ: ئیبنو مەسعوود گەیشتە عوسمان لە عەرەفات، تەنیای کردەوەو قسەی بۆ کرد، عوسمان بە ئیبنو مەسعودی (خوا لێیان ڕازی بێ) وت: ئایا کچێکت دەوێ بۆتی بخوازم، عەبدوڵلاش عەلقەمەی بانگ کرد، قسەی بۆ کرد، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کامەتان دەتوانێ بە ئەرکی هاوسەرگیری هەڵسێ با هاوسەرگیری بکات، چونکە چاکترە بۆ پاراستنی چاوو پاراستنی داوێن، هەرکەسیش توانای نیە با بەڕۆژوو بێت، چونکە ڕۆژوو بۆ ئەو دامرکێنەری ئارەزووەکانیەتی.**

**٢٢٤١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، وَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ»[٢].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: هەر یەکێکتان دەتوانێ بە ئەرکی هاوسەرگیری هەڵسێ با هاوسەرگیری بکات، ئەوەشتان توانای نیە با بەڕۆژوو بێت، چونکە ڕۆژوو بۆ ئەو دامرکێنەری ئارەزووەکانیەتی.**

**٢٢٤٢-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، وَمَعَنَا عَلْقَمَةُ وَالْأَسْوَدُ وَجَمَاعَةٌ، فَحَدَّثَنَا بِحَدِيثٍ مَا رَأَيْتُهُ حَدَّثَ بِهِ الْقَوْمَ إِلَّا مِنْ أَجْلِي لِأَنِّي كُنْتُ أَحْدَثَهُمْ، سِنّاً قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ»[٣].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح.**

**(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٠٥ و ٥٠٦٥ و ٥٠٦٦، ومسلم: ١ و ١٤٠٠/٤، وأبو داود: ٢٠٤٦، والترمذي: ١٠٨١، وإبن ماجه: ١٨٤٥.**





واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی یەزید دەڵێ: چووین بۆ لای عەبدوڵلا ﷺ عەلقەمەو ئەسوەدو کۆمەڵێکمان لەگەڵ بوو، باسی فەرموودەیەکی بۆ کردین وا ئەزانم تەنها لەبەر من ئەو فەرموودەیەی باس کرد، چونکە من گەنجترینیان بووم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی کۆمەڵەی گەنجەکان هەرکامتان دەتوانێ بە ئەرکی هاوسەرگیری هەڵسێ با هاوسەرگیری بکات، چونکە چاکترە بۆ پاراستنی چاوو پاراستنی داوێن.

- «عَنْ عَلْقَمَةَ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ ابْنِ مَسْعُودٍ وَهُوَ عِنْدَ عُثْمَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فَقَالَ عُثْمَانُ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى فِتْيَةٍ، فَقَالَ: مَنْ كَانَ مِنْكُمْ ذَا طَوْلٍ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَا، فَالصَّوْمُ لَهُ وِجَاءٌ»(١).

واتە: عەلقەمە دەڵێ: من لەگەڵ ئیبنو مەسعود بووم ئەویش لەلای عوسمان (خوا لێیان ڕازی بێ) بوو، عوسمان وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ لای کۆمەڵە گەنجێک، فەرمووی: هەرکامتان تواناى هەیەو دەستی دەچێ و ژیانی باشە با ژن بهێنێ، چونکە چاکترە بۆ پاراستنی چاوو پاراستنی داوێن، ئەوەتان توانای نیە با بەڕۆژوو بێت، چونکە ڕۆژوو بۆ ئەو دامرکێنەری ئارەزووەکانیەتی.

## بابەت: پاداشتی ئەو کەسەی ڕۆژێک لە پێناو خوا بە ڕۆژوو دەبێ و، باسی جیاوازی لەسەر سوهەیلی کوڕی ئەبو صاڵح لە فەرموودەکە دەربارەی ئەو بابەتە

**٢٢٤٤-** «عَنْ أَنَسٍ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ صَامَ يَوْماً فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ زَحْزَحَ اللَّهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ بِذَلِكَ الْيَوْمِ سَبْعِينَ خَرِيفاً»(٢).

---

(١) صحيح. {قال أبو عبد الرحمن: أبو معشر هذا اسمه زياد بن كليب ثقة، وهو صاحب إبراهيم روى عنه منصور ومغيرة وشعبة، وأبو معشر المدني اسمه نجيح وهو ضعيف ومع ضعفه أيضا كان قد اختلط عنده أحاديث مناكير منها محمد بن عمرو عن أبي سلمة عن أبي هريرة عن النبي ﷺ قال: ما بين المشرق والمغرب قبلة ومنها هشام بن عروة عن أبيه عن عائشة عن النبي ﷺ لا تقطعوا اللحم بالسكين ولكن انهشوه نهشا} قال المحقق هذا المقطع: (عن عائشة عن النبي ﷺ لا تقطعوا اللحم بالسكين ولكن انهشوه نهشا) ضعيفٌ.

(٢) صحيح.




**واته: ئەنەس دەگێڕێتەوە: لە سوهەیلی کوڕی ئەبو صالح، لە ئەبو هورەیرەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس ڕۆژێک لە پێناوی خوادا بەڕۆژوو بێت، خوا ﷻ نێوان ئەوو ئاگر حەفتا پایز دوور دەخاتەوە بە هۆی ئەو ڕۆژە.**

**٢٢٤٥-** «عَنْ أَبِي مُعَاوِيَةَ الضَّرِير، عَنْ سُهَيْلٍ، عَنِ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ صَامَ يَوْماً فِي سَبِيلِ اللَّهِ بَاعَدَ اللَّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّارِ بِذَلِكَ الْيَوْمِ سَبْعِينَ خَرِيفاً»[1].

**واته: ئەبو موعاویەی ضەریر دەگێڕێتەوە: لە سوهەیل، لە مەقبوری، لە ئەبو سەعیدی خودریەوە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕۆژێک لە پێناوی خوادا بەڕۆژوو بێت، خوا نێوان ئەوو ئاگر حەفتا پایز دوور دەخاتەوە بە هۆی ئەو ڕۆژە.**

**٢٢٤٦-** «عَنْ سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنِي سُهَيْلٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ صَامَ يَوْماً فِي سَبِيلِ اللَّهِ بَاعَدَ اللَّهُ ﷻ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفاً»[2].

**واته: سەعیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: سوهەیل هەواڵی پێدام، لە باوکیەوە، لە ئەبو هورەیرەوە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس ڕۆژێک لە پێناوی خوادا بەڕۆژوو بێت، خوا ﷻ ڕوخساری لە ئاگر حەفتا پایز دوور دەخاتەوە.**

**٢٢٤٧-** «عَنْ شُعْبَةُ، عَنْ سُهَيْلٍ، عَنْ صَفْوَانَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ صَامَ يَوْماً فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ بَاعَدَ اللَّهُ وَجْهَهُ مِنْ جَهَنَّمَ سَبْعِينَ عَاماً»[3].

**واته: شوعبە دەگێڕێتەوە: لە سوهەیل، لە صەفوان، لە ئەبو سعیدەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ڕۆژێک لە پێناوی خوادا بەڕۆژوو بێت، خوا ﷻ ڕوخساری لە ئاگر حەفتا ساڵ دوور دەخاتەوە.**

**٢٢٤٨-** «عَنِ ابْنِ الْهَادِ، عَنْ سُهَيْلٍ، عَنْ ابْنِ أَبِي عَيَّاشٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رضي الله عنه، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: مَا مِنْ عَبْدٍ يَصُومُ يَوْمَاً فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ إِلَّا بَعَّدَ اللَّهُ ﷻ بِذَلِكَ الْيَوْمِ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفَاً»[4].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٦٢٢، وإبن ماجه: ١٧١٨.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٤٠، ومسلم: ١٦٧ و ١١٥٣/١٦٨، والترمذي: ١٦٢٣، وإبن ماجه: ١٧١٧.

**واتە: ئیبنولهاد دەگێڕێتەوە: لە سوهەیل، لە ئیبنو ئەبو عیاش، لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ، ئەو گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەفەرموێ: هیچ بەندەیەک نیە ڕۆژێک لە پێناوی خوادا بەڕۆژوو بێت ئیللا خوا ﷻ لەبەر ئەو ڕۆژە حەفتا پایز ڕوخساری لە ئاگر دوور دەخاتەوە.**

**٢٢٤٩-** «عَنْ حُمَيْدِ بْنِ الْأَسْوَدِ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُهَيْلٌ، عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ أَبِي عَيَّاشٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ صَامَ يَوْماً فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ بَاعَدَهُ اللَّهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفاً»[١].

**واتە: حومەیدی کوڕی ئەسوەد دەڵێ: سوهەیل بۆی باس کردین، لە نوعمانی کوڕی ئەبو عیاشەوە دەڵێ: گوێم لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ بوو وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکەس ڕۆژێک لە پێناوی خوادا ﷻ بەڕۆژوو بێت، خوا لە ئاگر دووری دەخاتەوە حەفتا پایز.**

**٢٢٥٠-** «عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، وَسُهَيْلُ بْنُ أَبِي صَالِحٍ، سَمِعَا النُّعْمَانَ بْنَ أَبِي عَيَّاشٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ صَامَ يَوْماً فِي سَبِيلِ اللَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى بَاعَدَ اللَّهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفاً»[٢].

**واتە: ئیبنو جورەیج دەڵێ: یەحیای کوڕی سەعیدو سوهەیلی کوڕی ئەبو صاڵح بۆیان باس کرد، گوێیان لە نەعمانی کوڕی ئەبو عەیاش بوو وتی: گوێم لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ بوو دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەرکەس ڕۆژێک لە پێناوی خوادا ﷻ بەڕۆژوو بێت، خوا ڕوخساری لە ئاگر دوور دەخاتەوە حەفتا پایز.**

## باسی جیاوازی لەسەر سوفیانی سەوری لە فەرموودەکەدا

**٢٢٥١-** «عَن يَزِيدِ الْعَدَنِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ أَبِي عَيَّاشٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يَصُومُ عَبْدٌ يَوْماً فِي سَبِيلِ اللَّهِ إِلَّا بَاعَدَ اللَّهُ تَعَالَى بِذَلِكَ الْيَوْمِ النَّارَ عَنْ وَجْهِهِ سَبْعِينَ خَرِيفاً»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**واتە: یەزیدی عەدەنی دەڵێ: سوفیان بۆی باس کردین لە سوهەیلی کوڕی ئەبو صاڵح، لە نەعمانی کوڕی ئەبو عەیاش، لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێ ڕۆژێک لە پێناوی خوادا (تَبَارَكَ وَتَعَالَى) بەڕۆژوو بێت، ئیللا خوا بە هۆی ئەو ڕۆژەوە حەفتا پایز ڕوخساری لە ئاگر دوور دەخاتەوە.**

**٢٢٥٢-** «عَنْ قَاسِمٍ عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ أَبِي عَيَّاشٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ صَامَ يَوْماً فِي سَبِيلِ اللَّهِ بَاعَدَ اللَّهُ بِذَلِكَ الْيَوْمِ حَرَّ جَهَنَّمَ عَنْ وَجْهِهِ سَبْعِينَ خَرِيفاً»[١].

**واتە: قاسم دەگێڕێتەوە: لە سوفیان، لە سوهەیلی کوڕی ئەبو صاڵح، لە نەعمانی کوڕی ئەبو عەیاش، لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕۆژێک لە پێناوی خوادا بەڕۆژوو بێت، خوا بە هۆی ئەو ڕۆژەوە حەفتا پایز گەرمای دۆزەخ لە ڕوخساری دوور دەخاتەوە.**

**٢٢٥٣-** «عَنِ ابْنِ نُمَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ سُمَيٍّ، عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ أَبِي عَيَّاشٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ صَامَ يَوْماً فِي سَبِيلِ اللَّهِ بَاعَدَ اللَّهُ بِذَلِكَ الْيَوْمِ النَّارَ عَنْ وَجْهِهِ سَبْعِينَ خَرِيفاً»[٢].

**واتە: ئیبنو نومەیر دەڵێ: سوفیان بۆی باس کردین لە سومەی، لە نەعمانی کوڕی ئەبو عیاش، لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕۆژێک لە پێناوی خوادا بەڕۆژوو بێت، خوا بە هۆی ئەو ڕۆژەوە حەفتا پایز ڕوخساری دوور دەخاتەوە لە ئاگری دۆزەخ.**

**٢٢٥٤-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ صَامَ يَوْماً فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ بَاعَدَ اللَّهُ مِنْهُ جَهَنَّمَ مَسِيرَةَ مِائَةِ عَامٍ»[٣].

**واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕۆژێک لە پێناوی خوادا ﷻ بەڕۆژوو بێت، خوا دۆزەخی لێ دوور دەخاتەوە ماوەی سەد ساڵەڕێ.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) حسن.

## بابەت: ئەوەی قەدەغە کراوە لە ڕۆژووگرتن لە گەشتدا

**٢٢٥٥-** «عَنْ كَعْبِ بْنِ عَاصِمٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ»[١].

**واتە: کەعبی کوڕی عاصم ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ڕۆژووگرتن لە گەشتدا لە چاکەکاریی نیە.**

**٢٢٥٦-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: هَذَا خَطَأٌ وَالصَّوَابُ الَّذِي قَبْلَهُ، لَا نَعْلَمُ أَحَداً تَابَعَ ابْنَ كَثِيرٍ عَلَيْهِ»[٢].

**واتە: سەعیدی کوڕی موسەییب دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژووگرتن لە گەشتدا لە چاکەکاریی نیە.**

## هۆکاری ئەوەی ئەم (فەرموودە)ی بۆ وتراوەو باسی جیاوازی لەسەر موحەممەدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان لە فەرموودەکەی جابری کوڕی عەبدوڵڵا لەو بارەوە

**٢٢٥٧-** «عَنْ عُمَارَةَ بْنِ غَزِيَّةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى نَاساً مُجْتَمِعِينَ عَلَى رَجُلٍ فَسَأَلَ، فَقَالُوا: رَجُلٌ أَجْهَدَهُ الصَّوْمُ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ»[٣].

**واتە: عومارەی کوڕی غەزییە دەگێڕێتەوە: لە موحەممەدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان، لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکێکی بینی لەسەر پیاوێک کۆببوونەوەو پرسیاری کرد (ئەوە چیە؟)، وتیان: ڕۆژوو زۆری بۆ هێناوە، پێغەمبەر خوا ﷺ فەرمووی: ڕۆژوو گرتن لە گەشتدا لە چاکەکاریی نیە.**

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٦٦٤.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح.




**٢٢٥٨-** عَن يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنِي جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ بِرَجُلٍ فِي ظِلِّ شَجَرَةٍ يُرَشُّ عَلَيْهِ الْمَاءُ، قَالَ: مَا بَالُ صَاحِبِكُمْ هَذَا؟ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ صَائِمٌ، قَالَ: إِنَّهُ لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ أَنْ تَصُومُوا فِي السَّفَرِ، وَعَلَيْكُمْ بِرُخْصَةِ اللَّهِ الَّتِي رَخَّصَ لَكُمْ فَاقْبَلُوهَا»[١].

**واته:** یەحیای کوڕی ئەبو کەثیر دەڵێ: موحەممەدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان هەواڵی پێدام وتی: جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) هەواڵی پێدام، پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بەلای پیاوێک لە سێبەری دارێکدا بوو ئاویان دەپرژاندا بەسەریدا، فەرمووی: ئەوە هاوەڵەکەتان چیەتی؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بەڕۆژووە، فەرمووی: بێگومان لە چاکەکاریی نیە ڕۆژوو بگرن لە گەشتدا (وەکو هاوەڵەکەتان)، دەست بگرن بە ڕوخسەت و ئاسانکاری خوا کە ڕوخسەتی پێداون و وەریبگرن.

**٢٢٥٩-** «عَن يَحْيَى، قَالَ: أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: حَدَّثَنِي مَنْ سَمِعَ جَابِراً ﷺ نَحْوَهُ»[٢].

**واته:** یەحیا دەڵێ: موحەممەدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان هەواڵی پێدام وتی: بۆی باسکردم ئەو کەسەی لە جابرﷺ گوێی لێ بوو هەروەکو فەرموودەکەی پێشوو.

## باسی جیاوازی لەسەر عەلی کوڕی موبارەک

**٢٢٦٠-** «عَن وَكِيعٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ ثَوْبَانَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ، عَلَيْكُمْ بِرُخْصَةِ اللَّهِ ﷻ فَاقْبَلُوهَا»[٣].

**واته:** وەکیع دەڵێ: عەلی کوڕی موبارەک بۆی باس کردین، لە یەحیای کوڕی ئەبو کەثیر، لە موحەممەدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ثەوبان، لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژوو گرتن لە گەشتدا لە چاکەکاریی نیە، دەست بگرن بە ڕوخسەت و ئاسانکاری خواو وەریبگرن.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**٢٢٦١-** «عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عُمَرَ قَالَ: أَنْبَأَنَا عَلِيُّ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ رَجُلٍ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ»

**واتە: عوسمانی کوڕی عومەر، دەڵێ: عەلی کوڕی موبارەک بۆی باس کردین لە یەحیا، لە موحەممەدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان، لە پیاوێک، لە جابرەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژوو گرتن لە گەشتدا لە چاکەکاریی نیە.**

## باسی ناوی پیاوەکە (واتە: ناوی ئەو پیاوەی لە فەرموودەی پێشەوە نەهاتبوو)

**٢٢٦٢-** «عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَسَنٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى رَجُلاً قَدْ ظُلِّلَ عَلَيْهِ فِي السَّفَرِ، فَقَالَ: لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ»[٢].

**واتە: شوعبە دەگێڕێتەوە: لە موحەممەدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان، لە موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەسەن، لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتێکدا پیاوێکی بینی سێبەر کرابوو بەسەریدا، فەرمووی: ڕۆژوو گرتن لە گەشتدا لە چاکەکاریی نیە.**

**٢٢٦٣-** «عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى مَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ فِي رَمَضَانَ، فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ كُرَاعَ الْغَمِيمِ فَصَامَ النَّاسُ، فَبَلَغَهُ أَنَّ النَّاسَ قَدْ شَقَّ عَلَيْهِمُ الصِّيَامُ، فَدَعَا بِقَدَحٍ مِنَ الْمَاءِ بَعْدَ الْعَصْرِ فَشَرِبَ وَالنَّاسُ يَنْظُرُونَ، فَأَفْطَرَ بَعْضُ النَّاسِ وَصَامَ بَعْضٌ، فَبَلَغَهُ أَنَّ نَاساً صَامُوا، فَقَالَ: أُولَئِكَ الْعُصَاةُ»[٣].

**واتە: جەعفەری کوڕی موحەممەد لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی ڕزگار کردنی مەککە لە ڕەمەزاندا دەرچوو بۆ مەککە، ڕۆژووی گرت هەتا گەیشتە (كُرَاعَ الْغَمِيمِ) (ناوی شیوێکە لە پێش عوسفان) خەڵکەکەش بە ڕۆژوو بوون، هەواڵی پێگەیشت ڕۆژوو زۆری بۆ خەڵکەکە هێناوەو ماندووی کردوون، ئەویش**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٤٦، ومسلم: ١١١٥، وأبو داود: ٢٤٠٧.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١١١٤، والترمذي: ٧١٠.

داوای قاپێک ئاوی کرد دوای عەسر ئاوی خواردەوەو ڕۆژووەکەی شکاند خەڵکەکەش تەماشایان دەکرد، هەندێ لە خەڵکەکە ڕۆژوویان شکاند هەندێکی دیکەشیان بەردەوام بوون لەسەر ڕۆژووەکەیان، پێی ڕاگەیەنرا خەڵکێک هێشتا بەڕۆژوون، فەرمووی: بەڕاستی ئەوانە یاخی و سەرپێچیکارن.

**٢٢٦٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِطَعَامٍ بِمَرِّ الظَّهْرَانِ، فَقَالَ لِأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ: أَدْنِيَا فَكُلَا، فَقَالَا: إِنَّا صَائِمَانِ، فَقَالَ: ارْحَلُوا لِصَاحِبَيْكُمْ، اعْمَلُوا لِصَاحِبَيْكُمْ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنێکی بۆ هێنرا لە (مَرُّ الظَّهْرَانِ) (ناوی شیوێکە لە نزیک مەککە) بە ئەبو بەکرو عومەری فەرموو: فەرموون نزیک ببنەوە بخۆن، وتیان: ئێمە بەڕۆژووین، فەرمووی: کاروانیەکەیان بۆ ئامادە بکەن و یارمەتیان بدەن.**

**٢٢٦٥-** «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَغَدَّى بِمَرِّ الظَّهْرَانِ وَمَعَهُ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، فَقَالَ: الْغَدَاءَ»[٢].

**واتە: ئەبو سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ نانی دەخوارد لە (مَرُّ الظَّهْرَانِ) ئەبو بەکرو عومەری لەگەڵ بوو، فەرمووی: نزیک ببنەوە.**

**٢٢٦٦-** «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ، كَانُوا بِمَرِّ الظَّهْرَانِ»[٣].

**واتە: ئەبو سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەبو بەکرو عومەر لە (مَرُّ الظَّهْرَانِ) بوون.**

## باسی لابردنی ڕۆژوو لەسەر گەشتیارو، جیاوازی لەسەر ئەوزاعی لە هەواڵەکەی عەمرِی کوڕی ئومەییە لە فەرموودەکەدا

**٢٢٦٧-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ شُعَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْأَوْزَاعِيُّ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرُو بْنُ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيُّ ﷺ قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ سَفَرٍ، فَقَالَ: انْتَظِرِ الْغَدَاءَ يَا

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح لغيره.**

**(٣) صحيح لغيره.**




أَبَا أُمَيَّةَ، فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ: تَعَالَ ادْنُ مِنِّي حَتَّى أُخْبِرَكَ عَنِ الْمُسَافِرِ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ وَضَعَ عَنْهُ الصِّيَامَ وَنِصْفَ الصَّلَاةِ»[١].

**واتە: موحەممەدی کوڕی شوعەیب دەڵێ: ئەوزاعی بۆی باس کردین، لە یەحیا، لە ئەبو سەلەمەوە دەڵێ: عەمڕی کوڕی ئومەیەی ضەمری ﷺ هەواڵی پێدام وتی: لە گەشتێکدا هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: چاوەڕوانی خواردن بکە ئەی باوکی ئومەیە، وتم: من بە ڕۆژووم، فەرمووی: بێ لێم نزیک ببەرەوە تا هەواڵت بدەمێ دەربارەی گەشتیار: خوا ﷻ ڕۆژووی لەسەری لابردوەو نوێژیشی بۆ کردوە بە نیوە.**

**٢٢٦٨-** «عَنِ الْوَلِيدِ عَنْ الْأَوْزَاعِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو قِلَابَةَ، قَالَ: حَدَّثَنِي جَعْفَرُ بْنُ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيُّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَلَا تَنْتَظِرُ الْغَدَاءَ يَا أَبَا أُمَيَّةَ؟ قُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ: تَعَالَ أُخْبِرْكَ عَنِ الْمُسَافِرِ: إِنَّ اللَّهَ وَضَعَ عَنْهُ الصِّيَامَ وَنِصْفَ الصَّلَاةِ»[٢].

**واتە: وەلید دەگێڕێتەوە: لە ئەوزاعیەوە دەڵێ: یەحیای کوڕی ئەبو کەثیر بۆی باس کردم وتی: ئەبو قیلابە بۆی باس کردم وتی: جەعفەری کوڕی عەمڕی کوڕی ئومەیەی ضەمری لە باوکیەوە ﷺ وتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: ئایا چاوەڕوانی نان خواردن ناکەی ئەی باوکی ئومەیە؟ وتم: من بەڕۆژووم، فەرمووی: وەرە با هەواڵت بدەمێ دەربارەی گەشتیار: بەڕاستی خوای بەرز ڕۆژووی لەسەری لابردوەو نوێژیشی بۆ کردوە بە نیوە.**

**٢٢٦٩-** «عَنْ أَبِي الْمُغِيرَةِ قَالَ: حَدَّثَنَا الْأَوْزَاعِيُّ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَبِي الْمُهَاجِرِ، عَنْ أَبِي أُمَيَّةَ الضَّمْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ سَفَرٍ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَلَمَّا ذَهَبْتُ لِأَخْرُجَ، قَالَ: انْتَظِرِ الْغَدَاءَ يَا أَبَا أُمَيَّةَ، قُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ يَا نَبِيَّ اللَّهِ، قَالَ: تَعَالَ أُخْبِرْكَ عَنِ الْمُسَافِرِ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى وَضَعَ عَنْهُ الصِّيَامَ وَنِصْفَ الصَّلَاةِ»[٣].

**واتە: موغیرە دەڵێ: ئەوزاعی بۆی باس کردین لە یەحیا لە ئەبو قیلابە، لە باوکی موهاجر، لە ئەبو ئومەیەی ضەمری ﷺ دەڵێ: لە گەشتێکدا هاتم بۆ لای پێغەمبەری**

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح.




**خوا ﷺ سەلامم لێی کرد، کاتێ ویستم بڕۆم، فەرمووی: چاوەڕوانی نان خواردن بکە ئەی باوکی ئومەییە، وتم: من بەڕۆژووم ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: وەرە با هەواڵت بدەمێ دەربارەی گەشتیار: بەڕاستی خوای بەرز ڕۆژووی لەسەری لابردوەو نوێژیشی بۆ کردوە بە نیوە.**

**٢٢٧٠-** «عَن مُحَمَّدِ بْنِ حَرْبٍ، عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ، قَالَ: أَخْبَرَنِي يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو قِلَابَةَ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو الْمُهَاجِرِ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو أُمَيَّةَ يَعْنِي الضَّمْرِيَّ ﷺ، أَنَّهُ قَدِمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَذَكَرَ نَحْوَهُ»[١].

**واتە: موحەممەدی کوڕی حەرب دەگێڕێتەوە: ئەوزاعی دەڵێ: یەحیا هەواڵی پێدام وتی: ئەبو قیلابە بۆی باس کردم وتی: باوکی موهاجر بۆی باس کردم وتی: ئەبو ئومەیەی ضەمری ﷺ بۆی باس کردم، ئەو ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ هەروەکو فەرموودەکەی پێشوو.**

**٢٢٧١-** «عَن شُعَيْبٍ قَالَ: حَدَّثَنِي الْأَوْزَاعِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو قِلَابَةَ الْجَرْمِيُّ، أَنَّ أَبَا أُمَيَّةَ الضَّمْرِيَّ ﷺ، حَدَّثَهُمْ أَنَّهُ قَدِمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ سَفَرٍ، فَقَالَ: انْتَظِرِ الْغَدَاءَ يَا أَبَا أُمَيَّةَ، قُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ، قَالَ: ادْنُ أُخْبِرْكَ عَنِ الْمُسَافِرِ: إِنَّ اللَّهَ وَضَعَ عَنْهُ الصِّيَامَ وَنِصْفَ الصَّلَاةِ»[٢].

**واتە: شوعەیب دەڵێ: ئەوزاعی بۆی باس کردم وتی: یەحیا بۆی باس کردم وتی: ئەبو قیلابەی جەرمی بۆی باس کردم، ئومەییەی ضەمری ﷺ بۆی باس کردن، ئەو هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتێکدا، فەرمووی: چاوەڕوانی نان خواردن بکە ئەی باوکی ئومەییە، وتم: من بەڕۆژووم، فەرمووی: نزیک ببەرەوە تا هەواڵت بدەمێ دەربارەی گەشتیار: بەڕاستی خوای بەرز ڕۆژووی لەسەری لابردوەو نوێژیشی بۆ کردوە بە نیوە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




## باسی جیاوازی موعاویەی کوڕی سەلام و عەلی کوڕی موبارەک لەم فەرموودەدا

**٢٢٧٢-** «عَنْ عُثْمَان قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، أَنَّ أَبَا أُمَيَّةَ الضَّمْرِيَّ ﵁، أَخْبَرَهُ أَنَّهُ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مِنْ سَفَرٍ وَهُوَ صَائِمٌ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَلَا تَنْتَظِرِ الْغَدَاءَ؟ قَالَ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَعَالَ أُخْبِرْكَ عَنِ الصِّيَامِ: إِنَّ اللَّهَ ﷯ وَضَعَ عَنِ الْمُسَافِرِ الصِّيَامَ وَنِصْفَ الصَّلَاةِ»[١].

**واتە: عوسمان دەڵێ: موعاویە بۆی باس کردین لە یەحیای کوڕی ئەبو کەثیر، لە ئەبو قیلابە، لە ئەبو ئومەییەی ضەمری ﵁ هەواڵی پێداوە، ئەو هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتێکیدا بەڕۆژوو بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئایا چاوەڕوانی نان خواردن ناکەی؟ وتی: من بەڕۆژووم، پێغەمبەری خوا فەرمووی: وەرە با هەواڵت بدەمێ دەربارەی ڕۆژوو: بەڕاستی خوا ﷯ ڕۆژووی لەسەر گەشتیار لابردوەو نوێژیشی بۆ کردوە بە نیوە.**

**٢٢٧٣-** «عَن عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ قَالَ: أَنْبَأَنَا عَلِيٌّ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ رَجُلٍ، أَنَّ أَبَا أُمَيَّةَ ﵁، أَخْبَرَهُ أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ مِنْ سَفَرٍ، نَحْوَهُ»[٢].

**واتە: عوسمانی کوڕی عومەر دەڵێ: عەلی بۆی باس کردین لە یەحیا لە ئەبو قیلابە لە پیاوێکەوە کە ئەبو ئومەییە ﵁ هەواڵی پێداوە ئەو لە گەشتێکیدا هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، وەکو فەرموودەکەی پێشوو.**

**٢٢٧٤-** «عَنْ أَنَسٍ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ وَضَعَ عَنِ الْمُسَافِرِ نِصْفَ الصَّلَاةِ وَالصَّوْمَ، وَعَنِ الْحُبْلَى وَالْمُرْضِعِ»[٣].

**واتە: ئەنەس ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خوا نوێژی لەسەر گەشتیار کردوە بە نیوەو، ڕۆژووشی لەسەر لابردوە، هەروەها ڕۆژووی لەسەر ئافرەتی دووگیان و شیردەر لابردوە (لە کاتی ڕەمەزاندا).**

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٤٠٨، والترمذي: ٧١٥، وإبن ماجه: ١٦٦٧ و ٣٢٩٩.




**٢٢٧٥-** «عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ شَيْخٍ مِنْ قُشَيْرٍ، عَنْ عَمِّهِ، «حَدَّثَنَا ثُمَّ أَلْفَيْنَاهُ فِي إِبِلٍ لَهُ، فَقَالَ لَهُ أَبُو قِلَابَةَ: حَدِّثْهُ، فَقَالَ الشَّيْخُ: حَدَّثَنِي عَمِّي» أَنَّهُ ذَهَبَ فِي إِبِلٍ لَهُ، فَانْتَهَى إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَهُوَ يَأْكُلُ «أَوْ قَالَ: يَطْعَمُ» فَقَالَ: ادْنُ فَكُلْ «أَوْ قَالَ: ادْنُ فَاطْعَمْ» فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ وَضَعَ عَنِ الْمُسَافِرِ شَطْرَ الصَّلَاةِ وَالصِّيَامَ، وَعَنِ الْحَامِلِ وَالْمُرْضِعِ»[١].

**واتە: ئەیوب دەگێڕێتەوە: لە پیاوێک لە قوشەیر ئەویش لە مامی «بۆی باس کردین، پاشان لەگەڵید بووین وشترێکی پێ بوو، ئەبو قیلابە پێی وت بۆی باسی بکە، پیاوەکە وتی: مامم بۆی باس کردم» ئەو بە وشترێک ڕۆیشت تا کاتێک گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ، نانی دەخوارد، فەرمووی: نزیک بەرەوە نان بخۆ، وتم: من بەڕۆژووم، فەرمووی: خوا ﷻ نیوەی نوێژی لەسەر گەشتیار لابردوە، هەروەها ڕۆژووشی لەسەری لابردوە، وە لەسەر ئافرەتی دووگیان و شیردەریش (لە ناو مانگی ڕەمەزاندا).**

**٢٢٧٦-** «عَنْ أَيُّوبَ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو قِلَابَةَ، هَذَا الْحَدِيثَ، ثُمَّ قَالَ: هَلْ لَكَ فِي صَاحِبِ الْحَدِيثِ فَدَلَّنِي عَلَيْهِ فَلَقِيتُهُ، فَقَالَ: حَدَّثَنِي قَرِيبٌ لِي يُقَالُ لَهُ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي إِبِلٍ كَانَتْ لِي أُخِذَتْ، فَوَافَقْتُهُ وَهُوَ يَأْكُلُ، فَدَعَانِي إِلَى طَعَامِهِ، فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ: ادْنُ أُخْبِرْكَ عَنْ ذَلِكَ، إِنَّ اللَّهَ وَضَعَ عَنِ الْمُسَافِرِ الصَّوْمَ وَشَطْرَ الصَّلَاةِ»[٢].

**واتە: ئەیوب دەڵێ: ئەبو قیلابە ئەم فەرموودەیەی بۆ باس کردم، پاشان وتی: ئایا خاوەنی فەرموودەکەت دەوێ، پێی نیشاندام منیش پێی گەیشتم وتی: کەسێکی نزیک لێمەوە بۆی باس کردم پێی دەوترا ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ، وتی: بە وشترێکی خۆمەوە هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ نانی دەخوارد، بانگی کردم بۆ نان خواردن، وتم: من بەڕۆژووم، فەرمووی: نزیک ببەرەوە هەواڵت بدەمێ دەربارەی ئەوە، خوا ڕۆژووی لەسەر گەشتیار لابردوە، هەروەها نیوەی نوێژیش.**

**٢٢٧٧-** «عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ رَجُلٍ، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ لِحَاجَةٍ فَإِذَا هُوَ يَتَغَدَّى، قَالَ: هَلُمَّ إِلَى الْغَدَاءِ، فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ، قَالَ: هَلُمَّ أُخْبِرْكَ عَنِ الصَّوْمِ: إِنَّ اللَّهَ وَضَعَ عَنِ الْمُسَافِرِ نِصْفَ الصَّلَاةِ وَالصَّوْمَ، وَرَخَّصَ لِلْحُبْلَى وَالْمُرْضِعِ»[٣].

---

(١) حسن.

(٢) حسن.

(٣) حسن.




واتە: ئەبو قیلابە دەگێڕێتەوە: لە پیاوێکەوە دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ نانی دەخوارد، فەرمووی: فەرموو نان بخۆ، وتم: من بەڕۆژووم، فەرمووی: بێ با هەواڵت بدەمێ دەربارەی ڕۆژوو: بەڕاستی خوا نوێژی لەسەر گەشتیار کردوە بە نیوەو ڕۆژووشی لەسەر لابردوە، وە مۆڵەتیشی داوە بە ئافرەتی دووگیان و شیردەر (ڕۆژوو نەگرێ لە مانگی ڕەمەزاندا).

**٢٢٧٨-** «عَنْ أَبِي الْعَلَاءِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَنْ رَجُلٍ، نَحْوَهُ»(١).

واتە: ئەبو لعلائی کوڕی شیخیر دەگێڕێتەوە لە پیاوێکەوە، هەروەکو فەرموودەی پێشوو.

**٢٢٧٩-** «عَنْ هَانِئِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَنْ رَجُلٍ، مِنْ بَلْحَرِيشٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كُنْتُ مُسَافِراً فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَأَنَا صَائِمٌ وَهُوَ يَأْكُلُ، قَالَ: هَلُمَّ، قُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ، قَالَ: تَعَالَ، أَلَمْ تَعْلَمْ مَا وَضَعَ اللَّهُ عَنِ الْمُسَافِرِ، قُلْتُ: وَمَا وَضَعَ عَنِ الْمُسَافِرِ؟ قَالَ: الصَّوْمَ وَنِصْفَ الصَّلَاةِ»(٢).

واتە: هانئی کوڕی شیخیر دەگێڕێتەوە: لە پیاوێک لە بەلحەریش، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: من گەشتیار بووم هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺو بەڕۆژوو بووم، ئەویش نانی دەخوارد فەرمووی: وەرە پێشەوە نان بخۆ، وتم: من بەڕۆژووم، فەرمووی: وەرە ئایا نەتزانیوە خوا چی لابردوە لەسەر گەشتیار، وتم: چی لابردوە لەسەر گەشتیار؟ فەرمووی: ڕۆژوو، وە نیوەی نوێژ.

**٢٢٨٠-** «عَنْ هَانِئِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَنْ رَجُلٍ، مِنْ بَلْحَرِيشٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُسَافِرُ مَا شَاءَ اللَّهُ، فَأَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يَطْعَمُ، فَقَالَ: هَلُمَّ، فَاطْعَمْ، فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أُحَدِّثُكُمْ عَنِ الصِّيَامِ: إِنَّ اللَّهَ وَضَعَ عَنِ الْمُسَافِرِ الصَّوْمَ وَشَطْرَ الصَّلَاةِ»(٣).

واتە: هانئی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی شیخیر دەگێڕێتەوە: لە پیاوێک لە بەلحەریش لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: ئێمە گەشتمان دەکرد تا خوا ویستی لەسەر بووایە، هاتین بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش نانی دەخوارد فەرمووی: وەرە پێشەوە نان بخۆ، وتم:

---

(١) حسن.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح لغيره.




من بەڕۆژووم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: باستان بۆ دەکەم دەربارەی ڕۆژوو: بەڕاستی خوا ڕۆژووی لەسەر گەشتیار لابردوە، هەروەها نیوەی نوێژیش.

**٢٢٨١-** «عَنْ هَانِئِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كُنْتُ مُسَافِراً، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ يَأْكُلُ وَأَنَا صَائِمٌ، فَقَالَ: هَلُمَّ قُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ، قَالَ: أَتَدْرِي مَا وَضَعَ اللَّهُ عَنِ الْمُسَافِرِ، قُلْتُ: وَمَا وَضَعَ اللَّهُ عَنِ الْمُسَافِرِ؟ قَالَ: الصَّوْمَ وَشَطْرَ الصَّلَاةِ»[١].

واتە: هانئی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی شیخیر دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: من گەشتیار بووم، هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەو نانی دەخواردو منیش بەڕۆژوو بووم، فەرمووی: بێرە پێشەوە نان بخۆ، وتم: من بەڕۆژووم، فەرمووی: ئایا دەزانی خوا چی لابردوە لەسەر گەشتیار؟ وتم: خوا چی لابردوە لەسەر گەشتیار؟ فەرمووی: ڕۆژوو، هەروەها نیوەی نوێژ.

**٢٢٨٢-** «عَنْ غَيْلَانَ، قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ أَبِي قِلَابَةَ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَقَرَّبَ طَعَاماً، فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ فِي سَفَرٍ، فَقَرَّبَ طَعَاماً، فَقَالَ لِرَجُلٍ: ادْنُ فَاطْعَمْ، قَالَ: إِنِّي صَائِمٌ، قَالَ: إِنَّ اللَّهَ وَضَعَ عَنِ الْمُسَافِرِ نِصْفَ الصَّلَاةِ وَالصِّيَامَ فِي السَّفَرِ، فَادْنُ فَاطْعَمْ، فَدَنَوْتُ فَطَعِمْتُ»[٢].

واتە: غەیلان دەڵێ: لەگەڵ ئەبو قیلابە ﷺ دەرچووم لە گەشتێکدا، خواردنی نزیک کردەوە، وتم: من بەڕۆژووم، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتێکدا دەرچوو، خواردنی نزیک کردەوە، بە پیاوێکی فەرموو: نزیک ببەوە نان بخۆ، وتی: من بەڕۆژووم، فەرمووی: بەڕاستی خوا نیوەی نوێژو ڕۆژوو گرتنی لەسەر گەشتیار لابردوە لەکاتی گەشتدا، جا فەرموو نزیک ببەوە نان بخۆ، منیش نزیک بوومەوەو نانم خوارد.

## فەزڵ و چاکەی ڕۆژوو نەگرتن لە گەشتدا بەسەر ڕۆژوو گرتن

**٢٢٨٣-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي السَّفَرِ، فَمِنَّا الصَّائِمُ وَمِنَّا الْمُفْطِرُ، فَنَزَلْنَا فِي يَوْمٍ حَارٍّ وَاتَّخَذْنَا ظِلَالاً، فَسَقَطَ الصُّوَّامُ، وَقَامَ الْمُفْطِرُونَ فَسَقَوْا الرِّكَابَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ذَهَبَ الْمُفْطِرُونَ الْيَوْمَ بِالْأَجْرِ»[٣].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٩٠، ومسلم: ١٠١ و ١١١٩/١٠٢.




واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: ئێمە لە گەشتدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، تیاماندا بوو بەڕۆژوو بوو، وە تیاماندا بوو بەڕۆژوو نەبوو، لە ڕۆژێکی گەرمدا دابەزین سێبەرمان دەکرد، ئەوانەی بەڕۆژوو بوون پەکیان کەوت، ئەوانەش بە ڕۆژوو نەبوون هەستان دەستیان کرد بە ئاودانی وشترەکان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوانەی ئەمڕۆ بەڕۆژوو نەبوون پاداشتەکەیان بۆ خۆیان برد.

## باسی وتەی: ڕۆژووەوان لە گەشتدا وەکو ڕۆژوو نەبوو وایە لە نیشتەجێ بوون

**٢٢٨٤**- «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ قَالَ: يُقَالُ: الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ كَالْإِفْطَارِ فِي الْحَضَرِ»[١].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ دەڵێ: دەوترێ: ڕۆژووگرتن لە گەشتدا وەکو ڕۆژوو نەگرتنی وایە لە شوێنی نیشتەجێبووندا.

**٢٢٨٥**- «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ قَالَ: الصَّائِمُ فِي السَّفَرِ كَالْمُفْطِرِ فِي الْحَضَرِ»[٢].

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ دەڵێ: ڕۆژووەوان لە گەشتدا وەکو ڕۆژوو نەبوو وایە لە شوێنی نیشتەجێ بوون.

**٢٢٨٦**- «عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: الصَّائِمُ فِي السَّفَرِ كَالْمُفْطِرِ فِي الْحَضَرِ»[٣].

واتە: حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف دەگێڕێتەوە: باوکی ﷺ دەڵێ: ڕۆژووەوان لە گەشتدا وەکو ڕۆژوو نەبوو وایە لە شوێنی نیشتەجێ بوون.

---

(١) ضعيف. أخرجه إبن ماجه: ١٦٦٦ مرفوعاً.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف.




## ڕۆژوو گرتن لە گەشتداو، باسی جیاوازی فەرموودەی ئیبنو عەبباس لەوبارەیەوە

**٢٢٨٧-** «عَنْ مِقْسَمٍ، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ فِي رَمَضَانَ فَصَامَ حَتَّى أَتَى قُدَيْداً، ثُمَّ أُتِيَ بِقَدَحٍ مِنْ لَبَنٍ فَشَرِبَ وَأَفْطَرَ هُوَ وَأَصْحَابُهُ»[١].

**واتە: میقسەم، لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە ڕەمەزاندا دەرچوو بەڕۆژوو بوو تا گەیشتە (قُدَيْد) (شوێنێکی نزیکە لە عوسفان)، پاشان قاپێک شیریان بۆی هێنا خواردیەوەو خۆی و هاوەڵەکانی ڕۆژووەکەیان شکاند.**

**٢٢٨٨-** «عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: صَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْمَدِينَةِ حَتَّى أَتَى قُدَيْداً، ثُمَّ أَفْطَرَ حَتَّى أَتَى مَكَّةَ»[٢].

**واتە: موجاهید دەگێڕێتەوە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینەوە بەڕۆژوو بوو تا گەیشتە (قُدَيْد)، پاشان ڕۆژووی شکاند تا هاتەوە بۆ مەککە.**

**٢٢٨٩-** «عَنْ مِقْسَمٍ، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَامَ فِي السَّفَرِ حَتَّى أَتَى قُدَيْداً، ثُمَّ دَعَا بِقَدَحٍ مِنْ لَبَنٍ فَشَرِبَ، فَأَفْطَرَ هُوَ وَأَصْحَابُهُ»[٣].

**واتە: میقسەم دەگێڕێتەوە: لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتێکدا بەڕۆژوو بوو تا گەیشتە (قُدَيْد)، پاشان قاپێک شیریان بۆی هێنا خواردیەوە خۆی و هاوەڵەکانی ڕۆژووەکەیان شکاند.**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی جیاوازی لەسەر مەنصور

**٢٢٩٠-** «عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى مَكَّةَ فَصَامَ حَتَّى أَتَى عُسْفَانَ، فَدَعَا بِقَدَحٍ فَشَرِبَ «قَالَ: شُعْبَةُ» فِي رَمَضَانَ، فَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ، يَقُولُ: مَنْ شَاءَ صَامَ وَمَنْ شَاءَ أَفْطَرَ»[1].

**واتە: شوعبە دەگێڕێتەوە: لە مەنصور، لە موجاهید، لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ مەککە بەڕۆژوو بوو تا گەیشتە عوسفان (دێ یەکە لە نزیک مەککە) داوای قاپێک ئاوی کرد، ئینجا خواردیەوە «شوعبە دەڵێ:» لە ڕەمەزاندا، جا ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەیوت: هەرکەس ویستی با بەڕۆژوو بێت، هەرکەسیش ویستی با بەڕۆژوو نەبێ.**

**٢٢٩١-** «عَنْ جَرِيرٍ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَافَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي رَمَضَانَ، فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ عُسْفَانَ، ثُمَّ دَعَا بِإِنَاءٍ فَشَرِبَ نَهَاراً، يَرَاهُ النَّاسُ ثُمَّ أَفْطَرَ»[2].

**واتە: جەریر دەگێڕێتەوە: لە مەنصور، لە موجاهید، لە طاوس، لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ گەشتی کرد لە ڕەمەزاندا، بەڕۆژوو بوو تا گەیشتە عوسفان، پاشان داوای قاپێکی کرد بە ڕۆژ خواردیەوە، خەڵکی بینیان، پاشان ڕۆژووەکەی شکاند (لە پێش چاوی خەڵک).**

**٢٢٩٢-** «عَنِ الْعَوَّامِ بْنِ حَوْشَبٍ، قَالَ: قُلْتُ لِمُجَاهِدٍ: الصَّوْمُ فِي السَّفَرِ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ وَيُفْطِرُ»[3].

**واتە: عەوامی کوڕی حەوشەب دەڵێ: بە موجاهیدم وت: ڕۆژوو گرتن لە گەشتدا (حوکمی چۆنە؟)، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژووی دەگرت و دەیشکاند. (واتە: هەردووکیان دروستە، دەتوانی بەڕۆژوو بیت، دەشتوانی بەڕۆژوو نەبیت).**

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٤٨ و ٤٢٧٩، ومسلم: ١١١٣، وأبو داود: ٢٤٠٤، وإبن ماجه: ١٦٦١.**

**(٣) صحيح لغيره.**

**٢٢٩٣-** «عَن مُجَاهِدٌ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَامَ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، وَأَفْطَرَ فِي السَّفَرِ»[١].

**واتە: موجاهید دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژووی گرت لە ڕەمەزانداو لە گەشتدا شکاندی.**

## باسی جیاوازی لەسەر سولەیمانی کوڕی یەسار لە فەرموودەی حەمزەی کوڕی عەمر تیایدا

**٢٢٩٤-** «عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو الْأَسْلَمِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ؟ قَالَ: إِنْ «ثُمَّ ذَكَرَ كَلِمَةً مَعْنَاهَا» إِنْ شِئْتَ صُمْتَ، وَإِنْ شِئْتَ أَفْطَرْتَ»[٢].

**واتە: قەتادە دەگێڕێتەوە: لە سولەیانی کوڕی یەسار، لە حەمزەی کوڕی عەمری ئەسلەمی ﷺ، ئەو پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ڕۆژوو لە گەشتدا؟ فەرمووی: ئەگەر «باسی وشەیەکی کرد ماناکەی بەم شێوە بوو» ئەگەر ویستت بەڕۆژووبە، وە ئەگەر ویستت بەڕۆژوو مەبە.**

**٢٢٩٥-** «عَنْ بُكَيْرٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، أَنَّ حَمْزَةَ بْنَ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مِثْلَهُ مُرْسَلٌ»[٣].

**واتە: بوکەیر دەگێڕێتەوە: لە سولەیانی کوڕی یەسار، کە حەمزەی کوڕی عەمر ﷺ وتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا هەروەکو ئەوەی پێشوو، فەرموودەکە (مُرْسَل)ـە.**

**٢٢٩٦-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ أَبِي أَنَسٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ حَمْزَةَ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ؟ قَالَ: إِنْ شِئْتَ أَنْ تَصُومَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ أَنْ تُفْطِرَ فَأَفْطِرْ»[٤].

**واتە: عیمرانی کوڕی ئەبو ئەنەس دەگێڕێتەوە: لە سولەیانی کوڕی یەسار، لە حەمزەوە ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ڕۆژوو لە**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٢١/١٠٧، وأبو داود: ٢٤٠٣.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

**گەشتدا؟ فەرمووی: ئەگەر ویستت ڕۆژوو بگری ڕۆژوو بگرە، وە ئەگەر ویستت ڕۆژوو نەگری مەیگرە.**

**٢٢٩٧-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ أَبِي أَنَسٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ؟ فَقَالَ: إِنْ شِئْتَ أَنْ تَصُومَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ أَنْ تُفْطِرَ فَأَفْطِرْ»[1].

**واتە: عیمرانی کوڕی ئەبو ئەنەس دەگێڕێتەوە: لە سولەیمانی کوڕی یەسار، لە حەمزەی کوڕی عەمرەوە ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ڕۆژوو لە گەشتدا؟ فەرمووی: ئەگەر ویستت ڕۆژوو بگری ڕۆژوو بگرە، وە ئەگەر ویستت ڕۆژوو نەگری مەیگرە.**

**٢٢٩٨-** «عَنْ بُكَيْرٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو الْأَسْلَمِيِّ ﷺ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً عَلَى الصِّيَامِ فِي السَّفَرِ، قَالَ: إِنْ شِئْتَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ»[2].

**واتە: بوکەیر دەگێڕێتەوە: لە سولەیمانی کوڕی یەسار، لە حەمزەی کوڕی عەمری ئەسلەمی ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من توانام هەیە لە گەشتدا ڕۆژوو بگرم، فەرمووی: ئەگەر ویستت بەڕۆژووبە، وە ئەگەر ویستت بەڕۆژوو مەبە.**

**٢٢٩٩-** «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ؟ قَالَ: إِنْ شِئْتَ أَنْ تَصُومَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ أَنْ تُفْطِرَ فَأَفْطِرْ»[3].

**واتە: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان دەگێڕێتەوە، لە حەمزەی کوڕی عەمر ﷺ، پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ڕۆژوو لە گەشتدا؟ فەرمووی: ئەگەر ویستت ڕۆژوو بگری ڕۆژوو بگرە، وە ئەگەر ویستت ڕۆژوو نەگری مەیگرە.**

**٢٣٠٠-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ أَبِي أَنَسٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، وَحَنْظَلَةَ بْنِ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَانِي جَمِيعاً عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: كُنْتُ أَسْرُدُ الصِّيَامَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَسْرُدُ الصِّيَامَ فِي السَّفَرِ، فَقَالَ: إِنْ شِئْتَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ»[4].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**واته: عیمڕانی كوڕی ئەبو ئەنەس دەگێڕێتەوە: لە سولەیمانی كوڕی یەسارو حەنزەلەی كوڕی عەلی، دەڵێ: هەردووكیان بۆیان باس كردم لە حەمزەی كوڕی عەمرەوە ﷺ كە وتوویەتی: من بەردەوام بە ڕۆژوو دەبووم لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من بەردەوام بە ڕۆژوو دەبم لە گەشتدا، فەرمووی: ئەگەر ویستت بەڕۆژووبە، وە ئەگەر ویستت بەڕۆژوو مەبە.**

**٢٣٠١-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ أَبِي أَنَسٍ، عَنْ حَنْظَلَةَ بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ حَمْزَةَ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، إِنِّي رَجُلٌ أَسْرُدُ الصِّيَامَ أَفَأَصُومُ فِي السَّفَرِ؟ قَالَ: إِنْ شِئْتَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ»[١].

**واته: عیمڕانی كوڕی ئەبو ئەنەس دەگێڕێتەوە: لە حەنزەلەی كوڕی عەلی، لە حەمزەوە ﷺ وتی: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من بەردەوام بە ڕۆژوو دەبم ئایا لە گەشتدا بەڕۆژوو ببم، فەرمووی: ئەگەر ویستت بەڕۆژووبە، وە ئەگەر ویستت بەڕۆژوو مەبە.**

**٢٣٠٢-** «عَن عِمْرَانُ بْنُ أَبِي أَنَسٍ، أَنَّ سُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ، حَدَّثَهُ أَنَّ أَبَا مُرَاوِحٍ، حَدَّثَهُ أَنَّ حَمْزَةَ بْنَ عَمْرٍو ﷺ، حَدَّثَهُ أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَكَانَ رَجُلاً يَصُومُ فِي السَّفَرِ، فَقَالَ: إِنْ شِئْتَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ»[٢].

**واته: عیمڕانی كوڕی ئەبو ئەنەس دەگێڕێتەوە: سولەیمانی كوڕی یەسار بۆی باس كردوە باوكی موراویح بۆی باس كردوە حەمزەی كوڕی عەمر ﷺ بۆی باسی كرد، ئەو پرسیاری كرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ، پیاوێك بوو لە گەشتدا بەڕۆژوو دەبوو، فەرمووی: ئەگەر ویستت بەڕۆژووبە، وە ئەگەر ویستت بەڕۆژوو مەبە.**

## باسی جیاوازی لەسەر عوروە لە فەرموودەكەی حەمزە

**٢٣٠٣-** «عَنْ أَبِي الْأَسْوَدِ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِي مُرَاوِحٍ، عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَجِدُ فِيَّ قُوَّةً عَلَى الصِّيَامِ فِي السَّفَرِ، فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ؟ قَالَ: هِيَ رُخْصَةٌ مِنَ اللَّهِ ﷻ، فَمَنْ أَخَذَ بِهَا فَحَسَنٌ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَصُومَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: ئەبو ئەسوەد دەگێڕێتەوە: لە عوروە، لە باوکی موراویح، لە حەمزەی کوڕی عەمرەوە ، ئەو بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: هێزو توانا لە خۆمدا بەدی دەکەم لەسەر ڕۆژوو گرتن لە گەشتدا، ئایا گوناهبار دەبم؟ فەرمووی: ئەوە مۆڵەت و ئاسانکاریە لە لایەن خوای ﷻەوە، هەر کەس کار بە مۆڵەتی خوا بکات ئەوە چاکە، هەرکەسیش حەز دەکات بەڕۆژوو بێت ئەوە گوناهبار نابێت.

## باسی جیاوازی لەسەر هیشامی کوڕی عوروە لە فەرموودەکەدا

**٢٣٠٤-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ بِشْرٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو الْأَسْلَمِيِّ ، أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَصُومُ فِي السَّفَرِ؟ قَالَ: إِنْ شِئْتَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ»[١].

واتە: موحەممەدی کوڕی بەشیر دەگێڕێتەوە: لە هیشامی کوڕی عوروە، لە باوکیەوە، لە حەمزەی کوڕی عەمری ئەسلەمی ، ئەو پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ڕۆژوو بگرم لە گەشتدا؟ فەرمووی: ئەگەر ویستت بەڕۆژووبە، وە ئەگەر ویستت بەڕۆژوو مەبە.

**٢٣٠٥-** «عَنْ عَبْدُ الرَّحِيمِ الرَّازِيُّ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو ، أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي رَجُلٌ أَصُومُ، أَفَأَصُومُ فِي السَّفَرِ؟ قَالَ: إِنْ شِئْتَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ»[٢].

واتە: عەبدوڕڕەحیمی ڕازی دەگێڕێتەوە: لە هیشام، لە عوروە، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) لە حەمزەی کوڕی عەمرەوە  وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من پیاوێکم بەرۆژوو دەبم، ئایا ڕۆژوو بگرم لە گەشتدا؟ فەرمووی: ئەگەر ویستت بەڕۆژووبە، وە ئەگەر ویستت بەڕۆژوو مەبە.

**٢٣٠٦-** «عَنْ مَالِك، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: إِنَّ حَمْزَةَ، قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَصُومُ فِي السَّفَرِ؟ وَكَانَ كَثِيرَ الصِّيَامِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنْ شِئْتَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٤٢ و ١٩٤٣، ومسلم: ١١٢١، وأبو داود: ٢٤٠٢، والترمذي: ٧١١، وإبن ماجه: ١٦٦٢.

واتە: مالیک دەگێڕێتەوە: لە هیشامی کوڕی عوروە، لە باوکیەوە، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: حەمزە بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا، من بەرۆژوو ببم لە گەشتدا؟ جا ئەو (کەسێک بوو) زۆر بە ڕۆژوو دەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەگەر ویستت بەڕۆژووبە، وە ئەگەر ویستت بەڕۆژوو مەبە.

**٢٣٠٧-** «عَنْ ابْنِ عَجْلَانَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: إِنَّ حَمْزَةَ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَصُومُ فِي السَّفَرِ؟ فَقَالَ: إِنْ شِئْتَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ»[١].

واتە: ئیبنو عەجلان دەگێڕێتەوە: لە هیشامی کوڕی عوروە، لە باوکیەوە، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: حەمزە پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من بەرۆژوو دەبم لە گەشتدا؟ فەرمووی: ئەگەر ویستت بەڕۆژووبە، وە ئەگەر ویستت بەڕۆژوو مەبە.

**٢٣٠٨-** «عَن عَبْدَةِ بْنِ سُلَيْمَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ حَمْزَةَ الْأَسْلَمِيَّ، سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ، وَكَانَ رَجُلاً يَسْرُدُ الصِّيَامَ، فَقَالَ: إِنْ شِئْتَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ»[٢].

واتە: عەبدەی کوڕی سولەیمان دەڵێ: هیشامی کوڕی عوروە بۆی باس کردین، لە باوکیەوە، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: حەمزە ئەسلەمی پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ڕۆژوو لە گەشتدا؟ پیاوێک بوو بەردەوام بوو لەسەر ڕۆژوو، فەرمووی: ئەگەر ویستت بەڕۆژووبە، وە ئەگەر ویستت بەڕۆژوو مەبە.

## باسی جیاوازی لەسەر ئەبو نەزرەی کوڕی مونزیری کوڕی مالیکی کوڕی قوتەعە لە فەرموودەکەدا

**٢٣٠٩-** «عَنْ سَعِيدٍ الْجُرَيْرِيِّ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُسَافِرُ فِي رَمَضَانَ فَمِنَّا الصَّائِمُ، وَمِنَّا الْمُفْطِرُ لَا يَعِيبُ الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ، وَلَا يَعِيبُ الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ»[٣].

---

(١) حسن صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٣ و ١١١٦/٩٦، والترمذي: ٧١٢ و ٧١٣.





**واتە: سەعیدی جورەیری دەگێڕێتەوە: لە ئەبو نەزرەوە دەڵێ: ئەبو سەعید ﷺ بۆی باس کردین وتی: ئێمە لە ڕەمەزاندا گەشتمان دەکرد تیاماندا بوو بە ڕۆژوو بوو، وە تیاماندا بوو بەڕۆژوو نەبوو، نە ڕۆژوگر ڕەخنەی لە ڕۆژونەگر دەگرت، نە ڕۆژونەگر ڕەخنەی لە ڕۆژوگر دەگرت.**

**٢٣١٠-** «عَنْ أَبِي مَسْلَمَةَ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُسَافِرُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَمِنَّا الصَّائِمُ وَمِنَّا الْمُفْطِرُ، وَلَا يَعِيبُ الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ، وَلَا يَعِيبُ الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ»

**واتە: ئەبو مەسلەمە دەگێڕێتەوە: لە ئەبو نەزرە لە ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ گەشتمان دەکرد تیاماندا بوو بە ڕۆژوو بوو، وە تیاماندا بوو بەڕۆژوو نەبوو، نە ڕۆژووگر ڕەخنەی لە ڕۆژوونەگر دەگرت، نە ڕۆژونەگر ڕەخنەی لە ڕۆژووگر دەگرت.**

**٢٣١١-** «عَنْ عَاصِمٍ الْأَحْوَلِ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: سَافَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَصَامَ بَعْضُنَا وَأَفْطَرَ بَعْضُنَا»[٢].

**واتە: عاصمی ئەحوەل دەگێڕێتەوە: لە ئەبو نەزرە، لە جابرەوە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ گەشتمان کرد هەندێکمان بەڕۆژوو بووین هەندێکی ترمان بەڕۆژوو نەبووین.**

**٢٣١٢-** «عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ الْمُنْذِرِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّهُمَا، سَافَرَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَيَصُومُ الصَّائِمُ وَيُفْطِرُ الْمُفْطِرُ، وَلَا يَعِيبُ الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ وَلَا الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ»[٣].

**واتە: عاصم دەگێڕێتەوە لە ئەبو نەزرەی مونزیر، لە ئەبو سەعیدو جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) هەردووکیان گەشتیان کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بەڕۆژوو دەبوو بەڕۆژوو دەبوو، ئەوەشی بەڕۆژوو نەدەبوو بە ڕۆژوو نەدەبوو، نە ڕۆژووگر ڕەخنەی لە ڕۆژوونەگر دەگرت، نە ڕۆژوونەگر ڕەخنەی لە ڕۆژووگر دەگرت.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١١١٧.





## مۆڵەتدان بە گەشتیار بەشێکی ڕۆژ ڕۆژوو بگرێ و بەشەکەی تری بیشکێنێ

**٢٣١٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَامَ الْفَتْحِ صَائماً فِي رَمَضَانَ، حَتَّى إِذَا كَانَ بِالْكَدِيدِ أَفْطَرَ»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی ڕزگار کردنی مەککە بەرەو مەککە بەڕێ کەوت لە مانگی ڕەمەزاندا بەڕۆژوو بوو، هەتا گەیشتە (کَدِیدِ) (شوێنێکە لە نێوان عوسفان و قەدید) لەوێ ڕۆژووەکەی شکاند.**

## مۆڵەتدان بە شکاندنی ڕۆژوو بۆ ئەو کەسەی ئامادەی مانگی ڕەمەزان بووە، پاشان گەشتی کردوە

**٢٣١٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَافَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ عُسْفَانَ، ثُمَّ دَعَا بِإِنَاءٍ فَشَرِبَ نَهَاراً لِيَرَاهُ النَّاسُ، ثُمَّ أَفْطَرَ حَتَّى دَخَلَ مَكَّةَ، فَافْتَتَحَ مَكَّةَ فِي رَمَضَانَ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَصَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي السَّفَرِ وَأَفْطَرَ، فَمَنْ شَاءَ صَامَ وَمَنْ شَاءَ أَفْطَرَ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەباس خوا لێیان ڕازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ گەشتی کرد بە ڕۆژوو بوو تا گەیشتە عوسفان، پاشان داوای قاپێکی کرد بەڕۆژ لێی خواردەوە لەبەر ئەوەی خەڵکەکە بیبینن، پاشان بەڕۆژوو نەبوو تا چووە ناو مەککەوە لە ڕەمەزاندا، ئیبنو عەباس دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕۆژوو بوو لەگەشتدا، وە شکاندیشی، هەرکەس بیویستایە بەڕۆژوو دەبوو، هەرکەسیش بیویستایە بەڕۆژوو نەدەبوو.**

## لابردنی ڕۆژوو لەسەر ئافرەتی دوو گیان و شیردەر

**٢٣١٥-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، رَجُلٌ مِنْهُمْ أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ بِالْمَدِينَةِ وَهُوَ يَتَغَدَّى، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: هَلُمَّ إِلَى الْغَدَاءِ، فَقَالَ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ وَضَعَ لِلْمُسَافِرِ الصَّوْمَ وَشَطْرَ الصَّلَاةِ، وَعَنِ الْحُبْلَى وَالْمُرْضِعِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٤٤ و ٢٩٥٣ و ٢٩٥٤ و ٤٢٧٥ و ٤٢٧٦، ومسلم: ١١١٣.

(٢) صحيح.

(٣) حسن.



واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێک لە ئەوان هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە ئەو نانی دەخوارد، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: وەرە نان بخۆ، ئەویش وتی: من بەڕۆژووم، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: بەڕاستی خوا نوێژی لەسەر گەشتیار کردوە بە نیوەو ڕۆژووشی لەسەر لابردوە، هەروەها ڕۆژووی لەسەر ئافرەتی دووگیان و شیردەر لابردوە (لە مانگی ڕەمەزاندا).

## تەفسیری فەرمایشتی خوا ﷻ:

﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴿١٨٤﴾﴾[1].

واتە: وە پێویستە لەسەر ئەوانەی کە زۆر بە نارەحەتی ئەتوانن بەڕۆژووبن، بریتیان لەسەرە کە خۆراکی هەژارێکە.

**٢٣١٦-** «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ ﷺ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴿١٨٤﴾﴾البقرة ، كَانَ مَنْ أَرَادَ مِنَّا أَنْ يُفْطِرَ وَيَفْتَدِيَ، حَتَّى نَزَلَتِ الْآيَةُ الَّتِي بَعْدَهَا، فَنَسَخَتْهَا»[2].

واتە: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزیە خوارەوە:: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴿١٨٤﴾﴾، هەر کەس لە ئێمە بیویستایە ڕۆژووی نەدەگرت و فیدیەی دەدا، تا ئایەتەکەی دوای ئەو ئایەتە دابەزی و حوکمەکەی نەسخ کردەوە.

**٢٣١٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فِي قَوْلِهِ ﷻ: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴿١٨٤﴾﴾البقرة، يُطِيقُونَهُ: يُكَلَّفُونَهُ، فِدْيَةٌ: طَعَامُ مِسْكِينٍ وَاحِدٍ، فَمَنْ تَطَوَّعَ خَيْراً طَعَامُ مِسْكِينٍ آخَرَ لَيْسَتْ بِمَنْسُوخَةٍ فَهُوَ خَيْرٌ لَهُ، وَأَنْ تَصُومُوا خَيْرٌ لَكُمْ، لَا يُرَخَّصُ فِي هَذَا إِلَّا لِلَّذِي لَا يُطِيقُ الصِّيَامَ أَوْ مَرِيضٍ لَا يُشْفَى»[3].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) لە بارەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴿١٨٤﴾﴾، دەڵێ: (يُطِيقُونَهُ): لە تواناییاندا بێت زۆر بە نارەحەتی، (فِدْيَةٌ): خواردنی یەک هەژار، هەر کەس خواردنی هەژارێکی تریدا

(١) سورة البقرة.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٠٦، ومسلم: ١١٤٥، وأبو داود: ٢٣١٥، والترمذي: ٧٩٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٠٥، وأبو داود: ٢٣١٦ و ٢٣١٨.

ئەوە نەسخ نەکراوەو بۆی چاکترە، وە ئەگەر بەڕۆژوو بن بۆتان چاکترە، مۆڵەت نادرێ لەمەدا مەگەر بۆ کەسێک لە توانایدا نەبێ، یان نەخۆشێک چارەسەری نەبێ.

## هەڵگرتنی ڕۆژوو لەسەر ئافرەتێک لە حەیزدا بێت

**٢٣١٨-** «عَنْ مُعَاذَةَ الْعَدَوِيَّةِ، أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَتَقْضِي الْحَائِضُ الصَّلَاةَ إِذَا طَهُرَتْ؟ قَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ، كُنَّا نَحِيضُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ نَطْهُرُ فَيَأْمُرُنَا بِقَضَاءِ الصَّوْمِ، وَلَا يَأْمُرُنَا بِقَضَاءِ الصَّلَاةِ»[١].

واتە: موعاذەی عەدەوی دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک پرسیاری کرد لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ): ئایا ئەوەی لە حەیزدایە کاتێ پاک بوویەوە نوێژ قەزا بکاتەوە؟ (دەڵێ:) وتم: ئایا تۆ حەروریت (ئەوانە دەستەیەک بوون لە خواریجەکان درانە پاڵ (حروراء) ئەویش شوێنێک بوو لە نزیک کوفە)، ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەوتینە حەیزەوە پاشان پاک دەبووینەوە، فەرمانی پێکردین بە قەزا کردنەوەی ڕۆژوو، وە فەرمانی پێنەکردین بە گێڕانەوەی نوێژ.

**٢٣١٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: إِنْ كَانَ لَيَكُونُ عَلَيَّ الصِّيَامُ مِنْ رَمَضَانَ فَمَا أَقْضِيهِ حَتَّى يَجِيءَ شَعْبَانُ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئەگەر لە ڕەمەزان ڕۆژووم بکەوتبایە سەر نەمدەگێڕایەوە تا شەعبان دەهات.

## ئەگەر حەیزدار پاک بوویەوە یان گەشتیار هاتەوە لە ڕەمەزان، ئایا ئەو بەشەی ماوە لە ڕۆژەکەی بەڕۆژوو دەبێ

**٢٣٢٠-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ صَيْفِيٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ عَاشُورَاءَ: أَمِنْكُمْ أَحَدٌ أَكَلَ الْيَوْمَ؟ فَقَالُوا: مِنَّا مَنْ صَامَ، وَمِنَّا مَنْ لَمْ يَصُمْ، قَالَ: فَأَتِمُّوا بَقِيَّةَ يَوْمِكُمْ، وَابْعَثُوا إِلَى أَهْلِ الْعَرُوضِ، فَلْيُتِمُّوا بَقِيَّةَ يَوْمِهِمْ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢١، ومسلم: ٦٧ و ٣٣٥/٦٩، وأبو داود: ٢٦٢، والترمذي: ١٣٠ و ٧٨٧، وإبن ماجه: ٦٣١ و ١٦٧٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٥٠، ومسلم: ١١٤٦، وأبو داود: ٢٣٩٩، والترمذي: ٧٨٣، وإبن ماجه: ١٦٦٩.

(٣) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٧٣٥.




واتە: موحەممەدی کوڕی صەیفی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی عاشورا فەرمووی: ئایا کەسێک لە ئێوە هەیە ئەمڕۆ نانی خواردبێ؟ وتیان: تیاماندایە بەڕۆژووەو تیاماندایە بەڕۆژوو نیە، فەرمووی: ئەو بەشەی ماوە لە ڕۆژەکەتان تەواوی بکەن و هیچ مەخۆن تا ئێوارە، وە خەڵکی مەککەو مەدینەو دەوروبەریان ئاگادار بکەنەوە، با ئەو بەشەی ماوە لە ڕۆژەکەیان تەواوی بکەن هیچ نەخۆن هەتا ئێوارە.

## ئەگەر (کەسێک) لە شەودا نیەت نەهێنێ ئایا ئەو ڕۆژە دەتوانێ ڕۆژووی سوننەت بگرێ؟

**٢٣٢١-** «عَن سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لِرَجُلٍ أَذِّنْ يَوْمَ عَاشُورَاءَ: مَنْ كَانَ أَكَلَ فَلْيُتِمَّ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ أَكَلَ فَلْيَصُمْ»[١].

واتە: سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە پیاوێکی فەرموو: خەڵکی ئاگادار بکەرەوە لە ڕۆژی عاشورادا: هەر کەس نانی خواردوە با ئەو بەشەی ماوە لە ڕۆژەکەیدا تەواوی بکات، هەر کەسیش نانی نەخواردوە با بەڕۆژوو بێت.

## نیەت هێنان لە ڕۆژووگرتنداو، جیاوازی لەسەر تەڵحەی کوڕی یەحیای کوڕی تەڵحە لە هەواڵەکەی عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) لە فەرموودەکەدا

**٢٣٢٢-** «عَن أَبِي الْأَحْوَصِ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ يَحْيَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْماً، فَقَالَ: هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟، فَقُلْتُ: لَا، قَالَ: فَإِنِّي صَائِمٌ، ثُمَّ مَرَّ بِي بَعْدَ ذَلِكَ الْيَوْمِ وَقَدْ أُهْدِيَ إِلَيَّ حَيْسٌ فَخَبَأْتُ لَهُ مِنْهُ، وَكَانَ يُحِبُّ الْحَيْسَ. قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ أُهْدِيَ لَنَا حَيْسٌ فَخَبَأْتُ لَكَ مِنْهُ، قَالَ: أَدْنِيهِ أَمَا إِنِّي قَدْ أَصْبَحْتُ وَأَنَا صَائِمٌ فَأَكَلَ مِنْهُ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّمَا مَثَلُ صَوْمِ الْمُتَطَوِّعِ مَثَلُ الرَّجُلِ يُخْرِجُ مِنْ مَالِهِ الصَّدَقَةَ، فَإِنْ شَاءَ أَمْضَاهَا، وَإِنْ شَاءَ حَبَسَهَا»[٢].

واتە: ئەبو لئەحوص دەگێڕێتەوە: لە تەڵحەی کوڕی یەحیای کوڕی تەڵحە، لە موجاهید، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێک

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٢٤ و ٢٠٠٧، ومسلم: ١١٣٥.

(٢) حسن.




هاتە ژوورەوە بۆ لام، فەرمووی: ئایا هیچ شتێکتان لا هەیە بۆ خواردن؟ وتم: نەخێر، فەرمووی: کەواتە من بەڕۆژووم. پاشان ئەو ڕۆژەمان تێپەڕاند، ڕۆژەکەی دوایی خواردنێکیان بە دیاری بۆ هێنابووم لە خورماو ڕۆن شتی تر دروست کرابوو پێی دەوترا (حَيْس)، بەشی ئەوم شاردەوە، ئەویش حەزی لەو خواردنە بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، حەیسیان بۆ هێناوین بە دیاری بەشی تۆم لێ هەڵگرتووە، فەرمووی: نزیکی بکەرەوە، من بەیانیم کردەوە بەڕۆژوو بووم. ئینجا لێی خوارد، پاشان فەرمووی: نموونەی ڕۆژووی سوننەت وەکو کەسێک وایە لە ماڵەکەی دەربهێنێ بۆ بەخشین، ئەگەر ویستی دەیبەخشێ، ئەگەر ویستی دەیگرێتەوە (واتە: ئازادە کامیان هەڵدەبژێرێت).

**٢٣٢٣-** «عَنْ شَرِيكٌ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ يَحْيَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: دَارَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ دَوْرَةً، قَالَ: أَعِنْدَكِ شَيْءٌ؟ قَالَتْ: لَيْسَ عِنْدِي شَيْءٌ، قَالَ: فَأَنَا صَائِمٌ، قَالَتْ: ثُمَّ دَارَ عَلَيَّ الثَّانِيَةَ، وَقَدْ أُهْدِيَ لَنَا حَيْسٌ، فَجِئْتُ بِهِ، فَأَكَلَ فَعَجِبْتُ مِنْهُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، دَخَلْتَ عَلَيَّ وَأَنْتَ صَائِمٌ، ثُمَّ أَكَلْتَ حَيْساً، قَالَ: نَعَمْ يَا عَائِشَةُ، إِنَّمَا مَنْزِلَةُ مَنْ صَامَ فِي غَيْرِ رَمَضَانَ، أَوْ غَيْرِ قَضَاءِ رَمَضَانَ، أَوْ فِي التَّطَوُّعِ بِمَنْزِلَةِ رَجُلٍ أَخْرَجَ صَدَقَةَ مَالِهِ فَجَادَ مِنْهَا بِمَا شَاءَ فَأَمْضَاهُ، وَبَخِلَ مِنْهَا بِمَا بَقِيَ فَأَمْسَكَهُ»[١].

واتە: شەریک دەگێڕێتەوە: لە تەڵحەی کوڕی یەحیای کوڕی تەڵحە، لە موجاهید، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ جارێک هات بۆ لام، فەرمووی: ئایا شتێکت لا هەیە بۆ خواردن؟ وتم: هیچم لەلا نیە، فەرمووی: کەواتە من بەڕۆژووم، وتی: پاشان جارێکی دیکە هاتەوە بۆ لام، خواردنی حەیسیان[٢] بۆ کردبووین بە دیاری، منیش بۆم هێنا، لێی خوارد منیش سەرم سوڕما لێی، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، هاتیتە ژوورەوە بۆ لام بەڕۆژوو بووی، پاشان حەیست خوارد! فەرمووی: بەڵێ ئەی عائیشە، بێگومان پلەی ئەو کەسەی لە غەیری ڕەمەزان بەڕۆژوو دەبێ، یان جگە لە قەزا کردنەوەی ڕەمەزان، یان لە سوننەت، وەکو پیاوێک وایە ماڵەکەی دەرهێنا بێت بۆ بەخشین، ئەوەی ویستی لەسەر بێ دەیبەخشێ و ڕەزیلیش بکات لەوەی کە ماوەتەوە بیگرێتەوە.

---

(١) حسن.

(٢) حَيْس: تێکەڵەیە لە خورما و ڕۆن و کەشك. (سونەنی ئەبو داود - ناصح سازانی).

**٢٣٢٤-** «عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ يَحْيَى، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَجِيءُ، وَيَقُولُ: هَلْ عِنْدَكُمْ غَدَاءٌ؟ فَنَقُولُ: لَا، فَيَقُولُ: إِنِّي صَائِمٌ، فَأَتَانَا يَوْماً وَقَدْ أُهْدِيَ لَنَا حَيْسٌ، فَقَالَ: هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟ قُلْنَا: نَعَمْ، أُهْدِيَ لَنَا حَيْسٌ، قَالَ: أَمَا إِنِّي قَدْ أَصْبَحْتُ أُرِيدُ الصَّوْمَ، فَأَكَلَ»[١].

**واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە: لە تەڵحەی کوڕی یەحیا، ئەویش لە موجاهید لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەهات دەیفەرموو: ئایا شتێکتان لا هەیە بۆ خواردن؟ دەمانوت: نەخێر، دەیفەرموو: من بەڕۆژووم، ڕۆژێک هات بۆ لامان ئەو ڕۆژە خوادنی حەیسیان بە دیاری بۆ هێنا بووین، فەرمووی: بەڵام من بەیانی هەڵسام ویستم بەڕۆژوو بم، پاشان لێی خوارد.**

**٢٣٢٥-** «عَنْ سُفْيَانُ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ يَحْيَى، عَنْ عَائِشَةَ بِنْتِ طَلْحَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ قَالَتْ: أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْماً، فَقُلْنَا: أُهْدِيَ لَنَا حَيْسٌ قَدْ جَعَلْنَا لَكَ مِنْهُ نَصِيباً، فَقَالَ: إِنِّي صَائِمٌ، فَأَفْطَرَ»[٢].

**واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە: لە تەڵحەی کوڕی یەحیای، لە عائیشەی کچی تەڵحە، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دایکی ئیماندارن دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێک هات بۆ لامان، وتمان: خواردنی حەیسیان بە دیاری بۆ هێناوین بەشی تۆشمان لێی داناوە، فەرمووی: من بەڕۆژووم، پاشان ڕۆژووەکەی شکاند.**

**٢٣٢٦-** «عَنْ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا طَلْحَةُ بْنُ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَتْنِي عَائِشَةُ بِنْتُ طَلْحَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَأْتِيهَا وَهُوَ صَائِمٌ، فَقَالَ: أَصْبَحَ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ تُطْعِمِينِيهِ؟ فَنَقُولُ: لَا، فَيَقُولُ: إِنِّي صَائِمٌ، ثُمَّ جَاءَهَا بَعْدَ ذَلِكَ، فَقَالَتْ: أُهْدِيَتْ لَنَا هَدِيَّةٌ، فَقَالَ: مَا هِيَ؟ قَالَتْ: حَيْسٌ، قَالَ: قَدْ أَصْبَحْتُ صَائِماً، فَأَكَلَ»[٣].

**واتە: یەحیا دەڵێ: تەڵحەی کوڕی یەحیا بۆی باس کردین وتی: عائیشەی کچی تەڵحە بۆی باس کردم، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دایکی ئیمانداران دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای بەڕۆژوو بوو، فەرمووی: شتێکتان لەلا هەیە پێم بدەن**

---

(١) حسن صحيح.

(٢) حسن صحيح.

(٣) حسن صحيح.




بیخۆم؟ دەمانوت: نەخێر، دەیفەرموو: کەواتە: من بەڕۆژووم، پاشان جارێکی تر دوای ئەو جارە هاتەوە بۆ لای، عائیشە وتی: دیاریەکیان بۆ هێناوین، فەرمووی: چیە؟ وتی: خواردنی (حَيْسٌ)ـە، فەرمووی: کاتێک بەیانیم کردەوە بەڕۆژوو بووم، پاشان لێی خوارد.

**٢٣٢٧-** «عَنْ وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا طَلْحَةُ بْنُ يَحْيَى، عَنْ عَمَّتِهِ عَائِشَةَ بِنْتِ طَلْحَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ، فَقَالَ: هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟ قُلْنَا: لَا، قَالَ: فَإِنِّي صَائِمٌ»[١].

**واتە: وەکیع دەڵێ: تەڵحەی کوڕی یەحیا بۆی باس کردین لە پووریەوە عائیشەی کچی تەڵحە، ئەویش لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دایکی ئیمانداران دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێک هاتە ژوورەوە بۆ لام، فەرمووی: ئایا شتێکتان لا هەیە؟ وتمان: نەخێر، فەرمووی: کەواتە: من بەڕۆژووم.**

**٢٣٢٨-** «عَنْ الْقَاسِمِ بْنِ مَعْنٍ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ يَحْيَى، عَنْ عَائِشَةَ بِنْتِ طَلْحَةَ، وَمُجَاهِدٍ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَتَاهَا، فَقَالَ: هَلْ عِنْدَكُمْ طَعَامٌ؟ فَقُلْتُ: لَا، قَالَ: إِنِّي صَائِمٌ، ثُمَّ جَاءَ يَوْماً آخَرَ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا قَدْ أُهْدِيَ لَنَا حَيْسٌ، فَدَعَا بِهِ، فَقَالَ: أَمَا إِنِّي قَدْ أَصْبَحْتُ صَائِماً، فَأَكَلَ»[٢].

**واتە: قاسمی کوڕی مەعن دەگێڕێتەوە: لە تەڵحەی کوڕی یەحیا، لە عائیشەی کچی تەڵحەو موجاهید، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لای فەرمووی: ئایا خواردنێکتان لا هەیە؟ وتم: نەخێر، فەرمووی: من بەڕۆژووم. پاشان ڕۆژێکی تر هاتەوە، عائیشە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، دیاریەکیان بۆ هێناوین کە (حَيْسٌ)ـە، داوای کرد، فەرمووی: کاتێک بەیانیم کردەوە بەڕۆژوو بووم. پاشان لێی خوارد.**

**٢٣٢٩-** «عَنِ الْقَاسِمُ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ يَحْيَى، عَنْ مُجَاهِدٍ، وَأُمِّ كُلْثُومٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ، فَقَالَ: هَلْ عِنْدَكُمْ طَعَامٌ، نَحْوَهُ»[٣].

---

(١) حسن صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٩ و ١١٥٤/١٧٠، وأبو داود: ٢٤٥٥، والترمذي: ٧٣٣ و ٧٣٤، وإبن ماجه: ١٧٠١.

(٣) حسن صحيح.




**٢٣٢٤-** «عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ يَحْيَى، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَجِيءُ، وَيَقُولُ: هَلْ عِنْدَكُمْ غَدَاءٌ؟ فَنَقُولُ: لَا، فَيَقُولُ: إِنِّي صَائِمٌ، فَأَتَانَا يَوْماً وَقَدْ أُهْدِيَ لَنَا حَيْسٌ، فَقَالَ: هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟ قُلْنَا: نَعَمْ، أُهْدِيَ لَنَا حَيْسٌ، قَالَ: أَمَا إِنِّي قَدْ أَصْبَحْتُ أُرِيدُ الصَّوْمَ، فَأَكَلَ»[١].

**واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە: لە تەڵحەی کوڕی یەحیا، ئەویش لە موجاهید لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەهات دەیفەرموو: ئایا شتێکتان لا هەیە بۆ خواردن؟ دەمانوت: نەخێر، دەیفەرموو: من بەڕۆژووم، ڕۆژێک هات بۆ لامان ئەو ڕۆژە خوادنی حەیسیان بە دیاری بۆ هێنا بووین، فەرمووی: بەڵام من بەیانی هەڵسام ویستم بەڕۆژوو بم، پاشان لێی خوارد.**

**٢٣٢٥-** «عَنْ سُفْيَانُ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ يَحْيَى، عَنْ عَائِشَةَ بِنْتِ طَلْحَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ قَالَتْ: أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْماً، فَقُلْنَا: أُهْدِيَ لَنَا حَيْسٌ قَدْ جَعَلْنَا لَكَ مِنْهُ نَصِيباً، فَقَالَ: إِنِّي صَائِمٌ، فَأَفْطَرَ»[٢].

**واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە: لە تەڵحەی کوڕی یەحیای، لە عائیشەی کچی تەڵحە، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دایکی ئیمانداران دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێک هات بۆ لامان، وتمان: خواردنی حەیسیان بە دیاری بۆ هێناوین بەشی تۆشمان لێی داناوە، فەرمووی: من بەڕۆژووم، پاشان ڕۆژووەکەی شکاند.**

**٢٣٢٦-** «عَنْ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا طَلْحَةُ بْنُ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَتْنِي عَائِشَةُ بِنْتُ طَلْحَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَأْتِيهَا وَهُوَ صَائِمٌ، فَقَالَ: أَصْبَحَ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ تُطْعِمِينِيهِ؟ فَنَقُولُ: لَا، فَيَقُولُ: إِنِّي صَائِمٌ، ثُمَّ جَاءَهَا بَعْدَ ذَلِكَ، فَقَالَتْ: أُهْدِيَتْ لَنَا هَدِيَّةٌ، فَقَالَ: مَا هِيَ؟ قَالَتْ: حَيْسٌ، قَالَ: قَدْ أَصْبَحْتُ صَائِماً، فَأَكَلَ»[٣].

**واتە: یەحیا دەڵێ: تەڵحەی کوڕی یەحیا بۆی باس کردین وتی: عائیشەی کچی تەڵحە بۆی باس کردم، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دایکی ئیمانداران دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای بەڕۆژوو بوو، فەرمووی: شتێکتان لەلا هەیە پێم بدەن**

---

(١) حسن صحيح.

(٢) حسن صحيح.

(٣) حسن صحيح.




بیخۆم؟ دەمانوت: نەخێر، دەیفەرموو: کەواتە: من بەڕۆژووم، پاشان جارێکی تر دوای ئەو جارە هاتەوە بۆ لای، عائیشە وتی: دیاریەکیان بۆ هێناوین، فەرمووی: چیە؟ وتی: خواردنی (حَيْسٌ)ـە، فەرمووی: کاتێک بەیانیم کردەوە بەڕۆژوو بووم، پاشان لێی خوارد.

**٢٣٢٧-** «عَنْ وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا طَلْحَةُ بْنُ يَحْيَى، عَنْ عَمَّتِهِ عَائِشَةَ بِنْتِ طَلْحَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ، فَقَالَ: هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟ قُلْنَا: لَا، قَالَ: فَإِنِّي صَائِمٌ»[١].

واتە: وەکیع دەڵێ: تەڵحەی کوڕی یەحیا بۆی باس کردین لە پووریەوە عائیشەی کچی تەڵحە، ئەویش لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دایکی ئیمانداران دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێک هاتە ژوورەوە بۆ لام، فەرمووی: ئایا شتێکتان لا هەیە؟ وتمان: نەخێر، فەرمووی: کەواتە: من بەڕۆژووم.

**٢٣٢٨-** «عَنْ الْقَاسِمِ بْنِ مَعْنٍ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ يَحْيَى، عَنْ عَائِشَةَ بِنْتِ طَلْحَةَ، وَمُجَاهِدٍ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَتَاهَا، فَقَالَ: هَلْ عِنْدَكُمْ طَعَامٌ؟ فَقُلْتُ: لَا، قَالَ: إِنِّي صَائِمٌ، ثُمَّ جَاءَ يَوْماً آخَرَ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا قَدْ أُهْدِيَ لَنَا حَيْسٌ، فَدَعَا بِهِ، فَقَالَ: أَمَا إِنِّي قَدْ أَصْبَحْتُ صَائِماً، فَأَكَلَ»[٢].

واتە: قاسمی کوڕی مەعن دەگێڕێتەوە: لە تەڵحەی کوڕی یەحیا، لە عائیشەی کچی تەڵحەو موجاهید، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لای فەرمووی: ئایا خواردنێکتان لا هەیە؟ وتم: نەخێر، فەرمووی: من بەڕۆژووم. پاشان ڕۆژێکی تر هاتەوە، عائیشە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، دیاریەکیان بۆ هێناوین کە (حَيْسٌ)ـە، داوای کرد، فەرمووی: کاتێک بەیانیم کردەوە بەڕۆژوو بووم. پاشان لێی خوارد.

**٢٣٢٩-** «عَنِ الْقَاسِمُ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ يَحْيَى، عَنْ مُجَاهِدٍ، وَأُمِّ كُلْثُومٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ، فَقَالَ: هَلْ عِنْدَكُمْ طَعَامٌ، نَحْوَهُ»[٣].

---

(١) حسن صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٩ و ١١٥٤/١٧٠، وأبو داود: ٢٤٥٥، والترمذي: ٧٣٣ و ٧٣٤، وإبن ماجه: ١٧٠١.

(٣) حسن صحيح.




**واتە: قاسم دەگێڕێتەوە: لە تەڵحەی کوڕی یەحیا، لە موجاهیدو ئوم کەلسوم (خوا لێی ڕازی بێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ژوورەوە بۆ لای عائیشە، فەرمووی: ئایا خواردنێکتان لا هەیە؟ وەکو فەرموودەکەی دیکە (ی گێڕایەوە).**

**٢٣٣٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ قَالَتْ: جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْماً، فَقَالَ: هَلْ عِنْدَكُمْ مِنْ طَعَامٍ؟ قُلْتُ: لَا، قَالَ: إِذاً أَصُومُ، قَالَتْ: وَدَخَلَ عَلَيَّ مَرَّةً أُخْرَى، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ أُهْدِيَ لَنَا حَيْسٌ، فَقَالَ: إِذاً أُفْطِرُ الْيَوْمَ وَقَدْ فَرَضْتُ الصَّوْمَ»[١].

**واتە: دایکی ئیمانداران عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێک هات بۆ لامان، فەرمووی: خواردنێکتان لا هەیە؟ وتم: نەخێر، فەرمووی: کەواتە من بەڕۆژووم، وتی: جارێکی تر هاتەوە بۆ لام، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، (حَيْس)مان بە دیاری بۆ هاتووە، فەرمووی: کەواتە من ئەمڕۆ دەیشکێنم لە کاتێکدا نیەتی ڕۆژووم هێنا بوو.**

## باسی جیاوازی ئەوانەی فەرموودەکەی حەفصەیان گواستۆتەوە تیایدا

**٢٣٣١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ حَفْصَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ لَمْ يُبَيِّتِ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ، فَلَا صِيَامَ لَهُ»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە: لە حەفصەوە ﵂، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس پێش بەیانی نیەتی ڕۆژوو نەهێنێ، ئەوە ڕۆژووی بۆ نیە.**

**٢٣٣٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ لَمْ يُبَيِّتِ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ، فَلَا صِيَامَ لَهُ»[٣].

**واتە: عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە: لە حەفصەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس پێش بەیانی نیەتی ڕۆژوو نەهێنێ، ئەوە ڕۆژووی بۆ نیە.**

**٢٣٣٣-** «عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ حَفْصَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ طُلُوعِ الْفَجْرِ، فَلَا يَصُومُ»[٤].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٤٥٤، والترمذي: ٧٣٠، وإبن ماجه: ١٧٠٠.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**واتە: سالمی کوڕی عەبدوڵلا، لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە: لە حەفصە ﵂، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس پێش دەرچوونی بەرەبەیان نیەتی ڕۆژوو نەهێنێ، ئەوە ڕۆژووی بۆ نیە.**

**٢٣٣٤-** «عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ حَفْصَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنْ لَمْ يُبَيِّتِ الصِّيَامَ مِنَ اللَّيْلِ، فَلَا صِيَامَ لَهُ»(١).

**واتە: سالم دەگێڕێتەوە: لە ئیبنو عومەر، لە حەفصەوە ﵂، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس پێش بەیانی نیەتی ڕۆژوو نەهێنێ، ئەوە ڕۆژووی بۆ نیە.**

**٢٣٣٥-** «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ حَفْصَةَ ﵂، أَنَّهَا كَانَتْ تَقُولُ: مَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ مِنَ اللَّيْلِ فَلَا يَصُومُ»(٢).

**واتە: سالمی کوڕی عەبدوڵلا، لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە: لە حەفصەوە ﵂ دەڵێ: هەر کەس پێش دەرچوونی بەرەبەیان نیەتی ڕۆژوو نەهێنێ، ئەوە ڕۆژووی بۆ نیە.**

**٢٣٣٦-** «عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَتْ حَفْصَةُ ﵂، زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ: لَا صِيَامَ لِمَنْ لَمْ يُجْمِعْ قَبْلَ الْفَجْرِ»(٣).

**واتە: حەمزەی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە دەڵێ: حەفصە (خوا لێیان ڕازی بێ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: ڕۆژوو نیە بۆ کەسێک کە پێش بەرەبەیان نیەتی نەهێنا بێت.**

**٢٣٣٧-** «عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ حَفْصَةَ ﵂ قَالَتْ: لَا صِيَامَ لِمَنْ لَمْ يُجْمِعْ قَبْلَ الْفَجْرِ»(٤).

**واتە: حەمزەی کوڕی عەبدوڵلا دەگێڕێتەوە: لە عەبدوڵلای کوڕی عومەر، لە حەفصەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ڕۆژوو نیە بۆ کەسێک کە پێش بەرەبەیان نیەتی نەهێنا بێت.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح موقوف.

(٣) صحيح موقوف.

(٤) صحيح موقوف.





**٢٣٣٨-** «عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ حَفْصَةَ ﵂ قَالَتْ: لَا صِيَامَ لِمَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ»[(١)].

**واتە: حەمزەی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە، لە حەفصەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ڕۆژوو نیە بۆ کەسێک کە پێش بەرەبەیان نیەتی نەهێنا بێت.**

**٢٣٣٩-** «عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ حَفْصَةَ ﵂ قَالَتْ: لَا صِيَامَ لِمَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ»[(٢)].

**واتە: حەمزەی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە: لە حەفصەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ڕۆژوو نیە بۆ کەسێک کە پێش بەرەبەیان نیەتی نەهێنا بێت.**

**٢٣٤٠-** «عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ حَفْصَةَ ﵂ قَالَتْ: لَا صِيَامَ لِمَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ»[(٣)].

**واتە: حەمزەی کوڕی عەبدوڵلا دەگێڕێتەوە: حەفصە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ڕۆژوو نیە بۆ کەسێک کە پێش بەرەبەیان نیەتی نەهێنا بێت.**

**٢٣٤١-** «عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَائِشَةَ، وَحَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، مِثْلَهُ، لَا يَصُومُ إِلَّا مَنْ أَجْمَعَ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ»[(٤)].

**واتە: ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە: لە عائیشەو حەفصەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، هەمان فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، ڕۆژووی بۆ نیە مەگەر کەسێک نیەتی ڕۆژوو بهێنێ پێش بەرەبەیان.**

**٢٣٤٢-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: إِذَا لَمْ يُجْمِعِ الرَّجُلُ الصَّوْمَ مِنَ اللَّيْلِ فَلَا يَصُمْ»[(٥)].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئەگەر کەسێک لە شەودا نیەتی ڕۆژووی نەهێنا با ڕۆژوو نەگرێ.**

---

(١) صحيح موقوف.

(٢) صحيح موقوف.

(٣) صحيح موقوف.

(٤) صحيح لغيره.

(٥) صحيح موقوف.




**٢٣٤٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: لَا يَصُومُ إِلَّا مَنْ أَجْمَعَ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ڕۆژووی بۆ نیە مەگەر کەسێک نیەتی ڕۆژوو بهێنێ پێش بەرەبەیان.

## ڕۆژوو گرتنی پێغەمبەری خوا داود (علیه السلام)

**٢٣٤٤-** «عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللَّهِ ﷻ صِيَامُ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ، كَانَ يَصُومُ يَوْماً وَيُفْطِرُ يَوْماً، وَأَحَبُّ الصَّلَاةِ إِلَى اللَّهِ ﷻ صَلَاةُ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ، كَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ، وَيَقُومُ ثُلُثَهُ، وَيَنَامُ سُدُسَهُ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆشەویسترین ڕۆژوو لای خوا ﷻ ڕۆژووی داودە (عَلَيْهِ السَّلَام)، ڕۆژێک بە ڕۆژوو دەبوو، ڕۆژێکی تریش بە ڕۆژوو نەدەبوو، وە خۆشەویسترین نوێژ لای خوا ﷻ نوێژی داودە (عَلَيْهِ السَّلَامُ)، نیوەی شەو دەخەوت، سێیەکی نوێژی دەکرد، وە شەش یەکیشی دەخەوتەوە.

## ڕۆژووی پێغەمبەر ﷺ دایک و باوکم بە قوربانی بێت، وە باسی جیاوازی ئەوانەی فەرموودەکەیان گواستۆتەوە تیایدا

**٢٣٤٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يُفْطِرُ أَيَّامَ الْبِيضِ فِي حَضَرٍ وَلَا سَفَرٍ»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژە سپیەکاندا ڕۆژووی نەدەشکاند نە لە شوێنی نیشتەجێبوون نە لە گەشتدا.

تێبینی: (أَيَّامَ الْبِيضِ): بریتیە لەو ڕۆژانەی مانگ تیایاندا گەشاوەیە، هیچ تاریکیەکی تێدانیە، ئەویش شەوەکانی: سێزدەو چواردەو پازدەیە (١٣ و ١٤ و ١٥)ی مانگە،

---

(١) صحيح موقوف.

(٢) صحيح.

(٣) حسن.

وە وشەی: (الْبِيض) کۆی سپیە، بۆیە سپیایی دراوەتە پاڵ ئەو ڕۆژانە، چونکە شەوەکانیان ڕووناکە.

**٢٣٤٦-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ لَا يُفْطِرُ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ مَا يُرِيدُ أَنْ يَصُومَ، وَمَا صَامَ شَهْراً مُتَتَابِعاً غَيْرَ رَمَضَانَ مُنْذُ قَدِمَ الْمَدِينَةَ»(١).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێک جار ئەوەندە بە ڕۆژووی دەبوو تا دەمانوت ئیتر نایشکێنێت (ناوبڕی نەدەکرد) جاری واش هەبوو ئەوەندە بە ڕۆژوو نەدەبوو تا دەمانوت نایەوێ ڕۆژوو بگرێ، هیچ مانگێکی بە تەواوی نەدەگرت جگە لە ڕەمەزان لەو کاتەی هاتە مەدینە.**

**٢٣٤٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ مَا يُرِيدُ أَنْ يُفْطِرَ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ مَا يُرِيدُ أَنْ يَصُومَ»(٢).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە ڕۆژووی دەگرت تا دەمانوت نایەوێ بیشکێنێت، وە ئەوەندە بە ڕۆژوو نەدەبوو تا دەمانوت نایەوێ بەڕۆژوو بێت.**

**٢٣٤٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: لَا أَعْلَمُ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَرَأَ الْقُرْآنَ كُلَّهُ فِي لَيْلَةٍ، وَلَا قَامَ لَيْلَةً حَتَّى الصَّبَاحِ، وَلَا صَامَ شَهْراً قَطُّ كَامِلاً غَيْرَ رَمَضَانَ»(٣).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: نەمزانیوە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو قورئانی لە شەوێکدا خوێندبێ و، نەشمزانیوە شەوێک هەڵسابێ بۆ شەونوێژ تا بەیانی، وە نە مانگێک بە تەواوی بە ڕۆژوو بووبێت جگە لە ڕەمەزان.**

**٢٣٤٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ، عَنْ صِيَامِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كَانَ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ قَدْ صَامَ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ قَدْ أَفْطَرَ، وَمَا صَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ شَهْراً كَامِلاً مُنْذُ قَدِمَ الْمَدِينَةَ إِلَّا رَمَضَانَ»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٧١، ومسلم: ١٧٨ و ١١٥٧/١٧٩، وأبو داود: ٢٤٣٠، وابن ماجه: ١٧١١.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەربارەی ڕۆژووی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەوەندە ڕۆژووی دەگرت تا دەمانوت ئیتر هەر بەڕۆژوو دەبێت، وە ئەوەندە بەڕۆژوو نەدەبوو تا دەمانوت ئیتر بەڕۆژوو نابێت، پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ مانگێکی بە تەواوی ڕۆژووی نەگرتووە لەو ڕۆژەی هاتە مەدینە جگە لە ڕەمەزان.**

**٢٣٥٠-** «عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا تَقُولُ: كَانَ أَحَبَّ الشُّهُورِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَصُومَهُ شَعْبَانُ، بَلْ كَانَ يَصِلُهُ بِرَمَضَانَ»(١).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: خۆشەویسترین مانگ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژووی تێدا بگرتایە، ڕۆژووی مانگی شەعبان بوو، بەڵکو بەدەم ڕۆژوو گرتنەوە دەیگەیاند بە ڕەمەزان.**

**٢٣٥١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ مَا يُفْطِرُ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ مَا يَصُومُ، وَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي شَهْرٍ أَكْثَرَ صِيَاماً مِنْهُ فِي شَعْبَانَ»(٢).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێک جار ئەوەندە بە ڕۆژووی دەبوو تا دەمانوت ئیتر نایشکێنێت (ناوبڕی نەدەکرد) جاری واش هەبوو بە ڕۆژوو نەدەبوو تا دەمانوت نایەوێ ڕۆژوو بگرێ، پێغەمبەرم نەبینیوە لە هیچ مانگێکدا ئەوەندە زۆر بەڕۆژوو بوو بێت جگە لە شەعبان.**

**٢٣٥٢-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ لَا يَصُومُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ إِلَّا شَعْبَانَ وَرَمَضَانَ»(٣).

**واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو مانگ بە دوای یەکتردا بەڕۆژوو نەدەبوو جگە لە شەعبان و ڕەمەزان.**

**٢٣٥٣-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ يَصُومُ مِنَ السَّنَةِ شَهْراً تَامّاً إِلَّا شَعْبَانَ، وَيَصِلُ بِهِ رَمَضَانَ»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٤٣١.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە ساڵەکەدا مانگێک بە تەواوی بەڕۆژوو نەدەبوو جگە لە شەعبان، ڕەمەزانیشی دەگەیاند پێی.

**٢٣٥٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِشَهْرٍ أَكْثَرَ صِيَاماً مِنْهُ لِشَعْبَانَ، كَانَ يَصُومُهُ أَوْ عَامَّتَهُ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ مانگێک ئەوەندەی شەعبان ڕۆژووی زۆری تێدا نەدەگرت، ڕۆژووی ئەو مانگەی دەگرت، یان هەموو مانگەکە.**

**٢٣٥٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ شَعْبَانَ إِلَّا قَلِيلاً»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژووی شەعبانی دەگرت مەگەر کەمێکی نەبێت.**

**٢٣٥٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ كُلَّهُ»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژووی شەعبانی دەگرت مەگەر کەمێکی نەبێت.**

**٢٣٥٧-** «عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رضي الله عنه قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَمْ أَرَكَ تَصُومُ شَهْراً مِنَ الشُّهُورِ مَا تَصُومُ مِنْ شَعْبَانَ، قَالَ: ذَلِكَ شَهْرٌ يَغْفُلُ النَّاسُ عَنْهُ بَيْنَ رَجَبٍ وَرَمَضَانَ، وَهُوَ شَهْرٌ تُرْفَعُ فِيهِ الْأَعْمَالُ إِلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ، فَأُحِبُّ أَنْ يُرْفَعَ عَمَلِي وَأَنَا صَائِمٌ»[٤].

**واتە: ئوسامەی کوڕی زەید رضي الله عنه دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، نەمبینیوی هیچ مانگێک لە مانگەکان ئەوەندەی شەعبان بەڕۆژوو بێت، فەرمووی: ئەوە مانگێکە خەڵکی تیایدا بێئاگا دەبن دەکەوێتە نێوان ڕەجەب و ڕەمەزان، ئەو مانگە کردەوەکانی تێدا بەرز دەبێتەوە بۆ لای پەروەردگاری جیهانییان، حەز دەکەم کردەوەکانم بەرز بکرێنەوەو من بەڕۆژوو بم.**

---

(١) حسن صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) حسن.





**٢٣٥٨-** «عَنْ أُسَامَةِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ تَصُومُ حَتَّى لَا تَكَادَ تُفْطِرُ، وَتُفْطِرُ حَتَّى لَا تَكَادَ أَنْ تَصُومَ، إِلَّا يَوْمَيْنِ إِنْ دَخَلَا فِي صِيَامِكَ وَإِلَّا صُمْتَهُمَا، قَالَ: أَيُّ يَوْمَيْنِ؟ قُلْتُ: يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ، قَالَ: ذَانِكَ يَوْمَانِ تُعْرَضُ فِيهِمَا الْأَعْمَالُ عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ، فَأُحِبُّ أَنْ يُعْرَضَ عَمَلِي وَأَنَا صَائِمٌ»[١].

**واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ ئەوەندە بەڕۆژوو دەبیت تا خەریکە (بڵێم ڕۆژێک نیە) بە ڕۆژوو نەبیت، ئەوەندەش ڕۆژوو ناگری تا خەریکە بەڕۆژوو نەبیت، جگە لە دوو ڕۆژ نەبێت ئەگەر بکەوێتە ناو ڕۆژەکانی بە ڕۆژوو بوونت، یان ئەو ڕۆژانەی بێ ڕۆژوویت حەتمەن هەر دەیانگری، فەرمووی: کام دوو ڕۆژ؟ وتم: ڕۆژی دوو شەممەو ڕۆژی پێنج شەممە، فەرمووی: ئەوە دوو ڕۆژە کردەوەکان لای پەروەردگاری جیهانییان دەخرێنە ڕوو، حەز دەکەم کردەوەکانم بخرێنە ڕوو من بەڕۆژوو بم**

**٢٣٥٩-** «عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَسْرُدُ الصَّوْمَ، فَيُقَالُ: لَا يُفْطِرُ، وَيُفْطِرُ، فَيُقَالُ: لَا يَصُومُ»[٢].

**واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە بەڕۆژوو دەبوو، دەترا: ئیتر نایشکێنێت، وە ئەوەندەش بەڕۆژوو نەدەبوو تا دەوترا: ئیتر بەڕۆژوو نابێت.**

**٢٣٦٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَتَحَرَّى صِيَامَ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر گرنگی دەدا بە ڕۆژوو گرتنی ڕۆژی دوو شەممەو پێنج شەممە.**

**٢٣٦١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَحَرَّى يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ»[٤].

---

(١) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٤٣٦.

(٢) حسن صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.





**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر گرنگی دەدا بە ڕۆژوو گرتنی ڕۆژی دوو شەممەو پێنج شەممە.**

**٢٣٦٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَحَرَّى الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسَ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر گرنگی دەدا بە ڕۆژوو گرتنی ڕۆژی دوو شەممەو پێنج شەممە.**

**٢٣٦٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَحَرَّى يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر گرنگی دەدا بە ڕۆژوو گرتنی ڕۆژی دوو شەممەو پێنج شەممە.**

**٢٣٦٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَصُومُ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسَ»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی دوو شەممەو پێنج شەممە بە ڕۆژوو دەبوو.**

**٢٣٦٥-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ: الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسَ مِنْ هَذِهِ الْجُمُعَةِ، وَالِاثْنَيْنِ مِنَ الْمُقْبِلَةِ»[٤].

**واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو هەفتەیەکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو: دووشەممەو پێنج شەممە لەم هەینیەدا، وە دووشەممەی داهاتوو.**

**٢٣٦٦-** «عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ يَوْمَ الْخَمِيسِ، وَيَوْمَ الِاثْنَيْنِ، وَمِنَ الْجُمُعَةِ الثَّانِيَةِ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ»[٥].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) حسن.

(٥) حسن.

واتە: حەفصە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو مانگێکدا پێنج شەممەو دووشەممە بەڕۆژوو دەبوو، وە لە هەینی دووەمیشدا دوو شەممە بەڕۆژوو دەبوو.

**٢٣٦٧-** «عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ جَعَلَ كَفَّهُ الْيُمْنَى تَحْتَ خَدِّهِ الأَيْمَنِ، وَكَانَ يَصُومُ الاِثْنَيْنِ وَالْخَمِيسَ»(١).

واتە: حەفصە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەچووە سەر جێگاکەی بۆ خەوتن لەپی دەستی ڕاستی دەخستە ژێر ڕوومەتی ڕاستی، وە دوو شەممەو پێنج شەممە بەڕۆژوو دەبوو.

**٢٣٦٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ غُرَّةِ كُلِّ شَهْرٍ، وَقَلَّمَا يُفْطِرُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ»(٢).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو لە سەرەتای هەموو مانگێک، کەمجار هەبوو لە ڕۆژی هەینیدا ڕۆژووی نەدەگرت.

**٢٣٦٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِرَكْعَتَيِ الضُّحَى، وَأَنْ لَا أَنَامَ إِلَّا عَلَى وِتْرٍ، وَصِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنَ الشَّهْرِ»(٣).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردم بە دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاو، وە نەخەوم تا نوێژی ویتر دەکەم، وە لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ ڕۆژوو بگرم.

**٢٣٧٠-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، وَسُئِلَ عَنْ صِيَامِ عَاشُورَاءَ، قَالَ: مَا عَلِمْتُ النَّبِيَّ ﷺ صَامَ يَوْماً يَتَحَرَّى فَضْلَهُ عَلَى الْأَيَّامِ، إِلَّا هَذَا الْيَوْمَ، يَعْنِي شَهْرَ رَمَضَانَ، وَيَوْمَ عَاشُورَاءَ»(٤).

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پرسیار کرا دەربارەی ڕۆژووی عاشورا، وتی: نەمزانیوە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێک بەڕۆژوو بوو بێت فەزڵ و

---

(١) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٤٥١ و ٥٠٤٥.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٤٥٠، والترمذي: ٧٤٢، وإبن ماجه: ١٧٢٥.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٠٦، ومسلم: ١١٣٢.




چاكەی دابێ بەسەر ڕۆژەكانی تردا، جگە لەم ڕۆژە نەبێت، واتە: مانگی ڕەمەزان و ڕۆژی عاشورا.

**٢٣٧١-** «عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ ﷺ يَوْمَ عَاشُورَاءَ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ، يَقُولُ: يَا أَهْلَ الْمَدِينَةِ، أَيْنَ عُلَمَاؤُكُمْ؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ فِي هَذَا الْيَوْمِ: إِنِّي صَائِمٌ، فَمَنْ شَاءَ أَنْ يَصُومَ فَلْيَصُمْ»[1].

واتە: حومەیدی كوڕی عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوف دەڵێ: گوێم لێ بوو موعاویە ﷺ لە ڕۆژی عاشورادا لەسەر مینبەر دەیوت: ئەی خەڵكی مەدینە زاناكانتان لە كوێن؟ گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لەم ڕۆژەدا دەیفەرموو: من بەڕۆژووم، هەركەس دەیەوێ بەڕۆژوو بێت با بەڕۆژوو بێت.

**٢٣٧٢-** «عَنْ هُنَيْدَةَ بْنِ خَالِدٍ، عَنْ امْرَأَتِهِ، قَالَتْ: حَدَّثَتْنِي بَعْضُ نِسَاءِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَصُومُ يَوْمَ عَاشُورَاءَ، وَتِسْعاً مِنْ ذِي الْحِجَّةِ، وَثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنَ الشَّهْرِ أَوَّلَ اثْنَيْنِ مِنَ الشَّهْرِ وَخَمِيسَيْنِ»[2].

واتە: هونەیدەی كوڕی خالید دەگێڕێتەوە: لە هاوسەرەكەیەوە، دەڵێ: یەكێك لە خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ بۆی باس كردم، پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی عاشورادا بەڕۆژوو دەبوو، هەروەها نۆ ڕۆژ لە (ذي الْحِجَّة)، وە سێ ڕۆژیش لە مانگێكدا یەكەمین دووشەممە لە مانگەكەداو دوو پێنج شەممەش.

## باسی جیاوازی لەسەر عەطاء لەو هەواڵەی باس لە فەرموودەكە دەكات

**٢٣٧٣-** «عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ صَامَ الْأَبَدَ فَلَا صَامَ»[3].

ئەوزاعی دەڵێ: عەطاء بۆی باس كردین لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەركەس بەهەمیشەیی بەڕۆژوو

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٠٣، ومسلم: ١١٢٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




بێت ئەوە نە بەڕۆژوو بووە و نە شکاندوویەتی. (واتە: وەک ئەوە وایە بەڕۆژوو نەبووبێ لەبەر کەمی پاداشتی، وە بێڕۆژوو نەبووبێ لەبەر ئوقرە گرتن ئارامگرتنی لەسەر برسێتی و تینوێتی، وتراویشە ئەوە نزایە بۆ ئەو کەسە سەرزەنشت کردنیەتی لەبەر ئەو کارەی، وە وتراوە: بەڵکو هیچ پاداشتێکی بۆ نابێ لە ڕۆژووەکەی چونکە دەبێتە عادەت و نەریت، لە ڕاستیشدا بێ ڕۆژوو نەبووە).

**٢٣٧٤-** «عَنْ الْأَوْزَاعِيِّ قَالَ: حَدَّثَنَا عَطَاءٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ صَامَ الْأَبَدَ فَلَا صَامَ وَلَا أَفْطَرَ»[١].

**واتە: ئەوزاعی دەڵێ: عەطاء بۆی باس کردین لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بە هەمیشەیی بەڕۆژوو بێت ئەوە نە بەڕۆژوو بووەو نە شکاندوویەتی.**

**واتە: وەک ئەوە وایە بەڕۆژوو نەبووبێ لەبەر کەمی پاداشتەکەی، وە بێڕۆژوو نەبووبێ لەبەر ئوقرە گرتن ئارامگرتنی لەسەر برسێتی و تینوێتی، وتراویشە ئەوە نزایە بۆ ئەو کەسە سەرزەنشت کردنیەتی لەبەر ئەو کارەی، وە وتراوە: بەڵکو هیچ پاداشتێکی بۆ نابێ لە ڕۆژووەکەی، چونکە دەبێتە عادەت و نەریت، لە ڕاستیشدا بە ڕۆژوو نەبووە[٢].**

**٢٣٧٥-** «عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ قال: حَدَّثَنِي عَطَاء، قَالَ: حَدَّثَنِي مَنْ سَمِعَ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ صَامَ الْأَبَدَ فَلَا صَامَ»[٣].

**واتە: ئەوزاعی دەڵێ: عەطاء بۆی باس کردم وتی: بۆی باس کردم ئەو کەسەی لە ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) بیستویەتی دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بە هەمیشەیی بەڕۆژوو بێت ئەوە بەڕۆژوو نەبووە.**

**٢٣٧٦-** «عَنْ الْأَوْزَاعِيِّ، عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: حَدَّثَنِي مَنْ سَمِعَ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: مَنْ صَامَ الْأَبَدَ فَلَا صَامَ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) حاشية السندي على سنن النسائي ج٤/ص٢٠.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**واتە: ئەوزاعی دەگێڕێتەوە: عەطاء وتوویەتی: بۆی باس کردم ئەوکەسەی لە ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) بیستویەتی بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بە هەمیشەیی بەڕۆژوو بێت ئەوە بەڕۆژوو نەبووە.**

**٢٣٧٧-** «عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ، عَنْ عَطَاءٍ، أَنَّهُ حَدَّثَهُ، قَالَ: حَدَّثَنِي مَنْ، سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ صَامَ الْأَبَدَ فَلَا صَامَ، وَلَا أَفْطَرَ»(١).

**واتە: ئەوزاعی دەگێڕێتەوە: عەطاء بۆی باس کرد وتی: بۆی باس کردم ئەو کەسەی لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) بیستویەتی، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بە هەمیشەیی بەڕۆژوو بێت ئەوە بەڕۆژوو نەبووەو بێ ڕۆژووش نەبووە.**

**٢٣٧٨-** «عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ: سَمِعْتُ عَطَاءً، أَنَّ أَبَا الْعَبَّاسِ الشَّاعِرَ، أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: بَلَغَ النَّبِيَّ ﷺ أَنِّي أَصُومُ أَسْرُدُ الصَّوْمَ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ. قَالَ: قَالَ عَطَاءٌ: لَا أَدْرِي كَيْفَ ذَكَرَ صِيَامَ الْأَبَدِ لَا صَامَ مَنْ صَامَ الْأَبَدَ»(٢).

**واتە: ئیبنو جورەیج دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوێم لە عەطاء بوو، ئەبو لعباسی شاعیر هەواڵی پێداوە، ئەو بیستویەتی عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: بە پێغەمبەر ﷺ ڕاگەیەنرا کە من بەردەوام بەڕۆژوو دەبم، وە فەرموودەکەی هێنا، وتی: عەطاء وتویەتی: نازانم چۆن باسی ڕۆژووی هەمیشەیی کرد، هەر کەس بە هەمیشەیی بەڕۆژوو بێت ئەوە بەڕۆژوو نەبووە.**

## قەدەغەی بە ڕۆژوو بوون لە تەواوی ساڵ و،
## باسی جیاوازی لەسەر موتەڕڕیفی کوڕی عەبدوڵڵا لە فەرموودەکەدا

**٢٣٧٩-** «عَنْ يَزِيدَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَنْ أَخِيهِ مُطَرِّفٍ، عَنْ عِمْرَانَ ﷺ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ فُلَاناً لَا يُفْطِرُ نَهَاراً الدَّهْرَ، قَالَ: لَا صَامَ وَلَا أَفْطَرَ»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**واتە: یەزیدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی شیخیر دەگێڕێتەوە: لە موتەڕڕیفی برایەوە لە عیمرانەوە ﷺ دەڵێ: وترا: ئەی پێغەمبەری خوا، فڵانەکەس بە درێژایی ڕۆژەکانی ساڵ ڕۆژوو ناشکێنێ، فەرمووی: نە بەڕۆژوو بووەو نە بێڕۆژووش بووە.**

**٢٣٨٠-** «عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ مُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، أَخْبَرَنِي أَبِي ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَذُكِرَ عِنْدَهُ رَجُلٌ يَصُومُ الدَّهْرَ، قَالَ: لَا صَامَ وَلَا أَفْطَرَ»[1].

**واتە: قەتادە دەگێڕێتەوە: لە موتەڕڕیفی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی شیخیر لە باوکیەوە ﷺ هەواڵی پێداوە کە ئەو بیستویەتی لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ باسی پیاوێک کرا بە درێژایی ساڵ بەڕۆژوو دەبوو، فەرمووی: نە بەڕۆژوو بووەو نە بێڕۆژووش بووە.**

**٢٣٨١-** «عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ مُطَرِّفَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ فِي صَوْمِ الدَّهْرِ: لَا صَامَ وَلَا أَفْطَرَ»[2].

**واتە: قەتادە دەڵێ: بیستم موتەڕڕیفی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی شیخیر، لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ڕۆژووی درێژایی ساڵ فەرموویەتی: نە بەڕۆژوو بووەو نە بێڕۆژووش بووە.**

## باسی جیاوازی لەسەر غەیلانی کوڕی جەریر لە فەرموودەکەدا

**٢٣٨٢-** «عَن أَبِي هِلَالٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا غَيْلَانُ وَهُوَ ابْنُ جَرِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ وَهُوَ ابْنُ مَعْبَدٍ الزِّمَّانِيُّ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَمَرَرْنَا بِرَجُلٍ، فَقَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، هَذَا لَا يُفْطِرُ مُنْذُ كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ: لَا صَامَ وَلَا أَفْطَرَ»[3].

**واتە: ئەبو هیلال دەڵێ: غەیلانی کوڕی جەریر بۆی باس کردین دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی مەعبەدی زەمانی بۆی باس کردین لە قتادە، لە عومەرەوە ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕ بووین بەلای پیاوێکدا وتیان: ئەی پێغەمبەری**

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٧٠٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.




خوا، ئەم پیاوە لە ماوەی ئەوەندەو ئەوەندەوە بێڕۆژوو نەبووە فەرمووی: نە بەڕۆژوو بووەو نە بێڕۆژووش بووە.

**٢٣٨٣-** «عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ غَيْلَانَ، أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَعْبَدٍ الزِّمَّانِيَّ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سُئِلَ عَنْ صَوْمِهِ فَغَضِبَ، فَقَالَ عُمَرُ: رَضِينَا بِاللَّهِ رَبّاً، وَبِالْإِسْلَامِ دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، وَسُئِلَ عَمَّنْ صَامَ الدَّهْرَ، فَقَالَ: لَا صَامَ وَلَا أَفْطَرَ، أَوْ مَا صَامَ وَمَا أَفْطَرَ»[١].

واتە: شوعبە دەگێڕێتەوە: لە غەیلان ئەو بیستووی لە عەبدوڵڵای کوڕی مەعبەدی زەمانی، لە ئەبو قەتادەوە ﷺ، پێغەمبەری خواوە ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی ڕۆژوو گرتنی، ئەویش توڕە بوو، عومەر وتی: ڕازی بووین بەوەی خوا پەروەردگارمانەو ئیسلام ئاینمانەو موحەممەد ﷺ پێغەمبەرمانە، وە پرسیار کرا دەربارەی کەسێک بە درێژایی ساڵ بەڕۆژوو دەبێ، فەرمووی: نەڕۆژووی بۆ هەیە نە بێڕۆژووە، یان نەڕۆژووی بۆ بووەو نە بێڕۆژووە بووە.

## بەردەوام بوون لەسەر ڕۆژوو گرتن

**٢٣٨٤-** «عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ حَمْزَةَ بْنَ عَمْرٍو الْأَسْلَمِيَّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي رَجُلٌ أَسْرُدُ الصَّوْمَ، أَفَأَصُومُ فِي السَّفَرِ؟ قَالَ: صُمْ إِنْ شِئْتَ، أَوْ أَفْطِرْ إِنْ شِئْتَ»[٢].

واتە: عائیشە دەگێڕێتەوە: حەمزەی کوڕی عەمری ئەسلەمی (خوا لێیان ڕازی بێ)، پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من کەسێکم بەردەوام بەڕۆژووم، ئایا ڕۆژوو بگرم لە گەشتدا؟ فەرمووی: ئەگەر ویستت بەڕۆژووبە، وە ئەگەر ویستت بەڕۆژوو مەبە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٦ و ١١٦٢/١٩٨، وأبو داود: ٢٤٢٥ و ٢٤٢٦، والترمذي: ٧٤٩ و ٧٥٢ و ٧٦٧، وإبن ماجه: ١٧١٣ و ١٧٣٠ و ١٧٣٨.

(٢) صحيح.





## ڕۆژوو گرتنی دوو لەسەر سێی ساڵ، وە باسی جیاوازی ئەوانەی لەو بارەوە فەرموودەکەیان گواستۆتەوە

**٢٣٨٥-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُرَحْبِيلَ ﷺ، عَنْ رَجُلٍ، مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: قِيلَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: رَجُلٌ يَصُومُ الدَّهْرَ، قَالَ: وَدِدْتُ أَنَّهُ لَمْ يَطْعَمِ الدَّهْرَ، قَالُوا: فَثُلُثَيْهِ، قَالَ: أَكْثَرَ، قَالُوا: فَنِصْفَهُ، قَالَ: أَكْثَرَ، ثُمَّ قَالَ: أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِمَا يُذْهِبُ وَحَرَ الصَّدْرِ؟ صَوْمُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ»[١].

**واتە: عەمری کوڕی شورەحبیل ﷺ دەگێڕێتەوە: لە پیاوێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وتی: بە پێغەمبەر وترا: پیاوێک بە درێژایی ساڵ بەڕۆژوو دەبێ، فەرمووی: حەزم دەکرد بە درێژایی ساڵ هیچی نەخواردایە (تا دەمرد، مەبەست لەمەدا سەرزەنشت کردنە لەو کردەوە) وتیان: ئەی دوو لەسەر سێ، فەرمووی: زۆرە، پاشان فەرمووی: ئایا هەواڵتان بدەمێ بەوەی خوتورەی دڵ ناهێڵێ؟ ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژە لە هەموو مانگێکدا.**

**٢٣٨٦-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُرَحْبِيلَ ﷺ قَالَ: أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا تَقُولُ فِي رَجُلٍ صَامَ الدَّهْرَ كُلَّهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَدِدْتُ أَنَّهُ لَمْ يَطْعَمِ الدَّهْرَ شَيْئًا، قَالَ: فَثُلُثَيْهِ، قَالَ: أَكْثَرَ، قَالَ: فَنِصْفَهُ، قَالَ: أَكْثَرَ، قَالَ: أَفَلَا أُخْبِرُكُمْ بِمَا يُذْهِبُ وَحَرَ الصَّدْرِ؟ قَالُوا: بَلَى، قَالَ: صِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ»[٢].

**واتە: عەمری کوڕی شورەحبیل ﷺ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا: چی دەڵێی دەربارەی پیاوێک بە درێژایی ساڵ بەڕۆژوو دەبێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: حەزم دەکرد بە درێژایی ساڵ هیچی نەخواردایە (تا دەمرد، مەبەست لەمەدا سەرزەنشت کردنە لەو کردەوە) وتی: ئەی دوو لەسەر سێ، فەرمووی: زۆرە، وتی: ئەی نیوەی، فەرمووی: زۆرە، پاشان فەرمووی: ئایا هەواڵتان بدەمێ بەوەی خوتورەی دڵ ناهێڵێ؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ڕۆژوو گرتنی سێ ڕۆژە لە هەموو مانگێکدا.**

**٢٣٨٧-** «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ، قَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ بِمَنْ يَصُومُ الدَّهْرَ كُلَّهُ، قَالَ: لَا صَامَ وَلَا أَفْطَرَ ، أَوْ لَمْ يَصُمْ وَلَمْ يُفْطِرْ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ بِمَنْ يَصُومُ يَوْمَيْنِ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره.

وَيُفْطِرُ يَوْماً؟ قَالَ: أَوَ يُطِيقُ ذَلِكَ أَحَدٌ؟، قَالَ: فَكَيْفَ بِمَنْ يَصُومُ يَوْماً وَيُفْطِرُ يَوْماً؟ قَالَ: ذَلِكَ صَوْمُ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ، قَالَ: فَكَيْفَ بِمَنْ يَصُومُ يَوْماً وَيُفْطِرُ يَوْمَيْنِ؟ قَالَ: وَدِدْتُ أَنِّي أُطِيقُ ذَلِكَ، قَالَ: ثُمَّ قَالَ: ثَلَاثٌ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ، هَذَا صِيَامُ الدَّهْرِ كُلِّهِ»[١].

**واتە: ئەبو قەتادە دەڵێ: عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆنە کەسێک بە درێژایی ساڵ بەڕۆژوو بێت، فەرمووی: نە بەڕۆژوو بووەو نە بێڕۆژووش بووە، یان نەڕۆژووی بۆ بووەو نە بێڕۆژوو بووە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، چۆنە کەسێک دوو ڕۆژ بەڕۆژوو بێت و ڕۆژێک بەڕۆژوو نەبێت؟ فەرمووی: ئایا کەسێک هەیە ئەوە بتوانێت؟ وتی: ئەی چۆنە کەسێک ڕۆژێک بەڕۆژوو بێت و ڕۆژێکیش بەڕۆژوو نەبێت؟ فەرمووی: ئەوە ڕۆژووی داوودە (علیه السلام)، وتی: ئەی چۆنە کەسێک ڕۆژێک بەڕۆژوو بێت و دوو ڕۆژ بەڕۆژوو نەبێت؟ فەرمووی: حەزم دەکرد ئەوەم بتوانایە، وتی: پاشان فەرمووی: سێ ڕۆژ لە گشت مانگێکداو ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان، ئەوە ڕۆژوو گرتنی هەموو ساڵەکەیە.**

## ڕۆژوو گرتنی ڕۆژێک و نە گرتنی ڕۆژێک و، باسی جیاوازی دەستەواژەی ئەوانەی هەواڵەکەی عەبدوڵلای کوڕی عەمریان گواستۆتەوە

**٢٣٨٨-** «عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَفْضَلُ الصِّيَامِ صِيَامُ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ، كَانَ يَصُومُ يَوْماً وَيُفْطِرُ يَوْماً»[٢].

**واتە: موجاهید دەگێڕێتەوە: لە عەبدوڵلای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترین ڕۆژوو ڕۆژووی داوودە (علیه السلام) ڕۆژێک بەڕۆژوو دەبوو، ڕۆژێکیش بە ڕۆژوو نەدەبوو.**

**٢٣٨٩-** «عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: قَالَ لِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنْكَحَنِي أَبِي امْرَأَةً ذَاتَ حَسَبٍ، فَكَانَ يَأْتِيهَا فَيَسْأَلُهَا عَنْ بَعْلِهَا، فَقَالَتْ: نِعْمَ الرَّجُلُ مِنْ رَجُلٍ لَمْ يَطَأْ لَنَا فِرَاشاً، وَلَمْ يُفَتِّشْ لَنَا كَنَفاً مُنْذُ أَتَيْنَاهُ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: ائْتِنِي بِهِ، فَأَتَيْتُهُ مَعَهُ، فَقَالَ: كَيْفَ تَصُومُ؟ قُلْتُ: كُلَّ يَوْمٍ، قَالَ: صُمْ مِنْ كُلِّ جُمُعَةٍ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، قُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: صُمْ

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح.**




يَوْمَيْنِ وَأَفْطِرْ يَوْماً، قَالَ: إِنِّي أُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِك، قَالَ: صُمْ أَفْضَلَ الصِّيَامِ، صِيَامَ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ، صَوْمُ يَوْمٍ وَفِطْرُ يَوْمٍ»[١].

واتە: موجاهید دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) وتی: باوکم ئافرەتێکی ڕەسەنی وجاخ زادەی بۆ خواستم، دەچوو بۆ لای پرسیاری لێدەکرد دەربارەی مێردەکەی، ئەویش وتی: چاکترین پیاوە نە دێتە سەر جێگاو نە نزیکمان دەکەوێتەوە لەو کاتەی هاتووین بۆ لای، ئەوەی بۆ پێغەمبەرﷺ باس کرد، فەرمووی: بۆمی بهێنن، منیش لەگەڵی ڕۆیشتم، فەرمووی: چۆن ڕۆژوو دەگری؟ وتم: هەموو ڕۆژێک، فەرمووی: لە هەموو حەفتەیەکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژووبە، وتم: من لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: دوو ڕۆژ بە ڕۆژووبەو ڕۆژێک بەڕۆژوو مەبە، وتم: من لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: ڕۆژوو بگرە بە چاکترین ڕۆژووەکان، ڕۆژووی داود (علیه السلام) ڕۆژێک بە ڕۆژووبەو ڕۆژێک بە ڕۆژوو مەبە.

**٢٣٩٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: زَوَّجَنِي أَبِي امْرَأَةً فَجَاءَ يَزُورُهَا، فَقَالَ: كَيْفَ تَرَيْنَ بَعْلَكِ؟ فَقَالَتْ: نِعْمَ الرَّجُلُ مِنْ رَجُلٍ لَا يَنَامُ اللَّيْلَ، وَلَا يُفْطِرُ النَّهَارَ فَوَقَعَ بِي، وَقَالَ: زَوَّجْتُكَ امْرَأَةً مِنَ الْمُسْلِمِينَ فَعَضَلْتَهَا، قَالَ: فَجَعَلْتُ لَا أَلْتَفِتُ إِلَى قَوْلِهِ مِمَّا أَرَى عِنْدِي مِنَ الْقُوَّةِ وَالِاجْتِهَادِ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: لَكِنِّي أَنَا أَقُومُ وَأَنَامُ، وَأَصُومُ وَأُفْطِرُ، فَقُمْ وَنَمْ، وَصُمْ وَأَفْطِرْ، قَالَ: صُمْ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، فَقُلْتُ: أَنَا أَقْوَى مِنْ ذَلِك، قَالَ: صُمْ صَوْمَ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ، صُمْ يَوْماً وَأَفْطِرْ يَوْماً، قُلْتُ: أَنَا أَقْوَى مِنْ ذَلِك، قَالَ: اقْرَأِ الْقُرْآنَ فِي كُلِّ شَهْرٍ، ثُمَّ انْتَهَى إِلَى خَمْسَ عَشْرَةَ وَأَنَا أَقُولُ: أَنَا أَقْوَى مِنْ ذَلِكَ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: باوکم ژنی بۆ هێنام دەهات سەردانی دەکرد، پێی وت: پیاوەکەت چۆن دەبینی؟ وتی: چاکترین پیاوە نە بە شەو دەخەوێ و، نە بە ڕۆژیش نان دەخوات، ئەمەی لەسەرم قورس کرد، وتی: ئافرەتێک لە مسوڵمانانم بۆت خواستووەو پشت گوێت خستووە، وتی: منیش گوێم نەدا بە قسەکەی، چونکە لە خۆمدا هێزو توانایەکم بەدی دەکرد لەسەر ڕۆژوو گرتن، ئەوە گەیشت بە پێغەمبەرﷺ ، فەرمووی: بەڵام من شەونوێژ دەکەم و

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٧٨ و ٥٠٥٢، ومسلم: ٢٧٤٣.

(٢) صحيح.




**دەخەوم، بەڕۆژوو دەبم و بەڕۆژووش نابم، تۆش شەونوێژ بکەو بخەوە، بەڕۆژووبەو بەڕۆژووش مەبە، فەرمووی: لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژووبە، وتم: من لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: وەکو داود (علیه السلام) بەڕۆژووبە، ڕۆژێک بەڕۆژووبەو ڕۆژێکیش بەڕۆژوو مەبە، وتم: من لەوە بەهێز ترم، فەرمووی: لە هەموو مانگێکدا قورئان بخوێنە، پاشان کۆتایی پێهێنا بۆ پازدە منیش دەموت: من لەوە زیاتر دەتوانم.**

**٢٣٩١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حُجْرَتِي، فَقَالَ: أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَقُومُ اللَّيْلَ وَتَصُومُ النَّهَارَ، قَالَ: بَلَى، قَالَ: فَلَا تَفْعَلَنَّ، نَمْ وَقُمْ، وَصُمْ وَأَفْطِرْ، فَإِنَّ لِعَيْنِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِزَوْجَتِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِضَيْفِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِصَدِيقِكَ عَلَيْكَ حَقًّا. وَإِنَّهُ عَسَى أَنْ يَطُولَ بِكَ عُمُرٌ، وَإِنَّهُ حَسْبُكَ أَنْ تَصُومَ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلَاثاً، فَذَلِكَ صِيَامُ الدَّهْرِ كُلِّهِ، وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، قُلْتُ: إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً، فَشَدَّدْتُ، فَشُدِّدَ عَلَيَّ، قَالَ: صُمْ مِنْ كُلِّ جُمُعَةٍ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، قُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، فَشَدَّدْتُ، فَشُدِّدَ عَلَيَّ، قَالَ: صُمْ صَوْمَ نَبِيِّ اللَّهِ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ، قُلْتُ: وَمَا كَانَ صَوْمُ دَاوُدَ، قَالَ: نِصْفُ الدَّهْرِ»[1].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەکەمەوە، فەرمووی: مەگەر هەواڵم پێنەدراوە کە تۆ بە شەو شەونوێژ دەکەیت و بەڕۆژ بەڕۆژوو دەبی، وتی: بەڵێ، فەرمووی: وا مەکە، (بە شەو) بخەوەو (دوایی) هەڵسە بۆ شەونوێژ، (هەندێک ڕۆژ) ڕۆژوو بگرەو (هەندێک ڕۆژ) بە ڕۆژووش مەبە، چونکە چاوت مافی هەیە لەسەرت، جەستەت مافی هەیە لەسەرت، خێزانت مافی هەیە لەسەرت، میوانت مافی هەیە لەسەرت، هاوڕێکەت مافی هەیە لەسەرت، لەوەیە تۆ تەمەنت درێژ بێت، ئەوەندەت بەسە لە هەموو مانگێک سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بیت، ئەوەش بە قەد ڕۆژوو گرتنی هەموو ساڵەکەیە، یەک چاکەش بەرانبەرە بە دە چاکە، وتم: من هێزو توانام لەوە زیاترە، لەسەر خۆم توندم کرد، توندکرا لەسەرم، فەرمووی: بەڕۆژووبە وەکو ڕۆژوو گرتنی پێغەمبەر داود (علیه السلام) وتم: ڕۆژووی داود چۆن بووە، فەرمووی: نیوەی ساڵ. (ڕۆژێک نا ڕۆژێک).**

**٢٣٩٢-** «عَن عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: ذُكِرَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ يَقُولُ: لَأَقُومَنَّ اللَّيْلَ وَلَأَصُومَنَّ النَّهَارَ مَا عِشْتُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَنْتَ الَّذِي تَقُولُ ذَلِكَ؟ فَقُلْتُ

---

(١) صحيح.




لَهُ: قَدْ قُلْتُهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَإِنَّكَ لَا تَسْتَطِيعُ ذَلِكَ، فَصُمْ وَأَفْطِرْ، وَنَمْ وَقُمْ، وَصُمْ مِنَ الشَّهْرِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنَّ الْحَسَنَةَ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا وَذَلِكَ مِثْلُ صِيَامِ الدَّهْرِ، قُلْتُ: فَإِنِّي أُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: صُمْ يَوْماً وَأَفْطِرْ يَوْمَيْنِ، فَقُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: فَصُمْ يَوْماً وَأَفْطِرْ يَوْماً، وَذَلِكَ صِيَامُ دَاوُدَ، وَهُوَ أَعْدَلُ الصِّيَامِ، قُلْتُ: فَإِنِّي أُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو: لَأَنْ أَكُونَ قَبِلْتُ الثَّلَاثَةَ الْأَيَّامَ الَّتِي قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَهْلِي وَمَالِي»[1].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی کوڕی عەمڕی کوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: باس کرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو دەیوت: دەبێ بە شەو شەونوێژ بکەم و بەڕۆژیش بەڕۆژووبم تا لە ژیاندام، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: تۆ ئەو قسەیەت وت؟ وتم: بەڵێ من وتم ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: بەڕاستی تۆ توانای ئەوەت نیە، بەڕۆژووبەو بەڕۆژوو مەبە، شەنوێژ بکەو بخەوە، لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژووبە، چونکە چاکەیەک بەرانبەرە بە دە چاکە، ئەویش هەر وەکو ئەوە وایە بە درێژایی ساڵ بەڕۆژوو بوویی، وتم: من دەتوانم لەوە چاکتر بکەم ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ڕۆژێک بەڕۆژووبەو دوو ڕۆژ بەڕۆژوو مەبە، وتم: من دەتوانم لەوە چاکتر بکەم ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ڕۆژێک بەڕۆژووبەو ڕۆژێک بەڕۆژوو مەبە، ئەویش ڕۆژووی داودە (علیه السلام) چاکترین ڕۆژووە، وتم: من دەتوانم لەوە چاکتر بکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ شتێ لەوە چاکتر نیە، عەبدوڵڵای کوڕی عەمر وتی: ئەگەر ئەو سێ ڕۆژەی پێغەمبەرم وەربگرتایە خۆشەویستتر بوو لە لام لە ماڵ و منداڵم.**

**٢٣٩٣**- «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قُلْتُ: أَيْ عَمِّ حَدِّثْنِي عَمَّا قَالَ لَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: يَا ابْنَ أَخِي، إِنِّي قَدْ كُنْتُ أَجْمَعْتُ عَلَى أَنْ أَجْتَهِدَ اجْتِهَاداً شَدِيداً حَتَّى قُلْتُ: لَأَصُومَنَّ الدَّهْرَ، وَلَأَقْرَأَنَّ الْقُرْآنَ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَسَمِعَ بِذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأَتَانِي حَتَّى دَخَلَ عَلَيَّ فِي دَارِي، فَقَالَ: بَلَغَنِي أَنَّكَ قُلْتَ لَأَصُومَنَّ الدَّهْرَ، وَلَأَقْرَأَنَّ الْقُرْآنَ، فَقُلْتُ: قَدْ قُلْتُ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: فَلَا تَفْعَلْ، صُمْ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، قُلْتُ: إِنِّي أَقْوَى عَلَى أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: فَصُمْ مِنَ الْجُمُعَةِ يَوْمَيْنِ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسَ، قُلْتُ:

---

**(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٧٤ و ١٩٧٥ و ١٩٧٦ و ٣٤١٨ و ٥١٩٩ و ٦١٣٤، ومسلم: ١٨١ و ١١٥٩/١٨٥، وأبو داود: ١٣٨٨ و ٢٤٢٧.**




فَإِنِّي أَقْوَى عَلَى أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكِ، قَالَ: فَصُمْ صِيَامَ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ، فَإِنَّهُ أَعْدَلُ الصِّيَامِ عِنْدَ اللَّهِ، يَوْماً صَائِماً وَيَوْماً مُفْطِراً، وَإِنَّهُ كَانَ إِذَا وَعَدَ لَمْ يُخْلِفْ، وَإِذَا لَاقَى لَمْ يَفِرَّ»[١].

**واتە: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: چوومە ژوورەوە بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ)، وتم: ئەی مامی خۆم ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووی بۆم باس بکە، وتی: ئەی برازام، من ویستم کۆششێکی زۆر بکەم تا وتم: بە درێژایی ساڵ بەڕۆژوو دەبم و لە هەموو شەوو ڕۆژێکیشیدا قورئان دەخوێنمەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی بیست، هات بۆ لام تا هاتە ماڵەوەم، فەرمووی: هەواڵم پێ گەیشتووە تۆ وتوتە: بە درێژایی ساڵ بەڕۆژوو دەبم و قورئانیش دەخوێنم، وتم: بەڵێ ئەوەم وت ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: لە هەر هەینیەکدا دوو ڕۆژ بەڕۆژووبە دووشەممەو پێنج شەممە، وتم: من زۆر لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: ڕۆژووی داود (علیه السلام)، چونکە ئەوە چاکترین و ڕێک و پێکترین ڕۆژووە لای خوا، ڕۆژێک بەرۆژوو دەبوو ڕۆژێکیش بەڕۆژوو نەدەبوو، بێگومان ئەو هەر پەیانێکی بدایە دەیبردە سەر، وە ئەگەر ڕووبەڕوی دوژمن ببوایەتەوە ڕای نەدەکرد.**

## باسی ڕۆژووگرتنی زیان یان کەمکردنەوەی، وە باسی جیاوازی ئەوانەی هەواڵەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەمریان گواستۆتەوە لە فەرموودەکەدا

**٢٣٩٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لَهُ: صُمْ يَوْماً وَلَكَ أَجْرُ مَا بَقِيَ، قَالَ: إِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: صُمْ يَوْمَيْنِ وَلَكَ أَجْرُ مَا بَقِيَ، قَالَ: إِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: صُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ وَلَكَ أَجْرُ مَا بَقِيَ، قَالَ: إِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: صُمْ أَرْبَعَةَ أَيَّامٍ وَلَكَ أَجْرُ مَا بَقِيَ، قَالَ: إِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: صُمْ أَفْضَلَ الصِّيَامِ عِنْدَ اللَّهِ، صَوْمَ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ، كَانَ يَصُومُ يَوْماً وَيُفْطِرُ يَوْماً»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لە هەفتەدا) ڕۆژێک بەڕۆژووبە پاداشتی ڕۆژەکانی دیکەت**

---

(١) منكر بزيادة الوعد.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٥٩/١٩٢.




بۆ هەیە کە ماوەتەوە، وتی: من لەوە زیاتر لە توانامدایە، فەرمووی: دوو ڕۆژ بەڕۆژووبە پاداشتی ڕۆژەکانی دیکەت بۆ هەیە کە ماوەتەوە، وتی: من لەوە زیاتر لە توانامدایە، فەرمووی: سێ ڕۆژ بەڕۆژووبە پاداشتی ڕۆژەکانی دیکەت بۆ هەیە کە ماوەتەوە، وتی: من لەوە زیاتر لە توانامدایە، فەرمووی: چوار ڕۆژ بە ڕۆژووبە پاداشتی ڕۆژەکانی دیکەت بۆ هەیە کە ماوەتەوە، وتی: من لەوە زیاتر لە توانامدایە، فەرمووی: بەڕۆژووبە چاکترین ڕۆژوو لەلای خوا، ڕۆژووی داود (علیه السلام) بوو ئەو ڕۆژێک بەڕۆژوو دەبوو ڕۆژێکیش بەڕۆژوو نەدەبوو.

**٢٣٩٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: ذَكَرْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ الصَّوْمَ، فَقَالَ: صُمْ مِنْ كُلِّ عَشَرَةِ أَيَّامٍ يَوْماً، وَلَكَ أَجْرُ تِلْكَ التِّسْعَةِ، فَقُلْتُ: إِنِّي أَقْوَى مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: صُمْ مِنْ كُلِّ تِسْعَةِ أَيَّامٍ يَوْماً، وَلَكَ أَجْرُ تِلْكَ الثَّمَانِيَةِ، قُلْتُ: إِنِّي أَقْوَى مَنْ ذَلِكَ، قَالَ: فَصُمْ مِنْ كُلِّ ثَمَانِيَةِ أَيَّامٍ يَوْماً، وَلَكَ أَجْرُ تِلْكَ السَّبْعَةِ، قُلْتُ: إِنِّي أَقْوَى مِنْ ذَلِك، قَالَ: فَلَمْ يَزَلْ حَتَّى قَالَ: صُمْ يَوْماً وَأَفْطِرْ يَوْماً»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: باسی ڕۆژووم کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە هەموو دە ڕۆژ جارێک ڕۆژێک بەڕۆژووبە، پاداشتی ئەو نۆ ڕۆژەکەی دیکەت بۆ دەنوسرێ، وتم: من لەوە بەهێزترم، فەرمووی: لە هەموو نۆ ڕۆژ جارێک ڕۆژێک بەڕۆژووبە، پاداشتی ئەو هەشت ڕۆژەی دیکەت بۆ دەنوسرێ، وتم: من لەوە بەهێزترم، فەرمووی: لە هەموو هەشت ڕۆژ جارێک ڕۆژێک بەڕۆژووبە، پاداشتی ئەو حەوت ڕۆژەی دیکەت بۆ دەنوسرێ، وتم: من لەوە بەهێزترم، وتی: بەردەوام فەرمووی: تا فەرمووی: ڕۆژێک ڕۆژوو بگرە ڕۆژەکەی دیکە مەیگرە.

**٢٣٩٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: صُمْ يَوْماً وَلَكَ أَجْرُ عَشَرَةٍ، فَقُلْتُ: زِدْنِي، فَقَالَ: صُمْ يَوْمَيْنِ وَلَكَ أَجْرُ تِسْعَةٍ، قُلْتُ: زِدْنِي، قَالَ: صُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ وَلَكَ أَجْرُ ثَمَانِيَةٍ، قَالَ ثَابِتٌ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِمُطَرِّفٍ، فَقَالَ: مَا أُرَاهُ إِلَّا يَزْدَادُ فِي الْعَمَلِ وَيَنْقُصُ مِنَ الْأَجْرِ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێمی فەرموو: (لە هەر دە ڕۆژێکدا) ڕۆژێک بەڕۆژووبە پاداشتی دە ڕۆژەکەی دیکەت بۆ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح الإسناد.




هەیە، وتم: بۆم زیاد بکە، فەرمووی: دوو ڕۆژ بە ڕۆژووبە پاداشتی نۆ ڕۆژت هەیە، وتم: بۆم زیاد بکە، فەرمووی: سێ ڕۆژ بەڕۆژووبە پاداشتی هەشت ڕۆژت هەیە، ثابت وتی: ئەوەم بۆ موتەڕڕیف باس کرد، وتی: پێم وانیە تەنها ئەوە نەبێ کردەوەی زۆر دەکات و پاداشت کەم دەکاتەوە.

## ڕۆژووگرتنی دە ڕۆژ لە هەر مانگێک و جیاوازی ئەوانەی هەواڵەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەمریان گواستۆتەوە لە فەرموودەکەدا

**٢٣٩٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّكَ تَقُومُ اللَّيْلَ وَتَصُومُ النَّهَارَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا أَرَدْتُ بِذَلِكَ إِلَّا الْخَيْرَ، قَالَ: لَا صَامَ مَنْ صَامَ الْأَبَدَ. وَلَكِنْ أَدُلُّكَ عَلَى صَوْمِ الدَّهْرِ، ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ مِنَ الشَّهْرِ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: صُمْ خَمْسَةَ أَيَّامٍ، قُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: فَصُمْ عَشْراً، فَقُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: صُمْ صَوْمَ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ، كَانَ يَصُومُ يَوْماً وَيُفْطِرُ يَوْماً»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێم ڕاگەینراوە تۆ بە شەو شەونوێژ دەکەیت و بەڕۆژیش بەڕۆژوو دەبیت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا مەبەستم لەوەدا تەنها خێرە، فەرمووی: هەر کەس بە هەمیشەیی بەڕۆژوو بێت ئەوە ڕۆژووی بۆ نیە، بەڵام ڕێنموونیت دەکەم لەسەر ڕۆژووی ساڵ، لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژووبە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: پێنج ڕۆژ بەڕۆژووبە، وتم: لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: دە ڕۆژ بەڕۆژووبە، وتم: لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: ڕۆژوو بگرە وەکو ڕۆژووی داود (علیه السلام) ڕۆژێک بە ڕۆژوو دەبوو ڕۆژێکیش بەڕۆژوو نەدەبوو.

**٢٣٩٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو، وەکو فەرموودەکەی پێشوو (هاتووە).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٥٣ و ١٩٧٧ و ١٩٧٩ و ٣٢١٩، ومسلم: ١٨٦ و ١١٥٩/١٨٨، والترمذي: ٧٧٠، وإبن ماجه: ١٧٠٦.

(٢) صحيح.

**٢٣٩٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو، إِنَّكَ تَصُومُ الدَّهْرَ، وَتَقُومُ اللَّيْلَ، وَإِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ هَجَمَتْ الْعَيْنُ، وَنَفِهَتْ لَهُ النَّفْسُ، لَا صَامَ مَنْ صَامَ الْأَبَدَ صَوْمُ الدَّهْرِ، ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ مِنَ الشَّهْرِ صَوْمُ الدَّهْرِ كُلِّهِ، قُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: صُمْ صَوْمَ دَاوُدَ، كَانَ يَصُومُ يَوْماً وَيُفْطِرُ يَوْماً، وَلَا يَفِرُّ إِذَا لَاقَى»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: ئەی عەبدوڵڵای کوڕی عەمر، تۆ بە درێژایی ساڵ بەڕۆژوو دەبی و شەونوێژ دەکەی، تۆ ئەگەر ئەوە بکەی چاوت بە قوڵا دەچێ و نەفس و دەروونت ماندو دەبێت، هەر کەس بە هەمیشەیی بەڕۆژوو بێت ئەوە ڕۆژووی بۆ نیە، سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا بە قەد ڕۆژووگرتنی ساڵەکەیە، وتم: من لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: بە ڕۆژووبە وەک بە ڕۆژوو بوونی داود (علیه السلام)، ڕۆژێک بە ڕۆژوو دەبوو و ڕۆژێکیش بە ڕۆژوو نەدەبوو، وە ئەگەر ڕووبەڕووی دوژمن ببووایەتەوە پشتی هەڵنەدەکرد.**

**٢٤٠٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اقْرَأْ الْقُرْآنَ فِي شَهْرٍ، قُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، فَلَمْ أَزَلْ أَطْلُبُ إِلَيْهِ حَتَّى قَالَ: فِي خَمْسَةِ أَيَّامٍ، وَقَالَ: صُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنَ الشَّهْرِ، قُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكِ، فَلَمْ أَزَلْ أَطْلُبُ إِلَيْهِ حَتَّى قَالَ: صُمْ أَحَبَّ الصِّيَامِ إِلَى اللَّهِ ﷻ صَوْمَ دَاوُدَ، كَانَ يَصُومُ يَوْماً وَيُفْطِرُ يَوْماً»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: قورئان بخوێنە لە ماوەی مانگێکدا، وتم: من لەوە زیاتر دەتوانم، بەردەوام داوام لێکرد تا فەرمووی: لە پێنج ڕۆژدا، وە فەرمووی: لە مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژووبە، وتم: من لەوە زیاتر دەتوانم، بەردەوام داوام لێکرد تا فەرمووی: بەڕۆژووبە، خۆشەویسترین ڕۆژوو لای خوا ڕۆژوی داودە، ڕۆژێک بە ڕۆژوو دەبوو، ڕۆژێکیش بەڕۆژوو نەدەبوو.**

**٢٤٠١-** «عَن عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: بَلَغَ النَّبِيَّ ﷺ أَنِّي أَصُومُ أَسْرُدُ الصَّوْمَ، وَأُصَلِّي اللَّيْلَ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ، وَإِمَّا لَقِيَهُ قَالَ: أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَصُومُ وَلَا تُفْطِرُ، وَتُصَلِّي اللَّيْلَ،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

فَلَا تَفْعَلْ، فَإِنَّ لِعَيْنِكَ حَظّاً، وَلِنَفْسِكَ حَظّاً، وَلِأَهْلِكَ حَظّاً، وَصُمْ وَأَفْطِرْ، وَصَلِّ وَنَمْ، وَصُمْ مِنْ كُلِّ عَشَرَةِ أَيَّامٍ يَوْماً وَلَكَ أَجْرُ تِسْعَةٍ، قَالَ: إِنِّي أَقْوَى لِذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: صُمْ صِيَامَ دَاوُدَ إِذاً، قَالَ: وَكَيْفَ كَانَ صِيَامُ دَاوُدَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ؟ قَالَ: كَانَ يَصُومُ يَوْماً وَيُفْطِرُ يَوْماً، وَلَا يَفِرُّ إِذَا لَاقَى، قَالَ: وَمَنْ لِي بِهَذَا يَا نَبِيَّ اللَّهِ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: هەواڵ گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ کە من بەردەوام بەڕۆژوو دەبم و شەویش شەونوێژ دەکەم، ناردی بە شوێنیدا، یان پێی گەیشت، فەرمووی: هەواڵم پێدراوە تۆ هەمیشە بەڕۆژوو دەبێت و بێڕۆژوو نابیت، شەوانیش بەردەوام شەونوێژ دەکەی، کاری وا مەکە، چونکە چاوت مافی هەیە، نەفست مافی هەیە، خانەوادەکەت مافی هەیە، بەڕۆژووبەو بەڕۆژووش مەبە، شەونوێژ بکەو (هەندێکیش) بـخەوە، لە هەموو دە ڕۆژدا ڕۆژێک بە ڕۆژووبە پاداشتی نۆ ڕۆژەکەی دیکەت بۆ هەیە، وتی: من توانام لەوە زیاترە ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: بەڕۆژووبە وەک ڕۆژووی داود (علیه السلام) وتی: ڕۆژووی داود (علیه السلام) چۆن بوو ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ڕۆژێک بەرۆژوو دەبوو و، ڕۆژێکیش بەڕۆژوو نەدەبوو، وە ئەگەر ڕووبەڕوو دوژمن بووایەتەوە پشتی هەڵنەدەکرد، وتی: من لە کوێ بە ئەمە دەگەم ئەی پێغەمبەری خوا.**

## ڕۆژووگرتنی پێنج ڕۆژ لە مانگێکدا

**٢٤٠٢-** «عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ أَبِيكَ زَيْدٍ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما، فَحَدَّثَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذُكِرَ لَهُ صَوْمِي فَدَخَلَ عَلَيَّ، فَأَلْقَيْتُ لَهُ وِسَادَةَ أَدَمٍ رَبْعَةً حَشْوُهَا لِيفٌ، فَجَلَسَ عَلَى الْأَرْضِ وَصَارَتِ الْوِسَادَةُ فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَهُ، قَالَ: أَمَا يَكْفِيكَ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ؟ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: خَمْساً، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: سَبْعاً، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: تِسْعاً، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: إِحْدَى عَشْرَةَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَا صَوْمَ فَوْقَ صَوْمِ دَاوُدَ شَطْرَ الدَّهْرِ، صِيَامُ يَوْمٍ وَفِطْرُ يَوْمٍ»[٢].

**واتە: ئەبو قیلابە دەگێڕێتەوە: لە ئەبو مەلیح دەڵێ: لەگەڵ باوکتدا زەید ڕۆیشتم بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمر رضي الله عنهما، باسی ئەوەی کرد، کە ڕۆژووگرتنی من بۆ**

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٨٠ و ٦٢٧٧، ومسلم: ١١٥٩/١٩١.**

پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرابوو، دواتر هاتە ژوورەوە بۆ لام، سەرینێکم پێدا لە چەرم دروست کرابوو ناوەکەی ڕیشاڵی دارخورمای تێدا بوو، لەسەر زەویەکە دانیشت سەرینەکە لە نێوان من و ئەودا بوو، فەرمووی: ئایا لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژت بەس نیە؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: پێنج، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: حەوت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: نۆ، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: یازدە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: لە سەرووی ڕۆژووی داود (علیه السلام) ڕۆژوو نیە، نیوەی ساڵ، ڕۆژێک ڕۆژوو ڕۆژێکیش ڕۆژوو نەبوون.

## ڕۆژوو گرتنی چوار ڕۆژ لە مانگێکدا

**٢٤٠٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: صُمْ مِنَ الشَّهْرِ يَوْماً وَلَكَ أَجْرُ مَا بَقِيَ، قُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: فَصُمْ يَوْمَيْنِ وَلَكَ أَجْرُ مَا بَقِيَ، قُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: فَصُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ وَلَكَ أَجْرُ مَا بَقِيَ، قُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: صُمْ أَرْبَعَةَ أَيَّامٍ وَلَكَ أَجْرُ مَا بَقِيَ، قُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَفْضَلُ الصَّوْمِ صَوْمُ دَاوُدَ كَانَ يَصُومُ يَوْماً وَيُفْطِرُ يَوْماً»[١].

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: ڕۆژێک بەڕۆژووبە لە مانگێکدا پاداشتی ئەوەت بۆ هەیە کە ماوەتەوە، وتم: من لەوە زیاتر لە توانامدایە، فەرمووی: دوو ڕۆژ بەڕۆژووبە پاداشتی ئەو ڕۆژانەت بۆ هەیە کە ماوەتەوە، وتم: من لەوە زیاتر لە توانامدایە، فەرمووی: سێ ڕۆژ بەڕۆژووبە پاداشتی ئەو ڕۆژانەت بۆ هەیە کە ماوەتەوە، وتم: من لەوە زیاتر لە توانامدایە، فەرمووی: چوار ڕۆژ بەڕۆژووبە پاداشتی ئەو ڕۆژانەت بۆ هەیە کە ماوەتەوە، وتم: من لەوە زیاتر لە توانامدایە، فەرمووی: چاکترین ڕۆژوو لای خوا ڕۆژووی داودە، ئەو ڕۆژێک بەڕۆژوو دەبوو ڕۆژێکیش بەڕۆژوو نەدەبوو.

---

(١) صحيح.




## ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ لە مانگێکدا

**٢٤٠٤-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: أَوْصَانِي حَبِيبِي ﷺ بِثَلَاثَةٍ لَا أَدَعُهُنَّ إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى أَبَداً: أَوْصَانِي بِصَلَاةِ الضُّحَى، وَبِالْوَتْرِ قَبْلَ النَّوْمِ، وَبِصِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ»[١].

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: خۆشەویستم ﷺ وەسیەتی بۆ کردم بە سێ شت هەرگیز وازی لێ نەهێنم ئەگەر خوا ویستی: وەسیەتی بۆ کردم بە نوێژی چێشتەنگاو، وە بە ویتر پێش خەوتن، وە بە ڕۆژوو گرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا.**

**٢٤٠٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِثَلَاثٍ: بِنَوْمٍ عَلَى وِتْرٍ، وَالْغُسْلِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَصَوْمِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردم بە سێ شت: بە خەوتن لە دوای ویتر، وە خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی، وە ڕۆژوو گرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا.**

**٢٤٠٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِرَكْعَتَيِ الضُّحَى، وَأَنْ لَا أَنَامَ إِلَّا عَلَى وِتْرٍ، وَصِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردم بە دوو ڕکات چێشتەنگاو، وە نەخەوم تا نوێژی ویتر دەکەم، وە ڕۆژوو گرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا.**

**٢٤٠٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِنَوْمٍ عَلَى وَتْرٍ، وَالْغُسْلِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَصِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ»[٤].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردم بە خەوتن لە دوای ویتر، وە خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی، وە ڕۆژوو گرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا.**

---

**(١) صحيح.**

**(٢) منكر بذكر الغسل.**

**(٣) صحيح.**

**(٤) منكر بذكر الغسل.**




## باسی جیاوازی لەسەر ئەبو عوسمان لە فەرموودەی ئەبو هورەیرە لە ڕۆژوو گرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا

**٢٤٠٨-** «عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: شَهْرُ الصَّبْرِ، وَثَلَاثَةُ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ صَوْمُ الدَّهْرِ»[1].

**واتە: ثابت دەگێڕێتەوە: لە ئەبو عوسمان، ئەبو هورەیرە ﷺ وتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ڕۆژوو گرتنی مانگی خۆڕاگرتن (ڕەمەزان)و سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا بە قەد ڕۆژوو گرتنی ساڵەکەیە.**

**٢٤٠٩-** «عَنْ عَاصِمٍ الْأَحْوَلِ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ صَامَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنَ الشَّهْرِ فَقَدْ صَامَ الدَّهْرَ كُلَّهُ، ثُمَّ قَالَ: صَدَقَ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ: ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَا ۝١٦٠﴾ الأنعام»[2].

**واتە: عاصمی ئەحوەل دەگێڕێتەوە: لە ئەبو عوسمان، لە ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بێت لە مانگێکدا ئەوە مانگەکە بەڕۆژوو بووە، پاشان فەرمووی: خوا ﷻ ڕاستی فەرمووە لە کتێبەکەیدا: ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَا ۝١٦٠﴾، واتە: هەر کەس چاکە بکات، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا، دە ئەوەندی چاکەکەی پاداشتی بۆ هەیە.**

**٢٤١٠-** «عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ رَجُلٍ، قَالَ أَبُو ذَرٍّ ﷺ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ صَامَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ فَقَدْ تَمَّ صَوْمُ الشَّهْرِ، أَوْ فَلَهُ صَوْمُ الشَّهْرِ»[3].

**واتە: عاصم دەگێڕێتەوە: لە ئەبو عوسمان، لە پیاوێکەوە، لە ئەبو زەڕەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت لە مانگێکدا، ئەوە تەواوی مانگەکە بەڕۆژوو بووە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٧٦٢، وإبن ماجه: ١٧٠٨.

(٣) صحيح لغيره.




**٢٤١١-** «عَنْ عُثْمَانَ بْنَ أَبِي الْعَاصِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: صِيَامٌ حَسَنٌ ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ مِنَ الشَّهْرِ»[١].

**واتە: عوسمانی كوڕی ئەبو لعاص ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ڕۆژووگرتنی چاك بریتیە لە سێ ڕۆژ لە مانگێكدا.**

**٢٤١٢-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، قَالَ عُثْمَانُ بْنُ أَبِي الْعَاصِ ﷺ: نَحْوَهُ مُرْسَلٌ»[٢].

**واتە: سەعیدی كوڕی ئەبو هیند دەگێڕێتەوە: عوسمانی كوڕی ئەبو لعاص ﷺ هەمان فەرموودەی گێڕاوەتەوە بە مورسەلی.**

**٢٤١٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَصُومُ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ»[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە هەموو مانگێكدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو.**

## (مسوڵمان) چۆن سێ ڕۆژ ڕۆژوو دەگرێ لە هەموو مانگێكداو، باسی جیاوازی ئەوانەی لەوبارەوە فەرموودەكەیان گواستۆتەوە

**٢٤١٤-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَصُومُ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ. يَوْمَ الِاثْنَيْنِ مِنْ أَوَّلِ الشَّهْرِ، وَالْخَمِيسِ الَّذِي يَلِيهِ، ثُمَّ الْخَمِيسِ الَّذِي يَلِيهِ»[٤].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو مانگێكدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو، ڕۆژی دووشەممە لە سەرەتای مانگ و ئەو پێنج شەممەش كە بە دوایدا دەهات، پاشان ئەو پێنج شەممەی كە بە دوایدا دەهات.**

**٢٤١٥-** «عَنْ هُنَيْدَةَ الْخُزَاعِيِّ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، سَمِعْتُهَا تَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، أَوَّلَ اثْنَيْنِ مِنَ الشَّهْرِ، ثُمَّ الْخَمِيسَ، ثُمَّ الْخَمِيسَ الَّذِي يَلِيهِ»[٥].

---

(١) صحيح.
(٢) صحيح.
(٣) صحيح.
(٤) صحيح لغيره.
(٥) صحيح.




**واتە: هونەیدەی خوزاعی دەڵێ: چوومە ژوورەوە بۆ لای دایکی ئیماندااران (خوا لێی ڕازی بێ)، گوێم لێ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو، یەکەم دووشەممە لە سەرەتای مانگ، پاشان پێنج شەممە، پاشان ئەو پێنج شەممەی کە بەدوایدا دەهات.**

**٢٤١٦-** «عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أَرْبَعٌ لَمْ يَكُنْ يَدَعُهُنَّ النَّبِيُّ ﷺ: صِيَامَ عَاشُورَاءَ، وَالْعَشْرَ، وَثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْغَدَاةِ»[١].

**واتە: حەفصە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: چوار شت پێغەمبەر ﷺ وازی لێ نەدەهێنا: ڕۆژووی عاشوراو دەیەمی (ذِي الْحِجَّةِ) و سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا، وە دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی.**

**٢٤١٧-** «عَنْ هُنَيْدَةَ بْنِ خَالِدٍ، عَنْ امْرَأَتِهِ، عَنْ بَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَصُومُ تِسْعاً مِنْ ذِي الْحِجَّةِ، وَيَوْمَ عَاشُورَاءَ، وَثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، أَوَّلَ اثْنَيْنِ مِنَ الشَّهْرِ وَخَمِيسَيْنِ»[٢].

**واتە: هونەیدەی کوڕی خالید دەگێڕێتەوە: لە هاوسەرەکەی لە هەندێک لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ (بیستوویەتی)، کە پێغەمبەری خوا ﷺ نۆیەم ڕۆژی (ذِي الْحِجَّةِ) بە ڕۆژوو دەبوو، وە ڕۆژی عاشوراو، سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا بە ڕۆژوو دەبوو، یەکەم دووشەممە لە مانگەکەو دوو پێنج شەممە.**

**٢٤١٨-** «عَنْ هُنَيْدَةَ بْنِ خَالِدٍ، عَنْ امْرَأَتِهِ، عَنْ بَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَصُومُ الْعَشْرَ، وَثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسَ»[٣].

**واتە: هونەیدەی کوڕی خالید دەگێڕێتەوە لە هاوسەرەکەی، لە یەکێک لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەیەمی (ذِي الْحِجَّةِ) دەگرت، وە سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا، دووشەممەو پێنج شەممە.**

---

**(١) ضعيف.**

**(٢) صحيح.**

**(٣) صحيح. بلفظ: «الخميسين».**

**٢٤١٩-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُ بِصِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ: أَوَّلِ خَمِيسٍ، وَالِاثْنَيْنِ وَالِاثْنَيْنِ»[١].

**واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دەکرد بە ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ: یەکەمین پێنج شەممە، وە دووشەممەو دووشەممەیەکی دیکە.**

**٢٤٢٠-** «عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: صِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ صِيَامُ الدَّهْرِ، وَأَيَّامُ الْبِيضِ صَبِيحَةَ ثَلَاثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ»[٢].

**واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا وەک ڕۆژووگرتنی ساڵەکەیە، وە ڕۆژە سپیەکان سەر لەبەیانی سێزدەو چواردەو پازدە.**

## باسی جیاوازی لەسەر موسای کوڕی تەڵحە لە فەرموودەکە لە بارەی سێ ڕۆژ ڕۆژوو گرتن لە مانگێکدا

**٢٤٢١-** «عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِأَرْنَبٍ قَدْ شَوَاهَا فَوَضَعَهَا بَيْنَ يَدَيْهِ، فَأَمْسَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَلَمْ يَأْكُلْ، وَأَمَرَ الْقَوْمَ أَنْ يَأْكُلُوا، وَأَمْسَكَ الْأَعْرَابِيُّ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: مَا يَمْنَعُكَ أَنْ تَأْكُلَ؟ قَالَ: إِنِّي صَائِمٌ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنَ الشَّهْرِ، قَالَ: إِنْ كُنْتَ صَائِماً فَصُمِ الْغُرَّ»[٣].

**واتە: عەبدولمەلیکی کوڕی عومەیر دەگێڕێتەوە: لە موسای کوڕی طەلحە، لە ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێکی دەشتەکی هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ کەروێشکێکی برژاوی بۆ هێنا خستیە بەردەستی، پێغەمبەری خوا ﷺ لێی نەخوارد، فەرمانی کرد بە خەڵکەکە لێی بخۆن، کابرای دەشتەکیش لێی نەخوارد، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: چی وات لێ دەکات لێی نەخۆی؟ وتی: من سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبم لە مانگێکدا، فەرمووی: تۆ ئەگەر هەر بەڕۆژوو دەبیت، ئەو ڕۆژانە بگرە کە شەوەکانی مانگ ڕۆشنی کردوەتەوە.**

---

(١) شاذ. أخرجه أبو داود: ٢٤٣٧ و ٢٤٥٢.

(٢) حسن.

(٣) ضعيف.




**٢٤٢٢-** «عَنْ يَحْيَى بْنِ سَامٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَصُومَ مِنَ الشَّهْرِ ثَلَاثَةَ أَيَّامِ الْبِيضَ: ثَلَاثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ»[١].

**واتە: یەحیای کوڕی سام دەگێڕێتەوە: لە موسای کوڕی تەڵحە لە ئەبو زەڕەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردین لە مانگێکدا سێ ڕۆژی سپی (ئەو ڕۆژەی شەوەکان تیایدا گەشن) بەڕۆژوو بین: سێزدەو چواردەو پازدە.**

**٢٤٢٣-** «عَنْ يَحْيَى بْنَ سَامٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَصُومَ مِنَ الشَّهْرِ ثَلَاثَةَ أَيَّامِ الْبِيضَ: ثَلَاثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ»[٢].

**واتە: یەحیای کوڕی سام دەگێڕێتەوە: لە موسای کوڕی تەڵحە، لە ئەبو زەڕەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین لە مانگێکدا سێ ڕۆژی سپی بە ڕۆژوو بین: سێزدەو چواردەو پازدە.**

**٢٤٢٤-** «عَن يَحْيَى بْنَ سَامٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا ذَرٍّ ﷺ بِالرَّبَذَةِ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا صُمْتَ شَيْئاً مِنَ الشَّهْرِ، فَصُمْ ثَلَاثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ»[٣].

**واتە: یەحیای کوڕی سام دەگێڕێتەوە: موسای کوڕی تەڵحە دەڵێ: گوێم لە ئەبو زەڕ ﷺ بوو لە (الرَّبَذَة) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر لە مانگێکدا بەڕۆژوو بووی ئەوە سێزدەو چواردەو پازدە بە ڕۆژووبە.**

**٢٤٢٥-** «عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ بَيَانِ بْنِ بِشْرٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ ابْنِ الْحَوْتَكِيَّةِ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِرَجُلٍ: عَلَيْكَ بِصِيَامِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ»[٤].

**واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە: لە بەیانی کوڕی بیشر لە موسای کوڕی تەڵحە، لە ئیبن حەوتەکیەوە، لە ئەبو زەڕەوە ﷺ، وتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێکی فەرموو: دەست بگرە بە ڕۆژوو گرتنی سێزدەو چواردەو پازدە.**

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ٧٦١.

(٢) حسن.

(٣) حسن.

(٤) حسن لغيره.





**٢٤٢٦-** «عَنْ سُفْيَان، قَالَ: حَدَّثَنَا رَجُلَانِ مُحَمَّدٌ، وَحَكِيمٌ، عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ ابْنِ الْحَوْتَكِيَةِ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ رَجُلاً بِصِيَامِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ»[١] .

**واتە: سوفیان دەڵێ: دوو پیاو بۆی باس کردین موحەممەدو حەکیم، لە موسای کوڕی تەڵحە، لە ئیبن حەوتەکیە، لە ئەبو زەڕەوە ﷺ، وتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە پیاوێک کرد بە ڕۆژوو گرتنی سێزدەو چواردەو پازدە.**

**٢٤٢٧-** «عَنْ عِيسَى، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ الْحَكَمِ، عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ ابْنِ الْحَوْتَكِيَّةِ، قَالَ: قَالَ أَبِي ﷺ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَمَعَهُ أَرْنَبٌ قَدْ شَوَاهَا وَخُبْزٌ، فَوَضَعَهَا بَيْنَ يَدَي النَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: إِنِّي وَجَدْتُهَا تَدْمَى، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِأَصْحَابِهِ: لَا يَضُرُّ، كُلُوا، وَقَالَ لِلْأَعْرَابِيِّ: كُلْ، قَالَ: إِنِّي صَائِمٌ، قَالَ: صَوْمُ مَاذَا؟ قَالَ: صَوْمُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنَ الشَّهْرِ، قَالَ: إِنْ كُنْتَ صَائِمَ فَعَلَيْكَ بِالْغُرِّ الْبِيضِ: ثَلَاثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ»[٢].

**واتە: عیسا دەگێڕێتەوە: لە موحەممەد لە حەکەم، لە موسای کوڕی تەڵحە، لە ئیبن حەوتەکیە دەڵێ: باوکم ﷺ وتی: دەشتەکیەک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ کەروێشکێکی برژاوو نانی لەگەڵ خۆی هێنا بوو، لە بەردەستی پێغەمبەردا دانا، پاشان وتی: من بینیم خوێنی لێ دەهات (خوێنی حەیز، جا ئایا حەیز ببینێ دەخورێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: زیانی نیە بخۆن، بە دەشتەکیەکەی فەرموو: بخۆ، وتی: من بە ڕۆژووم، فەرمووی: ڕۆژووی چی؟ وتی: سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا، فەرمووی: ئەگەر تۆ بە ڕۆژوو دەبێ ئەوە دەست بگرە بە ئەو ڕۆژانەی کە شەوەکانی مانگ ڕۆشنی کردۆتەوە: سێزدەو چواردەو پازدە.**

**٢٤٢٨-** «عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مَعْنٍ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ يَحْيَى، عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ بِأَرْنَبٍ، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ مَدَّ يَدَهُ إِلَيْهَا، فَقَالَ الَّذِي جَاءَ بِهَا: إِنِّي رَأَيْتُ بِهَا دَماً، فَكَفَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَهُ، وَأَمَرَ الْقَوْمَ أَنْ يَأْكُلُوا، وَكَانَ فِي الْقَوْمِ رَجُلٌ مُنْتَبِذٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَا لَكَ؟ قَالَ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: فَهَلَّا ثَلَاثَ الْبِيضِ: ثَلَاثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ»[٣].

---

**(١) حسن لغيره.**

**(٢) ضعيف.**

**(٣) ضعيف.**





واتە: قاسمی کوڕی مەعن دەگێڕێتەوە: لە تەڵحەی کوڕی یەحیا، لە موسای کوڕی تەڵحە ﷺ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کەروێشکێکی لەگەڵ خۆی هێنا، پێغەمبەریش دەستی بۆی درێژ کرد، ئەو کەسەی کە هێنابووی وتی: من بینیم خوێنی لێ دەهات (حەیز) پێغەمبەر ﷺ (تەبیعەتی نەیبرد)و دەستی گرتەوەو فەرمانی کرد بە خەڵکەکە لێی بخۆن، لە ناو خەڵکەکەدا پیاوێک کەناری گرتبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە چیتە؟ وتی: من بە ڕۆژووم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی بۆچی ڕۆژە سپیەکانت نەگرت: سێزدەو چواردەو پازدە.

**٢٤٢٩-** «عَنْ يَعْلَى، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ يَحْيَى، عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ ﷺ قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِأَرْنَبٍ قَدْ شَوَاهَا رَجُلٌ، فَلَمَّا قَدَّمَهَا إِلَيْهِ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي قَدْ رَأَيْتُ بِهَا دَماً، فَتَرَكَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَلَمْ يَأْكُلْهَا، وَقَالَ لِمَنْ عِنْدَهُ: كُلُوا، فَإِنِّي لَوِ اشْتَهَيْتُهَا أَكَلْتُهَا، وَرَجُلٌ جَالِسٌ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ادْنُ فَكُلْ مَعَ الْقَوْمِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي صَائِمٌ، قَالَ: فَهَلَّا صُمْتَ الْبِيضَ، قَالَ: وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: ثَلَاثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ»[١].

واتە: یەعلا دەگێڕێتەوە لە تەڵحەی کوڕی یەحیا، لە موسای کوڕی تەڵحە ﷺ دەڵێ: کەروێشکێکیان هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ پیاوێک برژاندبووی کاتێ خستیە بەردەستی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من بینیم خوێنی لێهات (واتە: خوێنی حەیز) پێغەمبەر وازی لێ هێناو لێی نەخوارد، بەوانەی دەوروبەری فەرموو: بخۆن، ئەگەر حەزم لێ بووایە دەمخوارد، پیاوێکیش دانیشتبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نزیک ببەرەوە لەگەڵ خەڵکەکە بیخۆ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من بەڕۆژووم، فەرمووی: ئەی بۆچی ڕۆژە سپیەکانت نەگرت، وتی: کامانەن؟ فەرمووی: سێزدەو چواردەو پازدە.

**٢٤٣٠-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ رَجُلٍ يُقَالُ لَهُ عَبْدُ الْمَلِكِ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَأْمُرُ بِهَذِهِ الْأَيَّامِ الثَّلَاثِ الْبِيضِ، وَيَقُولُ: هُنَّ صِيَامُ الشَّهْرِ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی سیرین دەگێڕێتەوە: لە پیاوێکەوە پێی دەوترا: عەبدولمەلیک ئەویش لە باوکیەوە ﷺ دەیگێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دەکرد بەو سێ

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٤٤٩، وإبن ماجه: ١٧٠٧.




ڕۆژە سپیە (کە شەوەکانیان بە مانگ گەشاوەیە)، وە دەیفەرموو: ئەوانە ڕۆژووی ئەو مانگەن.

**٢٤٣١-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الْمَلِكِ بْنَ أَبِي الْمِنْهَالِ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَهُمْ بِصِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ الْبِيضِ، قَالَ: هِيَ صَوْمُ الشَّهْرِ»(١).

**واتە: ئەنەسی کوڕی سیرین دەڵێ: گوێم لە عەبدولمەلیکی کوڕی ئەبو مینهال بوو، لە باوکیەوە ﷺ دەیگێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردوون بە ڕۆژوو گرتنی سێ ڕۆژی سپی، (کە شەوەکانیان بە مانگ گەشاوەیە)، فەرمووی: ئەوە ڕۆژووی ئەو مانگەیە.**

**٢٤٣٢-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ، قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ قَتَادَةَ بْنِ مِلْحَانَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُنَا بِصَوْمِ أَيَّامِ اللَّيَالِي الْغُرِّ الْبِيضِ: ثَلَاثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ»(٢).

**واتە: ئەنەسی کوڕی سیرین دەڵێ: عەبدولمەلیکی کوڕی قەتادەی کوڕی میلحان، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ دەکردین بە ڕۆژوو گرتنی ئەو ڕۆژانەی کە شەوەکانی مانگ ڕۆشنی کردوەتەوە: سێزدەو چواردەو پازدە.**

## ڕۆژووگرتنی دوو ڕۆژ لە مانگێکدا

**٢٤٣٣-** «عَنْ أَبِي نَوْفَلِ بْنِ أَبِي عَقْرَبٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الصَّوْمِ، فَقَالَ: صُمْ يَوْماً مِنَ الشَّهْرِ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، زِدْنِي زِدْنِي، قَالَ: تَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ زِدْنِي زِدْنِي، يَوْمَيْنِ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، زِدْنِي زِدْنِي إِنِّي أَجِدُنِي قَوِيّاً، فَقَالَ: زِدْنِي زِدْنِي، أَجِدُنِي قَوِيّاً، فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ لَيَرُدُّنِي، قَالَ: صُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ»(٣).

**واتە: لە ئەبو نەوفەلی کوڕی ئەبو عەقرەب، لە باوکی ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ڕۆژوو، فەرمووی: یەک ڕۆژ ڕۆژو بگرە لە مانگێکدا،**

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح الإسناد.




وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بۆم زیاد بکە، بۆم زیاد بکە، فەرمووی: دەڵێی بۆم زیاد بکە بۆم زیاد بکە، دوو ڕۆژ لە مانگێکدا بە ڕۆژووبە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بۆم زیاد بکە، بۆم زیاد بکە من دەبینم توانام تێدایە، فەرمووی: بۆم زیاد بکە، بۆم زیاد بکە من دەبینم توانام تێدایە، پێغەمبەری خوا ﷺ بێ دەنگ بوو تا گومانم برد ڕەتم دەکاتەوەو چیتر بۆم زیاد ناکات، فەرمووی: سێ ڕۆژ بەڕۆژووبە لە هەموو مانگێکدا.

**٢٤٣٤-** «عَنْ أَبِي نَوْفَلِ بْنِ أَبِي عَقْرَبٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الصَّوْمِ، فَقَالَ: صُمْ يَوْماً مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَاسْتَزَادَهُ، قَالَ: بَأبِي أَنْتَ وَأُمِّي أَجِدُنِي قَوِيّاً، فَزَادَهُ، قَالَ: صُمْ يَوْمَيْنِ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، فَقَالَ: بَأبِي أَنْتَ وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَجِدُنِي قَوِيّاً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنِّي أَجِدُنِي قَوِيّاً، إِنِّي أَجِدُنِي قَوِيّاً، فَمَا كَادَ أَنْ يَزِيدَهُ، فَلَمَّا أَلَحَّ عَلَيْهِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: صُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ»[١].

واتە: لە ئەبو نەوفەلی کوڕی ئەبو عەقرەب، لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە ئەو پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ڕۆژوو، فەرمووی: یەک ڕۆژ ڕۆژو بگرە لە مانگێکدا، داوای کرد بۆی زیاد بکات، وتی: دایک و باوکم بە قوربانت بێ دەبینم توانام تێدایە، جا بۆی زیاد کردوو فەرمووی: دوو ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا بەڕۆژووبە، وتی: دایک و باوکم بە قوربانت بێت ئەی پێغەمبەری خوا من دەبینم توانام تێدایە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من دەبینم توانام تێدایە، من دەبینم توانام تێدایە، نەیدەویست بۆی زیاد بکات، بەڵام کاتێ پێداگری کرد پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سێ ڕۆژ بەڕۆژووبە لە هەموو مانگێکدا.

---

(١) صحيح الإسناد.




## بابەت: واجب بوونی زەکات

**٢٤٣٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِمُعَاذٍ حِينَ بَعَثَهُ إِلَى الْيَمَنِ: إِنَّكَ تَأْتِي قَوْماً أَهْلَ كِتَابٍ، فَإِذَا جِئْتَهُمْ فَادْعُهُمْ إِلَى أَنْ يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ بِذَلِكَ، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ ﷻ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ هُمْ «يَعْنِي» أَطَاعُوكَ بِذَلِكَ، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ ﷻ فَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ بِذَلِكَ، فَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ»[1].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە موعازی فەرموو کاتێ ناردی بۆ یەمەن: ئەی موعاز تۆ دەچیت بۆ لای خەڵکانێک لە خاوەن کتێبەکان، کاتێ چوویت بۆ لایان بانگیان بکە بۆ ئەوەی شایەتمان بهێنن بە: (أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ) جا ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵی تۆیان کرد بەو شایەتمانە، ئەوە پێیان ڕابگەیەنە کە بەڕاستی خوا ﷻ پێنج نوێژی لەسەریان فەرز کردوە لە شەوو ڕۆژێکدا، جا ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵی تۆیان کرد بەوە، ئەوە پێیان ڕابگەیەنە کە بەڕاستی خوا زەکاتی لەسەریان فەرز کردوە لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێ و دەگەڕێنرێتەوە بۆ هەژارەکانیان، جا ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵیان کردی بەوە، ئەوە لە نزای ستەم لێکراو بترسە.**

**٢٤٣٦-** «عَنْ بَهْزَ بْنَ حَكِيمٍ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، مَا أَتَيْتُكَ حَتَّى حَلَفْتُ أَكْثَرَ مِنْ عَدَدِهِنَّ لِأَصَابِعِ يَدَيْهِ أَنْ لَا آتِيَكَ وَلَا آتِيَ دِينَكَ، وَإِنِّي كُنْتُ امْرَأً لَا أَعْقِلُ شَيْئاً إِلَّا مَا عَلَّمَنِي اللَّهُ ﷻ وَرَسُولُهُ، وَإِنِّي أَسْأَلُكَ بِوَحْيِ اللَّهِ، بِمَا بَعَثَكَ رَبُّكَ إِلَيْنَا؟ قَالَ: بِالْإِسْلَامِ، قُلْتُ: وَمَا آيَاتُ الْإِسْلَامِ؟ قَالَ: أَنْ تَقُولَ أَسْلَمْتُ وَجْهِي إِلَى اللَّهِ، وَتَخَلَّيْتُ، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ»[2].

**واتە: بەهزی کوڕی حەکیم، لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە: باپیرەی ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من نەهاتم بۆ لات تا سوێندم خوارد بە ژمارەی پەنجەکانی دەستم هەرگیز نەیەم نە بۆ لای تۆو نە بۆ لای ئاینەکەیشت، من کەسێکم هیچ نازانم مەگەر**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٩٥ و ١٤٥٨ و ١٤٩٦ و ٢٤٤٨ و ٤٣٤٧ و ٧٣٧١ و ٧٣٧٢، ومسلم: ٢٩ و ١٩/٣١، وأبو داود: ١٥٨٤، والترمذي: ٦٢٥ و ٢٠١٤، وابن ماجه: ٧٨٣.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٢١٩٢ و ٢٤٢٤ و ٣٠٠١ و ٣١٤٣، وابن ماجه: ٢٣٤ و ٢٥٣٦ و ٤٢٨٧ و ٤٢٨٨.




ئەوەی خوا ﷻو پێغەمبەرەکەی فێری کردووم، بەڕاستی من داوای نیگاو وەحی خوات لێ دەکەم، پەروەردگارت تۆی بەچی ناردوە بۆ ناومان؟ فەرمووی: بە ئیسلام منی ناردوە؟ وتی: نیشانەکانی ئیسلام چیە؟ فەرمووی: ئەوەیە کە بڵێی ڕوخساری خۆمم بە خوا سپارد، وە خۆم داڕنی لە هاوبەشدانان، نوێژیش بکەی و زەکاتیش بدەی.

**٢٤٣٧-** «عَن أَبِي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ شَطْرُ الْإِيمَانِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَأُ الْمِيزَانَ، وَالتَّسْبِيحُ وَالتَّكْبِيرُ يَمْلَأُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ، وَالصَّلَاةُ نُورٌ، وَالزَّكَاةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ»[١].

واتە: ئەبو مالیکی ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەستنوێژ گرتن بە چاکی نیوەی ئیمانە، سوپاس و ستایش کردنی خواش تەرازوو پڕ دەکات، تەسبیحات و تەکبیر کردن ئاسمانەکان و زەوی پڕ دەکەن، نوێژ ڕوناکیە، زەکات ڕاستگۆیی خاوەنەکەی دەسەلمێنێ، ئارامگرتن ڕۆشناییەکی بەهێزە، قورئانیش یان بەڵگەیە بۆت، یان بەڵگەیە لەسەرت.

**٢٤٣٨-** «عَن صُهَيْب، أَنَّهُ سَمِعَ مِنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَمِنْ أَبِي سَعِيدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولَانِ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْماً، فَقَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ أَكَبَّ، فَأَكَبَّ كُلُّ رَجُلٍ مِنَّا يَبْكِي لَا نَدْرِي عَلَى مَاذَا حَلَفَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فِي وَجْهِهِ الْبُشْرَى، فَكَانَتْ أَحَبَّ إِلَيْنَا مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ، ثُمَّ قَالَ: مَا مِنْ عَبْدٍ يُصَلِّي الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ، وَيَصُومُ رَمَضَانَ، وَيُخْرِجُ الزَّكَاةَ، وَيَجْتَنِبُ الْكَبَائِرَ السَّبْعَ، إِلَّا فُتِّحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ، فَقِيلَ لَهُ: ادْخُلْ بِسَلَامٍ»[٢].

واتە: صوهەیب دەگێڕێتەوە: ئەو گوێی لە ئەبو هورەیرە بوو، لە ئەبو سەعید (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێن: ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین، فەرمووی: سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بە دەستە، سێ جار، پاشان کەوت، هەر پیاوێک لە ئێمەش کەوتین نەماندەزانی بۆچی سوێندی خوارد، پاشان سەری بەرز کردەوە مژدە لە ڕوخساری دەباری، ئەوە لای ئێمە خۆشەویستتر بوو لە وشتری سوور، پاشان فەرمووی: هیچ بەندەیەک نیە هەر پێنج نوێژەکە بکات و ڕەمەزان بەڕۆژوو

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٣، والترمذي: ٣٥١٧، وإبن ماجه: ٢٨٠.

(٢) ضعيف.




**بێت و زەکات دەربکات و دووربکەوێتەوە لە حەوت گوناهە گەورەکان، حەتمەن دەرگاکانی بەهەشتی بۆ دەکرێنەوە، پێی دەوترێ: بە سەلامەتی بچۆرە ژوورەوە.**

**٢٤٣٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ مِنْ شَيْءٍ مِنَ الْأَشْيَاءِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، دُعِيَ مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ يَا عَبْدَ اللَّهِ هَذَا خَيْرٌ لَكَ، وَلِلْجَنَّةِ أَبْوَابٌ، فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّلَاةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّلَاةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجِهَادِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الْجِهَادِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّدَقَةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّدَقَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصِّيَامِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الرَّيَّانِ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَلْ عَلَى مَنْ يُدْعَى مِنْ تِلْكَ الْأَبْوَابِ مِنْ ضَرُورَةٍ، فَهَلْ يُدْعَى مِنْهَا كُلِّهَا أَحَدٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَإِنِّي أَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ، يَعْنِي أَبَا بَكْرٍ»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەس دوو جووت لە شتێک لە شتەکان ببەخشێ لە پێناوی خوا (بۆ نموونە: دوو وشتر، یان دوو مەڕ یان ....هتدا) لە دەرگاکانی بەهەشتەوە بانگ دەکرێت ئەی بەندەی خوا ئەمە خێرو پاداشتێکە خوا ئامادەی کردوە بۆ تۆ، بەهەشتیش چەندین دەرگای هەیە، جا هەر کەس لە ئەهلی نوێژ بێت لە دەرگای نوێژەوە بانگ دەکرێ، هەر کەس لە ئەهلی جیهاد بێت لە دەرگای جیهادەوە بانگ دەکرێ، هەر کەس لە ئەهلی خێرو صەدەقەو زەکات بێت لە دەرگای خێرو صەدەقەو زەکاتەوە بانگ دەکرێ، هەر کەس لە ئەهلی ڕۆژوو بێت لە دەرگای ڕەییانەوە بانگ دەکرێ، ئەبو بەکری صدیق وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا پێویست دەکات کەسێک لەو هەموو دەرگایانەو بانگ بکرێ، (چونکە لە هەر دەرگایەکیانەوە چووە ژوورەوە ڕزگاری دەبێت)، ئایا کەسێک هەیە لە هەموو دەگاکانەوە بانگ بکرێ؟ فەرمووی: بەڵێ، ئومێد دەکەم تۆ لەوانە بیت.**

## بابەت هەڕەشە کردن لە گیردان و دەرنەکردنی زەکات

**٢٤٤٠-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: جِئْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ جَالِسٌ فِي ظِلِّ الْكَعْبَةِ، فَلَمَّا رَآنِي مُقْبِلاً، قَالَ: هُمُ الْأَخْسَرُونَ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ، فَقُلْتُ: مَا لِي لَعَلِّي أُنْزِلَ فِيَّ شَيْءٌ، قُلْتُ: مَنْ هُمْ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي، قَالَ: الْأَكْثَرُونَ أَمْوَالاً، إِلَّا مَنْ قَالَ: هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا حَتَّى بَيْنَ يَدَيْهِ، وَعَنْ

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٩٧ و ٣٦٦٦، ومسلم: ١٠٢٧، والترمذي: ٣٦٧٤.




يَمِينِهِ، وَعَنْ شِمَالِهِ، ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَا يَمُوتُ رَجُلٌ فَيَدَعُ إِبِلاً أَوْ بَقَراً لَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهَا، إِلَّا جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْظَمَ مَا كَانَتْ وَأَسْمَنَهُ تَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا، وَتَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا، كُلَّمَا نَفِدَتْ أُخْرَاهَا أُعِيدَتْ أُولَاهَا حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ»(١).

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە سێبەری کەعبە دانیشتبوو، کاتێ بینیمی بەرەو ڕووی دەڕۆیشتم، فەرمووی: سوێند بە پەروەردگاری کەعبە ئەوانە زەرەرمەند بوون، وتم: ڕەنگە شتێکم بۆ ڕووبدات، وتم: ئەوانە کێن دایک و باوکم بە قوربانت بێت، فەرمووی: ئەوانەی ماڵ و سامانیان زۆرە، جگە لە کەسێک نەبێت دەبەخشێ بەو شێوەو بەو شێوەو بەو شێوە، لە پێشی و لای ڕاستی و لای چەپی، پاشان فەرمووی: سوێند بە خوا هەرکەس بمرێ وشترێک، یان مانگایەک جێبهێڵێ زەکاتی دەرنەکردبێ لە ڕۆژی قیامەتدا زۆر گەورەتر دێت، بە سمەکانی دەیشێلێت و بە شاخەکانی قۆچی لێ دەدا، کاتێ کۆتایەکەیان تەواو دەبێ یەکەمینیان دەست پێدەکاتەوە تا بڕیار لە نێوان خەڵکیدا دەدرێت.**

**٢٤٤١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا مِنْ رَجُلٍ لَهُ مَالٌ لَا يُؤَدِّي حَقَّ مَالِهِ إِلَّا جُعِلَ لَهُ طَوْقاً فِي عُنُقِهِ، شُجَاعٌ أَقْرَعُ وَهُوَ يَفِرُّ مِنْهُ وَهُوَ يَتْبَعُهُ، ثُمَّ قَرَأَ مِصْدَاقَهُ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ ﷻ: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم ۖ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ ۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴿١٨٠﴾﴾آل عمران»(٢).

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر پیاوێک ماڵ و سامانێکی هەبێت زەکاتی ماڵەکەی دەرنەکات، ئەوە خوا ئەو ماڵە دەکات بە پیرەمارێکی کەچەڵ لە گەردنی دەئاڵێ، ئەو لێی ڕادەکاو ئەویش شوێنی دەکەوێ، پاشان پشت ڕاست کردنەوەی ئەمەی لە کتێبی خوادا خوێندەوە: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم ۖ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ ۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴿١٨٠﴾﴾، (واتە: هەرگیز وا گومان نەبەن ئەو کەسانەی کە چرووکی دەکەن بەوەی خوا پێی بەخشیون لە ڕێزو بەهرەی خۆی کە ئەو چرووکیە چاکترە بۆیان، نا وانیە، بەڵکو ئەوە خراپە بۆیان، ئەوەی چرووکیان پێی دەکرد بە زوویی وەک تەوق دەکرێتە ملیان لە ڕۆژی دواییدا).**

---

**(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٦٠ و ٦٦٣٨، ومسلم: ٩٩٠، والترمذي: ٦١٧، وإبن ماجه: ١٧٨٥.**

**(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٠١٢، وإبن ماجه: ١٧٨٤.**

**٢٤٤٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: أَيُّمَا رَجُلٍ كَانَتْ لَهُ إِبِلٌ لَا يُعْطِي حَقَّهَا فِي نَجْدَتِهَا وَرِسْلِهَا، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا نَجْدَتُهَا وَرِسْلُهَا؟ قَالَ: فِي عُسْرِهَا وَيُسْرِهَا، فَإِنَّهَا تَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَغَذِّ مَا كَانَتْ وَأَسْمَنِهِ وَآشَرِهِ، يُبْطَحُ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ فَتَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا، إِذَا جَاءَتْ أُخْرَاهَا أُعِيدَتْ عَلَيْهِ أُولَاهَا فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ فَيَرَى سَبِيلَهُ، وَأَيُّمَا رَجُلٍ كَانَتْ لَهُ بَقَرٌ لَا يُعْطِي حَقَّهَا فِي نَجْدَتِهَا وَرِسْلِهَا، فَإِنَّهَا تَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَغَذَّ مَا كَانَتْ وَأَسْمَنَهُ وَآشَرَهُ، يُبْطَحُ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ، فَتَنْطَحُهُ كُلُّ ذَاتِ قَرْنٍ بِقَرْنِهَا، وَتَطَؤُهُ كُلُّ ذَاتِ ظِلْفٍ بِظِلْفِهَا، إِذَا جَاوَزَتْهُ أُخْرَاهَا أُعِيدَتْ عَلَيْهِ أُولَاهَا فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ فَيَرَى سَبِيلَهُ، وَأَيُّمَا رَجُلٍ كَانَتْ لَهُ غَنَمٌ لَا يُعْطِي حَقَّهَا فِي نَجْدَتِهَا وَرِسْلِهَا، فَإِنَّهَا تَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَغَذِّ مَا كَانَتْ وَأَكْثَرِهِ وَأَسْمَنِهِ وَآشَرِهِ، ثُمَّ يُبْطَحُ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ فَتَطَؤُهُ كُلُّ ذَاتِ ظِلْفٍ بِظِلْفِهَا، وَتَنْطَحُهُ كُلُّ ذَاتِ قَرْنٍ بِقَرْنِهَا، لَيْسَ فِيهَا عَقْصَاءُ وَلَا عَضْبَاءُ، إِذَا جَاوَزَتْهُ أُخْرَاهَا أُعِيدَتْ عَلَيْهِ أُولَاهَا فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ فَيَرَى سَبِيلَهُ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر پیاوێک وشتری هەبێت مافی دەرنەکات کە زەکاتە لە کاتی (نَجْدَتِهَا وَرِسْلِهَا)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (نَجْدَتِهَا وَرِسْلِهَا) مانای چیە؟ فەرمووی: لە خۆشی و ناخۆشیدا، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا بە شێوەیەک دێت لەوسا بەهێزترو چالاکترو هارترە، لەسەر ڕوو فڕێ دەدرێتە دەشتاییەکی فراوانی تەخت، ئەویش بە سمەکانی دەیشێلێت، ئەگەر کۆتاهەمینیان تەواو بوو، یەکەمینیان دووبارە دێتەوە بەسەریدا لە ڕۆژێکدا ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە، تا دادگەری لە نێوان خەڵکدا دەکرێ ئەویش دەرەنجامی خۆی دەبینێ، وە هەر پیاوێک مانگای هەبێ زەکاتی دەرنەکات لە کاتی خۆشی و ناخۆشیدا ئەوە لە ڕۆژی دواییدا دێت لەوسا بەهێزترو چالاکترو هار ترە، پاشان ئەو کەسە فڕێ دەدرێتە دەشتاییەکی فراوانی تەخت، هەموو خاوەن شاخێک بە شاخەکەی قۆچی لێدەدا، وە هەموو خاوەن سمێک بە سمەکانی دەیشێلێت، کاتێ کۆتاییەکەی تێدەپەڕێ یەکەمینیان بە دوایدا دێت، لە ڕۆژێکدا ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە، تا دادگەری لە نێوان خەڵکی دەکرێ دەرەنجامی خۆی دەبینێ، وە هەر پیاوێک مەڕو ماڵاتی هەبێ زەکاتی دەرنەکات لە کاتی خۆشی و ناخۆشیدا ئەوە لە ڕۆژی دواییدا دێت لەوسا**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٦٦٠.




بەهێزترو چالاکترو هارترە، پاشان ئەو کەسە فڕێ دەدرێتە دەشتاییەکی فراوانی تەخت، پاشان هەموو خاوەن سمێک بە سمەکانی دەیشێلێت، وە هەموو خاوەن شاخێک بە شاخەکەی قۆچی لێدەدا، نە بێ شاخن، نە شاخیان شکاوە، کاتێ کۆتاییەکەی تێدەپەڕێ یەکەمینیان بە دوایدا دێتەوە، لە ڕۆژێکدا ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە، تا دادگەری لە نێوان خەڵکی دەکرێ دەرەنجامی خۆی دەبینێ.

## بابەت: ئەوانەی زەکات نادەن

**٢٤٤٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَاسْتُخْلِفَ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَهُ وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنَ الْعَرَبِ، قَالَ عُمَرُ، لِأَبِي بَكْرٍ: كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ، وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَمَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ، إِلَّا بِحَقِّهِ وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: لَأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ، فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ الْمَالِ، وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عِقَالاً كَانُوا يُؤَدُّونَهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهِ قَالَ عُمَرُ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلَّا أَنْ رَأَيْتُ اللَّهَ شَرَحَ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ لِلْقِتَالِ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد، پاشان لە دوای ئەو ئەبو بەکر کرا بە جێنشینی، ئەوەی بێبڕوا بوویەوە لە عەرەبەکان بێڕوا بوویەوە، (ئەبو بەکر وتی: یان زەکات دەدەن و یان دەجەنگم لەگەڵتان) عومەر بە ئەبو بەکری وت: چۆن لەگەڵ ئەو خەڵکە دەجەنگیت، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵک بجەنگم تا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) جا هەرکەس وتی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) ماڵ و نەفسی پارێزراوە، مەگەر بە حەقی ئیسلام نەبێ، لێپرسینەوەشی لای خوایە، ئەبو بەکر وتی: سوێند بە خوا دەجەنگم لەگەڵ ئەوەی جیاوازی بخاتە نێوان نوێژو زەکات، چونکە زەکات مافی ماڵ و سامانە، سوێند بە خوا ئەگەر ڕێگری بکەن گورێسێکم نەدەنێ (لە ماڵی زەکات) کە پێشتر دابێتیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگیان لەگەڵ دەکەم لەسەر نەدانی، عومەر وتی: سوێند بە خوا تەنها خوا دڵی ئەبو بەکری خستە سەر بڕیاردانی جەنگ، منیش بۆم دەرکەوت ئەو لەسەر حەقە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٩٩ و ١٤٥٦ و ٦٩٢٤ و ٧٢٨٤ و ٧٢٨٥، ومسلم: ٢٠، وأبو داود: ١٥٥٦، والترمذي: ٢٦٠٧.




## بابەت: سزای ئەوانەی زەکات نادەن

**٢٤٤٤-** «عَن بَهْزِ بْن حَكِيمٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ جَدِّي ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: فِي كُلِّ إِبِلٍ سَائِمَةٍ فِي كُلِّ أَرْبَعِينَ ابْنَةُ لَبُونٍ، لَا يُفَرَّقُ إِبِلٌ عَنْ حِسَابِهَا، مَنْ أَعْطَاهَا مُؤْتَجِراً فَلَهُ أَجْرُهَا، وَمَنْ أَبَى فَإِنَّا آخِذُوهَا، وَشَطْرَ إِبِلِهِ عَزْمَةٌ مِنْ عَزَمَاتِ رَبِّنَا، لَا يَحِلُّ لِآلِ مُحَمَّدٍ ﷺ مِنْهَا شَيْءٌ»[1].

**واتە: بەهزی کوڕی حەکیم دەڵێ: باوکم بۆی باس کردم، لە باپیرەمەوە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: لە هەر چل سەر وشترێکدا وشترێکی مێی دوو ساڵە دەدرێ، هیچ جیا ناکرێتەوە هەمووی دەژمێردرێ، هەر کەس بیدات بە نیازی پاداشت ئەوە پاداشتی بۆ هەیە، هەرکەسیش یاخی بێت و زەکات نەدات ئەوە ئێمە لێی وەردەگرین، بەشێک لە ماڵەکەی مافێکە لە مافەکانی پەروەردگارمان، هیچ لەوانە حەڵاڵ نیە بۆ خانەوادەی موحەممەد ﷺ.**

## بابەت: زەکاتی وشتر

**٢٤٤٥-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ، وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ»[2].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە دەغڵ و دان و خورمادا لە پێنج ویسق کەمتر زەکاتی ناکەوێ (ئەویش بەرانبەرە ٦٥٢ کغم)، وە لە پێنج سەر وشتر کەمتر بێت زەکاتی تێدانیە، لە زیویشدا لە پێنج ئوقیە کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ) (هەر ئوقیەیەکیش چل درهەمە، کەواتە: پێنج ئوقیە دەکاتە دوو سەد درهەم زیو).**

**٢٤٤٦-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ»[3].

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ١٥٧٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٠٥ و ١٤٤٧ و ١٤٥٩ و ١٤٨٤، ومسلم: ١ و ٩٧٩/٥، وأبو داود: ١٥٥٨ و ١٥٥٩، والترمذي: ٦٢٦ و ٦٢٧، وإبن ماجه: ١٧٩٣ و ١٨٣٢.

(٣) صحيح.




**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە پێنج سەر وشتر کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ، لە زیویشدا پێنج ئوقیە کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ، لە دەغڵ و دان و خورماشدا پێنج ویسق کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ.**

**٢٤٤٧-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّ أَبَا بَكْرٍ، كَتَبَ لَهُمْ إِنَّ هَذِهِ فَرَائِضُ الصَّدَقَةِ الَّتِي فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمُسْلِمِينَ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ ﷻ بِهَا رَسُولَهُ ﷺ، فَمَنْ سُئِلَهَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ عَلَى وَجْهِهَا فَلْيُعْطِ، وَمَنْ سُئِلَ فَوْقَ ذَلِكَ فَلَا يُعْطِ «فِيمَا دُونَ خَمْسٍ وَعِشْرِينَ مِنَ الْإِبِلِ فِي كُلِّ خَمْسِ ذَوْدٍ شَاةٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ خَمْساً وَعِشْرِينَ فَفِيهَا بِنْتُ مَخَاضٍ إِلَى خَمْسٍ وَثَلَاثِينَ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ بِنْتُ مَخَاضٍ فَابْنُ لَبُونٍ ذَكَرٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتّاً وَثَلَاثِينَ فَفِيهَا بِنْتُ لَبُونٍ إِلَى خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتَّةً وَأَرْبَعِينَ فَفِيهَا حِقَّةٌ طَرُوقَةُ الْفَحْلِ إِلَى سِتِّينَ، فَإِذَا بَلَغَتْ إِحْدَى وَسِتِّينَ فَفِيهَا جَذَعَةٌ إِلَى خَمْسٍ وَسَبْعِينَ، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتّاً وَسَبْعِينَ فَفِيهَا بِنْتَا لَبُونٍ إِلَى تِسْعِينَ، فَإِذَا بَلَغَتْ إِحْدَى وَتِسْعِينَ فَفِيهَا حِقَّتَانِ طَرُوقَتَا الْفَحْلِ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ فَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ بِنْتُ لَبُونٍ وَفِي كُلِّ خَمْسِينَ حِقَّةٌ، فَإِذَا تَبَايَنَ أَسْنَانُ الْإِبِلِ فِي فَرَائِضِ الصَّدَقَاتِ، فَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ الْجَذَعَةِ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ جَذَعَةٌ وَعِنْدَهُ حِقَّةٌ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ الْحِقَّةُ وَيَجْعَلُ مَعَهَا شَاتَيْنِ إِنْ اسْتَيْسَرَتَا لَهُ أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَماً، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ الْحِقَّةِ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ حِقَّةٌ وَعِنْدَهُ جَذَعَةٌ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ وَيُعْطِيهِ الْمُصَّدِّقُ عِشْرِينَ دِرْهَماً أَوْ شَاتَيْنِ إِنْ اسْتَيْسَرَتَا لَهُ، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ الْحِقَّةِ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ وَعِنْدَهُ بِنْتُ لَبُونٍ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ وَيَجْعَلُ مَعَهَا شَاتَيْنِ إِنْ اسْتَيْسَرَتَا لَهُ أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَماً، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ ابْنَةِ لَبُونٍ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ إِلَّا حِقَّةٌ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ وَيُعْطِيهِ الْمُصَّدِّقُ عِشْرِينَ دِرْهَماً أَوْ شَاتَيْنِ، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ ابْنَةِ لَبُونٍ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ بِنْتُ لَبُونٍ وَعِنْدَهُ بِنْتُ مَخَاضٍ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ وَيَجْعَلُ مَعَهَا شَاتَيْنِ إِنْ اسْتَيْسَرَتَا لَهُ أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَمَا، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ ابْنَةِ مَخَاضٍ وَلَيْسَ عِنْدَهُ إِلَّا ابْنُ لَبُونٍ ذَكَرٌ، فَإِنَّهُ يُقْبَلُ مِنْهُ وَلَيْسَ مَعَهُ شَيْءٌ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ إِلَّا أَرْبَعٌ مِنَ الْإِبِلِ فَلَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا، وَفِي صَدَقَةِ الْغَنَمِ فِي سَائِمَتِهَا إِذَا كَانَتْ أَرْبَعِينَ فَفِيهَا شَاةٌ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، فَإِذَا زَادَتْ وَاحِدَةً فَفِيهَا شَاتَانِ إِلَى مِائَتَيْنِ، فَإِذَا زَادَتْ وَاحِدَةً فَفِيهَا ثَلَاثُ شِيَاهٍ إِلَى ثَلَاثِ مِائَةٍ، فَإِذَا زَادَتْ فَفِي كُلِّ مِائَةٍ شَاةٌ، وَلَا يُؤْخَذُ فِي الصَّدَقَةِ هَرِمَةٌ وَلَا ذَاتُ عَوَارٍ وَلَا تَيْسُ الْغَنَمِ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ الْمُصَّدِّقُ، وَلَا يُجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ، وَلَا يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ، وَمَا كَانَ مِنْ خَلِيطَيْنِ فَإِنَّهُمَا يَتَرَاجَعَانِ بَيْنَهُمَا بِالسَّوِيَّةِ، فَإِذَا كَانَتْ سَائِمَةُ الرَّجُلِ نَاقِصَةً





مِنْ أَرْبَعِينَ شَاةً وَاحِدَةً فَلَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا، وَفِي الرِّقَةِ رُبْعُ الْعُشْرِ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ إِلَّا تِسْعِينَ وَمِائَةَ دِرْهَمٍ فَلَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: کە ئەبو بەکر نووسراوی بۆ کردن دەربارەی ئەمانە فەڕزی زەکاتن پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مسوڵمانان فەرزی کردوە، وە خوا ﷻ فەرمانی پێکردوە بە پێغەمبەرەکەی، هەر مسوڵمانێک داوای لێ بکرێت بە شێوەیەکی تەواو پێویستە زەکاتەکەی دەربکات، هەر کەس زیاد لەوە داوای لێ بکرێ ئەوە دەتوانێ نەیدات، لە خوار بیست و پێنج وشترەوە لە هەر پێنج دانەیەک بەرخێکی مێی یەک ساڵ دەکرێت بە زەکات، ئەگەر گەیشت بە بیست و پێنج وشتر فەرخە وشترێکی مێی یەک ساڵە ئەدرێ، تا سی و پێنج، ئەگەر گەیشت بە سی و شەش ئەوە وشترێکی مێی دوو ساڵە دەدرێ، هەتا دەگاتە چل و پێنج، ئەگەر گەیشتە چل و شەش، ئەوە وشترێکی مێی سێ ساڵە دەدەرێ، هەتا دەگاتە شەست، ئەگەر گەیشت بە شەست و یەک، ئەوە وشترێکی مێی چوار ساڵە دەدرێ، هەتا دەگاتە حەفتاو پێنج، ئەگەر گەیشتە حەفتاو شەش ئەوە دوو وشتری مێی دوو ساڵ دەدرێن، هەتا دەگاتە نەوەد، جا ئەگەر گەیشتە نەوەدو یەک، ئەوە دوو وشتری مێی سێ ساڵ دەدرێن، هەتا دەگاتە سەدو بیست، جا ئەگەر زیادی کرد لەسەر سەدو بیست لە هەموو چل دانەدا وشترێکی مێی دوو ساڵە دەدرێ، وە لە هەموو پەنجا دانەیەک وشترێکی مێی سێ ساڵە دەدرێ، جا ئەگەر ددانی وشترەکە دەرکەوت لە زەکاتەکان، هەر کەس زەکاتی وشترێکی مێی چوار ساڵەی لەسەر بوو، بەڵام ئەو وشترەی لەلا دەست نەدەکەوت، وشترێکی مێی سێ ساڵەی لەلا هەبوو، ئەوە دروستە وشترە سێ ساڵەکە بە زەکات بدات، لەگەڵ ئەو وشترەدا دوو بەرخی یەک ساڵەش بە زەکات دەدات، ئەگەر بۆی ئاسان بوو، یان بیست درهەم، وە هەر کەس زەکاتی وشترێکی مێی سێ ساڵەی لەسەر پێویست بوو، بەڵام ئەو وشترەی لەلا نەبوو، لە بەرانبەردا وشترێکی مێی چوار ساڵەی لەلا بوو، ئەوە لێی وەردەگیرێ و ئەو کەسەی کە وەری گرتووە بیست درهەم یان دوو بەرخی یەک ساڵی پێ دەدات، ئەگەر بۆی ئاسان بوو، وە هەر کەسێک زەکاتی وشترێکی مێی سێ ساڵەی

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٤٨ و ١٤٥٠ و ١٤٥١ و ١٤٥٣ و ١٤٥٤ و ١٤٥٥ و ٢٤٨٧ و ٦٩٥٥، وأبو داود: ١٥٦٧، وإبن ماجه: ١٨٠٠.




لەسەر پێویست بوو، هیچی لەلا نەبوو جگە لە وشترێکی مێی دوو ساڵە نەبێت ئەوە لێی وەردەگیرێ، لەگەڵ ئەوەدا دوو بەرخی مێی یەک ساڵە دەدات ئەگەر بۆی ئاسان بوو، یان بیست درهەم، وە هەر کەس زەکاتی وشترێکی مێی دوو ساڵەی لەسەر پێویست بوو، ئەو وشترەی لەلا نەبوو، بەڵام وشترێکی مێی سێ ساڵەی لەلا بوو، ئەوە لێی وەردەگیرێ، کۆکەرەوەی زەکات بیست درهەم یان دوو بەرخی مێی یەک ساڵەی پێ دەدات، وە هەر کەس زەکاتی وشترێکی مێی دوو ساڵەی لەسەر پێویست بوو، بەڵام هیچی لەلا نەبوو جگە لە وشترێکی مێی یەک ساڵە، ئەوە لێی وەردەگیرێ و لەگەڵ ئەوەشدا دوو بەرخی مێی یەک ساڵەی پێ دەدات ئەگەر بۆی ئاسان بوو، یان بیست درهەم، وە هەر کەس زەکاتی فەرخە وشترێکی مێی یەک ساڵەی لەسەر پێویست بوو، بەڵام هیچی لەلا نەبوو جگە لە وشترێکی نێری یەک ساڵە، ئەوە لێی وەردەگیرێ و هیچیشی لەگەڵدا نیە، هەرکەسیش چوار سەر وشتری هەبێ ئەوە زەکاتی لەسەر پێویست نابێ، مەگەر خاوەنەکەی بیەوێ، وە لە زەکاتی مەڕو بزندا ئەگەر گەیشت بە چل دانە ئەوە کاوڕێکی مێی یەک ساڵە دەدرێ هەتا دەگاتە سەدو بیست، ئەگەر لەوە زیاتر بوو گەیشتە سەدو بیست و یەک، ئەوە ئەوە دوو کاوڕی مێی یەک ساڵە دەدرێ، هەتا دەگاتە دوو سەد، ئەگەر گەیشتە دوو سەدو یەک سێ سەر دەدات، هەتا دەگاتە سێ سەد، ئەگەر لەوە زیاتر بوو لە هەموو سەد دانەیەک یەک سەر دەکاتە زەکات، وە ئاژەڵی پیرو پەککەوتەو کوێر عەیبدارو بەران و سابرێن وەرناگیرێ، مەگەر کۆکەرەوەی زەکات خۆی مەیلی لێی بێت، هەروەها ئاژەڵی تێکەڵ جیاناکرێتەوە، ئاژەڵی جیاش تێکەڵ ناکرێت لە ترسی زەکات، هەر زەکاتێ وەرگیرا لە دوو کەسی ئاژەڵ تێکەڵ، ئەوە دابەشی دەکەن لە نێوان خۆیاندا بە یەکسانی (واتە: بە گوێرەی ژمارەی ئاژەڵەکان)، ئەگەر مەڕوماڵاتی کەسێک کەمتر بوو لە چل سەر ئەوە زەکاتی ناکەوێ مەگەر خاوەنەکەی حەز بکات، وە لە زیودا چواریەکی دەیەک زەکات دەدات، (کە نیو مسقاڵ دەکات) ئەگەر تەنها سەدو نەوەد درهەمی هەبوو ئەوە زکاتی لەسەر نیە مەگەر خاوەنەکەی حەز بکات.




## بابەت: ڕێگرکردن و نەدانی زەکاتی وشتر

**٢٤٤٨-** «عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَأْتِي الْإِبِلُ عَلَى رَبِّهَا عَلَى خَيْرِ مَا كَانَتْ إِذَا هِيَ لَمْ يُعْطِ فِيهَا حَقَّهَا تَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا، وَتَأْتِي الْغَنَمُ عَلَى رَبِّهَا عَلَى خَيْرِ مَا كَانَتْ إِذَا لَمْ يُعْطِ فِيهَا حَقَّهَا تَطَؤُهُ بِأَظْلَافِهَا وَتَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا، قَالَ: وَمِنْ حَقِّهَا أَنْ تُحْلَبَ عَلَى الْمَاءِ، أَلَا لَا يَأْتِيَنَّ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِبَعِيرٍ يَحْمِلُهُ عَلَى رَقَبَتِهِ لَهُ رُغَاءٌ، فَيَقُولُ: يَا مُحَمَّدُ، فَأَقُولُ: لَا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئاً قَدْ بَلَّغْتُ، أَلَا لَا يَأْتِيَنَّ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِشَاةٍ يَحْمِلُهَا عَلَى رَقَبَتِهِ لَهَا يُعَارٌ، فَيَقُولُ: يَا مُحَمَّدُ، فَأَقُولُ لَا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئاً قَدْ بَلَّغْتُ، قَالَ: وَيَكُونُ كَنْزُ أَحَدِهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعاً أَقْرَعَ يَفِرُّ مِنْهُ صَاحِبُهُ وَيَطْلُبُهُ أَنَا كَنْزُكَ، فَلَا يَزَالُ حَتَّى يُلْقِمَهُ أُصْبُعَهُ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی دواییدا وشتر لە ئەوپەڕی بەهێز بووندایە دێتە سەر خاوەنەکەی ئەگەر زەکاتی لێنەدابوو بە سمەکانی دەیشێلێت، هەروەها بزن و مەڕیش لە ئەوپەڕی بەهێز بووندان دێنە سەر خاوەنەکەیان ئەگەر زەکاتی لێنەدابوو بە سمەکانیان دەیشێلن و بە شاخەکانیان قۆچی لێ دەدەن، فەرمووی: جا یەکێک لە مافەکانی ئەو ئاژەڵانە ئەوەیە کە لەسەر ئاو بدۆشرێن، پاشان فەرمووی: لە ڕۆژی دواییدا یەکێک لە ئێوە دێت وشتریک بەسەر ملیەوەیە دەباڕێنێ، دەڵێ: ئەی موحەممەد؟ دەڵێم: هیچم پێناکرێ بۆت لای خوا، پێشتر ڕامگەیاند، هی واش هەیە دێت مەڕێک بەسەر ملیەوەیە دەنگ دەقاڕێنێ، دەڵێ: ئەی موحەممەد؟ دەڵێم: هیچم پێناکرێ بۆت لای خوا، پێشتر ڕامگەیاند، فەرمووی: گەنجینەی یەکێکیان دەبێتە پیرەمارێکی کەچەڵ خاوەنەکەی لێی ڕادەکات، ئەویش شوێنی دەکەوێ دەڵێ: من گەنجینەکەتم، بەردەوام وا دەڵێ: تا سەرەتا پەنجەکانی قوت دەدات، پاشان هەموو جەستەی (دەخوات).**

## بابەت: لاچوونی زەکاتی وشتر ئەگەر خاوەنەکەی بۆ ناردن و سوار بوون بەکاری دەهێنا

**٢٤٤٩-** «عَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: فِي كُلِّ إِبِلٍ سَائِمَةٍ مِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ ابْنَةُ لَبُونٍ، لَا تُفَرَّقُ إِبِلٌ عَنْ حِسَابِهَا، مَنْ أَعْطَاهَا مُؤْتَجِراً

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٠٢، وإبن ماجه: ١٧٨٦.




لَهُ أَجْرُهَا، وَمَنْ مَنَعَهَا فَإِنَّا آخِذُوهَا، وَشَطْرَ إِبِلِهِ عَزْمَةً مِنْ عَزَمَاتِ رَبِّنَا، لَا يَحِلُّ لِآلِ مُحَمَّدٍ ﷺ مِنْهَا شَيْءٌ»[١].

**واتە: بەهزی کوڕی حەکیم دەڵێ: باوکم بۆی باس کردم، لە باپیرەمەوە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: لە هەر چل سەر وشترێکدا وشترێکی مێی دوو ساڵە دەدرێ، هیچ جیا ناکرێتەوە هەمووی دەژمێردرێ، (هەر کەس بیدات بە نیازی پاداشت ئەوە پاداشتی بۆ هەیە)، هەر کەسیش نەیدا ئەوە ئێمە لێی وەریدەگرین، بەشێک لە ماڵەکەی مافێکە لە مافەکانی پەروەردگارمان، هیچ لەوانە حەڵاڵ نیە بۆ خانەوادەی موحەممەد ﷺ.**

## بابەت: زەکاتی مانگا

**٢٤٥٠-** «عَنْ مُعَاذٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَهُ إِلَى الْيَمَنِ وَأَمَرَهُ أَنْ يَأْخُذَ مِنْ كُلِّ حَالِمٍ دِينَاراً أَوْ عِدْلَهُ مَعَافِرَ، وَمِنَ الْبَقَرِ مِنْ ثَلَاثِينَ تَبِيعاً أَوْ تَبِيعَةً، وَمِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ مُسِنَّةً»[٢].

**واتە: موعاز ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ یەمەن، فەرمانی پێکرد دینارێک یان لە بری ئەوە گوێرەکەیەکی یەک ساڵە بە سەرانە لە هەموو کەسێکی باڵغ وەربگرێ، لە زەکاتی مانگاش لە سی دانە گوێرەکەیەکی یەک ساڵە نێر بێت، یان مێ، وە لە هەموو چل دانەیەک گوێرەکەیەکی دوو ساڵە وەر بگرێ.**

**٢٤٥١-** «عَنْ مُعَاذٍ ﷺ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْيَمَنِ فَأَمَرَنِي أَنْ آخُذَ مِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ بَقَرَةً ثَنِيَّةً، وَمِنْ كُلِّ ثَلَاثِينَ تَبِيعاً، وَمِنْ كُلِّ حَالِمٍ دِينَاراً أَوْ عِدْلَهُ مَعَافِرَ»[٣].

**واتە: موعاز ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ یەمەن فەرمانی پێکردم لە چل سەر مانگاو ڕەشە وڵاخ گوێرەکەیەکی دوو ساڵە وەربگرم، وە لە سی سەر گوێرەکەیەکی یەک ساڵە وەربگرم، وە لە هەموو کەسێکی باڵغ دینارێک یان لە بری ئەوە گوێرەکەیەکی یەک ساڵە بەسەرانە وەربگرم.**

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥٧٧ و ١٥٧٨ و ٣٠٣٩، والترمذي: ٦٢٣، وابن ماجه: ١٨٠٣.

(٣) صحيح لغيره.

**٢٤٥٢-** «عَنْ مُعَاذٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا بَعَثَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْيَمَنِ أَمَرَهُ أَنْ يَأْخُذَ مِنْ كُلِّ ثَلَاثِينَ مِنَ الْبَقَرِ تَبِيعاً أَوْ تَبِيعَةً، وَمِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ مُسِنَّةً، وَمِنْ كُلِّ حَالِمٍ دِينَاراً أَوْ عِدْلَهُ مَعَافِرَ»[١].

**واتە: موعاز ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ یەمەن فەرمانی پێکرد لە سی سەر مانگاو ڕەشە وڵاخ گوێرەکەیەکی یەک ساڵە وەربگرێ نێر بێ، یان مێ، وە لە چل سەر گوێرەکەیەکی دوو ساڵە وەربگرێ، وە لە هەموو کەسێکی باڵغ دینارێک یان لە بری ئەوە گوێرەکەیەکی یەک ساڵە بە سەرانە وەربگرێ.**

**٢٤٥٣-** «عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ بَعَثَنِي إِلَى الْيَمَنِ أَنْ لَا آخُذَ مِنَ الْبَقَرِ شَيْئاً حَتَّى تَبْلُغَ ثَلَاثِينَ، فَإِذَا بَلَغَتْ ثَلَاثِينَ فَفِيهَا عِجْلٌ تَابِعٌ جَذَعٌ أَوْ جَذَعَةٌ حَتَّى تَبْلُغَ أَرْبَعِينَ، فَإِذَا بَلَغَتْ أَرْبَعِينَ فَفِيهَا بَقَرَةٌ مُسِنَّةٌ»[٢].

**واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردم کاتێ ناردمی بۆ یەمەن زەکات لە مانگاو ڕەشە وڵاخدا وەرنەگرم تا ڕێژەی دەگاتە سی دانە، کاتێ کە گەیشت بە سی دانە ئەوە گوێرەکەیەکی یەک ساڵە وەربگرم نێر بێت، یان مێ، تا دەگاتە چل سەر، کاتێ گەیشتە چل سەر گوێرەکەیەکی دوو ساڵە وەربگرم.**

## بابەت: ئەو کەسانەی زەکاتی مانگاو ڕەشە وڵاخ نادەن

**٢٤٥٤-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا مِنْ صَاحِبِ إِبِلٍ وَلَا بَقَرٍ وَلَا غَنَمٍ لَا يُؤَدِّي حَقَّهَا، إِلَّا وُقِفَ لَهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِقَاعٍ قَرْقَرٍ تَطَؤُهُ ذَاتُ الْأَظْلَافِ بِأَظْلَافِهَا، وَتَنْطَحُهُ ذَاتُ الْقُرُونِ بِقُرُونِهَا، لَيْسَ فِيهَا يَوْمَئِذٍ جَمَّاءُ وَلَا مَكْسُورَةُ الْقَرْنِ. قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَاذَا حَقُّهَا؟ قَالَ: إِطْرَاقُ فَحْلِهَا، وَإِعَارَةُ دَلْوِهَا، وَحَمْلٌ عَلَيْهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَلَا صَاحِبِ مَالٍ لَا يُؤَدِّي حَقَّهُ، إِلَّا يُخَيَّلُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعٌ أَقْرَعُ يَفِرُّ مِنْهُ صَاحِبُهُ وَهُوَ يَتْبَعُهُ يَقُولُ لَهُ: هَذَا كَنْزُكَ الَّذِي كُنْتَ تَبْخَلُ بِهِ، فَإِذَا رَأَى أَنَّهُ لَا بُدَّ لَهُ مِنْهُ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي فِيهِ، فَجَعَلَ يَقْضَمُهَا كَمَا يَقْضَمُ الْفَحْلُ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) حسن صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧ و ٩٨٨/٢٨.



واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ خاوەن وشتر، یان مانگا، یان مەڕو بزنێک نیە مافی نەدابێت لە ئاژەڵەکان، ئیللا لە ڕۆژی دواییدا دەوەستێنرێ لە دەشتاییەکی تەختدا، ئەوانەی کە سمیان هەیە بە سمەکانیان دەیشێلن، ئەوانەیشی شاخیان هەیە بە شاخەکانیان بەر قۆچی دەدەن، لەو ڕۆژەدا ئاژەڵێکی بێ شاخ و شاخ شکاویان تێدا نیە، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ماف پێدانی ئەوانە چۆنە؟ فەرمووی: بە کەڵدانیان و، پێدانیان بە خەڵک بۆ ئاو دەرهێنان لە بیردا، وە باریان پێ هەڵبگیرێ لە پێناوی خوا، وە خاوەن هیچ ماڵ و سامانێک نیە کە مافی ماڵ و سەروەتەکەی دەرنەکات، حەتمەن لە ڕۆژی دواییدا بۆی دەبێتە پیرەمارێکی کەچەڵ شوێنی دەکەوێ خاوەنەکەی لێی ڕادەکات، ئەویش شوێنی دەکەوێ و پێی دەڵێ: ئەمە گەنجینەکەتە کە لە دنیادا ڕەزیلیت لێ دەکرد، کاتێ زانی لێی ڕزگاری نابێ دەستی دەخاتە ناو دەمیەوە ئەویش گازی لێ دەگرێ وەک چۆن ئاژەڵی نێرە گاز دەگرێ.

## بابەت: زەکاتی مەڕو و بزن

**٢٤٥٥-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ، كَتَبَ لَهُ أَنَّ هَذِهِ فَرَائِضُ الصَّدَقَةِ الَّتِي فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمُسْلِمِينَ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ بِهَا رَسُولَهُ ﷺ، فَمَنْ سُئِلَهَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ عَلَى وَجْهِهَا فَلْيُعْطِهَا، وَمَنْ سُئِلَ فَوْقَهَا فَلَا يُعْطِهِ «فِيمَا دُونَ خَمْسٍ وَعِشْرِينَ مِنَ الْإِبِلِ فِي خَمْسِ ذَوْدٍ شَاةٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ خَمْساً وَعِشْرِينَ فَفِيهَا بِنْتُ مَخَاضٍ إِلَى خَمْسٍ وَثَلَاثِينَ، فَإِنْ لَمْ تَكُنِ ابْنَةُ مَخَاضٍ فَابْنُ لَبُونٍ ذَكَرٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتَّةً وَثَلَاثِينَ فَفِيهَا بِنْتُ لَبُونٍ إِلَى خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتَّةً وَأَرْبَعِينَ فَفِيهَا حِقَّةٌ طَرُوقَةُ الْفَحْلِ إِلَى سِتِّينَ، فَإِذَا بَلَغَتْ إِحْدَى وَسِتِّينَ فَفِيهَا جَذَعَةٌ إِلَى خَمْسَةٍ وَسَبْعِينَ، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتَّةً وَسَبْعِينَ فَفِيهَا ابْنَتَا لَبُونٍ إِلَى تِسْعِينَ، فَإِذَا بَلَغَتْ إِحْدَى وَتِسْعِينَ فَفِيهَا حِقَّتَانِ طَرُوقَتَا الْفَحْلِ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ فَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ ابْنَةُ لَبُونٍ وَفِي كُلِّ خَمْسِينَ حِقَّةٌ، فَإِذَا تَبَايَنَ أَسْنَانُ الْإِبِلِ فِي فَرَائِضِ الصَّدَقَاتِ فَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ الْجَذَعَةِ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ جَذَعَةٌ وَعِنْدَهُ حِقَّةٌ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ الْحِقَّةُ وَيَجْعَلُ مَعَهَا شَاتَيْنِ إِنْ اسْتَيْسَرَتَا لَهُ أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَماً، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ الْحِقَّةِ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ إِلَّا جَذَعَةٌ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ وَيُعْطِيهِ الْمُصَّدِّقُ عِشْرِينَ دِرْهَماً أَوْ شَاتَيْنِ، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ الْحِقَّةِ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ وَعِنْدَهُ ابْنَةُ لَبُونٍ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ وَيَجْعَلُ مَعَهَا شَاتَيْنِ إِنْ اسْتَيْسَرَتَا

لَهُ أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَماً، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ بِنْتِ لَبُونٍ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ إِلَّا حِقَّةٌ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ وَيُعْطِيهِ الْمُصَّدِّقُ عِشْرِينَ دِرْهَماً أَوْ شَاتَيْنِ، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ بِنْتِ لَبُونٍ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ بِنْتُ لَبُونٍ وَعِنْدَهُ بِنْتُ مَخَاضٍ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ وَيَجْعَلُ مَعَهَا شَاتَيْنِ إِنْ اسْتَيْسَرَتَا لَهُ أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَماً، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ ابْنَةِ مَخَاضٍ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ إِلَّا ابْنُ لَبُونٍ ذَكَرٌ فَإِنَّهُ يُقْبَلُ مِنْهُ وَلَيْسَ مَعَهُ شَيْءٌ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ إِلَّا أَرْبَعَةٌ مِنَ الْإِبِلِ فَلَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا، وَفِي صَدَقَةِ الْغَنَمِ فِي سَائِمَتِهَا إِذَا كَانَتْ أَرْبَعِينَ فَفِيهَا شَاةٌ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، فَإِذَا زَادَتْ وَاحِدَةً فَفِيهَا شَاتَانِ إِلَى مِائَتَيْنِ، فَإِذَا زَادَتْ وَاحِدَةً فَفِيهَا ثَلَاثُ شِيَاهٍ إِلَى ثَلَاثِ مِائَةٍ، فَإِذَا زَادَتْ وَاحِدَةً فَفِي كُلِّ مِائَةٍ شَاةٌ، وَلَا تُؤْخَذُ فِي الصَّدَقَةِ هَرِمَةٌ وَلَا ذَاتُ عَوَارٍ وَلَا تَيْسُ الْغَنَمِ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ الْمُصَّدِّقُ، وَلَا يُجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ، وَلَا يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ، وَمَا كَانَ مِنْ خَلِيطَيْنِ فَإِنَّهُمَا يَتَرَاجَعَانِ بَيْنَهُمَا بِالسَّوِيَّةِ، وَإِذَا كَانَتْ سَائِمَةُ الرَّجُلِ نَاقِصَةً مِنْ أَرْبَعِينَ شَاةً وَاحِدَةً فَلَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا، وَفِي الرِّقَةِ رُبْعُ الْعُشْرِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنِ الْمَالُ إِلَّا تِسْعِينَ وَمِائَةً فَلَيْسَ فِيهِ شَيْءٌ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا»[1].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: بێگومان ئەبو بەکر ﷺ، نوسراوی بۆ کرد بەڕاستی ئەمانە فەرزی زەکاتن پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مسوڵمانان فەرزی کردوە، وە خوا ﷻ فەرمانی پێ کردوە بە پێغەمبەرەکەی، هەر مسوڵمانێک داوای لێ بکرێت بە شێوەیەکی تەواو پێویستە زەکاتەکەی دەربکات، هەرکەس زیاد لەوە داوای لێ بکرێ ئەوە دەتوانێ نەیدات، لە خوار بیست و پێنج وشترەوە لە هەر پێنج دانەیەک بەرخێکی مێی یەک ساڵ دەکرێت بە زەکات، ئەگەر گەیشت بە بیست و پێنج وشتر فەرخە وشترێکی مێی یەک ساڵە دەدرێ، هەتا سی و پێنج، ئەگەر وشترێکی مێی یەک ساڵە نەبوو، ئەوە وشترێکی مێی دوو ساڵەی نێر دەدات، ئەگەر گەیشت بە سی و شەش ئەوە وشترێکی مێ ی دوو ساڵە دەدرێ، تا دەگاتە چل و پێنج، ئەگەر گەیشتە چل و شەش، ئەوە وشترێکی مێی سێ ساڵە دەدرێ، تا دەگاتە شەست، ئەگەر گەیشت بە شەست و یەک، ئەوە وشترێکی مێی چوار ساڵە دەدرێ، تا دەگاتە حەفتاو پێنج، ئەگەر گەیشتە حەفتاو شەش ئەوە دوو وشتری مێی دوو ساڵ دەدرێن، تا دەگاتە نەوەد، جا ئەگەر گەیشتە نەوەدو یەک، ئەوە دوو وشتری مێی سێ ساڵ دەدرێن، تا دەگاتە سەدو بیست، جا ئەگەر زیادی کرد لەسەر سەدو**

---

(١) صحيح.




بیست لە هەموو چل دانەدا وشترێکی مێی دوو ساڵە دەدرێ، وە لە هەموو پەنجا دانەیەک وشترێکی مێی سێ ساڵە دەدرێ، جا ئەگەر ددانی وشترەکە دەرکەوت لە زەکاتەکان هەرکەس زەکاتی وشترێکی مێی چوار ساڵەی لە سەر بوو، بەڵام ئەو وشترەی لەلا دەست نەدەکەوت، وشترێکی مێی سێ ساڵەی لەلا هەبوو، ئەوە دروستە وشترە سێ ساڵەکە بە زەکات بدات، لەگەڵ ئەو وشترەدا دوو بەرخی یەک ساڵەش بە زەکات دەدات ئەگەر بۆی ئاسان بوو، یان بیست درهەم، وە هەر کەس زەکاتی وشترێکی مێی سێ ساڵەی لەسەر پێویست بوو، بەڵام ئەو وشترەی لەلا نەبوو، لە بەرانبەردا وشترێکی مێی چوار ساڵەی لەلا بوو، ئەوە لێی وەردەگیرێ و ئەو کەسەی کە وەری گرتووە بیست درهەم یان دوو بەرخی یەک ساڵی پێ دەدات، ئەگەر بۆی ئاسان بوو، وە هەر کەسێک زەکاتی وشترێکی مێی دوو ساڵەی لەسەر پێویست بوو، هیچی لە لا نەبوو جگە لە وشترێکی مێی سێ ساڵە ئەوە لێی وەردەگیرێ، ئەو کەسەی زەکاتەکەی پێدراوە بیست درهەم یان دوو بەرخی مێی یەک ساڵە دەدات، هەر کەس زەکاتی وشترێکی مێی دوو ساڵەی لەسەر پێویست بوو، ئەو وشترەی لە لا نەبوو، بەڵام فەرخە وشترێکی مێی یەک ساڵەی لەلا بوو، ئەوە لێی وەردەگیرێ، لەگەڵ ئەوەشدا دوو بەرخی مێی یەک ساڵە ئەگەر بۆی ئاسان بوو یان بیست درهەم دەدات، هەر کەس زەکاتی فەرخە وشترێکی مێی دوو ساڵەی لەسەر پێویست بوو، بەڵام هیچی لەلا نەبوو جگە لە فەرخە وشترێکی مێی یەک ساڵە، ئەوە لێی وەردەگیرێ لەگەڵ ئەوەشدا دوو بەرخی مێی یەک ساڵە ئەگەر بۆی ئاسان بوو یان بیست درهەم دەدات، وە هەر کەس زەکاتی وشترێکی مێی یەک ساڵەی لەسەر پێویست بوو، بەڵام هیچی لەلا نەبوو جگە لە وشترێکی مێی دوو ساڵە، ئەوە لێی وەردەگیرێ و هیچی لەگەڵدا نیە، هەر کەسیش چوار سەر وشتری هەبێ ئەوە زەکاتی لەسەر پێویست نابێ، مەگەر خاوەنەکەی بیەوێ، وە لە زەکاتی مەڕو بزندا ئەگەر گەیشت بە چل دانە ئەوە کاوڕێکی مێی یەک ساڵە دەدرێ هەتا دەگاتە سەدو بیست، ئەگەر لەوە زیاتر بوو گەیشتە سەدو بیست و یەک، ئەوە دوو کاوڕی مێی یەک ساڵە دەدرێ، هەتا دەگاتە دوو سەد، ئەگەر گەیشتە دوو سەدو یەک سێ سەر دەدات، هەتا دەگاتە سێ سەد، ئەگەر لەوە زیاتر بوو لە هەموو سەد دانەیەک یەک سەر دەکاتە زەکات، وە ئاژەڵی پیرو پەککەوتەو کوێر عەیبدارو بەران و سابرێن وەرناگیرێ، مەگەر کۆکەرەوەی زەکات خۆی مەیلی لێی بێت، هەروەها




ئاژەڵی تێکەڵ جیاناکرێتەوە، ئاژەڵی جیاش تێکەڵ ناکرێت لە ترسی زەکات، هەر زەکاتێ وەرگیرا لە دوو کەسی ئاژەڵ تێکەڵ، ئەوە دابەشی دەکەن لە نێوان خۆیاندا بە یەکسانی (واتە: بە گوێرەی ژمارەی ئاژەڵەکان)، وە هەروەها نابێ دوو کەس مەڕو ماڵاتیان، ئەگەر مەڕو ماڵاتی کەسێک کەمتر بوو لە چل سەر ئەوە زەکاتی ناکەوێ مەگەر خاوەنەکەی حەز بکات، وە لە زیودا چواریەکی دەیەک زەکات دەدات، (کە نیو مسقاڵ دەکات) ئەگەر تەنها سەدو نەوەد درهەمی هەبوو ئەوە زکاتی لەسەر نیە مەگەر خاوەنەکەی حەز بکات.

## بابەت: ئەو کەسانەی زەکاتی مەڕو بزن نادەن

**٢٤٥٦-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا مِنْ صَاحِبِ إِبِلٍ وَلَا بَقَرٍ وَلَا غَنَمٍ لَا يُؤَدِّي زَكَاتَهَا، إِلَّا جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْظَمَ مَا كَانَتْ وَأَسْمَنَهُ، تَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا، وَتَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا، كُلَّمَا نَفِدَتْ أُخْرَاهَا أَعَادَتْ عَلَيْهِ أُولَاهَا، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ»[١].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر خاوەن وشترێک یان مانگایەک یان مەڕێک بمرێ و زەکاتی ماڵەکەی دەرنەکردبێت لە ڕۆژی قیامەتدا زۆر گەورەترو قەڵەو وتر لەو کە هەبووە دێت، بە سمەکانی دەیشێلێت و بە شاخەکانی قۆچی لێ دەدا، کاتێ کۆتایەکەیان تەواو دەبێ یەکەمینیان دەست پێ دەکاتەوە تا بڕیارو دادگەری لە نێوان خەڵکیدا دەدرێت.

## بابەت: تێکەڵ کردنی لە نێوان ئاژەڵی جیاکراوەو، جیاکردنەوە لە نێوان ئاژەڵی تێکەڵ کراو

**٢٤٥٧-** «عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ ﷺ قَالَ: أَتَانَا مُصَدِّقُ النَّبِيِّ ﷺ فَأَتَيْتُهُ فَجَلَسْتُ إِلَيْهِ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: إِنَّ فِي عَهْدِي أَنْ لَا نَأْخُذَ رَاضِعَ لَبَنٍ، وَلَا نَجْمَعَ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ، وَلَا نُفَرِّقَ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ بِنَاقَةٍ كَوْمَاءَ فَقَالَ: خُذْهَا، فَأَبَى»[٢].

واتە: سوەیدی کوڕی غەفلە ﷺ دەڵێ: فەرمانبەرو کۆکەرەوەی زەکات لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ هات بۆ لامان، منیش چووم بۆ لای گوێم لێ بوو دەیوت: لە

---

(١) صحيح.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ١٥٧٩ و ١٥٨٠، وإبن ماجه: ١٨٠١.




سەردەمی مندا ئاژەڵی شیردەرمان وەرنەدەگرت، وە ئاژەڵی جیامان تێکەڵ نەدەکرد، ئاژەڵی تێکەڵیشمان جیا نەدەکردەوە لە ترسی زەکات پیاوێک دەهات بۆ لای بە وشترێکی زۆر چاک دەیوت: وەریبگرە، ئەویش وەرینەدەگرت.

تێبینی: دروست نیە دوو خاوەن مەڕو ماڵات مەڕەکانیان لە یەکتر جیا بێت یەک زەکات بدەن، بۆ نموونە: ئەگەر هەریەکەو چل سەریان هەبوو لە کاتی دەرکردنی زەکات کۆیان بکەنەوە بۆ ئەوەی هەردووکیان یەک سەر زەکات دەربکەن، ئەوە دروست نیە، بەڵکو دەبێ لەم کاتەدا هەریەکەو زەکاتی خۆی بەجیا بدات، هەروەها نابێ دوو کەس مەڕو ماڵاتیان پێکەوە بێت لە یەکتر جیایان بکەنەوە لەبەر دەرکردنی زەکات، ئەگەر هەردووکیان تێکەڵ بوون ئەوە بە یەکسانی زەکات دەردەکەن.

**٢٤٥٨-** «عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ سَاعِياً فَأَتَى رَجُلاً فَآتَاهُ فَصِيلاً مَخْلُولاً، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: بَعَثْنَا مُصَدِّقَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَإِنَّ فُلَاناً أَعْطَاهُ فَصِيلاً مَخْلُولاً، اللَّهُمَّ لَا تُبَارِكْ فِيهِ وَلَا فِي إِبِلِهِ، فَبَلَغَ ذَلِكَ الرَّجُلَ فَجَاءَ بِنَاقَةٍ حَسْنَاءَ فَقَالَ: أَتُوبُ إِلَى اللَّهِ ﷻ وَإِلَى نَبِيِّهِ ﷺ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: اللَّهُمَّ بَارِكْ فِيهِ وَفِي إِبِلِهِ»[١].

واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ نێرداوی خۆی نارد هات بۆ لای پیاوێک ئەویش ئاژەڵێکی لەڕی بۆی هێنا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کۆکەرەوەی زەکاتمان نارد، فلانەکەس وشترێکی لەڕی پێدا، خوایە بەرەکەت نەخەیتە خۆی و وشترەکەشی، هەواڵ گەیشت بەو پیاوە هات وشترێکی چاکی هێنا، وتی تەوبە دەکەم بۆ لای خوا ﷻو بۆ لای پێغەمبەرەکەی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوایە بەرەکەت بخەیتە خۆی وشترەکەی.

## بابەت: پاڕانەوەی ئیمام بەوەی خوا فەڕو بەرەکەت بخاتە سامانی ئەو کەسەی زەکاتی ماڵەکەی دەردەکات

**٢٤٥٩-** «عَن عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَتَاهُ قَوْمٌ بِصَدَقَتِهِمْ، قَالَ: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ فُلَانٍ، فَأَتَاهُ أَبِي بِصَدَقَتِهِ فَقَالَ: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِي أَوْفَى»[٢].

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٩٧ و ٤١٦٦ و ٦٣٣٢ و ٦٣٥٩، ومسلم: ١٠٧٨، وأبو داود: ١٥٩٠، وإبن ماجه: ١٧٩٦.




**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ دەڵێ: کاتێ خەڵکانێک زەکاتی خۆیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بهێنایە، دەیفەرموو: خوایە فەڕو بەرەکەت بخەرە ناو ماڵ و سامانی بنەماڵەی فلانەکەس، باوکم زەکاتی خۆی هێنا، فەرمووی: خوایە فەڕو بەرەکەت بخەرە ناو ماڵ و سامانی ئەبو ئەوفا.**

## بابەت: ئەگەر (زەکات وەرگر) سنووری تێپەڕاند لە زەکات

**٢٤٦٠-** «عَن جَرِيرٍ ﷺ قالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ نَاسٌ مِنَ الْأَعْرَابِ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، يَأْتِينَا نَاسٌ مِنْ مُصَدِّقِيكَ يَظْلِمُونَ، قَالَ: أَرْضُوا مُصَدِّقِيكُمْ، قَالُوا: وَإِنْ ظَلَمَ؟ قَالَ: أَرْضُوا مُصَدِّقِيكُمْ، ثُمَّ قَالُوا: وَإِنْ ظَلَمَ؟ قَالَ: أَرْضُوا مُصَدِّقِيكُمْ، قَالَ جَرِيرٌ: فَمَا صَدَرَ عَنِّي مُصَدِّقٌ مُنْذُ سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَّا وَهُوَ رَاضٍ»[١].

**واتە: جەریر ﷺ دەڵێ: خەڵکانێکی دەشت نشین هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، خەڵکانێک دێن لە لایەن تۆوە زەکات کۆدەکەنەوە ستەم دەکەن، فەرمووی: ڕازیان بکەن، وتیان: ئەگەر ستەمیشی کرد؟ فەرمووی: زەکات وەرگرەکان ڕازی بکەن، پاشان وتیان: ئەگەر ستەمیشی کرد؟ فەرمووی: ڕازیان بکە، جەریر دەڵێ: لەو کاتەی ئەمەم بیست لە پێغەمبەری خوا ﷺ هەر زەکات کۆکەرەوەیەک هاتبێ بۆ لام ئیللا ڕازیم کردوە.**

**٢٤٦١-** «عَنْ جَرِيرٌ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا أَتَاكُمُ الْمُصَدِّقُ فَلْيَصْدُرْ وَهُوَ عَنْكُمْ رَاضٍ»[٢].

**واتە: جەریر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئەو کەسەی زەکات کۆدەکاتەوە هات بۆ لاتان با کاتێ دەگەڕێتەوە لێتان ڕازی بێت.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٨٩، وأبو داود: ١٥٨٩.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٨٩/١٧٧، والترمذي: ٦٤٧ و ٦٤٨، وإبن ماجه: ١٨٠٢.

## بابەت: دەرکردنی زەکاتی ماڵ لە لایەن گەورەوە بەبێ ویستی ئەو کەسەی زەکاتەکە دەردەکات

**٢٤٦٢-** «عَنْ مُسْلِمِ بْنِ ثَفِنَةَ، قَالَ: اسْتَعْمَلَ ابْنُ عَلْقَمَةَ أَبِي عَلَى عِرَافَةِ قَوْمِهِ، وَأَمَرَهُ أَنْ يُصَدِّقَهُمْ، فَبَعَثَنِي أَبِي إِلَى طَائِفَةٍ مِنْهُمْ لِآتِيَهُ بِصَدَقَتِهِمْ، فَخَرَجْتُ حَتَّى أَتَيْتُ عَلَى شَيْخٍ كَبِيرٍ يُقَالُ لَهُ سَعْرٌ، فَقُلْتُ: إِنَّ أَبِي بَعَثَنِي إِلَيْكَ لِتُؤَدِّيَ صَدَقَةَ غَنَمِكَ، قَالَ: ابْنَ أَخِي وَأَيُّ نَحْوٍ تَأْخُذُونَ؟ قُلْتُ: نَخْتَارُ حَتَّى إِنَّا لَنَشْبُرُ ضُرُوعَ الْغَنَمِ، قَالَ: ابْنَ أَخِي فَإِنِّي أُحَدِّثُكَ أَنِّي كُنْتُ فِي شِعْبٍ مِنْ هَذِهِ الشِّعَابِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَنَمٍ لِي، فَجَاءَنِي رَجُلَانِ، عَلَى بَعِيرٍ، فَقَالَا: إِنَّا رَسُولَا رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَيْكَ لِتُؤَدِّيَ صَدَقَةَ غَنَمِكَ، قَالَ: قُلْتُ: وَمَا عَلَيَّ فِيهَا؟ قَالَا: شَاةٌ، فَأَعْمِدُ إِلَى شَاةٍ قَدْ عَرَفْتُ مَكَانَهَا مُمْتَلِئَةٍ مَحْضاً وَشَحْماً فَأَخْرَجْتُهَا إِلَيْهِمَا، فَقَالَ: هَذِهِ الشَّافِعُ، وَالشَّافِعُ الْحَائِلُ، وَقَدْ نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَأْخُذَ شَافِعاً، قَالَ: فَأَعْمِدُ إِلَى عَنَاقٍ مُعْتَاطٍ، وَالْمُعْتَاطُ الَّتِي لَمْ تَلِدْ وَلَداً وَقَدْ حَانَ وِلَادُهَا، فَأَخْرَجْتُهَا إِلَيْهِمَا فَقَالَا: نَاوِلْنَاهَا، فَرَفَعْتُهَا إِلَيْهِمَا فَجَعَلَاهَا مَعَهُمَا عَلَى بَعِيرِهِمَا ثُمَّ انْطَلَقَا»[1].

واتە: موسلیمی کوڕی سەفینە دەڵێ: ئیبنو عەلقەمە باوکمی کرد بە گەورەو چاوساغی هۆزەکەی، فەرمانی پێکرد زەکاتیان لێ وەربگرێ، باوکم منی نارد بۆ لای کۆمەڵێکیان بە مەبەستی وەرگرتنی زەکاتەکانیان، منیش دەرچووم تا گەیشتم بە پیاوکی بەساڵاچوو پێی دەوترا: سەعر، وتم: باوکم منی ناردووە بۆ ئەوەی زەکاتی مەڕەکانت بدەیت، وتی: ئەی برازام بۆ کامەیان دەبەن؟ وتم: هەڵدەبژێرین تا ئەو ئەندازەیەی گوانەکانیشیان بە دەست دەپێوین، وتی: ئەی برازام من بۆت باس دەکەم، من لە شیوێک لە شیوەکان بووم لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵە مەڕێکم هەبوو، دوو پیاو هاتن بۆ لام بەسەر وشترێکەوە بوون، وتیان: ئێمە نێردراوی پێغەمبەری خواین هاتوین بۆ لات، بۆ ئەوەی زەکاتی مەڕەکانت بدەیت، وتی: وتم: چی لەسەرمە تیایدا؟ وتیان: بەرخێک، منیش دەستم بۆ بەرخێکی پڕ بەزوو قەڵەو پڕ شیر برد بۆم دەرهێنان لە ناو مەڕەکاندا، وتیان: ئەمە ئاوسە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێکردووین مەڕی ئاوس وەربگرین بە زەکات، وتی: پاشان دەستم برد بۆ

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٥٨١ و ١٥٨٢.




**بەرخێکی قسر لە تەمەنی ئەو بەرخانەدا بوو کە ئاوس دەبن، بۆم دەرهێنان، وتیان: بمدەرێ منیش پێمدان و ئەوانیش خستیانە سەر وشترەکەیان پاشان ڕۆیشتن.**

**٢٤٦٣-** «عَن مُسْلِمُ بْنُ ثَفِنَةَ، أَنَّ ابْنَ عَلْقَمَةَ اسْتَعْمَلَ أَبَاهُ عَلَى صَدَقَةِ قَوْمِهِ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ»[1].

**واتە: موسلیمی کوڕی سەفینە دەگێڕێتەوە: کوڕەکەی عەلقەمە باوکی ئەرکی کۆکردنەوەی زەکاتی هۆزەکەی پێ سپارد، فەرموودەکەی هێنایەوە.**

**٢٤٦٤-** «عَن عُمَرَ ﷺ قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِصَدَقَةٍ فَقِيلَ: مَنَعَ ابْنُ جَمِيلٍ وَخَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ وَعَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا يَنْقِمُ ابْنُ جَمِيلٍ إِلَّا أَنَّهُ كَانَ فَقِيراً فَأَغْنَاهُ اللَّهُ، وَأَمَّا خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ فَإِنَّكُمْ تَظْلِمُونَ خَالِداً قَدْ احْتَبَسَ أَدْرَاعَهُ وَأَعْتُدَهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَأَمَّا الْعَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ عَمُّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَهِيَ عَلَيْهِ صَدَقَةٌ وَمِثْلُهَا مَعَهَا»[2].

**واتە: عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە زەکاتدان، وترا: ئیبنو جەمیل و خالدی کوڕی وەلیدو عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیب زەکاتیان نەداوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئیبنو جەمیل بیانووی نیە مەگەر ئەوە نەبێت کە هەژار بوو خواو پێغەمبەرەکەی دەوڵەمەندیان کرد، بەڵام ئێوە ستەم لە خالیدی کوڕی وەلید دەکەن، چونکە ئەو زرێ و کەل و پەلەکانی کردوەتە وەقف لە پێناوی خوادا، بەڵام عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیب مامی پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی لەسەرەو ئەوەندەی تریش زیاتر.**

**٢٤٦٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِصَدَقَةٍ، مِثْلَهُ سَوَاءً»[3].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە زەکات، هەروەکو ئەو فەرموودەی پێشوو.**

**٢٤٦٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ هِلَالٍ الثَّقَفِيِّ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: كِدْتُ أُقْتَلُ بَعْدَكَ فِي عَنَاقٍ أَوْ شَاةٍ مِنَ الصَّدَقَةِ، فَقَالَ: لَوْلَا أَنَّهَا تُعْطَى فُقَرَاءَ الْمُهَاجِرِينَ مَا أَخَذْتُهَا»[4].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٦٨، ومسلم: ٩٨٣، وأبو داود: ١٦٢٣.

(٤) ضعيف.

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی هیلالی ثەقەفی ﷺ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: خەریک بوو دوای تۆ بکوژرێم بە هۆی بەرخە مێیەک، یان کاوڕێکی زەکات، (چونکە زۆری کرد لە خاوەنماڵەکە) وتی: ئەگەر نەدرایە بە هەژارە کۆچکردووەکان ئەوە وەرم نەدەگرت.**

## بابەت: زەکاتی ئەسپ

**٢٤٦٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ فِي عَبْدِهِ وَلَا فَرَسِهِ صَدَقَةٌ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەکات لەسەر مسوڵمان نیە لە کۆیلەو ئەسپەکەیدا.**

**٢٤٦٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا زَكَاةَ عَلَى الرَّجُلِ الْمُسْلِمِ فِي عَبْدِهِ وَلَا فَرَسِهِ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەکات لەسەر مسوڵمان نیە لە کۆیلەو ئەسپەکەیدا.**

**٢٤٦٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، يَرْفَعُهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ فِي عَبْدِهِ وَلَا فِي فَرَسِهِ صَدَقَةٌ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ ڕەفعی کردوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: زەکات لەسەر مسوڵمان نیە لە کۆیلەکەی و لە ئەسپەکەیدا.**

**٢٤٧٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَيْسَ عَلَى الْمَرْءِ فِي فَرَسِهِ وَلَا فِي مَمْلُوكِهِ صَدَقَةٌ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٦٣ و ١٤٦٤، ومسلم: ٨ و ٩٨٢/١٠، وأبو داود: ١٥٩٤ و ١٥٩٥، والترمذي: ٦٢٨، وإبن ماجه: ١٤٦٣.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: زەكات لەسەر مسوڵمان نیە لە كۆیلەكەی و لە ئەسپەكەیدا.

## بابەت: زەكاتی كۆیلەكان

**٢٤٧١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ فِي عَبْدِهِ وَلَا فِي فَرَسِهِ صَدَقَةٌ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەكات لەسەر مسوڵمان نیە لە ئەسپەكەی و لە كۆیلەكەیدا.**

**٢٤٧٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ صَدَقَةٌ فِي غُلَامِهِ وَلَا فِي فَرَسِهِ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: زەكات لەسەر مسوڵمان نیە لە كۆیلەكەی و لە ئەسپەكەیدا.**

## بابەت: زەكاتی زیو

**٢٤٧٣-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ»[٣].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە زیودا پێنج ئوقیە كەمتر بێت زەكاتی ناكەوێ (هەر ئوقیەیەكیش چل درهەمە، (كەواتە: پێنج ئوقیە دەكاتە دوو سەد درهەم زیو)، وە لە پێنج سەر وشتر كەمتر بێت زەكاتی ناكەوێ، وە لە دەغڵ و دان و خورمادا لە پێنج ویسق كەمتر زەكاتی ناكەوێ (ئەویش بەرانبەرە ٦٥٢ كغم).**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**٢٤٧٤-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوْسُقٍ مِنَ التَّمْرِ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ مِنَ الْوَرِقِ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ مِنَ الْإِبِلِ صَدَقَةٌ»(١).

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە دەغڵ و دان و خورمادا لە پێنج ویسق کەمتر زەکاتی ناکەوێ، وە لە زیودا پێنج ئوقیە کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ، وە لە پێنج سەر وشتر کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ.**

**٢٤٧٥-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا صَدَقَةَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوْسَاقٍ مِنَ التَّمْرِ، وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ مِنَ الْوَرِقِ صَدَقَةٌ، وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ مِنَ الْإِبِلِ صَدَقَةٌ»(٢).

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: پێنج ویسق خورما کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ، وە لە پێنج ئوقیە زیو کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ، وە لە پێنج سەر وشتر کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ.**

**٢٤٧٦-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ مِنَ الْوَرِقِ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسٍ مِنَ الْإِبِلِ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ»(٣).

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: لە زیودا پێنج ئوقیە کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ، وە لە پێنج سەر وشتر کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ، وە لە دەغڵ و دان و خورمادا لە پێنج ویسق کەمتر زەکاتی ناکەوێ.**

**٢٤٧٧-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قَدْ عَفَوْتُ عَنِ الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ، فَأَدُّوا زَكَاةَ أَمْوَالِكُمْ مِنْ كُلِّ مِائَتَيْنِ خَمْسَةً»(٤).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥٧٤، والترمذي: ٦٢٠، وإبن ماجه: ١٧٩ و ١٨١٣.




**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خۆشبووم لە وەرگرتنی زەکات لە ئەسپ و بەندەکان، زەکاتی ماڵەکانتان بدەن لە هەموو دوو سەد (درهەمێک) پێنج درهەم.**

**٢٤٧٨-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قَدْ عَفَوْتُ عَنِ الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ مِائَتَيْنِ زَكَاةٌ»[1].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خۆش بووم لە وەرگرتنی زەکات لە ئەسپ و بەندەکان، لە دوو سەد (درهەم) بە خوارتر زەکاتی تێدانیە.**

## بابەت: زەکاتی خشڵ و زێڕو زیوی ئافرەت

**٢٤٧٩-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ امْرَأَةً مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَبِنْتٌ لَهَا، فِي يَدِ ابْنَتِهَا مَسَكَتَانِ غَلِيظَتَانِ مِنْ ذَهَبٍ، فَقَالَ: أَتُؤَدِّينَ زَكَاةَ هَذَا؟ قَالَتْ: لَا، قَالَ: أَيَسُرُّكِ أَنْ يُسَوِّرَكِ اللَّهُ ﷻ بِهِمَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ سِوَارَيْنِ مِنْ نَارٍ، قَالَ: فَخَلَعَتْهُمَا فَأَلْقَتْهُمَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: هُمَا لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ»[2].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە: لە باوکی، لە باپیرەی ﷺ، ئافرەتێک لە ئەهلی یەمەن هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ کچەکەی خۆی لەگەڵدا بوو، دوو بازنی گەورەی زێڕ لە دەستی کچەکەیدا بوو، فەرمووی: ئایا زەکاتی ئەمە دەدەی؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ئایا پێت خۆشە خوا بە هۆی ئەو بازنانەوە لە ڕۆژی قیامەتدا دوو بازنی ئاگر بخاتە دەستت، وتی: دایەکەند دای بە پێغەمبەری خوا ﷺ، (ئافرتەکە) وتی: ئەوە بۆ خواو پێغەمبەرەکەیەتی (واتە: بردێ بە بیت المال).**

**٢٤٨٠-** «عَن عَمْرُو بْنُ شُعَيْبٍ ﷺ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ وَمَعَهَا بِنْتٌ لَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَفِي يَدِ ابْنَتِهَا مَسَكَتَانِ، نَحْوَهُ مُرْسَلٌ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: خَالِدٌ أَثْبَتُ مِنَ الْمُعْتَمِرِ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ١٥٦٣، والترمذي: ٦٣٧.

(٣) حسن لغيره.




واتە: عەمری کوڕی شوعەیب ﷺ دەڵێ: ئافرەتێک لە ئەهلی یەمەن هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ کچەکەی خۆی لەگەڵدا بوو، دوو بازنی گەورەی زێڕ لە دەستی کچەکەیدا بوو، وەکو ئەو فەرموودەی پێشووەو (مُرْسَل)ـە.

## بابەت: ئەو کەسەی زەکاتی ماڵەکەی نادات

**٢٤٨١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ الَّذِي لَا يُؤَدِّي زَكَاةَ مَالِهِ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مَالُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعاً أَقْرَعَ لَهُ زَبِيبَتَانِ، قَالَ: فَيَلْتَزِمُهُ أَوْ يُطَوِّقُهُ، قَالَ: يَقُولُ: أَنَا كَنْزُكَ، أَنَا كَنْزُكَ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئەو کەسەی زەکاتی ماڵەکەی دەرناکات، ماڵ و سامانەکەی لە ڕۆژی دواییدا دەبێتە پیرەمارێکی کەچەڵ دوو خاڵی ڕەش لە سەرووی هەردوو چاویەتی، فەرمووی: لە خوێ دەگرێ، یان لە گەردنی دەئاڵێ، دەڵێ: من گەنجینەکەتم من گەنجینەکەتم.

**٢٤٨٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ آتَاهُ اللَّهُ ﷻ مَالاً فَلَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهُ مُثِّلَ لَهُ مَالُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعاً أَقْرَعَ لَهُ زَبِيبَتَانِ، يَأْخُذُ بِلِهْزِمَتَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيَقُولُ: أَنَا مَالُكَ، أَنَا كَنْزُكَ، ثُمَّ تَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ﴾آل عمران»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس خوا ماڵێکی پێبەخشی بێت و زەکاتی ماڵەکەی دەرنەکات، لە ڕۆژی دواییدا ئەو ماڵە دەبێتە پیرەمارێکی کەچەڵ دوو خاڵی ڕەش لەسەرووی هەردوو چاویەتی، بە هەردوو شەویلگەکانی دەیگرێ و دەڵێ: من ماڵەکەتم من گەنجینەکەتم، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ﴾آل عمران، واتە: هەرگیز واگومان نەبەن ئەو کەسانەی کە چروکی دەکەن بەوەی خوا پێی بەخشیون لە ڕێزو بەهرەی خۆی.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٠٣ و ٤٥٦٥.




## زەکاتی خورما

**٢٤٨٣-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسَاقٍ مِنْ حَبٍّ أَوْ تَمْرٍ صَدَقَةٌ»[١].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە دەغڵ و دان و خورماشدا پێنج ویسق کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ.**

## بابەت: زەکاتی گەنم

**٢٤٨٤-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَحِلُّ فِي الْبُرِّ وَالتَّمْرِ زَكَاةٌ حَتَّى تَبْلُغَ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ، وَلَا يَحِلُّ فِي الْوَرِقِ زَكَاةٌ حَتَّى تَبْلُغَ خَمْسَةَ أَوَاقٍ، وَلَا يَحِلُّ فِي إِبِلٍ زَكَاةٌ حَتَّى تَبْلُغَ خَمْسَ ذَوْدٍ»[٢].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەکات لە گەنم و خورمادا دروست نیە تا ڕێژەیان دەگاتە پێنج ویسق (ئەویش بەرانبەرە ٦٥٢ کغم) وە لە زیودا زەکات ناکەوێ تا ڕێژەی دەگاتە پێنج ئوقیە، وە لە وشتریشدا زەکات ناکەوێ هەتا دەگاتە پێنج سەر.**

## بابەت: زەکاتی دانەوێڵەکان

**٢٤٨٥-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَيْسَ فِي حَبٍّ وَلَا تَمْرٍ صَدَقَةٌ حَتَّى تَبْلُغَ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ، وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ، وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ»[٣].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: زەکات لە دانەوێڵەو خورمادا ناکەوێ تا ڕێژەیان دەگاتە پێنج ویسق (ئەویش بەرانبەرە ٦٥٢ کغم)، وە لە وشتریشدا زەکات ناکەوێ تا دەگاتە پێنج سەر، وە لە زیودا زەکات ناکەوێ هەتا ڕێژەی دەگاتە پێنج ئوقیە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح.

## ئەو ئەندازەی کە زەکاتی تێدا پێویست دەبێ

**٢٤٨٦-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ»(١).

**واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە زیودا زەکات ناکەوێ تا ڕێژەی دەگاتە پێنج ئوقیە.**

**٢٤٨٧-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ»(٢).

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە زیویدا پێنج ئوقیە کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ، وە لە پێنج سەر وشتر کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ، لە دەغڵ و دان و خورماشدا پێنج ویسق کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ.**

## بابەت: ئەوەی دە یەک واجب دەکات، ئەوەیشی نیوەی دە یەک واجب دەکات

**٢٤٨٨-** «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالْأَنْهَارُ وَالْعُيُونُ أَوْ كَانَ بَعْلاً الْعُشْرُ، وَمَا سُقِيَ بِالسَّوَانِي وَالنَّضْحِ نِصْفُ الْعُشْرِ»(٣).

**واتە: سالم دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو میوەو دانەوێڵەی بە باران و ڕووبارو کانیاو ئاو درابێ، یان ئاوی دار خورمای خواردبێ بە شێی زەوی بەبێ ئاوی ئاسمان ئەوە دەیەک زەکاتی دەکەوێ، وە ئەوەی بە هۆی ئاژەڵ یان لە ڕووبار بۆی هێنراوەو (مەسرەفی لێکراوە) ئاودراوە ئەوە نیوەی زەکاتی دەیەکی دەکەوێ.**

**٢٤٨٩-** «عَن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالْأَنْهَارُ وَالْعُيُونُ الْعُشْـرُ، وَفِيمَا سُقِيَ بِالسَّانِيَةِ نِصْفُ الْعُشْـرِ»(٤).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٨٣، وأبو داود: ١٥٩٦، والترمذي: ٦٤٠، وإبن ماجه: ١٨١٧.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٨١، وأبو داود: ١٥٩٧.




واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو میوەو دانەوێڵەی بە باران و ڕووبارو کانیاو ئاودراوە ئەوە دەیەک زەکاتی دەکەوێ، وە ئەوەی بە هۆی ئاژەڵەوە ئاودراوە (وە مەسرەف لە ئاودانەکەی کراوە)، ئەوە نیوەی زەکاتی دەیەکی دەکەوێ.

**٢٤٩٠-** «عَنْ مُعَاذٍ ﷺ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْيَمَنِ فَأَمَرَنِي أَنْ آخُذَ مِمَّا سَقَتِ السَّمَاءُ الْعُشْرَ، وَفِيمَا سُقِيَ بِالدَّوَالِي نِصْفَ الْعُشْرِ»[١].

واتە: موعاز ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ یەمەن فەرمانی پێکردم ئەوەی بە باران ئاودراوە دەیەک وەربگرم، ئەوەشی لە بیر دەهێنرێتە دەرەوە نیوەی دەیەک وەربگرم.

## خەمڵێنەر چی جێ دەهێڵێ بۆ خەمڵاندنەکەی و حیسابی ناکات

**٢٤٩١-** «عَنْ خبيب بن عَبْدِ الرَّحْمَنِ يُحدث عن عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مَسْعُودِ بْنِ نِيَارٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ قَالَ: أَتَانَا وَنَحْنُ فِي السُّوقِ، فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا خَرَصْتُمْ فَخُذُوا وَدَعُوا الثُّلُثَ، فَإِنْ لَمْ تَأْخُذُوا أَوْ تَدَعُوا الثُّلُثَ فَدَعُوا الرُّبُعَ»[٢].

واتە: خوبەیبی کوڕی عەبدوڕڕەحمان باسی دەکرد لە عەبدوڕڕەحمان کوڕی مەسعودی کوڕی دینار لە سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە ﷺ دەڵێ: هات بۆ لامان ئێمەش لە بازاردا بووین، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ خەمڵاندتان بۆ بەروبوومی زەکات کرد، خەمڵاندنەکە وەربگرن و سێیەکی بەجێبهێڵن، (حیسابی مەکەن) ئەگەر نەتانبرد یان وازتان لە سێیەک نەهێنا، واز لە چوار یەک بهێنن.

تێبینی: (لەم فەرموودەدا باسی ئەوەی کردووە لە کاتێ دەغل و دان و خەمڵاندنی میوە هەمووی حیساب نەکرێت، بەڵکو سێیەک، یان چواریەک حیساب نەکرێ، تاوەکو ئەوەندەی خەڵک دەیخۆن و خەسار دەبێت و باڵندە دەیخۆن و دەڕژێت، نەبێتە زەرەر بەسەر خاوەنەکەی).

---

(١) حسن صحيح.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٦٠٥، والترمذي: ٦٤٣.





## فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ ﴿٢٦٧﴾﴾[1].

**٢٤٩٢-** «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنُ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﷺ، فِي الْآيَةِ الَّتِي قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ ﴿٢٦٧﴾﴾البقرة، قَالَ: هُوَ الْجُعْرُورُ وَلَوْنُ حُبَيْقٍ، فَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ تُؤْخَذَ فِي الصَّدَقَةِ الرُّذَالَةُ»[2].

**واتە: ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیف ﷺ، دەربارەی فەرمایشتی خوا ﷻ ﴿وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ ﴿٢٦٧﴾﴾البقرة، دەڵێ: ئەوە خورمای جەعروورو (کە خورمایەکی بچووکەو سوودی لێ نابینرێ) خورمای حوبەیق، (کە جۆرە خورمایەکی خراپە دراوەتە پاڵ ناوی پیاوێک). بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە ئەو خورما خراپە بە زەکات وەربگیرێ.**

**٢٤٩٣-** «عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَبِيَدِهِ عَصاً وَقَدْ عَلَّقَ رَجُلٌ قِنْوَ حَشَفٍ، فَجَعَلَ يَطْعَنُ فِي ذَلِكَ الْقِنْوِ، فَقَالَ: لَوْ شَاءَ رَبُّ هَذِهِ الصَّدَقَةِ تَصَدَّقَ بِأَطْيَبَ مِنْ هَذَا، إِنَّ رَبَّ هَذِهِ الصَّدَقَةِ يَأْكُلُ حَشَفاً يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[3].

**واتە: عەوفی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە گۆچانێکی بەدەستەوە بوو، پیاوێک هێشووە خورمایەکی وشکی خراپی هەڵواسیبوو لە مزگەوتدا، جا بە گۆچانەکەی دەیدا لەو هێشوە خورمایە، فەرمووی: ئەگەر خاوەنی ئەم صەدەقەیە بیویستایە لەمە چاکتری دەبەخشی، بەڕاستی خاوەنی ئەم صەدەقەیە لە ڕۆژی دواییدا هەر ئەمە دەخوا.**

## بابەت: کانــزا

**٢٤٩٤-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ اللُّقَطَةِ؟ فَقَالَ: مَا كَانَ فِي طَرِيقٍ مَأْتِيٍّ أَوْ فِي قَرْيَةٍ عَامِرَةٍ فَعَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا وَإِلَّا فَلَكَ، وَمَا لَمْ يَكُنْ فِي طَرِيقٍ مَأْتِيٍّ وَلَا فِي قَرْيَةٍ عَامِرَةٍ فَفِيهِ وَفِي الرِّكَازِ الْخُمْسُ»[4].

---

(١) البقرة، واتە لەو ماڵە مەبەخشن کە خراپە.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٦٠٧ من حديث أبي أمامة عن أبيه سهل بن حنيف.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ١٦٠٨، وإبن ماجه: ٨١٢١.

(٤) حسن. أخرجه أبو داود: ١٧٠٨ و ١٧١٠ و ١٧١١ و ١٧١٢ و ١٧١٣ و ٤٣٩٠، والترمذي: ١٢٨٩، وإبن ماجه: ٢٥٩٦.




واتە: عەمری كوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە: لە باوكیەوە، لە باپیرەیەوە ﷺ دەڵێ: پرسیار كرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ماڵی دۆزراوە؟ فەرمووی: ئەوەی لە ڕێگاو بان دۆزیتەوە یان لە شارێكی ئاوەدان ئەوە ساڵێک بیناسێنە، ئەگەر خاوەنەكەی هاتەوە ئەوە چاكە ئەگەر نەهاتەوا ئەوە بۆ تۆیە، وە ئەگەر لە ڕێگاو بان، یان لە دێیەكی ئاوەدان نەدۆزرێتەوە، ئەوە لەوەدا، وە لە خەزێنە (واتە: لە دۆزینەوەی ئەو كەلوپەلە گرانبەهایانەی دەگەڕێتەوە بۆ پێشی ئیسلام) پێنج یەک زەكات هەیە.

**٢٤٩٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْعَجْمَاءُ جُرْحُهَا جُبَارٌ، وَالْبِئْرُ جُبَارٌ، وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئاژەڵ (هەر زیانێک بدات بەبێ كەمتەرخەمی لە لایەن خاوەنەكەیەوە) ئەوە بە فیڕۆ دەڕوات، وە بیر هیچی تێدانیە (واتە: ئەگەر كەسێک لە زەویەكی خۆیدا بیرێک هەڵبكەنێ دواتر كەسێک، یان شتێک بكەوێتە ناویەوە ئەوە خوێنبایی نیە، یان ئەگەر كەسێک پیاوێک بە كرێ بگرێ بیری بۆ هەڵبكەنێ شتێک كەوت بەسەریداو مرد بەبێ كەمتەرخەمی خاوەن ماڵ ئەوە خوێنبایی نیە) وە كانزاو مەعدەنیش هیچی تێدانیە (ئەگەر كەسێک لە زەویەكی خۆیدا، یان زەویەک هی كەس نەبێت چاڵ هەڵبكەنێ دواتر كەسێک بكەوێتە ناوی، بێ كەمتەرخەمی خاوەنەكەی ئەوە خوێنبایی بۆ نیە) وە لە خەزێنە (واتە: لە دۆزینەوەی ئەو كەلوپەلە گرانبەهایانەی دەگەڕێتەوە بۆ پێشی ئیسلام) پێنج یەک زەكات هەیە.

**٢٤٩٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، بِمِثْلِهِ»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: لە پێغەمبەری خوا ﷺ بە وێنەی ئەو فەرموودەی پێشوو.

**٢٤٩٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: جُرْحُ الْعَجْمَاءِ جُبَارٌ، وَالْبِئْرُ جُبَارٌ، وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ»(٣).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٩٩ و ٢٣٥٥ و ٦٩١٢ و ٦٩١٣، ومسلم: ٤٥ و ١٧١٠/٤٦، وأبو داود: ٣٠٨٥ و ٤٥٩٣، والترمذي: ٦٤٢ و ١٣٧٧، وإبن ماجه: ٢٥٠٩ و ٢٦٧٣.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاژەڵ (هەر زیانێک بدات بەبێ کەمتەرخەمی لە لایەن خاوەنەکەیەوە) ئەوە بە فیرۆ دەڕوات، وە بیر هیچی تێدانیە (واتە: ئەگەر کەسێک لە زەویەکی خۆیدا بیرێک هەڵبکەنێ دواتر کەسێک، یان شتێک بکەوێتە ناویەوە ئەوە خوێنبایی نیە، یان ئەگەر کەسێک پیاوێک بە کرێ بگرێ بیری بۆ هەڵبکەنێ شتێک کەوت بەسەریداو مرد بەبێ کەمتەرخەمی خاوەن ماڵ ئەوە خوێنبایی نیە) وە کانزاو مەعدەنیش هیچی تێدانیە (ئەگەر کەسێک لە زەویەکی خۆیدا، یان زەویەک هی کەس نەبێت چاڵ هەڵبکەنێ دواتر کەسێک بکەوێتە ناوی، بێ کەمتەرخەمی خاوەنەکەی ئەوە خوێنبایی بۆ نیە) وە لە خەزێنە (واتە: لە دۆزینەوەی ئەو کەلوپەلە گرانبەهایانەی دەگەڕێتەوە بۆ پێشی ئیسلام) پێنج یەک زەکات هەیە.

**٢٤٩٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْبِئْرُ جُبَارٌ، وَالْعَجْمَاءُ جُبَارٌ، وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَفِي الرِّكَازِ الْخُمْسُ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بیر هیچی تێدانیە (واتە: ئەگەر کەسێک لە زەویەکی خۆیدا بیرێک هەڵبکەنێ دواتر کەسێک یان شتێک بکەوێتە ناویەوە ئەوە خوێنبایی نیە، یان ئەگەر کەسێک پیاوێک بە کرێ بگرێ بیری بۆ هەڵبکەنێ شتێک کەوت بەسەریداو مرد بەبێ کەمتەرخەمی خاوەن ماڵ ئەوە خوێنبایی نیە) وە ئاژەڵ (هەر زیانێک بدات بەبێ کەمتەرخەمی لە لایەن خاوەنەکەیەوە) ئەوە بە فیرۆ دەڕوات، وە کانزاو مەعدەنیش هیچی تێدانیە (ئەگەر کەسێک لە زەویەکی خۆیدا یان زەویەک هی کەس نەبێت چاڵ هەڵبکەنێ دواتر کەسێک بکەوێتە ناوی، بێ کەمتەرخەمی خاوەنەکەی ئەوە خوێنبایی بۆ نیە) وە لە خەزێنە (واتە: لە دۆزینەوەی ئەو کەلوپەلە گرانبەهایانەی دەگەڕێتەوە بۆ پێشی ئیسلام) پێنج یەک زەکات هەیە.

## بابەت: زەكاتی هەنگ

**٢٤٩٩-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: جَاءَ هِلَالٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِعُشُورِ نَحْلٍ لَهُ، وَسَأَلَهُ أَنْ يَحْمِيَ لَهُ وَادِياً يُقَالُ لَهُ سَلَبَةُ، فَحَمَى لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَلِكَ الْوَادِيَ،

---

(١) صحيح.




فَلَمَّا وَلِيَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، كَتَبَ سُفْيَانُ بْنُ وَهْبٍ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ يَسْأَلُهُ، فَكَتَبَ عُمَرُ، إِنْ أَدَّى إِلَيَّ مَا كَانَ يُؤَدِّي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ عُشْرِ نَحْلِهِ فَاحْمِ لَهُ سَلَبَةَ ذَلِكَ، وَإِلَّا فَإِنَّمَا هُوَ ذُبَابُ غَيْثٍ يَأْكُلُهُ مَنْ شَاءَ»[١].

**واتە: عەمرِی کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە، لە باپیرەی ﷺ دەڵێ: هیلال هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ یەک لەسەر دەی هەنگوینی خۆی هێنا، داوای کرد پێغەمبەری خوا ﷺ پارێزگاری ئەو شیوەی بۆ بکات کە پێی دەوترا (سَلَبَة)، پێغەمبەر ﷺ پارێزگاری ئەو شیوەی گردە ئەستۆ، کاتێ عومەری کوڕی خەطاب کرا بە جێنشین، سوفیانی کوڕی وەهەب نامەیەکی نارد بۆ عومەر لەو بارەیەوە پرسیاری لێکرد، عومەر وتی: با ئەو یەک لەسەر دەی کە دەینارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەنگوێنەکانی بۆم بنێرێ، منیش شیوەکەی (سَلَبَة) بۆ دەپارێزم، ئەگەرنا ئەوە مێشولەیەکە بە هەموو لایەکدا دەڕوات هەر کێ بیەوێ دەیخوات.**

## بابەت: زەکاتی (سەرفترە) لە مانگی ڕەمەزان

**٢٥٠٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زَكَاةَ رَمَضَانَ عَلَى الْحُرِّ وَالْعَبْدِ، وَالذَّكَرِ وَالْأُنْثَى، صَاعاً مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ، فَعَدَلَ النَّاسُ بِهِ نِصْفَ صَاعٍ مِنْ بُرٍّ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفترەی فەرز کرد لەسەر ئازادو بەندەو نێرو مێ، صاعێک لە خورما، یان صاعێک لە جۆ، خەڵکی نیو صاع گەنمیان یەکسان کرد بەرانبەر بە صاعێک لە جۆ.**

**زانیاری: صاعێک چوار گوێلە، هەر گوێلێک (٥٤٤) گرامە، کەواتە چوار صاع دەکاتە دوو کیلۆو سەدو حەفتاو شەش گرام.**

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ١٦٠٠ و ١٦٠١ و ١٦٠٢، وإبن ماجه: ١٨٢٤.

(٢) صحيح.




## بابەت: فەرز بوونی زەکاتی (سەرفیترە) لەسەر کۆیلە

**٢٥٠١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَدَقَةَ الْفِطْرِ عَلَى الذَّكَرِ وَالْأُنْثَى، وَالْحُرِّ وَالْمَمْلُوكِ صَاعاً مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ، قَالَ: فَعَدَلَ النَّاسُ إِلَى نِصْفِ صَاعٍ مِنْ بُرٍّ»(١).

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفترەی فەرز کرد لەسەر نێرو مێ و ئازادو کۆیلە، صاعێک لە خورما، یان صاعێک لە جۆ، وتی: خەڵکی نیو صاع گەنمیان یەکسان کرد بەرانبەر بە صاعێک لە جۆ.

## زەکاتی (سەرفترەی) ڕەمەزان فەرزە لەسەر منداڵ

**٢٥٠٢-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زَكَاةَ رَمَضَانَ عَلَى كُلِّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ، حُرٍّ وَعَبْدٍ، ذَكَرٍ وَأُنْثَى صَاعَاً مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعَاً مِنْ شَعِيرٍ»(٢).

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفترەی ڕەمەزانی فەرز کرد لەسەر هەموو منداڵ و گەورەو ئازادو کۆیلەو نێرو مێ یەک، صاعێک لە خورما، یان صاعێک لە جۆ.

## زەکاتی (سەرفترەی) ڕەمەزان فەرزە لەسەر مسوڵمانان جگە لەو بێبڕوایانەی پەیمانیان بەستوە

**٢٥٠٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَرَضَ زَكَاةَ الْفِطْرِ مِنْ رَمَضَانَ عَلَى النَّاسِ صَاعَاً مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعَاً مِنْ شَعِيرٍ عَلَى كُلِّ حُرٍّ أَوْ عَبْدٍ، ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى مِنَ الْمُسْلِمِينَ»(٣).

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفترەی ڕەمەزانی فەرز کرد لەسەر خەڵکی صاعێک لە خورما، یان صاعێک لە جۆ، لەسەر هەموو ئازاد یان کۆیلە، یان نێر یان مێ ی، لە مسوڵمانان.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**٢٥٠٤-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زَكَاةَ الْفِطْرِ صَاعاً مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ عَلَى الْحُرِّ وَالْعَبْدِ، وَالذَّكَرِ وَالْأُنْثَى، وَالصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَأَمَرَ بِهَا أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلَاةِ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفترەی فەرز کرد صاعێک لە خورما، یان صاعێک لە جۆ، لەسەر هەموو ئازادو بەندەو نێرو مێ و گەورەو بچووک لە مسوڵمانان، وە فەرمانی کرد دەربکرێ پێش ئەوەی خەڵکی دەربچن بۆ نوێژ.**

## چەندە فەرزە (لە زەکاتی سەرفترە)

**٢٥٠٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَدَقَةَ الْفِطْرِ عَلَى الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ، وَالذَّكَرِ وَالْأُنْثَى، وَالْحُرِّ وَالْعَبْدِ صَاعاً مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفترەی فەرز کرد لەسەر بچوک و گەورەو نێرو مێ و ئازادو کۆیلە، صاعێک لە خورما، یان صاعێک لە جۆ.**

## بابەت: فەرز بوونی زەکاتی سەرفترە پێش واجب بوونی زەکات

**٢٥٠٦-** «عَنْ قَيْسِ بْنِ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا نَصُومُ عَاشُورَاءَ وَنُؤَدِّي زَكَاةَ الْفِطْرِ، فَلَمَّا نَزَلَ رَمَضَانُ وَنَزَلَتِ الزَّكَاةُ، لَمْ نُؤْمَرْ بِهِ وَلَمْ نُنْهَ عَنْهُ، وَكُنَّا نَفْعَلُهُ»[٣].

**واتە: قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ دەڵێ: ئێمە ڕۆژی عاشورا بەڕۆژوو دەبووین و زەکاتی سەرفترەمان دەدا، کاتێ ڕۆژووی ڕەمەزان و ئایەتی زەکات دابەزی، نە فەرمانمان پێکرا بە سەرفترە نە قەدەغەمان لێکرا، ئێمەش ئەنجامان دەدا.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٠٣ و ١٥٠٤ و ١٥٠٧ و ١٥٠٩ و ١٥١١ و ١٥١٢، ومسلم: ١٢ و ٩٨٤/١٦ و ٢٢ و ٩٨٦/٢٣، وأبو داود: ١٦١٠ و ١٦١١ و ١٦١٢ و ١٦١٣ و ١٦١٥، والترمذي: ٦٧٥ و ٦٧٦ و ٦٧٧، وإبن ماجه: ١٨٢٥ و ١٨٢٦.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**٢٥٠٧-** «عَنْ قَيْسِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِصَدَقَةِ الْفِطْرِ قَبْلَ أَنْ تَنْزِلَ الزَّكَاةُ، فَلَمَّا نَزَلَتِ الزَّكَاةُ لَمْ يَأْمُرْنَا وَلَمْ يَنْهَنَا وَنَحْنُ نَفْعَلُهُ»[١].

**واته: قەیسی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین بە سەرفترە دان پێش ئەوەی ئایەتی زەکات دابەزێ، کاتێ ئایەتی زەکات دابەزی، نە فەرمانی پێکردین و نە قەدەغەی لێکردین، ئێمەش ئەنجامان دەدا.**

## پێوانەی زەکاتی سەرفترە.

**٢٥٠٨-** «عَنْ الْحَسَنِ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا «وَهُوَ أَمِيرُ الْبَصْرَةِ» فِي آخِرِ الشَّهْرِ أَخْرِجُوا زَكَاةَ صَوْمِكُمْ، فَنَظَرَ النَّاسُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، فَقَالَ: مَنْ هَاهُنَا مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ قُومُوا فَعَلِّمُوا إِخْوَانَكُمْ فَإِنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ أَنَّ هَذِهِ الزَّكَاةَ فَرَضَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى كُلِّ ذَكَرٍ وَأُنْثَى، حُرٍّ وَمَمْلُوكٍ، صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ أَوْ تَمْرٍ أَوْ نِصْفَ صَاعٍ مِنْ قَمْحٍ، فَقَامُوا»[٢].

**واته: حەسەن دەڵێ: ئیبنو عباس (خوا لێیان ڕازی بێ) کاتێ کاربەدەستی بەصرە بوو وتی: لە کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا، زەکاتی ڕۆژوەکانتان دەربکەن، خەڵکی هەندێکیان تەماشای هەندێکی دیکەیان کرد، وتی: کێ لە خەڵکی مەدینە لێرەیە هەستن براکانتان فێر بکەن، چونکە بەڕاستی ئەوان نازانن کە ئەم زەکاتە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرزی کردوە لەسەر هەموو نێرو مێ و ئازادو بەندەیک، صاعێک لە جۆ یان خورما یان نیو صاع لە گەنم ئەوانیش پێی هەستان.**

**(ڕونکردنەوە صاعێک بۆ ئێستا دەکاتە: (٢٤٢٠)گرام، واتە: نزیکەی دوو کیلۆو نیو، ڕای جیاوازی دیکەیش هەیە لەوبارەیەوە).**

**٢٥٠٩-** «عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: ذَكَرَ فِي صَدَقَةِ الْفِطْرِ، قَالَ: صَاعاً مِنْ بُرٍّ، أَوْ صَاعاً مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ سُلْتٍ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٨٢٨.

(٢) ضعيف الإسناد، لكن المرفوع صحيح.

(٣) شاذ.




**واتە: ئیبنو سیرین دەگێڕێتەوە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) باسی زەکاتی سەرفترەی کرد، وتی: صاعێک لە گەنم، یان صاعێک لە خورما، یان صاعێک لە جۆ، یان صاعێک لە جۆی سپی.**

**٢٥١٠-** «عَنْ أَبِي رَجَاءٍ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، يَخْطُبُ عَلَى مِنْبَرِكُمْ «يَعْنِي مِنْبَرَ الْبَصْرَةِ» يَقُولُ: صَدَقَةُ الْفِطْرِ صَاعٌ مِنْ طَعَامٍ»[١].

**واتە: ئەبو ڕەجاء دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عەبباس بوو (خوا لێیان ڕازی بێ)، لەسەر مینبەرەکەی وتاری دەدا (لە بەصرە)و دەیوت: زەکاتی سەرفیترە صاعێکە لە خواردن).**

## بابەت: خورما بۆ زەکاتی سەرفترە

**٢٥١١-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَدَقَةَ الْفِطْرِ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ أَقِطٍ»[٢].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفترەی فەرز کرد صاعێک لە جۆ، یان صاعێک لە خورما، یان صاعێک لە کەشک.**

## دەرکردنی مێووژ بۆ زەکاتی سەرفترە

**٢٥١٢-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ زَكَاةَ الْفِطْرِ إِذْ كَانَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَاعاً مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ زَبِيبٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ أَقِطٍ»[٣].

**واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ ئێمە زەکاتی سەرفترەمان دەردەکرد کاتێ پێغەمبەری خوامان ﷺ لەناودا بوو، صاعێک لە خواردن، یان صاعێک لە جۆ، یان صاعێک لە خورما، یان صاعێک لە مێوژ، یان صاعێک لە کەشک.**

**٢٥١٣-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ صَدَقَةَ الْفِطْرِ إِذْ كَانَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَاعاً مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ أَقِطٍ» فَلَمْ نَزَلْ كَذَلِكَ حَتَّى قَدِمَ

---

**(١) صحيح الإسناد.**

**(٢) صحيح.**

**(٣) صحيح.**




مُعَاوِيَةُ مِنَ الشَّامِ، وَكَانَ فِيمَا عَلَّمَ النَّاسَ أَنَّهُ قَالَ: مَا أَرَى مُدَّيْنِ مِنْ سَمْرَاءِ الشَّامِ إِلَّا تَعْدِلُ صَاعاً مِنْ هَذَا، قَالَ: فَأَخَذَ النَّاسُ بِذَلِكَ»[١].

**واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: ئێمە زەکاتی سەرفترەمان دەردەکرد کاتێ پێغەمبەری خوامان ﷺ لەناودا بوو، صاعێک لە خواردن، یان صاعێک لە خورما، یان صاعێک لە جۆ، یان صاعێک لە کەشک. بەردەوام بەو شێوە بووین تا موعاویە لەشامەوە هات، ئەوەی خەڵکی زانیویانە ئەوە بوو ئەو دەیوت: وادەبینم دوو گوێل لە گەنمی شام یەکسانە بە صاعێک لەمە، وتی: ئینجا خەڵکی کاریان بەوە کرد.**

## دەرکردنی ئارد بۆ زەکاتی سەرفترە

**٢٥١٤-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: لَمْ نُخْرِجْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَّا صَاعاً مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ زَبِيبٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ دَقِيقٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ أَقِطٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ سُلْتٍ، ثُمَّ شَكَّ سُفْيَانُ، فَقَالَ: دَقِيقٍ أَوْ سُلْتٍ»[٢].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: لەسەردەم پێغەمبەری خوادا ﷺ زەکاتی سەرفترەمان دەرنەکرد مەگەر صاعێک لە خورما، یان صاعێک لە جۆ، یان صاعێک لە مێوژ، یان صاعێک لە ئارد، یان صاعێک لە کەشک، یان صاعێک لە جۆی سپی. پاشان سوفیان گومانی هەبووە ئایا ئاردی وت یان جۆی سپی.**

## دەرکردنی گەنم بۆ زەکاتی سەرفترە

**٢٥١٥-** «عَنْ الْحَسَنِ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، خَطَبَ بِالْبَصْرَةِ فَقَالَ: أَدُّوا زَكَاةَ صَوْمِكُمْ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، فَقَالَ: مَنْ هَاهُنَا مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ قُومُوا إِلَى إِخْوَانِكُمْ فَعَلِّمُوهُمْ، فَإِنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَرَضَ صَدَقَةَ الْفِطْرِ عَلَى الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ، وَالْحُرِّ وَالْعَبْدِ، وَالذَّكَرِ وَالْأُنْثَى نِصْفَ صَاعِ بُرٍّ، أَوْ صَاعاً مِنْ تَمْرٍ أَوْ شَعِيرٍ، قَالَ الْحَسَنُ: فَقَالَ عَلِيٌّ: أَمَّا إِذَا أَوْسَعَ اللَّهُ فَأَوْسِعُوا أَعْطُوا صَاعاً مِنْ بُرٍّ أَوْ غَيْرِهِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٠٥ و ١٥٠٦ و ١٥٠٨ و ١٥١٠، ومسلم: ١٧ و ٩٨٥/٢١، وأبو داود: ١٦١٦ و ١٦١٧ و ١٦١٨، والترمذي: ٦٧٣، وإبن ماجه: ١٨٢٩.

(٢) صحيح. دون ذكر الدقيق.

(٣) ضعيف الإسناد، المرفوع منه صحيح.




واتە: حەسەن دەگێڕێتەوە: ئیبنو عباس (خوا لێیان ڕازی بێ) ، لە بەصرە وتاریدا وتی: زەکاتی ڕۆژوەکانتان دەربکەن، خەڵکەکەش هەندێکیان تەماشای هەندێکی دیکەیان کرد، وتی: کێ لە خەڵکی مەدینە لێرەیە هەستن براکانتان فێر بکەن، چونکە ئەوان نازانن، بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفترەی فەرزی کردوە لەسەر هەموو بچوک و گەورەو ئازادو بەندەو نێرو مێ یەک، نیو صاع لە گەنم، یان صاعێک لە خورما یان جۆ، حەسەن وتی: عەلی دەڵێ: بەڵام کاتێ خوا دەرووی کردەوەو بژێویتان باش بوو ئەوە صاعێک گەنم یان غەیری ئەوە بدەن.

## دەرکردنی جۆی سپی بۆ زەکاتی سەرفترە

**٢٥١٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ النَّاسُ يُخْرِجُونَ عَنْ صَدَقَةِ الْفِطْرِ فِي عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ أَوْ تَمْرٍ أَوْ سُلْتٍ أَوْ زَبِيبٍ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: خەڵکی زەکاتی سەرفترەیان دەردەکرد لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ صاعێک لە جۆ یان خورما یان یان جۆی سپی، یان مێوژ.

## دەرکردنی جۆ بۆ زەکاتی سەرفترە

**٢٥١٧-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ أَوْ تَمْرٍ أَوْ زَبِيبٍ أَوْ أَقِطٍ، فَلَمْ نَزَلْ كَذَلِكَ حَتَّى كَانَ فِي عَهْدِ مُعَاوِيَةَ، قَالَ: مَا أَرَى مُدَّيْنِ مِنْ سَمْرَاءِ الشَّامِ إِلَّا تَعْدِلُ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ»[٢].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری رضي الله عنه دەڵێ: ئێمە لە سەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ صاعێک لە جۆ، یان خورما، یان مێوژ، یان کەشکان دەردەکرد، ئێمە بەردەوام بووین لەسەر ئەمە تا گەیشتینە سەردەمی موعاویە، وتی: وادەبینم دوو گوێل لە جۆی شام یەکسانە بە صاعێک جۆ.

---

(١) صحيح السناد.

(٢) صحيح.

## دەركردنی كەشك بۆ زەكاتی سەرفترە

**٢٥١٨-** «عَن أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ صَاعاً مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ أَقِطٍ لَا نُخْرِجُ غَيْرَهُ»(١).

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: ئێمە لەسەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ صاعێک لە خورما، یان صاعێک لە جۆ، یان صاعێک لە کەشکمان دەردەکرد جگە لەوەمان دەرنەدەکرد.

## صاع ئەندازەكەی چەندێكە؟

**٢٥١٩-** «عَنْ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ ﷺ قَالَ: كَانَ الصَّاعُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مُدّاً وَثُلُثاً بِمُدِّكُمْ الْيَوْمَ»(٢).

واتە: سائیبی کوڕی یەزید ﷺ دەڵێ: صاع لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ (المُدّ) گوێلێک و سێیەکی بوو بە (المُدّ) ئێوە.

(ڕونکردنەوە: (المُدّ): (پێوانەیەکی ناسراو بووە لەو سەردەمەدا، وتراویشە لەبەر ئەوە ناو براوە بە (المُدّ) چونکە مرۆڤ هەردوو دەستی دانایە پڕی دەکرد، واتە: بە ئەندازەی گوێلێکە).

**٢٥٢٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْمِكْيَالُ مِكْيَالُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ وَالْوَزْنُ وَزْنُ أَهْلِ مَكَّةَ»(٣).

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پێوانە پێوانەی خەڵکی مەدینەیە، کێشانەش کێشانەی خەڵی مەککەیە.

ڕونکردنەوە: (الْمِكْيَالُ مِكْيَالُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ) واتە: صاعی مەدینە ئەو صاعەیە کە پەیوەستە بە دەرکردنی زەکاتی سەفترەو کەفارەتەکانی تر، چونکە صاعەکانی

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧١٢ و ٧٣٣٠.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٣٤٠.




ناوچەکانی تر جیاوازن لەگەڵ ئەوەی مەدینە، هەرچەندە بە هەموویان دەوترێ: صاع، بەڵام صاعی مەدینە بە پێوانە دادەنرێ، (وَالْوَزْنُ وَزْنُ أَهْلِ مَكَّةَ) واتە: تەنها کیشانەی زێڕو زیو، مەبەست ئەوەیە ئەوەی ئیعتیباری پێدەکرێ لە بەشی زەکات لە کیشانە خەڵکی مەککە، بریتیە لەو درهەمەی کە دە دانەی بەرانبەرە بە حەوت مسقاڵ)

## بابەت: ئەو کاتەی کە چاکتر وایە زەکاتی سەرفترەی تێدا بدرێ

**٢٥٢١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ بِصَدَقَةِ الْفِطْرِ، أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلَاةِ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد زەکاتی سەرفترە بدرێ پێش ئەوەی خەڵکی دەربچن بۆ نوێژ.**

## دەرکردنی سەرفترە لەشارێکەوە بۆ شارێکی تر

**٢٥٢٢-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ إِلَى الْيَمَنِ فَقَالَ: إِنَّكَ تَأْتِي قَوْمًا أَهْلَ كِتَابٍ فَادْعُهُمْ إِلَى شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ، فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ ﷻ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ: خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ، فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ ﷻ قَدِ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً فِي أَمْوَالِهِمْ، تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ، فَتُوضَعُ فِي فُقَرَائِهِمْ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ لِذَلِكَ، فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ، فَإِنَّهَا لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللَّهِ ﷻ حِجَابٌ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ موعازی نارد بۆ یەمەن فەرمووی: تۆ دەچیت بۆ لای کەسانێک لە خاوەن کتێبەکان، بانگیان بکە بۆ ئەوەی شایەتمان بهێنن بە (أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ) جا ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵی تۆیان کرد بەو شایەتمانە، ئەوە پێیان ڕابگەیەنە کە بەڕاستی خوا ﷻ پێنج نوێژی لەسەریان فەرز کردوە لە هەموو شەوو ڕۆژێکدا، جا ئەگەر**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




ئەوان گوێڕایەڵی تۆیان کرد، ئەوە پێیان ڕابگەیەنە کە بەڕاستی خوا زەکاتی لەسەریان فەرز کردوە لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێ و دەگەڕێنرێتەوە بۆ هەژارەکانیان، جا ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵیان کردی لەوەدا، دەخیلە وریابە دەست نەبەی بۆ ماڵە زۆر چاکەکانیان، هەروەها لە نزای ستەم لێکراو بترسە، چونکە لە نێوان ئەوو خوادا پەردە نیە.

## بابەت: ئەگەر زەكاتی دا بەكەسێكی دەوڵەمەندو هەستی پێنەكرد

**٢٥٢٣** - «عَنِ أَبي هُرَيْرَةَ ﷺ قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قَالَ رَجُلٌ: لَأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدِ سَارِقٍ، فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ تُصُدِّقَ عَلَى سَارِقٍ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ عَلَى سَارِقٍ، لَأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ، فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدِ زَانِيَةٍ، فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ تُصُدِّقَ اللَّيْلَةَ عَلَى زَانِيَةٍ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ عَلَى زَانِيَةٍ، لَأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ، فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدِ غَنِيٍّ، فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ تُصُدِّقَ عَلَى غَنِيٍّ، قَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ عَلَى زَانِيَةٍ، وَعَلَى سَارِقٍ، وَعَلَى غَنِيٍّ، فَأُتِيَ فَقِيلَ لَهُ: أَمَّا صَدَقَتُكَ فَقَدْ تُقُبِّلَتْ، أَمَّا الزَّانِيَةُ فَلَعَلَّهَا أَنْ تَسْتَعِفَّ بِهِ مِنْ زِنَاهَا، وَلَعَلَّ السَّارِقَ أَنْ يَسْتَعِفَّ بِهِ عَنْ سَرِقَتِهِ، وَلَعَلَّ الْغَنِيَّ أَنْ يَعْتَبِرَ فَيُنْفِقَ مِمَّا أَعْطَاهُ اللَّهُ ﷻ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پیاوێک وتی: دەبێ صەدەقە و زەکات دەربکەم صەدەقەکەی لەگەڵ خۆی برد خستیە ناو دەستی دزێکەوە، بەیانی خەڵکی (بە سەرسوڕمانەوە) باسیان دەکرد وتیان: زەکاتی بە دز بەخشیوە، وتی: خوایە سوپاس بۆ تۆ زەکاتم بەخشی بەکەسێکی دز، هەر دەبێ صەدەقە و زەکات دەربکەم صەدەقەکەی لەگەڵ خۆی برد خستیە ناو دەستی ئافرەتێکی زیناکارەوە، بەیانی خەڵکی باسیان کرد وتیان: زەکاتی بەخشیوە بە ئافرەتێکی زیناکار، وتی: خوایە سوپاس بۆ تۆ زەکاتم دا بەئافرەتێکی زیناکار، هەر دەبێ صەدەقە و زەکات دەربکەم صەدەقەکەی لەگەڵ خۆی برد خستیە ناو دەستی پیاوێکی دەوڵەمەند، بەیانی خەڵکی باسیان کرد وتیان: زەکاتی بەخشیوە بە پیاوێکی دەوڵەمەند، وتی: خوایە سوپاس بۆ تۆ زەکاتم بەخشیوە بە ئافرەتێکی زیناکارو پیاوێکی دز و دەوڵەمەندێک، ئەو کەسە هێنراو پێی وترا: زەکات و صەدەقەکەت وەرگیرا، هەرچی دەربارەی ئافرەتە زیناکارەکەیە

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٢١، ومسلم: ١٠٢٢.




بەڵکو ببێتە مایەی ئەوەی خۆی پاک ڕابگرێ لە زینا کردن، وە بەڵکو دزەکەش بە هۆی ئەو سامانەوە خۆی بپارێزی لە دزی کردن، وە بەڵکو دەوڵەمەندەکەش پەند وەربگرێ ببەخشێ لەوەی خوا پێیداوە.

## بابەت: زەکات دەرکردن لە ماڵێکی دزراو لە دەستکەوتی جەنگ

**٢٥٢٤-** «عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ لَا يَقْبَلُ صَلَاةً بِغَيْرِ طُهُورٍ، وَلَا صَدَقَةً مِنْ غُلُولٍ»[١].

**واتە:** ئەبو مەلیح دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەڕاستی خوا ﷻ: نوێژ وەرناگرێ بەبێ دەستنوێژ، وە زەکات و صەدەقەی دزێتیش وەرناگرێ.

ڕونکردنەوە: (غُلُول): (دزی کردنە لە غەنیمەت و دەستکەوتی جەنگ).

**٢٥٢٥-** «عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا تَصَدَّقَ أَحَدٌ بِصَدَقَةٍ مِنْ طَيِّبٍ، وَلَا يَقْبَلُ اللَّهُ ﷻ إِلَّا الطَّيِّبَ، إِلَّا أَخَذَهَا الرَّحْمَنُ ﷻ بِيَمِينِهِ، وَإِنْ كَانَتْ تَمْرَةً، فَتَرْبُو فِي كَفِّ الرَّحْمَنِ، حَتَّى تَكُونَ أَعْظَمَ مِنَ الْجَبَلِ، كَمَا يُرَبِّي أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ، أَوْ فَصِيلَهُ»[٢].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێک نیە ببەخشێ لە ماڵی پاک و حەڵاڵ، خوا ﷻ وەری ناگرێ تەنها پاک و حەڵاڵ نەبێت، ئیللا خوای بەخشندە بە دەستی ڕاستی وەری دەگرێ، ئەگەر دەنکە خورمایەک بێت لەناو لەپی خوای بەخشندە زیاد دەکات تا گەورەتر دەبێت لە کێوێک، هەر وەک چۆن یەکێ لە ئێوە بەچکە ئەسپەکەی یان بەچکە وشترەکەی پەروەردە دەکات.

## بەخشین لە لایەن کەسێکی هەژار بەپێی توانای خۆی

**٢٥٢٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُبْشِيٍّ الْخَثْعَمِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ أَيُّ الْأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: إِيمَانٌ لَا شَكَّ فِيهِ، وَجِهَادٌ لَا غُلُولَ فِيهِ، وَحَجَّةٌ مَبْرُورَةٌ، قِيلَ: فَأَيُّ الصَّلَاةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: طُولُ

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٩، وإبن ماجه: ٢٧١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤١٠ و ٧٤٣٠ تعليقاً، ومسلم: ١٠١٤، والترمذي: ٦٦١ و ٦٦٢، وإبن ماجه: ١٨٤٢.




الْقُنُوتِ، قِيلَ: فَأَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: جُهْدُ الْمُقِلِّ، قِيلَ: فَأَيُّ الْهِجْرَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: مَنْ هَجَرَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ ﷻ، قِيلَ: فَأَيُّ الْجِهَادِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: مَنْ جَاهَدَ الْمُشْرِكِينَ بِمَالِهِ، وَنَفْسِهِ، قِيلَ: فَأَيُّ الْقَتْلِ أَشْرَفُ؟ قَالَ: مَنْ أُهَرِيقَ دَمُهُ، وَعُقِرَ جَوَادُهُ»(١).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی حوبشی خەثعەمی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرد چی کردەوەیەک چاکە؟ فەرمووی: بڕوایەک هیچ گومانی تێدا نەبێ و جیهادێکیش هیچ دزی و خیانەتێکی تێدا نەبێ، حەجێکی وەرگیراویش، وترا: چی نوێژێک چاکە؟ فەرمووی: وەستانی درێژی تێدا بێت. وترا: چی بەخشینێک چاکە؟ فەرمووی: بەخشینی کەسێکی هەژار بەپێی توانای خۆی. وترا: چی جیهادێک چاکە؟ فەرمووی: ئەوەی جیهادی هاوبەشدانەران دەکات بەماڵ و نەفسی. وترا: چی کوشتنێک شەرەفە؟ فەرمووی: کەسێک خۆی و ئەسپەکەی لە گۆڕەپانی جیهادا بکوژرێ.**

**٢٥٢٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سَبَقَ دِرْهَمٌ مِائَةَ أَلْفِ دِرْهَمٍ، قَالُوا: وَكَيْفَ؟ قَالَ: كَانَ لِرَجُلٍ دِرْهَمَانِ تَصَدَّقَ بِأَحَدِهِمَا، وَانْطَلَقَ رَجُلٌ إِلَى عُرْضِ مَالِهِ، فَأَخَذَ مِنْهُ مِائَةَ أَلْفِ دِرْهَمٍ فَتَصَدَّقَ بِهَا»(٢).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەک درهەم پێشی سەد هەزار درهەم کەوت، وتیان: چۆن؟ فەرمووی: پیاوێک دوو درهەمی هەبوو دانەیەکیان دەکات بەخێر، پیاوێکیش چوو بۆ لای بەشێک لە ماڵەکەی سەد هەزار درهەمی لێدەر کردو کردی بە خێر.**

**٢٥٢٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: سَبَقَ دِرْهَمٌ مِائَةَ أَلْفٍ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ؟ قَالَ: رَجُلٌ لَهُ دِرْهَمَانِ فَأَخَذَ أَحَدَهُمَا فَتَصَدَّقَ بِهِ، وَرَجُلٌ لَهُ مَالٌ كَثِيرٌ فَأَخَذَ مِنْ عُرْضِ مَالِهِ مِائَةَ أَلْفٍ، فَتَصَدَّقَ بِهَا»(٣).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەک درهەم پێشی سەد هەزار درهەم کەوت، وتیان: چۆن ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: پیاوێک**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٣٢٥ و ١٤٤٩.

(٢) حسن.

(٣) حسن.




**دوو درهەمی هەبوو دانەیەکیان کرد بەخێر، پیاوێکیش ماڵ و سامانێکی زۆری هەبوو سەد هەزار درهەمی لێ دەکردو کردی بە خێر.**

**٢٥٢٩-** «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَأْمُرُنَا بِالصَّدَقَةِ فَمَا يَجِدُ أَحَدُنَا شَيْئاً يَتَصَدَّقُ بِهِ حَتَّى يَنْطَلِقَ إِلَى السُّوقِ، فَيَحْمِلَ عَلَى ظَهْرِهِ، فَيَجِيءَ بِالْمُدِّ فَيُعْطِيَهُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِنِّي لَأَعْرِفُ الْيَوْمَ رَجُلاً لَهُ مِائَةُ أَلْفٍ مَا كَانَ لَهُ يَوْمَئِذٍ دِرْهَمٌ»(١).

**واتە: ئەبو مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێدەکرین بە بەخشین، کەسێکمان شتێکی نەدەبینی بیکات بەخێر، پاشان دەچوو بۆ بازار حەماڵی دەکرد تا گوێلێ خواردنی دەست دەکەوت، دەیبەخشی بە پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵام من ئەمڕۆ کەسی وا دەناسم سەد هەزار درهەمی هەیە، ئەو ڕۆژە یەک درهەمی نەبوو.**

**٢٥٣٠-** «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالصَّدَقَةِ، فَتَصَدَّقَ أَبُو عَقِيلٍ بِنِصْفِ صَاعٍ، وَجَاءَ إِنْسَانٌ بِشَيْءٍ أَكْثَرَ مِنْهُ، فَقَالَ الْمُنَافِقُونَ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ لَغَنِيٌّ عَنْ صَدَقَةِ هَذَا، وَمَا فَعَلَ هَذَا الْآخَرُ، إِلَّا رِيَاءً، فَنَزَلَتْ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ ﴿٧٩﴾ ﴾ التوبة»(٢).

**واتە: ئەبو مەسعود ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین بە بەخشین، ئەبو عەقیل نیو صاعی بەخشی، کەسێکی تر هات لەو زیاتری بەخشی، دووڕووەکان وتیان: خوا ﷻ بێنیازە لە بەخشینی ئەمە، ئەمەی دووەم تەنها بۆ ڕووپامایی بەخشیویەتی: دواتر ئەم ئایەتە دابەزیە خوارەوە: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ ﴿٧٩﴾ ﴾ التوبة ، واتە: ئەوکاسانەی کە تانەو تەشەر دەدەن لەو بڕوادارانەی جگە لە زەکات ماڵ و سامانیان دەبەخشن، وە (تانەو تەشەر دەدەن) لەوانەی کە تەنها کەمێکیان هەیە بە زەحمەت پەیدایان کردوە.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤١٦ و ٢٢٧٣ و ٤٦٦٩، وإبن ماجه: ٤١٥٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤١٥ و ٤٦٦٨، ومسلم: ١٠١٨.

## دەستی سەرەوە

**٢٥٣١-** «عَن حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ ﷛ يَقُولُ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ هَذَا الْمَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، فَمَنْ أَخَذَهُ بِطِيبِ نَفْسٍ، بُورِكَ لَهُ فِيهِ، وَمَنْ أَخَذَهُ بِإِشْرَافِ نَفْسٍ، لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، وَكَانَ كَالَّذِي يَأْكُلُ وَلَا يَشْبَعُ، وَالْيَدُ الْعُلْيَا، خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى»[١].

**واته: حەکیمی کوڕی حیزام ﷛ دەڵێ: داوام کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی بەخشیم، پاشان داوام لێ کرد، پێی بەخشیم، پاشان داوام کرد پێی بەخشیم، پاشان فەرمووی: بەڕاستی ئەم ماڵ و سامانە شرینە، ئەوەی بە ڕەزامەندی و بێ داواکردن وەری بگرێ، بەرەکەتی بۆ تێدەکرێت، هەرکەسیش وەری بگرێ و چاو برسی بێت، بەرەکەتی بۆ تێناکرێت، ئەوەش وەکو ئەوکەسەی لێ دێت کە هەر دەخواو تێر نابێت، وە دەستی سەرەوە چاکترە لە دەستی خوارەوە.**

## بابەت: کامەیان دەستی سەرەوەیە

**٢٥٣٢-** «عَنْ طَارِقٍ الْمُحَارِبِيِّ ﷛ قَالَ: قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَائِمٌ عَلَى الْمِنْبَرِ يَخْطُبُ النَّاسَ وَهُوَ يَقُولُ: يَدُ الْمُعْطِي الْعُلْيَا، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ: أُمَّكَ، وَأَبَاكَ، وَأُخْتَكَ، وَأَخَاكَ، ثُمَّ أَدْنَاكَ، أَدْنَاكَ»[٢].

**واتە: طارقی موحاریبی ﷛ دەڵێ: چووین بۆ مەدینە پێغەمبەری خوا ﷺ وەستا بوو لەسەر مینبەر وتاری بۆ خەڵکی دەداو دەیفەرموو: دەستی ئەوەی دەبەخشێ لەسەرەوەیە، بەوانە دەست پێبکە کە بژێوی و بەخێوکردنیان لەسەرتە: دایک، باوکت، خوشکت، برات، پاشان خوار ترت، خوار ترت.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٧٢ و ٢٧٥٠ و ٣١٤٣ و ٦٤٤١، ومسلم: ١٠٣٥، والترمذي: ٢٤٦٣.

(٢) صحيح.

## دەستی خوارەوە

**٢٥٣٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ وَهُوَ يَذْكُرُ الصَّدَقَةَ، وَالتَّعَفُّفَ عَنِ الْمَسْأَلَةِ: الْيَدُ الْعُلْيَا، خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَالْيَدُ الْعُلْيَا الْمُنْفِقَةُ، وَالْيَدُ السُّفْلَى السَّائِلَةُ»(١).

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی بەخشین و خۆپاراستنی دەکرد لە داواکردن (سواڵ کردن)، دەیفەرموو: دەستی سەرەوە چاکترە لە دەستی خوارەوە، دەستی سەرەوە ئەو دەستەیە کە دەبەخشێ، دەستی خوارەوەش ئەو دەستەیە کە داوا دەکات.**

## بەخشین لەسەر دەوڵەمەندی

**٢٥٣٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: خَيْرُ الصَّدَقَةِ: مَا كَانَ عَنْ ظَهْرِ غِنًى، وَالْيَدُ الْعُلْيَا، خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ»(٢).

**واتە: ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترین بەخشین ئەوەیە لەسەر دەوڵەمەندی بێت، وە دەستی سەرەوە چاکترە لە دەستی خوارەوە، وە بەوە دەست پێ بکە کە بژێوی و بەخێوکردنی لەسەرتە.**

## ڕاڤەکردن و شیکردنەوەی (بەخشین لەسەر دەوڵەمەندی)

**٢٥٣٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَصَدَّقُوا، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ عِنْدِي دِينَارٌ، قَالَ: تَصَدَّقْ بِهِ عَلَى نَفْسِكَ قَالَ: عِنْدِي آخَرُ، قَالَ: تَصَدَّقْ بِهِ عَلَى زَوْجَتِكَ قَالَ: عِنْدِي آخَرُ، قَالَ: تَصَدَّقْ بِهِ عَلَى وَلَدِكَ قَالَ: عِنْدِي آخَرُ، قَالَ: تَصَدَّقْ بِهِ عَلَى خَادِمِكَ قَالَ: عِنْدِي آخَرُ، قَالَ: أَنْتَ أَبْصَرُ»(٣).

**واتە: ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ببەخشن، پیاوێک وتی: دینارێکم هەیە، فەرمووی: بۆ نەفسی خۆت بیبەخشە، وتی: دینارێکی ترم هەیە،**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٢٩، ومسلم: ١٠٣٣، وأبو داود: ١٦٤٨.

(٢) حسن صحيح.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ١٦٩١.





فەرمووی: ببیەخشە بە خێزانەکەت وتی: دینارێکی ترم هەیە، فەرمووی: ببیەخشە بە منداڵەکەت وتی: دینارێکی ترم هەیە، فەرمووی: ببیەخشە بە خزمەتکارەکەت وتی: دینارێکی ترم هەیە، فەرمووی: خۆت چاکتر دەزانی.

## بابەت: ئەگەر ماڵی بەخشی بەڵام خۆی پێویستی پێی هەبوو، ئایا بۆی دەگێڕدرێتەوە؟

**٢٥٣٦-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً دَخَلَ الْمَسْجِدَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ فَقَالَ: صَلِّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ جَاءَ الْجُمُعَةَ الثَّانِيَةَ، وَالنَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ، فَقَالَ: صَلِّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ جَاءَ الْجُمُعَةَ الثَّالِثَةَ، فَقَالَ: صَلِّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: تَصَدَّقُوا فَتَصَدَّقُوا، فَأَعْطَاهُ ثَوْبَيْنِ ثُمَّ قَالَ: تَصَدَّقُوا، فَطَرَحَ أَحَدَ ثَوْبَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَلَمْ تَرَوْا إِلَى هَذَا، أَنَّهُ دَخَلَ الْمَسْجِدَ بِهَيْئَةٍ بَذَّةٍ فَرَجَوْتُ أَنْ تَفْطِنُوا لَهُ، فَتَتَصَدَّقُوا عَلَيْهِ، فَلَمْ تَفْعَلُوا، فَقُلْتُ: تَصَدَّقُوا، فَتَصَدَّقْتُمْ فَأَعْطَيْتُهُ ثَوْبَيْنِ، ثُمَّ قُلْتُ: تَصَدَّقُوا، فَطَرَحَ أَحَدَ ثَوْبَيْهِ، خُذْ ثَوْبَكَ، وَانْتَهَرَهُ»[١].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەی خوا ﷺ لە ڕۆژی هەینی وتاری دەدا، پیاوێک هاتە ژورەوە، فەرمووی: دوو ڕکات نوێژ بکە، پاشان هەینی دووەم هاتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا، فەرمووی: دوو ڕکات نوێژ بکە، پاشان هەینی سێیەم هاتەوە، فەرمووی: دوو ڕکات نوێژ بکە، پاشان فەرمووی: ببەخشن، ئەوانیش بەخشیان، دوو پۆشاکی پێدا، پاشان فەرمووی: ببەخشن، یەکێک لە پۆشاکەکانی دانا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا تەماشای ئەمەتان نەکرد، هاتە مزگەوتەوە بە جلوبەرگێکەوە هەژاری پێیەوە دیار بوو، ئومێدم کرد ئاوڕی لێ بدەینەوەو پێی ببەخشن بەڵام نەتانکرد، پاشان وتم: ببەخشن، ئێوەش بەخشیتان، دوو پۆشاکم پێدا، پاشان وتم ببەخشن، یەکێک لە پۆشاکەکانی دانا، پۆشاکەکەت هەڵگرە، ڕێگری لێ کرد پۆشاکەکەی ببەخشێ.

---

(١) حسن.

## بەخشین لەلایەن مرۆڤەوە

**٢٥٣٧-** «عَنْ عُمَيْرٍ مَوْلَى آبِي اللَّحْمِ ﷺ قَالَ: أَمَرَنِي مَوْلَايَ أَنْ أُقَدِّدَ لَحْمًا، فَجَاءَ مِسْكِينٌ، فَأَطْعَمْتُهُ مِنْهُ، فَعَلِمَ بِذَلِكَ مَوْلَايَ فَضَرَبَنِي، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَدَعَاهُ، فَقَالَ: لِمَ ضَرَبْتَهُ فَقَالَ: يُطْعِمُ طَعَامِي بِغَيْرِ أَنْ آمُرَهُ «وَقَالَ مَرَّةً أُخْرَى: بِغَيْرِ أَمْرِي» قَالَ: الْأَجْرُ بَيْنَكُمَا»[١].

**واتە: عومەیر مەولای ئەبو لەحم ﷺ دەڵێ: گەورەکەم فەرمانی پێکردم گۆشت ببرژێنم، هەژارێک هات، لەو خواردنەم پێدا، مەولاکەم بەوەی زانی لێیدام، منیش هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، بانگی کرد، فەرمووی: بۆ لێتداوە؟ وتی: خواردنی من دەبەخشێ بەبێ ئەوەی فەرمانی پێ بکەم «جارێکی تر وتی: بەبێ فەرمانم» فەرمووی: پاداشتەکە لە نێوان هەردوکتان دایە.**

**٢٥٣٨-** «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ صَدَقَةٌ قِيلَ: أَرَأَيْتَ إِنْ لَمْ يَجِدْهَا؟ قَالَ: يَعْتَمِلُ بِيَدِهِ، فَيَنْفَعُ نَفْسَهُ، وَيَتَصَدَّقُ قِيلَ: أَرَأَيْتَ إِنْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قَالَ: يُعِينُ ذَا الْحَاجَةِ الْمَلْهُوفَ قِيلَ: فَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قَالَ: يَأْمُرُ بِالْخَيْرِ قِيلَ: أَرَأَيْتَ إِنْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قَالَ: يُمْسِكُ عَنِ الشَّرِّ، فَإِنَّهَا صَدَقَةٌ»[٢].

**واتە: ئەبو موسا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو مسوڵمانێک بەخشینی لەسەر پێویستە، وترا: ئەگەر نەیبوو؟ فەرمووی: کار بکات سوود بە خۆیشی بگەیەنێت و خێریشی لێ بکات، وترا: ئەگەر کاری دەسنەکەوت؟ فەرمووی: یارمەتی داماوێکی بێ دەرەتان بدات، وترا: ئەگەر ئەویشی بۆ نەکرا؟ فەرمووی: با فەرمان بە چاکە بکات، وترا: ئەی ئەگەر ئەوەشی نەتوانی؟ فەرمووی: دەست هەڵبگرێ لە شەڕو خراپە، ئەوە بۆ ئەو خێرو چاکەیە.**

## بەخشینی ئافرەت لە ماڵی مێردەکەی

**٢٥٣٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا تَصَدَّقَتِ الْمَرْأَةُ مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا، كَانَ لَهَا أَجْرٌ، وَلِلزَّوْجِ مِثْلُ ذَلِكَ، وَلِلْخَازِنِ مِثْلُ ذَلِكَ، وَلَا يَنْقُصُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِنْ أَجْرِ صَاحِبِهِ شَيْئًا، لِلزَّوْجِ بِمَا كَسَبَ، وَلَهَا بِمَا أَنْفَقَتْ»[٣].

---

**(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٢٥، وابن ماجه: ٢٢٩٧.**

**(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٤٥ و ٦٠٢٢، ومسلم: ١٠٠٨.**

**(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٢٥ و ١٤٣٧ و ١٤٣٩ و ١٤٤٠ و ١٤٤١ و ٢٠٦٥، ومسلم: ١٠٢٤، وأبو داود: ١٦٨٥، والترمذي: ٦٧١ و ٦٧٢.**




واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئافرەت بەخشی لە ماڵی مێردەکەی، پاداشتی بۆ هەیە، بۆ مێردەکەشی بە هەمان شێوە، وە بۆ خەزنەدارەکەش بەهەمان شێوە، هیچ یەکێکیان لە پاداشتی ئەوی تر کەم ناکات، بۆ مێرد چونکە بەدەستی هێناوە، وە بۆ ئەویش کە بەخشیویەتی.

## بەخشینی ئافرەت بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی

**٢٥٤٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَمَّا فَتَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَكَّةَ قَامَ خَطِيباً فَقَالَ فِي خُطْبَتِهِ: لَا يَجُوزُ لِامْرَأَةٍ عَطِيَّةٌ، إِلَّا بِإِذْنِ زَوْجِهَا»(١).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەتحی مەککەی کرد هەستا وتاری خوێند لە وتارەکەیدا فەرمووی: دروست نیە بۆ هیچ ئافرەتێک ببەخشێت مەگەر بە مۆڵەتی مێردەکەی.

## فەزڵ و گەورەیی بەخشین

**٢٥٤١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ ﷺ اجْتَمَعْنَ عِنْدَهُ فَقُلْنَ: أَيَّتُنَا بِكَ أَسْرَعُ لُحُوقًا، فَقَالَ: أَطْوَلُكُنَّ يَدَاً فَأَخَذْنَ قَصَبَةً، فَجَعَلْنَ يَذْرَعْنَهَا، فَكَانَتْ سَوْدَةُ أَسْرَعَهُنَّ بِهِ لُحُوقاً، فَكَانَتْ أَطْوَلَهُنَّ يَدَاً، فَكَانَ ذَلِكَ مِنْ كَثْرَةِ الصَّدَقَةِ»(٢).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ کۆبوونەوە لە خزمەتیدا وتیان: کاممان زوو دەگەین بەتۆ؟ فەرمووی: کامەتان دەستی درێژ تر بێت، پارچە قامیشێکیان هێنا، دەستی خۆیانیان پێ دەپێوی، جا سەودە لە هەموویان زووتر کۆچی دوایی کردو گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ، چوونکە دەستی بەخشینی لە هەموویان درێژ تر بوو، ئەویش لەبەر زۆری بەخشینەکانی.

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٢٧٤ و ٣٥٤٧ و ٤٥٦٢ و ٤٥٦٦، والترمذي: ١٣٩٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٢٠.

## بابەت: چ صەدەقەو بەخشینێک چاکترینە

**٢٥٤٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: أَنْ تَصَدَّقَ، وَأَنْتَ شَحِيحٌ، تَأْمُلُ الْعَيْشَ، وَتَخْشَى الْفَقْرَ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چی بەخشینێک چاکترینە؟ فەرمووی: ببەخشیت لەکاتێکدا لەشت ساغ بیت و ئومێدت بە ژیان هەبێ و لە هەژاریش بترسیت.**

**٢٥٤٣-** «عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَفْضَلُ الصَّدَقَةِ، مَا كَانَ عَنْ ظَهْرِ غِنًى، وَالْيَدُ الْعُلْيَا، خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ»[٢].

**واتە: حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چاکترین بەخشین ئەوەیە لەسەر دەوڵەمەندی بێت، دەستی سەرەوە چاکترە لە دەستی خوارەوە، بەوانە دەست پێبکە کە بژێوی و بەخێوکردنیان لەسەرتە.**

**٢٥٤٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: خَيْرُ الصَّدَقَةِ مَا كَانَ عَنْ ظَهْرِ غِنًى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترین بەخشین ئەوەیە لەسەر دەوڵەمەندی بێت، بەوانە دەست پێبکە کە بژێوی لەسەرتە.**

**٢٥٤٥-** «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا أَنْفَقَ الرَّجُلُ عَلَى أَهْلِهِ وَهُوَ يَحْتَسِبُهَا، كَانَتْ لَهُ صَدَقَةً»[٤].

**واتە: ئەبو مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاو ببەخشێتە خانەوادەکەی و چاوەڕوانی پاداشت بکات ئەوە دەبێتە بەخشین بۆی.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤١٩ و ٢٧٤٨، ومسلم: ١٠٣٢، وأبو داود: ٢٨٦٥، وإبن ماجه: ٢٧٠٦.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٣٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٢٦ و ٥٣٥٦.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥ و ٤٠٠٦ و ٥٣٥١، ومسلم: ١٠٠٢، والترمذي: ١٩٦٥.




**٢٥٤٦-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: أَعْتَقَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي عُذْرَةَ عَبْدًا لَهُ عَنْ دُبُرٍ، فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: أَلَكَ مَالٌ غَيْرُهُ قَالَ: لَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ يَشْتَرِيهِ مِنِّي، فَاشْتَرَاهُ نُعَيْمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الْعَدَوِيُّ بِثَمَانِ مِائَةِ دِرْهَمٍ، فَجَاءَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: ابْدَأْ بِنَفْسِكَ، فَتَصَدَّقْ عَلَيْهَا، فَإِنْ فَضَلَ شَيْءٌ فَلِأَهْلِكَ، فَإِنْ فَضَلَ شَيْءٌ عَنْ أَهْلِكَ، فَلِذِي قَرَابَتِكَ، فَإِنْ فَضَلَ عَنْ ذِي قَرَابَتِكَ شَيْءٌ، فَهَكَذَا، وَهَكَذَا يَقُولُ: بَيْنَ يَدَيْكَ، وَعَنْ يَمِينِكَ، وَعَنْ شِمَالِكَ»[1].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە بەنی عەزرە بەندەیەکی هەبوو لە دوای نوێژ ئازادی کرد، هەواڵ گەیشت بە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا جگە لەوە ماڵ و سامانی ترت هەیە؟ وتی: نەخێر، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێ لە منی دەکڕێ، نوعەیمی کوڕی عەبدوڵڵای عەدەوی بە هەشت درهەمی کڕی، پێغەمبەری خوا ﷺ پارەکەی بۆی هێنا پێیدا، پاشان فەرمووی: لە خۆتەوە دەستی پێبکە، ببەخشە بە خۆت، ئەگەر شتێ زیاتر بوو بۆ خانەوادەکەت، ئەگەر زیاتر بوو لە خانەوادەکەت، ئەوە بۆ خزمە نزیکەکانت، ئەگەر زیاتر بوو لە خزمەنزیکەکانت، ئا بەو شێوەیەو بەوشێوەیە ببەخشە بەوانە لە بەردەستت دان و ئەوانەی لای ڕاست و چەپتن.**

## بەخشینی ڕەزیل و ڕژدو پیسکە

**٢٥٤٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ مَثَلَ الْمُنْفِقِ الْمُتَصَدِّقِ، وَالْبَخِيلِ كَمَثَلِ رَجُلَيْنِ عَلَيْهِمَا جُبَّتَانِ «أَوْ جُنَّتَانِ»مِنْ حَدِيدٍ، مِنْ لَدُنْ ثُدِيِّهِمَا إِلَى تَرَاقِيهِمَا، فَإِذَا أَرَادَ الْمُنْفِقُ أَنْ يُنْفِقَ اتَّسَعَتْ عَلَيْهِ الدِّرْعُ أَوْ مَرَّتْ حَتَّى تُجِنَّ بَنَانَهُ، وَتَعْفُوَ أَثَرَهُ، وَإِذَا أَرَادَ الْبَخِيلُ أَنْ يُنْفِقَ قَلَصَتْ وَلَزِمَتْ كُلُّ حَلْقَةٍ مَوْضِعَهَا، حَتَّى إِذَا أَخَذَتْهُ بِتَرْقُوَتِهِ «أَوْ بِرَقَبَتِهِ» يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَشْهَدُ أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُوَسِّعُهَا، فَلَا تَتَّسِعُ، قَالَ طَاوُسٌ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يُشِيرُ بِيَدِهِ وَهُوَ يُوَسِّعُهَا وَلَا تَتَوَسَّعُ»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: وێنەی (کەسی) بەخشندەو ڕەزیل، وەکو دوو پیاو وان دوو زرێی ئاسنیان لەبەردا بێت لە گۆی**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٣١ و ٢٤١٥ و ٢٥٣٤ و ٦٧١٦ و ٦٩٤٧، ومسلم: ٩٩٧، وأبو داود: ٣٩٥٥ و ٣٩٥٦ و ٣٩٥٧، والترمذي: ١٢١٩، وإبن ماجه: ٢٥١٢ و ٢٥١٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٤٣، ومسلم: ١٠٢١.




**مەمکیانەوە تا دەفەی شانی داپۆشیبن، بەخشندەکەش هەرچەندە خێرو چاکە بکات وردە وردە زرێکەی فراوانتر دەبێت و پێستەکەی دادەپۆشێت تا سەرپەنجەکانی دەشارێتەوە، لەزەویش دەخشێت تا شوێن پێکانی دەسڕێتەوە، ڕەزیلیش هەرکاتێ بیەوێت خێرێ بکات ئەڵقەکانی ئەو زرێیە هەریەک دەنوسێن بەشوێنی خۆیانەوە، تا گیر دەبن لە شانی یان گەردنی، کابرا دەیەوێت فراوانی بکات کەچی فراوان نابێت. ئەبو هورەیرە دەڵێ: شایەتی دەدەم پێغەمبەرم بینی قەڵغانەکەی فراوان دەکرد فراوان نەدەبوو، طاوس دەڵێ: گوێم لە ئەبو هورەیرە بوو بەدەستی ئاماژەی دەکردو فراوانی دەکردەوە، بەڵام فراوان نەدەبوو.**

**٢٥٤٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَثَلُ الْبَخِيلِ، وَالْمُتَصَدِّقِ، مَثَلُ رَجُلَيْنِ عَلَيْهِمَا جُنَّتَانِ مِنْ حَدِيدٍ، قَدِ اضْطَرَّتْ أَيْدِيَهُمَا إِلَى تَرَاقِيهِمَا، فَكُلَّمَا هَمَّ الْمُتَصَدِّقُ بِصَدَقَةٍ، اتَّسَعَتْ عَلَيْهِ، حَتَّى تُعَفِّيَ أَثَرَهُ، وَكُلَّمَا هَمَّ الْبَخِيلُ بِصَدَقَةٍ، تَقَبَّضَتْ كُلُّ حَلْقَةٍ إِلَى صَاحِبَتِهَا، وَتَقَلَّصَتْ عَلَيْهِ، وَانْضَمَّتْ يَدَاهُ إِلَى تَرَاقِيهِ، وَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: فَيَجْتَهِدُ أَنْ يُوَسِّعَهَا فَلَا تَتَّسِعُ»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نموونەی ڕەزیل و بەخشندە، وەکو دوو پیاو وان دوو زرێی ئاسنیان لەبەردا بێت، دەستیان ببەن بۆ سەر شانیان، هەرکاتێ بەخشندەکە بیەوێت خێرێ بکات بۆی فراوان ببێت، تا وردە وردە زرێیەکە فراوان دەبێت و لەزەویش دەخشێت و شوێن پێکانی دەسڕێتەوە، ڕەزیلیش هەرکاتێ بیەوێت خێرێ بکات ئەڵقەکانی ئەو زرێیە هەریەک دەنوسێن بەشوێنی خۆیانەوەو تەسک دەبنەوە لەبەریدا، دەستی هەر بەسەر شانیەوە دەبێت، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: کابرا هەوڵ دەدا فراوانی بکات کەچی فراوان نابێت.**

## ژماردنی بەخشین

**٢٥٤٩-** «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا يَوْماً فِي الْمَسْجِدِ جُلُوساً، وَنَفَرٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ فَأَرْسَلْنَا رَجُلاً إِلَى عَائِشَةَ لِيَسْتَأْذِنَ، فَدَخَلْنَا عَلَيْهَا، قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ سَائِلٌ مَرَّةً، وَعِنْدِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأَمَرْتُ لَهُ بِشَيْءٍ، ثُمَّ دَعَوْتُ بِهِ، فَنَظَرْتُ إِلَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

---

(١) صحيح.




أَمَا تُرِيدِينَ أَنْ لَا يَدْخُلَ بَيْتَكِ شَيْءٌ، وَلَا يَخْرُجَ، إِلَّا بِعِلْمِكِ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: مَهْلاً يَا عَائِشَةُ، لَا تُحْصِي، فَيُحْصِيَ اللَّهُ ﷻ عَلَيْكِ»[١].

**واتە: ئەبو ئومامەی كوڕی سەهلی كوڕی حونەیف ﷺ وتی: ڕۆژێک ئێمە لە مزگەوتدا دانیشتبوین لەگەڵ چەند كەسێک لە كۆچكەران و ئەنصارەكان، پیاوێكیان نارد بۆ لای عائیشە بۆ ئەوەی مۆڵەتی لێ وەربگرین، پاشان ڕۆیشتین بۆ لای، وتی: جارێكیان داواكەرێک هات بۆ لام پێغەمبەری خوا ﷺ لام بوو، بڕیارمدا شتێكی بدەمێ، پاشان بانگم كرد بۆ لای شتەكەو تەماشای ئەو شتەم كرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا حەز ناكەی هیچ نەیەتە ماڵەكەتەوەو دەرنەچی تەنها بە زانیاری خۆت نەبێت وتم: بەڵی، (واتە: نەخێر ئەوەم ناوێ بەڵكو ئەوەم دەوێ خوا پێم ببەخشێ بەبێ ئەوەی دەیزانم، چونكە ئەو ڕزق ڕۆزیەی بە زانیاری مرۆڤ دێتە ژورەوە دیاریكراوە، بەڵام ڕزق و ڕۆزی خوا دیاری كراو نیە لەوە فراوانترە) فەرمووی: لەسەرخۆبەو نەرم و نیانی بەكار بهێنە لە كاروبارەكانتدا، خێرو چاكە مەژمێرە با خوا بە ژمارە ماڵت نەداتێ.**

**٢٥٥٠-** «عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهَا: لَا تُحْصِي، فَيُحْصِيَ اللَّهُ ﷻ عَلَيْكِ»[٢].

**واتە: ئەسمائی كچی ئەبو بەكر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: خێرو چاكە مەژمێرە با خوا بە ژمارە ماڵت نەداتێ.**

**٢٥٥١-** «عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهَا جَاءَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ لَيْسَ لِي شَيْءٌ إِلَّا مَا أَدْخَلَ عَلَيَّ الزُّبَيْرُ، فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ فِي أَنْ أَرْضَخَ مِمَّا يُدْخِلُ عَلَيَّ؟ فَقَالَ: ارْضَخِي مَا اسْتَطَعْتِ، وَلَا تُوكِي فَيُوكِيَ اللَّهُ ﷻ عَلَيْكِ»[٣].

**واتە: ئەسمائی كچی ئەبو بەكر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەو هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: من هیچم نیە جگە لەوەی زوبەیر دەیهێنێتەوەو دەمداتێ، ئایا گوناهبار دەبم شتێكی كەمی لێ ببەخشم؟ فەرمووی: ببەخشە هەرچی لە تواناتدایە، دەرگای خێر دامەخە با خوا دەرگای خێرت لێ دانەخات.**

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ١٧٠٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٣٣ و ٢٥٩١، ومسلم: ١٠٢٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٣٤ و ٢٥٩٠، ومسلم: ١٠٢٩/٨٩، وأبو داود: ١٦٩٩، والترمذي: ١٩٦٠.

## بەخشینی ماڵ و سامانی کەم

**٢٥٥٢-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: اتَّقُوا النَّارَ، وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ»[١].

**واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە ئاگر بترسن ئەگەر چی بە لەتە خورمایەکیش بێت.**

**٢٥٥٣-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّارَ فَأَشَاحَ بِوَجْهِهِ وَتَعَوَّذَ مِنْهَا «ذَكَرَ شُعْبَةُ أَنَّهُ فَعَلَهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ» ثُمَّ قَالَ: اتَّقُوا النَّارَ، وَلَوْ بِشِقِّ التَّمْرَةِ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا، فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ»[٢].

**واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ئاگری کرد ڕووی وەرگێڕا هەروەکو ئەوەی پەنا پێ بگرێ-شوعبە باسی کرد پێغەمبەر سێ جار ئەوەی کرد- پاشان فەرمووی: لە ئاگر بترسن ئەگەر چی بە ئەندازەی لەتە خورمایەکیش بێت، ئەگەر ئەو لەتە خورماشتان نەبوو، ئەوە بە وتەیەکی پاک و چاک.**

## بابەت: هاندان لەسەر بەخشین

**٢٥٥٤** - «عَنِ الْمُنْذِرِ بْنَ جَرِيرٍ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فِي صَدْرِ النَّهَارِ، فَجَاءَ قَوْمٌ عُرَاةً حُفَاةً مُتَقَلِّدِي السُّيُوفِ، عَامَّتُهُمْ مِنْ مُضَرَ، بَلْ كُلُّهُمْ مِنْ مُضَرَ، فَتَغَيَّرَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لِمَا رَأَى بِهِمْ مِنَ الْفَاقَةِ، فَدَخَلَ ثُمَّ خَرَجَ، فَأَمَرَ بِلَالاً فَأَذَّنَ، فَأَقَامَ الصَّلَاةَ، فَصَلَّى ثُمَّ خَطَبَ، فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ، وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا، وَبَثَّ مِنْهُمَا، رِجَالاً كَثِيراً، وَنِسَاءً، وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ، وَالْأَرْحَامَ، إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً، وَاتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنْظُرْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ لِغَدٍ، تَصَدَّقَ رَجُلٌ مِنْ دِينَارِهِ مِنْ دِرْهَمِهِ مِنْ ثَوْبِهِ، مِنْ صَاعِ بُرِّهِ مِنْ صَاعِ تَمْرِهِ، حَتَّى قَالَ: وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ، فَجَاءَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ بِصُرَّةٍ كَادَتْ كَفُّهُ تَعْجِزُ عَنْهَا، بَلْ قَدْ عَجَزَتْ، ثُمَّ تَتَابَعَ النَّاسُ حَتَّى رَأَيْتُ كَوْمَيْنِ مِنْ طَعَامٍ، وَثِيَابٍ، حَتَّى رَأَيْتُ وَجْهَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَتَهَلَّلُ كَأَنَّهُ مُذْهَبَةٌ، فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً حَسَنَةً،

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤١٣ و ١٤١٧ و ٣٥٩٥ و ٦٠٢٣ و ٦٥٣٩ و ٦٥٤٠ و ٦٥٦٣ و ٧٤٤٣ و ٧٥١٢، ومسلم: ٦٦ و ١٠١٦/٦٨، والترمذي: ٢٤١٥، وإبن ماجه: ١٨٥ و ١٨٤٣.

(٢) صحيح.

فَلَهُ أَجْرُهَا، وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا، وَمَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً سَيِّئَةً، فَعَلَيْهِ وِزْرُهَا، وَوِزْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْئًا»[1].

**واتە: مونزیری کوڕی جەریر باس دەکات، لە باوکیەوە ﷺ، دەڵێ: ئێمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بووین سەرلەبەیانی خەڵکێکی ڕەش و ڕوت و پێپەتی هاتن، شمشێرەکانیان لە کێلاندا بوو زۆربەیان لە هۆزی موضەڕ بوون، بەڵکو هەموویان، ڕوخساری پێغەمبەری خوا ﷺ گۆڕا کاتێ دیمەنی هەژاری پێیانەوە بینی، چووە ژورەوە پاشان هاتە دەرەوە، فەرمانی کرد بە بیلال بانگیداو پاشان قامەتی نوێژی کرد، پاشان نوێژی کردو دواتر وتارێکی خوێند، فەرمووی: ئەی خەڵکینە خۆتان بپارێزن لە سزای پەروەردگارتان ئەوەی کە دروستی کردوون لە یەک کەسەوە کە ئادەمە، تەنها ئەویش هاوسەرەکەی دروست کردووەو بڵاوی کردوەتەوە لەو دووانە پیاوانی زۆر، هەروەها ئافرەتان، خۆتان بپارێزن لەو خوایەی کە بەناوی ئەوەوە داوادەکەن لە یەکتر، وە خۆتان بپارێزن لە پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی، بەڕاستی خوا هەمیشە چاودێرە بەسەرتانەوە، وە لەخوا بترسن، هەموو کەسێک با سەرنج بدات بزانێ چی پێش خۆی ناردوە بۆ پاشە ڕۆژی، با کەسێک دیناری ببەخشێ لە درهەمەکانی، لە جلوبەرگەکەی، لە صاعە گەنمەکەی، لە صاعە خورماکەی، تا فەرمووی: ئەگەر چی بە لەتە خورمایەکیش بێت، پیاوێک لە ئەنصارەکان هات گورزەیەک خواردنی هێنا ئەوەندە زۆر بوو خەریک بوو نەیتوانی، بەڵکو نەیتوانی، پاشان خەڵکی بەدوای یەکتردا خواردنیان هێنا، تا دوو کەڵەکە لە خواردنم بینی بەرز بوو بوویەوە، هەروەها جل و بەرگیش، تەماشای ڕوخساری پێغەمبەرم دەکرد وەکو زێڕ دەگەشایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکەس لە ئیسلامدا ڕێگایەکی چاک بگرێتەبەر خەڵکیش شوێنی بکەون، ئەوە پاداشتی ئەو ڕێگا چاکەی بۆ هەیە، هەرکەسیش لە دوای ئەو بیکات پاداشتی بۆ دەگەڕێتەوە، بەبێ ئەوەی لە پاداشتی کەس کەم ببێتەوە، هەرکەسیش لە ئیسلامدا ڕێگایەکی خراپ دابهێنێ، ئەوە گوناهەکەی بۆ ئەوە، وە بۆ ئەوەشە کاری پێدەکات بەبێ ئەوەی لە گوناهی هیچ یەکێکیان کەم بکات.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٩ و ١٠١٧/٧١، والترمذي: ٢٦٧٥، وإبن ماجه: ٢٠٣.

**٢٥٥٥** - «عَنْ حَارِثَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: تَصَدَّقُوا، فَإِنَّهُ سَيَأْتِي عَلَيْكُمْ زَمَانٌ يَمْشِي الرَّجُلُ بِصَدَقَتِهِ، فَيَقُولُ الَّذِي يُعْطَاهَا لَوْ جِئْتَ بِهَا بِالْأَمْسِ قَبِلْتُهَا، فَأَمَّا الْيَوْمَ فَلَا»[١].

**واتە: حاریثە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ببەخشن، چونکە سەردەمێک دێت بەسەرتاندا کەسێک زەکاتەکەی دێنێ، ئەوکەسەی وەری دەگرێ پێی دەڵێ: ئەگەر دوێنێ بتهێنایە وەرم دەگرت، بەڵام ئەمڕۆ وەری ناگرم.**

## تکا بۆ کردن لە بەخشین

**٢٥٥٦**- «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: اشْفَعُوا، تُشَفَّعُوا، وَيَقْضِي اللَّهُ ﷻ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ مَا شَاءَ»[٢].

**واتە: ئەبو موسا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: تکا بکەن بۆ بەخشین (لەوەیە ئێوە ببنە هۆکارێک بۆ پڕ کردنەوەی کەمو کوڕی کەسێکی هەژار ئەگەر ئێوە ئەوە نیازتان بوو پاداشت وەردەگرن لەسەر تکاکردنەکەتان)، تکاتان بۆ دەکرێ، خوا لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی چی بوێ دەیکات.**

**٢٥٥٧**- «عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ لَيَسْأَلُنِي الشَّيْءَ فَأَمْنَعُهُ حَتَّى تَشْفَعُوا فِيهِ، فَتُؤْجَرُوا، وَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: اشْفَعُوا، تُؤْجَرُوا»[٣].

**واتە: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پیاوێک داوای شتێکم لێ دەکات، پێی نادەم تا ئێوە تکای بۆ دەکەن، پاداشت وەردەگرن لەسەر تکا کردنتان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تکا بکەن پاداشت وەردەگرن.**

## فێز کردن و خۆبادان بە بەخشینەوە

**٢٥٥٨**- «عَنِ ابْنِ جَابِرٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ مِنَ الْغَيْرَةِ: مَا يُحِبُّ اللَّهُ ﷻ، وَمِنْهَا مَا يَبْغُضُ اللَّهُ ﷻ، وَمِنَ الْخُيَلَاءِ: مَا يُحِبُّ اللَّهُ ﷻ، وَمِنْهَا مَا يَبْغُضُ اللَّهُ ﷻ، فَأَمَّا الْغَيْرَةُ

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤١١ و ١٤٢٤ و ٧١٢٠، ومسلم: ١٠١١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٣٢ و ٦٠٢٧، ومسلم: ٢٦٢٧، وأبو داود: ٥١٣١ و ٥١٣٣، والترمذي: ٢٦٧٢.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥١٣٢.





الَّتِي يُحِبُّ اللَّهُ ﷻ: فَالْغَيْرَةُ فِي الرِّيبَةِ، وَأَمَّا الْغَيْرَةُ الَّتِي يَبْغُضُ اللَّهُ ﷻ: فَالْغَيْرَةُ فِي غَيْرِ رِيبَةٍ، وَالِاخْتِيَالُ الَّذِي يُحِبُّ اللَّهُ ﷻ: اخْتِيَالُ الرَّجُلِ بِنَفْسِهِ، عِنْدَ الْقِتَالِ، وَعِنْدَ الصَّدَقَةِ، وَالِاخْتِيَالُ الَّذِي يَبْغُضُ اللَّهُ ﷻ: الْخُيَلَاءُ فِي الْبَاطِلِ»[١].

**واتە: ئیبنو جابر دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی هەندێ غیرە هەیە خوا خۆشی دەوێ، هەندێکی تریان خوا ڕقی لێیەتی، هەندێ لە خۆبەگەورە زانین و فیزکردن هەیە خوا ﷻ خۆشی دەوێ، هەندێکی تریان خوا ﷻ ڕقی لێیەتی، ئەو غیرەی خوا ﷻ خۆشی دەوێ: ئەوەیە شتێکی خراپ ببینێ لە خێزانەکەی غیرە بیگرێ، بەڵام ئەو غیرەی خوا ڕقی لێیەتی غیرە کردنێکە بەبێ ئەوەی جێگای گومان بێت، وە ئەو خۆبەگەورە زانینەی خۆشی دەوێ کە بوێریە لەکاتی جەنگداو هەستانە بە چالاکی و خۆبەگەورە دانان لەبەرانبەر دوژمن، وە خۆبەگەورە زانین لە کاتی بەخشین، ئەوەیە ئەو بەخشینە لە دڵیەوە دەربچێت و پێی خۆش بێت و بێباک نەبێ لەوەی بەخشیویەتی، وە ئەو خۆبەگەورە زانینەی خوا ﷻ ڕقی لێیەتی: خۆبەگەورە زانینە لە شتی پووچدا.**

**٢٥٥٩-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كُلُوا، وَتَصَدَّقُوا، وَالْبَسُوا فِي غَيْرِ إِسْرَافٍ، وَلَا مَخِيلَةٍ»[٢].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب، لە باوکیەوە، لە باپیرەیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بخۆن و ببەخشن، پۆشاک بپۆشن بەبێ زیادەڕەوی و لووت بەرزی.**

## بابەت: پاداشتی خەزنەدار ئەگەر بە مۆڵەتی گەورەکەی بەخشی

**٢٥٦٠-** «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ، يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضاً» وَقَالَ:الْخَازِنُ الْأَمِينُ: الَّذِي يُعْطِي مَا أُمِرَ بِهِ طَيِّباً بِهَا نَفْسُهُ أَحَدُ الْمُتَصَدِّقَيْنِ»[٣].

**واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بڕوادار بۆ بڕوادار وەکو خانویەک وایە هەندێکی دیکە دەبەستێتەوە. وە فەرمووی: خەزنەداری**

(١) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٢٦٥٩.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٢٨١٩، وإبن ماجه: ٣٦٠٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٣٨ و ٢٢٦٠ و ٢٣١٩، ومسلم: ١٠٢٣، وأبو داود: ١٦٨٤.

دەستپاکی مسوڵمان: کە فەرمانی هەر بەخشینێکی پێدرا بە دڵێکی خۆشەوە دەیبەخشێت بەوکەسەی فەرمانی پێدراوە، یەکێکە لەو دوو بەخشەرە.

## بابەت: بەخشین بە نهێنی

**٢٥٦١-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْجَاهِرُ بِالْقُرْآنِ كَالْجَاهِرِ بِالصَّدَقَةِ، وَالْمُسِرُّ بِالْقُرْآنِ كَالْمُسِرِّ بِالصَّدَقَةِ»[١].

**واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوکەسەی بە ئاشکرا قورئان دەخوێنێ، وەکو ئەوکەسە وایە بە ئاشکرا دەبەخشێ، وە ئەوکەسەی بە نهێنی قورئان دەخوێنێ، وەکو ئەوکەسە وایە بە نهێنی دەبەخشێ،**

## ئەوکەسەی منەت دەکات بەوەی بەخشیویەتی

**٢٥٦٢-** «عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ثَلَاثَةٌ لَا يَنْظُرُ اللَّهُ ﷻ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: الْعَاقُّ لِوَالِدَيْهِ، وَالْمَرْأَةُ الْمُتَرَجِّلَةُ، وَالدَّيُّوثُ، وَثَلَاثَةٌ لَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ: الْعَاقُّ لِوَالِدَيْهِ، وَالْمُدْمِنُ عَلَى الْخَمْرِ، وَالْمَنَّانُ بِمَا أَعْطَى»[٢].

**واتە: سالمی کوڕی عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە: باوکی (خوا لێیان ڕازی بێ) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ کۆمەڵ خوا ﷻ تەماشایان ناکات لە ڕۆژی دواییدا: ئەوکەسەی سەرپێچی دایک و باوکی دەکات، بێ ئابڕو یان گەواد، ئەو ئافرەتەیشی خۆی دەچوێنی بە پیاو، وە سێ کۆمەڵ ناچنە بەهەشتەوە: ئەوکەسەی سەرپێچی دایک و باوکی دەکات، ئەوکەسەی بەردەوامە لەسەر مەی خواردنەوە، ئەوکەسەیشی منەت دەکات بەوەی بەخشیویەتی.**

**٢٥٦٣-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ ﷻ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ، وَلَا يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ، فَقَرَأَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «فَقَالَ أَبُو ذَرٍّ: خَابُوا وَخَسِرُوا، خَابُوا وَخَسِرُوا» قَالَ: الْمُسْبِلُ إِزَارَهُ، وَالْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ، وَالْمَنَّانُ عَطَاءَهُ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٣٣٣، والترمذي: ٢٩١٩.

(٢) حسن صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٦، وأبو داود: ٤٠٨٧ و ٤٠٨٨، والترمذي: ١٢١١، وإبن ماجه: ٢٢٠٨.




واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سێ کۆمەڵ هەن خوا ﷻ لە ڕۆژی دواییدا نە قسەیان لەگەڵ دەکات و نە تەماشایان دەکات و نە پاکیان دەکاتەوە، وە سزایەکی بە ئێشیان بۆ هەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ خوێندیەوە، -ئەبو زەڕ وتی: هیوا بڕاوو زەرەر مەند بوون، هیوا بڕاوو زەرەر مەند بوون، ئەوکەسەی کە دەرقاچەکەی درێژە-، فەرمووی: ئەوکەسەی جلی درێژ دەپۆشێ و بەدوایدا دەخشێ (لەبەر فیزو خۆبەگەورە زانین)، وە ئەو کەسەی ماڵەکەی زیاد دەکات بە سوێندی درۆ، ئەوکەسەیشی منەت دەکات بەسەر ئەوکەسەی پێی بەخشیوە.

**٢٥٦٤-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ ﷻ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ، وَلَا يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: الْمَنَّانُ بِمَا أَعْطَى، وَالْمُسْبِلُ إِزَارَهُ، وَالْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ»[(١)].

واتە: واتە: ئەبو زەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ کۆمەڵ هەن خوا ﷻ لە ڕۆژی دواییدا نە قسەیان لەگەڵ دەکات و نە تەماشایان دەکات و نە پاکیان دەکاتەوەو سزایەکی بە ئێشیان بۆ هەیە: ئەوکەسەی کە منەت دەکات بەسەر خەڵکیدا بەوەی بەخشیوەتی، ئەوکەسەی جلی درێژ دەپۆشێ و بەدوایدا دەخشێ (لەبەر فیزو خۆبەگەورە زانین) ئەو کەسەی ماڵەکەی زیاد دەکات بە سوێندی درۆ.

## بابەت: وەڵامدانەوەی داواکەر (سواڵکەر).

**٢٥٦٥-** «عَنِ ابْنِ بُجَيْدٍ الْأَنْصَارِيِّ، عَنْ جَدَّتِهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: رُدُّوا السَّائِلَ وَلَوْ بِظِلْفٍ مُحْرَقٍ»[(٢)].

واتە: ئیبنو بوجەیدی ئەنصاری دەگێڕێتەوە: لە داپیرەیەوە خوا لێی ڕازی بێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: وەڵامی داواکەر (سواڵکەر) بدەنەوە ئەگەرچی بە سمێکی سوتاویش بێت.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٦٦٧، والترمذي: ٦٦٥.

## بابەت: ئەوکەسەی داوای لێدەکرێ و نابەخشێ

**٢٥٦٦-** «عَن بَهْزَ بْنَ حَكِيمٍ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا يَأْتِي رَجُلٌ مَوْلَاهُ يَسْأَلُهُ مِنْ فَضْلٍ عِنْدَهُ، فَيَمْنَعُهُ إِيَّاهُ، إِلَّا دُعِيَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعٌ أَقْرَعُ يَتَلَمَّظُ فَضْلَهُ الَّذِي مَنَعَ»[١].

**واتە: بەهزی کوڕی حەکیم، لە باوکیەوە، لە باپیرەیەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هیچ کەسێک ناچێت بۆ لای گەورەکەی داوای لێ بکات لەو ماڵە زیادەی کە لە لایەتی، ئەویش پێی نەبەخشێ ئیللا لە ڕۆژی دواییدا پیرەمارێکی کەچەڵی بۆ بانگ دەکرێ زمانی دەردەکات و دەیهێنێ و دەباو بەشوێندا دەگەڕێ.**

## هەرکەسێ داوای کرد لەبەر خوا ﷻ پێی بدرێ

**٢٥٦٧-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنِ اسْتَعَاذَ بِاللَّهِ فَأَعِيذُوهُ، وَمَنْ سَأَلَكُمْ بِاللَّهِ فَأَعْطُوهُ، وَمَنِ اسْتَجَارَ بِاللَّهِ فَأَجِيرُوهُ، وَمَنْ آتَى إِلَيْكُمْ مَعْرُوفاً فَكَافِئُوهُ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَادْعُوا لَهُ حَتَّى تَعْلَمُوا أَنْ قَدْ كَافَأْتُمُوهُ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس داوای کرد لەبەر خوا پەنا بدرێ پەنای بدەن، هەرکەس داوای لێ کردن پێی ببەخشن، هەرکەس پەنای بۆ بردن پەنای بدەن، هەرکەس چاکەی بۆ کردن پاداشتی بدەنەوە، ئەگەر نەتان توانی نزای خێری بۆ بکەن، تا وادەزانن پاداشتتان داوەتەوە.**

## هەرکەس داوای کرد بەڕوخساری خوا ﷻ

**٢٥٦٨-** «بَهْزَ بْنَ حَكِيمٍ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ مَا أَتَيْتُكَ حَتَّى حَلَفْتُ أَكْثَرَ مِنْ عَدَدِهِنَّ لِأَصَابِعِ يَدَيْهِ، أَلَّا آتِيَكَ، وَلَا آتِيَ دِينَكَ، وَإِنِّي كُنْتُ امْرَأً لَا أَعْقِلُ شَيْئاً، إِلَّا مَا عَلَّمَنِي اللَّهُ وَرَسُولُهُ، وَإِنِّي أَسْأَلُكَ بِوَجْهِ اللَّهِ ﷻ بِمَا بَعَثَكَ رَبُّكَ إِلَيْنَا؟ قَالَ:

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٦٧٢ و ٥١٠٩.




بِالْإِسْلَامِ، قَالَ: قُلْتُ وَمَا آيَاتُ الْإِسْلَامِ؟ قَالَ: أَنْ تَقُولَ: أَسْلَمْتُ وَجْهِي إِلَى اللّٰهِ ﷻ، وَتَخَلَّيْتُ، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، كُلُّ مُسْلِمٍ عَلَى مُسْلِمٍ مُحَرَّمٌ أَخَوَانِ نَصِيرَانِ لَا يَقْبَلُ اللَّهُ ﷻ مِنْ مُشْرِكٍ بَعْدَمَا أَسْلَمَ عَمَلاً، أَوْ يُفَارِقَ الْمُشْرِكِينَ إِلَى الْمُسْلِمِينَ»[١].

**واتە: بەهزی کوڕی حەکیم، لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە: باپیرەی (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من سوێندم خواردوە بە ژمارەی پەنجەکانی دەستم هەرگیز نەیەم نە بۆ لای تۆ، نە بۆ لای ئاینەکەت، من کەسێکم هیچ نازانم مەگەر ئەوەی خوا ﷻ و پێغەمبەرەکەی فێری کردووم، بەڕاستی من داوات لێ دەکەم بەروخساری خوا، بەچی تۆی ناردوە بۆ ناومان؟ فەرمووی: بە ئیسلام؟ وتی: وتم: نیشانەکانی ئیسلام چیە؟ فەرمووی: ئەوەیە کە بڵێی ڕۆخساری خۆمم ڕادەستی خوا کرد، وە خۆم داڕنی لە هاوبەشدانان، نوێژیش بکەی و زکاتیش بدەی، هەموو مسوڵمانێ لەسەر مسوڵمان حەرامە، دوو بران یەکتر سەردەخەن، خوا هیچ کردەوەیە وەرناگرێ لە کەسێکی هاوبەشدانەر دوای ئەوەی مسوڵمان دەبێ، هەتا هیجرەت نەکات بۆ ناو مسوڵمانان.**

## ئەو کەسەی لەبەر خوا ﷻ داوای لێ دەکرێ ببەخشێ، ئەویش پێی نابەخشێ

**٢٥٦٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ النَّاسِ مَنْزِلاً؟ قُلْنَا: بَلَى يَا رَسُولَ اللّٰهِ قَالَ: رَجُلٌ آخِذٌ بِرَأْسِ فَرَسِهِ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ ﷻ حَتَّى يَمُوتَ، أَوْ يُقْتَلَ، وَأُخْبِرُكُمْ بِالَّذِي يَلِيهِ؟ قُلْنَا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللّٰهِ، قَالَ: رَجُلٌ مُعْتَزِلٌ فِي شِعْبٍ يُقِيمُ الصَّلَاةَ، وَيُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَيَعْتَزِلُ شُرُورَ النَّاسِ، وَأُخْبِرُكُمْ بِشَرِّ النَّاسِ؟ قُلْنَا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللّٰهِ، قَالَ: الَّذِي يُسْأَلُ بِاللّٰهِ ﷻ، وَلَا يُعْطِي بِهِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا هەواڵتان بدەمێ بەوەی چاکترین پلەو پایەی هەیە لای خوا؟ وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: پیاوێک ڕەشمەی ئەسپەکەی دەگرێ دەجەنگێ لە پێناوی خوادا تا دەمرێ یان دەکوژرێ، وە هەواڵتان بدەمێ بەوەی**

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٦٥٢.




دوای ئەو دێت؟ وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: پیاوێکی گۆشەگیرە لە شیوێکدا نوێژەکانی بەجێدێنێ و زەکات دەردەکات و لە شەڕو خراپەکانی خەڵکی دورە، وەهەواڵتان بدەمێ بە خراپترین کەس؟ وتمان: بەڵی ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ئەو کەسەیە لەبەر خوا داوای لێدەکرێ، لەبەر خوا پێی نابەخشێ.

## پاداشتی ئەو کەسەی دەبەخشێ

**٢٥٧٠-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: ثَلَاثَةٌ يُحِبُّهُمُ اللَّهُ ﷻ، وَثَلَاثَةٌ يَبْغُضُهُمُ اللَّهُ ﷻ، أَمَّا الَّذِينَ يُحِبُّهُمُ اللَّهُ ﷻ: فَرَجُلٌ أَتَى قَوْمَاً فَسَأَلَهُمْ بِاللَّهِ ﷻ، وَلَمْ يَسْأَلْهُمْ بِقَرَابَةٍ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُمْ، فَمَنَعُوهُ، فَتَخَلَّفَهُ رَجُلٌ بِأَعْقَابِهِمْ فَأَعْطَاهُ سِرَّاً لَا يَعْلَمُ بِعَطِيَّتِهِ إِلَّا اللَّهُ ﷻ، وَالَّذِي أَعْطَاهُ، وَقَوْمٌ سَارُوا لَيْلَتَهُمْ حَتَّى إِذَا كَانَ النَّوْمُ أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِمَّا يُعْدَلُ بِهِ، نَزَلُوا فَوَضَعُوا رُءُوسَهُمْ، فَقَامَ يَتَمَلَّقُنِي، وَيَتْلُو آيَاتِي، وَرَجُلٌ كَانَ فِي سَرِيَّةٍ فَلَقُوا الْعَدُوَّ فَهُزِمُوا، فَأَقْبَلَ بِصَدْرِهِ حَتَّى يُقْتَلَ أَوْ يَفْتَحَ اللَّهُ لَهُ، وَالثَّلَاثَةُ: الَّذِينَ يَبْغُضُهُمُ اللَّهُ ﷻ: الشَّيْخُ الزَّانِي، وَالْفَقِيرُ الْمُخْتَالُ، وَالْغَنِيُّ الظَّلُومُ»[١].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سێ کۆمەڵ هەن خوا خۆشی دەوێن، سی کۆمەڵی دیکەش هەن خوا ڕقی لێیانە، جا ئەوانەی کە خوا خۆشی دەوێن، پیاوێکە دەچێت بۆ لای خەڵکێک داوایان لێ دەکات لەبەر خوا یارمەتی بدەن، لەبەر خزمایەتی لە نێوان ئەوو ئەوان داوایان لێ ناکات، ئەوانیش یارمەتی نادەن، پیاوێک لەناویاندا دەمێنێتەوە لە دوایانەوە، بە نهێنی یارمەتی دەدات، کەس بە هاوکاریەکەی نازانێت جگە لەخوا، وە ئەوکەسەیشی پێی بەخشیوە، خەڵکێکیش شەو ڕەوی بکەن تا وایان لێ دێت خەو لەلایان لە هەموو شتێ خۆشەویستر دەبێت سەریان دابنێن و بخەون، کەسێک لەناویان هەستێت بپاڕێتەوە لێم و ئایەتەکانم بخوێنێتەوە، وە پیاوێک لەناو دەستەیەکدا ڕووبەڕووی دوژمن ببنەوەو بشکێن، ئەم ڕوبەڕوویان ببێتەوە هەتا دەکوژرێ یان دەروی بۆ دەکرێتەوە، ئەو سیانەشی کە خوا ڕقی لێیانە: پیاوێکی بەساڵاچووی زیناکارە، وە هەژارێکی لەخۆبایی، هەروەها دەوڵەمەندێکی ستەمکار.

---

(١) ضعيف.




## ڕاڤەكردن و شیكردنەوەی هەژار

**٢٥٧١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَيْسَ الْمِسْكِينُ الَّذِي تَرُدُّهُ التَّمْرَةُ، وَالتَّمْرَتَانِ، وَاللُّقْمَةُ، وَاللُّقْمَتَانِ، إِنَّ الْمِسْكِينَ الْمُتَعَفِّفُ اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ ﴿لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا﴾البقرة» [1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەژار ئەوكەسە نیە دەنكە خورمایەک و دوو دەنكە خورما، یان پارویەک و دوو پارو بیگەڕێنێتەوە بەڵكو هەژار ئەوكەسەیە خۆی دەگرێتەوە داوا لە خەڵكی ناكات، ئەگەر ویستتان بخوێنن: ﴿لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا﴾البقرة واتە: داوای هیچ لەكەس ناكەن بەزۆر.**

**٢٥٧٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَيْسَ الْمِسْكِينُ بِهَذَا الطَّوَّافِ الَّذِي يَطُوفُ عَلَى النَّاسِ تَرُدُّهُ اللُّقْمَةُ وَاللُّقْمَتَانِ وَالتَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ، قَالُوا: فَمَا الْمِسْكِينُ؟ قَالُوا: الَّذِي لَا يَجِدُ غِنًى يُغْنِيهِ وَلَا يُفْطَنُ لَهُ، فَيُتَصَدَّقَ عَلَيْهِ وَلَا يَقُومُ فَيَسْأَلَ النَّاسَ»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەژار ئەوكەسە نیە كە بەسەر خەڵكیدا دەگەڕێ دەنكە خورمایەک و دوو دەنكە خورما، یان پارویەک و دوو پارو بیگەڕێنێتەوە، وتیان: هەژار كێیە؟ وتیان: ئەوكەسەیە هیچی نیە بێنیازی بكات لە خەڵک، وە پێی نازانرێ تا خێری پێبكرێ، داواش لە خەڵكی ناكات.**

**٢٥٧٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَيْسَ الْمِسْكِينُ الَّذِي تَرُدُّهُ الْأُكْلَةُ وَالْأُكْلَتَانِ، وَالتَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ، قَالُوا: فَمَا الْمِسْكِينُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: الَّذِي لَا يَجِدُ غِنًى، وَلَا يَعْلَمُ النَّاسُ حَاجَتَهُ، فَيُتَصَدَّقَ عَلَيْهِ»[3].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەژار ئەوكەسە نیە پارویەک و دوو پارو یان دەنكە خورمایەک و دوو دەنكە خورما بیگەڕێنێتەوە،**

---

(١) شاذ بزيادة: «اقْرَءُوا».

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٧٦ و ١٤٧٩ و ٤٥٣٩، ومسلم: ١٠١ و ١٠٢/١٠٣٩، وأبو داود: ١٦٣١ و ١٦٣٢.

(٣) صحيح.

**وتیان: ئەی هەژار کێیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەوکەسەیە هیچی نیە بێنیازی بکات لە خەڵک، خەڵکیش بە کەمو کوڕی نازانن، تا خێری پێبکەن.**

**٢٥٧٤-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ بُجَيْدٍ، عَنْ جَدَّتِهِ أُمِّ بُجَيْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا «وَكَانَتْ مِمَّنْ بَايَعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ» أَنَّهَا قَالَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ الْمِسْكِينَ لَيَقُومُ عَلَى بَابِي فَمَا أَجِدُ لَهُ شَيْئًا أُعْطِيهِ إِيَّاهُ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنْ لَمْ تَجِدِي شَيْئًا تُعْطِينَهُ إِيَّاهُ، إِلَّا ظِلْفًا مُحْرَقًا، فَادْفَعِيهِ إِلَيْهِ»[1].

**واتە: عەبدورەحمانی کوڕی بوجەید دەگێڕێتەوە: لە داپیرەی دایکی بوجەید (خوا لێی ڕازی بێ) «یەکێک بوو لەوانەی بەیعەتی دابوو بە پێغەمبەری خوا ﷺ» بە پێغەمبەری وت: هەژار لەبەر دەرگام دەوەستێ هیچ شک نابەم بیدەم پێی، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەگەر هیچت نەبینی بیبەخشی پێی جگە لە سمێکی سوتاو بیدەرێ.**

## هەژاری لەخۆبایی و لووت بەرز

**٢٥٧٥-** «عَنِ ابْنِ عَجْلَانَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يُحَدِّثُ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ ﷻ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: الشَّيْخُ الزَّانِي، وَالْعَائِلُ الْمَزْهُوُّ، وَالْإِمَامُ الْكَذَّابُ»[2].

**واتە: ئیبنو عەجلان دەڵێ: گوێم لە باوکم بوو باسی دەکرد، لە ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ کۆمەڵ هەن خوا قسەیان لەگەڵ ناکات لە ڕۆژی دوایی: پیرە پیاوێکی بەساڵاچووی زیناکار، هەژارێکی لووت بەرز، پێشەوایەکی درۆزن.**

**٢٥٧٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَرْبَعَةٌ يَبْغُضُهُمُ اللَّهُ ﷻ: الْبَيَّاعُ الْحَلَّافُ، وَالْفَقِيرُ الْمُخْتَالُ، وَالشَّيْخُ الزَّانِي، وَالْإِمَامُ الْجَائِرُ»[3].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چوار کۆمەڵ هەن خوا ڕقی لێیانە: فرۆشیارێکی سوێند خۆر، هەژارێکی لووت بەرز، پیرە پیاوێکی بەساڵاچووی زیناکار، پێشەوایەکی ستەمکار.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## فەزڵ و چاكەی ئەوكەسەی بێوەژن بەسەر دەكاتەوە

**٢٥٧٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: السَّاعِي عَلَى الْأَرْمَلَةِ، وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ»[١].

**واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوكەسەی بێوەژن و هەژار بەسەر دەكاتەوە وەكو موجاهیدێک وایە لە پێناوی خوادا.**

## ئەوانەی دڵیان دائەهێنرێ بۆ خۆشەویستی ئیسلام

**٢٥٧٨-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: بَعَثَ عَلِيٌّ وَهُوَ بِالْيَمَنِ بِذُهَيْبَةٍ بِتُرْبَتِهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَسَمَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، بَيْنَ أَرْبَعَةِ نَفَرٍ: الْأَقْرَعِ بْنِ حَابِسٍ الْحَنْظَلِيِّ، وَعُيَيْنَةَ بْنِ بَدْرٍ الْفَزَارِيِّ، وَعَلْقَمَةَ بْنِ عُلَاثَةَ الْعَامِرِيِّ، ثُمَّ أَحَدِ بَنِي كِلَابٍ، وَزَيْدٍ الطَّائِيِّ ثُمَّ أَحَدِ بَنِي نَبْهَانَ فَغَضِبَتْ قُرَيْشٌ «وَقَالَ مَرَّةً أُخْرَى: صَنَادِيدُ قُرَيْشٍ» فَقَالُوا: تُعْطِي صَنَادِيدَ نَجْدٍ، وَتَدَعُنَا قَالَ: إِنَّمَا فَعَلْتُ ذَلِكَ لِأَتَأَلَّفَهُمْ، فَجَاءَ رَجُلٌ كَثُّ اللِّحْيَةِ، مُشْرِفُ الْوَجْنَتَيْنِ، غَائِرُ الْعَيْنَيْنِ، نَاتِئُ الْجَبِينِ، مَحْلُوقُ الرَّأْسِ، فَقَالَ: اتَّقِ اللَّهَ يَا مُحَمَّدُ، قَالَ: فَمَنْ يُطِيعُ اللَّهَ ﷻ إِنْ عَصَيْتُهُ أَيَأْمَنُنِي عَلَى أَهْلِ الْأَرْضِ وَلَا تَأْمَنُونِي، ثُمَّ أَدْبَرَ الرَّجُلُ فَاسْتَأْذَنَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ، فِي قَتْلِهِ يَرَوْنَ أَنَّهُ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ مِنْ ضِئْضِئِ هَذَا قَوْماً يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ، يَقْتُلُونَ أَهْلَ الْإِسْلَامِ، وَيَدَعُونَ أَهْلَ الْأَوْثَانِ، يَمْرُقُونَ مِنَ الْإِسْلَامِ، كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ لَئِنْ أَدْرَكْتُهُمْ لَأَقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ عَادٍ»[٢].

**واته: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: عەلی لە یەمەنەوە بەشێ لە زێڕی تێكەڵكراو بە خۆڵی نارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەریش دابەشی كردە سەر چوار كەسدا: ئەقرەعی كوڕی حابیسی حەنظەلی، عویەینەی كوڕی بەدری فەزاری، عەلقەمەی كوڕی عولاثەی عامری، پاشان پیاوێک لە بەنی كیلاب و زەیدی طائیش، پاشان پیاوێک لە بەنی نەهبان، قورەیشەكان توڕە بوون «جارێكی تر وتی: پیاوماقوڵانی**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٥٣ و ٦٠٠٦ و ٦٠٠٧، ومسلم: ٢٩٨٩، والترمذي: ١٩٦٩، وإبن ماجه: ٢١٤٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٤٤ و ٤٣٥١ و ٤٦٦٧ و ٧٤٣٢، ومسلم: ١٤٣ و ١٠٦٤/١٤٤، وأبو داود: ٤٧٦٤، وإبن ماجه: ١٦٩.




قورەیش تورە بوون» وتیان: بەشی پیاوماقوڵانی نەجد دەدەی و ئێمە بێبەش دەکەی، فەرمووی: من بۆیە ئەوەم پێدان لەناو بچن، پیاوێکی ڕیش پڕو ڕومەت بەرزو چاو بچووک و ناوچاو بەرزی سەرتاشراو هات وتی: لەخوا بترسە ئەی موحەممەد، فەرمووی: ئەگەر سەرپێچی خوا بکەم ئیتر کێ گوێڕایەڵی دەکات، ئایا خوا منی کردوە بە ئەمینی سەر زەوی ئێوە نامکەن بە ئەمین، پاشان پیاوەکە پشتی هەڵکردو ڕۆیشت، پیاوێک لەناو خەڵکەکە داوای کرد پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی بدات بیکوژێ، ئەویش خالدی کوڕی وەلید بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە پشتی ئەم پیاوە خەڵکێک دێنە دنیاوە قورئان دەخوێنن لە قوڕگیان تێپەر ناکات، ئەهلی ئیسلام دەکوژن و واز لە ئەهلی بتپەرستی دێنن، لە ئیسلام دەردەچن وەکو چۆن تیر لە کەوان دەردەچێ، ئەگەر بگەم پێیان وەکو عاد دەیانکوژم.

## بەخشین بدرێ بەو کەسەی نێوان دوو کۆمەڵ چاک دەکات و ئەرکیان دەخاتە ئەستۆ

**٢٥٧٩-** «عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ مُخَارِقٍ ﷺ قَالَ: تَحَمَّلْتُ حَمَالَةً، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَسَأَلْتُهُ فِيهَا فَقَالَ: إِنَّ الْمَسْأَلَةَ لَا تَحِلُّ، إِلَّا لِثَلَاثَةٍ رَجُلٍ تَحَمَّلَ بِحَمَالَةٍ بَيْنَ قَوْمٍ فَسَأَلَ فِيهَا حَتَّى يُؤَدِّيَهَا، ثُمَّ يُمْسِكَ»[١].

واتە: قەبیصەی کوڕی موخاریق ﷺ دەڵێ: ئەرکێکم خستە ئەستۆی خۆم (لە خوێن بایی یان چارەسەر کردنی نێوان دوو کۆمەڵ)، هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ داوای یارمەتیم لێ کرد، فەرمووی: (دواکردن حەڵاڵ نیە مەگەر بۆ سێ پیاو، پیاوێک ئاشتەوایی نێوان دوو کۆمەڵی خستبێتە ئەستۆی خۆی بە بڕێک لە سامان، داوا بکات تا دایداتەوە، پاشان دەستبگرێتەوە.

**٢٥٨٠-** «عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ مُخَارِقٍ ﷺ قَالَ: تَحَمَّلْتُ حَمَالَةً فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَسْأَلُهُ فِيهَا فَقَالَ: أَقِمْ يَا قَبِيصَةُ حَتَّى تَأْتِيَنَا الصَّدَقَةُ، فَنَأْمُرَ لَكَ، قَالَ: ثُمَّ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا قَبِيصَةُ إِنَّ الصَّدَقَةَ لَا تَحِلُّ إِلَّا لِأَحَدِ ثَلَاثَةٍ: رَجُلٍ تَحَمَّلَ حَمَالَةً، فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَ قِوَامًا مِنْ عَيْشٍ، أَوْ سِدَادًا مِنْ عَيْشٍ، وَرَجُلٍ أَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ، فَاجْتَاحَتْ مَالَهُ، فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ حَتَّى

---

(١) صحيح.

يُصِيبَهَا ثُمَّ يُمْسِكَ، وَرَجُلٍ أَصَابَتْهُ فَاقَةٌ حَتَّى يَشْهَدَ ثَلَاثَةٌ مِنْ ذَوِي الْحِجَا مِنْ قَوْمِهِ قَدْ أَصَابَتْ فُلَانَاً فَاقَةٌ فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَ قِوَاماً مِنْ عَيْشٍ، أَوْ سِدَاداً مِنْ عَيْشٍ، فَمَا سِوَى هَذَا مِنَ الْمَسْأَلَةِ يَا قَبِيصَةُ؟ سُحْتٌ يَأْكُلُهَا صَاحِبُهَا سُحْتَاً»[١].

**واتە: قەبیصەی کوڕی موخاریق ﷺ دەڵێ: ئەرکێکم خستە ئەستۆی خۆم (لە خوێن بایی یان چارەسەر کردنی نێوان دوو کۆمەڵ)، هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوای یارمەتیم لێ کرد، فەرمووی: چاوەڕوان بە ئەی قەبیصە هەتا بەخشینمان بۆ دێت و دەیدەین پێت، پاشان فەرمووی: ئەی قەبیصە بەخشین تەنها بۆ سێ کەس دروستە: پیاوێک ئاشتەوایی نێوان دوو کۆمەڵی خستبێتە ئەستۆی خۆی بە بڕێک لە سامان، دروستە بۆی داوا بکات تا کەمو کوڕیەکەی پڕ دەکاتەوە، وە پیاوێک ماڵەکەی لە دەست چووبێ (بەهۆی سوتان یان کەوتنە ژێر ئاو) ئەوە حەڵاڵە بۆی داوا بکات تا بەدەستی دێنێتەوە، پاشان خۆی دەگرێتەوە لە داواکردن، کەسێکیش تووشی هەژاری بووبێ تا سێ کەسی ژیر لە کەسوکارەکەی شایەتی بۆ بدەن بڵێن فلانەکەس تووشی هەژاری بووە، ئەوە حەڵاڵ بۆی داوا بکات تا کەمو کوڕیەکانی پڕ دەکاتەوە، جگە لەمانە ئەی قەبیصە ناڕەوا و حەرامە؟ خاوەنەکەی بە حەرامی دەیخوا.**

## بەخشین بەسەر هەتیودا

**٢٥٨١** - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: جَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ، وَجَلَسْنَا حَوْلَهُ فَقَالَ: إِنَّمَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ مِنْ بَعْدِي، مَا يُفْتَحُ لَكُمْ مِنْ زَهْرَةِ، وَذَكَرَ الدُّنْيَا، وَزِينَتَهَا، فَقَالَ رَجُلٌ: أَوَ يَأْتِي الْخَيْرُ بِالشَّرِّ؟ فَسَكَتَ عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقِيلَ لَهُ: مَا شَأْنُكَ؟ تُكَلِّمُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَلَا يُكَلِّمُكَ قَالَ: وَرَأَيْنَا أَنَّهُ يُنْزَلُ عَلَيْهِ فَأَفَاقَ يَمْسَحُ الرُّحَضَاءَ وَقَالَ: أَشَاهِدٌ السَّائِلُ إِنَّهُ لَا يَأْتِي الْخَيْرُ بِالشَّرِّ وَإِنَّ مِمَّا يُنْبِتُ الرَّبِيعُ يَقْتُلُ، أَوْ يُلِمُّ إِلَّا آكِلَةُ الْخَضِرِ، فَإِنَّهَا أَكَلَتْ حَتَّى إِذَا امْتَدَّتْ خَاصِرَتَاهَا، اسْتَقْبَلَتْ عَيْنَ الشَّمْسِ فَثَلَطَتْ ثُمَّ بَالَتْ ثُمَّ رَتَعَتْ، وَإِنَّ هَذَا الْمَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، وَنِعْمَ صَاحِبُ الْمُسْلِمِ، هُوَ إِنْ أَعْطَى مِنْهُ الْيَتِيمَ، وَالْمِسْكِينَ، وَابْنَ السَّبِيلِ، وَإِنَّ الَّذِي يَأْخُذُهُ بِغَيْرِ حَقِّهِ، كَالَّذِي يَأْكُلُ وَلَا يَشْبَعُ، وَيَكُونُ عَلَيْهِ شَهِيداً يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٤٤، وأبو داود: ١٦٤٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٢١ و ١٤٦٥ و ٢٨٤٢ و ٦٤٢٧، ومسلم: ١٢١ و ١٠٥٢/١٢٣، وإبن ماجه: ٣٩٩٥.




**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر دانیشت و ئێمەش لەگەڵیدا دانیشتین، فەرمووی: بێگومان ئەوەی لێی دەترسم لەدوای خۆم ئەوەیە جوانی ڕازاوەیی دنیاتان بەڕودا بکرێتەوە، پیاوێک وتی: ئایا خێر شەڕ بەدوای خۆیدا دێنێ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ بوو، (وەحی بۆ دابەزی) بە کابرا وترا: ئەوە چیتە؟ قسەت لەگەڵ پێغەمبەری خوا کرد بەڵام ئەو قسەی لەگەڵت نەکرد، وتی: وامان زانی وەحی بۆ دێت، پاشان عارەقی ناوچاوانی سڕی و فەرمووی: نیشانی پرسیارکەر دەدەم چاکە خراپە بەدوای خۆیدا ناهێنێ، بەڵام ئەو لەوەڕەی جۆگەی ئاو (کە لە ڕوبارەوە دێت) سەوزی دەکات ئاژەڵ دەکوژێ (بەهۆی ئەوەی ئەو سەوزاییە دەبینێ بەبێ ئاگایی هەر دەخوات) یان نزیکی مردنی دەکاتەوە، جگە لەو ئاژەڵە نەبێت کە سەوزەو لەوەڕ دەخوات، تا هەردوو کەلەکەی دەئاوسێت، پاشان خۆی دەداتە بەر خۆر (خواردنەکە هەڵدێنێتەوە بۆ ناو دەمی و کاوێژی پێ دەکات و لەزەت لەو کاوێژە وەردەگرێ) ئینجا پیسی و میز دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ لەوەڕەکە، بەڕاستی ماڵی دنیا سەوزو شرینە، چاکترین خاوەن ماڵ و سامانی موسڵمان ئەوکەسەیە بەشی هەتیو و هەژارو ڕێبواری لێبدات، بەڕاستی ئەوکەسەی بە غەیری حەقی خۆی سامانی دنیا بەدەست دەخا وەکو ئەوکەسە وایە بخوا و تێر نەبێ، ئەو ماڵەش دەبێتە شایەت لەسەری لە ڕۆژی دواییدا.**

## بەخشین بەسەر کەسە نزیکەکان

**٢٥٨٢-** «عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ الصَّدَقَةَ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ، وَعَلَى ذِي الرَّحِمِ اثْنَتَانِ صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ»(١).

**واتە: سەلمانی کوڕی عامر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەخشین بەسەر هەژاراندا خێرو چاکەیە، وە بەسەر خاوەن ڕەحم و بەبەزەییەکاندا دوانە: هەم خێرو چاکەیە هەم پەیوەندی خزمایەتیە.**

**٢٥٨٣** - «عَنْ زَيْنَبَ، امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِلنِّسَاءِ: تَصَدَّقْنَ وَلَوْ مِنْ حُلِيِّكُنَّ، قَالَتْ: وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ خَفِيفَ ذَاتِ الْيَدِ، فَقَالَتْ لَهُ: أَيَسَعُنِي أَنْ أَضَعَ صَدَقَتِي

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٦٥٨، وإبن ماجه: ١٨٤٤.

فِيكَ وَفِي بَنِي أَخٍ لِي يَتَامَى، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: سَلِي عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَتْ: فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَإِذَا عَلَى بَابِهِ امْرَأَةٌ مِنَ الْأَنْصَارِ يُقَالُ لَهَا: زَيْنَبُ تَسْأَلُ عَمَّا أَسْأَلُ عَنْهُ، فَخَرَجَ إِلَيْنَا بِلَالٌ، فَقُلْنَا لَهُ: انْطَلِقْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَسَلْهُ عَنْ ذَلِكَ، وَلَا تُخْبِرْهُ مَنْ نَحْنُ، فَانْطَلَقَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: مَنْ هُمَا؟ قَالَ: زَيْنَبُ قَالَ: أَيُّ الزَّيَانِبِ؟ قَالَ: زَيْنَبُ امْرَأَةُ عَبْدِ اللَّهِ وَزَيْنَبُ الْأَنْصَارِيَّةُ قَالَ: نَعَمْ، لَهُمَا أَجْرَانِ: أَجْرُ الْقَرَابَةِ، وَأَجْرُ الصَّدَقَةِ»[1].

**واتە: زەینەب خێزانی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئافرەتانی فەرموو: ببەخشن ئەگەرچی لە خشڵەكانتانیش بێت، وتی: عەبدوڵڵا دەستی كورت بوو، خێزانی پێی وت: ئایا دەتوانم بەخشینەكەم بدەم بە تۆو بە برازاكەم كە هەتیوە، عەبدوڵڵا وتی: پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ بكە لەو بارەوە، وتی: ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لەبەر دەرگاكەی ئافرەتێكی ئەنصاری وەستا بوو پێی دەوترا: زەینەب، ئەویش هەمان پرسیاری منی دەكرد، بیلال هات بۆ لامان پێمان وت: برۆ بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو پرسیارەی لێ بكە، پێی مەڵێ ئێمە كێین، ئەویش ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئەو دووانە كێن)؟ وتی: زەینەب، فەرمووی: كام زەینەبەكان؟ وتی: زەینەبی خێزانی عەبدوڵڵا وە زەینەبی ئەنصاری، فەرمووی: بەڵێ، دوو پاداشتیان بۆ هەیە: پاداشتی خزمایەتی و پاداشتی بەخشین.**

## داواكردن و سواڵكردن لە خەڵك

**٢٥٨٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَأَنْ يَحْتَزِمَ أَحَدُكُمْ حُزْمَةَ حَطَبٍ عَلَى ظَهْرِهِ فَيَبِيعَهَا خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَسْأَلَ رَجُلاً فَيُعْطِيَهُ، أَوْ يَمْنَعَهُ»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەكێک لە ئێوە گورزەیەک یان چارۆكەیەک دار بخاتە سەر شانی و بیهێنێ و بیفرۆشێ چاكترە بۆی لەوەی داوا لە كەسێک بكات، پێی بدات یان پێی نەدات.**

**٢٥٨٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَسْأَلُ حَتَّى يَأْتِيَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَيْسَ فِي وَجْهِهِ مُزْعَةٌ مِنْ لَحْمٍ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٦٦، ومسلم: ٤٥ و ١٠٠٠/٤٦، والترمذي: ٦٣٥ و ٦٣٦، وإبن ماجه: ١٨٣٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٧٠ و ١٤٨٠ و ٢٠٧٤ و ٢٣٧٤، ومسلم: ١٠٦ و ١٠٤٢/١٠٧، والترمذي: ٦٨٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٧٤ و ١٤٧٥، ومسلم: ١٠٣ و ١٠٤٠/١٠٤.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام پیاو داواو سواڵ دەکات، تا لە ڕۆژی دواییدا دێت پارچە گۆشتێک بەڕوخساریەوە نەماوە.

**٢٥٨٦-** «عَنْ عَائِذِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَسَأَلَهُ فَأَعْطَاهُ، فَلَمَّا وَضَعَ رِجْلَهُ عَلَى أُسْكُفَّةِ الْبَابِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَوْ تَعْلَمُونَ مَا فِي الْمَسْأَلَةِ، مَا مَشَى أَحَدٌ إِلَى أَحَدٍ يَسْأَلُهُ شَيْئاً»(١).

واتە: عائیزی کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ داوای کرد، ئەویش پێی بەخشی، کاتێ قاچی خستە سەر لێوار دەرگاکە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر بتانزانیایە چی لەداوا کردندا هەیە، هیچ کەسێک نەدەچوو بۆ لای کەسێکی تر داوا بکات.

## داواکردن لە پیاوچاکان

**٢٥٨٧-** «عَنِ ابْنِ الْفِرَاسِيِّ ﷺ، أَنَّ الْفِرَاسِيَّ، قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَسْأَلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: لَا وَإِنْ كُنْتَ سَائِلاً، لَا بُدَّ فَاسْأَلِ الصَّالِحِينَ»(٢).

واتە: ئیبنو لفیراسی ﷺ دەگێڕێتەوە: فیراسی بە پێغەمبەری خوا ﷺ وت: ئەی پێغەمبەر لە غەیری خوا داوا بکەم؟ فەرمووی: نا، بەڵام تۆ ئەگەر هەر ناچار بووی داوا بکەی، ئەوە داوا لە پیاوچاکان بکە.

## خۆپاراستن لە داواکردن یان سواڵکردن

**٢٥٨٨-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ نَاساً مِنَ الْأَنْصَارِ، سَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَأَعْطَاهُمْ، ثُمَّ سَأَلُوهُ، فَأَعْطَاهُمْ حَتَّى إِذَا نَفِدَ مَا عِنْدَهُ، قَالَ: مَا يَكُونُ عِنْدِي مِنْ خَيْرٍ، فَلَنْ أَدَّخِرَهُ عَنْكُمْ، وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللَّهُ ﷻ، وَمَنْ يَصْبِرْ، يُصَبِّرْهُ اللَّهُ، وَمَا أُعْطِيَ أَحَدٌ عَطَاءً هُوَ خَيْرٌ، وَأَوْسَعُ مِنَ الصَّبْرِ»(٣).

---

(١) حسن.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٦٤٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٦٩ و ١٤٧٠، ومسلم: ١٠٥٣، وأبو داود: ١٦٤٤، والترمذي: ٢٠٢٤.




واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: کۆمەڵە پیاوێک لە ئەنصارەکان، داوایان کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی بەخشین، پاشان داوایان لێ کرد، دیسان پێی بەخشین تا هیچی لا نەما، فەرمووی: هەر خێرێکم لا بێت هەرگیز لێتانی هەڵناگرم، هەرکەس خۆی بپارێزێ لە داواکردن، خوا ﷻ دەیپارێزێ، هەرکەسیش ئارام بگرێ، خوا ئارامی پێدەبەخشێ، هیچ کەسێک نیە شتێکی پێبەخشرابێت چاکترو فراوانتر بێت لە ئارامی.

**٢٥٨٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَأَنْ يَأْخُذَ أَحَدُكُمْ حَبْلَهُ فَيَحْتَطِبَ عَلَى ظَهْرِهِ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَأْتِيَ رَجُلاً أَعْطَاهُ اللَّهُ ﷻ مِنْ فَضْلِهِ، فَيَسْأَلَهُ أَعْطَاهُ، أَوْ مَنَعَهُ»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بەدەستە ئەگەر یەکێک لە ئێوە گوریسەکەی ببات گورزەیەک دار بخاتە سەر شانی و بیهێنێ، چاکترە بۆی لەوەی داوا لە کەسێک بکات کە خوا ﷻ بە فەزڵی خۆی پێی بەخشیوە، پێی ببەخشێ یان پێی نەدات.

## فەزڵ و چاکەی ئەو کەسەی داوا لە خەڵکی ناکات

**٢٥٩٠-** «عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ يَضْمَنْ لِي وَاحِدَةً وَلَهُ الْجَنَّةُ، «قَالَ يَحْيَى: هَاهُنَا كَلِمَةٌ مَعْنَاهَا» أَنْ لَا يَسْأَلَ النَّاسَ شَيْئًا»(٢).

واتە: ئەوبان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکەس گرنتی یەکێک لەمانەم بۆ بکات بەهەشتی بۆ هەیە «یەحیا (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی فەرموودەکە) وتی: لێرەدا باسی وشەیەکی کرد ماناکەی ئەوەیە» داوای هیچ لە خەڵکی نەکات.

**٢٥٩١-** «عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ مُخَارِقٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا تَصْلُحُ الْمَسْأَلَةُ إِلَّا لِثَلَاثَةٍ رَجُلٍ: أَصَابَتْ مَالَهُ جَائِحَةٌ، فَيَسْأَلُ حَتَّى يُصِيبَ سِدَاداً مِنْ عَيْشٍ، ثُمَّ يُمْسِكُ، وَرَجُلٍ تَحَمَّلَ حَمَالَةً، فَيَسْأَلُ حَتَّى يُؤَدِّيَ إِلَيْهِمْ حَمَالَتَهُمْ، ثُمَّ يُمْسِكُ عَنِ الْمَسْأَلَةِ، وَرَجُلٍ يَحْلِفُ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ مِنْ قَوْمِهِ مِنْ ذَوِي الْحِجَا بِاللَّهِ، لَقَدْ حَلَّتِ الْمَسْأَلَةُ لِفُلَانٍ، فَيَسْأَلُ حَتَّى يُصِيبَ قِوَاماً مِنْ مَعِيشَةٍ، ثُمَّ يُمْسِكُ عَنِ الْمَسْأَلَةِ، فَمَا سِوَى ذَلِكَ سُحْتٌ»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٨٣٧.

(٣) صحيح.




واتە: قەبیصەی کوڕی مەخاریق ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: داواکردن گونجاو نیە مەگەر بۆ سێ پیاو: پیاوێک ماڵەکەی لە دەست چووبێ (بەهۆی سوتان یان کەوتنە ژێر ئاو) داوا بکات تا کەمو کوڕیەکەی پڕ دەکاتەوە، پاشان خۆی بگرێتەوە لە داواکردن، وە پیاوێک ئاشتەوایی نێوان دوو کۆمەڵی خستبێتە ئەستۆی خۆی بە بڕێک لە سامان، دروستە بۆی داوا بکات تا کەمو کوڕیەکەی پڕ دەکاتەوە، پاشان خۆی بگرێتەوە لە داواکردن، وە پیاوێک سێ کەسی ژیر لە کەسوکارەکەی سوێندی بۆ بخۆن و بڵێن بەڕاستی فلانەکەس تووشی هەژاری بووە، داوا بکات تا کەمو کوڕیەکانی پڕ دەکاتەوە، پاشان خۆی دەگرێتەوە لە داواکردن، جگە لەوانە ناڕەواو حەرامە.

## سنووری دەوڵەمەندی

**٢٥٩٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ سَأَلَ وَلَهُ مَا يُغْنِيهِ، جَاءَتْ خُمُوشَاً، أَوْ كُدُوحَاً فِي وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ: وَمَاذَا يُغْنِيهِ، أَوْ مَاذَا أَغْنَاهُ؟ قَالَ: خَمْسُونَ دِرْهَمَاً، أَوْ حِسَابُهَا مِنَ الذَّهَبِ»[١].

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس داوا بکات و ئەوەندەشی هەبێت بێنیاز بێت لە داواکرد، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا بە ڕوخسارێکی ڕوشێنراوە دێت، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا: چی دەوڵەمەندو بێنیازی دەکات لە داواکردن؟ فەرمووی: پەنجا درهەم، یان ئەندازەی ئەوە ئاڵتونی هەبێت.

## بابەت: پێداگری لە داواکردندا

**٢٥٩٣-** «عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا تُلْحِفُوا فِي الْمَسْأَلَةِ، وَلَا يَسْأَلْنِي أَحَدٌ مِنْكُمْ شَيْئَاً، وَأَنَا لَهُ كَارِهٌ، فَيُبَارَكَ لَهُ فِيمَا أَعْطَيْتُهُ»[٢].

واتە: موعاویە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێداگری و زۆر مەکەن لە داواکردندا، با یەکێک لە ئێوە داوای شتێک لەمن نەکات کە پێم ناخۆشە، خوا فەڕو بەرەکەت دەخاتە ناو ئەوەی من پێی دەبەخشم.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٦٢٦، والترمذي: ٦٥١، وإبن ماجه: ١٨٤٠.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٣٨.

## ئەو کەسە کێیە پێداگری دەکات لە داواکردندا

**٢٥٩٤-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ سَأَلَ وَلَهُ أَرْبَعُونَ دِرْهَمَاً، فَهُوَ الْمُلْحِفُ»[١].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە: لە باوکی، لە باپیرەی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس داوا بکات و چل دەرهەمی هەبێت ئەوە پێداگری کردوە.**

**٢٥٩٥-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: سَرَّحَتْنِي أُمِّي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَتَيْتُهُ وَقَعَدْتُ، فَاسْتَقْبَلَنِي، وَقَالَ: مَنِ اسْتَغْنَى: أَغْنَاهُ اللَّهُ ﷻ، وَمَنِ اسْتَعَفَّ: أَعَفَّهُ اللَّهُ ﷻ، وَمَنِ اسْتَكْفَى: كَفَاهُ اللَّهُ ﷻ، وَمَنْ سَأَلَ وَلَهُ قِيمَةُ أُوقِيَّةٍ: فَقَدْ أَلْحَفَ، فَقُلْتُ: نَاقَتِي الْيَاقُوتَةُ، خَيْرٌ مِنْ أُوقِيَّةٍ فَرَجَعْتُ، وَلَمْ أَسْأَلْهُ»[٢].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: دایکم ناردمی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ منیش چووم بۆ لای و لە خزمەتیدا دانیشتم، ڕووی تێکردم، فەرمووی: ئەوەی خۆی دەوڵەمەندو بێنیازی بکات: خوا ﷻ دەوڵەمەندو بێنیازی دەکات لە هەموو خەڵکی، ئەوەشی خۆی بپارێزی: خوا ﷻ دەیپارێزی، ئەوەشی ڕازی بێت بەوەی هەیەتی: خوا ﷻ ڕازی دەکات، ئەوەشی داوا بکات بە قەد ئوقیەیەکی هەبێت (کە دەکاتە چل درهەم) ئەوە پێداگری کردوە، وتم: وشترە گەوهەرەکەم چاکترە لە ئوقیەیەک بۆیە گەڕامەوەو داوام نەکرد.**

## ئەگەر کەسێ پارەو درهەمی نەبوو بەڵام هاوشێوەی ئەوەی هەبوو

**٢٥٩٦-** «عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي أَسَدٍ قَالَ: نَزَلْتُ أَنَا وَأَهْلِي، بِبَقِيعِ الْغَرْقَدِ فَقَالَتْ لِي أَهْلِي: اذْهَبْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَسَلْهُ لَنَا شَيْئَاً نَأْكُلُهُ، فَذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَوَجَدْتُ عِنْدَهُ رَجُلاً يَسْأَلُهُ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا أَجِدُ مَا أُعْطِيكَ، فَوَلَّى الرَّجُلُ عَنْهُ وَهُوَ مُغْضَبٌ، وَهُوَ يَقُولُ: لَعَمْرِي إِنَّكَ لَتُعْطِي مَنْ شِئْتَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّهُ لَيَغْضَبُ عَلَيَّ أَنْ لَا

---

(١) حسن صحيح.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ١٦٢٨.

أَجِدَ مَا أُعْطِيهِ، مَنْ سَأَلَ مِنْكُمْ وَلَهُ أُوقِيَّةٌ أَوْ عِدْلُهَا، فَقَدْ سَأَلَ إِلْحَافاً، قَالَ الْأَسَدِيُّ: فَقُلْتُ لَلَقْحَةٌ لَنَا خَيْرٌ مِنْ أُوقِيَّةٍ، وَالْأُوقِيَّةُ: أَرْبَعُونَ دِرْهَمَاً، فَرَجَعْتُ، وَلَمْ أَسْأَلْهُ، فَقَدِمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بَعْدَ ذَلِكَ، شَعِيرٌ، وَزَبِيبٌ، فَقَسَّمَ لَنَا مِنْهُ حَتَّى أَغْنَانَا اللَّهُ ﷻ»[1].

**واتە: عەطائی کوڕی یەسار ﷺ دەگێڕێتەوە: لە پیاوێک لە بەنی ئەسەد، وتی: من و خێزانەکەم دابەزینە بەقیعی غەرقەد، خێزانەکەم وتی: بڕۆ بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوای شتێکی لێ بکە با بیخۆین، ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بینیم پیاوێک لایەتی و داوای لێ دەکات، پێغەمبەریش فەرمووی: هیچم لا نیە بیدەم پێت، پیاوەکە پشتی هەڵکرد بە تورەییەوە دەیوت: سوێند بێت تۆ هەرکەس خۆت بتەوێ پێی دەبەخشی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی ئەو لە من تورە دەبێ لەسەر ئەوەی هیچم لا نیە بیدەم پێی، هەرکەس لە ئێوە داوا بکات و ئوقیەیەکی هەبێت، یان هاوشێوەی ئەوە پێداگری کردوە، ئەسەدی وتی: وشترێکی شیردەرمان هەیە باشتر لە ئوقیەیەک، ئوقیەش: چل درهەمە، منیش گەڕامەوە و داوام لێ نەکرد، دوای ئەوە جۆو مێوژیان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، دابەشی کرد بەسەرماندا هەتا خوا ﷻ دەوڵەمەندی کردین.**

**٢٥٩٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ، وَلَا لِذِي مِرَّةٍ سَوِيٍّ»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەخشین حەڵاڵ نیە بۆ دەوڵەمەند، هەروەها بۆ کەسێکیش توانای کار کردنی هەبێت و لەشی ساغ و سەلامەت بێت.**

## داواکردنی کەسێک توانای کارکردن پەیدا کردنی بژێوی هەبێت

**٢٥٩٨-** «عَن عُبَيْدِ اللَّهِ بْنُ عَدِيِّ بْنِ الْخِيَارِ ﷺ، أَنَّ رَجُلَيْنِ حَدَّثَاهُ أَنَّهُمَا: أَتَيَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَسْأَلَانِهِ مِنَ الصَّدَقَةِ؟ فَقَلَّبَ فِيهِمَا الْبَصَرَ، «وَقَالَ مُحَمَّدٌ: بَصَرَهُ» فَرَآهُمَا جَلْدَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنْ شِئْتُمَا، وَلَا حَظَّ فِيهَا لِغَنِيٍّ، وَلَا لِقَوِيٍّ مُكْتَسِبٍ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٦٢٧.

(٢) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٨٣٩.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٦٣٣.




واتە: عوبەیدوڵڵای کوڕی عەدی کوڕی خیار ﷺ دەگێڕێتەوە: دوو پیاو بۆیان باس کرد هەردوکیان هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوایان لێ دەکرد لە خێرو صەدەقە بەشیان بدات؟ تەماشای کردن، بینی بەهێزن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ویستتان، ئەمە نە بەشی دەوڵەمەندی تێدایە، نە بەشی بەهێزێک بتوانێ کەسابەت بکات.

## داواکردنی لە کەسێکی خاوەن دەسەڵات

**٢٥٩٩-** «عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ الْمَسَائِلَ كُدُوحٌ، يَكْدَحُ بِهَا الرَّجُلُ وَجْهَهُ، فَمَنْ شَاءَ كَدَحَ وَجْهَهُ، وَمَنْ شَاءَ تَرَكَ، إِلَّا أَنْ يَسْأَلَ الرَّجُلُ ذَا سُلْطَانٍ، أَوْ شَيْئاً لَا يَجِدُ مِنْهُ بُدّاً»[١].

واتە: سەمورەی کوڕی جوندوب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی داواکردن ڕوشێنەرە، مرۆڤ بەو داواکردنە ڕوخساری دەڕوشێنی، هەرکەس ویستی ڕوخساری دەڕوشێنێ، هەرکەسیش ویستی وازی لێدێنێ، مەگەر پیاوێ داوای (مافی خۆی) لە خاوەن دەسەڵات بکات، یان شتێک بەهیچ شێوەیەک بەدەستی نەهێنێ، (واتە: ناچار بێت و چارەسەری نەبێت، وەکو برسێتی و نەبوونی).

## داواکردن لە کارێکدا ناچار بێت داوا بکات

**٢٦٠٠-** «عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْمَسْأَلَةُ كَدٌّ يَكُدُّ بِهَا الرَّجُلُ وَجْهَهُ، إِلَّا أَنْ يَسْأَلَ الرَّجُلُ سُلْطَاناً، أَوْ فِي أَمْرٍ لَا بُدَّ مِنْهُ»[٢].

واتە: سەمورەی کوڕی جوندوب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: داواکردن ڕوشێنەرە، مرۆڤ بەو داواکردنە ڕوخساری دەڕوشێنی، مەگەر پیاوێ داوای (مافی خۆی) لە خاوەن دەسەڵات بکات، یان لە کارێکدا هەر دەبێ داوا بکات.

**٢٦٠١ -** «عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ، فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ، فَأَعْطَانِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا حَكِيمُ إِنَّ هَذَا الْمَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، فَمَنْ أَخَذَهُ

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٦٣٩، والترمذي: ٦٨١.

(٢) صحيح.





بِطِيبِ نَفْسٍ، بُورِكَ لَهُ فِيهِ، وَمَنْ أَخَذَهُ بِإِشْرَافِ نَفْسٍ، لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، وَكَانَ كَالَّذِي يَأْكُلُ، وَلَا يَشْبَعُ، وَالْيَدُ الْعُلْيَا، خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى»[١].

**واتە: حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ دەڵێ: داوام کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی بەخشیم، پاشان داوام لێ کرد، پێی بەخشیم، پاشان داوام کرد پێی بەخشیم، پاشان فەرمووی: ئەی حەکیم، بەڕاستی ئەم ماڵ و سامانە شرینە، هەرکەس بە ڕەزامەندی و بێ داواکردن وەری بگرێ، بەرەکەتی بۆ تێدەکرێت، هەرکەسیش وەری بگرێ و چاو برسی بێت، بەرەکەتی بۆ تێناکرێت، ئەوەش وەکو ئەوکەسەی لێ دێت کە هەر دەخواو تێر نابێت، وە دەستی سەرەوە چاکترە لە دەستی خوارەوە.**

**٢٦٠٢-** «عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ، فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ، فَأَعْطَانِي، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا حَكِيمُ إِنَّ هَذَا الْمَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، مَنْ أَخَذَهُ بِسَخَاوَةِ نَفْسٍ، بُورِكَ لَهُ فِيهِ، وَمَنْ أَخَذَهُ بِإِشْرَافِ النَّفْسِ، لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، وَكَانَ كَالَّذِي يَأْكُلُ، وَلَا يَشْبَعُ، وَالْيَدُ الْعُلْيَا، خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى»[٢].

**واتە: حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ دەڵێ: داوام کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی بەخشیم، پاشان داوام لێ کرد، پێی بەخشیم، پاشان داوام کرد پێی بەخشیم، پاشان فەرمووی: ئەی حەکیم، بەڕاستی ئەم ماڵ و سامانە شرینە، هەرکەس بە ڕەزامەندی و بێ داواکردن وەری بگرێ، بەرەکەتی بۆ تێدەکرێت، هەرکەسیش وەری بگرێ و چاو برسی بێت، بەرەکەتی بۆ تێناکرێت، ئەوەش وەکو ئەوکەسەی لێ دێت کە هەر دەخواو تێر نابێت، وە دەستی سەرەوە چاکترە لە دەستی خوارەوە.**

**٢٦٠٣-** «عَن حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ، فَأَعْطَانِي، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا حَكِيمُ إِنَّ هَذَا الْمَالَ حُلْوَةٌ، فَمَنْ أَخَذَهُ بِسَخَاوَةِ نَفْسٍ، بُورِكَ لَهُ فِيهِ، وَمَنْ أَخَذَهُ بِإِشْرَافِ نَفْسٍ، لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، وَكَانَ كَالَّذِي يَأْكُلُ، وَلَا يَشْبَعُ، وَالْيَدُ الْعُلْيَا، خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، قَالَ حَكِيمٌ: فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ، لَا أَرْزَأُ أَحَداً بَعْدَكَ حَتَّى أُفَارِقَ الدُّنْيَا بِشَيْءٍ»[٣].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح.**

**(٣) صحيح.**




واتە: حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ دەڵێ: داوام کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی بەخشیم، پاشان داوام لێ کرد، پێی بەخشیم، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی حەکیم، بەڕاستی ئەم ماڵ و سامانە شرینە، هەرکەس بە ڕەزامەندی و بێ داواکردن وەری بگرێ، بەرەکەتی بۆ تێدەکرێت، هەرکەسیش وەری بگرێ و چاو برسی بێت، بەرەکەتی بۆ تێناکرێت، ئەوەش وەکو ئەوکەسەی لێ دێت کە هەر دەخواو تێر نابێت، وە دەستی سەرەوە چاکترە لە دەستی خوارەوە. حەکیم وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، سوێند بەو خوایەی تۆی بەحەق ڕەوانە کردوە، لە دوای تۆ داوا لەهیچ کەس ناکەم تا لەدنیا دەردەچم.

## ئەو کەسەی خوا ﷻ ماڵ و سامانێکی پێ دەدات بەبێ داواکردن

**٢٦٠٤-** «عَنِ ابْنِ السَّاعِدِيِّ الْمَالِكِيِّ قَالَ: اسْتَعْمَلَنِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَلَى الصَّدَقَةِ، فَلَمَّا فَرَغْتُ مِنْهَا فَأَدَّيْتُهَا إِلَيْهِ، أَمَرَ لِي بِعُمَالَةٍ، فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّمَا عَمِلْتُ لِلَّهِ ﷻ، وَأَجْرِي عَلَى اللَّهِ ﷻ، فَقَالَ: خُذْ مَا أَعْطَيْتُكَ، فَإِنِّي قَدْ عَمِلْتُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ لَهُ: مِثْلَ قَوْلِكَ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا أُعْطِيتَ شَيْئاً مِنْ غَيْرِ أَنْ تَسْأَلَ، فَكُلْ، وَتَصَدَّقْ»[١].

واتە: ئیبنو ساعیدی مالکی دەڵێ: عومەری کوڕی خەطاب (خوا لێیان ڕازی بێ) ئەرکی کۆکردنەوەی زەکاتی خستە ئەستۆم، کاتێ لێ بوومەوە زەکاتەکەم برد بۆی، فەرمانی کرد کرێم پێبدرێ، پێم وت: من لە پێناوی خوادا ئەوەم کردوەو پاداشتم لای خوایە، وتی: ئەوەی دەیدەم پێت وەریبگرە، من لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ کارم کرد، بە پێغەمبەرم وت: هەروەکو ئەوەی تۆ بە منت وت، پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: ئەگەر شتێکت پێدرا بەبێ ئەوەی داوای بکەی، بیخۆو و بیکە بە خێر.

**٢٦٠٥-** «عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنُ السَّعْدِيِّ، أَنَّهُ قَدِمَ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا مِنَ الشَّامِ فَقَالَ: أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَعْمَلُ عَلَى عَمَلٍ مِنْ أَعْمَالِ الْمُسْلِمِينَ، فَتُعْطَى عَلَيْهِ عُمَالَةً، فَلَا تَقْبَلُهَا، قَالَ: أَجَلْ إِنَّ لِي أَفْرَاساً، وَأَعْبُداً، وَأَنَا بِخَيْرٍ، وَأُرِيدُ أَنْ يَكُونَ عَمَلِي صَدَقَةً عَلَى الْمُسْلِمِينَ، فَقَالَ: إِنِّي أَرَدْتُ الَّذِي أَرَدْتَ، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ، يُعْطِينِي الْمَالَ، فَأَقُولُ أَعْطِهِ، مَنْ هُوَ أَفْقَرُ إِلَيْهِ مِنِّي،

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧١٦٣، ومسلم: ١١٠ و ١٠٤٥/١١٢، وأبو داود: ١٦٤٧ و ٢٩٤٤.





وَإِنَّهُ أَعْطَانِي مَرَّةً مَالاً، فَقُلْتُ لَهُ، أَعْطِهِ، مَنْ هُوَ أَحْوَجُ إِلَيْهِ مِنِّي، فَقَالَ: مَا آتَاكَ اللَّهُ ﷻ مِنْ هَذَا الْمَالِ مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ، وَلَا إِشْرَافٍ، فَخُذْهُ، فَتَمَوَّلْهُ، أَوْ تَصَدَّقْ بِهِ، وَمَا لَا فَلَا تُتْبِعْهُ نَفْسَكَ»[1].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی سەعدی دەگێڕێتەوە: کە ئەو لە شامەوە ڕۆیشت بۆ لای عومەری کوڕی خەطاب (خوا لێیان ڕازی بێ) ، عومەر پێی وت: هەواڵم پێ گەیشتووە تۆ کارێک ڕادەپەڕێنی لە کاروباری مسوڵمان لەسەر ئەو کارە کرێت پێ دراوە بەڵام تۆ وەرت نەگرتووە، وتی: بەڵێ، من ئەسپێک و بەندەیەکم هەیەو لەشم ساغە، دەمەوێت کارەکەم چاکەیەک بێت بۆ مسوڵمانان، عومەر وتی: منیش ویستم وەکو چۆن تۆ ویستت، پێغەمبەر ﷺ ماڵی پێدەبەخشیم، دەموت: بیدە بە کەسێک لەمن هەژارتر بێت، جارێک ماڵێکی پێدام، پێم وت: بیبەخشە بەوەی لە من زیاتر پێویستی پێیەتی، فەرمووی: هەرماڵێکت بۆ هات لەم ماڵە بەبێ چاوتێبرین و داواکردن وەریبگرە، بۆ خۆت سوودی لێوەربگرە یان بیبەخشە، ئەگەرنا چاوی تێمەبڕە.**

**٢٦٠٦-** «عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنَ السَّعْدِيِّ، أَنَّهُ قَدِمَ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فِي خِلَافَتِهِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: أَلَمْ أُحَدَّثْ أَنَّكَ تَلِي مِنْ أَعْمَالِ النَّاسِ أَعْمَالاً، فَإِذَا أُعْطِيتَ الْعُمَالَةَ رَدَدْتَهَا فَقُلْتُ بَلَى، فَقَالَ عُمَرُ: فَمَا تُرِيدُ إِلَى ذَلِكَ، فَقُلْتُ: لِي أَفْرَاسٌ وَأَعْبُدٌ وَأَنَا بِخَيْرٍ، وَأُرِيدُ أَنْ يَكُونَ عَمَلِي صَدَقَةً عَلَى الْمُسْلِمِينَ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: فَلَا تَفْعَلْ فَإِنِّي كُنْتُ أَرَدْتُ مِثْلَ الَّذِي أَرَدْتَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يُعْطِينِي الْعَطَاءَ، فَأَقُولُ أَعْطِهِ أَفْقَرَ إِلَيْهِ مِنِّي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: خُذْهُ فَتَمَوَّلْهُ، أَوْ تَصَدَّقْ بِهِ مَا جَاءَكَ مِنْ هَذَا الْمَالِ، وَأَنْتَ غَيْرُ مُشْرِفٍ، وَلَا سَائِلٍ فَخُذْهُ، وَمَا لَا فَلَا تُتْبِعْهُ نَفْسَكَ»[2].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی سەعدی دەگێڕێتەوە کە ئەو ڕۆیشت بۆ لای عومەری کوڕی خەطاب (خوا لێیان ڕازی بێ)، عومەر پێی وت: هەواڵم پێ گەیشتووە تۆ کارێک ڕادەپەڕێنی لە کاروباری مسوڵمان لەسەر ئەو کارە کرێت پێ دراوە، بەڵام تۆ وەرت نەگرتووە، (ئەویش) وتی: بەڵێ، عومەر وتی: مەبەستت چیە لەوەدا، وتم: من چەند ئەسپ و بەندەیەکم هەیەو لەشم ساغە، دەمەوێت کارەکەم چاکەیەک بێت بۆ مسوڵمانان، عومەر پێی وت: کاری وامەکە منیش ڕەتم کردەوە وەکو چۆن تۆ ڕەتت کردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەخشینی پێ دەبەخشیم، دەموت: بیبەخشە**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**بە کەسێک لە من هەژارتر بێت، پێم وت: بیبەخشە بەوەی لە من زیاتر پێویستی پێیەتی، فەرمووی: وەریبگرە بۆ خۆد سوودی لێ وەربگرە، یان بیبەخشە، هەرماڵێکت بۆ هات لەم ماڵە بەبێ چاوتێبڕین و داواکردن وەریبگرە، ئەگەرنا چاوی تێمەبڕە.**

**٢٦٠٧-** «عَن عَبْدَ اللَّهِ بْنَ السَّعْدِيِّ، أَنَّهُ قَدِمَ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فِي خِلَافَتِهِ فَقَالَ عُمَرُ: أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَلِي مِنْ أَعْمَالِ النَّاسِ أَعْمَالاً، فَإِذَا أُعْطِيتَ الْعُمَالَةَ كَرِهْتَهَا، قَالَ: فَقُلْتُ: بَلَى، قَالَ: فَمَا تُرِيدُ إِلَى ذَلِكَ، فَقُلْتُ: إِنَّ لِي أَفْرَاساً وَأَعْبُداً، وَأَنَا بِخَيْرٍ وَأُرِيدُ أَنْ يَكُونَ عَمَلِي صَدَقَةً عَلَى الْمُسْلِمِينَ، فَقَالَ عُمَرُ: فَلَا تَفْعَلْ فَإِنِّي كُنْتُ أَرَدْتُ الَّذِي أَرَدْتَ، فَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ، يُعْطِينِي الْعَطَاءَ، فَأَقُولُ: أَعْطِهِ، أَفْقَرَ إِلَيْهِ مِنِّي، حَتَّى أَعْطَانِي مَرَّةً مَالاً، فَقُلْتُ: أَعْطِهِ، أَفْقَرَ إِلَيْهِ مِنِّي، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: خُذْهُ، فَتَمَوَّلْهُ، وَتَصَدَّقْ بِهِ، فَمَا جَاءَكَ مِنْ هَذَا الْمَالِ وَأَنْتَ غَيْرُ مُشْرِفٍ، وَلَا سَائِلٍ فَخُذْهُ، وَمَا لَا فَلَا تُتْبِعْهُ نَفْسَكَ»[1].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی دەگێڕێتەوە: ئەو ڕۆیشت بۆ لای عومەری کوڕی خەطاب (خوا لێیان ڕازی بێ) لە خیلافەتیدا، عومەر پێی وت: هەواڵم پێ گەیشتووە تۆ کارێک ڕادەپەڕێنی لە کاروباری مسوڵمان، ئەگەر لەسەر ئەو کارە کرێت پێ درابێت پێت ناخۆش بووە، وتوویەتی: وتم: بەڵێ، عومەر وتوویەتی: مەبەستت چیە لەوەدا، (دەڵێ) وتم: من چەندین ئەسپ و کۆیلەم هەیەو لەشم ساغە، دەمەوێت کارەکەم چاکەیەک بێت بۆ مسوڵمانان، عومەر وتی: کاری وامەکە منیش ئەوەم ویست کە تۆ ویستت، پێغەمبەری خوا ﷺ بەخشینی پێ دەبەخشیم، دەموت: بیبەخشە بە کەسێک لە من هەژارتر بێت، تا جارێک ماڵێکی پێدام، وتم: بیبەخشە بە کەسێک لەمن هەژارتر بێت، فەرمووی: وەریبگرە بۆ خۆت سوودی لێ وەربگرە، یان بیبەخشە، هەرماڵێکت بۆ هات لەم ماڵە بەبێ چاوتێبڕین و داواکردن وەریبگرە، ئەگەرنا چاوی تێمەبڕە.**

**٢٦٠٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ عُمَر، يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ، يُعْطِينِي الْعَطَاءَ، فَأَقُولُ: أَعْطِهِ، أَفْقَرَ إِلَيْهِ مِنِّي، حَتَّى أَعْطَانِي مَرَّةً مَالاً، فَقُلْتُ لَهُ: أَعْطِهِ، أَفْقَرَ إِلَيْهِ مِنِّي، فَقَالَ: خُذْهُ، فَتَمَوَّلْهُ، وَتَصَدَّقْ بِهِ، وَمَا جَاءَكَ مِنْ هَذَا الْمَالِ وَأَنْتَ غَيْرُ مُشْرِفٍ، وَلَا سَائِلٍ، فَخُذْهُ، وَمَا لَا فَلَا تُتْبِعْهُ نَفْسَكَ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٧٣ و ٧١٦٤، ومسلم: ١٠٤٥.





واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە عومەر بوو وتی: پێغەمبەر ﷺ بەخشینی پێ دەبەخشیم، دەموت: بیبەخشە بە کەسێک لە من هەژارتر بێت، تا جارێک ماڵێکی پێدام، وتم: بیبەخشە بە کەسێک لە من هەژارتر بێت، فەرمووی: وەریبگرە بۆ خۆت سوودی لێ وەربگرە، یان بیبەخشە، هەرماڵێکت بۆ هات لەم ماڵە بەبێ چاوتێبڕین و داواکردن وەریبگرە، ئەگەرنا چاوی تێمەبڕە.

## بابەت: ڕاسپاردنی خانەوادەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر زەکات

**٢٦٠٩-** «عَن رَبِيعَةَ بْنَ الْحَارِثِ قَالَ لِعَبْدِ الْمُطَّلِبِ بْنِ رَبِيعَةَ بْنِ الْحَارِثِ، وَالْفَضْلِ بْنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ رضي الله عنهما: ائْتِيَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقُولَا لَهُ: اسْتَعْمِلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ عَلَى الصَّدَقَاتِ، فَأَتَى عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، وَنَحْنُ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ، فَقَالَ لَهُمَا: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، لَا يَسْتَعْمِلُ مِنْكُمْ أَحَداً عَلَى الصَّدَقَةِ، قَالَ عَبْدُ الْمُطَّلِبِ: فَانْطَلَقْتُ أَنَا وَالْفَضْلُ، حَتَّى أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ لَنَا: إِنَّ هَذِهِ الصَّدَقَةَ، إِنَّمَا هِيَ أَوْسَاخُ النَّاسِ، وَإِنَّهَا لَا تَحِلُّ، لِمُحَمَّدٍ وَلَا لِآلِ مُحَمَّدٍ ﷺ»[1].

واتە: ڕەبیعەی کوڕی حاریث بە عەبدولموطەلیبی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی حاریث و فەزڵی کوڕی عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیبی رضي الله عنهما وت: بڕۆن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێی بڵێن: لەسەر زەکات دامان بنێ وئیشمان پێ بسپێرە، عەلی کوڕی ئەبو طالیب هات ئێمە لەسەر ئەو حاڵە بووین، پێی وتن: پێغەمبەر ﷺ ئێوە لەسەر زەکات دانانێت، عەبدولموطەلیب وتی: من و فەزل (کە برایەتی) ڕۆیشتین تا گەیشتین بە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێیانی فەرموو: بە ڕاستی ئەم زەکاتە پیسی خەڵکیە، حەڵاڵ نیە بۆ موحەممەدو خانەوادەکەی.

## بابەت: کوڕی خوشکی هۆزێک یان گەلێک یەکێکە لە ئەوان

**٢٦١٠-** «عَن شُعْبَةَ، قَالَ: قُلْتُ لِأَبِي إِيَاسٍ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ، أَسَمِعْتَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رضي الله عنه يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ابْنُ أُخْتِ الْقَوْمِ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، قَالَ: نَعَمْ»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٧٢، وأبو داود: ٢٩٨٥.

(٢) صحيح.




**واتە: شوعبە دەڵێ: بە ئەبو ئیاسی موعاویەی کوڕی قوڕڕەم وت: ئایا بیستوتە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ بڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کوڕە خوشکی هۆزێک لە خۆیانە؟ وتی: بەڵێ. (واتە: خوشکەزا یەکێکە لە ئەوان، هەمان حوکمی خانەوادەی هاشمی هەیە زەکاتی پێناشێ).**

**٢٦١١-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: ابْنُ أُخْتِ الْقَوْمِ مِنْهُمْ»[١].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کوڕە خوشکی هۆزێک لە ئەوانە.**

## بابەت: مەولای هۆزێک یەکێکە لە ئەوان

**٢٦١٢-** «عَنِ ابْنِ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، اسْتَعْمَلَ رَجُلاً مِنْ بَنِي مَخْزُومٍ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَأَرَادَ أَبُو رَافِعٍ أَنْ يَتْبَعَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ الصَّدَقَةَ لَا تَحِلُّ لَنَا، وَإِنَّ مَوْلَى الْقَوْمِ مِنْهُمْ»[٢].

**واتە: ئیبنو ئەبو ڕافیع دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی لە بەنی مەخزوم دانا لەسەر زەکات، ئەبو ڕافیع ویستی شوێنی بکەوێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: زەکات بۆ ئێمە حەڵاڵ نیە، هەروەها مەولای هۆزێکیش لە ئەوانە**

**تێبینی: (مَوْلَى) واتە: کۆیلەی ئازاد کراو.**

## زەکات بۆ پێغەمبەر ﷺ حەڵاڵ نیە

**٢٦١٣-** «عَن بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ، إِذَا أُتِيَ بِشَيْءٍ سَأَلَ عَنْهُ أَهَدِيَّةٌ أَمْ صَدَقَةٌ؟ فَإِنْ قِيلَ صَدَقَةٌ، لَمْ يَأْكُلْ، وَإِنْ قِيلَ، هَدِيَّةٌ بَسَطَ يَدَهُ»[٣].

**واتە: بەهزی کوڕی حەکیم، لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە، کە باپیرەی ﷺ وتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر شتێکی بۆ بهێنرایە پرسیاری دەکرد دەربارەی ئایا دیاریە، یان**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٤٦ و ٣٥٢٨ و ٦٧٦٢، ومسلم: ١٠٥٩/١٣٣، والترمذي: ٣٩٠١.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٦٥٠، والترمذي: ٦٥٧.

(٣) حسن. أخرجه الترمذي: ٦٥٦.

زەکاتە؟ ئەگەر بوترایە زەکاتە، لێی نەدەخوارد، وە ئەگەر بوترایە دیاریە دەستی درێژ دەکردو لێی دەخوارد.

## ئەگەر زەکات گۆڕا (بە دیاری)

**٢٦١٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا أَرَادَتْ أَنْ تَشْتَرِيَ بَرِيرَةَ فَتُعْتِقَهَا، وَإِنَّهُمُ اشْتَرَطُوا وَلَاءَهَا، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: اشْتَرِيهَا، وَأَعْتِقِيهَا، فَإِنَّ الْوَلَاءَ لِمَنْ أَعْتَقَ، وَخُيِّرَتْ حِينَ أُعْتِقَتْ، وَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِلَحْمٍ، فَقِيلَ: هَذَا مِمَّا تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ فَقَالَ: هُوَ لَهَا صَدَقَةٌ، وَلَنَا هَدِيَّةٌ، وَكَانَ زَوْجُهَا حُرًّا»[1].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەو ویستی بەریرە بکڕێ و ئازادی بکات، خانەوادەی گەورەکەی مەرجیان دانا دەبێت بە وەلاء بمێنێتەوە بۆ خۆیان (واتە: ئەگەر بەریرە کۆچی دوایی کرد میراتگری نەبوو ئەمان میراتەکەی ببەن) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیکڕە و ئازادی بکە، چونکە وەلاء بۆ ئەو کەسەیە ئازادی دەکات، بەریرە کاتێ ئازاد کرا سەرپشک کرا، دواتر گۆشتێک هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، وترا: ئەمە بە خێر دراوە بە بەریرە، فەرمووی: ئەوە بۆ ئەو زەکاتەو بۆ ئێمە دیاریە، وە مێردەکەی کەسێکی ئازاد بوو.**

## کڕینەوەی ئەوماڵەی کراوە بە خێرو صەدەقە

**٢٦١٥-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: حَمَلْتُ عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ، فَأَضَاعَهُ الَّذِي كَانَ عِنْدَهُ، وَأَرَدْتُ أَنْ أَبْتَاعَهُ مِنْهُ، وَظَنَنْتُ أَنَّهُ بَائِعُهُ بِرُخْصٍ، فَسَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: لَا تَشْتَرِهِ وَإِنْ أَعْطَاكَهُ بِدِرْهَمٍ، فَإِنَّ الْعَائِدَ فِي صَدَقَتِهِ كَالْكَلْبِ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ»[2].

**واتە: زەیدی کوڕی ئەسلەم، لە باوکیەوە دەڵێ: گوێم لە عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) وتی: ئەسپێکم بەخشی بەو کەسەی لە پێناو خوادا جیهادی پێ بکات، ئەو**

---

(١) صحيح دون قوله: «حر» و المحفوظ «عبد». أخرجه البخاري: ١٤٩٣ و ٢٥٣٦ و ٥٢٨٤ و ٦٧١٧ و ٦٧٥١ و ٦٧٥٨ و ٦٧٦٠، ومسلم: ١٠٧٥، وأبو داود: ٢٢٣٥، والترمذي: ١١٥٥ و ١١٥٦ و ٢١٢٥، وإبن ماجه: ٢٠٧٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٩٠ و ٢٦٢٣ و ٢٦٣٦ و ٢٩٧٠ و ٣٠٠٣، ومسلم: ١٦٢٠، والترمذي: ٦٦٨، وإبن ماجه: ٢٣٩١ و ٢٣٩٢.




**کەسەی ئەسپەکەی لەلا بوو قەدری نەدەزانی و خزمەتی نەدەکرد، ویستم لێی بکڕمەوە گومانم برد هەرزان فرۆشی بکات، پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی ئەوە، فەرمووی: لێی مەکڕەوە ئەگەر بە یەک درهەمیش بتداتەوە، چونکە ئەو کەسەی صەدەقەکەی بگێڕێتەوە وەکو سەگێک وایە ڕشانەوەکەی بخواتەوە.**

**٢٦١٦-** «عَنْ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ حَمَلَ عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَرَآهَا تُبَاعُ، فَأَرَادَ شِرَاءَهَا، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: لَا تَعْرِضْ فِي صَدَقَتِكَ»[١].

**واتە: عومەر ﷺ، ئەسپێکی بەخشی لە پێناو خوادا، بینی دەفرۆشرێ، ویستی خۆی بیکڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: صەدەقەکەت مەگێڕەرەوە.**

**٢٦١٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، كَانَ يُحَدِّثُ أَنَّ عُمَرَ، تَصَدَّقَ بِفَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ، فَوَجَدَهَا تُبَاعُ بَعْدَ ذَلِكَ، فَأَرَادَ أَنْ يَشْتَرِيَهُ، ثُمَّ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَاسْتَأْمَرَهُ فِي ذَلِكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَعُدْ فِي صَدَقَتِكَ»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: بەڕاستی عومەر، ئەسپێکی لە پێناو خوادا بەخشی، دوای ئەوە تەماشای کرد دەفرۆشرا، ویستی بیکڕێتەوە، پاشان هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکرد بیکڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: صەدەقەکەت مەگێڕەوە.**

**٢٦١٨-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَمَرَ عَتَّابَ بْنَ أَسِيدٍ أَنْ يَخْرُصَ الْعِنَبَ، فَتُؤَدَّى زَكَاتُهُ زَبِيباً، كَمَا تُؤَدَّى زَكَاةُ النَّخْلِ تَمْراً»[٣].

**واتە: سەعیدی کوڕی موسەییب دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە عەتابی کوڕی ئوسەید ترێیەکان بیخەمڵێنێ بە مێوژ، دواتر زەکاتەکەی دەربکرێ، وەکو چۆن خورمای تەڕ کۆ دەخەمڵێنرێ بە خورمای وشک، پاشان زەکاتی دەردەکرێ.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٨٩ و ٢٧٧٥ و ٢٩١٧ و ٣٠٠٢، ومسلم: ١٦٢١، وأبو داود: ١٥٩٣.

(٣) حسن الإسناد مرسلًا.




## بابەت: پێویستبوون، یان واجببوونی حەج

**٢٦١٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّاسَ، فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ قَدْ فَرَضَ عَلَيْكُمُ الْحَجَّ، فَقَالَ رَجُلٌ: فِي كُلِّ عَامٍ؟ فَسَكَتَ عَنْهُ حَتَّى أَعَادَهُ ثَلَاثاً، فَقَالَ: لَوْ قُلْتُ نَعَمْ، لَوَجَبَتْ، وَلَوْ وَجَبَتْ، مَا قُمْتُمْ بِهَا، ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ، فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ، وَاخْتِلَافِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِالشَّيْءِ فَخُذُوا بِهِ مَا اسْتَطَعْتُمْ، وَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ، فَاجْتَنِبُوهُ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاریدا بۆ خەڵکی فەرمووی: بەڕاستی خوا ﷻ حەجی لەسەرتان فەرز کرد، پیاوێک وتی: لە هەموو ساڵێکدا؟ بێدەنگ بوو تا سێ جار دووبارەی کردەوە، پاشان فەرمووی: ئەگەر بموتایە بەڵێ، ئەوە واجب دەبوو دەبوو، ئەگەر واجبیش بووایە، نەتان دەتوانی بەجێیبهێنن، وازم لێ بێنن لەوەی وازم لێهێناوە بۆتان، چونکە پێش ئێوە لەناوچوون بە هۆی ئەوەی پرسیاری زۆریان دەکردو جیاواز بوون لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان، جا ئەگەر فەرمانم پێکردن بە شتێک هەرچی لە توانانتاندایە لێی وەربگرن، وە ئەگەر شتێکم لێ قەدەغە کردن لێی دووربکەونەوە.**

**٢٦٢٠-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَامَ، فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى كَتَبَ عَلَيْكُمُ الْحَجَّ، فَقَالَ الْأَقْرَعُ بْنُ حَابِسٍ التَّمِيمِيُّ كُلُّ عَامٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَسَكَتَ، فَقَالَ: لَوْ قُلْتُ نَعَمْ، لَوَجَبَتْ، ثُمَّ إِذاً لَا تَسْمَعُونَ، وَلَا تُطِيعُونَ، وَلَكِنَّهُ حَجَّةٌ وَاحِدَةٌ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا، فەرمووی: خوای بەرز حەجی لەسەرتان نوسیوە، ئەقرەعی کوڕی حابیسی تەمیمی وتی: هەموو ساڵێک ئەی پێغەمبەری خوا؟ بێدەنگ بوو، پاشان فەرمووی: ئەگەر بموتایە بەڵێ، ئەوە واجب دەبوو، پاشان ئەوکات گوێڕایەڵ نەدەبوون و بەجێتان نەدەهێنا، بەڵکو تەنها یەک حەجە.**

## واجببوونی عومرە

**٢٦٢١-** «عَنْ أَبِي رَزِينٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبِي شَيْخٌ كَبِيرٌ، لَا يَسْتَطِيعُ الْحَجَّ، وَلَا الْعُمْرَةَ، وَلَا الظَّعْنَ، قَالَ: فَحُجَّ، عَنْ أَبِيكَ، وَاعْتَمِرْ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٣٧.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٧٢١، وإبن ماجه: ٢٨٨٦.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٨١٠، والترمذي: ٩٣٠، وإبن ماجه: ٢٩٠٦.

واتە: ئەبو ڕەزین ﷺ دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا باوکم پیاوێکی گەورەو بەساڵاچووە، ناتوانی حەج و عومرە بکات، هەروەها ناتوانێ سواری وڵاخیش بێت، فەرمووی: لە جیاتی باوکت حەج بکە، وە عومرەش بکە.

## گەورەیی حەجی وەرگیراو

**٢٦٢٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْحَجَّةُ الْمَبْرُورَةُ: لَيْسَ لَهَا جَزَاءٌ إِلَّا الْجَنَّةُ، وَالْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەجی وەرگیراو: هیچ پاداشتێکی نیە جگە لە بەهەشت، وە عومرەش بۆ عومرە دەبێتە کەفارەتی گوناهەکان لە نێوانیاندا.**

**٢٦٢٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْحَجَّةُ الْمَبْرُورَةُ: لَيْسَ لَهَا ثَوَابٌ إِلَّا الْجَنَّةُ، مِثْلَهُ سَوَاءً، إِلَّا أَنَّهُ قَالَ: تُكَفِّرُ مَا بَيْنَهُمَا»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: حەجی وەرگیراو: هیچ پاداشتێکی نیە جگە لە بەهەشت، هەروەک فەرموودەکەی پێشوو، ئەوە نەبێ فەرموویەتی: دەبێتە کەفارەتی نێوانیان.**

## فەزڵ و گەورەیی حەج کردن

**٢٦٢٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ: أَيُّ الْأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: الْإِيمَانُ بِاللَّهِ، قَالَ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، قَالَ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: ثُمَّ الْحَجُّ الْمَبْرُورُ»[3].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا: چ کردەوەیەک چاکە؟ فەرمووی: بڕوابوون بە خوا، وتی: پاشان چی؟ فەرمووی: جیهاد لە ڕێگای خوادا، وتی: پاشان چی؟ فەرمووی: حەجێکی وەرگیراو.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٧٣، ومسلم: ١٣٤٩، والترمذي: ٩٣٣، وإبن ماجه: ٢٨٨٨.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦ و ١٥١٩، ومسلم: ٨٣، والترمذي: ١٦٥٨.




٢٦٢٥- «عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَفْدُ اللَّهِ ثَلاثَةٌ: الْغَازِي، وَالْحَاجُّ، وَالْمُعْتَمِرُ»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: میوانە بەڕێزەکانی خوا (لە گەشتیارەکان) سیانن: ئەو کەسەی غەزا دەکات، ئەو کەسەی حەج دەکات، ئەو کەسەی عومرە دەکات.**

٢٦٢٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: جِهَادُ الْكَبِيرِ، وَالصَّغِيرِ، وَالضَّعِيفِ، وَالْمَرْأَةِ: الْحَجُّ، وَالْعُمْرَةُ»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جیهادی گەورەو بچووک و لاواز ئافرەت: حەج و عەمرەیە.**

٢٦٢٧- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ حَجَّ هَذَا الْبَيْتَ فَلَمْ يَرْفُثْ، وَلَمْ يَفْسُقْ، رَجَعَ كَمَا وَلَدَتْهُ أُمُّهُ»[3].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس حەجی ماڵی خوا بکات و گوفتارو ڕەفتاری خراپ نەکات و، هەروەها سەرپێچی نەکات، ئەوە دەگەڕێتەوە وەک ئەو کاتەی لە دایک بووە (واتە: بێ گوناهو پاک پاک دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە وەکو سەردەمی ساوایی).**

٢٦٢٨- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَا نَخْرُجُ فَنُجَاهِدَ مَعَكَ، فَإِنِّي لَا أَرَى عَمَلاً فِي الْقُرْآنِ، أَفْضَلَ مِنَ الْجِهَادِ، قَالَ: لَا، وَلَكُنَّ أَحْسَنُ الْجِهَادِ وَأَجْمَلُهُ، حَجُّ الْبَيْتِ، حَجٌّ مَبْرُورٌ»[4].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا دەرنەچین جیهاد بکەین لەگەڵتدا، من کردەوەیەک نابینمەوە لە قورئاندا چاکتر بێت لە جیهاد، فەرمووی: نەخێر، بەڵام چاکترین و جوانترین جیهاد حەجی ماڵی خوایە، حەجێکی وەرگیراو.**

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٢٨٩٢ بنحوه.

(٢) حسن.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٢١ و ١٨١٩ و ١٨٢٠، ومسلم: ١٣٥٠، والترمذي: ٨١١، وإبن ماجه: ٢٨٨٩.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٢٠ و ١٨١٦ و ٢٧٨٤ و ٢٨٧٦، وإبن ماجه: ٢٩٠١.

## فەزل و چاكی عومرە

**٢٦٢٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ، لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلَّا الْجَنَّةُ»(١).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عومرە بۆ عومرە دەبێتە كەفارەتی گوناهەكان لە نێوانیاندا، حەجی وەرگیراویش: هیچ پاداشتێكی نیە جگە لە بەهەشت.**

## فەزل و چاكەی حەج و عومرە بە شوێن یەكتردا

**٢٦٣٠-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَابِعُوا بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، فَإِنَّهُمَا: يَنْفِيَانِ الْفَقْرَ، وَالذُّنُوبَ، كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ»(٢).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەج و عومرە یەكێكیان بە دوای ئەوی تردا بكەن (ئەگەر حەجتان كرد بە دوایدا عومرە بكەن، ئەگەر عومرەشتان كرد بە دوایدا حەج بكەن)، چونكە ئەو دووانە: هەژاری و گوناهەكان دووردەخەنەوە، وەكو چۆن ئاگری كورە پیسی ئاسن دووردەخاتەوە.**

**٢٦٣١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَابِعُوا بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، فَإِنَّهُمَا: يَنْفِيَانِ الْفَقْرَ وَالذُّنُوبَ، كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ: خَبَثَ الْحَدِيدِ وَالذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، وَلَيْسَ لِلْحَجِّ الْمَبْرُورِ ثَوَابٌ دُونَ الْجَنَّةِ»(٣).

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەج و عومرە یەكێكیان بە دوای ئەوی تردا بكەن (ئەگەر حەجتان كرد بە دوایدا عومرە بكەن، ئەگەر عومرەشتان كرد بە دوایدا حەج بكەن)، چونكە ئەو دووانە: هەژاری و**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) حسن صحيح. أخرجه الترمذي: ٨١٠.

گوناهەکان دووردەخەنەوە، وەکو چۆن ئاگری کورە (یان ئەو ئامرازەی ئاسنگەر ئاگری پێ گەش دەکات) پیسی ئاسن و زێڕو زیو دووردەخاتەوە، حەجی وەرگیراویش پاداشتی نیە جگە لە بەهەشت.

### حەج کردن لە جیاتی (کەسێکی) مردوو کە (پێشتر) نەزری کردوە حەج بکات

**٢٦٣٢-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ امْرَأَةً نَذَرَتْ أَنْ تَحُجَّ، فَمَاتَتْ، فَأَتَى أَخُوهَا النَّبِيَّ ﷺ، فَسَأَلَهُ عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ عَلَى أُخْتِكَ دَيْنٌ أَكُنْتَ قَاضِيَهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَاقْضُوا اللَّهَ، فَهُوَ أَحَقُّ بِالْوَفَاءِ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک نەزری کرد حەج بکات، پاشان مرد، براکەی هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لەوبارەیەوە پرسیاری لێکرد؟ فەرمووی: ئەگەر خوشکەکەت قەرزار بووایە ئایا تۆ قەرزەکەیت دەدایەوە؟ وتی: بەڵێ، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: دەی قەرزی خواش بدەنەوە، خوا لە پێشترە بەوەی بەوەفا بیت بەرانبەر قەرزەکەی.

### حەج کردن لە جیاتی ئەو مردووەی کە حەجی نەکردوە

**٢٦٣٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَمَرَتِ امْرَأَةٌ سِنَانَ بْنَ سَلَمَةَ الْجُهَنِيَّ أَنْ يَسْأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ أُمَّهَا مَاتَتْ وَلَمْ تَحُجَّ، أَفَيُجْزِئُ عَنْ أُمِّهَا أَنْ تَحُجَّ عَنْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ، لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّهَا دَيْنٌ فَقَضَتْهُ عَنْهَا، أَلَمْ يَكُنْ يُجْزِئُ عَنْهَا فَلْتَحُجَّ عَنْ أُمِّهَا»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئافرەتێک سینانی کوڕی سەلەمەی جوهەنی ڕاسپارد پرسیاری بۆ بکات لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە دایکی مردوەو حەجی نەکردوە، ئایا دروستە لە بری دایکی حەج بکات؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر دایکی قەرزار بووایە قەرزەکەی بۆ دەدایەوە، ئایا نابێ حەجی بۆ بکات، با حەج لە جیاتی دایکی بکات.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٥٢ و ٦٦٩٩ و ٧٣١٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٥٢.




**٢٦٣٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتِ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ أَبِيهَا، مَاتَ وَلَمْ يَحُجَّ؟ قَالَ: حُجِّي عَنْ أَبِيكِ»[1].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: بێگومان ئافرەتێک پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی باوکی کە حەجی نەکردوە؟ فەرمووی: لە جیاتی باوکت حەج بکە.**

## حەج لە جیاتی ئەو کەسەی خۆی ناگرێ بەسەر وڵاخەوە

**٢٦٣٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ امْرَأَةً مِنْ خَثْعَمَ سَأَلَتِ النَّبِيَّ ﷺ غَدَاةَ جَمْعٍ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَرِيضَةُ اللَّهِ فِي الْحَجِّ عَلَى عِبَادِهِ، أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخاً كَبِيراً، لَا يَسْتَمْسِكُ عَلَى الرَّحْلِ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: نَعَمْ»[2].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک لە خەثعەم پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ سەرلەبەیانی کە کۆببوونەوە لە موزدەلیفە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، حەج فەرزی خوایە لەسەر بەندەکانی، لەسەر باوکیشم فەرز بووە، زۆر پیرەو خۆی بەسەر وڵاخەوە ناگرێ، ئایا من حەجی بۆ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ.**

**٢٦٣٦-** «عَنِ ابْنِ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا مِثْلَهُ»[3].

**واتە: طاوس، لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) هەر وەکو ئەو فەرموودەی پێشەوەی گێڕاوەتەوە.**

## عومرە لە جیاتی ئەو کەسەی کە ناتوانێت

**٢٦٣٧-** «عَنْ أَبِي رَزِينٍ الْعُقَيْلِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبِي شَيْخٌ كَبِيرٌ، لَا يَسْتَطِيعُ الْحَجَّ، وَلَا الْعُمْرَةَ، وَالظَّعْنَ قَالَ: حُجَّ، عَنْ أَبِيكَ، وَاعْتَمِرْ»[4].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**واتە: ئەبو ڕەزینی عوقەیلی ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا باوکم پیاوێکی گەورەو بەساڵاچووە، ناتوانی حەج یان عومرە بکات، هەروەها ناتوانێ سواری وڵاخیش بێت، فەرمووی: لە جیاتی باوکت حەج بکە، وە عومرەش بکە.**

## لێکچوواندنی دانەوەی حەج، بە دانەوەی قەرزاری

**٢٦٣٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنْ خَثْعَمَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ أَبِي شَيْخٌ كَبِيرٌ، لَا يَسْتَطِيعُ الرُّكُوبَ، وَأَدْرَكَتْهُ فَرِيضَةُ اللَّهِ فِي الْحَجِّ، فَهَلْ يُجْزِئُ أَنْ أَحُجَّ عَنْهُ؟ قَالَ: آنْتَ أَكْبَرُ وَلَدِهِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ عَلَيْهِ دَيْنٌ أَكُنْتَ تَقْضِيهِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَحُجَّ عَنْهُ»[(١)].

**واتە: عەبدوڵڵا کوڕی زوبەیر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک لە خەثعەم هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: باوکم پیاوێکی بە ساڵاچووە ناتوانی بەسەر وڵاخەوە خۆی بگرێ، حەج کە خوا فەرزی کردوە لەسەری پێویست بووە، ئایا دروستە من لە جیاتی ئەو حەج بکەم؟ فەرمووی: تۆ گەورەترینی ناو منداڵەکانی؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: ئەگەر باوکت قەرزار بووایە قەرزەکەیت دەدایەوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: دەی لە جیاتی حەج بکە.**

**٢٦٣٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبِي مَاتَ، وَلَمْ يَحُجَّ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ عَلَى أَبِيكَ دَيْنٌ أَكُنْتَ قَاضِيَهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَدَيْنُ اللَّهِ أَحَقُّ»[(٢)].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا باوکم مردوەو حەجی نەکردوە، ئایا حەجی بۆ بکەم؟ فەرمووی: ئایا ئەگەر باوکت قەرزار بووایە قەرزەکەیت دەدایەوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: قەرزی خوا حەقترو لە پێشترە.**

**٢٦٤٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ، أَنَّ أَبِي أَدْرَكَهُ الْحَجُّ، وَهُوَ شَيْخٌ كَبِيرٌ، لَا يَثْبُتُ عَلَى رَاحِلَتِهِ، فَإِنْ شَدَدْتُهُ خَشِيتُ أَنْ يَمُوتَ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ عَلَيْهِ دَيْنٌ فَقَضَيْتَهُ أَكَانَ مُجْزِئاً؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَحُجَّ عَنْ أَبِيكَ»[(٣)].

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) حسن لغيره.

(٣) صحيح.




**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ، وتی: باوکم کاتی حەجی هاتووە، بەڵام پیرو بەساڵاچووە خۆی ناگرێ بەسەر وڵاخەکەیەوە، ئەگەر زۆری لێبکەم دەترسم بمرێ، ئایا حەجی بۆ بکەم؟ فەرمووی: ئایا ئەگەر قەرزی لەسەر بووایەو بۆت بدایەتەوە دەبوو؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: دەی لە جیاتی باوکت حەج بکە.**

## حەج کردنی ئافرەت لەبری پیاو

**٢٦٤١-** «عَنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ رَدِيفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَجَاءَتْهُ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمَ تَسْتَفْتِيهِ، وَجَعَلَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا، وَتَنْظُرُ إِلَيْهِ، وَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يَصْرِفُ وَجْهَ الْفَضْلِ إِلَى الشِّقِّ الْآخَرِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ فَرِيضَةَ اللَّهِ فِي الْحَجِّ عَلَى عِبَادِهِ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخاً كَبِيراً، لَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يَثْبُتَ عَلَى الرَّاحِلَةِ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَذَلِكَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: فەزلی کوڕی عەبباس لە پشتی پێغەمبەری خواوە ﷺ بوو بەسەر وڵاخەکە، ئافرەتێک لە خەثعەم هات بۆ لای پرسیاری لێ دەکرد، لەوکاتەدا فەزل تەماشای ئافرەتەکەی دەکرد، ئافرەتەکەش تەماشای ئەوی دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی فەزلی وەرچەرخاند بەلایەکی تردا، ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، حەج فەرزی خوایە لەسەر بەندەکانی، لەسەر باوکیشم فەرز بووە، زۆر پیرەو خۆی بەسەر وڵاخەوە ناگرێ، ئایا من حەجی بۆ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەویش لە حەجیماڵئاواییدا بوو.**

**٢٦٤٢-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ امْرَأَةً مِنْ خَثْعَمَ اسْتَفْتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، وَالْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ رَدِيفُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ فَرِيضَةَ اللَّهِ فِي الْحَجِّ عَلَى عِبَادِهِ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخاً كَبِيراً، لَا يَسْتَوِي عَلَى الرَّاحِلَةِ، فَهَلْ يَقْضِي عَنْهُ أَنْ أَحُجَّ عَنْهُ؟ فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: نَعَمْ، فَأَخَذَ الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ يَلْتَفِتُ إِلَيْهَا، وَكَانَتِ امْرَأَةً حَسْنَاءَ، وَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْفَضْلَ فَحَوَّلَ وَجْهَهُ مِنَ الشِّقِّ الْآخَرِ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥١٣ و ١٨٥٤ و ١٨٥٥ و ٤٣٩٩ و ٦٢٢٨، ومسلم: ١٣٣٤، وأبو داود: ١٨٠٩.

(٢) صحيح.

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک لە خەثعەم لە حەجی ماڵئاوایی پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، فەزلی کوڕی عەبباسیش لە پشتیەوە بوو لەسەر وڵاخەکە، ئەی پێغەمبەری خوا، حەج فەرزی خوایە لەسەر بەندەکانی، لەسەر باوکیشم فەرز بووە، زۆر پیرەو خۆی بەسەر وڵاخەوە ناگرێ، ئایا دەکرێ من حەجی بۆ بکەم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: بەڵێ، فەزلی کوڕی عەبباس لای لێکردەوە (تەماشای کردوە)، ئافرەتێکی جوان بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی فەزلی بەلایەکی تردا وەرچەرخاند.

## حەج کردنی پیاو لە جیاتی ئافرەت

**٢٦٤٣-** «عَنِ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ كَانَ رَدِيفَ النَّبِيِّ ﷺ فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أُمِّي عَجُوزٌ كَبِيرَةٌ، وَإِنْ حَمَلْتُهَا لَمْ تَسْتَمْسِكْ، وَإِنْ رَبَطْتُهَا خَشِيتُ أَنْ أَقْتُلَهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّكَ دَيْنٌ أَكُنْتَ قَاضِيَهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَحُجَّ عَنْ أُمِّكَ»[1].

واتە: فەزلی کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەو لە پشتی پێغەمبەر ﷺ بوو بە سەر وڵاخێکەوە، پیاوێک هات بۆ لای وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، دایکم پیرەو بەساڵاچووە ئەگەر بیخەمە سەر وڵاخ خۆی ناگرێ، وە ئەگەر بیبەسمەوە دەترسم ببەمە هۆی مردنی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا ئەگەر دایکت قەرزار بووایە قەرزەکەت دەدایەوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: لە جیاتی دایکت حەج بکە.

## چاکتر وایە کوڕی گەورەی ماڵ لەبری باوکی حەج بکات

**٢٦٤٤-** «عَنِ ابْنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِرَجُلٍ: أَنْتَ أَكْبَرُ وَلَدِ أَبِيكَ، فَحُجَّ عَنْهُ»[2].

واتە: ئیبنو زوبەیر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێکی فەرموو: تۆ گەورەترین منداڵی باوکتی، حەجی بۆ بکە.

---

(١) شاذ. أخرجه البخاري: ١٦٠٣، ومسلم: ١٢٦١/٢٣٢، وأبو داود: ١٨٠٥.

(٢) ضعيف الإسناد.

## حەج كردن بە منداڵی بچوک

**٢٦٤٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ امْرَأَةً رَفَعَتْ صَبِيّاً لَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلِهَذَا حَجٌّ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَلَكِ أَجْرٌ»[1].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک منداڵێکی بەرز كردەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئایا لەسەر ئەم منداڵە حەج هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ، تۆش پاداشتت دەست دەكەوێ.**

**٢٦٤٦-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: رَفَعَتِ امْرَأَةٌ صَبِيّاً لَهَا مِنْ هَوْدَجٍ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلِهَذَا حَجٌّ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَلَكِ أَجْرٌ»[2].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئافرەتێک منداڵەكەی خۆی لە ناو كەژاوەكە بەرز كردەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا حەج لەسەر ئەم منداڵە هەیە (دەتوانێ جێبەجێی بكات)؟ فەرمووی: بەڵێ، تۆش پاداشتت دەست دەكەوێ.**

**٢٦٤٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: رَفَعَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ صَبِيّاً، فَقَالَتْ: أَلِهَذَا حَجٌّ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَلَكِ أَجْرٌ»[3].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئافرەتێک منداڵەكەی خۆی بەرز كردەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئایا حەج لەسەر ئەم منداڵە هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ، تۆش پاداشتت دەست دەكەوێ.**

**٢٦٤٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: صَدَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا كَانَ بِالرَّوْحَاءِ لَقِيَ قَوْماً فَقَالَ: مَنْ أَنْتُمْ؟ قَالُوا: الْمُسْلِمُونَ، قَالُوا: مَنْ أَنْتُمْ؟ قَالُوا: رَسُولُ اللَّهِ قَالَ: فَأَخْرَجَتِ امْرَأَةٌ صَبِيّاً مِنَ الْمِحَفَّةِ، فَقَالَتْ: أَلِهَذَا حَجٌّ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَلَكِ أَجْرٌ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٣٦، وأبو داود: ١٧٣٦.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو کاتێ گەیشتە (الرَّوْحَاءِ) گەیشت بە خەڵکێک، فەرمووی: ئێوە کێن؟ وتیان: مسوڵمانین، وتیان: ئێوە کێن؟ وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: ئافرەتێک منداڵێکی دەرهێنا لە ناو جێگاکەی، وتی: ئایا ئەمە حەجی لەسەرە؟ فەرمووی: بەڵێ، تۆش پاداشتت دەست دەکەوێ.

**٢٦٤٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ بِامْرَأَةٍ وَهِيَ فِي خِدْرِهَا مَعَهَا صَبِيٌّ، فَقَالَتْ: أَلِهَذَا حَجٌّ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَلَكِ أَجْرٌ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای ئافرەتێکدا تێپەڕی خۆی داپۆشیبوو، منداڵێکیشی لەگەڵ بوو، وتی: ئایا ئەمە حەجی لەسەرە؟ وتی: بەڵێ، تۆش پاداشتت دەست دەکەوێ.

## ئەو کاتەی کە پێغەمبەر ﷺ لە مەدینەوە دەرچوو بۆ حەج

**٢٦٥٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا تَقُولُ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، لِخَمْسٍ بَقِينَ مِنْ ذِي الْقِعْدَةِ، لَا نُرَى إِلَّا الْحَجَّ حَتَّى إِذَا دَنَوْنَا مِنْ مَكَّةَ، أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ إِذَا طَافَ بِالْبَيْتِ أَنْ يَحِلَّ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین پێنج ڕۆژی مابوو لە (ذي الْقِعْدَة) مەبەستمان تەنها حەج بوو، تا لە مەککە نزیک بووینەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد هەر کەس قوربانی لەگەڵ خۆی نەهێناوە ئەگەر تەوافی کرد با ئیحرام بشکێنێ.

## کاتەکانی ئیحرام بەستنی خەڵکی مەدینە

**٢٦٥١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: يُهِلُّ أَهْلُ الْمَدِينَةِ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ، وَأَهْلُ الشَّامِ مِنَ الْجُحْفَةِ، وَأَهْلُ نَجْدٍ مِنْ قَرْنٍ، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: وَبَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: وَيُهِلُّ أَهْلُ الْيَمَنِ مِنْ يَلَمْلَمَ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٣ و ١٥٢٢ و ١٥٢٥ و ١٥٢٧ و ١٥٢٨ و ٧٣٣٤، ومسلم: ١٤ و ١٥ و ١١٨٢/١٧، وأبو داود: ١٧٣٧، والترمذي: ٨١٣، وإبن ماجه: ٢٩١٤.

واتە: عەبدوڵڵا کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵکی مەدینە لە (ذي الْحُلَيْفَة) ئیحرام دەبەستن، خەڵکی شامیش لە (الْجُحْفَة)، خەڵکی نەجدیش لە (قَرْن)، عەبدوڵڵا وتی: پێم ڕاگەینرا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خەڵکی یەمەن لە (يَلَمْلَمَ) ئیحرام دەبەستن.

## کاتەکانی ئیحرام بەستنی خەڵکی شام

**٢٦٥٢**- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً قَامَ فِي الْمَسْجِدِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مِنْ أَيْنَ تَأْمُرُنَا أَنْ نُهِلَّ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يُهِلُّ أَهْلُ الْمَدِينَةِ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ، وَيُهِلُّ أَهْلُ الشَّامِ مِنَ الْجُحْفَةِ، وَيُهِلُّ أَهْلُ نَجْدٍ مِنْ قَرْنٍ، قَالَ ابْنُ عُمَرَ: وَيَزْعُمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: وَيُهِلُّ أَهْلُ الْيَمَنِ مِنْ يَلَمْلَمَ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَقُولُ: لَمْ أَفْقَهْ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک هەڵسا لە ناو مزگەوت، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، لە کوێ فەرمانمان پێدەکەی ئیحرام ببەستین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خەڵکی مەدینە لە (ذي الْحُلَيْفَة) ئیحرام دەبەستن، خەڵکی شامیش لە (الْجُحْفَة)، خەڵکی نەجدیش لە (قَرْن)، ئیبنو عومەر وتی: پێیان وابوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵکی یەمەن لە (يَلَمْلَمَ) ئیحرام دەبەستن، ئیبنو عومەر وتی: لەمە تێنەگەیشتووم لە پێغەمبەری خواوە.

## کاتەکانی ئیحرام بەستنی خەڵکی میسر

**٢٦٥٣**- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: وَقَّتَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذَا الْحُلَيْفَةِ، وَلِأَهْلِ الشَّامِ وَمِصْرَ الْجُحْفَةَ، وَلِأَهْلِ الْعِرَاقِ ذَاتَ عِرْقٍ، وَلِأَهْلِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمَ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتی ئیحرام بەستنی دانا بۆ خەڵکی مەدینە لە (ذي الْحُلَيْفَة)، وە بۆ خەڵکی شام و میسریش لە (الْجُحْفَة)، بۆ خەڵکی عێراقیش لە (ذَاتَ عِرْق) بۆ خەڵکی یەمەنیش لە (يَلَمْلَمَ).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٧٣٩.

## کاتەکانی ئیحرام بەستنی خەڵکی یەمەن

**٢٦٥٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَقَّتَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذَا الْحُلَيْفَةِ، وَلِأَهْلِ الشَّامِ الْجُحْفَةَ، وَلِأَهْلِ نَجْدٍ قَرْنًا، وَلِأَهْلِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمَ، وَقَالَ: هُنَّ لَهُنَّ وَلِكُلِّ آتٍ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِهِنَّ فَمَنْ كَانَ أَهْلُهُ دُونَ الْمِيقَاتِ حَيْثُ يُنْشِئُ حَتَّى يَأْتِيَ ذَلِكَ عَلَى أَهْلِ مَكَّةَ»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ: کاتی ئیحرام بەستنی دانا بۆ خەڵکی مەدینە لە (ذي الْحُلَيْفَة)، وە بۆ خەڵکی شام لە (الْجُحْفَة)، بۆ خەڵکی نەجد لە (قَرْن) بۆ خەڵکی یەمەنیش لە (يَلَمْلَمَ)، وە فەرمووی: ئەوانە بۆ ئەوانەو بۆ هەموو کەسێکە لە شوێنی ترەوە هاتبێ، جا هەر کەسێکماڵەکەی لە یەکێک لەو شوێنانە بوو هەر لە ماڵ خۆی ئیحرام دەبەستێ هەتا دێتە مەککە.**

## کاتەکانی ئیحرام بەستنی خەڵکی نەجد

**٢٦٥٥-** «عَنْ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنه، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: يُهِلُّ أَهْلُ الْمَدِينَةِ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ، وَأَهْلُ الشَّامِ مِنَ الْجُحْفَةِ، وَأَهْلُ نَجْدٍ مِنْ قَرْنٍ»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵا رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خەڵکی مەدینە لە (ذي الْحُلَيْفَة) ئیحرام دەبەستن، خەڵکی شامیش لە (الْجُحْفَة)، خەڵکی نەجدیش لە (قَرْن).**

## کاتەکانی ئیحرام بەستنی خەڵکی عیراق

**٢٦٥٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: وَقَّتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذَا الْحُلَيْفَةِ، وَلِأَهْلِ الشَّامِ وَمِصْرَ الْجُحْفَةَ، وَلِأَهْلِ الْعِرَاقِ ذَاتَ عِرْقٍ، وَلِأَهْلِ نَجْدٍ قَرْنًا، وَلِأَهْلِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمَ»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتی ئیحرام بەستنی دانا بۆ خەڵکی مەدینە لە (ذي الْحُلَيْفَة)، وە بۆ خەڵکی شام و میسریش لە (الْجُحْفَة)، بۆ خەڵکی عێراقیش لە (ذَات عِرْق)، خەڵکی نەجدیش لە (قَرْن)، بۆ خەڵکی یەمەنیش لە (يَلَمْلَم).**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٢٦ و ١٥٢٩، ومسلم: ١١٨١، وأبو داود: ١٧٣٨.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




## ئەو کەسەی ماڵەکەی لەو شوێنە بێت کە ئیحرامی تێدا دەبەسترێ

**٢٦٥٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: وَقَّتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذَا الْحُلَيْفَةِ، وَلِأَهْلِ الشَّامِ الْجُحْفَةَ، وَلِأَهْلِ نَجْدٍ قَرْناً، وَلِأَهْلِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمَ، قَالَ: هُنَّ لَهُمْ وَلِمَنْ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِمَّنْ سِوَاهُنَّ، لِمَنْ أَرَادَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، وَمَنْ كَانَ دُونَ ذَلِكَ مِنْ حَيْثُ بَدَا حَتَّى يَبْلُغَ ذَلِكَ أَهْلَ مَكَّةَ»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ: کاتی ئیحرام بەستنی دانا بۆ خەڵکی مەدینە لە (ذي الْحُلَيْفَة)، وە بۆ خەڵکی شام لە (الْجُحْفَة)، بۆ خەڵکی نەجد لە (قَرْن)، بۆ خەڵکی یەمەنیش لە (يَلَمْلَمَ)، وە فەرمووی: ئەو جێگایانە بۆ ئەو شوێنانەیە، وە بۆ هەموو کەسێکە لە شوێنی ترەوە هاتبێ، بۆ ئەوەشە ویستی حەج و عەمرەی هەبێ، هەر کەس ماڵەکەی لە نێوان مەککەو ئەو شوێنانە بوو هەر لە ماڵ خۆی ئیحرام دەبەستێ تا دێتە مەککە.**

**٢٦٥٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، وَقَّتَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذَا الْحُلَيْفَةِ، وَلِأَهْلِ الشَّامِ الْجُحْفَةَ، وَلِأَهْلِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمَ، وَلِأَهْلِ نَجْدٍ قَرْناً، فَهُنَّ لَهُمْ وَلِمَنْ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِ أَهْلِهِنَّ مِمَّنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، فَمَنْ كَانَ دُونَهُنَّ فَمِنْ أَهْلِهِ، حَتَّى أَنَّ أَهْلَ مَكَّةَ يُهِلُّونَ مِنْهَا»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ: کاتی ئیحرام بەستنی دانا بۆ خەڵکی مەدینە لە (ذي الْحُلَيْفَة)، وە بۆ خەڵکی شام لە (الْجُحْفَة)، بۆ خەڵکی یەمەنیش لە (يَلَمْلَم)، بۆ خەڵکی نەجد لە (قَرْن)، وە فەرمووی: ئەو جێگایانە بۆ ئەو شوێنانەیە، وە بۆ هەموو کەسێکە لە شوێنی ترەوە هاتبێ لەوانەی کە مەبەستی حەج و عومرەیە، هەرکەس ماڵەکەی لە نێوان مەککەو ئەو شوێنانە بوو هەر لە ماڵ خۆی ئیحرام دەبەستێ، تا خەڵکی مەککە، هەر لە مەککە ئیحرام دەبەستن.**

## مانەوە لە (ذِي الْحُلَيْفَة)

**٢٦٥٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: بَاتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِذِي الْحُلَيْفَةِ بِبَيْدَاءَ، وَصَلَّى فِي مَسْجِدِهَا»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٨٨.




**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەوی کردەوە لە (ذِي الْحُلَيْفَة) لە (بَيْدَاءَ) (کە شوێنێکی تایبەتە لە نزیک مەدینە)، لە ناو مزگەوتەکەیشی نوێژی کرد.**

**٢٦٦٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ وَهُوَ فِي الْمُعَرَّسِ بِذِي الْحُلَيْفَةِ أُتِيَ فَقِيلَ لَهُ: إِنَّكَ بِبَطْحَاءَ مُبَارَكَةٍ»[1].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە موعەڕەس بوو (کە شەش میل دوورە لە مەدینە) لە (ذِي الْحُلَيْفَة) لە خەودا پێی وترا: بە ڕاستی تۆ لە شیوێکی پیرۆزدای.**

**٢٦٦١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنَاخَ بِالْبَطْحَاءِ الَّذِي بِذِي الْحُلَيْفَةِ وَصَلَّى بِهَا»[2].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شیوێکی (ذِي الْحُلَيْفَة) (کە جێگایەکی نەرمی فراوانە لم و زیخی تێدایە بۆ پشوودان گونجاوە) وشتری یەخداو نوێژی تێدا کرد.**

## مانەوە لە (الْبَيْدَاءَ) کە ناوی شوێنێکی تایبەتە لە (ذي الحُلَيْفة)

**٢٦٦٢-** «عَنْ أَنَسِ ابْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، صَلَّى الظُّهْرَ بِالْبَيْدَاءِ، ثُمَّ رَكِبَ وَصَعِدَ جَبَلَ الْبَيْدَاءِ فَأَهَلَّ بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، حِينَ صَلَّى الظُّهْرَ»[3].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی لە بەیداء کرد، پاشان سوار وشترەکەی بوو سەرکەوتە سەر کێوی بەیداء لەوێ ئیحرامی حەج و عومرەی بەست، کاتێ کە نوێژی نیوەڕۆی کرد.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٣٥ و ٢٣٣٦، ومسلم: ٤٣٣ و ١٣٤٦/٤٣٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٣٢، ومسلم: ٤٣٠ و ١٢٥٧/٤٣١، وأبو داود: ٢٠٤٤.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٧٧٤.




## غوسڵ دەركردن بۆ ئیحرام بەستن

**٢٦٦٣-** «عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ، أَنَّهَا وَلَدَتْ مُحَمَّدَ بْنَ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا بِالْبَيْدَاءِ، فَذَكَرَ أَبُو بَكْرٍ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: مُرْهَا فَلْتَغْتَسِلْ، ثُمَّ لِتُهِلَّ»[١].

**واتە: ئەسمائی كچی عومەیس دەگێڕێتەوە: ئەو موحەممەدی كوڕی ئەبو بەكری بوو لە بەیداء (خوا لێیان ڕازی بێ)، ئەبو بەكر ئەوەی باسكرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: فەرمانی پێبكە با خۆی بشوات، پاشان ئیحرام ببەستێ.**

**٢٦٦٤-** «عَنْ أَبِي بَكْرٍ ﷺ، أَنَّهُ خَرَجَ حَاجاً مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَجَّةَ الْوَدَاعِ، وَمَعَهُ امْرَأَتُهُ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ الْخَثْعَمِيَّةُ، فَلَمَّا كَانُوا بِذِي الْحُلَيْفَةِ، وَلَدَتْ أَسْمَاءُ مُحَمَّدَ بْنَ أَبِي بَكْرٍ، فَأَتَى أَبُو بَكْرٍ النَّبِيَّ ﷺ فَأَخْبَرَهُ ، فَأَمَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَأْمُرَهَا، أَنْ تَغْتَسِلَ ثُمَّ تُهِلَّ بِالْحَجِّ، وَتَصْنَعَ مَا يَصْنَعُ النَّاسُ، إِلَّا أَنَّهَا لَا تَطُوفُ بِالْبَيْتِ»[٢].

**واتە: ئەبو بەكر ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ حەج كردن، حەجیماڵئاوایی، ئەسمائی كچی عومەیسی خەثعەمی خێزانی لەگەڵ بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێكرد فەرمانی پێ بكات خۆی بشوات پاشان ئیحرام ببەستێ بۆ حەج، ئەوەی خەڵكی دەیكات ئەویش بیكات، تەنها ئەوە نەبێ تەوافی ماڵی پیرۆز نەكات.**

## خۆشۆردنی ئەو كەسەی ئیحرامی بەستووە

**٢٦٦٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، وَالْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ، أَنَّهُمَا اخْتَلَفَا بِالْأَبْوَاءِ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ، وَقَالَ الْمِسْوَرُ: لَا يَغْسِلُ رَأْسَهُ، فَأَرْسَلَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ إِلَى أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ أَسْأَلُهُ عَنْ ذَلِكَ فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ بَيْنَ قَرْنَيِ الْبِئْرِ، وَهُوَ مُسْتَتِرٌ بِثَوْبٍ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، وَقُلْتُ: أَرْسَلَنِي إِلَيْكَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ أَسْأَلُكَ، كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَغْسِلُ رَأْسَهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ؟: فَوَضَعَ أَبُو أَيُّوبَ يَدَهُ عَلَى الثَّوْبِ فَطَأْطَأَهُ حَتَّى بَدَا رَأْسُهُ، ثُمَّ قَالَ لِإِنْسَانٍ:

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٢٩١٢.




يَصُبُّ عَلَى رَأْسِهِ، ثُمَّ حَرَّكَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ، فَأَقْبَلَ بِهِمَا، وَأَدْبَرَ، وَقَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَفْعَلُ»[(١)].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، و میسوەری کوڕی مەخرەمە هەردووکیان لە (الأَبْوَاء) بوون (کە ناوچەیەکە لە نێوان مەککە و مەدینە) ڕاو بۆچوونیان جیاواز بوو، ئیبنو عەبباس وتی: ئیحرام پۆش دەتوانێ سەری بشوات، میسوەر وتی: ناتوانێ سەری بشوات، ئیبنو عەبباس ناردمی بۆ لای ئەبو ئەیوبی ئەنصاری لەوبارەیەوە پرسیاری لێ بکەم، بینیم خۆی دەشۆرد لە نێوان دوو کۆڵەکەدا، پەردەشی پۆشیبوو، سڵاوم لێکرد، وتم: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ناردومی بۆ لات پرسیارت لێبکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن سەری شۆردوە کاتێک لە ئیحرامدا بوو؟ ئەبو ئەیوب دەستی خستە سەر پەردەکە و دای نەواند تا سەری دەرکەوت، پاشان بە کەسێکی وت: ئاو بکات بەسەریدا، ئەویش ئاوی کرد بەسەریدا، پاشان دەستی خستە ناو سەری، دەستەکانی دەهێناو دەبرد، وتی: ئا بەم شێوەیە پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە سەری شۆردوە.

## قەدەغەکردنی پۆشینی پۆشاکی ڕەنگکراو بە وەرس و زەعفەران لە ئیحرامدا

**٢٦٦٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَنْ يَلْبَسَ الْمُحْرِمُ ثَوْباً مَصْبُوغاً بِزَعْفَرَانٍ أَوْ بِوَرْسٍ»[(٢)].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە ئەو کەسەی ئیحرام دەبەستێ جلێک بپۆشێ ڕەنگکرابێ بە زەعفەران یان وەرس.

تێبینی: (ورس و زعفران): دوو جۆرە گیای بۆن خۆشن.

**٢٦٦٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ؟ قَالَ: لَا يَلْبَسُ الْقَمِيصَ، وَلَا الْبُرْنُسَ، وَلَا السَّرَاوِيلَ، وَلَا الْعِمَامَةَ، وَلَا ثَوْباً مَسَّهُ وَرْسٌ، وَلَا

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٣٠، ومسلم: ١٢٠٥، وأبو داود: ١٨٤٠، وإبن ماجه: ٢٩٣٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٤٧ و ٥٨٥٢، ومسلم: ١١٧٧/٣، وإبن ماجه: ٢٩٣٠ و ٢٩٣٢.

زَعْفَرَانٌ، وَلَا خُفَّيْنِ إِلَّا لِمَنْ لَا يَجِدُ نَعْلَيْنِ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ نَعْلَيْنِ، فَلْيَقْطَعْهُمَا حَتَّى يَكُونَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کەسەی لە ئیحرامدایە چی پۆشاکێک لەبەر بکات؟ فەرمووی: نە کراس لەبەر بکات و نە کڵاو لەسەر بکات و نە شەرواڵ لە پێ بکات و نە مێزەر لەسەر بکات و، نە جلێک بپۆشێ وەرس یان زەعفەرانی بەرکەوتبێ، نە خوف لە پێ بکات، مەگەر کەسێک نەعلی دەست نەکەوێ، ئەگەر نەعلی دەست نەکەوت، ئەوا با خوف لە پێ بکات، بەڵام لە خوار قاپەڕەقەی قاچیەوە بیبڕێت.

### پۆشینی جوبە، یان عەبا لە ئیحرامدا

**٢٦٦٨-** «عَنْ صَفْوَانَ بْنِ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: لَيْتَنِي أَرَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يُنْزَلُ عَلَيْهِ، فَبَيْنَا نَحْنُ بِالْجِعِرَّانَةِ، وَالنَّبِيُّ ﷺ فِي قُبَّةٍ فَأَتَاهُ الْوَحْيُ، فَأَشَارَ إِلَيَّ عُمَرُ أَنْ تَعَالَ، فَأَدْخَلْتُ رَأْسِي الْقُبَّةَ فَأَتَاهُ رَجُلٌ قَدْ أَحْرَمَ فِي جُبَّةٍ بِعُمْرَةٍ مُتَضَمِّخٌ بِطِيبٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا تَقُولُ فِي رَجُلٍ قَدْ أَحْرَمَ فِي جُبَّةٍ إِذْ أُنْزِلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَغِطُّ لِذَلِكَ فَسُرِّيَ عَنْهُ، فَقَالَ: أَيْنَ الرَّجُلُ الَّذِي سَأَلَنِي آنِفاً؟ فَأُتِيَ بِالرَّجُلِ فَقَالَ: أَمَّا الْجُبَّةُ فَاخْلَعْهَا، وَأَمَّا الطِّيبُ فَاغْسِلْهُ، ثُمَّ أَحْدِثْ إِحْرَاماً»[٢].

واتە: صەفوانی کوڕی یەعلای کوڕی ئومەیە ﷺ وتی: خۆزگە پێغەمبەری خوام ﷺ دەبینی کاتێ وەحی بۆ دەهات، لە کاتێکدا ئێمە لە جیعرانە بووین، پێغەمبەر ﷺ لە ژێر دەوارێکدا بوو وەحی بۆ هات، عومەر ئاماژەی بۆ کردم بچم بۆ لای، منیش سەرم خستە ژێر دەوارەکە، پیاوێک هات بۆ لای جوبەیەکی پۆشیبوو، ئیحرامی بە عومرە بەستبو و، وە خۆی بۆنخۆش کردبوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چی دەڵێی دەربارەی پیاوێک لە جوبەیەکدا ئیحرامی بەستووە، دواتر وەحی بۆ دابەزی لەوکاتەدا پرخەی دەهات، پاشان ئاسایی بوویەوە، فەرمووی: ئەو پیاوە لە کوێیە کە کەمێ پێش ئێستا پرسیاری کرد؟ کابرا هێنرا، فەرمووی: ئەو جوبەیە داکەنە، ئەو بۆنەش بشۆرە، پاشان ئیحرام ببەستە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٦٦ و ١٨٤٢ و ٥٨٠٦، ومسلم: ١١٧٧/٢، وأبو داود: ١٨٢٣.

(٢) صحيح. دون قوله: «ثُمَّ أَحْدِثْ إِحْرَاماً» فإنه شاذ. أخرجه البخاري: ١٥٣٦ و ١٧٨٩ و ١٨٤٧ و ٤٩٨٥، ومسلم: ٦ و ١١٨٠/١٠، وأبو داود: ١٨١٩ و ١٨٢٠ و ١٨٢١ و ١٨٢٢، والترمذي: ٨٣٥ و ٨٣٦.




## ڕێگری كردن لە پۆشینی كراس بۆ ئەو كەسەی ئیحرامی بەستوە

**٢٦٦٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَلْبَسُوا الْقُمُصَ، وَلَا الْعَمَائِمَ، وَلَا السَّرَاوِيلَاتِ، وَلَا الْبَرَانِسَ، وَلَا الْخِفَافَ، إِلَّا أَحَدٌ لَا يَجِدُ نَعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلَا تَلْبَسُوا شَيْئاً مَسَّهُ الزَّعْفَرَانُ، وَلَا الْوَرْسُ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، پیاوێک پرسیاری كرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو كەسەی لە ئیحرامدایە چی پۆشاكێک لەبەر بكات؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نە كراس لەبەر بكەن و نە مێزەر لەسەر بكەن و نە شەرواڵ لە پێ بكەن و نە ڕۆبی كڵاودار لەبەر بكەن و نە خوف لە پێ بكەن، مەگەر كەسێک نەعلی دەست نەكەوێ، ئەوا با خوف لە پێ بكات، بەڵام لە خوار قاپەڕەقەی قاچیەوە بیبڕێت، وە هیچ پۆشاكێک لەبەر مەكەن كە زەعفەران و وەرسی پێوە بێت.**

## قەدەغە كردن لە لەبەركردنی شەرواڵ لە ئیحرامدا

**٢٦٧٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا نَلْبَسُ مِنَ الثِّيَابِ إِذَا أَحْرَمْنَا؟ قَالَ: لَا تَلْبَسُوا الْقَمِيصَ، وَقَالَ عَمْرٌو مَرَّةً أُخْرَى: الْقُمُصَ، وَلَا الْعَمَائِمَ، وَلَا السَّرَاوِيلَاتِ، وَلَا الْخُفَّيْنِ، إِلَّا أَنْ لَا يَكُونَ لِأَحَدِكُمْ نَعْلَانِ، فَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلَا ثَوْباً مَسَّهُ وَرْسٌ، وَلَا زَعْفَرَانٌ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەر چی پۆشاكێک لەبەر بكەین كاتێ ئیحرامان بەست؟ فەرمووی: كراس لەبەر مەكەن، جارێكی تر عەمر وتی: نە كراس لەبەر بكەن و، نە مێزەر لەسەر بكەن و، نە شەرواڵ بپۆشن، نە خوف لە پێ بكەن، مەگەر كەسێک نەعلی دەست نەكەوێ، پێی بكات،**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٤ و ١٥٤٢ و ١٨٣٨ و ١٨٤٢ و ٥٧٩٤ و ٥٨٠٣ و ٥٨٠٥، ومسلم: ١١٧٧، وأبو داود: ١٨٢٤ و ١٨٢٥ و ١٨٢٦ و ١٨٢٧، والترمذي: ٨٣٣، وإبن ماجه: ٢٩٢٩ و ٢٩٣٢.

(٢) صحيح.




بەڵام لە خوار قاپەڕەقەی قاچیەوە بیبڕێت، وە هیچ پۆشاکێک لەبەر مەکەن کە زەعفەران و وەرسی پێوە بێت.

## ڕێگەدان بە لەبەر کردنی شەرواڵ بۆ کەسێک پشتەماڵی نەبێ خۆی پێ بپۆشێ

**٢٦٧١-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ، يَخْطُبُ وَهُوَ يَقُولُ: السَّرَاوِيلُ لِمَنْ لَا يَجِدُ الْإِزَارَ، وَالْخُفَّيْنِ لِمَنْ لَا يَجِدُ النَّعْلَيْنِ لِلْمُحْرِمِ»[(١)].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو وتاری دەدا و دەیفەرموو: شەرواڵ بۆ کەسێکە پشتەماڵی نەبێ خۆی پێ بپۆشێ، هەروەها لە پێ کردنی خوفیش بۆ کەسێکە نەعلی دەست نەکەوێ، ئەمە بۆ ئیحرام.

**٢٦٧٢-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ لَمْ يَجِدْ إِزَاراً، فَلْيَلْبَسْ سَرَاوِيلَ، وَمَنْ لَمْ يَجِدْ نَعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ»[(٢)].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو وتاری دەداو دەیفەرموو: هەر کەس پشتەماڵی نیە با شەرواڵ بپۆشێ، وە هەر کەس نەعلی نیە با خوفەکان لە پێ بکات.

## قەدەغە کردن لەوەی ئافرەت پەچە بکات لە حەرەمدا

**٢٦٧٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَامَ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَاذَا تَأْمُرُنَا أَنْ نَلْبَسَ مِنَ الثِّيَابِ فِي الْإِحْرَامِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَلْبَسُوا الْقَمِيصَ، وَلَا السَّرَاوِيلَاتِ، وَلَا الْعَمَائِمَ، وَلَا الْبَرَانِسَ، وَلَا الْخِفَافَ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ أَحَدٌ لَيْسَتْ لَهُ نَعْلَانِ فَلْيَلْبَسِ الْخُفَّيْنِ مَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلَا تَلْبَسُوا شَيْئاً مِنَ الثِّيَابِ مَسَّهُ الزَّعْفَرَانُ، وَلَا الْوَرْسُ، وَلَا تَنْتَقِبُ الْمَرْأَةُ الْحَرَامُ، وَلَا تَلْبَسُ الْقُفَّازَيْنِ»[(٣)].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٤٠ و ١٨٤١ و ١٨٤٣ و ٥٨٠٤ و ٥٨٥٣، ومسلم: ١١٧٨، وأبو داود: ١٨٢٩، والترمذي: ٨٣٤، وإبن ماجه: ٢٩٣١.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێت دەڵێ: پیاوێک هەستا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا فەرمانی چی پۆشاکێکمان پێدەکەیت لە ئیحرامدا بیپۆشین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نە کراس لەبەر بکەن و نە شەرواڵ لە پێ بکەن و نە مێزەر لەسەر بکەن و نە ڕۆبی کڵاودار لەبەر بکەن و نە خوف لە پێ بکەن، مەگەر کەسێک نەعلی دەست نەکەوێ، ئەوا با خوف لە پێ بکات، بەڵام لە خوار قاپەڕەقەی قاچیەوە بیبڕێت، وە هیچ پۆشاکێک لەبەر مەکەن کە زەعفران و وەرسی پێوە بێت، وە با ئافرەت پەچە نەکات و دەستکێشیش لە دەست نەکات.

## قەدەغە کردن لە لەسەر کردنی کڵاو لە ئیحرامدا

**٢٦٧٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَلْبَسُوا الْقَمِيصَ، وَلَا الْعَمَائِمَ، وَلَا السَّرَاوِيلَاتِ، وَلَا الْبَرَانِسَ، وَلَا الْخِفَافَ، إِلَّا أَحَدٌ لَا يَجِدُ نَعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلَا تَلْبَسُوا شَيْئاً مَسَّهُ الزَّعْفَرَانُ، وَلَا الْوَرْسُ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، پیاوێک پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کەسەی لە ئیحرامدایە چی پۆشاکێک لەبەر بکات؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نە کراس لەبەر بکەن و نە مێزەر لەسەر بکەن و نە شەرواڵ لە پێ بکەن و نە ڕۆبی کڵاودار لەبەر بکەن و نە خوف لە پێ بکەن، مەگەر کەسێک نەعلی دەست نەکەوێ، ئەوا با خوف لە پێ بکات، بەڵام لە خوار قاپەڕەقەی قاچیەوە بیبڕێت، وە هیچ پۆشاکێک لەبەر مەکەن کە زەعفەران و وەرسی پێوە بێت. (کە دوو جۆرە گیای بۆن خۆشن).

**٢٦٧٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَا نَلْبَسُ مِنَ الثِّيَابِ إِذَا أَحْرَمْنَا؟ قَالَ: لَا تَلْبَسُوا الْقَمِيصَ وَلَا السَّرَاوِيلَاتِ وَلَا الْعَمَائِمَ، وَلَا الْبَرَانِسَ، وَلَا الْخِفَافَ إِلَّا أَنْ يَكُونَ أَحَدٌ لَيْسَتْ لَهُ نَعْلَانِ، فَلْيَلْبَسِ الْخُفَّيْنِ أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ وَلَا تَلْبَسُوا مِنَ الثِّيَابِ شَيْئاً مَسَّهُ وَرْسٌ وَلَا زَعْفَرَانٌ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




واتە: ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، چی پۆشاکێک لەبەر بکەین کاتێ ئیحرامان بەست؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نە کراس لەبەر بکەن و نە شەرواڵ لە پێ بکەن و نە مێزەر لەسەر بکەن و نە ڕۆبی کڵاودار لەبەر بکەن و نە خوف لە پێ بکەن، مەگەر کەسێک نەعلی دەست نەکەوێ، ئەوا با خوف لە پێ بکات، بەڵام لە خوار قاپەڕەقەی قاچیەوە بیبڕێت، وە هیچ پۆشاکێک لەبەر مەکەن کە زەعفەران و وەرسی پێوە بێت.

## قەدەغە کردن لە لەسەر کردنی مێزەر لە ئیحرامدا

**٢٦٧٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَادَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ فَقَالَ: مَا نَلْبَسُ إِذَا أَحْرَمْنَا؟ قَالَ: لَا تَلْبَسِ الْقَمِيصَ وَلَا الْعِمَامَةَ، وَلَا السَّرَاوِيلَ وَلَا الْبُرْنُسَ، وَلَا الْخُفَّيْنِ إِلَّا أَنْ لَا تَجِدَ نَعْلَيْنِ فَإِنْ لَمْ تَجِدِ النَّعْلَيْنِ فَمَا دُونَ الْكَعْبَيْنِ»[1].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک بانگی کرد وتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ چی بپۆشین کاتێ ئیحرامان بەست؟ فەرمووی: نە کراس لەبەر بکەو نە مێزەر لەسەر بکەو نە شەرواڵ لە پێ بکەو نە ڕۆبی کڵاودار لەبەر بکەو نە خوف لە پێ بکە، مەگەر نەعلت دەست نەکەوێ، ئەگەر نەعلت دەست نەکەوت ئەوە با لە خوار قاپەڕەقەی قاچەوە بێت.

**٢٦٧٧-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَادَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ، فَقَالَ: مَا نَلْبَسُ إِذَا أَحْرَمْنَا؟ قَالَ: لَا تَلْبَسِ الْقَمِيصَ، وَلَا الْعَمَائِمَ، وَلَا الْبَرَانِسَ، وَلَا السَّرَاوِيلَاتِ، وَلَا الْخِفَافَ، إِلَّا أَنْ لَا يَكُونَ نِعَالٌ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ نِعَالٌ فَخُفَّيْنِ دُونَ الْكَعْبَيْنِ، وَلَا ثَوْباً مَصْبُوغاً بِوَرْسٍ، أَوْ زَعْفَرَانٍ، أَوْ مَسَّهُ وَرْسٌ، أَوْ زَعْفَرَانٌ»[2].

واتە: ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێت دەڵێ: پیاوێک بانگی کرد وتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ چی بپۆشین کاتێ ئیحرامان بەست؟ فەرمووی: نە کراس لەبەر بکە و نە مێزەر لەسەر بکە و نە ڕۆبی کڵاودار لەبەر بکە و نە شەرواڵ لە پێ بکە و نە خوف لە پێ بکە، مەگەر نەعلت دەست نەکەوێ، ئەگەر نەعلت دەست نەکەوت ئەوە با

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




لە خوار قاپەڕەقەی قاچەوە بێت، هەروەها جلێكی ڕەنگ كراویش بە وەرس یان زەعفەران، یان وەرسی بەركەوتبێ یان زەعفەران.

## قەدەغە كردن لە لەپێ كردنی خوفەكان لە ئیحرام

**٢٦٧٨-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: لَا تَلْبَسُوا فِي الْإِحْرَامِ الْقَمِيصَ، وَلَا السَّرَاوِيلَاتِ، وَلَا الْعَمَائِمَ، وَلَا الْبَرَانِسَ، وَلَا الْخِفَافَ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێت دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: لە ئیحرامدا نە كراس بپۆشن نە شەرواڵ نە مێزەر نە ڕۆبی كڵاودار نە خوف لە پێ بكەن.**

## ڕێگەدان لە لەپێ كردنی خوفەكان لە ئیحرامدا بۆ كەسێک نەعلی دەست نەكەوێت

**٢٦٧٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِذَا لَمْ يَجِدْ إِزَاراً، فَلْيَلْبَسِ السَّرَاوِيلَ، وَإِذَا لَمْ يَجِدِ النَّعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسِ الْخُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر پشتەماڵی دەست نەكەوت ئەوە با شەرواڵ لە پێ بكات، وە ئەگەر نەعلیشی دەست نەكەوت، با خوف لە پێ بكات، بەڵام لە خوار قاپەڕەقەیەوە بیبڕێتەوە.**

## بڕینی (خوفەكان) تا خوار هەردوو قاپەڕەقە

**٢٦٨٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا لَمْ يَجِدِ الْمُحْرِمُ النَّعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسِ الْخُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. دون : «وَلْيَقْطَعْهُمَا» فإنه شاذ.

(٣) صحيح.

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئەو كەسەی ئیحرامی بەستووە نەعلی دەست نەكەوت، با خوف لە پێ بكات، وە با لە خوار قاپەڕەقەیەوە بیبڕێت.

## قەدەغە كردن لەوەی ئافرەتی ئیحرام بەستوو دەستكێش لە دەست بكات

**٢٦٨١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً قَامَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَاذَا تَأْمُرُنَا أَنْ نَلْبَسَ مِنَ الثِّيَابِ فِي الْإِحْرَامِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَلْبَسُوا الْقُمُصَ، وَلَا السَّرَاوِيلَاتِ، وَلَا الْخِفَافَ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ رَجُلٌ لَهُ نَعْلَانِ، فَلْيَلْبَسِ الْخُفَّيْنِ أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلَا يَلْبَسْ شَيْئاً مِنَ الثِّيَابِ مَسَّهُ الزَّعْفَرَانُ، وَلَا الْوَرْسُ، وَلَا تَنْتَقِبُ الْمَرْأَةُ الْحَرَامُ، وَلَا تَلْبَسُ الْقُفَّازَيْنِ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک هەڵسا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا فەرمانی چی پۆشاكێكمان پێدەكەیت لە ئیحرامدا بیپۆشین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نە كراس لەبەر بكەن و، نە شەرواڵ لە پێ بكەن و، نە خوف لە پێ بكەن، مەگەر كەسێک نەعلی دەست نەكەوێ، ئەوە با خوف لە پێ بكات، بەڵام لە خوار قاپەڕەقەی قاچیەوە بیبڕێت، وە هیچ پۆشاكێک لەبەر نەكات كە زەعفەران یان وەرسی بەركەوتبێت، وە با ئافرەت پەچە نەكات و دەستكێشیش لە دەست نەكات.

## قژ پێكەوە نووسان لە كاتی ئیحرام

**٢٦٨٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ أُخْتِهِ حَفْصَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قُلْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا شَأْنُ النَّاسِ حَلُّوا، وَلَمْ تَحِلَّ مِنْ عُمْرَتِكَ؟ قَالَ: إِنِّي لَبَّدْتُ رَأْسِي، وَقَلَّدْتُ هَدْيِي، فَلَا أُحِلُّ حَتَّى أُحِلَّ مِنَ الْحَجِّ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر دەگێڕێتەوە: لە حەفصەی خوشكیەوە رضي الله عنها دەڵێ: بە پێغەمبەرم ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا خەڵكی بۆچی ئیحرامیان شكاندووە بۆ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٦٦ و ١٦٩٧ و ١٧٢٥ و ٤٣٩٨ و ٥٩١٦، ومسلم: ١٢٢٩، وأبو داود: ١٨٠٦، وإبن ماجه: ٣٠٤٦.




**عومرە کەچی تۆ ئیحرامت نەشکاندوە لە عومرەکەت؟ فەرمووی: من قژم پێکەوە نووساندوە، قوربانیم دیاری کردوە، ئیحرامەکەم ناشکێنم هەتا لە حەج دەبمەوە.**

**٢٦٨٣-** «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يُهِلُّ مُلَبِّداً»[١].

**واتە: سالم دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی دەنگی بەرز دەکردنەوە لە ئیحرامی بەستندا بە: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إنَّ الحَمْدَ والنِّعْمَةَ لَكَ والمُلْكَ لا شَرِيكَ لَكَ)، سریژ و هەنگوینی لە قژی دەدا تا وەک لەباو یەک بگرێ و هەڵنەوەشێ.**

## ڕێگە پێدانی بۆنخۆش کردن لە کاتی ئیحرام

**٢٦٨٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، عِنْدَ إِحْرَامِهِ حِينَ أَرَادَ أَنْ يُحْرِمَ، وَعِنْدَ إِحْلَالِهِ، قَبْلَ أَنْ يُحِلَّ بِيَدَيَّ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بۆن خۆش کرد بە دەستی خۆم لە کاتی ئیحرام بەستنی، کاتێ ویستی ئیحرام بکات، وە کاتێ شکاندنی، پێش ئەوەی تەواف بکات.**

**٢٦٨٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِإِحْرَامِهِ، قَبْلَ أَنْ يُحْرِمَ، وَلِحِلِّهِ قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بۆن خۆش کرد بۆ ئیحرام بەستنی، پێش ئەوەی ئیحرام ببەستێ، وە بۆ شکاندنیشی پێش ئەوەی تەوافی ماڵی خوا بکات.**

**٢٦٨٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِإِحْرَامِهِ، قَبْلَ أَنْ يُحْرِمَ، وَلِحِلِّهِ حِينَ أَحَلَّ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٣٩ و ١٧٥٤ و ٤٩٢٢ و ٥٩٢٨ و ٥٩٣٠، ومسلم: ٣١ و ١١٨٩/٣٨، وأبو داود: ١٧٤٥، والترمذي: ٩١٧، وإبن ماجه: ٢٩٢٦ و ٣٠٤٢.




**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بۆن خۆش کرد بۆ ئیحرام بەستنی، پێش ئەوەی ئیحرام ببەستێ، وە بۆ شکاندنیشی کاتێ کە شکاندی.**

**٢٦٨٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِحُرْمِهِ، حِينَ أَحْرَمَ، وَلِحِلِّهِ بَعْدَ مَا رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ، قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ»(١).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بۆن خۆش کرد بۆ ئیحرام بەستنی، کاتێ ئیحرامی بەست، وە بۆ شکاندنیشی دوای ئەوەی شەیتانی بەرد باران کرد، پێش ئەوەی تەوافی ماڵی خوا بکات.**

**٢٦٨٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِإِحْلَالِهِ، وَطَيَّبْتُهُ لِإِحْرَامِهِ طِيباً لَا يُشْبِهُ طِيبَكُمْ هَذَا، تَعْنِي لَيْسَ لَهُ بَقَاءٌ»(٢).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بۆن خۆش کرد لە کاتی ئیحرام شکاندنی، وە بە بۆنێک بۆن خۆشم کرد لە کاتی ئیحرام بەستنی بەم بۆن خۆش کردنەتان نەدەچوو، واتە: بۆنەکە نەدەمایەوە.**

**٢٦٨٩-** «عَن عُرْوَةَ ﷺ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ بِأَيِّ شَيْءٍ طَيَّبْتِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَتْ: بِأَطْيَبِ الطِّيبِ، عِنْدَ حُرْمِهِ وَحِلِّهِ»(٣).

**واتە: عوروە ﷺ دەڵێ: بە عائیشەم وت بە چی شتێک پێغەمبەری خوات ﷺ بۆن خۆش کرد؟ وتی: بە خۆشترین بۆن، لە کاتی ئیحرام بەستنی و لە کاتی شکاندنیشی.**

**٢٦٩٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أُطَيِّبُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، عِنْدَ إِحْرَامِهِ، بِأَطْيَبِ مَا أَجِدُ»(٤).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من پێغەمبەری خوام ﷺ بۆن خۆش دەکرد لە کاتی ئیحرامدا بە خۆشترین بۆنێ کە لە لام بووایە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**٢٦٩١-** «عَنْ عَائِشَة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أُطَيِّبُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، بِأَطْيَبِ مَا أَجِدُ لِحُرْمِهِ، وَلِحِلِّهِ وَحِينَ يُرِيدُ أَنْ يَزُورَ الْبَيْتَ»[١].

**واته: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من پێغەمبەری خوام ﷺ بۆن خۆش دەکرد له کاتی ئیحرامدا به خۆشترین بۆنێ که له لام بووایه.**

**٢٦٩٢-** «عَنْ عَائِشَةِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَبْلَ أَنْ يُحْرِمَ، وَيَوْمَ النَّحْرِ، قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ، بِطِيبٍ فِيهِ مِسْكٌ»[٢].

**واته: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بۆن خۆش کرد به بۆنێک له میسک پێش ئەوەی ئیحرام ببەستێ، وه له ڕۆژی سەربڕیندا (ڕۆژی دەیەمی (ذي الحجة)ەیه که دەکاته یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان، بۆیه ناو نراوه به (النَّحْر) سەربڕین، چونکه خەڵکی قوربانی زۆری تێدا دەکەن)، پێش ئەوەی تەوافی ماڵی خوا بکات.**

**٢٦٩٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ الطِّيبِ فِي رَأْسِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ مُحْرِمٌ»[٣].

**واته: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هەر وەکو ئێستا بریقەی بۆنه خۆشەکەم له نێوەڕاستی سەری پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینی، له ئیحرامیشدا بوو.**

**٢٦٩٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: لَقَدْ كَانَ يُرَى وَبِيصُ الطِّيبِ، فِي مَفَارِقِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ مُحْرِمٌ»[٤].

**واته: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بەڕاستی بریقەی بۆنی خۆش له نێوەڕاستی سەر پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینرا کاتێ له ئیحرامدا بوو.**

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

## شوێنی بۆنی خۆش لە کاتی ئیحرام

**٢٦٩٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ الطِّيبِ فِي رَأْسِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ مُحْرِمٌ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هەر وەکو ئێستا بریقەی بۆنە خۆشەکەم لە نێوەڕاستی سەر پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینی، کاتێ لە ئیحرامدا بوو.**

**٢٦٩٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ الطِّيبِ فِي أُصُولِ شَعْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ مُحْرِمٌ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من تەماشای بریقەی بۆنی خۆشم دەکرد لە ناو قژی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ لە ئیحرامدا بوو.**

**٢٦٩٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ الطِّيبِ فِي مَفْرِقِ رَأْسِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ مُحْرِمٌ»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هەر وەکو ئێستا بریقەی بۆنە خۆشەکەم لە نێوەڕاستی سەر پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینی، کاتێ لە ئیحرامدا بوو.**

**٢٦٩٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: لَقَدْ رَأَيْتُ وَبِيصَ الطِّيبِ فِي رَأْسِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ مُحْرِمٌ»[٤].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بەڕاستی بریقەی بۆنی خۆشم دەبینی لەسەری پێغەمبەری خوا ﷺ، کاتێ لە ئیحرامدا بوو.**

**٢٦٩٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ الطِّيبِ فِي مَفَارِقِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يُهِلُّ»[٥].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح.




**واته: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هەر وەکو ئێستا بریقەی بۆنە خۆشەکەم لە نێوەڕاستی سەری پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینی، کاتێ لە ئیحرامدا بوو.**

**٢٧٠٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يُحْرِمَ ادَّهَنَ بِأَطْيَبِ، مَا يَجِدُهُ حَتَّى أَرَى وَبِيصَهُ فِي رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ»[١].

**واته: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ بیویستایە ئیحرام ببەستێ پرچی چەور دەکرد، ئەوەندی لەبەر دەستیدا بووایە، تا بریقەیم دەبینی لەسەر سەر ڕیشی پێغەمبەر ﷺ.**

**٢٧٠١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أُطَيِّبُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، بِأَطْيَبِ مَا كُنْتُ أَجِدُ مِنَ الطِّيبِ حَتَّى أَرَى وَبِيصَ الطِّيبِ فِي رَأْسِهِ، وَلِحْيَتِهِ قَبْلَ أَنْ يُحْرِمَ»[٢].

**واته: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من پێغەمبەری خوام ﷺ بۆن خۆش دەکرد لە کاتی ئیحرامدا بە خۆشترین بۆنێک کە لە لام بووایە، تا بریقەی بۆنەکەم بەسەر و ڕیشیەوە دەبینی، پێش ئەوەی ئیحرام ببەستێ.**

**٢٧٠٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: لَقَدْ رَأَيْتُ وَبِيصَ الطِّيبِ، فِي مَفَارِقِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، بَعْدَ ثَلَاثٍ»[٣].

**واته: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بەڕاستی بریقەی بۆنی خۆشم دەبینی لەسەری پێغەمبەری خوا ﷺ، دوای سێ ڕۆژ.**

**٢٧٠٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَرَى وَبِيصَ الطِّيبِ فِي مَفْرِقِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بَعْدَ ثَلَاثٍ»[٤].

**واته: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هەر وەکو ئێستا بریقەی بۆنە خۆشەکەم لە نێوەڕاستی سەری پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینی، دوای سێ ڕۆژ.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧١ و ١٥٣٨ و ٥٩١٨ و ٥٩٢٣، ومسلم: ٣٩ و ١١٩٠/٤٥، وأبو داود: ١٧٣٦، وإبن ماجه: ٢٩٢٧ و ٢٩٢٨.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح لغيره. أخرجه إبن ماجه: ٢٩٢٨.




**٢٧٠٤-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْتَشِرِ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنِ الطِّيبِ عِنْدَ الْإِحْرَامِ، فَقَالَ: لَأَنْ أَطَّلِيَ بِالْقَطِرَانِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ ذَلِكَ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَائِشَةَ فَقَالَتْ: يَرْحَمُ اللَّهُ أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، لَقَدْ كُنْتُ أُطَيِّبُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَيَطُوفُ فِي نِسَائِهِ، ثُمَّ يُصْبِحُ يَنْضَحُ طِيباً»[1].

**واتە: موحەممەدی کوڕی مونتەشیر دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) لە کاتی ئیحرام، وتی: ئەگەر ڕەشم بکەن بە قیر لەوە پێم خۆشترە بۆنی خۆش بدەم لە خۆم، ئەوەم باس کرد بۆ عائیشە، وتی: خوا ڕەحم بە باوکی عەبدوڕڕەحمان بکات، چونکە من پێغەمبەری خوام ﷺ بۆن خۆش دەکرد دەچوو بۆ لای خێزانەکانی، پاشان بەیانی دەکردەوە بۆنی خۆشی بڵاو دەکردەوە.**

**٢٧٠٥-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْتَشِرِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: لَأَنْ أُصْبِحَ مُطَّلِياً بِقَطِرَانٍ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أُصْبِحَ مُحْرِماً أَنْضَحُ طِيباً، فَدَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ فَأَخْبَرْتُهَا بِقَوْلِهِ، فَقَالَتْ: طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَطَافَ فِي نِسَائِهِ، ثُمَّ أَصْبَحَ مُحْرِماً»[2].

**واتە: موحەممەدی کوڕی مونتەشیر دەگێڕێتەوە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئەگەر بەیانی بکەمەوە خۆم ڕەشم بکەم بەقیر لەوە پێم خۆشترە خۆم تەڕ بکەم بە بۆنی خۆش، ڕۆیشتم بۆ لای عائیشە هەواڵم پێدا بە قسەکەی، وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بۆن خۆش کرد، پاشان چوو بۆ لای خێزانەکانی، پاشان بەیانی کردەوە بە ئیحرام پۆشی.**

## بەکارهێنانی زەعفەران بۆ ئیحرام پۆش

**٢٧٠٦-** «عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَتَزَعْفَرَ الرَّجُلُ»[3].

**واتە: ئەنەس رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە پیاوێک لە ئیحرامدا زەعفەران بەکاربێنێ.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٧ و ٢٧٠، ومسلم: ٤٧ و ١١٩٢/٤٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٤٦، ومسلم: ٢١٠١، وأبو داود: ٤١٧٩، والترمذي: ٢٨١٥.




**٢٧٠٧-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَنِ التَّزَعْفُرِ»[١].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەکارهێنانی زەعفەرانی قەدەغە کردوە لە ئیحرامدا.**

**٢٧٠٨-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، نَهَى عَنِ التَّزَعْفُرِ»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەکارهێنانی زەعفەرانی قەدەغە کردوە لە ئیحرامدا.**

## دەربارەی بەکارهێنانی (خَلُوق) بۆ ئیحرام پۆش[٣]

**٢٧٠٩-** «عَنْ صَفْوَانَ بْنِ يَعْلَى، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، وَقَدْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، وَعَلَيْهِ مُقَطَّعَاتٌ وَهُوَ مُتَضَمِّخٌ بِخَلُوقٍ، فَقَالَ: أَهْلَلْتُ بِعُمْرَةٍ فَمَا أَصْنَعُ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَا كُنْتَ صَانِعاً فِي حَجِّكَ، قَالَ: كُنْتُ أَتَّقِي هَذَا، وَأَغْسِلُهُ، فَقَالَ: مَا كُنْتَ صَانِعاً فِي حَجِّكَ، فَاصْنَعْهُ فِي عُمْرَتِكَ»[٤].

**واتە: صەفوانی کوڕی یەعلا دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە، (خوا لێیان ڕازی بێ)، پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئیحرامی بەستبوو بۆ عومرە، جلێکی پارچە پارچەی لەبەردا بوو دووری بووی بەیەکترەوە و بۆن خۆشی کردبوو بە (خَلُوق)، وتی: ئیحرامم بەستووە بە عومرە چی بکەم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە حەجدا چیت دەکرد، وتی: من خۆم دەپاراست لەمە و دەمشۆرد، فەرمووی: ئەوەی لە حەجەکەتدا کردووتە بە هەمان شێوە لە عومرەکەدا بیکە.**

**٢٧١٠-** «عَنْ صَفْوَانَ بْنِ يَعْلَى، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَجُلٌ وَهُوَ بِالْجِعِرَّانَةِ، وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ وَهُوَ مُصَفِّرٌ لِحْيَتَهُ وَرَأْسَهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَحْرَمْتُ بِعُمْرَةٍ وَأَنَا كَمَا تَرَى؟ فَقَالَ: انْزِعْ عَنْكَ الْجُبَّةَ، وَاغْسِلْ عَنْكَ الصُّفْرَةَ، وَمَا كُنْتَ صَانِعاً فِي حَجَّتِكَ، فَاصْنَعْهُ فِي عُمْرَتِكَ»[٥].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.

(٣) (خَلُوق): بۆنێکی ناسراوی خۆشە لە زەعفەران پێکدەهێندرێت ڕەنگی سوورو زەرد ئەڕوانێ.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح.




واتە: صەفوانی کوڕی یەعلا دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە جیعرانە بوو، جوبەیەکی لەبەردا بوو، قژو سەری زەرد کردبوو بە (خَلُوق)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من ئیحرامم بەستبوو بۆ عومرەو بەم شێوەیەم؟ فەرمووی: جوبەکە لەبەرت دابکەنەو ئەو زەردیەش بشۆرە ئەوەی لە حەجەکەتدا کردووتە بەهەمان شێوە لە عومرەکەدا بیکە.

## چاو ڕەشتن بۆ ئیحرام پۆش

**٢٧١١-** «عَنْ أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فِي الْمُحْرِمِ إِذَا اشْتَكَى رَأْسَهُ، وَعَيْنَيْهِ أَنْ يُضَمِّدَهُمَا بِصَبِرٍ»[1].

واتە: ئەبانی کوڕی عوسمان دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کەسێک لە ئیحرامدا تووشی سەر ئێشە بوو، وە چاوەکانی دەئێشا با لەسەر خۆی بیانپێچێتەوە.

## پۆشینی پۆشاکی ڕەنگ کراو کەراهەتی هەیە بۆ ئیحرام پۆش

**٢٧١٢-** «عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: أَتَيْنَا جَابِراً ﷺ فَسَأَلْنَاهُ عَنْ حَجَّةِ النَّبِيِّ ﷺ، فَحَدَّثَنَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي، مَا اسْتَدْبَرْتُ لَمْ أَسُقِ الْهَدْيَ، وَجَعَلْتُهَا عُمْرَةً، فَمَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ فَلْيُحْلِلْ، وَلْيَجْعَلْهَا عُمْرَةً، وَقَدِمَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ مِنَ الْيَمَنِ بِهَدْيٍ، وَسَاقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، مِنَ الْمَدِينَةِ هَدْياً وَإِذَا فَاطِمَةُ قَدْ لَبِسَتْ ثِيَاباً صَبِيغاً، وَاكْتَحَلَتْ قَالَ: فَانْطَلَقْتُ مُحَرِّشاً أَسْتَفْتِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ فَاطِمَةَ لَبِسَتْ ثِيَاباً صَبِيغاً، وَاكْتَحَلَتْ، وَقَالَتْ: أَمَرَنِي بِهِ أَبِي ﷺ قَالَ: صَدَقَتْ، صَدَقَتْ، صَدَقَتْ، أَنَا أَمَرْتُهَا»[2].

واتە: جەعفەری کوڕی موحەممەد دەڵێ: باوکم بۆی باسکردم وتی: هاتین بۆ لای جابر ﷺ پرسیاری حەجی پێغەمبەرمان لێکرد، ئەویش بۆمان گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو بۆچوونەی ئێستا هەمە ئەوسا هەمبووایە ئاژەڵی قوربانیم لەگەڵ خۆم نەدەهێناو دەمکرد بە عومرە، هەر کەس قوربانی نەهێناوە با ئیحرام

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٩ و ١٢٠٤/٩٠، وأبو داود: ١٨٣٨ و ١٨٣٩، والترمذي: ٩٥٢.

(٢) صحيح.




ببەستێ و بیکات بە عومرە، عەلی لە یەمەن گەڕایەوە قوربانی لەگەڵ خۆی هێنا بوو، پێغەمبەریش ﷺ لە مەدینەوە قوربانی هێنا بوو، بینی فاتیمە جلێکی ڕەنگاو ڕەنگی لەبەر کردبو و، وە چاویشی ڕەشتبوو، وتی: بە توڕەییەوە ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێبکەم لەوبارەیەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا فاتیمە جلێکی ڕەنگکراوی لەبەر کردوە و چاویشی ڕەشتووە، وتیشی: باوکم ﷺ فەرمانی پێکردم، فەرمووی: ڕاست دەکات، ڕاست دەکات، ڕاست دەکات، من فەرمانم پێکردوە.

## دانەپۆشینی سەرو ڕوخساری ئیحرام پۆش

**٢٧١٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً وَقَعَ عَنْ رَاحِلَتِهِ، فَأَقْعَصَتْهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَيُكَفَّنُ فِي ثَوْبَيْنِ خَارِجاً رَأْسُهُ وَوَجْهُهُ، فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّياً»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک وڵاخەکەی فڕێیدایە خوارەوە دەستبەجێ کوشتی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بە ئاوو سیدر بیشۆرن، کفنی بکەن لە دوو پۆشاکدا سەرو ڕوخساری با لە دەرەوە بێت، چونکە لە ڕۆژی دواییدا زیندو دەکرێتەوە تەلبیە دەکات.

**٢٧١٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: مَاتَ رَجُلٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ، وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِي ثِيَابِهِ، وَلَا تُخَمِّرُوا وَجْهَهُ وَرَأْسَهُ، فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّياً»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک مرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە ئاوو سیدر بیشۆرن، کفنی بکەن بەجلەکانیەوە، ڕوخسارو سەری دامەپۆشن، چونکە لە ڕۆژی دواییدا زیندوو دەکرێتەوە تەلبیە دەکات.

## ئیحرام بەستن بە تەنها بۆ حەج

**٢٧١٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَفْرَدَ الْحَجَّ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢١١/١٢٢، وأبو داود: ١٧٧٧، والترمذي: ٨٢٠، وإبن ماجه: ٢٩٦٤ و ٢٩٦٥.




**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئیفرادی کرد بە حەج، (واتە: بە تەنها ئیحرامی بەست بۆ حەج).**

**٢٧١٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أَهَلَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْحَجِّ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئیحرامی بەست بۆ حەج.**

**٢٧١٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، مُوَافِينَ لِهِلَالِ ذِي الْحِجَّةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ شَاءَ أَنْ يُهِلَّ بِحَجٍّ فَلْيُهِلَّ، وَمَنْ شَاءَ أَنْ يُهِلَّ بِعُمْرَةٍ فَلْيُهِلَّ بِعُمْرَةٍ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین لە نزیک هاتنی مانگی (ذِي الْحِجَّة) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکەس دەیەوێ ئیحرام ببەستێ بۆ حەج با ئیحرام ببەستێ، هەرکەسیش دەیەوێ ئیحرام ببەستێ بۆ عومرە با ئیحرام ببەستێ بۆ عومرە.**

**٢٧١٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَا نَرَى إِلَّا أَنَّهُ الْحَجُّ»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین تەنها مەبەستمان حەج بوو.**

## نیەت هێنانی حەج و عومرە پێکەوە (الْقِرَان)

**٢٧١٩-** «عَنْ أَبِي وَائِلٍ، قَالَ: قَالَ الصُّبَيُّ بْنُ مَعْبَدٍ: كُنْتُ أَعْرَابِيّاً نَصْرَانِيّاً فَأَسْلَمْتُ، فَكُنْتُ حَرِيصاً عَلَى الْجِهَادِ، فَوَجَدْتُ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ مَكْتُوبَيْنِ عَلَيَّ، فَأَتَيْتُ رَجُلاً مِنْ عَشِيرَتِي يُقَالُ لَهُ هُرَيْمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ فَسَأَلْتُهُ فَقَالَ: اجْمَعْهُمَا، ثُمَّ اذْبَحْ مَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ، فَأَهْلَلْتُ بِهِمَا، فَلَمَّا أَتَيْتُ الْعُذَيْبَ لَقِيَنِي سَلْمَانُ بْنُ رَبِيعَةَ وَزَيْدُ بْنُ صُوحَانَ، وَأَنَا أُهِلُّ بِهِمَا، فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِلْآخَرِ: مَا هَذَا بِأَفْقَهَ مِنْ بَعِيرِهِ، فَأَتَيْتُ عُمَرَ ﷺ فَقُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ إِنِّي أَسْلَمْتُ، وَأَنَا حَرِيصٌ عَلَى الْجِهَادِ، وَإِنِّي وَجَدْتُ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ مَكْتُوبَيْنِ عَلَيَّ، فَأَتَيْتُ هُرَيْمَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ فَقُلْتُ: يَا هَنَاهْ

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٦٢ و ٤٤٠٨، ومسلم: ١٢١١/١١٨، وأبو داود: ١٧٧٩ و ١٧٨٠.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




إِنِّي وَجَدْتُ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ مَكْتُوبَيْنِ عَلَيَّ، فَقَالَ: اجْمَعْهُمَا، ثُمَّ اذْبَحْ مَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ، فَأَهْلَلْتُ بِهِمَا، فَلَمَّا أَتَيْنَا الْعُذَيْبَ لَقِيَنِي سَلْمَانُ بْنُ رَبِيعَةَ وَزَيْدُ بْنُ صُوحَانَ فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِلْآخَرِ: مَا هَذَا بِأَفْقَهَ مِنْ بَعِيرِهِ، فَقَالَ عُمَرُ: هُدِيتَ لِسُنَّةِ نَبِيِّكَ ﷺ»[1].

**واتە: ئەبو وائیل دەڵێ: صەبی کوڕی مەعبەد دەڵێ: من پیاوێکی دەشتەکی گاور بووم، پاشان مسوڵمان بووم، زۆر سور بووم لەسەر جیهاد کردن، تەماشام کرد حەج و عومرە لەسەرم پێویستن، هاتم بۆ لای پیاوێک لە هۆزەکەم پێی دەوترا: هورەیمی کوڕی عەبدوڵڵا پرسیارم لێ کرد وتی: هەردووکیان پێکەوە بکە، پاشان چی بۆت ئاسان بوو بیکە بە قوربانی، منیش ئیحرامم بە نیەتی هەردووکیان بەست، کاتێ کە گەیشتم بە (الْعُذَيْبَ) سەلمانی کوڕی ڕەبیعە و زەیدی کوڕی صوحانم پێگەیشت، منیش ئیحرامم بۆ هەردووکیان بەستبوو، یەکێکیان بە ئەوی تری وت: ئەمە لە وشترەکەی ژیرتر نیە، هاتم بۆ لای عومەر ﷺ وتم: ئەی ئەمیری بڕواداران من مسوڵمان بووم، وە سور بووم لەسەر جیهاد کردن، بینیم حەج و عومرە لەسەرم پێویستن، هاتم بۆ لای هورەیمە کوڕی عەبدوڵڵا وتم: من دەبینم حەج و عومرە لەسەرم پێویستن، وتی: هەردووکیان پێکەوە کۆبکەرەوە، پاشان هەرچی لە تواناتدا هەیە بیکە بە قوربانی، منیش ئیحرامم بۆ هەردووکیان بەست، کاتێ هاتینە (الْعُذَيْب) سەلمانی کوڕی ڕەبیعە و زەیدی کوڕی صوحانم پێگەیشت، یەکێکیان بە ئەوی تری وت: ئەمە لە وشترەکەی ژیرتر نیە، عومەر وتی: ڕێنمایی کراوی بۆ سوننەتی پێغەمبەرەکەت ﷺ.**

**٢٧٢٠-** «عَنْ شَقِيقٍ، قَالَ: أَنْبَأَنَا الصُّبَيُّ فَذَكَرَ مِثْلَهُ، قَالَ: فَأَتَيْتُ عُمَرَ ﷺ فَقَصَصْتُ عَلَيْهِ الْقِصَّةَ إِلَّا قَوْلَهُ يَا هَنَاهْ»[2].

**واتە: شەقیق دەڵێ: صوبە بۆی باس کردین وەکو ئەوەی پێشوو، وتی: هاتم بۆ لای عومەر ﷺ باسەکەم بۆی گێڕایەوە جگە لەم وتەیەی: (يَا هَنَاهْ).**

**٢٧٢١-** «عَنْ أَبِي وَائِلٍ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ بَنِي تَغْلِبَ يُقَالُ لَهُ: الصُّبَيُّ بْنُ مَعْبَدٍ وَكَانَ نَصْرَانِيّاً فَأَسْلَمَ فَأَقْبَلَ فِي أَوَّلِ مَا حَجَّ ، فَلَبَّى بِحَجٍّ وَعُمْرَةٍ جَمِيعاً، فَهُوَ كَذَلِكَ يُلَبِّي بِهِمَا جَمِيعاً، فَمَرَّ عَلَى سَلْمَانَ

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٧٩٨ و ١٧٩٩، وإبن ماجه: ٢٩٧.

(٢) صحيح.




بْنِ رَبِيعَةَ وَزَيْدِ بْنِ صُوحَانَ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا: لَأَنْتَ أَضَلُّ مِنْ جَمَلِكَ، هَذَا فَقَالَ الصُّبَيُّ: فَلَمْ يَزَلْ فِي نَفْسِي حَتَّى لَقِيتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: هُدِيتَ لِسُنَّةِ نَبِيِّكَ ﷺ»[1].

**واتە: ئەبو وائیل دەگێڕێتەوە پیاوێک لە بەنی تەغلیب پێی دەوترا: صوبەی کوڕی مەعبەد پیاوێکی گاور بوو، دواتر مسوڵمان بوو یەکەم جار هات بۆ حەج ئیحرامی بۆ حەج و عومرە بەست پێکەوە، تێپەڕی بەلای سەلمانی کوڕی ڕەبیعە و زەیدی کوڕی صوحان، یەکێکیان وتی: تۆ لە وشترەکەت گەمژە تری، صوبەی وتی: بەردەوام ئەمە لە دەروونمدا بوو تا گەیشتم بە عومەری کوڕی خەطاب ﷺ و ئەوەم بۆی باس کرد، وتی: ڕێنمایی کراوی بۆ سوننەتی پێغەمبەرەکەت ﷺ.**

**٢٧٢٢-** «عَنْ مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ، قَالَ: كُنْتُ جَالِساً عِنْدَ عُثْمَانَ فَسَمِعَ عَلِيّاً رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يُلَبِّي بِعُمْرَةٍ، وَحَجَّةٍ، فَقَالَ: أَلَمْ نَكُنْ نُنْهَى عَنْ هَذَا، قَالَ: بَلَى، وَلَكِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: يُلَبِّي بِهِمَا جَمِيعاً، فَلَمْ أَدَعْ قَوْلَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، لِقَوْلِكَ»[2].

**واتە: مەڕوانی کوڕی حەکەم دەڵێ: من دانیشتبووم لای عوسمان گوێی لە عەلی بوو (خوا لێیان ڕازی بێ) تەلبیەی دەکرد بە حەج و عومرە، وتی: ئایا ئێمە ئەمەمان قەدەغە نەکردوە، وتی: بەڵێ، بەڵام من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو تەلبیەی کرد بە هەردووکیان پێکەوە، واز لە وتەی پێغەمبەری خوا ﷺ ناهێنم لەبەر قسەی تۆ.**

**٢٧٢٣-** «عَنْ مَرْوَانَ، أَنَّ عُثْمَانَ نَهَى عَنِ الْمُتْعَةِ، وَأَنْ يَجْمَعَ الرَّجُلُ بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، فَقَالَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: لَبَّيْكَ بِحَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ مَعاً، فَقَالَ عُثْمَانُ: أَتَفْعَلُهَا، وَأَنَا أَنْهَى عَنْهَا، فَقَالَ عَلِيٌّ: لَمْ أَكُنْ لِأَدَعَ سُنَّةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لِأَحَدٍ مِنَ النَّاسِ»[3].

**واتە: مەڕوان دەگێڕێتەوە عوسمان ڕێگری کرد لە (الْمُتْعَة)، وە لەوەی کەسێک حەج و عومرە پێکەوە کۆبکاتەوە، عەلی (خوا لێیان ڕازی بێ) وتی: تەلبیەی حەج و عەمرەی کرد پێکەوە، عوسمان وتی: ئایا پێکەوە دەیانکەی، لە کاتێکدا من ڕێگری لێدەکەم، عەلی وتی: لەبەر قسەی هیچ کەسێک واز لە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ناهێنم.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٦٣، ومسلم: ٢٩٦٤ بنحوه.

(٣) صحيح.




**(الْمُتْعَة): واتە: کەسێک چوو بۆ حەج ئیحرام ببەستێت بە عومرە لە مانگەکانی حەجدا، هەر کە چووە ئەوێ تەواف بکات سەعی نێوان صەفا و مەروەش بکات، وە قژی کورت بکاتەوە یان بیتاشێ، دواتر ئیحرام لە خۆی بکاتەوە، وە هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵە تا کاتی حەج کردن، بەڵام پێویست دەبێت لەسەری کە خوێن بڕێژێت (ئاژەڵێک سەربڕێ).**

**٢٧٢٤-** «عَنْ شُعْبَةَ بِهَذَا الْإِسْنَادِ مِثْلَهُ»[١].

**واتە: شوعبە دەگێڕێتەوە: بەهەمان سەنەد وەکو فەرموودەکەی پێشوو.**

**٢٧٢٥-** «عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: كُنْتُ مَعَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ حِينَ أَمَّرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْيَمَنِ، فَلَمَّا قَدِمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ عَلِيٌّ: فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كَيْفَ صَنَعْتَ؟ قُلْتُ: أَهْلَلْتُ بِإِهْلَالِكَ، قَالَ: فَإِنِّي سُقْتُ الْهَدْيَ، وَقَرَنْتُ، قَالَ: وَقَالَ ﷺ لِأَصْحَابِهِ: لَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي، مَا اسْتَدْبَرْتُ لَفَعَلْتُ كَمَا فَعَلْتُمْ، وَلَكِنِّي سُقْتُ الْهَدْيَ، وَقَرَنْتُ»[٢].

**واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: من لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبو طالب بووم کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ کردی بە ئەمیر بەسەر یەمەنەوە، کاتێ هاتەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، عەلی وتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش پێمی فەموو: چیت کرد؟ وتم: ئیحرامم بەست وەکو ئیحرام بەستنی تۆ، فەرمووی: من ئاژەڵم لەگەڵ خۆم برد بۆ سەربڕین و حەج و عومرەم پێکەوە کۆکردەوە، وتی: پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: ئەو بۆچوونەی ئێستا هەمە ئەوسا هەمبووایە ئاژەڵی قوربانیم لەگەڵ خۆم نەدەهێنا، ئەگەر ئێستاش ئاژەڵی قوربانیم پێ نەبووایە ئیحرامم نەدەبەست.**

**٢٧٢٦-** «عَنْ حُمَيْدِ بْنِ هِلَالٍ، قَالَ: سَمِعْتُ مُطَرِّفاً، يَقُولُ: قَالَ لِي عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ ﷺ: جَمَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ حَجٍّ وَعُمْرَةٍ، ثُمَّ تُوُفِّيَ قَبْلَ أَنْ يَنْهَى عَنْهَا، وَقَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ الْقُرْآنُ بِتَحْرِيمِهِ»[٣].

**واتە: حومەیدی کوڕی هیلال دەڵێ: گوێم لە موتەڕڕیف بوو دەیوت: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ پێمی وت: پێغەمبەری خوا ﷺ حەج و عومرەی پێکەوە کۆکردەوە، پاشان**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٧٩٧.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥١٧ و ١٥١٨، ومسلم: ١٦٥ و ١٢٢٦/١٧٣، وإبن ماجه: ٢٩٧٨.

كۆچی دوایی كرد پێش ئەوەی قەدەغەی بكات، وە پێش ئەوەی قورئان دابەزێ بە قەدەغە كردنی.

**٢٧٢٧-** «عَنْ عِمْرَانَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ جَمَعَ بَيْنَ حَجٍّ وَعُمْرَةٍ، ثُمَّ لَمْ يَنْزِلْ فِيهَا كِتَابٌ، وَلَمْ يَنْهَ عَنْهُمَا النَّبِيُّ ﷺ، قَالَ فِيهِمَا رَجُلٌ بِرَأْيِهِ مَا شَاءَ»[١].

واتە: عیمران ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ حەج و عومرەی پێكەوە كۆكردەوە، پاشان قورئان دەربارەی دانەبەزی و قەدەغەی نەكرد. هەر كەسەو بە بۆچوونی خۆی ئەوەی بیویستایە دەیوت لەوبارەوە.

**٢٧٢٨-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: تَمَتَّعْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[٢].

واتە: عیمرانی كوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: نیەتی عومرەمان هێنا بە (تَمَتُّع) لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ.

(تَمَتُّع): واتە: كەسێک دەچێت بۆ حەج ئیحرام دەبەستێ بە عومرە لە مانگەكانی حەجدا.

**٢٧٢٩-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا، لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا»[٣].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: پەروەردگار پەیڕەویت دەكەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ كەچ دەكەم بە عومرەو حەج، پەروەردگار پەیڕەویت دەكەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ كەچ دەكەم بە عومرەو حەج، (واتە: تەلبیەی حەج و عومرەی دەكرد پێكەوە).

**٢٧٣٠-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُلَبِّي بِهِمَا»[٤].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو تەلبیە بۆ حەج و عومرە دەكرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢١٤ و ١٢٥١/٢١٥، وأبو داود: ١٧٩٥، والترمذي: ٨٢١، وإبن ماجه: ٢٩٦٨ و ٢٩٦٩.

(٤) صحيح.




**٢٧٣١-** «عَن بَكْرِ بن عبد اللّهِ الْمُزَنِيُّ قال سمعت أَنَساً ﷺ يُحَدِّثُ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُلَبِّي بِالْعُمْرَةِ وَالْحَجِّ جَمِيعَاً، فَحَدَّثْتُ بِذَلِكَ ابْنَ عُمَرَ فَقَالَ: لَبَّى بِالْحَجِّ وَحْدَهُ، فَلَقِيتُ أَنَساً فَحَدَّثْتُهُ، بِقَوْلِ ابْنِ عُمَرَ فَقَالَ أَنَسٌ: مَا تَعُدُّونَا إِلَّا صِبْيَاناً، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَبَّيْكَ عُمْرَةً، وَحَجّاً مَعاً»[(١)].

**واتە: بەکری کوڕی عەبدوڵڵای موزەنی دەڵێ: گوێم لە ئەنەس بوو باسی دەکرد وتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو تەلبیەی عومرەو حەجی پێکەوە دەکرد، ئەوەم بۆ ئیبنو عومەر باس کرد، وتی: بەتەنها تەلبیەی بۆ حەج کرد، گەیشتم بە ئەنەس قسەکەی ئیبنو عومەرم بۆی باس کرد، ئەنەس وتی: وا ئەزانن ئێمە منداڵین، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: پەروەردگار پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم بە عومرەو حەج پێکەوە.**

## تەمەتوع کردن

**تێبینی: (التَّمَتُّع): واتە: کەسێک دەچێت بۆ حەج ئیحرام دەبەستێ بە عومرە لە مانگەکانی حەجدا، کە گەیشتە ئەوێ ڕاستەوخۆ تەواف دەکات و سەعی نێوان صەفاو مەروە دەکات و قژی کورت دەکاتەوە، یاخود دەیتاشێ، پاشان ئیحرام لە خۆی دەکاتەوە و هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵە هەتا کاتی حەج کردن، پاشان ئیحرامی حەج دەبەستێ، ئەوکات عومرە جیا دەبێت لە حەج، بەڵام واجبە لەسەری کە خوێن بڕێژێ.**

**٢٧٣٢-** «عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عُمَر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: تَمَتَّعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ، وَأَهْدَى وَسَاقَ مَعَهُ الْهَدْيَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ، وَبَدَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَهَلَّ بِالْعُمْرَةِ، ثُمَّ أَهَلَّ بِالْحَجِّ، وَتَمَتَّعَ النَّاسُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ، فَكَانَ مِنَ النَّاسِ مَنْ أَهْدَى فَسَاقَ الْهَدْيَ، وَمِنْهُمْ مَنْ لَمْ يُهْدِ، فَلَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَكَّةَ قَالَ لِلنَّاسِ: مَنْ كَانَ مِنْكُمْ أَهْدَى، فَإِنَّهُ لَا يَحِلُّ مِنْ شَيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ، حَتَّى يَقْضِيَ حَجَّهُ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ أَهْدَى، فَلْيَطُفْ بِالْبَيْتِ، وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ وَلْيُقَصِّرْ، وَلْيَحْلِلْ، ثُمَّ لِيُهِلَّ بِالْحَجِّ، ثُمَّ لِيُهْدِ، وَمَنْ لَمْ يَجِدْ هَدْياً فَلْيَصُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ، وَسَبْعَةً إِذَا رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ، فَطَافَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ قَدِمَ مَكَّةَ، وَاسْتَلَمَ الرُّكْنَ أَوَّلَ شَيْءٍ، ثُمَّ خَبَّ ثَلَاثَةَ أَطْوَافٍ مِنَ السَّبْعِ، وَمَشَى أَرْبَعَةَ أَطْوَافٍ، ثُمَّ رَكَعَ حِينَ قَضَى

---

**(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٣٥٣ و ٤٣٥٤، ومسلم: ١٨٥ و ١٢٣٢/١٨٦.**




طَوَافَهُ بِالْبَيْتِ فَصَلَّى عِنْدَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ فَانْصَرَفَ فَأَتَى الصَّفَا فَطَافَ بِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ سَبْعَةَ أَطْوَافٍ، ثُمَّ لَمْ يَحِلَّ مِنْ شَيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ حَتَّى قَضَى حَجَّهُ وَنَحَرَ هَدْيَهُ يَوْمَ النَّحْرِ، وَأَفَاضَ فَطَافَ بِالْبَيْتِ، ثُمَّ حَلَّ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ، وَفَعَلَ مِثْلَ مَا فَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، مَنْ أَهْدَى وَسَاقَ الْهَدْيَ مِنَ النَّاسِ»[1].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجیماڵئاوایدا لە پێشدا ئیحرامی بە عومرە بەست پاشان بە حەج، وە مەڕێکی کرد بە فیدیە لە (ذِي الْحُلَيْفَة)، پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتا ئیحرامی بۆ عومرە بەست، پاشان ئیحرامی بە حەج بەست، خەڵکیش لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئیحرامیان بۆ عومرە بەست پاشان بۆ حەج، خەڵکانێک هەبوو فیدیەیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، هەندێکیشیان نەیان هێنابوو، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە مەککە بە خەڵکەکەی فەرموو: هەرکەس لە ئێوە کە فیدیەی لەگەڵ خۆی هێناوە ئەوە هیچ شتێک لەوانە کە لێی حەرام کراوە بۆی حەڵاڵ نیە، تا حەجەکەی تەواو دەکات، هەرکەسیش فیدیەی پێ نیە ئەوە با تەوافی بەیت و صەفاو مەروە بکات، وە مووی سەری ببڕێ و ئیحرام بشکێنێ، پاشان ئیحرام بۆ حەج ببەستێت و فیدیە بدات، ئەوەش توانای فیدیە دانی نیە با سێ ڕۆژ لە حەج بەڕۆژوو بێت، وە حەوت ڕۆژیش کاتێک گەڕایەوە ناو کەسوکاری، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک گەیشتە مەککە یەکەم شت دەستی دا لە بەردە ڕەشەکە، پاشان سێ سووڕی لە حەوت جارەکە بە هەروەلە کرد، چوار جارەکەی تریش بە ڕۆیشتن، وە دوو ڕکات نوێژی لای مەقامدا کرد کاتێ کە تەوافەکەی بە دەوری ماڵی خوا تەواو کرد، پاشان سەلامی دایەوەو هات بۆ صەفا حەوت جار لە نێوان صەفاو مەروەدا گەڕا، پاشان ئیحرامی نەشکاند، وە هیچ شتێک لەو شتانەی لێی حەرام بوو بۆی حەڵاڵ نەبوو تا حەجەکەی تەواو کرد، وە قوربانیەکەی لە ڕۆژی جەژندا سەربڕی، دواتر لە مینا هاتە خوارەوەو تەوافی ماڵی خوای کرد، پاشان ئیحرامی شکاند لەو شتانەی کە لێی حەرام بوو، ئەوانەشی کە ئاژەڵی قوربانیان هێنا بوو هەر وەک پێغەمبەری خوایان ﷺ کرد.**

---

(١) صحيح. لكن قوله: «وَبَدَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَهَلَّ بِالْعُمْرَةِ، ثُمَّ أَهَلَّ بِالْحَجِّ» فشاذ. أخرجه البخاري: ١٦٩١، ومسلم: ١٢٢٧، وأبو داود: ١٨٠٥.

**٢٧٣٣-** «عَن سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ يَقُولُ: حَجَّ عَلِيٌّ وَعُثْمَانُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فَلَمَّا كُنَّا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ نَهَى عُثْمَانُ عَنِ التَّمَتُّعِ فَقَالَ عَلِيٌّ إِذَا رَأَيْتُمُوهُ قَدْ ارْتَحَلَ فَارْتَحِلُوا فَلَبَّى عَلِيٌّ وَأَصْحَابُهُ بِالْعُمْرَةِ، فَلَمْ يَنْهَهُمْ عُثْمَانُ فَقَالَ عَلِيٌّ: أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَنْهَى عَنِ التَّمَتُّعِ «قَالَ: بَلَى، قَالَ لَهُ عَلِيٌّ: أَلَمْ تَسْمَعْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، تَمَتَّعَ، قَالَ: بَلَى»[١].

**واتە: سەعیدی کوڕی موسیب دەڵێ: عەلی و عوسمان (خوا لێیان ڕازی بێ) حەجیان کرد کاتێ ئێمە لە ڕێگا بووین، عوسمان ڕێگری کرد لە تەمەتوع، عەلی وتی: کاتێ بینیتان ئەو ڕۆیشت ئێوەش بڕۆن، عەلی و هاوەڵەکانی تەلبیەیان دەکرد بۆ عومرە، عوسمان ڕێگری لێنەکردن، عەلی وتی: هەواڵم پێدراوە ڕێگریت کردوە لە تەمەتوع، وتی: بەڵێ، عەلی پێی وت: ئایا نەتبیستووە پێغەمبەری خوا ﷺ تەمەتوعی کردوە، وتی: بەڵێ.**

**٢٧٣٤-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ الْحَارِثِ بْنِ نَوْفَلِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، أَنَّهُ سَمِعَ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ، وَالضَّحَّاكَ بْنَ قَيْسٍ، عَامَ حَجَّ مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ وَهُمَا يَذْكُرَانِ التَّمَتُّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَقَالَ الضَّحَّاكُ: لَا يَصْنَعُ ذَلِكَ، إِلَّا مَنْ جَهِلَ أَمْرَ اللَّهِ تَعَالَى؟ فَقَالَ سَعْدٌ: بِئْسَمَا قُلْتَ يَا ابْنَ أَخِي، قَالَ الضَّحَّاكُ فَإِنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ نَهَى عَنْ ذَلِكَ، قَالَ سَعْدٌ: قَدْ صَنَعَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَصَنَعْنَاهَا مَعَهُ»[٢].

**واتە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی حارثی کوڕی نەوفەلی کوڕی حارثی کوڕی عەبدولموطەلیب، ئەو گوێی لە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص و ضەحاکی کوڕی قەیس بوو، ئەو ساڵەی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﷺ حەجی کرد، هەردووکیان باسی تەمەتوعیان دەکرد بە عومرە بۆ حەج، ضەحاک وتی: کەس ئەوە ناکات مەگەر کەسێک بێئاگا بێت لە کتێبی خوا؟ سەعد وتی: قسەیەکی خراپت کرد ئەی برازا، ضەحاک وتی: عومەری کوڕی خەطاب ڕێگری لەوە کردوە، سەعد وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کردوویەتی ئێمەش لەگەڵی کردوومانە.**

**٢٧٣٥-** «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يُفْتِي بِالْمُتْعَةِ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: رُوَيْدَكَ بِبَعْضِ فُتْيَاكَ، فَإِنَّكَ لَا تَدْرِي مَا أَحْدَثَ أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ فِي النُّسُكِ بَعْدُ حَتَّى لَقِيتُهُ فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ عُمَرُ: قَدْ عَلِمْتُ أَنَّ

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٦٩، ومسلم: ١٢٢٣.

(٢) ضعيف الإسناد. أخرجه الترمذي: ٨٢٣.

النَّبِيَّ ﷺ قَدْ فَعَلَهُ، وَلَكِنْ كَرِهْتُ أَنْ يَظَلُّوا مُعَرِّسِينَ بِهِنَّ فِي الْأَرَاكِ، ثُمَّ يَرُوحُوا بِالْحَجِّ، تَقْطُرُ رُءُوسُهُمْ»[١].

**واتە: ئەبو موسا ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو فتوای بە تەمەتوع دەدا، پیاوێک پێی وت: لەسەرخۆبە لە هەندێ لە فتواکانت، چونکە تۆ نازانی ئەمیری بڕواداران دواتر چی داهێناوە سەبارەت بە قوربانی، کاتێ گەیشتم پێی پرسیارم لێ کرد، عومەر وتی: بەڕاستی زانیم پێغەمبەر ﷺ تەمەتوعی کردوە، بەڵام پێم باش نەبوو (لەبەر ئەوەی خەڵکی مافی حەج نادەن) و سەرقاڵ دەبن بە خێزانەکانیان لە ئەراک (شوێنێکە لە نزیک عەرەفات)، پاشان دەچن بۆ حەج ئاو بەسەریاندا دەتکێت.**

**٢٧٣٦-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: وَاللَّهِ إِنِّي لَأَنْهَاكُمْ عَنِ الْمُتْعَةِ، وَإِنَّهَا لَفِي كِتَابِ اللَّهِ وَلَقَدْ فَعَلَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يَعْنِي الْعُمْرَةَ فِي الْحَجِّ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە عومەر ﷺ بوو دەیوت: سوێند بە خوا من ڕێگریتان لێ دەکەم لە حەجی تەمەتوع، بێگومان ئەوە لە کتێبی خوادا هەیە، بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو حەجدا عومرەی کردوە (واتە: پێکەوەی کردوون).**

**٢٧٣٧-** «عَنْ طَاوُسٍ، قَالَ: قَالَ مُعَاوِيَةُ لِابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَعَلِمْتَ أَنِّي قَصَّرْتُ مِنْ رَأْسِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عِنْدَ الْمَرْوَةِ؟ قَالَ: لَا، يَقُولُ ابْنُ عَبَّاسٍ: هَذَا مُعَاوِيَةُ يَنْهَى النَّاسَ عَنِ الْمُتْعَةِ، وَقَدْ تَمَتَّعَ النَّبِيُّ ﷺ»[٣].

**واتە: طاوس دەڵێ: موعاویە بە ئیبنو عەبباسی ﷺ وت: ئایا زانیوتە من قژی پێغەمبەری خوام ﷺ کورت کردەوە لە مەروە؟ وتی: نەخێر، ئیبنو عەبباس دەڵێ: ئەمە موعاویەیە ڕێگری لە خەڵکی دەکات لە تەمەتوع، بێگومان پێغەمبەر ﷺ تەمەتوعی کرد.**

---

**(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٢٢، وإبن ماجه: ٢٩٧٩.**

**(٢) صحيح الإسناد.**

**(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٨٢٢.**

**٢٧٣٨-** «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ بِالْبَطْحَاءِ فَقَالَ: بِمَا أَهْلَلْتَ؟ قُلْتُ: أَهْلَلْتُ بِإِهْلَالِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: هَلْ سُقْتَ مِنْ هَدْيٍ؟ قُلْتُ: لَا، قَالَ: فَطُفْ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ حِلَّ، فَطُفْتُ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ أَتَيْتُ امْرَأَةً مِنْ قَوْمِي فَمَشَطَتْنِي، وَغَسَلَتْ رَأْسِي، فَكُنْتُ أُفْتِي النَّاسَ بِذَلِكَ فِي إِمَارَةِ أَبِي بَكْرٍ، وَإِمَارَةِ عُمَرَ، وَإِنِّي لَقَائِمٌ بِالْمَوْسِمِ إِذْ جَاءَنِي رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّكَ لَا تَدْرِي مَا أَحْدَثَ أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ فِي شَأْنِ النُّسُكِ، قُلْتُ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ مَنْ كُنَّا أَفْتَيْنَاهُ بِشَيْءٍ فَلْيَتَّئِدْ، فَإِنَّ أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ قَادِمٌ عَلَيْكُمْ، فَأْتَمُّوا بِهِ فَلَمَّا قَدِمَ قُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ مَا هَذَا الَّذِي أَحْدَثْتَ فِي شَأْنِ النُّسُكِ؟ قَالَ: إِنْ نَأْخُذْ بِكِتَابِ اللَّهِ ﷻ، فَإِنَّ اللَّهَ ﷻ قَالَ: ﴿ وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ﴿١٩٦﴾ ﴾البقرة، وَإِنْ نَأْخُذْ بِسُنَّةِ نَبِيِّنَا ﷺ فَإِنَّ نَبِيَّنَا ﷺ لَمْ يَحِلَّ حَتَّى نَحَرَ الْهَدْيَ»[1].

**واتە:** ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو لە (الْبَطْحَاءَ) بوو: (جێگایەكی نەرمی فراوانە لم و زیخی تێدایە بۆ پشوودان گونجاوە)، فەرمووی: بەچی ئیحرامت بەستووە؟ وتم: ئیحرامم بەستووە بەوەی پێغەمبەر ﷺ پێبەستووە، فەرمووی: ئایە وشتری قوربانیت لەگەڵ خۆت هێناوە؟ وتم: نەخێر، فەرمووی: دەی تەوافی ماڵی پیرۆز بكە، لەگەڵ صەفا و مەروە، پاشان ئیحرام بشكێنە، منیش تەوافی ماڵی پیرۆزو صەفاو مەروەم كرد، پاشان هاتم بۆ لای ئافرەتێكی مەحرەمی كەسوكارم قژمی شانە كردو شۆردی، من فتوام بەمە دەدا لە سەردەمی ئەبو بەكرو سەردەمی عومەر، وە لە مەوسیم بووم پیاوێك هات بۆ لام وتی: تۆ نازانیت ئەمیری بڕواداران چی وتوە دەربارەی قوربانی، وتم: ئەی خەڵكینە هەركەس لە ئێمە فتوای داوە بە هەر شتێك با بێدەنگ بێت، چونكە ئەمیری بڕواداران بەڕێوەیە بۆ ئێرە دێت، كاتێ هات: وتم: ئەی ئەمیری بڕواداران ئەمە چیە دەربارەی قوربانی وتوتە؟ وتی: ئێمە كتێبی خوا وەردەگرین، چونكە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ﴿١٩٦﴾ ﴾البقرة، (واتە: حەج و عومرەتان كە دەست پێكرد، تەنها بۆ خوا بە تەواوی بیكەن). وە ئەگەر كار بە سونەتی پێغەمبەرمان بكەین، ئەوە پێغەمبەرمان ئیحرامی نەشكاند تا قوربانی كرد.

**٢٧٣٩-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَدْ تَمَتَّعَ وَتَمَتَّعْنَا مَعَهُ، قَالَ: فِيهَا قَائِلٌ بِرَأْيِهِ»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٥٩ و ١٥٦٥ و ١٧٢٤ و ١٧٩٥ و ٤٣٤٦ و ٤٣٩٧، ومسلم: ١٥٤ و ١٢٢١/١٥٦.

(٢) صحيح.




**واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نیەتی عومرەی هێنا بە تەمەتوع ئێمەش لەگەڵیدا نیەتمان هێنا، وتی: هەبوو بەڕاوبۆچوونی خۆی دەکرد.**

## وازهێنان لە ناونان لە کاتی ئیحرام (الإهْلَال)(١)

**٢٧٤٠-** «عَن جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، قَالَ: أَتَيْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فَسَأَلْنَاهُ عَنْ حَجَّةِ النَّبِيِّ ﷺ، فَحَدَّثَنَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، مَكَثَ بِالْمَدِينَةِ تِسْعَ حِجَجٍ، ثُمَّ أُذِّنَ فِي النَّاسِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي حَاجٍّ هَذَا الْعَامِ فَنَزَلَ الْمَدِينَةَ بَشَرٌ كَثِيرٌ كُلُّهُمْ يَلْتَمِسُ أَنْ يَأْتَمَّ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَيَفْعَلُ مَا يَفْعَلُ ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، لِخَمْسٍ بَقِينَ مِنْ ذِي الْقِعْدَةِ، وَخَرَجْنَا مَعَهُ، قَالَ جَابِرٌ: وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ أَظْهُرِنَا عَلَيْهِ يَنْزِلُ الْقُرْآنُ وَهُوَ يَعْرِفُ تَأْوِيلَهُ، وَمَا عَمِلَ بِهِ مِنْ شَيْءٍ عَمِلْنَا، فَخَرَجْنَا لَا نَنْوِي إِلَّا الْحَجَّ»(٢).

**واتە: جەعفەری کوڕی موحەممەد دەڵێ باوکم بۆی باسکردم وتی: هاتین بۆ لای جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) پرسیارمان لێکرد دەربارەی حەجی پێغەمبەر ﷺ، بۆی باسکردین نۆ ساڵ لە مەدینە مایەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی ئاگادار کردەوە لەم ساڵەدا حەج دەکات، خەڵکێکی زۆر لە مەدینە دابەزین هەموویان مەبەستیان ئەوە بوو پەیڕەوی پێغەمبەر بکەن، ئەو چی دەکات ئەوانیش هەر وا بکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو پێنج ڕۆژی مابوو لە (ذِي الْقِعْدَة) ئێمەش لەگەڵی دەرچووین، جابر وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناوماندا بوو قورئانی بۆ دادەبەزی و ئەو (لە هەموو کەس باشتر) لە لێکدانەوەی دەزانی، هەرشتێکی کرد ئێمەش کردمان، کاتێ لە ماڵ دەرچووین تەنها مەبەستمان ئەوە بوو حەج بکەین.**

**٢٧٤١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا لَا نَنْوِي إِلَّا الْحَجَّ فَلَمَّا، كُنَّا بِسَرِفَ حِضْتُ، فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَأَنَا أَبْكِي فَقَالَ: أَحِضْتِ، قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: إِنَّ هَذَا شَيْءٌ كَتَبَهُ اللَّهُ ﷻ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ، فَاقْضِي مَا يَقْضِي الْمُحْرِمُ، غَيْرَ أَنْ لَا تَطُوفِي بِالْبَيْتِ»(٣).

---

(١) مەبەست لە ئیهلال تەلبیەء ئیحرامە، لە بنچینەدا ئیهلال بە مانای دەنگ بەرز کردنەوە دێت بە (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ) هەرکەس دەنگی بەرز کردەوە ئەوە ئیهلالی کردوە.

(٢) صحيح. وهو جزء من حديث جابر الطويل. أخرجه مسلم: ١٢١٨، وأبو داود: ١٩٠٥ و ١٩٠٧ و ١٩٠٨ و ١٩٠٩، وإبن ماجه ٣٠٧٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٤، ومسلم: ١٢١١/١١٩، وأبو داود: ١٧٨٢، وإبن ماجه: ٢٩٦٣.




واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچووین تەنها مەبەستمان حەج کردن بوو، کاتێ گەیشتینە (سَرِفَ) (شوێنێک بوو لە نزیک مەکە) کەوتمە حەیزەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لام دەگریام. فەرمووی: چیتە حەیزت تووش بووە؟، وتم: بەڵێ. فەرمووی: ئەمە شتێکە خوا لەسەر کچەکانی ئادەم نوسیویەتی، ئەوەی ئیحرام پۆش دەیکات تۆش بیکە، بەڵام تەوافی ماڵی خوا مەکە.

## حەجکردن بەبێ نیەتێک کە ئیحرام پۆچ مەبەستی بووبێ

**٢٧٤٢-** «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ: أَقْبَلْتُ مِنَ الْيَمَنِ وَالنَّبِيُّ ﷺ مُنِيخٌ بِالْبَطْحَاءِ حَيْثُ حَجَّ، فَقَالَ: أَحَجَجْتَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: كَيْفَ قُلْتَ؟ قَالَ: قُلْتُ لَبَّيْكَ بِإِهْلَالٍ كَإِهْلَالِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: فَطُفْ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَأَحِلَّ، فَفَعَلْتُ ثُمَّ أَتَيْتُ امْرَأَةً فَفَلَتْ رَأْسِي، فَجَعَلْتُ أُفْتِي النَّاسَ بِذَلِكَ، حَتَّى كَانَ فِي خِلَافَةِ عُمَرَ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا أَبَا مُوسَى رُوَيْدَكَ بَعْضَ فُتْيَاكَ فَإِنَّكَ لَا تَدْرِي مَا أَحْدَثَ أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ فِي النُّسُكِ بَعْدَكَ، قَالَ أَبُو مُوسَى: يَا أَيُّهَا النَّاسُ مَنْ كُنَّا أَفْتَيْنَاهُ فَلْيَتَّئِدْ، فَإِنَّ أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ قَادِمٌ عَلَيْكُمْ، فَأْتَمُّوا بِهِ، وَقَالَ عُمَرُ: إِنْ نَأْخُذْ بِكِتَابِ اللَّهِ فَإِنَّهُ يَأْمُرُنَا بِالتَّمَامِ، وَإِنْ نَأْخُذْ بِسُنَّةِ النَّبِيِّ ﷺ، فَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ، لَمْ يَحِلَّ حَتَّى بَلَغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ»[1].

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەگێڕێتەوە: لە یەمەن گەڕامەوە، پێغەمبەر ﷺ لە (الْبَطْحَاءَ): (جێگایەکی نەرمی فراوانە لم و زیخی تێدایە بۆ پشوودان گونجاوە) وشترەکەی یەخدابوو دوای ئەوەی حەجی کردبوو، فەرمووی: ئایا حەجت کرد؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: چیت وت؟ وتی: وتم: (لَبَّيْكَ) بە ئیحرام بەستن وەکو ئیحرام بەستنی پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: تەوافی بەیت و صەفاو مەروە بکە، وە بیشکێنە، منیش ئەوەم کرد، پاشان هاتم بۆ لای ئافرەتێکی مەحرەمی کەسوکارم قژمی شانە کردو شۆردی، من فتوام بەمە دەدا لە ناو خەڵکیدا، تا خیلافەتی عومەریش، پیاوێک پێی وت: ئەی ئەبو موسا لەسەر خۆبە لە هەندێ لە فتواکانت چونکە تۆ نازانی ئەمیری بڕواداران چی داهێناوە سەبارەت بە قوربانی لە دوای تۆ، ئەبو موسا وتی: ئەی خەڵکینە هەر کەسێک لە ئێمە فتوای داوە بە هەر شتێک با بێدەنگ بێت، چونکە ئەمیری بڕواداران بەڕێوەیە دێت بۆ لاتان، پەیڕەوی بکەن، عومەر وتی:

---

(١) صحيح.




**ئەگەر دەست بگرین بە کتێبی خوا ئەوە فەرمانمان پێ دەکات بە تەواوی، وە ئەگەر سوننەتی پێغەمبەر ﷺ وەربگرین ئەوە پێغەمبەر ﷺ ئیحرامی نەشکاند تا قوربانیەکە گەیشتە جێی دیاری کراوی خۆی.**

**٢٧٤٣-** «عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، قَالَ: أَتَيْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فَسَأَلْنَاهُ عَنْ حَجَّةِ النَّبِيِّ ﷺ، فَحَدَّثَنَا أَنَّ عَلِيّاً قَدِمَ مِنَ الْيَمَنِ بِهَدْيٍ، وَسَاقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْمَدِينَةِ هَدْياً، قَالَ لِعَلِيٍّ: بِمَا أَهْلَلْتَ؟ قَالَ: قُلْتُ اللَّهُمَّ إِنِّي أُهِلُّ بِمَا أَهَلَّ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَمَعِيَ الْهَدْيُ، قَالَ: فَلَا تَحِلَّ»[١].

**واتە: جەعفەری کوڕی موحەممەد دەڵێ: باوکم بۆی باس کردم وتی: هاتین بۆ لای جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) پرسیارمان لێکرد دەربارەی حەجی پێغەمبەر ﷺ، بۆی باس کردین عەلی لە یەمەنەوە هات بە قوربانیەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ لە مەدینەوە قوربانی لەگەڵ خۆی هێنا بوو، بە عەلی فەرموو: بە چی ئیحرامت بەستووە؟ دەڵێ: وتم: خوایە من ئیحرام دەبەستم بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیحرامی پێبەستووە، قوربانیشم لەگەڵ خۆم هێناوە، فەرمووی: مەیشکێنە.**

**٢٧٤٤-** «عَن جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَدِمَ عَلِيٌّ مِنْ سِعَايَتِهِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: بِمَا أَهْلَلْتَ يَا عَلِيُّ؟ قَالَ: بِمَا أَهَلَّ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ، قَالَ: فَاهْدِ، وَامْكُثْ حَرَاماً كَمَا أَنْتَ، قَالَ: وَأَهْدَى عَلِيٌّ لَهُ هَدْياً»[٢].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: عەلی گەڕایەوە لەو ئەرکەی پێی سپێردرابوو لە یەمەن، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: بەچی ئیحرامت بەستووە ئەی عەلی؟ وتی: بەوەی پێغەمبەر ﷺ ئیحرامی پێبەستووە، فەرمووی: قوربانی بکە و بە ئیحرامەوە بمێنەوە وەکو چۆن ماویتەتەوە، وتی: عەلی قوربانیەکی کرد بە قوربانی.**

**٢٧٤٥-** «عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: كُنْتُ مَعَ عَلِيٍّ حِينَ أَمَّرَهُ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى الْيَمَنِ، فَأَصَبْتُ مَعَهُ أَوَاقِيَ، فَلَمَّا قَدِمَ عَلِيٌّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ عَلِيٌّ: وَجَدْتُ فَاطِمَةَ قَدْ نَضَحَتِ الْبَيْتَ بِنَضُوحٍ، قَالَ: فَتَخَطَّيْتُهُ، فَقَالَتْ لِي: مَا لَكَ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ أَمَرَ أَصْحَابَهُ فَأَحَلُّوا، قَالَ: قُلْتُ إِنِّي أَهْلَلْتُ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




بِإِهْلَالِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ لِي: كَيْفَ صَنَعْتَ؟ قُلْتُ: إِنِّي أَهْلَلْتُ بِمَا أَهْلَلْتَ، قَالَ: فَإِنِّي قَدْ سُقْتُ الْهَدْيَ، وَقَرَنْتُ»[1].

**واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: من لەگەڵ عەلی بووم کاتێ پێغەمبەر ﷺ کردی بە ئەمیر بەسەر یەمەنەوە، چەند ئوقیەیەکیان بە دەست خست، کاتێ عەلی هاتەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، عەلی وتی: فاطمەم بینی ماڵی خوای بۆن خۆش کرد، منیش تێپەڕیم بەسەریدا، پێمی وت: ئەوە چیتە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردوە بە هاوەڵانی ئیحرمیان شکاندوە، وتی: وتم: من ئیحرامم بەستووە بە ئیحرامی پێغەمبەر ﷺ، وتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چیت کرد؟ وتم: من ئیحرامم بەستووە بەوەی تۆ ئیحرامت بەستووە، فەرمووی: من ئاژەڵم لەگەڵ خۆم برد بۆ سەربڕین و حەج و عومرەم پێکەوە کۆ کردەوە.**

## ئەگەر ئیحرامی بەست بۆ عومرە ئایا دەیکاتە حەج لەگەڵی

**٢٧٤٦-** «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَرَادَ الْحَجَّ عَامَ نَزَلَ الْحَجَّاجُ، بَابْنِ الزُّبَيْرِ فَقِيلَ لَهُ: إِنَّهُ كَائِنٌ بَيْنَهُمْ قِتَالٌ، وَأَنَا أَخَافُ أَنْ يَصُدُّوكَ، قَالَ: لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ، أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ، إِذاً أَصْنَعُ كَمَا صَنَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، إِنِّي أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ أَوْجَبْتُ عُمْرَةً، ثُمَّ خَرَجَ حَتَّى إِذَا كَانَ بِظَاهِرِ الْبَيْدَاءِ، قَالَ: مَا شَأْنُ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ إِلَّا وَاحِدٌ أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ أَوْجَبْتُ حَجّاً مَعَ عُمْرَتِي، وَأَهْدَى هَدْياً اشْتَرَاهُ بِقُدَيْدٍ، ثُمَّ انْطَلَقَ يُهِلُّ بِهِمَا جَمِيعاً حَتَّى قَدِمَ مَكَّةَ فَطَافَ بِالْبَيْتِ، وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَلَمْ يَزِدْ عَلَى ذَلِكَ، وَلَمْ يَنْحَرْ، وَلَمْ يَحْلِقْ، وَلَمْ يُقَصِّرْ، وَلَمْ يَحِلَّ مِنْ شَيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ حَتَّى كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ فَنَحَرَ، وَحَلَقَ فَرَأَى أَنْ قَدْ قَضَى طَوَافَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ بِطَوَافِهِ الْأَوَّلِ، وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: كَذَلِكَ فَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[2].

**واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) ویستی حەج بکات ئەو ساڵەی حاجیەکان دابەزین بۆ جەنگ لەگەڵ ئیبنو زوبەیر، پێی وترا: لە نێوانیاندا کوشتارو جەنگ هەیە، من دەترسم ڕووبەڕووت ببنەوە، وتی: سوێند بە خوا**

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٣٩ و ١٦٤٠ و ١٦٩٣ و ١٧٠٨ و ١٨٠٦ و ١٨٠٧ و ١٨٠٨ و ١٨١٣ و ٤١٨٣ و ٤١٨٤ و ٤١٨٥، ومسلم: ١٨٠ و ١٨٣/١٢٣٠، والترمذي: ٩٠٧، وإبن ماجه: ٣١٠٢.**




بەڕاستی لە پێغەمبەری خواوە بۆ ئێوە سەرمەشق و پێشەوایەتی چاک هەیە، کەواتە پێغەمبەری خوا ﷺ چی کردوە منیش ئەوە دەکەم، من ئێوە دەکەم بە شایەت عومرەم لەسەر خۆم پێویست کرد، پاشان ڕۆیشت هەتا گەیشتە (الْبَيْدَاء)، وتی: کاری عومرەو حەج هەر یەکێکە من ئێوە دەکەم بە شایەت حەجم پێویست کرد لەسەر خۆم لەگەڵ عومرەکەم، ئاژەڵێکیشی کڕی لە قودەیدو کردی بە قوربانی، پاشان دەرچوو ئیحرامی بۆ هەردووکیان بەست پێکەوە تا گەیشتە مەککە تەوافی بەیتی کرد، هەروەها صەفاو مەروەش، لەوە زیاتری نەکرد، هیچی سەرنەبڕی، وە سەری نەتاشی و کورتی نەکردەوە، هەرچی لێ حەرام کرابوو هیچی حەڵاڵ نەکرد، تا ڕۆژی قوربانی هات قوربانی کرد، وە سەری تاشی، جا بینی تەوافی حەج و عەمرەی تەواو کردوە بە تەوافی یەکەم، ئیبنو عومەر وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەی کرد.

## چۆنیەتی تەلبیە کردن (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)

**٢٧٤٧-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُهِلُّ يَقُولُ: لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ، وَإِنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَرْكَعُ بِذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ النَّاقَةُ قَائِمَةً عِنْدَ مَسْجِدِ ذِي الْحُلَيْفَةِ، أَهَلَّ بِهَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ»[1].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو ئیحرامی دەبەست دەیفەرموو: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ) واتە: پەروەردگار پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم، وەڵامی داواکەت دەدەمەوەو تۆ تەنها و بێ شەریکیت، وە بێگومان سوپاس و ستایش و هەموو نازو نیعمەتێک موڵک و دەسەڵاتێک هەر بۆ تۆیە، تۆ بێ هاوەڵ و بێ وێنەیت، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە (ذِي الْحُلَيْفَة) دوو ڕکاتی دەکرد، پاشان کاتێ لەسەر وڵاخەکەی دامەزرا و ڕوو کردە مزگەوتی (ذِي الْحُلَيْفَة) بەو وشانە تەلبیەی دەکرد.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٤٠ و ٥٩١٥، ومسلم: ١١٨٤، وأبو داود: ١٧٤٧، وإبن ماجه: ٣٠٤٧.




**٢٧٤٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ»[١].

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ) واتە: ئەی پەروەردگار پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم، وەڵامی داواکەت دەدەمەوەو تۆ تەنها و بێ شەریکیت، وە بێگومان سوپاس و ستایش و هەموو نازو نیعمەتێک موڵک و دەسەڵاتێک هەر بۆ تۆیە، تۆ بێ هاوەڵ و بێ وێنەیت.

**٢٧٤٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: تَلْبِيَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ»[٢].

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: تەلبیەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەم شێوەیە بوو: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ) واتە: ئەی پەروەردگار پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم، وەڵامی داواکەت دەدەمەوەو تۆ تەنها و بێ شەریکیت، وە بێگومان سوپاس و ستایش و هەموو نازو نیعمەت و موڵک و دەسەڵاتێک هەر بۆ تۆیە، تۆ بێ هاوەڵ و بێ وێنەیت.

**٢٧٥٠-** «عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَتْ تَلْبِيَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ، وَزَادَ فِيهِ ابْنُ عُمَرَ: لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ، وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ، وَالْعَمَلُ»[٣].

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: تەلبیەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەم شێوەیە بوو: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ) واتە: ئەی پەروەردگار پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم، وەڵامی داواکەت دەدەمەوەو تۆ تەنها و بێ شەریکیت، وە بێگومان

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٤٩، ومسلم: ١٩ و ١١٨٤/٢٠، وأبو داود: ١٨١٢، والترمذي: ٨٢٥ و ٨٢٦، وإبن ماجه: ٢٩١٨.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




سوپاس و ستایش و هەموو نازو نیعمەت و موڵک و دەسەڵاتێک هەر بۆ تۆیە، تۆ بێ هاوەڵ و بێ وێنەیت، ئیبنو عومەر ئەمەشی زیاد کردوە: (لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ، وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ، وَالْعَمَلُ) واتە: ئەی پەروەردگار پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم، هەموو خۆش گوزەرانیەک هەر هی تۆیە، وە هەموو خێرو چاکەیەک بە دەستی تۆیە، هەموو کارو کردەوەیەک هەر بۆ تۆیە.

**٢٧٥١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: كَانَ مِنْ تَلْبِيَةِ النَّبِيِّ ﷺ، لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: تەلبیەی پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیە بوو: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ) واتە: ئەی پەروەردگار پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم، وەڵامی داواکەت دەدەمەوەو تۆ تەنها و بێ شەریکیت، وە بێگومان سوپاس و ستایش و هەموو نازو نیعمەت و موڵک و دەسەڵاتێک هەر بۆ تۆیە.

**٢٧٥٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ مِنْ تَلْبِيَةِ النَّبِيِّ ﷺ، لَبَّيْكَ إِلَهَ الْحَقِّ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: تەلبیەی پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیە بوو: (لَبَّيْكَ إِلَهَ الْحَقِّ) واتە: ئەی پەرستراوی بەحەق پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم.

## بەرزكردنەوەی دەنگ بە تەلبیە

**٢٧٥٣-** «عَنْ خَلَّادِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: جَاءَنِي جِبْرِيلُ فَقَالَ لِي: يَا مُحَمَّدُ مُرْ أَصْحَابَكَ أَنْ يَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالتَّلْبِيَةِ»[3].

واتە: خەللادی کوڕی سائیب، لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جبریل هات بۆ لام پێمی وت: ئەی موحەممەد فەرمان بە هاوەڵانت بکە دەنگیان بەرز بکەنەوە بە تەلبیە.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٢٩٢٠.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٨١٤، والترمذي: ٨٢٩، وإبن ماجه: ٢٩٢٢.

## كار كردن لە ئیحرامدا

**٢٧٥٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَهَلَّ فِي دُبُرِ الصَّلَاةِ»(١).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای نوێژ ئیحرامی بەست.**

**٢٧٥٥-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى الظُّهْرَ بِالْبَيْدَاءِ ثُمَّ رَكِبَ، وَصَعِدَ جَبَلَ الْبَيْدَاءِ، وَأَهَلَّ بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ حِينَ صَلَّى الظُّهْرَ»(٢).

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی كرد لە (الْبَيْدَاء)، پاشان سوار وڵاخەكەی بوو كەوتە ڕێ، چووە سەر كێوی بەیداء كاتێ نوێژی نیوەڕۆی كرد ئیحرامی بۆ حەج و عومرە بەست.**

**٢٧٥٦-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، فِي حَجَّةِ النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمَّا أَتَى ذَا الْحُلَيْفَةِ، صَلَّى وَهُوَ صَامِتٌ حَتَّى أَتَى الْبَيْدَاءَ»(٣).

**واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: لەبارەی حەجی پێغەمبەر ﷺ، كاتێ هاتە (ذِي الْحُلَيْفَة) نوێژی كرد، ئەو بێدەنگ بوو تا هاتە بەیداء.**

**٢٧٥٧-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: بَيْدَاؤُكُمْ هَذِهِ الَّتِي تَكْذِبُونَ فِيهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، مَا أَهَلَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، إِلَّا مِنْ مَسْجِدِ ذِي الْحُلَيْفَةِ»(٤).

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئەم بەیدائە كە ئێوە درۆی پێوە دەكەن بەناو پێغەمبەرەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئیحرامی نەبەست تەنها لە مزگەوتی (ذِي الْحُلَيْفَة) نەبێت.**

**٢٧٥٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَرْكَبُ رَاحِلَتَهُ بِذِي الْحُلَيْفَةِ ثُمَّ يُهِلُّ، حِينَ تَسْتَوِي بِهِ قَائِمَةً»(٥).

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٨١٩.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٤١، ومسلم: ٢٣ و ١١٨٦/٢٤، وأبو داود: ١٧٧١، والترمذي: ٨١٨.

(٥) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥١٤ و ١٥٥٢، ومسلم: ٢٧ و ١١٨٧/٢٩، وإبن ماجه: ٢٩١٦.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی، سواری وڵاخەکەی بوو لە (ذي الْحُلَيْفَة)، کاتێ ڕێک بوویەوە لەسەر وڵاخەکەی تەلبیەی دەکرد (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ،....).

**٢٧٥٩-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّهُ كَانَ يُخْبِرُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَهَلَّ حِينَ اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) هەواڵی داوە، پێغەمبەر ﷺ تەلبیەی دەکرد کاتێ دامەزرا لەسەر وڵاخەکەی و بەرەو سەرەوە دەیبرد.

**٢٧٦٠-** «عَنْ عُبَيْدِ بْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: رَأَيْتُكَ تُهِلُّ إِذَا اسْتَوَتْ بِكَ نَاقَتُكَ، قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كَانَ يُهِلُّ إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ نَاقَتُهُ وَانْبَعَثَتْ»[٢].

واتە: عوبەیدی کوڕی جورەیج دەڵێ: بە ئیبنو عومەرم (خوا لێیان ڕازی بێ) وت: دەبینم تەلبیە دەکەی کاتێ وشترکەت بەرو سەرەوە دەتبات، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ تەلبیەی دەکرد کاتێ وشترەکەی بەرەو سەرەوە دەیبرد.

## ئیحرام بەستنی ئەو ئافرەتانەی لە خوێنی دوای منداڵ بووندان، زەیستانە

**٢٧٦١-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ تِسْعَ سِنِينَ، لَمْ يَحُجَّ، ثُمَّ أَذَّنَ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ، فَلَمْ يَبْقَ أَحَدٌ يَقْدِرُ أَنْ يَأْتِيَ رَاكِباً، أَوْ رَاجِلاً إِلَّا قَدِمَ، فَتَدَارَكَ النَّاسُ لِيَخْرُجُوا مَعَهُ حَتَّى جَاءَ ذَا الْحُلَيْفَةِ فَوَلَدَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ مُحَمَّدَ بْنَ أَبِي بَكْرٍ، فَأَرْسَلَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: اغْتَسِلِي، وَاسْتَثْفِرِي بِثَوْبٍ، ثُمَّ أَهِلِّي، فَفَعَلَتْ»[٣].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نۆ ساڵ مایەوە و حەجی نەکرد، پاشان خەڵکی ئاگادار کردەوە بە حەج کردن، هەرکەس توانای هەبوو بە سواری بێت یان بە پێی ئامادە بوو، خەڵکی کۆ بوونەوە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




تا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەربچن، تا گەیشت بە (ذَا الْحُلَيْفَة) ئەسمائی کچی عومەیس موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکری بوو، کەسێکی نارد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: خۆت بشۆرە و پارچە قوماشێک بخەرە ئەو شوێنە و، پاشان ئیحرام ببەستە، ئەویش ئەوەی کرد.

**٢٧٦٢-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: نَفَسَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ مُحَمَّدَ بْنَ أَبِي بَكْرٍ، فَأَرْسَلَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، تَسْأَلُهُ كَيْفَ تَفْعَلُ؟ فَأَمَرَهَا أَنْ تَغْتَسِلَ، وَتَسْتَثْفِرَ بِثَوْبِهَا، وَتُهِلَّ»[١].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: ئەسمائی کچی عومەیس خوێنی زەیستانەی بۆ هات بە هۆی لەدایک بوونی موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکر، کەسێکی نارد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پرسیاری لێ بکات چی بکات؟ فەرمانی پێکرد خۆی بشوات و پارچە قوماشێک بخاتە ئەو شوێنەی خوێنی لێ دەردەچێ و، پاشان ئیحرام ببەستێ.

## دەربارەی ئەو ئافرەتەی ئیحرامی بۆ عومرە بەستوە دەکەوێتە حەیزەوە و دەترسێ حەجی لە دەست بچێ

**٢٧٦٣-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَقْبَلْنَا مُهِلِّينَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِحَجٍّ مُفْرَدٍ، وَأَقْبَلَتْ عَائِشَةُ مُهِلَّةً بِعُمْرَةٍ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِسَرِفَ، عَرَكَتْ حَتَّى إِذَا قَدِمْنَا طُفْنَا بِالْكَعْبَةِ، وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَأَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَنْ يَحِلَّ مِنَّا مَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ، قَالَ: فَقُلْنَا حِلُّ مَاذَا؟ قَالَ: الْحِلُّ كُلُّهُ» فَوَاقَعْنَا النِّسَاءَ، وَتَطَيَّبْنَا بِالطِّيبِ، وَلَبِسْنَا ثِيَابَنَا وَلَيْسَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ عَرَفَةَ إِلَّا أَرْبَعُ لَيَالٍ، ثُمَّ أَهْلَلْنَا يَوْمَ التَّرْوِيَةِ، ثُمَّ دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى عَائِشَةَ فَوَجَدَهَا تَبْكِي، فَقَالَ: مَا شَأْنُكِ؟ فَقَالَتْ: شَأْنِي أَنِّي قَدْ حِضْتُ، وَقَدْ حَلَّ النَّاسُ، وَلَمْ أُحْلِلْ، وَلَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ، وَالنَّاسُ يَذْهَبُونَ إِلَى الْحَجِّ الْآنَ، فَقَالَ: إِنَّ هَذَا أَمْرٌ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ، فَاغْتَسِلِي، ثُمَّ أَهِلِّي بِالْحَجِّ، فَفَعَلَتْ، وَوَقَفَتِ الْمَوَاقِفَ حَتَّى إِذَا طَهُرَتْ طَافَتْ بِالْكَعْبَةِ، وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ قَالَ: قَدْ حَلَلْتِ مِنْ حَجَّتِكِ، وَعُمْرَتِكِ جَمِيعاً، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَجِدُ فِي نَفْسِي أَنِّي لَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ حَتَّى حَجَجْتُ، قَالَ: فَاذْهَبْ بِهَا يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ فَأَعْمِرْهَا مِنَ التَّنْعِيمِ، وَذَلِكَ لَيْلَةَ الْحَصْبَةِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٦ و ١٢١٣/١٣٨، وأبو داود: ١٧٨٥ و ١٧٨٦.




واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتین ئیحرامان تەنها بۆ حەج بەستبوو، عائیشەش هات ئیحرامی بەستبوو بۆ عومرە، تا ئێمە گەیشتینە شوێنێک بەناو (سَرِف) (شوێنێک بوو لە نزیک مەککە) کەوتە حەیزەوە تا گەیشتین تەوافی کەعبەمان کرد، وە صەفاو مەروەشمان کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردین هەرکەس ئاژەڵی لەگەڵ خۆی نەهێناوە با ئیحرام بشکێنێ، وتمان: شکاندنی چی؟ فەرمووی: شکاندنی تەواو، چووینە لای خێزانەکانمان و خۆمان بۆن خۆش کرد و جل و بەرگمان پۆشی و نێوانی ئێمە و عەرەفە تەنها چوار میل بوو، پاشان لە ڕۆژی هەشتەمی (ذِي الْحِجَّةِ) ئیحرامان بەست، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لای عائیشە بینی دەگریا، فەرمووی: ئەوە چیتە؟ وتی: کەوتومەتە حەیزەوە، خەڵکی ئیحرامیان شکاند، منیش نە ئیحرامم شکاند و نە تەوافم کرد، خەڵکی ئێستا دەچن بۆ حەج، فەرمووی: ئەمە شتێکە خوا لەسەر کچەکانی ئادەم نوسیویەتی، خۆت بشۆرە پاشان ئیحرامی حەج ببەستە، ئەوەی کرد، لە جێگاکان وەستا تا پاک بوویەوە، تەوافی کەعبەی کرد، وە صەفاو مەروەش، پاشان فەرمووی: حەج و عومرەت پێکەوە کرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، لە نەفسی خۆمدا وا هەست دەکەم تەوافی بەیتم نەکرد تا حەجم کرد، فەرمووی: ئەی عەبدوڕەحمان لەگەڵ خۆت ببە لە تەنعیم عومرەی پێبکە، ئەو شەوە شەوی حەصبە بوو.

**٢٧٦٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَأَهْلَلْنَا بِعُمْرَةٍ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ، فَلْيُهْلِلْ بِالْحَجِّ مَعَ الْعُمْرَةِ، ثُمَّ لَا يَحِلَّ، حَتَّى يَحِلَّ مِنْهُمَا جَمِيعاً. فَقَدِمْتُ مَكَّةَ، وَأَنَا حَائِضٌ، فَلَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ، وَلَا بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَشَكَوْتُ ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: انْقُضِي رَأْسَكِ، وَامْتَشِطِي، وَأَهِلِّي بِالْحَجِّ، وَدَعِي الْعُمْرَةَ. فَفَعَلْتُ. فَلَمَّا قَضَيْتُ الْحَجَّ، أَرْسَلَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، مَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ إِلَى التَّنْعِيمِ، فَاعْتَمَرْتُ، قَالَ: هَذِهِ مَكَانُ عُمْرَتِكِ. فَطَافَ الَّذِينَ أَهَلُّوا بِالْعُمْرَةِ بِالْبَيْتِ، وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ حَلُّوا، ثُمَّ طَافُوا طَوَافاً آخَرَ بَعْدَ أَنْ رَجَعُوا مِنْ مِنًى لِحَجِّهِمْ، وَأَمَّا الَّذِينَ جَمَعُوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، فَإِنَّمَا طَافُوا طَوَافاً وَاحِداً»[1].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٦ و ٣١٧ و ٣١٩ و ١٥٥٦ و ١٦٣٨ و ١٦٩٢ و ١٧٨٣ و ١٧٨٦، ومسلم: ١١١ و ١٢١١/١١٧، وأبو داود: ١٧٧٨ و ١٧٨١ و ١٨٩٦، وإبن ماجه: ٣٠٠٠.




واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین بۆ حەجی ماڵئاوایی، ئیحرامان بەست بۆ عومرە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکەسێ ئاژەڵی لەگەڵ خۆی هێناوە بۆ سەربڕین، ئەوە با ئیحرام بۆ حەج و عومرە پێکەوە ببەستێ، پاشان با نەیشکێنێ، تا هەردووکیان تەواو دەکات، منیش هاتمە مەککە و لە حەیزدا بووم، تەوافی بەیتم نەکرد، هەوەها لە نێوان صەفاو مەروەش، هەواڵمدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سەرت بکەرەوە و قژت شانە بکە و ئیحرام بۆ حەج ببەستە، واز لە عومرە بهێنە، منیش ئەوەم کرد، کاتێ حەجم تەواو کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر ناردمی بۆ تەنعیم، پاشان عومرەم کرد، فەرمووی: ئەمە شوێنی عومرەکەتە، ئەوانەی ئیحرامی عومرەیان بەستبوو تەوافی بەیتیان کرد، وە لە نێوان صەفاو مەروەش، پاشان شکاندیان، پاشان تەوافێکی تریان کرد دوای ئەوەی لە مینا گەڕانەوە لە حەجکردنیان، بەڵام ئەوانەی حەج و عومرەیان کۆ کردەوە تەنها یەک تەوافیان کرد.

## مەرج دانان لە حەجدا

## (مەرج دادەنا کاتێ نەخۆش کەوت لە ئیحرام دەردەچێ)

**٢٧٦٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ ضُبَاعَةَ أَرَادَتِ الْحَجَّ ، فَأَمَرَهَا النَّبِيُّ ﷺ، أَنْ تَشْتَرِطَ، فَفَعَلَتْ، عَنْ أَمْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»(١).

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ضوباعە ویستی حەج بکات، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد مەرج دابنێ، ئەویش فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ جێبەجێی کرد.

## چی بڵێ کاتێ مەرجی دانا

**٢٧٦٦-** «عَنْ هِلَالِ بْنِ خَبَابٍ، قَالَ: سَأَلْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ، عَنِ الرَّجُلِ يَحُجُّ يَشْتَرِطُ؟ قَالَ: الشَّرْطُ بَيْنَ النَّاسِ فَحَدَّثْتُهُ، حَدِيثَهُ يَعْنِي عِكْرِمَةَ فَحَدَّثَنِي، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ ضُبَاعَةَ بِنْتَ الزُّبَيْرِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أُرِيدُ الْحَجَّ فَكَيْفَ

---

(١) صحيح.

أَقُولُ؟ قَالَ: قُولِي، لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، وَمَحِلِّي مِنَ الْأَرْضِ حَيْثُ تَحْبِسُنِي، فَإِنَّ لَكِ عَلَى رَبِّكِ مَا اسْتَثْنَيْتِ»[1].

**واتە: هیلالی کوڕی خەباب دەڵێ: پرسیارم لە سەعیدی کوڕی جوبەیر کرد دەربارەی پیاوێک حەج بکات و مەرج دابنات؟ وتی: مەرج لە نێوانی خەڵکی، فەرموودەکەی عیکریمەم بۆی باس کرد، لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، کە ضوباعەی کچی زوبەیری کوڕی عەبدولموطلیب هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من دەمەوێ حەج بکەم چی بڵێم؟ فەرمووی: (بڵێ: لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ) واتە: پەروەردگار پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم، ئیحرام شکاندنم تا ئەو شوێنەیە کە نەخۆش دەکەوم، بێگومان ئەو جیاکردنەوەت بۆ هەیە لای پەروەردگارت**

**ڕونکردنەوە: دروستە مرۆڤ بە هۆی نەخۆشیەوە ئیحرام بشکێنێت بەر لە تەواو بوونی، بەمەرجێک لە سەرەتای ئیحرامەکەی مەرج دابنێت، وەک لەم فەرموودەیەدا هاتووە).**

**٢٧٦٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: جَاءَتْ ضُبَاعَةُ بِنْتُ الزُّبَيْرِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي امْرَأَةٌ ثَقِيلَةٌ، وَإِنِّي أُرِيدُ الْحَجَّ فَكَيْفَ تَأْمُرُنِي أَنْ أُهِلَّ؟ قَالَ: أَهِلِّي وَاشْتَرِطِي، إِنَّ مَحِلِّي حَيْثُ حَبَسْتَنِي»[2].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ضوباعەی کچی زوبەیر هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من ئافرەتێکی قورسم، دەمەوێ حەج بکەم تۆ چۆن فەرمانم پێدەکەیت ئیحرام ببەستم؟ فەرمووی: ئیحرام ببەستە و مەرج دابنێ، (بڵێ) ئیحرام شکاندنم تا ئەو شوێنەیە کە نەخۆش دەکەوم.**

**٢٧٦٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى ضُبَاعَةَ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي شَاكِيَةٌ، وَإِنِّي أُرِيدُ الْحَجَّ، فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ ﷺ: حُجِّي، وَاشْتَرِطِي إِنَّ مَحِلِّي حَيْثُ تَحْبِسُنِي»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٦ و ١٢٠٨/١٠٨، وأبو داود: ١٧٧٦، والترمذي: ٩٤١، وإبن ماجه: ٢٩٣٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٨٩، ومسلم: ١٢٠٧.




واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت بۆ لای ضوباعە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من نەخۆشم و دەمەوێ حەج بکەم، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: حەج بکە، وە مەرج دابنێ، (بڵێ) ئیحرام شکاندنم تا شوێنەدایە کە نەخۆش دەکەوم.

## ئەوکەسەی ڕێگری لێ دەکرێ لە حەج و مەرجی دانەناوە چی بکات

**٢٧٦٩-** «عَنْ سَالِمٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يُنْكِرُ الِاشْتِرَاطَ فِي الْحَجِّ، وَيَقُولُ: أَلَيْسَ حَسْبُكُمْ سُنَّةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِنْ حُبِسَ أَحَدُكُمْ عَنِ الْحَجِّ طَافَ بِالْبَيْتِ، وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ حَلَّ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى يَحُجَّ عَاماً قَابِلاً، وَيُهْدِي، وَيَصُومُ، إِنْ لَمْ يَجِدْ هَدْياً»[١].

واتە: سالم دەڵێ: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) نکوڵی مەرج دانانی دەکرد لەحەجدا، وە دەیوت: ئایا سوننەتی پێغەمبەرتان بەس نیە، ئەگەر یەکێک لە ئێوە ڕێگری حەجی لێکرا با تەوافی بەیت بکات، وە صەفاو مەروەش، پاشان ئیحرام بشکێنێ لە هەموو شتێک تا ساڵێکی تر حەج دەکات، وە ئاژەڵ سەرببڕێ و ڕۆژووش بگرێ، ئەگەر ئاژەڵی دەست نەکەوت.

**٢٧٧٠-** «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يُنْكِرُ الِاشْتِرَاطَ فِي الْحَجِّ، وَيَقُولُ: مَا حَسْبُكُمْ سُنَّةُ نَبِيِّكُمْ ﷺ، إِنَّهُ لَمْ يَشْتَرِطْ، فَإِنْ حَبَسَ أَحَدَكُمْ حَابِسٌ، فَلْيَأْتِ الْبَيْتَ فَلْيَطُفْ بِهِ، وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ لِيَحْلِقْ، أَوْ يُقَصِّرْ، ثُمَّ لِيُحْلِلْ، وَعَلَيْهِ الْحَجُّ مِنْ قَابِلٍ»[٢].

واتە: سالم دەگێڕێتەوە: لە باوکی ﷺ کە ئەو نکوڵی مەرج دانانی دەکرد لە حەجدا، وە دەیوت: سوننەتی پێغەمبەرتان ﷺ بەسە، بێگومان ئەو مەرجی دانەناوە، ئەگەر هەر ڕێگریەک هاتە ڕێی یەکێکتان، ئەوە با سەردانی بەیت بکات و تەواف بکات، وە لە نێوان صەفاو مەروەش، پاشان با سەری بتاشێ یان قژی کورت بکاتەوە، پاشان ئیحرام بشکێنێ، بۆ ساڵێکی تر حەجی لەسەر پێویستە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨١٠، والترمذي: ٩٤٢.

(٢) صحيح.

## دیاری کردنی ئاژەڵی دیاری بۆ قوربانی

**٢٧٧١-** «عَنْ عُرْوَةَ، عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ، وَمَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زَمَنَ الْحُدَيْبِيَةِ فِي بِضْعَ عَشْرَةَ مِائَةً مِنْ أَصْحَابِهِ حَتَّى إِذَا كَانُوا بِذِي الْحُلَيْفَةِ، قَلَّدَ الْهَدْيَ، وَأَشْعَرَ وَأَحْرَمَ بِالْعُمْرَةِ»[١].

**واتە:** عوروە دەگێڕێتەوە: لە میسوەری کوڕی مەخرەمە و مەڕوانی کوڕی حەکەم دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەردەمی حودەیبیە لەگەڵ پتر لە هەزار کەسێک لە هاوەڵانی دەرچوو تا گەیشتن بە (ذِي الْحُلَيْفَة)، ملوانکەی لە مل ئاژەڵە دیاریەکان کرد بۆ قوربانی، برینەی کردن و ئیحرامیشی بەست بۆ عومرە.

**ڕونکردنەوە:** (الْهَدْيَ) واتە: ئاژەڵی دیاری بۆ قوربانی کردن لە مەککە).

**٢٧٧٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَشْعَرَ بُدْنَهُ»[٢].

**واتە:** عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وشترێکی قەڵەوی دیاری کرد یان برینەی کرد بۆ قوربانی.

## کام لەو دوو تەنیشتەی وشترەکەی دیاری دەکات بۆ قوربانی

**٢٧٧٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَشْعَرَ بُدْنَهُ مِنَ الْجَانِبِ الْأَيْمَنِ، وَسَلَتَ الدَّمَ عَنْهَا، وَأَشْعَرَهَا»[٣].

**واتە:** ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ وشترێکی برینە کرد لەلای ڕاستیەوە، خوێنی لێ دەرهێنا، وە دیاری کرد.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٩٤ و ٢٧١٢ و ٢٧٣١ و ٤١٥٨ و ٤١٧٨ و ٤١٨٠، وأبو داود: ١٧٥٤ و ٢٧٦٥ و ٢٧٦٦ و ٤٦٥٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




## بابەت: دەرهێنانی خوێن لە وشتر (بە مەبەستی دیاریکردن بۆ قوربانی).

**٢٧٧٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، لَمَّا كَانَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ، أَمَرَ بِبَدَنَتِهِ فَأُشْعِرَ فِي سَنَامِهَا مِنَ الشِّقِّ الْأَيْمَنِ، ثُمَّ سَلَتَ عَنْهَا، وَقَلَّدَهَا نَعْلَيْنِ فَلَمَّا اسْتَوَتْ بِهِ عَلَى الْبَيْدَاءِ أَهَلَّ»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە (ذي الْحُلَيْفَة) بوو، فەرمانی کرد بە وشترێک کۆپارەی لای ڕاستی بریندار کرد پاشان خوێنەکەی سڕی، دوو نەعلیشی کردە ملی، کاتێ دامەزرا لەسەر وڵاخەکەی و بەرەو (الْبَيْدَاء) ڕۆیی تەلبیەی کرد.**

### هۆنینەوەی ملوانکە بۆ دیاریکردنی ئاژەڵی دیاری

**٢٧٧٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُهْدِي مِنَ الْمَدِينَةِ، فَأَفْتِلُ قَلَائِدَ هَدْيِهِ، ثُمَّ لَا يَجْتَنِبُ شَيْئاً مِمَّا يَجْتَنِبُهُ الْمُحْرِمُ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەو وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە ئاژەڵی قوربانی دیاری دەکرد، منیش ملوانکەکانم دەهۆنیەوە بۆ ملی قوربانیەکانی، پاشان دورنەدەکەوتەوە لە هیچ شتێ کە ئیحرام پۆش لێی دور دەکەوتەوە. (واتە: پێغەمبەر ﷺ ئاژەڵی بەدیاری دەنارد بۆ مەککە بەڵام لە ئیحرامدا نەبوو، بۆیە دوورنەدەکەوتەوە لەو شتانەی کە قەدەغەیە لەسەر ئیحرام پۆش).**

**٢٧٧٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَفْتِلُ قَلَائِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَيَبْعَثُ بِهَا، ثُمَّ يَأْتِي مَا يَأْتِي الْحَلَالُ قَبْلَ أَنْ يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من خۆم ملوانکەی ئاژەڵی دیاری پێغەمبەری خوام ﷺ دەهۆنیەوە، پاشان دەینارد بۆ مەککە، پاشان ئەوەی بێ ئیحرام بیکردایە دەیکرد، پێش ئەوەی قوربانیەکە بگاتە جێی دیاری کراوی خۆی.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٤٣، وأبو داود: ١٧٥٢ و ١٧٥٣، والترمذي: ٩٠٦، وإبن ماجه: ٣٠٩٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٩٨ و ١٧٠٠ و ٢٣١٧، ومسلم: ٣٥٩ و ٣٦٠ و ١٣٢١/٣٦٩، وأبو داود: ١٧٥٨، وإبن ماجه: ٣٠٩٤.

(٣) صحيح.




**٢٧٧٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: إِنْ كُنْتُ لَأَفْتِلُ قَلَائِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ يُقِيمُ وَلَا يُحْرِمُ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من خۆم ملوانكەی ئاژەڵی دیاری پێغەمبەری خوام ﷺ دەهۆنیەوە، پاشان دەمایەوە و ئیحرامی نەدەپۆشی.**

**٢٧٧٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَفْتِلُ الْقَلَائِدَ لِهَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَيُقَلِّدُ هَدْيَهُ، ثُمَّ يَبْعَثُ بِهَا، ثُمَّ يُقِيمُ لَا يَجْتَنِبُ شَيْئاً مِمَّا يَجْتَنِبُهُ الْمُحْرِمُ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من خۆم ملوانكەكانم دەهۆنیەوە بۆ ئەو ئاژەڵانەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ بە دیاری دەینارد بۆ قوربانی، پاشان ملوانكەی دەكردە ملی ئاژەڵەكەی، پاشان دەینارد بۆ مەككە، پاشان دەمایەوە و خۆی نەدەپاراست لەوەی ئیحرام پۆش خۆی دەپارێزێ.**

**٢٧٧٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: لَقَدْ رَأَيْتُنِي أَفْتِلُ قَلَائِدَ الْغَنَمِ لِهَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ يَمْكُثُ حَلَالاً»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هەروەكو ئەوەی ئێستا لە پێش چاوم بێت ملوانەكەی ملی مەڕم دەهۆنیەوە بۆ ئەو ئاژەڵانەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیكردە دیاری بۆ قوربانی، پاشان بەبێ ئیحرام دەمایەوە.**

## ئەو شتەی ملوانكەی پێ دەهۆنرێتەوە

**٢٧٨٠-** «عَنْ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أَنَا فَتَلْتُ تِلْكَ الْقَلَائِدَ مِنْ عِهْنٍ كَانَ عِنْدَنَا، ثُمَّ أَصْبَحَ فِينَا، فَيَأْتِي مَا يَأْتِي الْحَلَالُ مِنْ أَهْلِهِ، وَمَا يَأْتِي الرَّجُلُ مِنْ أَهْلِهِ»[٤].

**واتە: دایكی ئیمانداران (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من ئەو ملوانكەم هۆنیەوە لە خوری خۆمان، پاشان تیاماندا بوو بەیانی دەكردەوە ئەوەی بێ ئیحرام دەیكرد**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٠٤، ومسلم: ١٣٢١/٣٧٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٠١ و ١٧٠٢ و ١٧٠٣، ومسلم: ٣٦٥ و ١٣٢١/٣٦٨، وأبو داود: ١٧٥٥، والترمذي: ٩٠٩، وإبن ماجه: ٣٠٩٥ و ٣٠٩٦.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

ئەویش دەیکرد، ئەوەشی کەسێک بێ ئیحرام لەگەڵ خێزانی دەیکات ئەویش دەیکرد.

## ملوانکە لە مل کردنی (ئاژەڵی) قوربانی بە مەبەستی دیاریکردن

**٢٧٨١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ حَفْصَةَ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا شَأْنُ النَّاسِ قَدْ حَلُّوا بِعُمْرَةٍ وَلَمْ تَحْلِلْ أَنْتَ مِنْ عُمْرَتِكَ؟ قَالَ: إِنِّي لَبَّدْتُ رَأْسِي وَقَلَّدْتُ هَدْيِي فَلَا أَحِلُّ حَتَّى أَنْحَرَ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە: لە حەفصەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا خەڵکی بۆچی ئیحرامیان شکاندوە بۆ عومرە کەچی تۆ ئیحرامت نەشکاندوە لە عومرەکەت؟ فەرمووی: من قژم پێکەوە نووساندوە، ملوانکەم لە ملی (ئاژەڵی) قوربانی کردوە، ئیحرامەکەم ناشکێنم تا خوێن نەڕێژم.

**٢٧٨٢-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ لَمَّا أَتَى ذَا الْحُلَيْفَةِ، أَشْعَرَ الْهَدْيَ فِي جَانِبِ السَّنَامِ الْأَيْمَنِ، ثُمَّ أَمَاطَ عَنْهُ الدَّمَ، وَقَلَّدَهُ نَعْلَيْنِ، ثُمَّ رَكِبَ نَاقَتَهُ، فَلَمَّا اسْتَوَتْ بِهِ الْبَيْدَاءَ، لَبَّى وَأَحْرَمَ عِنْدَ الظُّهْرِ، وَأَهَلَّ بِالْحَجِّ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ هات بۆ (ذُو الْحُلَيْفَة) وشتری دیاری برینە کرد لە لای کۆپارەی لای ڕاستی، پاشان خوێنەکەی لابرد، دوو نەعلیشی کردە ملی، پاشان سواری وشترەکەی بوو، کاتێ دامەزرا لەسەر وڵاخەکەی و بەرەو (الْبَيْدَاء) بەڕێ کەوت، تەلبیەی کردو لە کاتی نیوەڕۆدا ئیحرامی بەست و تەلبیەی حەجی کرد.

## ملوانکە لە مل کردنی وشتر بە مەبەستی دیاری کردن

**٢٧٨٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: فَتَلْتُ قَلَائِدَ بُدْنِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِيَدَيَّ، ثُمَّ قَلَّدَهَا، وَأَشْعَرَهَا وَوَجَّهَهَا إِلَى الْبَيْتِ، وَبَعَثَ بِهَا، وَأَقَامَ فَمَا حَرُمَ عَلَيْهِ شَيْءٌ كَانَ لَهُ حَلَالاً»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٩٩ و ١٧٠٥، ومسلم: ٣٦١ و ١٣٢١/٣٦٤، وأبو داود: ١٧٥٧، والترمذي: ٩٠٨، وإبن ماجه: ٣٠٩٨.




واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بە دەستی خۆم ملوانکەی ملی وشتری دیاریم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هۆنیەوە، پاشان دەیکرد ملی و برینەی دەکرد دەینارد بۆ بەیت، دەمایەوە هیچ شتێکی لەسەر حەرام نەبوو کە پێشتر بۆی حەڵاڵ بوو.

**٢٧٨٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: فَتَلْتُ قَلَائِدَ بُدْنِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ لَمْ يُحْرِمْ، وَلَمْ يَتْرُكْ شَيْئاً مِنَ الثِّيَابِ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من خۆم ملوانکەی ملی وشتری قوربانیەکانم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هۆنیەوە، پاشان ئیحرامی نەبەست وازی لە هیچ شتێک نەهێنا لە جل و بەرگ.

## ملوانکە لە مل کردنی مەڕ بە مەبەستی دیاری کردن

**٢٧٨٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَفْتِلُ قَلَائِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ غَنَماً»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من خۆم ملوانکەی ملی مەڕی دیاریم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەهۆنیەوە.

**٢٧٨٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كَانَ يُهْدِي الْغَنَمَ»[٣].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ مەڕی بە دیاری دەنارد بۆ ماڵی خوا بە مەبەستی سەربڕین.

**٢٧٨٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَهْدَى مَرَّةً غَنَماً، وَقَلَّدَهَا»[٤].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ جارێکیان مەڕێکی بە دیاری نارد بۆ مەککە بۆ سەربڕین و ملوانکەی کردە ملی.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**٢٧٨٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَفْتِلُ قَلَائِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ غَنَماً، ثُمَّ لَا يُحْرِمُ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من خۆم ملوانکەی ملی ئاژەڵی دیاریم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هۆنیەوە، پاشان ئیحرامی نەدەبەست.**

**٢٧٨٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَفْتِلُ قَلَائِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ غَنَماً، ثُمَّ لَا يُحْرِمُ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: دەڵێ: من خۆم ملوانکەی ملی ئاژەڵی دیاریم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هۆنیەوە، پاشان ئیحرامی نەدەبەست.**

**٢٧٩٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُنَّا نُقَلِّدُ الشَّاةَ، فَيُرْسِلُ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَلَالاً لَمْ يُحْرِمْ مِنْ شَيْءٍ»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئێمە ملوانکەمان دەکردە ملی مەڕ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەینارد بەبێ ئیحرام، ئیحرامیشی بۆ هیچ نەدەبەست.**

## دوو نەعل لە مل کردنی ئاژەڵی دیاری بۆ قوربانی

**٢٧٩١-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، لَمَّا أَتَى ذَا الْحُلَيْفَةِ أَشْعَرَ الْهَدْيَ مِنْ جَانِبِ السَّنَامِ الْأَيْمَنِ، ثُمَّ أَمَاطَ عَنْهُ الدَّمَ، ثُمَّ قَلَّدَهُ نَعْلَيْنِ، ثُمَّ رَكِبَ نَاقَتَهُ، فَلَمَّا اسْتَوَتْ بِهِ الْبَيْدَاءَ أَحْرَمَ بِالْحَجِّ، وَأَحْرَمَ عِنْدَ الظُّهْرِ، وَأَهَلَّ بِالْحَجِّ»[٤].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ هات بۆ (ذُو الْحُلَيْفَة) وشتری دیاری بۆ قوربانی برینە کرد لە لای کۆپارەی لای ڕاستی، پاشان خوێنەکەی لابرد، دوو نەعلیشی کردە ملی، پاشان سواری وشترەکەی بوو، کاتێ دامەزرا لەسەر وڵاخەکەی و بەرەو (الْبَيْدَاء) بەڕێ کەوت، تەلبیەی کردو لە کاتی نیوەڕۆدا ئیحرامی بەست و تەلبیەی حەجی کرد.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




## ئایا ئیحرام دەبەستێ کاتێ (کەسەکە) ملوانکەی لەملی ئاژەڵە دیاریەکەی کردوە بۆ قوربانی؟

**٢٧٩٢-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا كَانُوا حَاضِرِينَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِالْمَدِينَةِ، بَعَثَ بِالْهَدْيِ، فَمَنْ شَاءَ أَحْرَمَ، وَمَنْ شَاءَ تَرَكَ»[١].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەوان کاتێ لە خزمەتی پێغەمبەردا بوون لە مەدینە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاژەڵی دیاری بۆ قوربانی دەنارد بۆ مەککە، هەر کەس بیویستایە ئیحرامی دەبەست، هەرکەسیش بیویستایە ئیحرامی نەدەبەست.

## ئایا ملپێچ کردنی ئاژەڵی دیاری بۆ قوربانی ئیحرام پێویست دەکات؟

**٢٧٩٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَفْتِلُ قَلَائِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِيَدَيَّ، ثُمَّ يُقَلِّدُهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَدِهِ، ثُمَّ يَبْعَثُ بِهَا مَعَ أَبِي، فَلَا يَدَعُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ شَيْئاً أَحَلَّهُ اللَّهُ ﷻ لَهُ، حَتَّى يَنْحَرَ الْهَدْيَ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بە دەستی خۆم ملوانکەی ملی ئاژەڵە قوربانیەکانم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەهۆنیەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی خۆی دەیکردە ملی، پاشان لەگەڵ باوکم دەینارد بۆ مەککە، پێغەمبەری خوا ﷺ وازی لە شتێک نەدەهێنا کە خوا بۆی حەڵاڵ کردبوو، هەتا دیاریەکەی سەر دەبڕی.

**٢٧٩٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَفْتِلُ قَلَائِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ لَا يَجْتَنِبُ شَيْئاً مِمَّا يَجْتَنِبُهُ الْمُحْرِمُ»[٣].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بە دەستی خۆم ملوانکەی ملی ئاژەڵە قوربانیەکانم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەهۆنیەوە، پاشان لە هیچ شتێک دوورنەدەکەوتەوە کە ئیحرام پۆش لێی دوور دەکەوتەوە.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**٢٧٩٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَفْتِلُ قَلَائِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَا يَجْتَنِبُ شَيْئاً وَلَا نَعْلَمُ الْحَجَّ يُحِلُّهُ، إِلَّا الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بە دەستی خۆم ملوانکەی ملی ئاژەڵە قوربانیەکانم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەهۆنیەوە، خۆی بە دوور نەدەگرت لە هیچ شتێک کە ئیحرام پۆش خۆی لێ بە دوور دەگرێ، نەمانزانیوە حەج حەڵاڵی بکات، تەنها تەوافی بەیت نەبێ.**

**٢٧٩٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: إِنْ كُنْتُ لَأَفْتِلُ قَلَائِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَيُخْرَجُ بِالْهَدْيِ مُقَلَّداً، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُقِيمٌ مَا يَمْتَنِعُ مِنْ نِسَائِهِ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ملوانکەی ملی ئاژەڵە قوربانیەکانم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەهۆنیەوە، قوربانیەکان دەردەکران بە دیاریکراوی بۆ مەککە، پێغەمبەریش لە شوینی خۆی بوو خێزانەکانی لە خۆی قەدەغە نەدەکرد.**

**٢٧٩٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: لَقَدْ رَأَيْتُنِي أَفْتِلُ قَلَائِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْغَنَمِ، فَيَبْعَثُ بِهَا، ثُمَّ يُقِيمُ فِينَا حَلَالاً»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هەر وەکو ئەوەی لە پێش چاوم بێت ملوانکەی ملی مەڕی قوربانیم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەهۆنیەوە، پاشان دەینارد، پاشان لەناوماندا دەمایەوە بەبێ ئیحرام.**

## ناردنی ئاژەڵی دیاری بۆ مەککە بە مەبەستی سەربڕین

**٢٧٩٨-** «عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، سَاقَ هَدْياً فِي حَجِّهِ»[٤].

**واتە: جابر رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ ئاژەڵی دیاری نارد لە حەج کردنیدا.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




## سواربوونی وشتری دیاری بۆ سەربڕین

**٢٧٩٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، رَأَى رَجُلاً يَسُوقُ بَدَنَةً، قَالَ: ارْكَبْهَا، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهَا بَدَنَةٌ، قَالَ: ارْكَبْهَا، وَيْلَكَ فِي الثَّانِيَةِ، أَوْ فِي الثَّالِثَةِ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بینی وشترێکی قوربانی بۆ سەربڕین لێ دەخوڕی، فەرمووی: سواریبە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو وشترە بۆ قوربانیە، لە دووەم جار یان سێیەم جاردا فەرمووی: هاوار بۆ تۆ سواریبە.**

**٢٨٠٠-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى رَجُلاً يَسُوقُ بَدَنَةً، فَقَالَ: ارْكَبْهَا، قَالَ: إِنَّهَا بَدَنَةٌ، قَالَ: ارْكَبْهَا، قَالَ: إِنَّهَا بَدَنَةٌ، قَالَ فِي الرَّابِعَةِ: ارْكَبْهَا، وَيْلَكَ»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بینی وشترێکی قوربانی بۆ سەربڕین لێ دەخوڕی، فەرمووی: سواریبە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو وشترە بۆ قوربانیە، لە چوارەم جاردا فەرمووی: هاوار بۆ تۆ سواریبە.**

## سواربوونی وشتری دیاری بۆ سەربڕین بۆ کەسێکە ڕێگا ماندووی بکات

**٢٨٠١-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى رَجُلاً يَسُوقُ بَدَنَةً، وَقَدْ جَهَدَهُ الْمَشْيُ، قَالَ: ارْكَبْهَا، قَالَ: إِنَّهَا بَدَنَةٌ، قَالَ: ارْكَبْهَا، وَإِنْ كَانَتْ بَدَنَةً»[٣].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی وشترێکی دیاری لێدەخوڕی بۆ قوربانی، ڕێگا ماندووی کردبوو، فەرمووی: سواریبە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە وشتری دیاریە بۆ سەربڕین، فەرمووی: سواریبە، با وشتری دیاریش بێت بۆ سەربڕین.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٨٩ و ١٧٠٦ و ٢٧٥٥ و ٦١٦٠، ومسلم: ٣٧١ و ١٣٢٢/٣٧٢، وأبو داود: ١٧٦٠، وإبن ماجه: ٣١٠٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٩٠ و ٢٧٥٤ و ٦١٥٩، ومسلم: ٣٧٣ و ١٣٢٣/٣٧٤، والترمذي: ٩١١، وإبن ماجه: ٣١٠٤.

(٣) صحيح.




## سواربوونی وشتری دیاری بە شێوەیەکی چاک

**٢٨٠٢-** «عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، يَسْأَلُ عَنْ رُكُوبِ الْبَدَنَةِ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: ارْكَبْهَا بِالْمَعْرُوفِ إِذَا أُلْجِئْتَ إِلَيْهَا حَتَّى تَجِدَ ظَهْراً»[1].

**واتە: ئەبو زوبەیر، دەڵێ: گوێم لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا بوو (خوا لێیان ڕازی بێ) پرسیاری لێکرا دەبارەی وشتری دیاری، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: سواریبە بە شێوەیەکی چاک ئەگەر ناچار بووی تا وڵاخێکی تر پەیدا دەکەی بۆ سوار بوون.**

## ڕەوایەتی هەڵوەشاندنەوەی حەج بە عومرە
## بۆ کەسێک قوربانی بە دیاری لەگەڵ خۆی نەهێنابێ

**٢٨٠٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَلَا نُرَى إِلَّا الْحَجَّ، فَلَمَّا قَدِمْنَا مَكَّةَ طُفْنَا بِالْبَيْتِ ، أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَنْ لَمْ يَكُنْ سَاقَ الْهَدْيَ، أَنْ يَحِلَّ، فَحَلَّ مَنْ لَمْ يَكُنْ سَاقَ الْهَدْيَ وَنِسَاؤُهُ لَمْ يَسُقْنَ فَأَحْلَلْنَ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَحِضْتُ فَلَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ، فَلَمَّا كَانَتْ لَيْلَةُ الْحَصْبَةِ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، يَرْجِعُ النَّاسُ بِعُمْرَةٍ وَحَجَّةٍ، وَأَرْجِعُ أَنَا بِحَجَّةٍ، قَالَ: أَوَ مَا كُنْتِ طُفْتِ لَيَالِيَ قَدِمْنَا مَكَّةَ، قُلْتُ: لَا، قَالَ: فَاذْهَبِي مَعَ أَخِيكِ إِلَى التَّنْعِيمِ، فَأَهِلِّي بِعُمْرَةٍ، ثُمَّ مَوْعِدُكِ مَكَانُ كَذَا، وَكَذَا»[2].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین تەنها مەبەستمان حەج بوو، کاتێ گەیشتینە مەککە تەوافی ماڵی خوامان کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد هەرکەس قوربانی نەهێناوە با ئیحرامەکەی بشکێنێ، جا ئەوەی قوربانی نەهێنابوو ئیحرامەکەی شکاند، خێزانەکانیشی قوربانیان نەهێنا بوو، بۆیە ئیحرامەکەیان شکاند، عائیشە دەڵێ: کەوتمە حەیز تەوافی ماڵی خوام نەکرد، کاتێ لە شەوی مانەوە بووین، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٧٥ و ١٣٢٤/٣٧٦، وأبو داود: ١٧٦١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٦١ و ١٧٦٢ و ١٧٧١ و ١٧٧٢، ومسلم: ١٢٨ و ١٢١١/١٢٩، وأبو داود: ١٧٨٣، وإبن ماجه: ٣٠٧٣.




**دەگەڕێنەوە بە عومرەو حەجێک، منیش تەنها بە حەجێک دەگەڕێمەوە، فەرمووی: ئەی تۆ تەوافت نەکرد ئەو شەوانەی کە هاتینە مەککە، وتم: نا، فەرمووی: دەی لەگەڵ براکەت برۆ بۆ تەنعیم (سێ میل لە مەککە دوور بوو) ئیحرام ببەستە بۆ عومرە، پاشان جێگای بینینت لە فلانە شوێن و فلانە شوێنە.**

**٢٨٠٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، لَا نُرَى إِلَّا أَنَّهُ الْحَجُّ، فَلَمَّا دَنَوْنَا مِنْ مَكَّةَ، أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ أَنْ يُقِيمَ عَلَى إِحْرَامِهِ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ أَنْ يَحِلَّ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین تەنها مەبەستمان حەج بوو، کاتێ نزیک مەککە بووینەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد هەر کەس قوربانی لەگەڵ خۆی هێناوە با بەردەوام بێت لەسەر ئیحرامەکەی، هەرکەسیش قوربانی نەهێناوە با ئیحرام بشکێنێ.**

**٢٨٠٥-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: أَهْلَلْنَا أَصْحَابَ النَّبِيِّ ﷺ بِالْحَجِّ خَالِصاً لَيْسَ مَعَهُ غَيْرُهُ خَالِصاً وَحْدَهُ، فَقَدِمْنَا مَكَّةَ صَبِيحَةَ رَابِعَةٍ، مَضَتْ مِنْ ذِي الْحِجَّةِ، فَأَمَرَنَا النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: أَحِلُّوا، وَاجْعَلُوهَا عُمْرَةً فَبَلَغَهُ عَنَّا أَنَّا نَقُولُ: لَمَّا لَمْ يَكُنْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ عَرَفَةَ إِلَّا خَمْسٌ، أَمَرَنَا أَنْ نَحِلَّ فَنَرُوحَ إِلَى مِنًى، وَمَذَاكِيرُنَا تَقْطُرُ مِنَ الْمَنِيِّ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَخَطَبَنَا، فَقَالَ: فَقَدْ بَلَغَنِي الَّذِي قُلْتُمْ، وَإِنِّي لَأَبَرُّكُمْ وَأَتْقَاكُمْ، وَلَوْلَا الْهَدْيُ لَحَلَلْتُ، وَلَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي، مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا أَهْدَيْتُ، قَالَ: وَقَدِمَ عَلِيٌّ مِنَ الْيَمَنِ فَقَالَ: بِمَا أَهْلَلْتَ؟ قَالَ بِمَا أَهَلَّ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ، قَالَ: فَأَهْدِ، وَامْكُثْ حَرَاماً كَمَا أَنْتَ قَالَ، وَقَالَ سُرَاقَةُ بْنُ مَالِكِ بْنِ جُعْشُمٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ عُمْرَتَنَا هَذِهِ لِعَامِنَا هَذَا أَوْ لِلْأَبَدِ؟ قَالَ: هِيَ لِلْأَبَدِ»[٢].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: ئێمە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئیحرامان بە تایبەتی بۆ حەج بەست، چووینە مەککە سەرەبەیانی چوار ڕۆژ تێپەڕیبوو لە (ذِي الْحِجَّة) پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردین فەرمووی: ئیحرام بشکێنن و بیکەن بە عومرە، هەواڵمان پێگەیشت دەمانوت: تەنها پێنج میلمان ماوە، فەرمانی پێکردین ئیحرام بشکێنین و**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٠٩ و ١٧٢٠ و ٢٩٥٢، ومسلم: ١٢١١/١٢٥، وإبن ماجه: ٢٩٨١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٥٧ و ١٥٦٨ و ١٦٥١ و ١٧٨٥ و ٢٥٠٥ و ٧٢٣٠ و ٧٣٦٧، ومسلم: ١٤١ و ١٢١٦/١٤٤، وأبو داود: ١٧٨٧ و ١٧٨٨، والترمذي: ٢٩٨٠، وإبن ماجه: ١٠٧٤ و ٢٩٨٠.




**بڕۆین بۆ مینا، ئەندامی نێرینەمان مەنی لێدەهاتە خوارەوە، پێغەمبەر ﷺ وتارێکی بۆ داین فەرمووی: ئەوەی باستان کرد پێم گەیشت، من چاکترین و لە خوا ترسترینتانم، ئەگەر قوربانیەکە نەبووایە ئیحرامم دەشکاند، ئەگەر سەرەتا وەکو ئێستا بمزانیایە بەوەی هاوەڵەکانم تووشی نارەحەتی دەبن ئەوە قوربانیم لەگەڵ خۆم نەدەهێنا، وتی: عەلی لە یەمەنەوە هات، فەرمووی: بەچی ئیحرامت کردوە؟ وتی: بەوەی پێغەمبەر ﷺ ئیحرامی پێکردوە، فەرمووی: قوربانی بکە، بمێنەرەوە بە ئیحرامی وەک چۆن ماوی، وتی: سوراقەی کوڕی جەعشەم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم عومرەمان تەنها بۆ ئەمساڵە یان بۆ هەتا هەتایە؟ فەرمووی: بۆ هەتا هەتایە.**

**٢٨٠٦-** «عَنْ سُرَاقَةَ بْنِ مَالِكِ بن جُعْشُمٍ ﷺ أَنَّهُ قال: يا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ عُمْرَتَنَا هذه لِعَامِنَا أَمْ لِأَبَدٍ قال رسول اللَّهِ ﷺ هِيَ لِأَبَدٍ»[١].

**واتە: سوراقەی کوڕی مالکی کوڕی جوعشوم ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم عومرەی ئێمە تەنها بۆ ئەم ساڵانە یان بۆ هەتا هەتایە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بۆ هەتا هەتایە.**

**٢٨٠٧-** «عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: قَالَ سُرَاقَةُ ﷺ: تَمَتَّعَ رسول اللَّهِ ﷺ وَتَمَتَّعْنَا معه فَقُلْنَا أَلَنَا خَاصَّةً أَمْ لِأَبَدٍ قال بَلْ لِأَبَدٍ» [٢].

**واتە: عەطاء دەڵێ: سوراقە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تەمەتوعی کرد ئێمەش تەمەتوعمان لەگەڵی، وتمان ئایا ئەمە تەنها بۆ ئێمەیە یان بۆ هەتا هەتایە؟ فەرمووی: بۆ هەتا هەتایە.**

**٢٨٠٨-** «عَنِ الْحَرْثِ بْنِ بِلَالٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ قُلْتُ: يا رَسُولَ اللَّهِ أَفَسْخُ الْحَجِّ لنا خَاصَّةً أَمْ لِلنَّاسِ عَامَّةً، قَالَ: بَلْ لَنَا خَاصَّةً»[٣].

**واتە: حەرثی کوڕی بیلال دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە ﷺ وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا هەڵوەشاندنەوەی حەج تەنها بۆ ئێمەیە، یان بۆ هەموو خەڵکە، فەرمووی: تەنها بۆ ئێمەیە.**

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٢٩٧٧.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٨٠٨، وإبن ماجه: ٢٩٨٤.




**٢٨٠٩-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ في مُتْعَةِ الْحَجِّ قَالَ كَانَت لَنَا رُخْصَةً»[١].

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەربارەی تەمەتوعی حەج وتی: ئەوە بۆ ئێمە ڕوخسەت بوو.**

**٢٨١٠-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: في مُتْعَةِ الْحَجِّ لَيْسَتْ لَكُمْ وَلَسْتُمْ منها في شَيْءٍ إنما كانت رُخْصَةً لنا أَصْحَابَ مُحَمَّدٍ ﷺ»[٢].

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەربارەی تەمەتوعی حەج وتی: بۆ ئێوە نیە (تەمەتوع گشتگیرە، بەڵام هەڵوەشاندنەوەی حەج بە عومڕە تایبەتە) ئێوە هیچتان نیە لەوەدا، بەڵكو ئەوە ڕوخسەتێكە بۆ ئێمەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ.**

**٢٨١١-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: كَانَتْ الْمُتْعَةُ رُخْصَةً لَنَا»[٣].

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: تەمەتوعی ڕوخسەتێك بوو بۆمان.**

**٢٨١٢-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحَمنِ بْنِ أَبِي الشَّعْثَاءِ قَالَ كُنْتُ مَعَ إِبْرَاهِيمُ النَّخَعِيِّ وَإِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ فَقُلْتُ: لَقَد هَمَمْتُ أَنْ أَجْمَعَ الْعَامَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ فقال إِبْرَاهِيمُ لَوْ كَانَ أَبُوكَ لم يَهُمَّ بِذَلِكَ قال وقال إِبْرَاهِيمُ التَّيْمِيُّ عَنْ أَبِيه، عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ إنْمَا كَانِتْ الْمُتْعَةُ لنا خَاصَّةً»[٤].

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ئەبو شەعثاء دەڵێ: من لەگەڵ ئیبراهیمی نەخەعی و ئیبراهیمی تەمیمی بووم، وتم: بەڕاستی هات بە خەیاڵمدا ئەم ساڵ حەج و عومڕە پێكەوە كۆبكەمەوە، ئیبراهیم وتی: ئەگەر باوكت بووایە خەیاڵی ئەوەی نەدەكرد، وتی: ئیبراهیمی تەمیمی لە باوكیەوە گێڕایەوە لە ئەبو زەڕ ﷺ وتی: بەڕاستی تەمەتوع بە تایبەتی بۆ ئێمە بوو.**

**٢٨١٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قال كَانُوا يُرَوْنَ أَنَّ الْعُمْرَةَ في أَشْهُرِ الْحَجِّ من أَفْجَرِ الْفُجُورِ في الأرض وَيَجْعَلُونَ الْمُحَرَّمَ صَفَرَ وَيَقُولُونَ إذا بَرَأَ الدَّبَرْ وَعَفَا الْوَبَرْ وَانْسَلَخَ صَفَرْ أو قال دخل صَفَرْ فَقَدْ حَلَّتْ الْعُمْرَةُ لِمَنْ اعْتَمَرْ فَقَدِمَ النبي ﷺ وَأَصْحَابُهُ صَبِيحَةَ رَابِعَةٍ مُهِلِّينَ بِالْحَجِّ فَأَمَرَهُمْ أَنْ يَجْعَلُوهَا عُمْرَةً فَتَعَاظَمَ ذلك عِنْدَهُمْ فَقَالُوا يا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الْحِلِّ قال الْحِلُّ كُلُّهُ»[٥].

---

(١) صحيح موقوف. أخرجه مسلم: ١٦٠ و ١٢٢٤/١٦٣، وإبن ماجه: ٢٩٨٥.

(٢) صحيح موقوف.

(٣) صحيح موقوف.

(٤) صحيح موقوف.

(٥) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٦٤ و ٣٨٣٢، ومسلم: ١٢٤٠.




واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: خەڵکی سەردەمی نەفامی پێیان وابوو کە عومرە کردن لە مانگەکانی حەجدا لە هەموو خراپەیەک خراپترە لەسەر زەویدا، مانگی موحەڕەمەیان لە جێی صەفەر دادەنا و دەیانوت: ئەگەر کاتێ وشترە ئاوسەکان چاک بوونەوەو شوێنی پێیەکانیان سڕایەوەو مانگی صەفەر بەسەرچوو، ئیتر ئەو کاتە عومرە کردن دروستە بۆ کەسێ کە بیەوێت بیکات، پێغەمبەر و ﷺ هاوەڵانی لەبەرەبەیانی چوارەم ڕۆژدا گەیشتن نیەتی حەجیان هێنا بوو، فەرمانی پێکردن نیەتەکەیان بگۆڕن بە عومرە ئەوانیش ئەوەیان بەلاوە گەورە و گران بوو وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا دروستە؟ فەرمووی: بە هەموو شێوەیەک حەڵاڵ و دروستە.

**٢٨١٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يقول أَهَلَّ رسول اللَّهِ ﷺ بِالْعُمْرَةِ وَأَهَلَّ أَصْحَابُهُ بِالْحَجِّ وَأَمَرَ من لم يَكُنْ معه الْهَدْيُ أَنْ يَحِلَّ وكان فِيمَنْ لم يَكُنْ معه الْهَدْيُ طَلْحَةُ بن عُبَيْدِ اللَّهِ وَرَجُلٌ آخَرُ فَأَحَلَّا»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئیحرامی عومرەی بەست، هاوەڵەکانیشی ئیحرامی حەجیان بەست، فەرمانی کرد هەر کەس قوربانی لەگەڵ خۆی نەهێناوە ئیحرام بشکێنێ، لەوانەش قوربانی لەگەڵ خۆی نەهێنا بوو طەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا و پیاوێکی تر بوو، هەردووکیان ئیحرامیان بەست.

**٢٨١٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: هَذِهِ عُمْرَةٌ اسْتَمْتَعْنَاهَا فَمَنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ هدى فَلْيَحِلَّ الْحِلَّ كُلَّهُ فَقَدْ دَخَلَتْ الْعُمْرَةُ في الْحَجِّ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەمە عومرەیە چێژمان لێوەرگرت، هەرکەس قوربانی لا نیە، ئەوە با ئیحرام بە تەواوی بشکێنێ و هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵە، ئەوە عومرە چووەتە ناو حەجەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٦ و ١٢٣٩/١٩٧، وأبو داود: ١٨٠٤.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٤١، وأبو داود: ١٧٩٠.

## ئەوەی دروستە بۆ ئیحرام پۆش بیخوات لە نێچیری ڕاو کراو

**٢٨١٦-** «عَنْ أَبي قَتَادَةَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَتَّى إِذَا كَانَ بِبَعْضِ طَرِيقِ مَكَّةَ تَخَلَّفَ مَعَ أَصْحَابٍ لَهُ مُحْرِمِينَ وهو غَيْرُ مُحْرِمٍ وَرَأَى حِمَاراً وَحْشِيّاً فَاسْتَوَى على فَرَسِهِ ثُمَّ سَأَلَ أَصْحَابَهُ أَنْ يُنَاوِلُوهُ سَوْطَهُ فَأَبَوْا فَسَأَلَهُمْ رُمْحَهُ فَأَبَوْا فَأَخَذَهُ ثُمَّ شَدَّ على الْحِمَارِ فَقَتَلَهُ فَأَكَلَ منه بَعْضُ أَصْحَابِ النَّبيِّ ﷺ وَأَبَى بَعْضُهُمْ فَأَدْرَكُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَسَأَلُوهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: إِنَّمَا هِيَ طُعْمَةٌ أَطْعَمَكُمُوهَا اللَّه ﷻ»[١].

**واتە: ئەبو قتادە ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بوو لە یەکێک لە ڕێگاوبانەکانی مەککە لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵانی دواکەوت بە ئیحرامەوە، بەڵام خۆی ئیحرامی نەپۆشیبوو، گوێ درێژێکی کێوی بینی، سەرکەوتە سەر ئەسپەکەی، پاشان قامچیەکە لە دەستی بەربووە خوارەوە داوای لە هاوەڵەکانی کرد قامچیەکە بدەن بە دەستیەوە، ئەوانیش نەیاندا پێی، پاشان داوای ڕمەکەی کرد هەر نەیاندا پێی، دواتر خۆی هەڵیگرت، پاشان هێرشی کرد سەر گوێدرێژەکە و کوشتی، هەندێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ لێیان خوارد، هەندێکی تریشیان لێیان نەخوارد، پاشان گەیشتن بە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاریان لێکرد دەربارەی، فەرمووی: خواردنێکە خوا ﷻ پێی بەخشیون.**

**٢٨١٧-** «عَنْ عَبْدالرَّحْمَن التَّيْمِيِّ قَالَ: كُنَّا مَعَ طَلْحَةَ بن عُبَيْدِ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ مُحْرِمُونَ فَأُهْدِيَ لَهُ طَيْرٌ وَهُوَ رَاقِدٌ فَأَكَلَ بَعْضُنَا وَتَوَرَّعَ بَعْضُنَا فَاسْتَيْقَظَ طَلْحَةُ فَوَفَّقَ مَنْ أَكَلَهُ وَقَالَ: أَكَلْنَاهُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[٢].

**واتە: عەبدوڕەحمانی تەمیمی دەڵێ: ئێمە لەگەڵ طەڵحەی کوڕی عوبیدوڵلا ﷺ بووین و ئیحرامان پۆشیبوو باڵندەیەکی بە دیاری بۆ هێنرا ڕاکشا بوو، هەندێکمان لێیان خوارد و هەندێکی ترمان لێمان نەخوارد، طەڵحە لە خەو هەڵسا لێی خواردو وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ خواردمان.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٢٣ و ٢٩١٤ و ٥٤٩٠ و ٥٤٩٢، ومسلم: ٥٦ و ١١٩٦/٥٧، وأبو داود: ١٨٥٢، والترمذي: ٨٤٧.

(٢) صحيح الإسناد. أخرجه مسلم: ١١٩٧.

**٢٨١٨-** «عَنْ عُمَيْرِ بن سَلَمَةَ الضَّمْرِيِّ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ عَنِ الْبَهْزِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ يُرِيدُ مَكَّةَ وهو مُحْرِمٌ حتى إذا كَانُوا بِالرَّوْحَاءِ إذا حِمَارُ وَحْشٍ عَقِيرٌ فَذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فقال دَعُوهُ فإنه يُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَ صَاحِبُهُ فَجَاءَ الْبَهْزِيُّ وهو صَاحِبُهُ إلى رسول اللَّهِ ﷺ فقال يا رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عَلَيْكَ وسلم شَأْنَكُمْ بهذا الْحِمَارِ فَأَمَرَ رسول اللَّهِ ﷺ أَبَا بَكْرٍ فَقَسَّمَهُ بين الرِّفَاقِ ثُمَّ مَضَى حتى إذا كان بِالْأُثَايَةِ بين الرُّوَيْثَةِ وَالْعَرْجِ إذا ظَبْيٌ حَاقِفٌ في ظِلٍّ وَفِيهِ سَهْمٌ فَزَعَمَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ رَجُلاً يَقِفُ عِنْدَهُ لَا يُرِيبُهُ أَحَدٌ من الناس حتى يُجَاوِزَهُ»[١].

**واتە: عومەیری كوڕی سەلەمەی ضەمری دەگێڕێتەوە: بەهزیی ﷺ هەواڵی پێدا، پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بە ئیحرامەوە بۆ مەككە، تا گەیشتن بە ڕەوحاء گوێدرێژێكی كێوی قسریان بینی، ئەوە باس كرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وازی لێ بهێنن لەوەیە خاوەنەكەی بێتەوە، بەهزیی كە خاوەنی گوێدرێژێكە بوو هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر ئەم گوێدرێژەتان پێویستە بیبەن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی كرد بە ئەبو بەكر گۆشتەكەی دابەش كرد لە نێوان هاوەڵەكاندا، پاشان بەڕێكەوتن هەتا گەیشتن بە (الْأُثَايَة) (كە شوێنێكە دەكەوێتە) نێوان (الرُّوَيْثَة) نێوان (الْعَرْج) (كە دێ یەكە چەند ڕۆژێك لە مەدینەوە دوورە)، كەڵە ئاسكێكیان بینی لە سێبەرێكدا خەوتبوو تیرێكی بەركەوتبوو، پێی وابوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە كەسێك كرد لای بوەستێ كەس بێزاری نەكات تا لێی تێپەڕ دەبەن.**

## ئەوەی دروست نیە بۆ ئیحرام پۆش بیخوات لە نێچیر

**٢٨١٩-** «عَنِ الصَّعْبِ بن جَثَّامَةَ ﷺ، أَنَّهُ أَهْدَى لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ حِمَارَ وَحْشٍ وهو بِالْأَبْوَاءِ أو بِوَدَّانَ فَرَدَّهُ عَلَيْهِ رَسُول اللَّهِ ﷺ فَلَمَّا رَأَى رَسُول اللَّهِ ﷺ مَا فِي وَجْهِي، قَالَ: أَمَا إِنَّهُ لَمْ نَرُدَّهُ عَلَيْكَ إِلاَّ أَنَّا حُرُمٌ»[٢].

**واتە: صەعبی كوڕی جەثامە ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو گوێدرێژێكی كێوی بە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا لە ئەبواء یان لە وەددان، پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕاندیەوە**

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٢٥ و ٢٥٧٣ و ٢٥٩٦، ومسلم: ١١٩٤/٥٤، والترمذي: ٨٤٩، وإبن ماجه: ٣٠٩٠.



**بۆی، كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بینی ڕوخساری بە جۆرێ گۆڕا، فەرمووی: ئێمە بۆتمان نەدەگەڕاندەوە تەنها لەبەر ئەوە نەبێت لە ئیحرام داین.**

**٢٨٢٠-** «عَنِ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَقْبَلَ حَتَّى إِذَا كَانَ بِوَدَّانَ رَأَى حِمَارَ وَحْشٍ فَرَدَّهُ عَلَيْه، وَقَالَ: أَنَا حُرُمٌ لَا نَأْكُلُ الصَّيْدَ»(١).

**واتە: صەعبی كوڕی جەثامە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ هاتە وەددان گوێدرێژێكی كێوی بینی، گەڕاندیەوە بۆ خاوەنەكەی، فەرمووی: ئیحرامم بەستووە، ئێمە نێچیر ناخۆین.**

**٢٨٢١-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: لِزَيْدِ بن أَرْقَمَ ﷺ، مَا عَلِمْتَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أُهْدِيَ لَهُ عُضْوُ صَيْدٍ وَهُوَ مُحْرِمٌ فَلَمْ يَقْبَلْهُ قَالَ: نَعم»(٢).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، بە زەیدی كوڕی ئەرقەمی ﷺ وت: تۆ زانیوتە پێغەمبەر ﷺ لە ئیحرامدا بوو ئەندامی نیچیرێكی بە دیاری بۆ هێنرا وەری نەگرت وتی: بەڵێ.**

**٢٨٢١-** «عَنْ طَاوُسٍ عَنِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَدِمَ زَيْدُ بن أَرْقَمَ ﷺ، فَقَالَ لَهُ ابْن عَبَّاسٍ يَسْتَذْكِرُهُ كَيْفَ أَخْبَرْتَنِي عن لَحْمِ صَيْدٍ أُهْدِيَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ وهو حَرَامٌ، قَالَ: نَعم أَهْدَى لَهُ رَجُلٌ عُضْواً مِنْ لَحْمِ صَيْدٍ فَرَدَّهُ، وَقَالَ: إِنَّا لَا نَأْكُلُ إِنَّا حُرُمٌ»(٣).

**واتە: طاوس دەگێڕێتەوە: لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: زەیدی كوڕی ئەرقەم هات، ئیبنو عەبباس پێی وت: یادی خستەوە چۆن هەواڵم پێدەدەی دەربارەی گۆشتی نێچیر كە بە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نێردرابوو، لە كاتێكدا ئەو لە ئیحرامدا بوو؟ وتی: بەڵێ، پیاوێك بەشێك گۆشتی بۆی هێنا لە نێچیرێك ڕاوی كردبوو، ئەویش گێڕایەوەو فەرمووی: ئێمە لە ئیحرامدا نێچیری ڕاوكراو ناخۆین.**

**٢٨٢٢-** «عَنِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَهْدِي الصَّعْبُ بن جَثَّامَةَ ﷺ إِلى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ رِجْلَ حِمَارِ وَحْشٍ تَقْطُرُ دَماً، وَهُوَ مُحْرِمٌ وَهُو بِقُدَيْدٍ فَرَدَّهَا عَلَيْهِ»(٤).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٩٥، وأبو داود: ١٨٥٠.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٣ و ١١٩٤/٥٤.




واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: صەعبی کوڕی جوثامە ﷺ ڕانی گوێدرێژێکی کێوی بە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا، ئەو لە ئیحرامدا بوو لە (قُدَیْد) ڕەتی کردەوە بۆی.

**٢٨٢٣**- «عَنِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ الصَّعْبَ بن جَثَّامَةَ ﷺ أَهْدَى لِلنَّبِيِّ ﷺ حِمَاراً وهو مُحْرِمٌ فَرَدَّهُ عَلَيْهِ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: صەعبی کوڕی جوثامە ﷺ گوێ درێژێکی کێوی بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا بە دیاری، ئەو لە ئیحرامدا بوو، گێڕایەوە بوو.

## ئەگەر ئیحرام پۆش پێکەنی کابرای بێ ئیحرام تێگەیشت مەبەستی پێی نێچیرێکە، ئینجا ڕاوی کردو کوشتی ئایا لێی دەخوات، یان نا؟

**٢٨٢٤**- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: انْطَلَقَ أَبِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ فَأَحْرَمَ أَصْحَابُهُ وَلَمْ يُحْرِمْ فَبَيْنَمَا أَنَا مَعَ أَصْحَابِي ضَحِكَ بَعْضُهُمْ إِلى بَعْضٍ فَنَظَرْتُ، فَإِذَا حِمَارُ وَحْشٍ فَطَعَنْتُهُ فَاسْتَعَنْتُهُمْ فَأَبَوْا أَنْ يُعِينُونِي فَأَكَلْنَا مِنْ لَحْمِهِ وَخَشِينَا أَنْ نُقْتَطَعَ فَطَلَبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُرَفِّعُ فَرَسِي شَأْواً وَأَسِيرُ شَأْواً فَلَقِيتُ رَجُلاً مِنْ غِفَارٍ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ فَقُلْتُ: أَيْنَ تَرَكْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال تَرَكْتُهُ وَهُوَ قَائِلٌ بِالسُّقْيَا فَلَحِقْتُهُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَصْحَابَكَ يقرؤون عَلَيْكَ السَّلَامَ وَرَحْمَةَ اللَّهِ وَإِنَّهُمْ قد خَشُوا أَنْ يُقْتَطَعُوا دُونَكَ فَانْتَظِرْهُمْ فَانْتَظَرَهُمْ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إني أَصَبْتُ حِمَارَ وَحْشٍ وَعِنْدِي مِنْهُ فَقَالَ لِلْقَوْمِ: كُلُوا وَهُمْ مُحْرِمُونَ»[٢].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی ئەبو قەتادە دەڵێ: باوکم (خوا لێیان ڕازی بێ) لە ساڵی حودەیبیە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو، هاوەڵەکانی ئیحرامیان بەست، ئەو ئیحرامی نەبەستبوو، لە کاتێکدا من لەگەڵ هاوەڵەکانمدا بووم هەندێکیان بۆ هەندێکی دیکەیان پێکەنین، تەماشام کرد گوێ درێژێکی کێویم بینی، لێمدا، داوای

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٢١ و ١٨٢٤ و ٢٥٦٩ و ٢٨٥٤ و ٥٤٠٦ و ٥٤٠٧، ومسلم: ٥٩ و ١١٩٦/٦٤، وإبن ماجه: ٣٠٩٣.

هاوكاریم لێكردن بەڵام هاوكاریان نەكردم، پاشان لە گۆشتەكەیان خوارد، ترساین لەوەی دوژمن لە پێغەمبەری خوا ﷺ دامان ببڕێت، پاشان گەڕام بە دوای پێغەمبەری خوادا ﷺ، جارێ بە ئەسپەكەم بە پەلە دەڕۆیشتم جارێ بە ئاسایی، هەتا گەیشتم بە پیاوێک لە غیفار لە نیوەی شەودا وتم: پێغەمبەرت ﷺ لە كوێ بەجێهێشت، وتی: كاتێ بە جێم هێشت لە شوێنێک بە ناوی: (السُّقْيَا) قەیلولەی دەكرد، پێی گەیشتم وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، بەڕاستی هاوەڵەكانت سڵاوت لێ دەكەن، ئەوان لەوە دەترسن دوژمن لە تۆ دایان ببڕێنێت، چاوەڕوانیان بكە چاوەڕوانیان بكە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من گوێ درێژێكی كێویم پێكاوە، هەندێ لە گۆشتەكەیم لە لایە، بە خەڵكەكەی فەرموو: بخۆن لە كاتێكدا ئەوان لە ئیحرامدا بوون.

**٢٨٢٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ أَنَّ أَبَاهُ أخبره، أَنَّهُ غَزَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ غَزْوَةَ الْحُدَيْبِيَةِ، قَالَ: فَأَهَلُّوا بِعُمْرَةٍ غَيْرِي فَاصْطَدْتُ حِمَارَ وَحْشٍ فَأَطْعَمْتُ أَصْحَابِي مِنْهُ وَهُمْ مُحْرِمُونَ، ثُمَّ أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَنْبَأْتُهُ أَنَّ عِنْدَنَا مِنْ لَحْمِهِ فَاضِلَةً فَقَالَ: كُلُوهُ وَهُمْ مُحْرِمُونَ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە: باوكی هەواڵی داوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداری غەزای حودەیبیەی كرد، وتی: هەموویان ئیحرامی عومرەیان بەست جگە لە من، منیش گوێدرێژێكی كێویم ڕاو كرد، هەندێكم بەخشی بە هاوەڵەكانم خواردیان، لە كاتێكدا لە ئیحرامدا بوون، پاشان هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵم پێدا بەشێک لە گۆشتەكەیان لەلا ماوە فەرمووی: بیخۆن، لە كاتێكدا ئەوان لە ئیحرامدا بوون.

## ئەگەر ئیحرام پۆش ئاماژەی بە نێچیرێ كرد ئیحرام نەپۆش كوشتی

**٢٨٢٦-** «عَن عَبْدَ اللَّهِ بن أبي قَتَادَةَ يحدث، عن أبيه ﷺ أَنَّهُمْ كَانُوا في مَسِيرٍ لهم بَعْضُهُمْ مُحْرِمٌ وَبَعْضُهُمْ ليس بِمُحْرِمٍ قَالَ فَرَأَيْتُ حِمَارَ وَحْشٍ فَرَكِبْتُ فَرَسِي وَأَخَذْتُ الرُّمْحَ فَاسْتَعَنْتُهُمْ فَأَبَوْا أَنْ يُعِينُونِي فَاخْتَلَسْتُ سَوْطاً من بَعْضِهِمْ فَشَدَدْتُ عَلَى الْحِمَارِ فَأَصَبْتُهُ فَأَكَلُوا مِنْهُ فَأَشْفَقُوا قال فَسُئِلَ عَنْ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: هَلْ أَشَرْتُمْ أو أَعَنْتُمْ؟ قَالُوا: لَا، قَالَ: فَكُلُوا»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادە، لەباوکیەوە ﷛ باس دەکات، ئەوان لە گەشتێکیاندا بوون، هەندێکیان ئیحرامیان پۆشی بوو، هەندێکیشیان ئیحرامیان نەپۆشی بوو، وتی: گوێدرێدرێژێکی کێویم بینی سواری ئەسپەکەم بووم، ڕمەکەم هەڵگرت، پاشان داوای یارمەتیم لێ کردن، ئەوانیش نکوڵیان کرد لەوەی یارمەتیم بدەن، قامچیەکم لە یەکێکیان دزی گوێ درێژەکەم پێ بەستەوەو پێکام، ئینجا ئەوانیش لێیان خوارد، وتی: پرسیار کرا دەربارەی خواردنی ئەو گۆشتە لە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا ئاماژەتان پێکرد بۆی یان هاوکاریتان کرد؟ وتیان: نەخێر، فەرمووی: دەی لێی بخۆن.

**٢٨٢٧-** «عَنْ جَابِرٍ ﷛ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: صَيْدُ الْبَرِّ لَكُمْ حَلَالٌ مَا لَمْ تَصِيدُوهُ أَو يُصَادَ لَكُمْ. قَالَ أبو عَبْد الرحمن عَمْرُو بن أبي عَمْرٍو ليس بِالْقَوِيِّ في الحديث وَإِنْ كان قد رَوَى عنه مَالِكٌ»[١].

واتە: جابر ﷛ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: نێچری کێوی بۆتان حەڵاڵە، بە مەرجێک خۆتان ڕاوتان نەکردبێ، یان بۆتان ڕاو نەکرابێ. ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: عەمری کوڕی ئەبو موسا بەهێز نیە لە فەرموودەکەدا، ئەگەر چی مالکیش لێیەوە ڕیوایەتی کردوە.

## ئەوەی دروستە ئیحرام پۆش بیکوژێ لە ئاژەڵەکان، کوشتنی سەگی هارە

**٢٨٢٨-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: خَمْسٌ لَيْسَ عَلَى الْمُحْرِمِ فِي قَتْلِهِنَّ جُنَاحٌ الْغُرَابُ وَالْحِدَأَةُ وَالْعَقْرَبُ وَالْفَأْرَةُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پێنج (ژیاندار) هەن ئیحرام پۆش بیانکوژێت گوناهبار نابێت، قەلەڕەش و کۆلارە (سورە داڵ و مشک گرەشی پێدەوترێ)، وە دووپشک و مشک و سەگی هار.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٨٥١، والترمذي: ٨٤٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٢٦ و ٣٣١٥، ومسلم: ٧٦ و ١١٩٩/٧٩، وأبو داود: ١٨٤٦، وإبن ماجه: ٣٠٨٨.

## كوشتنى مار

**٢٨٢٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: خَمْسٌ يَقْتُلُهُنَّ الْمُحْرِمُ الْحَيَّةُ وَالْفَأْرَةُ وَالْحِدَأَةُ وَالْغُرَابُ الأَبْقَعُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پێنج (ژیاندار) هەن ئیحرام پۆش دەیانكوژێت، مارو مشك و كۆلارەو ئەو قەلەڕەشەی پەڵەی سپی لەسەر پشتێتی، یان لەسەر سنگێتی، وە سەگی هاریش.**

## كوشتنى مشك

**٢٨٣٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَذِنَ فِي قَتْلِ خَمْسٍ مِنَ الدَّوَابِّ لِلْمُحْرِمِ الْغُرَابُ وَالْحِدَأَةُ وَالْفَأْرَةُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ وَالْعَقْرَبُ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوە بە كوشتنی پێنج جۆرە ئاژەڵ بۆ ئیحرام پۆش: قەلەڕەش و كۆلارەو مشك و سەگی هارو دوو پشك.**

## كوشتنى مارمێلكە

**٢٨٣١-** «عَنْ سَعِيدِ بن الْمُسَيَّبِ، أَنَّ امْرَأَةً دَخَلَتْ على عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا وَبِيَدِهَا عُكَّازٌ فَقَالَتْ مَا هَذَا فَقَالَتْ لِهَذِهِ الْوَزَغِ لِأَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ حَدثنا أَنَّهُ لم يَكُنْ شَيْءٌ إلاَّ يُطْفِئُ عَلَى إبْرَاهِيم عَلَيْهِ السَّلَام إلاَّ هَذِهِ الدَّابَّةُ فَأَمَرَنَا بِقَتْلِهَا وَنَهَى عَنْ قَتْلِ الْجِنَّانِ إلاَّ ذَا الطُّفْيَتَيْنِ وَالأَبْتَرَ فَإِنَّهُمَا يَطْمِسَانِ الْبَصَرَ، وَيُسْقِطَانِ ما في بُطُونِ النِّسَاءِ»[٣].

**واتە: سەعیدی كوڕی موسیب دەگێڕێتەوە: ئافرەتێك هاتە ژوورەوە بۆ لای عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) گۆچانێكی بەدەستەوە بوو، عائیشە وتی: ئەمە چیە؟ وتی: ئەمە بۆ مارمێلكەیە، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باس كردین، هەموو شتەكان بە گوێرەی**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٢٩ و ٣٣١٤، ومسلم: ٦٦ و١١٩٨/٧١، والترمذي: ٨٣٧، وإبن ماجه: ٣٠٨٧ و ٣٢٤٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٠٨، ومسلم: ٢٢٣٢، وإبن ماجه: ٣٢٣١ و ٣٥٣٤.




توانایان ئاگرەکەی ئیبراهیمیان دەکوژاندەوە جگە لەم گیاندارە نەبێت، فەرمانی پێکردووین بە کوشتنی، ڕێگریشی کردوە لە کوشتنی ئەو مارانەی لە ماڵەکاندان جگە لەوانە نەبێت کە دوو خەتی سپی لە بان پشتیانە، وە ئەوانەش کە کلکیان بچووکە، چونکە ئەو دووانە چاو کوێر دەکەن و منداڵی ناو سکیش لەبار دەبن.

## کوشتنی دووپشک، کۆڵاژدم، دەمارە کۆڵە

**٢٨٣٢**- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النبي ﷺ قال خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ لَا جُنَاحَ عَلَى من قَتَلَهُنَّ أو في قَتْلِهِنَّ وهو حَرَامٌ الْحِدَأَةُ وَالْفَأْرَةُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ وَالعَقْرَبُ وَالْغُرَابُ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پێنج لە گیانداران هەن هەر کەسێک بیانکوژێ گوناهبار نابێ، با لە ئیحرامیشدا بێت: کۆلارەو مشک و سەگی هارو دووپشک و قەلەڕەش.

## کوشتنی کۆلارە، سورە داڵ، مشک گرەشی پێدەوترێ

**٢٨٣٣**- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا نَقْتُلُ مِنَ الدَّوَابِّ إِذَا أَحْرَمْنَا؟ قَالَ: خَمْسٌ لَا جُنَاحَ عَلَى مَنْ قَتَلَهُنَّ الْحِدَأَةُ وَالْغُرَابُ وَالْفَأْرَةُ وَالْعَقْرَبُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چی بکوژین لە ناو گیانداران ئەگەر لە ئیحرامدا بووین؟ فەرمووی: پێنج گیاندار هەن هەر کەسێک بیانکوژێ گوناهبار نابێ: کۆلارەو قەلەڕەش و مشک و دووپشک و سەگی هار).

## کوشتنی قەلەڕەش

**٢٨٣٤**- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النبي ﷺ سُئِلَ ما يَقْتُلُ الْمُحْرِمُ؟ قَالَ: يَقْتُلُ الْعَقْرَبَ وَالْفُوَيْسِقَةَ وَالْحِدَأَةَ وَالْغُرَابَ وَالْكَلْبَ الْعَقُورَ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی ئەوەی ئیحرام پۆش دەیکوژێ؟ فەرمووی: دووپشک و مشک و کۆلارەو قەلەڕەش و سەگی هار دەکوژێ.

**٢٨٣٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ النَّبِيّ ﷺ: خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ لَا جُنَاحَ في قَتْلِهِنَّ عَلَى مَن قَتَلَهُنَّ في الْحَرَمِ وَالْإِحْرَامِ الْفَأْرَةُ وَالْحِدَأَةُ وَالْغُرَابُ وَالْعَقْرَبُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ»[1].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پێنج گیاندار هەن هەر کەسێک بیانکوژێ گوناهبار نابێ لە حەرەم و لە ئیحرامدا، مشک و کۆلارە و قەلەڕەش و دووپشک و سەگی هار.

## ئەو گیاندارەی کە نابێ ئیحرام پۆش بیکوژێ

**٢٨٣٦-** «عَنِ بْنِ أبي عَمَّارٍ، قَالَ: سَأَلْتُ جَابِرَ بْن عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: عَنْ الضَّبُعِ؟ فَأَمَرَنِي بِأَكْلِهَا، قُلْتُ: أَصَيْدٌ هِيَ قَالَ: نَعم، قُلْتُ أَسَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: نَعَم»[2].

واتە: ئیبنو ئەبو عەممار دەڵێ: پرسیارم کرد لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەربارەی خواردنی کەمتیار؟ فەرمانی پێکردم بە خواردنی، وتم: ئایا ئەوە نێچیرە؟ وتی: بەڵێ، وتم: ئایا لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستوتە؟ وتی: بەڵێ.

## ڕێگەدان لە مارەکردن لە کاتی ئیحرامدا

**٢٨٣٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: تَزَوَّجَ النَّبِيّ ﷺ مَيْمُونَةَ وَهُوَ مُحْرِمٌ»[3].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ مەیمونەی مارە کرد لە ئیحرامیشدا بوو.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٨٠١، والترمذي: ٨٥١ و ١٧٩١، وإبن ماجه: ٣٠٨٥ و ٣٢٣٦.

(٣) شاذ. أخرجه البخاري: ١٨٣٧ و ٤٢٥٨ و ٤٢٥٩ و ٥١١٤، ومسلم: ٤٦ و ٤٧/١٤١٠، وأبو داود: ١٨٤٤، والترمذي: ٨٤٢ و ٨٤٣ و ٨٤٤، وإبن ماجه: ١٩٦٥.

**٢٨٣٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَكَحَ حَرَامَـاً»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئیحرامدا (مەیمونەی) مارە کرد.**

**٢٨٣٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَزَوَّجَ مَيْمُونَةَ وَهُمَا مُحْرِمَانِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ مەیمونەی مارە کرد هەردووکیان لە ئیحرامدا بوون.**

**٢٨٤٠-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَزَوَّجَ مَيْمُونَةَ وَهُوَ مُحْرِمٌ»[٣].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ مەیمونەی مارە کرد لە ئیحرامیشدا بوو.**

**٢٨٤١-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيّ ﷺ تَزَوَّجَ مَيْمُونَةَ وَهُوَ مُحْرِمٌ»[٤].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ مەیمونەی مارە کرد لە ئیحرامیشدا بوو.**

## قەدەغە کردن لە مارە کردن لە کاتی ئیحرامدا

**٢٨٤٢-** «عَنْ عُثْمَانَ بن عَفَّانَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُول اللَّهِ ﷺ: لَا يَنْكِحُ الْمُحْرِمُ ولا يَخْطُبُ ولا يُنْكِحُ»[٥].

**واتە: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیحرام پۆش نابێ بۆ خۆی ئافرەت مارە بکات، وە نابێ داوای ئافرەتیش بکات، وە نابێ بۆ کەسێکی تر داوای بکات.**

---

(١) شاذ.

(٢) شاذ.

(٣) شاذ.

(٤) شاذ.

(٥) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٠٩، وأبو داود: ١٨٤١ و ١٨٤٢، والترمذي: ٨٤٠، وإبن ماجه: ١٩٦٦.




**٢٨٤٣-** «عَنْ أَبَان بْن عُثْمَانَ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيّ ﷺ أَنَّهُ نَهَى أَنْ يَنْكِحَ الْمُحْرِمُ أَو يُنْكِحَ أَو يَخْطُبَ»[١].

**واتە: ئەبانی کوڕی عوسمان لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کردوە ئیحرام پۆش ئافرەت مارە بکات، یان بۆ کەسێکی تر مارەی بکات، یان داوای بکات.**

**٢٨٤٤-** «عَنْ نُبَيْهِ بن وَهْبٍ قَالَ: أَرْسَلَ عُمَرُ بن عُبَيْدِ اللَّهِ بن مَعْمَرٍ إلى أَبَانَ بن عُثْمَانَ ﷺ يَسْأَلُهُ أَيَنْكِحُ الْمُحْرِمُ فقال أَبَانُ إِنَّ عُثْمَانَ بن عَفَّانَ حَدَّثَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَا يَنْكِحُ الْمُحْرِمُ ولا يَخْطُبُ»[٢].

**واتە: نوبەیهی کوڕی وەهەب دەڵێ: عومەری کوڕی عوبەیدوڵڵا نێردراوی نارد بۆ لای ئەبانی کوڕی عوسمان ﷺ پرسیاری لێکرد ئایا دەبێت ئیحرام پۆش ئافرەت مارە دەکات؟ ئەبان وتی: عوسمانی کوڕی عەفان باسی کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئیحرام پۆش نابێ بۆ خۆی ئافرەت مارە بکات، وە نابێ داوای ئافرەتیش بکات.**

## کەڵە شاخ کردن بۆ ئیحرام پۆش

**٢٨٤٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ احْتَجَمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ»[٣].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کەڵە شاخی کرد لە ئیحرامیشدا بوو.**

**٢٨٤٦-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ احْتَجَمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ»[٤].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کەڵە شاخی کرد لە ئیحرامیشدا بوو.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**٢٨٤٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: احْتَجَمَ النَّبيّ ﷺ وَهُوَ مُحْرِمٌ»[(١)].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ كەڵە شاخی كرد لە ئیحرامیشدا بوو.**

## كەڵە شاخ كردنی ئیحرام پۆش بە هۆی نەخۆشیەكەوە

**٢٨٤٨-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبيّ ﷺ احْتَجَمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ من وَثْءٍ كَانَ بِه»[(٢)].

**واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ كەڵە شاخی كرد بە ئیحرامەوە بە هۆی ئازارێكەوە لە گۆشتیدا بوو نەک ئێسكی.**

## كەڵە شاخ كردنی ئیحرام پۆش لەسەر پشتی پێ

**٢٨٤٩-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ احْتَجَمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ عَلَى ظَهْرِ الْقَدَمِ مِنْ وَثْءٍ كَانَ بِهِ»[(٣)].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ كەڵە شاخی كرد بە ئیحرامەوە لەسەر پشتی پێی بە هۆی (وَثْء) (كە ئازارێكە لە گۆشتدا ناگاتە سەر ئێسک) تووشی بوو بوو.**

## كەشاخ كردن ئیحرام لە نێوەڕاستی سەری

**٢٨٥٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن بُحَيْنَةَ ﷺ يحدث، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ احْتَجَمَ وَسَطَ رَأْسِهِ وهو مُحْرِمٌ بِلَحْيِ جَمَلٍ من طَرِيقِ مَكَّةَ»[(٤)].

**واتە: عەبدوڵڵای كوڕی بوحەینە ﷺ باس دەكات پێغەمبەری خوا ﷺ نێوەڕاستی سەری كەڵە شاخ كرد لە ئیحرامیشدا بوو لە (لَحْيِ جَمَلٍ) (كە شوێنێكە لە ڕێگای مەككە).**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٨٣٦، وإبن ماجه: ٣٠٨٢.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٨٣٧.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٣٦، ومسلم: ١٢٠٣، وإبن ماجه: ٣٤٨١.




## دەربارەی ئیحرام پۆش کاتێ سپێ ئازاری سەری دەدا

**٢٨٥١-** «عَنْ كَعْبِ بنِ عُجْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مُحْرِماً، فَآذَاهُ الْقَمْلُ في رَأْسِهِ، فَأَمَرَهُ رَسُول اللَّهِ ﷺ أَنْ يَحْلِقَ رَأْسَهُ، وَقَالَ: صُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ أو أَطْعِمْ سِتَّةَ مَسَاكِينَ مُدَّيْنِ مُدَّيْنِ أو انْسُكْ شَاةً، أَيَّ ذَلِكَ فَعَلْتَ أَجْزَأَ عَنْكَ»[١].

**واتە: کەعبی کوڕی عوجرە ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئیحرامی بەستبوو، سپێ ئازار سەریدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکرد سەری بتاشێ، فەرمووی: سێ ڕۆژ بەڕۆژوبە، یان نانی شەش هەژار بدە بە ئەندازەی دوو (مُدّ) گوێل، دوو (مُدّ) گوێل، یاخود مەڕێک سەر ببڕە، هەرکامەیان بکەیت ئەوە بەسە بۆت.**

**تێبینی: (المُدّ): پێوانەیەکی ناسراو بووە لەو سەردەمەدا، وتراویشە لەبەر ئەوە ناو براوە بە (المُدّ) چونکە مرۆڤ هەردوو دەستی دانایە پڕی دەکرد، واتە: بە ئەندازەی گوێلێکە.**

**٢٨٥٢-** «عَنْ كَعْبِ بنِ عُجْرَةَ ﷺ قَالَ: أَحْرَمْتُ فَكَثُرَ قَمْلُ رَأْسِي فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبيّ ﷺ فَأَتَانِي وَأَنَا أَطْبُخُ قِدْراً لِأَصْحَابِي فَمَسَّ رَأْسِي بِأَصْبعهِ، فَقَالَ: انْطَلِقْ فَاحْلِقْهُ وَتَصَدَّقْ عَلَى سِتَّةِ مَسَاكِينَ»[٢].

**واتە: کەعبی کوڕی عوجرە ﷺ دەڵێ: ئیحرامم بەست سپێی سەرم زۆر بوو بوو، ئەوە گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لام منیش لە مەنجەڵێکدا چێشتم لێدەنا بۆ هاوەڵەکانم، بە پەنجەکانی دەستیدا لە سەرم و فەرمووی: بڕۆ سەرت بتاشەو، (خواردن) ببەخشە بەسەر شەش کەسی هەژاردا.**

## شۆردنی ئیحرام پۆش بە سیدر کاتێ مرد

**٢٨٥٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً كَانَ مَعَ النَّبيّ ﷺ فَوَقَصَتْهُ نَاقَتُهُ وهو مُحْرِمٌ فَمَاتَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ في ثَوْبَيْهِ، ولا تُمِسُّوهُ بِطِيبٍ، ولا تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ، فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّياً»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨١٤، ومسلم: ١٢٠١، وأبو داود: ١٨٥٦ و ١٨٥٧ و ١٨٥٨، والترمذي: ٩٥٣ و ٢٩٧٣ و ٢٩٧٤، وإبن ماجه: ٣٠٧٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بوو ئیحرامی بەستبوو، وشترەکەی فڕێی دایە خوارەوەو ملی شکاند و دەستبەجێ مرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بە ئاوو سیدر بیشۆرن، کفنی بکەن لە دوو پۆشاکدا، بۆنی خۆشی لێ مەدەن، سەرو ڕوخساری با لە دەرەوە بێت، چونکە لە ڕۆژی دواییدا زیندوو دەکرێتەوە تەلبیە دەکات.

## ئیحرام پۆش لە چەند پۆشاکی کفن دەکرێ کاتێ مرد

**٢٨٥٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَجُلاً مُحْرِمَاً صُرِعَ عن نَاقَتِهِ فَأُوقِصَ، ذُكِرَ أَنَّهُ قَدْ مَاتَ، فَقَالَ النَّبِيّ ﷺ اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ في ثَوْبَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: عَلَى إِثْرِهِ خَارِجاً رَأْسُهُ، قَالَ ولا تُمِسُّوهُ طِيباً، فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّياً قَالَ شُعْبَةُ فَسَأَلْتُهُ بَعْدَ عَشْرِ سِنِينَ فَجَاءَ بِالْحَدِيثِ كَمَا كَانَ يَجِيءُ بِهِ إلاَّ أَنَّهُ قَالَ: ولا تُخَمِّرُوا وَجْهَهُ وَرَأْسَهُ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک ئیحرامی بەستبوو لە وشترەکەی کەوتە خوارەوە دەستبەجێ ملی شکاو گیانی لە دەستدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە ئاوو سیدر بیشۆرن، کفنی بکەن لە دوو پۆشاکدا، پاشان دوای ئەوە فەرمووی: با سەری لە دەرەوە بێت، فەرمووی: بۆنی خۆشی لێ مەدەن، چونکە لە ڕۆژی دواییدا زیندوو دەکرێتەوە تەلبیە دەکات.

## قەدەغە کردن لەوەی ئیحرام پۆش کاتێ مرد بۆنی خۆش لێ بدرێ

**٢٨٥٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قال: بَيْنَا رَجُلٌ وَاقِفٌ بِعَرَفَةَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذْ وَقَعَ مِنْ رَاحِلَتِهِ فَأَقْعَصَهُ أَو قَالَ: فَأَقْعَصَتْهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ في ثَوْبَيْنِ، ولا تُحَنِّطُوهُ ولا تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ، فَإِنَّ اللَّهَ ﷻ يَبْعَثُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّياً»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: لە کاتێکدا پیاوێک لەسەر کێوی عەرەفە ڕاوەستا بوو لە ناکاو لەسەر وشترەکەی کەوتە خوارەوە ملی شکاو مرد، یان وشترەکەی ملی شکاند، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیشۆرن بە ئاوو بە سیدر و

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




کفنی بکەن، بە دوو پارچە پۆشاکەکەی کە بۆ ئیحرام بەستویەتی، وە بۆنی خۆشی لێ مەدەن و سەریشی دامەپۆشن، چونکە ئەو زیندوو دەکرێتەوە لە ڕۆژی دواییدا تەلبیە دەکات.

٢٨٥٦- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قال: وَقَصَتْ رَجُلاً مُحْرِماً نَاقَتُهُ فَقَتَلَتْهُ فَأُتِيَ رَسُول اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: اغْسِلُوهُ وَكَفِّنُوهُ وَلاَ تُغَطُّوا رَأْسَهُ ولا تُقَرِّبُوهُ طِيْبَاً فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يُهِلُّ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک وشترەکەی فڕێیدایە خوارەوە ملی شکاو دەستبەجێ مرد، هێنرا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیشۆرن و کفنی بکەن سەری دامەپۆشن، بۆنی خۆشی لێ نزیک مەکەنەوە، چونکە ئەو زیندوو دەکرێتەوە تەلبیە دەکات.

## قەدەغە کردنی داپۆشینی ڕوخسار و سەری ئیحرام پۆش کاتێ مرد

٢٨٥٧- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً كَانَ حَاجّاً مَعَ رَسُول اللَّهِ ﷺ وَأَنَّهُ لَفَظَهُ بَعِيرُهُ فَمَاتَ، فَقَالَ رَسُول اللَّهِ ﷺ يُغَسَّلُ وَيُكَفَّنُ في ثَوْبَيْنِ، ولا يُغَطَّى رَأْسُهُ وَوَجْهُهُ، فَإِنَّهُ يَقُومُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّياً»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک بە مەبەستی حەج لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، وشترەکەی فڕێیدایە خوارەوە دەستبەجێ مرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با بشۆرێ و کفن بکرێ لە دوو پۆشاکدا، سەرو ڕوخساری داناپۆشرێ، چونکە ئەو لە ڕۆژی دواییدا زیندوو دەکرێتەوە تەلبیە دەکات.

## قەدەغە کردنی داپۆشینی سەری ئیحرام پۆش کاتێ مرد

٢٨٥٨- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَقْبَلَ رَجُلٌ حَرَاماً مَعَ رَسُول اللَّهِ ﷺ فَخَرَّ مِنْ فَوْقِ بَعِيرِهِ، فَوُقِصَ وَقْصاً فَمَاتَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ وَأَلْبِسُوهُ ثَوْبَيْهِ، ولا تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ، فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُلَبِّي»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک بە ئیحرامەوە هات لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر وشترەکەی کەوتە خوارەوە ملی شکا، دەستبەجێ مرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیشۆرن بە ئاوو سیدر و دوو پۆشاکی لەبەر بکەن و سەری دامەپۆشن، چونکە ئەو زیندوو دەکرێتەوە تەلبیە دەکات.

## دەربارەی کەسێک دوژمن ڕێگری حەجی لێ بکات

**٢٨٥٩-** «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْن عَبْد اللَّهِ وَسَالِمَ بن عبد اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَخْبَرَاهُ، أَنَّهُمَا كَلَّمَا عَبْدَ اللَّهِ بن عُمَرَ لَمَّا نَزَلَ الْجَيْشُ بِابْنِ الزُّبَيْرِ قبل أَنْ يُقْتَلَ، فَقَالَا: لَا يَضُرُّكَ أَنْ لَا تَحُجَّ الْعَامَ إِنَّا نَخَافُ أَنْ يُحَالَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْبَيْتِ، قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُول اللَّهِ ﷺ فَحَالَ كُفَّارُ قُرَيْشٍ دُونَ الْبَيْتِ فَنَحَرَ رَسُول اللَّهِ ﷺ هَدْيَهُ وَحَلَقَ رَأْسَهُ، وَأُشْهِدُكُمْ أَنِّي قد أَوْجَبْتُ عُمْرَةً إِنْ شَاءَ الله أَنْطَلِقُ فَإِنْ خُلِّيَ بَيْنِي وَبَيْنَ الْبَيْتِ طُفْتُ وَإِنْ حِيلَ بَيْنِي وَبَيْنَ الْبَيْتِ فَعَلْتُ ما فَعَلَ رَسُول اللَّهِ ﷺ وأنا معه ثُمَّ سَارَ سَاعَةً ثُمَّ قال فَإِنَّمَا شَأْنُهُمَا وَاحِدٌ أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قد أَوْجَبْتُ حَجَّةً مع عُمْرَتِي فلم يَحْلِلْ مِنْهُمَا حتى أَحَلَّ يوم النَّحْرِ وَأَهْدَى» [1].

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵاو سالمی کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) هەواڵیان پێداوە ئەوان قسەیان لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر کرد کاتێ سەربازەکان دابەزین بۆ جەنگ لەگەڵ ئیبنو زوبەیر، پێش ئەوەی بکوژرێ، وتیان: زیانت پێناگات ئەم ساڵ حەج نەکەی، ئێمە دەترسین بەربەست دروست بکرێ لە نێوان ئێمە و بەیتدا، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوین بۆ حەج بێبڕوایانی قورەیش ڕێگریان کردین بچینە بەیت، پێغەمبەری خوا ﷺ قوربانیەکەی خۆی سەربڕی و سەری تاشی، من ئێوە دەکەم بە شایەت عومرەم پێویست کرد بە ویستی خوا، ئەگەر ڕێگەیان دام تەوافی بەیت دەکەم، ئەگەر بەربەستیان دروست کرد لە نێوان من و بەیتدا، ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ کردوویەتی ئەوە دەکەم، من لەگەڵی بووم، پاشان ئەندازەیەک ڕۆیشت، پاشان وتی: بێگومان حەج و عومرە هەر وەکو یەکترن، من دەتانکەم بە شایەت حەجم لەسەر خۆم پێویست کرد لەگەڵ عومرەکەم، ئیحرامی لە هیچ کامەیان نەشکاند تا لە ڕۆژی جەژن ئیحرامی شکاند و قوربانیەکەی نارد.

---

(١) صحيح.

**٢٨٦٠-** «عَنِ الْحَجَّاجِ بن عَمْرٍو الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ عَرِجَ، أو كُسِرَ، فَقَدْ حَلَّ وَعَلَيْهِ حَجَّةٌ أُخْرَى فَسَأَلْتُ بن عَبَّاسٍ وَأَبَا هُرَيْرَةَ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَا: صَدَقَ»[1].

**واتە: حەجاجی کوڕی عەمری ئەنصاری ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەرکەس لە ڕێگای حەج شەل بوو، یان قاچی شکێنرا (بەهەر هۆکارێک)، ئەوە دەتوانێ ئیحرام بشکێنێ، وە حەجێکی تری لەسەر پێویستە، جا پرسیارم کرد لە ئیبنو عەبباس و ئەبو هورەیرە دەربارەی ئەمە؟! وتیان: ڕاست دەکات.**

**٢٨٦١-** «عَنِ الْحَجَّاجِ بْن عَمْرٍو ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ كُسِرَ، أَو عَرِجَ فَقَدْ حَلَّ وَعَلَيْهِ حَجَّةٌ أُخْرَى وَسَأَلْتُ: ابن عَبَّاسٍ وَأَبَا هُرَيْرَةَ؟! فَقَالَا: صَدَقَ»[2].

**واتە: حەجاجی کوڕی عەمری ئەنصاری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەس لە ڕێگای حەج شەل بوو، یان قاچی شکێنرا (بەهەر هۆکارێک)، ئەوە دەتوانێ ئیحرام بشکێنێ، وە حەجێکی تری لەسەر پێویستە، پرسیارم کرد لە ئیبنو عەبباس و ئەبو هورەیرە دەربارەی ئەمە؟! وتیان: ڕاست دەکات.**

## چوونە ناو مەککە

**٢٨٦٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَنْزِلُ بِذِي طُوًى يَبِيتُ بِهِ حَتَّى يُصَلِّيَ صَلَاةَ الصُّبْحِ حِيْنَ يَقْدَمُ إلى مَكَّةَ وَمُصَلَّى رَسُول اللَّهِ ﷺ ذَلِكَ عَلَى أَكَمَةٍ غَلِيظَةٍ ليس في الْمَسْجِدِ الذي بُنِيَ ثَمَّ وَلَكِنْ أَسْفَلَ مِنْ ذَلِكَ عَلَى أَكَمَةٍ خَشِنَةٍ غَلِيظَةٍ»[3].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەردەچوو بۆ مەککە، دادەبەزییە ناوچەیەک بە ناو (ذِي طُوًى) (لە نزیک مەککە) دەمایەوە تا نوێژی بەیانی لەوێ دەکرد، وە شوێنی نوێژی پێغەمبەریش ﷺ لەسەر تەپۆڵکەیەکی ئەستور بوو، نەک لە ناو ئەو مزگەوتەی لەوێ بونیاد نرا بوو، بەڵام لەوە نزم تر بوو لەسەر تەپۆڵکەیەکی زبری ئەستور بوو.**

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ١٨٦٢، والترمذي: ٩٤٠، وإبن ماجه: ٣٠٧٧.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٩١ و ١٧٦٧ و ١٧٦٩، ومسلم: ٢٢٦ و ١٢٥٩/٢٢٨.

## چوونە ناوەوەی مەککە بە شەو

**٢٨٦٣-** «عن مُحَرِّشٍ الْكَعْبِيِّ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ لَيْلاً مِنَ الْجِعِرَّانَةِ حِيْنَ مَشَى مُعْتَمِراً فَأَصْبَحَ بِالْجِعِرَّانَةِ كَبَائِتٍ حَتَّى إِذَا زَالَتْ الشَّمْسُ خَرَجَ عَنِ الْجِعِرَّانَةِ في بَطْنِ سَرِفَ حَتَّى جَامَعَ الطَّرِيقَ طَرِيقَ الْمَدِينَةِ مِن سَرِفَ»[1].

**واتە: موحەڕیشی کەعبی ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ بە شەو دەرچوو لە جیعرانە، کاتێ ڕێی کرد بە مەبەستی عومرە، (جا چوو بۆ مەککە بە شەو و، عومرەکەی تەواو کرد، دواتر لە شەوەکەدا دەرچوو لە مەککەوە) لە جیعرانە بەیانی کردەوە وەک ئەوەی هەموو شەوەکە لە جیعڕانە بووبێت و دەرنەچوبێت، تا کاتێ خۆر ترازا، ئینجا لە جیعرانە دەرچوو تێپەڕی بە ناو (سَرِفَ) (شوێنێک بوو لە نزیک مەکە) تا گەیشتە ڕێگای مەدینە لە (سَرِفَ).**

**تێبینی: زۆربەی زانایان دەڵێن: ئەو کەسەی کە لە مەککەیە دروست بۆی لە نزیکترین شوێن ئیحرامی عومرە ببەستێت، بەڵام لە جیعرانە سوننەتە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێ بەستویەتی. خوا زاناترە)**

**٢٨٦٤-** «عَنْ مُحَرِّشٍ الْكَعْبِيِّ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ مِنَ الْجِعِرَّانَةِ لَيْلاً كَأَنَّهُ سَبِيكَةُ فِضَّةٍ فَاعْتَمَرَ ثُمَّ أَصْبَحَ بها كَبَائِتٍ»[2].

**واتە: موحەڕیشی کەعبی ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ بە شەو دەرچوو لە جیعرانە، هەر وەکو زیو وابوو، عومرەی کرد، پاشان لەوێ بەیانی کردەوە.**

## لە کوێوە دەچێتە ناو مەککە؟

**٢٨٦٥-** «عَنِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ مِنَ الثَّنِيَّةِ الْعُلْيَا الَّتِي بِالْبَطْحَاءِ وَخَرَجَ مِنَ الثَّنِيَّةِ السُّفْلَى»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩٩٦، والترمذي: ٩٣٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٧٥ و ١٥٧٦، ومسلم: ١٢٥٧، وأبو داود: ١٨٦٦ و ١٨٦٧، وإبن ماجه: ٢٩٤٠.




واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ناو مەککەوە لە ڕێگای سەرەوە کە لە (الْبَطْحَاء)ـە، وە لە ڕێگای خوارەوەش دەرچوو.

## چوونە ناو مەککە بە بەیداخەوە

**٢٨٦٦-** «عن جَابِر ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ وَلِوَاؤُهُ أَبْيَضُ»[١].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ چووە ناو مەککەوە (لە ساڵی ڕزگار کردنی) بەیداخەکەی سپی بوو.

## چوونە ناو مەککە بەبێ ئیحرام

**٢٨٦٧-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ وَعَلَيْهِ الْمِغْفَرُ فَقِيلَ بن خَطَلٍ مُتَعَلِّقٌ بِأَسْتَارِ الْكَعْبَةِ، فقال اقْتُلُوهُ»[٢].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ چووە ناو مەککەوە) لە ساڵی ڕزگار کردنی (کڵاوێکی سەربازی لەسەردا بوو، پێی وترا: ئیبنو خەطەل خۆی هەڵواسیوە بە کەعبەدا فەرمووی: بیکوژن.

**٢٨٦٨-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِي ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ وَعَلَى رَأْسِهِ الْمِغْفَرُ»[٣].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ چووە ناو مەککەوە لە ساڵی ڕزگار کردنی کڵاوێکی سەربازی لەسەردا بوو.

**٢٨٦٩-** «عَنْ جَابِرِ بن عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِي ﷺ دَخَلَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ بِغَيْرِ إِحْرَامٍ»[٤].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ چووە مەککە لە ڕۆژی رزگار کردنی مێزەرێکی ڕەشی لەسەردا بوو بەبێ ئیحرام.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٥٩٢، والترمذي: ٦٧٩، وإبن ماجه: ٢٨١٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٤٦ و ٣٠٤٤ و ٤٢٨٦ و ٥٨٠٨، ومسلم: ١٣٥٧، وأبو داود: ٢٦٨٥، والترمذي: ١٦٩٣، وإبن ماجه: ٢٨٠٥.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٥٨، وأبو داود: ٤٠٧٦، والترمذي: ١٦٧٩ و ١٧٣٥، وإبن ماجه: ٢٨٢٢ و ٣٥٨٥.

## ئەو کاتەی کە پێغەمبەر ﷺ هاتە ناو مەککەوە

**٢٨٧٠-** «عَنِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَصْحَابُهُ لِصُبْحِ رَابِعَةٍ وَهُمْ يُلَبُّونَ بِالْحَجِّ فَأَمَرَهُمْ رَسُول اللَّهِ ﷺ أَنْ يَحِلُّوا»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی سەرلەبەیانی چوارەم ڕۆژی (ذِي الْحِجَّةِ) هاتن ئیحرامی حەجیان بەستبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردن ئیحرام بشکێنن.**

**٢٨٧١-** «عَنِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالض: قَدِمَ رسول اللَّهِ ﷺ لِأَرْبَعٍ مَضَيْنَ من ذِي الْحِجَّةِ وقد أَهَلَّ بِالْحَجِّ فَصَلَّى الصُّبْحَ بِالْبَطْحَاءِ، وَقَالَ: مَنْ شَاءَ أَنْ يَجْعَلَهَا عُمْرَةً فَلْيَفْعَلْ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مەککە چوار ڕۆژ تێپەڕیبوو لە (ذِي الْحِجَّةِ) ئیحرامی حەجی بەستبوو، نوێژی بەیانی لە بەطحاء کرد و فەرمووی: هەرکەس دەیەوێ بیکات بە عومرە با بیکات.**

**٢٨٧٢-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَدِمَ النبي ﷺ مَكَّةَ صَبِيحَةَ رَابِعَةٍ مَضَتْ من ذِي الْحِجَّةِ»[٣].

**واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ هاتە مەککە چوار ڕۆژ تێپەڕیبوو لە (ذِي الْحِجَّةِ).**

## وتنی شیعر لە حەرەمداو ڕێکردن بە بەردەم ئیمام دا

**٢٨٧٣-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ في عُمْرَةِ الْقَضَاءِ وَعَبْدُ اللَّهِ بن رَوَاحَةَ يَمْشِي بين يَدَيْهِ وَهُوَ يَقُولُ: خَلُّوا بنى الْكُفَّارِ عن سَبِيلِهِ الْيَوْمَ نَضْرِبْكُمْ على تَنْزِيلِهِ، ضَرْباً يُزِيلُ الْهَامَ عن مَقِيلِهِ وَيُذْهِلُ الْخَلِيلَ عن خَلِيلِهِ فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: يا بن رَوَاحَةَ بين يَدَيْ رسول اللَّهِ ﷺ وفي حَرَمِ اللَّهِ ﷻ تَقُولُ الشِّعْرَ قال النَّبِيّ ﷺ خَلِّ عنه فَلَهُوَ أَسْرَعُ فِيهِمْ من نَضْحِ النَّبْلِ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٨٥، ومسلم: ١٩٩ و ١٢٤٠/٢٠٢.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٨٤٧.




واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ هاتە مەککە بۆ قەزا کردنەوەی عومرە کە ساڵی حودەیبیە ڕێگری لێکرا، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە بە بەردەمیدا دەهات و دەڕۆیی و دەیوت: بێبڕوایان با ڕێگای بەردەمی چۆڵ بکەن، ئەمڕۆ لێتان دەدەین تا دادەبەزینە مەککە. لێدانێک سەر لە گەردن جیا دەکاتەوە، خۆشەویست لە خۆشەویست جیا دەکاتەوە، عومەر وتی: ئەی کوڕی ڕەواحە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و لە حەرەمی خوادا شیعر دەڵێی! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕاستی ئەو شیعرە کاریگەرترە لەسەر دڵیان لە تیر باران کردن.

## ڕێزو پیرۆزی مەککە

**٢٨٧٤-** «عَنِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُول اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الْفَتْحِ هَذَا الْبَلَدُ حَرَّمَهُ الله يوم خَلَقَ السماوات وَالْأَرْضَ فَهُوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللَّهِ إلى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا يُعْضَدُ شَوْكُهُ ولاَ يُنَفَّرُ صَيْدُهُ ولا يَلْتَقِطُ لُقَطَتَهُ إلاَّ من عَرَّفَهَا ولا يُخْتَلَى خَلَاهُ قَالَ الْعَبَّاسُ: يا رَسُولَ اللَّهِ إلاَّ الْإِذْخِرَ فذكر كَلِمَةً مَعْنَاهَا إلاَّ الْإِذْخِرَ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ڕزگار کردنی مەککەدا فەرمووی: ئەم شارە خوا حەرامی کردوە لەو ڕۆژەی ئاسمانەکان و زەوی دروست کردوە، ئەم شارە حەرامە لەبەر ئەوەی خوا پیرۆزی کردوە حەرامی کردوە تا ڕۆژی دوایی، دڕکەکانی هەڵناکەندرێن، نێچیرەکانیش تار ناکرێن، دۆزراوەکانیشی هەڵناگیرێن مەگەر بۆ کەسێک پێناسەی بکات (تا خاوەنەکەی دەدۆزێتەوە) ڕووەکەکانیشی هەڵناکەنرێن، عەبباس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا جگە (إِذْخِر) باسی وشەیەکی کرد ئەمە ماناکەی بوو جگە لە (إِذْخِر).

## قەدەغە کردنی کوشتار تیایدا

**٢٨٧٥-** «عَنِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُول اللَّهِ ﷺ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ إِنَّ هَذَا الْبَلَدَ حَرَامٌ حَرَّمَهُ اللَّه ﷻ لم يَحِلَّ فيه الْقِتَالُ لِأَحَدٍ قَبْلِي وَأُحِلَّ لي سَاعَةً من نَهَارٍ فَهُوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللَّهِ ﷻ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٨٧ و ١٨٣٤ و ٢٧٨٣ و ٢٨٢٥ و ٣٠٧٧ و ٣١٨٩، ومسلم: ١٢٥٣، وأبو داود: ٢٠١٨ و ٣٢٨٠، والترمذي: ١٥٩٠.

(٢) صحيح.




واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ڕزگار کردنی مەککەدا فەرمووی: بەڕاستی ئەم شارە حەرامە، خوا حەرامی کردوە، بە هیچ شێوەیەک کوشتار تیایدا دروست نیە بۆ هیچ کەسێک لە پێش منەوە، تەنها ساتێک لە ڕۆژدا بۆم حەلاڵ کراوە، ئەو شارە حەرامە چونکە خوا پیرۆزی کردوە.

**٢٨٧٦-** «عَنْ أَبي شُرَيْحٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ لِعَمْرِو بن سَعِيدٍ وهو يَبْعَثُ الْبُعُوثَ إلى مَكَّةَ ائْذَنْ لي أَيُّهَا الْأَمِيرُ أُحَدِّثْكَ قَوْلاً قام بِهِ رَسُول اللَّهِ ﷺ الْغَدَ من يَوْمِ الْفَتْحِ سَمِعَتْهُ أُذُنَايَ وَوَعَاهُ قَلْبِي وَأَبْصَرَتْهُ عَيْنَايَ حين تَكَلَّمَ بِهِ حَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عليه، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ مَكَّةَ حَرَّمَهَا الله ولم يُحَرِّمْهَا الناس ولا يَحِلُّ لِامْرِئٍ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ يَسْفِكَ بها دَماً ولا يَعْضُدَ بها شَجَراً فَإِنْ تَرَخَّصَ أَحَدٌ لِقِتَالِ رَسُول اللَّهِ ﷺ فيها فَقُولُوا له: إِنَّ اللَّهَ أَذِنَ لِرَسُولِهِ ولم يَأْذَنْ لَكُمْ وَإِنَّمَا أَذِنَ لي فيها سَاعَةً من نَهَارٍ وقد عَادَتْ حُرْمَتُهَا الْيَوْمَ كَحُرْمَتِهَا بِالْأَمْسِ وَلْيُبَلِّغْ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ»(١).

واتە: ئەبو شورەیح ﷺ، بە عەمری کوڕی سەعیدی وت: ئەو سوپای نارد بۆ مەککە بۆ جەنگ لەگەڵ عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر، وتی: مۆڵەتم بدە ئەی پێشەوا قسەیەکت بۆ باس بکەم پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئازاد کردنی مەککە پێی هەڵسا، بە گوێی خۆم بیستم و بە دڵم وەرم گرت و بە چاوم بینیم، کاتی باسی کرد سوپاس و ستایشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: بەڕاستی مەککە خوا حەرامی کردوە و خەڵکی حەرامیان نەکردوە، حەلاڵ نیە بۆ هیچ کەسێک بڕوای هێنابێ بە خواو بە ڕۆژی دوایی خوێنی تێدا بڕێژێ، وە درەختەکانی ببڕێت، ئەگەر یەکێک بیانوی هێنایەوە بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگی تێدا کردوە، پێی بڵێن: خوا ﷻ مۆڵەتی داوە بە پێغەمبەرەکەی و مۆڵەتی بە ئێوە نەداوە، بێگومان ساتێک لە ڕۆژ مۆڵەتی داوە بە من، بەڕاستی ئەمڕۆ حەرام کردنی گەڕایەوە هەروەکو دوێنێ، با ئەو کەسەی ئامادەیە ئەو کەسە ئاگادار بکاتەوە کە ئامادە نیە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٤ و ١٨٣٢ و ٤٢٩٥، ومسلم: ١٣٥٤، وأبو داود: ٤٥٠٤، والترمذي: ٨٠٩ و ١٤٠٦.



## ناوەڕۆک

نوێژ کردنی جەنازە لەسەر منداڵان...................................................... ٢٥٥

